


پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە

بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

# صحيح ابن خزيمة

## بەکوردی


نووسینی: الإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السُّلمي النَّيسابوري

وەرگێڕانی : عباس محمد أمين

دیزایینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

هەڵەچن و ڕێنووس : بڕیار هێرۆیی

خەتی بەرگ : ستافی پیت

چاپی یەکەم : ١٤٤٤ك - ٢٠٢٣ز

٧٣٤ لاپەڕە

٢٤ × ١٧ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ١١٣ )ی ساڵی ٢٠٢٢ پێ دراوە
















# صحيح ابن خزيمة

## بەکوردی




نووسینی

الإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة أبو بكر السُّلمي النّيسابوري

وەرگێڕان

عباس محمد أمين

## الرُّخْصَةِ فِي قُبْلَةِ الصَّائِمِ رُءُوسَ النِّسَاءِ وَوُجُوهَهُنَّ خِلَافَ مَذْهَبِ مَنْ كَانَ يَكْرَهُ ذَلِكَ

**٢٠٠١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَظَلُّ صَائِمًا، لَا يُبَالِي مَا قَبَّلَ مِنْ وَجْهِي حَتَّى يُفْطِرَ، وَقَالَ يُوسُفُ: فَقَبَّلَ مَا شَاءَ مِنْ وَجْهِي، وَقَالَ الزَّعْفَرَانِيُّ: فَقَبَّلَ أَيَّ مَكَانٍ شَاءَ مِنْ وَجْهِي[١].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ڕۆژووەوان ماچی سەر و ڕوخساری هاوسەرەکانی بکات بە پێچەوانەی مەزهەبی ئەو کەسەی بەناپەسەندی دەزانێت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەزمانی بەڕۆژووەوە بەلایەوە ئاسایی بوو چەندە ڕوخسارمی ماچ بکردایە تا ڕۆژووی دەشکاند، یوسف (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: بەویستی خۆی ماچی ڕوخساری دەکردم، وە زەعفەڕانیش (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: هەر شوێنێکی بویستایە لە ڕوخسارم ماچی دەکرد.

**٢٠٠٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصِيبُ مِنَ الرُّءُوسِ وَهُوَ صَائِمٌ[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە زمانی بەڕۆژووەوە سەری ماچ دەکرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي مَصِّ الصَّائِمِ لِسَانَ الْمَرْأَةِ، خِلَافَ مَذْهَبِ مَنْ كَرِهَ الْقُبْلَةَ لِلصَّائِمِ عَلَى الْفَمِ إِنْ جَازَ الِاحْتِجَاجُ بِمِصْدَعٍ أَبِي يَحْيَى، فَإِنِّي لَا أَعْرِفُهُ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

**٢٠٠٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ، وَيَمُصُّ لِسَانَهَا[٣].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ڕۆژووەوان زمانی هاوسەرەکەی بمژێ، جیاواز لە مەزهەبی ئەو کەسەی بە ناپەسندی دەزانێ پیاو ماچی زمانی هاوسەرەکەی بکات، ئەگەر دروست بێ فەرموودەکەی میصدەعی کوڕی یەحیا بە بەڵگە وەربگیرێ، چونکە من نازانم ئەو دادپەروەرە یان لەکەدارە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) هذا حديث باطل وإسناده مسلسل بالعلل.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکرد لە کاتێکدا بەڕۆژوو بووەو، زمانیشی دەمژی.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي قُبْلَةِ الصَّائِمِ الْمَرْأَةَ الصَّائِمَةَ

٢٠٠٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَهْوَى إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُقَبِّلَنِي، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمَةٌ قَالَ: «وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَبَّلَنِي»[1].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ڕۆژووەوان ماچی هاوسەرەکەی بکات کاتێ کە هاوسەرەکەی بەڕۆژووە

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام بۆ ئەوەی ماچم بکات، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: منیش بەڕۆژووم، دواتر ماچی کردم.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْقُبْلَةَ لِلصَّائِمِ مُبَاحَةٌ لِجَمِيعِ الصُّوَّامِ، وَلَمْ تَكُنْ خَاصَّةً لِلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ جَابِرٍ عَنْ عُمَرَ مِنْ هَذَا الْبَابِ

٢٠٠٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ماچکردن بەزمانی بەڕۆژووەوە ڕێگەپێدراوە بۆ هەموو ڕۆژووەوانەکان، تایبەت نییە بە پێغەمبەر ﷺ، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی جابر لە عومەرەوە، لەم بەشەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بەوەی ڕۆژووەوان ماچی هاوسەرەکەی بکات.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.





## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي السِّوَاكِ لِلصَّائِمِ

**٢٠٠٦-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ، وَلَمْ يَسْتَثْنِ مُفْطِرًا دُونَ صَائِمٍ، فَفِيهَا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ السِّوَاكَ لِلصَّائِمِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ فَضِيلَةٌ كَهُوَ لِلْمُفْطِرِ»(١).

## باسی مۆڵەتدان بە سیواککردن بۆ ڕۆژووەوان

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوە فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن لە کاتی هەموو نوێژێکدا. لەم فەرموودەدا بەڕۆژوونەبوو و ڕۆژووەوانی لە یەکدی جیا نەکردەوە، بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی سیواککردن بۆ ڕۆژووەوان لە کاتی هەموو نوێژێکدا کارێکی چاکە وەکوو چۆن بۆ بەڕۆژوونەبوو کارێکی چاکە.

**٢٠٠٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مَا لَا أُحْصِي يَسْتَاكُ وَهُوَ صَائِمٌ(٢).

واتە: عەبدوڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: هێندە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە زمانی بەڕۆژووەوە سیواکی کردووە لە هەژمار نایەت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِاكْتِحَالِ الصَّائِمِ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، وَإِنْ لَمْ يَصِحَّ الْخَبَرُ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ، فَالْقُرْآنُ دَالٌّ عَلَى إِبَاحَتِهِ وَهُوَ قَوْلُ اللَّهِ ﷻ: ﴿ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ ﴾البقرة: ١٨٧، دَالٌّ عَلَى إِبَاحَةِ الْكُحْلِ لِلصَّائِمِ

**٢٠٠٨-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ قَالَ: نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْبَرَ وَنَزَلْتُ مَعَهُ، فَدَعَانِي بِكُحْلِ إِثْمِدٍ، فَاكْتَحَلَ فِي رَمَضَانَ وَهُوَ صَائِمٌ إِثْمِدَ غَيْرَ مُمَسَّكٍ(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.




باسی مۆڵەتدان بە چاوڕشتن بۆ ڕۆژووەوان، ئەگەر فەرموودەكە صەحیح بێ، ئەگەر صەحیحیش نەبێ لە ڕووی گواستنەوەوە، ئەوە قورئان بەڵگەیە لەسەر ڕێگەپێدانی، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ ﴾، واتە: ئێستا ئێوە دەتوانن بچنە لای خێزانەكانتان. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ڕەوایەتی چاوڕشتن بۆ ڕۆژووەوان

ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزیە خەیبەر بۆ پشوودان منیش لەگەڵی دابەزیم، بانگی كردم بۆ كلی چاوڕشتن، لە ڕەمەزاندا چاوی ڕشت بەڕۆژوویش بوو، بە كلێك بۆنخۆش كرابوو بە میسك.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَرْكِ الْجُنُبِ الِاغْتِسَالَ مِنَ الْجَنَابَةِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ إِذَا كَانَ مُرِيدًا لِلصَّوْمِ

٢٠٠٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُدْرِكُهُ الصُّبْحُ وَهُوَ جُنُبٌ فَيَصُومُ[١].

## باسی ڕێگە دراوە لەشگران خۆی نەشوات تا بەرەبەیان، ئەگەر ویستی بەڕۆژوو بێ

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی دەكردەوەو لەشیشی گران بوو.

٢٠١٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە لەشگرانی بەهەمان شێوەی دەفەرموو.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ فِي الزَّجْرِ عَنِ الصَّوْمِ إِذَا أَدْرَكَ الْجُنُبُ الصُّبْحَ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ، لَمْ يَفْهَمْ مَعْنَاهُ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ، فَأَنْكَرَ الْخَبَرَ، وَتَوَهَّمَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ مَعَ جَلَالَتِهِ وَمَكَانِهِ مِنَ الْعِلْمِ غَلَطَ فِي رِوَايَتِهِ، وَالْخَبَرُ ثَابِتٌ صَحِيحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ إِلَّا أَنَّهُ مَنْسُوخٌ لَا أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ غَلَطَ فِي رِوَايَةِ هَذَا الْخَبَرِ

٢٠١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: مَنْ أَصْبَحَ جُنُبًا فَلَا يَصُمْ. قَالَ: فَانْطَلَقَ أَبُو بَكْرٍ، وَأَبُوهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ حَتَّى دَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، وَعَائِشَةَ، وَكِلَاهُمَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصْبِحُ جُنُبًا ثُمَّ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





يَصُومُ، فَانْطَلَقَ أَبُو بَكْرٍ، وَأَبُوهُ حَتَّى أَتَيَا مَرْوَانَ، فَحَدَّثَاهُ فَقَالَ: عَزَمْتُ عَلَيْكُمَا لَمَا انْطَلَقْتُمَا إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، فَحَدَّثَاهُ، فَقَالَ: أَهُمَا قَالَتَا لَكُمَا؟ قَالَا: نَعَمْ. قَالَ: هُمَا أَعْلَمُ. إِنَّمَا أَنْبَأَنِيهِ الْفَضْلُ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَحَالَ الْخَبَرَ عَلَى مَلِيءٍ صَادِقٍ بَارٍّ فِي خَبَرِهِ، إِلَّا أَنَّ الْخَبَرَ مَنْسُوخٌ، لَا أَنَّهُ وَهْمٌ، لَا غَلَطٌ، وَذَلِكَ أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عِنْدَ ابْتِدَاءِ فَرْضِ الصَّوْمِ عَلَى أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ كَانَ حَظَرَ عَلَيْهِمُ لَا الْأَكْلَ وَالشُّرْبَ فِي لَيْلِ الصَّوْمِ بَعْدَ النَّوْمِ، كَذَلِكَ الْجِمَاعَ، فَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ خَبَرُ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ: مَنْ أَصْبَحَ وَهُوَ جُنُبٌ فَلَا يَصُمْ، فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ قَبْلَ أَنْ يُبِيحَ اللَّهُ الْجِمَاعَ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا أَبَاحَ اللَّهُ تَعَالَى الْجِمَاعَ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ كَانَ لِلْجُنُبِ إِذَا أَصْبَحَ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ أَنْ يَصُومَ ذَلِكَ الْيَوْمَ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَمَّا أَبَاحَ الْجِمَاعَ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ كَانَ الْعِلْمُ مُحِيطًا بِأَنَّ الْمُجَامِعَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ يَطْرُقُهُ فَاعِلًا مَا قَدْ أَبَاحَهُ اللَّهُ لَهُ فِي نَصِّ تَنْزِيلِهِ، وَلَا سَبِيلَ لِمَنْ هَذَا فِعْلُهُ إِلَى الِاغْتِسَالِ إِلَّا بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ، وَلَوْ كَانَ إِذَا أَدْرَكَهُ الصُّبْحُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ لَمْ يَجُزْ لَهُ الصَّوْمُ كَانَ الْجِمَاعُ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ بِأَقَلَّ وَقْتٍ يُمْكِنُ الِاغْتِسَالُ فِيهِ مَحْظُورًا غَيْرَ مُبَاحٍ، وَفِي إِبَاحَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ الْجِمَاعَ فِي جِمَاعِ اللَّيْلِ بَعْدَ مَا كَانَ مَحْظُورًا بَعْدَ النَّوْمِ بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ الْجَنَابَةَ الْبَاقِيَةَ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ بِجِمَاعٍ فِي اللَّيْلِ مُبَاحٌ لَا يَمْنَعُ الصَّوْمَ. فَخَبَرُ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا فِي صَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ مَا كَانَ يُدْرِكُهُ الصُّبْحُ جُنُبًا نَاسِخٌ لِخَبَرِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ؛ لِأَنَّ هَذَا الْفِعْلَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ يُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ بَعْدَ نُزُولِ إِبَاحَةِ الْجِمَاعِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ، فَاسْمَعِ الْآنَ خَبَرًا عَنْ كَاتِبِ الْوَحْيِ لِلنَّبِيِّ ﷺ بِصِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ خَبَرَ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ رَحِمَهُ اللَّهُ.

**باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە دەربارەی سەرزەنشتكردن لە ڕۆژووگرتن، ئەگەر لەشگران بەیانی كردەوە پێش ئەوەی خۆی بشوات، هەندێ لە زانایان لە ماناكەی نەگەیشتوون، بۆیە ئینكاری فەرموودەكەیان كردووە، بەهەڵەدا چوون وایانزانیوە ئەبو هورەیرە ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو شكۆ و پلە وپایەی لە زانستدا هەڵەی كردووە لە ڕیوایەتەكەیدا، بەڵام فەرموودەكە چەسپاوە و تەواوە لە ڕووی گواستنەوە، ئەوە نەبێ حوكمەكەی نەسخ كراوەتەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ هەڵەی نەكردووە لە گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هەر كەس بەیانی كردەوە بە لەشگرانی با ڕۆژوو نەگرێت، وتی: ئەبو بەكر و عەبدوڕەحمان ڕۆیشتن بۆ لای ئوممو سەلەمە و عائیشە (خوا لێیان

---

(١) صحيح.




ڕازی بێ)، هەردووکیان وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی دەکردەوە بەلەشگرانی پاشان بەڕۆژوو دەبوو، دواتر ئەبو بەکر و باوکی ڕۆیشتن بۆ لای مەڕوان، ئەوەیان بۆی باس کرد، وتی: جەختتان لەسەر دەکەمەوە بچن بۆ لای ئەبو هورەیرە ئەوەی بۆ باس بکەن، دواتر ئەوانیش چوون بۆ لای ئەوەیان بۆی باس کرد، وتی: ئەو دووانە پێیان وتن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەوان شارەزاترن. بێگومان ئەوە فەزل بۆی باس کردم.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: فەرموودەکە کەسێکی ڕاستگۆ هێناویەتی، ئەوە نەبێ فەرموودەکە حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوە، نەك ئەو لێی تێکچووبێت یان هەڵەی کردبێت، بێگومان خوای بەرز و مەزن لە سەرەتای فەرزکردنی ڕۆژوو لەسەر ئوممەتی موحەممەد ﷺ قەدەغەی کرد لەسەریان نەك خواردن و خواردنەوە لە شەوی ڕۆژوودا لەدوای خەوتن، بەهەمان شێوە جووتبوونیش، پێدەچێت فەرموودەکەی فەزلی کوڕی عەباس: هەر کەس بەیانی کردەوە و لەشی گران بوو با ڕۆژوو نەگرێت، پێش ئەوە بووبێت خوا ﷻ ڕێگە بدات بە جووتبوون تا دەرچوونی بەرەبەیان، جا کاتێ خوا ﷻ ڕێگەی دا بە جووتبوون تا دەرچوونی بەرەبەیان، لەشگران بۆی هەبوو بەیانی بکاتەوە و بەڕۆژوو بێت پێش ئەوەی خۆی بشوات، چونکە خوا ﷻ کاتێ ڕێگەی دا بە جووتبوون تا بەرەبەیان، گومان لەوەدا نییە لەو کاتەدا خەڵکانێك ئەوەیان دەکرد، لەبەر ئەوە خوا ڕێگەی پێ داوە، جا ئەو کەسەی لەو کاتەدا جووت دەبوو چاری نەبوو هەر دەبووایە دوای دەرچوونی بەرەبەیان خۆی بشۆردایە، جا ئەگەر ڕۆژی بەسەردا بهاتایە پێش ئەوەی خۆی بشوات ڕۆژووەکەی دروست نەبووایە، ئەوە جووتبوون پێش دەرچوونی بەرەبەیان بە کەمترین کات خۆشۆردن قەدەغە بوو و ڕێگەپێدراو نەبوو، چونکە مرۆڤ لە کاتی خۆشۆردن بەرەبەیانی بەسەردا دەهات، جا خوا ﷻ ڕێگەی دا بە جووتبوون لە شەودا دوای خەوتن دوای ئەوەی کە پێشتر قەدەغە بوو، ڕوون بۆیەوە و چەسپا جووتبوون لە شەودا و مانەوە بەلەشگرانی تا بەرەبەیان ڕێگەپێدراوە و ڕێگر نییە لەبەردەم ڕۆژوودا، جا فەرموودەکەی عائیشە و ئوممو سەلەمە دەربارەی بەڕۆژووبوونی پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی بەیانی بەسەردا هات بەلەشگرانییەوە، هەڵوەشێنەرەوەی فەرموودەکەی فەزلی کوڕی عەباسە، چونکە ئەو کردەوەی پێغەمبەرە ﷺ پێدەچێت دوای دابەزینی ڕێگەپێدانی جووتبوون بووبێت




تا دەرچوونی بەرەبەیان، ئێستا گوێ بگرە بۆ فەرموودەی نووسەری وەحی پێغەمبەر ﷺ لەسەر تەواوی ئەوەی فەرموودەکەی فەزلی کوڕی عەباسم لەیەکدایەوە.

**٢٠١٢-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ أَنَّهُ أَخْبَرَ زَيْد بْنَ ثَابِتٍ رضي الله عنه عَنْ قَوْلِ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: مَنِ اطَّلَعَ عَلَيْهِ الْفَجْرُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ وَهُوَ جُنُبٌ لَمْ يَغْتَسِلْ، أَفْطَرَ وَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ؟ فَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَيْنَا الصِّيَامَ، كَمَا كَتَبَ عَلَيْنَا الصَّلَاةَ، فَلَوْ أَنَّ رَجُلًا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَهُوَ نَائِمٌ كَانَ يَتْرُكُ الصَّلَاةَ؟ قَالَ: قُلْتُ لِزَيْدٍ: فَيَصُومُ، وَيَصُومُ يَوْمًا آخَرَ؟ فَقَالَ زَيْدٌ: يَوْمَيْنِ بِيَوْمٍ[1].

واتە: قەبیصەی کوڕی زوئەیب دەگێڕێتەوە، ئەو هەواڵی دا بە زەیدی کوڕی سابت رضي الله عنه دەربارەی وتەکەی ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه کە وتویەتی: هەر کەس بەیانی بەسەردا هات لەمانگی ڕەمەزاندا بەلەشگرانییەوە، بەڕۆژوویش بوو، ئەوە ڕۆژووەکەی شکاوە و واجبە لەسەری قەزای بکاتەوە؟ زەیدی کوڕی سابت رضي الله عنه وتی: بێگومان خوا ڕۆژووی لەسەرمان نووسیوە وەکوو چۆن نوێژی لەسەرمان نووسیوە، ئەگەر کەسێك خەوت و خۆری بەسەردا هات و نوێژی بەیانی نەکرد، ئایا واز لە نوێژەکە دەهێنێ؟ وتی: بە زەیدم رضي الله عنه وت: ڕۆژووەکەی دەگرێ، ڕۆژێکدیکەش دەگرێ؟ زەید رضي الله عنه وتی: دوو ڕۆژ بە ڕۆژێك؟!

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جَنَابَةَ النَّبِيِّ ﷺ الَّتِي أَخَّرَ الْغُسْلَ بَعْدَهَا إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ فَصَامَ، كَانَ مِنْ جِمَاعٍ لَا مِنِ احْتِلَامٍ

**٢٠١٣-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنَ النِّسَاءِ مِنْ غَيْرِ حُلْمٍ، ثُمَّ يَظَلُّ صَائِمًا[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو لەشگرانبوونەی پێغەمبەر ﷺ کە خۆشۆردنی بەهۆیەوە دواخست تا ڕۆژ بوویەوە و دواتر بەڕۆژوو بوو، بەهۆی چوونە لای هاوسەرەکانیەوە بوو نەك بەهۆی خەوبینین

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی دەکردەوە بەلەشگرانی بەهۆی جووتبوونی لەگەڵ خێزانەکانی نەك بەهۆی خەوبینین، پاشان بەردەوام دەبوو لەسەر ڕۆژووەکەی.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّوْمَ جَائِزٌ لِكُلِّ مَنْ أَصْبَحَ جُنُبًا وَاغْتَسَلَ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ وَالزَّجْرِ عَنْ أَنْ يُقَالَ: كَانَ هَذَا خَاصًّا لِلنَّبِيِّ ﷺ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ كُلَّ مَا فَعَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ مِمَّا لَمْ يَجُزْ أَنَّهُ خَاصٌّ لَهُ، فَعَلَى النَّاسِ التَّأَسِّي بِهِ وَاتِّبَاعِهِ ﷺ

**٢٠١٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْتَفْتِيهِ وَهِيَ تَسْمَعُ مِنْ وَرَاءِ الْبَابِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُدْرِكُنِي الصَّلَاةُ وَأَنَا جُنُبٌ أَفَأَصُومُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَأَنَا تُدْرِكُنِي الصَّلَاةُ وَأَنَا جُنُبٌ فَأَصُومُ»، فَقَالَ: لَسْتَ مِثْلَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ فَقَالَ: «وَاللَّهِ- يَعْنِي- : إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لِلَّهِ، وَأَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّقِي»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الرَّجَاءُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَقُولُ: إِنَّهُ جَائِزٌ أَنْ يَقُولَ الْمَرْءُ فِيمَا لَا يَشُكُّ فِيهِ وَلَا يَمْتَرِي: وَأَنَا أَرْجُو أَنْ يَكُونَ كَذَا وَكَذَا، إِذْ لَا شَكَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ مُسْتَيْقِنًا غَيْرَ شَاكٍّ، وَلَا مُرْتَابٍ أَنْ كَانَ أَخْشَى الْقَوْمِ لِلَّهِ وَأَعْلَمَهُمْ بِمَا يَتَّقِي، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي رُوِيَ عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ قَيْسٍ أَنَّهُ قِيلَ لَهُ: أَمُؤْمِنٌ أَنْتَ؟ قَالَ: أَرْجُو، وَلَا شَكَّ وَلَا ارْتِيَابَ أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ كَانَ يَجْرِي عَلَيْهِمْ أَحْكَامُ الْمُؤْمِنِينَ مِنَ الْمُنَاكَحَاتِ، وَالْمُبَايَعَاتِ وَشَرَائِعِ الْإِسْلَامِ، وَقَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ، فَاسْمَعِ الدَّلِيلَ الْوَاضِحَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: إِنِّي لَأَرْجُو، مَا أَعْلَمْتُ أَنَّهُ: قَدْ أَقْسَمَ بِاللَّهِ أَنَّهُ أَشَدُّهُمْ خَشْيَةً.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژوو دروستە بۆ هەموو کەسێك بەیانی بکاتەوە بەلەشگرانی و خۆی بشوات دوای دەرچوونی بەرەبەیان، وە سەرکۆنەکردن لەوەی دەوترێ: ئەوە تایبەت بووە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر شتێك پێغەمبەر ﷺ کردبێتی لەوانەی کە دروست نییە تایبەت بێت بە ئەوەوە، پێویستە لەسەر خەڵك پەیڕەوی بکەن و شوێنی بکەون

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ دەکرد، ئەویش لە پشت دەرگاکەوە گوێی لێ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کاتی نوێژ دێت

---

(١) صحيح.




و منیش لەشم گرانە ئایا بەڕۆژوو ببم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: منیش کاتی نوێژ دێت لەشم گرانە و بەڕۆژوو دەبم، وتی: تۆ وەکوو ئێمە نیت ئەی پێغەمبەری خوا، خوا لە گوناهەکانی پێش و پاشت خۆش بووە، فەرمووی: سوێند بە خوا من ئومێدەوارم لە خواترسترینتان و زاناترینتان بم بە هۆی ئەوەی خۆم دەپارێزم.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم ئومێدخواستنە لەو شێوازەیە کە دەڵێم: دروستە بۆ بەندە لە شتێکدا هیچ گومان و دوودڵی نەبێت بڵێ: من ئومێدەوارم ئاوا و ئاوا بێت، چونکە گومانی تێدا نییە پێغەمبەر ﷺ دڵنیا بووە لەوەی فەرموویەتی هیچ گومان و دوودڵییەکی لەوەدا نەبووە کە ئەو لەخواترسترین و زاناترینی نێو خەڵکە، ئەمەش لەو شێوازەیە کە لە عەلقەمەی کوڕی قەیسەوە گێڕدراوەتەوە کە پێی وترا: تۆ بڕواداریت؟ وتی: ئومێد دەکەم، گومان لەوەدا نییە ئەو یەکێك بوو لەو بڕوادارانەی کە سەرجەم یاسا و ڕێساکانی ئیسلام دەیگرتەوە لە هاوسەرگیری و کڕین و فرۆشتن و دروشمەکانی ئیسلام، بێگومان ئەم بابەتەم لە کتێبی (الْإِيمَان) ڕوون کردۆتەوە، جا گوێ بۆ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا بگرە کە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (إِنِّي لَأَرْجُو) ئەوەی زانیومە ئەو سوێندی خواردووە بە خوا کە ئەو لە خواترسترینیانە.

**٢٠١٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ، فَرَغِبَ عَنْهُ رِجَالٌ، فَقَالَ: «مَا بَالُ رِجَالٍ آمُرُهُمْ بِالْأَمْرِ يَرْغَبُونَ عَنْهُ؟ وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وَأَشَدُّهُمْ خَشْيَةً»[1].

واتە: عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە هەندێ شت، کۆمەڵێك لە پیاوان پێیان ناخۆش بوو، فەرمووی: ئەوە چییە خەڵکانێك هەیە فەرمانیان پێدەکەم بە شتێك پێیان ناخۆشە، سوێند بە خوا من زاناترینیانم بە خواناسی، لە هەمووتان زیاتر لێی دەترسم.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، مَنْ أُبِيحَ لَهُ الْفِطْرُ فِي رَمَضَانَ عِنْدَ الْمُسَافِرِ

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، بِلَفْظَةٍ مُخْتَصَرَةٍ مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ السَّبَبِ الَّذِي قَالَ لَهُ تِلْكَ الْمَقَالَةَ، تَوَهَّمَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ مَنْ لَمْ يَفْهَمِ السَّبَبَ أَنَّ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ غَيْرُ جَائِزٍ حَتَّى أَمَرَ بَعْضُهُمُ الصَّائِمَ فِي السَّفَرِ بِإِعَادَةِ الصَّوْمِ بَعْدُ فِي الْحَضَرِ

---

(١) صحيح.

**٢٠١٦-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ»[1].

**کۆباسی ڕۆژوو لە گەشتدا، کام گەشتیار بۆی هەیە ڕۆژوو نەگرێت لە ڕەمەزاندا باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕۆژووگرتن لە گەشتدا، بە دەستەواژەیەکی کورت بەبێ باسکردنی هۆکاری وتنی ئەو وتەیە، هەندێ لە زانایان بەهەڵەدا چووە ئەوەی کە لە هۆکارەکەی تێنەگەیشتووە وا دەزانێ ڕۆژووگرتن لە گەشتدا دروست نییە، تەنانەت هەندێك لەوانە فەرمانی کردووە بەو کەسەی لە گەشتدا بەڕۆژوو بووە، لە شوێنی نیشتەجێبوونی ڕۆژووەکەی دووبارە بکاتەوە**

واتە: کەعبی کوڕی عاصمی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاکەو پەرستشەوە نییە.

## بَابُ ذِكْرِ السَّبَبِ الَّذِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ

**٢٠١٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عمرو بْنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا قَدِ اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَقَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالُوا: هَذَا رَجُلٌ صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ».

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا قَالَ هَذِهِ الْمَقَالَةَ إِذِ الصَّائِمُ الْمُسَافِرُ غَيْرُ قَابِلٍ يُسْرَ اللَّهِ حَتَّى اشْتَدَّ بِهِ الصَّوْمُ، وَاحْتِيجَ إِلَى أَنْ يُظَلَّ[2].

## باسی هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاکە و پەرستشەوە نییە

واتە: موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەگێڕێتەوە، لە جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە گەشتێکدا) پیاوێکی بینی خەڵك لەسەری کۆبووبوونەوە، وە سێبەری بۆ دروست کرابوو، وتیان:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




ئەم پیاوە بەڕۆژووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاكە و پەرستشەوە نییە بۆتان.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەو قسەی فەرموو چونكە ئەو ڕۆژووگرە لە گەشتەكەیدا ئاسانكاری خوای وەرنەگرتووە، تا ڕۆژووەكەی زۆری بۆی هێنا و پێویستی بەوە بووە سێبەری بۆ بكرێ.

**٢٠١٨-** وَفِي خَبَرِ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ: فَغُشِيَ عَلَيْهِ، فَجَعَلَ يَنْضَحُ الْمَاءَ، أَيْ: عَلَيْهِ. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ، إِنَّمَا قَالَ: «لَيْسَ الْبِرُّ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ»: أَيْ: لَيْسَ الْبِرُّ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ حَتَّى يُغْشَى عَلَى الصَّائِمِ، وَيُحْتَاجُ إِلَى أَنْ يُظَلَّلَ وَيُنْضَحَ عَلَيْهِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ رَخَّصَ لِلْمُسَافِرِ فِي الْفِطْرِ، وَجَعَلَ لَهُ أَنْ يَصُومَ فِي أَيَّامٍ أُخَرَ، وَأَعْلَمَ فِي مُحْكَمِ تَنْزِيلِهِ أَنَّهُ أَرَادَ بِهِمُ الْيُسْرَ لَا الْعُسْرَ فِي ذَلِكَ، فَمَنْ لَمْ يَقْبَلْ يُسْرَ اللَّهِ جَازَ أَنْ يُقَالَ لَهُ: لَيْسَ أَخْذُكَ بِالْعُسْرِ فَيَشْتَدُّ الْعُسْرُ عَلَيْكَ مِنَ الْبِرِّ. وَقَدْ يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ فِي هَذَا الْخَبَرِ: لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ: أَيْ: لَيْسَ كُلُّ الْبِرِّ هَذَا، قَدْ يَكُونُ الْبِرُّ أَيْضًا أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ، وَقَبُولُ رُخْصَةِ اللَّهِ وَالْإِفْطَارِ فِي السَّفَرِ. وَسَأُدَلِّلُ بَعْدُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى صِحَّةِ هَذَا التَّأْوِيلِ[(١)].

واتە: لە فەرموودەكەی سەعیدی كوڕی یەسار هاتووە، لە جابرەوە ﷺ: بێهۆش بوو، دواتر ئاویان دەپرژاند بەسەریدا، پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو، پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمووی: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاكە و پەرستشەوە نییە. واتە: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاكە و پەرستشەوە نییە تا ڕۆژووگر بێهۆش بكات و پێویستی بەوە هەبێت بخرێتە سێبەر و ئاوپرژێن بكرێ، چونكە خوا مۆڵەتی بە گەشتیار داوە ڕۆژوو نەگرێ و لە ڕۆژێكی دیكەدا ڕۆژووەكەی بگرێت، وە لە قورئانەكەیدا ڕایگەیاندووە خوا دەیەوێت (لە ڕۆژووگرتندا) ئاسانكارییان بۆ بكات نەك قورسی و بارگرانی بخاتە سەرشانیان، جا هەر كەسێك ئاسانكاری خوا وەرنەگرێ دروستە پێی بوترێ: كاتێك قورسی و گرانی وەردەگرێ و پێی ناڕەحەت دەبێ لە چاكە و پەرستش نییە. وە دروستە لە فەرموودەكە ئەم مانایە لەیەك بدرێتەوە: (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ) واتە: ڕۆژووگرتن هەموو چاكەیەك نییە لە گەشتدا، هەروەها هەندێ جار چاكە ئەوەیە لە گەشتدا بەڕۆژوو بن، وە وەرگرتنی مۆڵەتی خوا و بەڕۆژوونەبوون لە گەشتدا. دواتر بەویستی خوا بەڵگە دێنمەوە لەسەر ڕاستی ئەم لێكدانەوەیە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي تَسْمِيَةِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ عُصَاةً، مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي أَسْمَاهُمْ بِهَذَا الِاسْمِ تَوَهَّمَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ أَنَّ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ غَيْرُ جَائِزٍ لِهَذَا الْخَبَرِ

**٢٠١٩-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ عَامَ الْفَتْحِ إِلَى مَكَّةَ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ وَصَامَ النَّاسُ، ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ فَرَفَعَهُ حَتَّى نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَهُ، فَقِيلَ لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ: إِنَّ بَعْضَ النَّاسِ قَدْ صَامَ، قَالَ: «أُولَئِكَ الْعُصَاةُ، أُولَئِكَ الْعُصَاةُ»[١].

## باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە كە ئەوانەی لە گەشتدا بەڕۆژوو دەبن ناوی لێناون سەرپێچیكاران، بەبێ باسی ئەو هۆكارەی كە بەهۆیەوە ئەو ناوەی لێناون، هەندێ لە زانایان بەهەڵەدا چوون و وایانزانیوە ڕۆژووگرتن لە گەشتدا دروست نییە لەبەر ئەم فەرموودەیە

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ڕزگاركردنی مەككە لە ڕەمەزاندا دەرچوو بۆ مەككە، ڕۆژووی گرت هەتا گەیشتە (كُرَاعَ الْغَمِيمِ) (ناوی شیوێكە لە پێش عوسفان) خەڵكەكەش بەڕۆژوو بوون، (هەواڵی پێگەیشت ڕۆژوو زۆری بۆ خەڵكەكە هێناوە و ماندووی كردوون)، پاشان داوای قاپێك ئاوی كرد بەرزی كردەوە بۆ لای دەمی خەڵكەكەش تەماشایان دەكرد، ئینجا خواردیەوە، دوای ئەوە پێی وترا هەندێ لە خەڵكەكە هێشتا بەڕۆژوون، فەرمووی: بەڕاستی ئەوانە یاخی و سەرپێچیكارن، بەڕاستی ئەوانە یاخی و سەرپێچیكارن.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا سَمَّاهُمْ عُصَاةً إِذْ أَمَرَهُمْ بِالْإِفْطَارِ وَصَامُوا «وَمَنْ أُمِرَ بِفِعْلٍ وَإِنْ كَانَ الْفِعْلُ مُبَاحًا فَرْضًا وَاجِبًا فَتَرَكَ مَا أُمِرَ بِهِ مِنَ الْمُبَاحِ جَازَ أَنْ يُسَمَّى عَاصِيًا»

**٢٠٢٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَافَرَ فِي رَمَضَانَ، فَاشْتَدَّ الصَّوْمُ عَلَى رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَجَعَلَتْ رَاحِلَتُهُ تَهِيمُ بِهِ تَحْتَ الشَّجَرَةِ، فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُفْطِرَ، ثُمَّ دَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِإِنَاءٍ، فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ، ثُمَّ شَرِبَ وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە ناوی لێنان بە سەرپێچیکەران، چونکە فەرمانی پێ کردن بە شکاندنی ڕۆژووەکانیان، بەڵام ئەوان هەر بەردەوام بوون لەسەر ڕۆژووەکەیان، وە هەر کەس فەرمانی پێ کرا بە کردەوەیەك ئەگەرچی ئەو کردەوەیە ڕێگەپێدراو بێت یان فەرز بێت یان واجب، وازی لەوە هێنا کە فەرمانی پێ کراوە لەو شتەی کە ڕێگەپێدراوە دروستە پێی بوترێ سەرپێچیکەر**

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا گەشتی کرد، ڕۆژوو زۆری هێنا بۆ پیاوێك لە هاوەڵەکانی، وشترەکەی دەیبرد بۆ سێبەری دارەکان، هەواڵ درا بە پێغەمبەر ﷺ، فەرمانی پێ کرد ڕۆژوەکەی بشکێنێت، پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای قاپێ ئاوی کرد و ئینجا لەسەر دەستی دانا، پاشان لێی خواردەوە و خەڵکەکەیش تەماشایان دەکرد.

**٢٠٢١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ فَرَغِبَ عَنْهُ رِجَالٌ، فَقَالَ: «مَا بَالُ رِجَالٍ آمُرُهُمْ بِالْأَمْرِ يَرْغَبُونَ عَنْهُ؟ وَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە هەندێ شت، کۆمەڵێك لە پیاوان پێیان ناخۆش بوو، فەرمووی: ئەوە چییە خەڵکانێك هەیە فەرمانیان پێ دەکەم بە شتێك پێیان ناخۆشە، سوێند بە خوا من زاناترینیانم بە خواناسی، لە هەمووتان زیاتر لێی دەترسم.

**٢٠٢٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَى عَلَى نَهَرٍ مِنْ مَاءِ السَّمَاءِ، مِنْ هَذَا الْجِنْسِ أَيْضًا. قَالَ فِي الْخَبَرِ: إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي رَاكِبٌ، وَأَنْتُمْ مُشَاةٌ، إِنِّي أَيْسَرُكُمْ، فَهَذَا الْخَبَرُ دَلَّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَامَ وَأَمَرَهُمْ بِالْفِطْرِ فِي الِابْتِدَاءِ، إِذْ كَانَ الصَّوْمُ لَا يَشُقُّ عَلَيْهِ، إِذْ كَانَ رَاكِبًا، لَهُ ظَهْرٌ، لَا يَحْتَاجُ إِلَى الْمَشْيِ، وَأَمَرَهُمْ بِالْفِطْرِ، إِذْ كَانُوا مُشَاةً يَشْتَدُّ عَلَيْهِمُ الصَّوْمُ مَعَ الرَّجَّالَةِ، فَسَمَّاهُمْ ﷺ عُصَاةً إِذِ امْتَنَعُوا مِنَ الْفِطْرِ بَعْدَ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ إِيَّاهُمْ بَعْدَ عِلْمِهِ أَنْ يَشْتَدَّ الصَّوْمُ عَلَيْهِمْ، إِذْ لَا ظَهْرَ لَهُمْ، وَهُمْ يَحْتَاجُونَ إِلَى الْمَشْيِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەبو سەعید ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ هاتە سەر ڕووبارێك ئاو بەهۆی بارانەوە دروست بووبوو، هەروەها ئەویش بەهەمان شێوەیە. لە فەرموودەکەدا فەرمووی: من وەکوو ئێوە نیم، من سوارم و ئێوەیش پیادەن، (ڕۆژووگرتن) بۆ من ئاسانترە لە هەمووتان، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ سەرەتا بەڕۆژوو بوو، وە لە سەرەتاوە فەرمانیشی پێ کردن ڕۆژووەکە بشکێنن، چونکە ڕۆژوو بارگرانی لەسەری دروست نەدەکرد، لەبەرئەوەی سوار بوو وشتری پێ بوو پێویستی بە ڕێکردن نەدەکرد، فەرمانیشی کرد بە ئەوان ڕۆژووەکەیان بشکێنن، چونکە ئەوان پیادە بوون ڕۆژوو بۆیان گران بوو لەگەڵ ڕێکردندا، بۆیە ناوی لێنان سەرپێچیکەران، ئەویش لە کاتێکدا بوو کە ڕێگرییان کرد لە ڕۆژووشکاندن دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن، دوای ئەوەی زانی ڕۆژوو قورسایی لەسەر شانیان دروست دەکات، چونکە وڵاخیان نەبوو سواری ببن و پێویستیان بە ڕێکردن هەبوو.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ أَصْحَابَهُ بِالْفِطْرِ عَامَ فَتْحِ مَكَّةَ إِذِ الْفِطْرُ أَقْوَى لَهُمْ عَلَى الْحَرْبِ، لَا أَنَّ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ غَيْرُ جَائِزٍ

**٢٠٢٣**- عَنْ قَزْعَةَ قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ ﷺ وَهُوَ مَكْثُورٌ عَلَيْهِ، فَلَمَّا تَفَرَّقَ النَّاسُ عَنْهُ قُلْتُ: لَا أَسْأَلُكَ عَمَّا يَسْأَلُكَ هَؤُلَاءِ عَنْهُ، وَسَأَلْتُهُ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى مَكَّةَ وَنَحْنُ صِيَامٌ، فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ، فَكَانَتْ رُخْصَةً، فَمِنَّا مَنْ صَامَ، وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ»، ثُمَّ نَزَلْنَا مَنْزِلًا آخَرَ، فَقَالَ: «إِنَّكُمْ مُصَبِّحُو عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ، فَأَفْطِرُوا»، فَكَانَتْ عَزْمَةً فَأَفْطَرْنَا، ثُمَّ قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَصُومُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ بَيِّنٌ وَأَوْضَحَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمَّاهُمْ عُصَاةً إِذْ عَزَمَ عَلَيْهِمْ فِي الْفِطْرِ لِيَكُونَ أَقْوَى لَهُمْ عَلَى عَدُوِّهِمْ، إِذْ قَدْ دَنَوْا مِنْهُمْ، وَيَحْتَاجُونَ إِلَى مُحَارَبَتِهِمْ، فَلَمْ يَأْتَمِرُوا لِأَمْرِهِ؛ لِأَنَّ خَبَرَ جَابِرٍ فِي عَامِ الْفَتْحِ، وَهَذَا الْخَبَرُ فِي تِلْكَ السَّفْرَةِ، أَيْضًا فَلَمَّا عَزَمَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِمْ بِالْفِطْرِ لِيَكُونَ الْفِطْرُ أَقْوَى لَهُمْ، فَصَامُوا حَتَّى كَانَ يُغْشَى عَلَى بَعْضِهِمْ، وَيَحْتَاجُ إِلَى أَنْ يُظَلَّلَ، وَيُنْضَحَ الْمَاءُ

---

(١) صحيح.

عَلَيْهِ، فَيَضْعُفُوا عَنْ مُحَارَبَةِ عَدُوِّهِمْ، جَازَ أَنْ يُسَمِّيَهُمْ عُصَاةً، إِذْ أَمَرَهُمْ بِالتَّقَوِّي لِعَدُوِّهِمْ، فَلَمْ يُطِيعُوا، وَلَمْ يَتَقَوَّوْا لَهُمْ.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی ڕۆژوو بشکێنن لە کاتی ئازادکردنی مەککەدا، چونکە ڕۆژوونەگرتن بەهێزو چالاکی دەکردن لەسەر جەنگ، نەك ڕۆژوو لە گەشتدا دروست نەبێ**

واتە: قەزعە دەڵێ: هاتم بۆ لای ئەبو سەعید ﷺ خەڵکێکی زۆر لە دەوری بوون، کاتێ خەڵکەکە لێی دوور کەوتنەوە، وتم: پرسیاری شتێکت لێ ناکەم کە ئەوان پرسیاریان لێ دەکردی، پرسیارم لێ کرد دەربارەی ڕۆژووگرتن لە گەشتدا، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتمان کرد بۆ مەککە ئێمە بەڕۆژوو بووین، دواتر دابەزینە ناوچەیەك بۆ پشوودان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئێوە لە دوژمن نزیك بوونەتەوە، ڕۆژوونەگرتن بە هێزتان دەکات، جا ڕۆژووشکاندن مۆڵەت بوو، تیاماندا بوو ڕۆژووی گرت، تیاشماندا بوو شکاندی، دواتر دابەزیە جێگایەکی دیکە بۆ پشوودان، فەرمووی: ئێوە سبەینێ ڕووبەڕووی دوژمن دەبنەوە، ڕۆژوونەگرتن بەهێزتان دەکات بەرانبەر بە دوژمن، ڕۆژوو مەگرن، جا پێداگری کرد ئێمەیش ڕۆژوومان نەگرت، پاشان وتی: دوای ئەوە دەمبینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەشتدا بەڕۆژوو دەبووین.

ئەبو بەکر وتی: ئەم فەرموودەیە ڕوون و ئاشکرایە کە پێغەمبەر ﷺ پێداگری کرد ڕۆژوو نەگرن بۆ ئەوەی بەهێزتر بن لە بەرانبەر دوژمن کاتێك کە نزیك بوون لێیانەوە و پێویست بوو لەگەڵیان بجەنگن، بەڵام ئەوان فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکرد، چونکە فەرموودەکەی جابر لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا بوو، ئەم فەرموودەیەش لە هەمان گەشتدا بوو، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ پێداگری لێ کردن ڕۆژوو نەگرن بۆ ئەوەی بەهێزتر بن بەرانبەر بە دوژمن، ئەوانیش بەڕۆژوو بوون تا هەندێکیان بێهۆش بوون، پێویستی بەوە بوو بخرێنە سێبەر و ئاو بپرژێنرێ بەسەریاندا، بۆیە لاواز بوون لە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، دروستە بە خەڵکانێکی لەو جۆرە بوترێ: سەرپێچیکەر و یاخی، چونکە فەرمانی پێ کردن بە خۆبەهێزکردن بۆ گیان دوژمنەکانیان، بەڵام ئەوان گوێڕایەڵییان نەکرد و خۆیان بەهێز نەکرد بەرانبەریان.



## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ رَغْبَةً عَنْهَا «وَجَائِزٌ أَنْ يُسَمَّى تَارِكُ السُّنَّةِ عَاصِيًا إِذَا تَرَكَهَا رَغْبَةً عَنْهَا لَا بِتَرْكِهَا، إِذِ التَّرْكُ غَيْرُ مَعْصِيَةٍ، وَفِعْلُهَا فَضِيلَةٌ»

٢٠٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[١].

**باسی هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەوەی حەزی پێی نەبێت، وە دروستە ئەو کەسەی واز لە سوننەت دەهێنێ پێی بوترێ سەرپێچیکەر، ئەگەر وازی لێ هێنا بەهۆی ئەوەی حەزی پێ نەکات نەک تەنها بەهۆی وازهێنانی، چونکە وازهێنان لە سوننەت سەرپێچی نییە، ئەنجامدانیشی فەزڵ و چاکەیە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس پشتی لە سوننەتی من کرد ئەوە لە من نییە (واتە: لەسەر ڕێبازی من نییە).

## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ فَرْضِ الصَّوْمِ عَنِ الْمُسَافِرِ «إِذْ هُوَ مُبَاحٌ لَهُ الْفِطْرُ فِي السَّفَرِ عَلَى أَنْ يَصُومَ فِي الْحَضَرِ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ، لَا أَنَّ الْفَرْضَ سَاقِطٌ عَنْهُ لَا تَجِبُ عَلَيْهِ إِعَادَتُهُ». قال اللَّهُ تعالى: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ١٨٤﴾ البقرة.

٢٠٢٥- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الْقُشَيْرِيِّ خَرَّجْتُهُ بَعْدُ فِي إِبَاحَةِ الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ لِلْحَامِلِ وَالْمُرْضِعِ[٢].

**باسی هەڵگرتنی ڕۆژووی فەرز لەسەر گەشتیار، چونکە ڕێگەی پێ دراوە لە گەشتدا بەڕۆژوو نەبێت بە مەرجێ لە شوێنی نیشتەجێبوونی لە ڕۆژەکانی دیکەدا ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە، نەک بە مانای ئەوەی فەرزەکەی لەسەر هەڵگیراوە و پێویست نییە لەسەری دووبارەی بکاتەوە، خوا تعالى فەرموویەتی: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ١٨٤﴾، واتە: هەر کەس لە ئێوە نەخۆش بوو، یان لە سەفەر بوو، با لە ڕۆژەکانی دیکەدا بیگرێتەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واته: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیکی قوشەیری دواتر هێناومانەتەوە سەبارەت بە ڕێگەپێدانی ڕۆژوونەگرتنی ڕەمەزان بۆ ئافرەتی دووگیان و شیردەر.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْفِطْرَ فِي السَّفَرِ رُخْصَةٌ لَا أَنَّ حَتْمًا عَلَيْهِ أَنْ يُفْطِرَ

٢٠٢٦- عَنْ أَبِي مُرَاوِحٍ عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَجِدُ بِي قُوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هِيَ رُخْصَةٌ مِنَ اللَّهِ، فَمَنْ أَخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصُومَ فَلَا جُنَاحٌ عَلَيْهِ»، قَالَ: وَفِي خَبَرِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَعَلَيْكُمْ بِرُخْصَةِ اللَّهِ الَّتِي رَخَّصَ لَكُمْ، فَاقْبَلُوهَا»[١].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ڕۆژوونەگرتن لە گەشتدا مۆڵەتە نەك پێویست بێ لەسەری هەر بەڕۆژوو نەبێ

واته: ئەبو موڕاویح دەگێڕێتەوە، لە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمییەوە ﷺ، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هێز و توانا لە خۆمدا بەدی دەکەم لە گەشتدا بەڕۆژوو بم، ئایا گوناهبار نابم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە مۆڵەتێکە لەلایەن خواوە، هەر کەس دەستی پێوە گرت ئەوە چاکە، هەر کەسیش پێی خۆش بوو بەڕۆژوو بێت گوناهی ناگات، وتی: وە لە فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی سەوبان هاتووە، لە جابرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست بگرن بە مۆڵەتی خواوە کە بۆی داناون، وەریبگرن.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ فِي السَّفَرِ فِي رَمَضَانَ لِقَبُولِ رُخْصَةِ اللَّهِ الَّتِي رَخَّصَ لِعِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ، إِذِ اللَّهُ يُحِبُّ قَابِلَ رُخْصَتِهِ

٢٠٢٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُتْرَكَ مَعْصِيَتُهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چاکتر وایە لە گەشتدا ڕۆژوو نەگیرێ لەبەر وەرگرتنی ئەو مۆڵەتەی خوا داویەتی بە بەندە باوەڕدارەکانی، چونکە خوا ئەو کەسەی خۆش دەوێ مۆڵەتەکانی وەربگرێ**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوای گەورە پێی خۆشە مۆڵەتەکانی وەربگیرێ، وەك چۆن پێی خۆشە واز لە سەرپێچیکردنی بهێنرێ.

**بَابُ ذِكْرِ تَخْيِيرِ الْمُسَافِرِ بَيْنَ الصَّوْمِ وَالْفِطْرِ، إِذِ الْفِطْرُ رُخْصَةٌ، وَالصَّوْمُ جَائِزٌ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ: لَيْسَ الْبِرُّ، وَ وَلَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ، عَلَى مَا تَأَوَّلْتُ؛ لِأَنَّ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ، إِذْ مَا لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ، فَمَعْصِيَةٌ، وَلَوْ كَانَ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ مَعْصِيَةً، لَمَا جَعَلَ لِلْمُسَافِرِ الْخِيَارَ بَيْنَ الطَّاعَةِ وَالْمَعْصِيَةِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ خَيَّرَ الْمُسَافِرَ بَيْنَ الصَّوْمِ وَالْإِفْطَارِ**

**٢٠٢٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيَّ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ، وَكَانَ رَجُلًا يَسْرُدُ الصَّوْمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَنْتَ بِالْخِيَارِ إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[1].

**باسی سەرپشککردنی گەشتیار لە نێوان ڕۆژووگرتن و ڕۆژوونەگرتن، چونکە ڕۆژوونەگرتن مۆڵەتە، ڕۆژووگرتنیش دروستە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (لَيْسَ الْبِرُّ)، وە (وَلَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ) بەو شێوەی لێکمدایەوە، چونکە ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە چاکە نییە، هەر شتێکیش چاکە نەبێت ئەوە سەرپێچییە، ئەگەر ڕۆژوو لە گەشتدا سەرپێچی بووایە، ئیتر بۆچی گەشتیاری سەرپشك دەکرد لە نێوان گوێڕایەڵی سەرپێچیدا، پێغەمبەر ﷺ گەشتیاری سەرپشککرد لە ڕۆژووگرتن و ڕۆژوونەگرتن**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕۆژووگرتن لە گەشتدا، ئەو پیاوە بەردەوام بەڕۆژوو دەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ سەرپشکی ئەگەر ویستت بەڕۆژوو بە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

---

(١) صحيح.

**٢٠٢٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﭬ، أَنَّهُمَا سَافَرَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ يَصُومُ الصَّائِمُ وَيُفْطِرُ الْمُفْطِرُ فَلَا يَعِيبُ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ، وَلَا الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ(١).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری و جابری کوڕی عەبدوڵا ﭬ دەگێڕنەوە، ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ گەشتیان کرد (لە مانگی ڕەمەزاندا) تیایاندا بوو بەڕۆژوو بوو، وە تیایاندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، نە ڕۆژوونەگر ڕەخنەی لە ڕۆژووگر دەگرت، نە ڕۆژووگر ڕەخنەی لە ڕۆژوونەگر دەگرت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ لِمَنْ قَوِيَ عَلَيْهِ وَالْفِطْرِ لِمَنْ ضَعُفَ عَنْهُ

**٢٠٣٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﭬ قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، فَلَمْ يَعِبِ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ، وَلَا الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ مَنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ أَنَّ ذَلِكَ حَسَنٌ جَمِيلٌ، وَمَنْ وَجَدَ ضَعْفًا فَأَفْطَرَ فَذَلِكَ حَسَنٌ جَمِيلٌ(٢).

## باسی بەچاکدانانی ڕۆژووگرتن لە گەشتدا بۆ ئەو کەسەی توانای هەیە بەڕۆژوو بێت، وە ڕۆژوونەگرتن بۆ ئەو کەسەی توانای نییە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﭬ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتمان کرد لە ڕەمەزاندا، تیاماندا بوو بەڕۆژوو بوو، وە تیاماندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، نە ڕۆژوونەگر ڕەخنەی لە ڕۆژووگر دەگرت، نە ڕۆژووگر ڕەخنەی لە ڕۆژوونەگر دەگرت، جا پێیان وا بوو هەر کەس توانای بوو بەڕۆژوو بێت، ئەوە چاکە و جوانە، هەر کەسیش توانای نەبووو بەڕۆژوو نەبێت، ئەویش هەر چاك و جوانە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ فِي السَّفَرِ إِذَا عَجَزَ عَنْ خِدْمَةِ نَفْسِهِ إِذَا صَامَ

**٢٠٣١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَأُتِيَ بِطَعَامٍ، فَقَالَ لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: «ادْنُوَا فَكُلَا»، فَقَالَا: إِنَّا صَائِمَانِ، فَقَالَ: «اعْمَلُوا لِصَاحِبَيْكُمْ، ارْحَلُوا لِصَاحِبَيْكُمْ، ادْنُوَا فَكُلَا»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده معلول بالإرسال.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ أَيْضًا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي ذَكَرْتُ قَبْلُ أَنَّ لِلصَّائِمِ فِي السَّفَرِ الْفِطْرَ بَعْدَ مُضِيِّ بَعْضِ النَّهَارِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَهُمَا بِالْأَكْلِ بَعْدَ مَا أَعْلَمَاهُ أَنَّهُمَا صَائِمَانِ.

## باسی چاکتر وایە ڕۆژووەوان لە گەشتدا ڕۆژووەکەی بشکێنێ ئەگەر نەیتوانی خزمەتی خۆی بکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنێکی بۆ هێنرا لە (مَرُّ الظَّهْرَانِ) (ناوی شیوێکە لە نزیك مەککە) بە ئەبو بەکر و عومەری فەرموو: فەرموون نزیك ببنەوە بخۆن، وتیان: ئێمە بەڕۆژووین، فەرمووی: یارمەتیان بدەن و کاروانییەکەیان بۆ ئامادە بکەن، نزیك ببنەوە بخۆن.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەروەها ئەم فەرموودەیە لەو شێوازەیە پێشتر باسم کرد ڕۆژووەوان بۆی هەیە لە گەشتدا ڕۆژووەکەی بشکێنێ دوای ڕۆیشتنی بەشێك لە ڕۆژ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن بە خواردن دوای ئەوەی ئاگاداریان کردەوە ئەوان بەڕۆژوون.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُفْطِرَ الْخَادِمَ فِي السَّفَرِ أَفْضَلُ مِنَ الصَّائِمِ الْمَخْدُومِ فِي السَّفَرِ

**٢٠٣٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي السَّفَرِ، فَصَامَ بَعْضٌ وَأَفْطَرَ بَعْضٌ، فَتَحَزَّمَ الْمُفْطِرُونَ وَعَمِلُوا، وَضَعُفَ الصُّوَّامُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ، فَقَالَ ﷺ فِي ذَلِكَ: «ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ»[1].

## باسی ئەو کەسەی ڕۆژوو ناگرێ و خزمەت دەکات لە گەشتدا، چاکترە لەو کەسەی ڕۆژوو دەگرێ و خزمەتی دەکرێ لە گەشتدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا بوو، هەندێکیان بەڕۆژوو بوون و هەندێکیشیان بەڕۆژوو نەبوون، ئەوانەی کە بەڕۆژوو نەبوون هەستان بە ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەکان، ئەوانەیشی بەڕۆژوو بوون نەیانتوانی ئیشوکارەکان

---

(١) صحيح.





ڕاپەڕینن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانەی ئەمڕۆ بەڕۆژوو نەبوون پاداشتەکەیان بەدەست هێنا.

**٢٠٣٣-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا فِي يَوْمٍ حَارٍّ شَدِيدِ الْحَرِّ، فَمِنَّا مَنْ يَتَّقِي الشَّمْسَ بِيَدِهِ، وَأَكْثَرُنَا ظِلًّا صَاحِبُ الْكِسَاءِ يَسْتَظِلُّ بِهَا الصَّائِمُونَ، وَقَامَ الْمُفْطِرُونَ، فَضَرَبُوا الْأَبْنِيَةَ، وَسَقُوا الرِّكَابَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە لە گەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، تیاماندا بوو بەڕۆژوو بوو، وە تیاماندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا دابەزینە جێگایەك بۆ پشوودان، تیاماندا بوو بە دەستی خۆی لە خۆرەکە خۆی دەپاراست، ئەوەمان زۆرترین سێبەری هەبوو خاوەن پارچە پۆشاکێك بوو ڕۆژووەوانەکان دەچوونە سێبەری، ئەوانەش بەڕۆژوو نەبوون هەستان دەواریان هەڵدا و ئاوی وشترەکانیان دا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوانەی ئەمڕۆ بەڕۆژوو نەبوون پاداشتەکەیان بەدەست هێنا.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي صَوْمِ بَعْضِ رَمَضَانَ، وَفِطْرِ بَعْضٍ فِي السَّفَرِ

**٢٠٣٤-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ فِي رَمَضَانَ حَتَّى بَلَغَ الْكَدِيدَ ثُمَّ أَفْطَرَ[٢].

## باسی مۆڵەتدان بەڕۆژووگرتنی هەندێك لە ڕۆژووی ڕۆژی ڕەمەزان و نەگرتنی هەندێکی لە گەشتدا

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لەوبارەوە فەرموودەی ئیبنو عەباس ﷺ هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژوو بوو لەساڵی ئازادکردنی مەککە تا گەیشتە (الكَدِيدِ) (شوێنێکە لە نێوان عوسفان و قودەید) پاشان ڕۆژووەکەی شکاند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ تَوَهَّمَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ
## أَنَّ الْفِطْرَ فِي السَّفَرِ نَاسِخٌ لِإِبَاحَةِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ

**٢٠٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷻ قَالَ: صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ حَتَّى إِذَا بَلَغَ الْكَدِيدَ أَفْطَرَ، وَإِنَّمَا يُؤْخَذُ بِالْآخِرِ فَالْآخِرِ مِنْ قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قال سفيان لا أدري هذا من قول بن عباس أو من قول عبيد الله أو من قول الزهري[١].

## باسی فەرموودەیەك هەندێ لە زانایان بەهەڵەدا چوون و وایانزانیوە بەڕۆژوونەبوون لە گەشتدا حوكمی ڕێگەپێدانی بەڕۆژووبوونی هەڵوەشاندۆتەوە (نەسخ كردۆتەوە)

واتە: ئیبنو عەباس ﷻ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژوو بوو لە ساڵی ئازادكردنی مەككە تا گەیشتە (الكَدِيدِ) (شوێنێكە لە نێوان عوسفان و قودەید) لەوێ ڕۆژووەكەی شكاند. بێگومان كار بە دوایین دەكرێ، دوایین وتە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (كە ڕۆژوونەگرتنە لە گەشتدا) سوفیان (كە یەكێكە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: نازانم ئەمە لە وتەی ئیبنو عەباسە یان لە وتەی عوبەیدوڵایە یان لە وتەی زوهرییە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ عَلَى أَنَّ هَذِهِ الْكَلِمَةَ:
## وَإِنَّمَا يُؤْخَذُ بِالْآخِرِ، لَيْسَ مِنْ قَوْلِ ابْنِ عَبَّاسٍ

**٢٠٣٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷻ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ يُرِيدُ مَكَّةَ، فَصَامَ حَتَّى أَتَى عُسْفَانَ، فَدَعَا بِإِنَاءٍ، فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ، حَتَّى نَظَرَ إِلَيْهِ النَّاسُ، ثُمَّ أَفْطَرَ وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: «مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ كَانَ يَرَى صَوْمَ النَّبِيِّ ﷺ فِي السَّفَرِ فِي الِابْتِدَاءِ، وَإِفْطَارَهُ بَعْدُ، هَذَا مِنَ الْجِنْسِ الْمُبَاحِ أَنَّ كِلَا الْفِعْلَيْنِ جَائِزٌ، لَا أَنَّ إِفْطَارَهُ بَعْدَ بُلُوغِهِ عُسْفَانَ كَانَ نَسْخًا لِمَا تَقَدَّمَ مِنْ صَوْمِهِ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ڕوونکردنەوە لەسەر ئەوەی ئەم وشەیە: (وَإِنَّمَا يُؤْخَذُ بِالْآخِرِ)، واتە: بێگومان کار بە دوایین دەکرێ، وتەی ئیبنو عەباس نییە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە دەرچوو بە مەبەستی مەککە، بەڕۆژوو بوو تا گەیشتە (عُسْفَانَ) (گوندێکە لە نێوان مەککە و مەدینە سی و شەش میل لە مەککەوە دوورە)، دواتر داوای ئاوی کرد، ئینجا کردی بە دەستیدا تا خەڵکەکە تەماشایان کرد، پاشان ڕۆژووەکەی شکاند، جا ئیبنو عەباس دەیوت: هەر کەس ویستی بەڕۆژوو بوو هەر کەسیش ویستی بەڕۆژوو نەبوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکات ئیبنو عەباس پێغەمبەری ﷺ بینی لە گەشتدا سەرەتا بەڕۆژوو بوو، دواتریش شکاندی، ئەمەش لەو شێوازەیە کە هەردوو کردەوەکە دروستە، نەك ڕۆژووشکاندنی دوای گەیشتنی بە عوسفان هەڵوەشێنەرەوەی حوکمی ڕۆژووگرتنەکەی بێت کە لە پێشەوە گرتی.

## بَابُ ذِكْرِ دَلِيلٍ ثَانٍ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْفِطْرِ عَامَ الْفَتْحِ لَمْ يَكُنْ بِنَاسِخٍ لِإِبَاحَتِهِ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ

**٢٠٣٧**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَصُومُ بَعْدَ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ[١].

## باسی بەڵگەی دووەم لەسەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە شکاندنی ڕۆژوو نەسخکەرەوەی ڕێگەپێدانی نەبووە بە ڕۆژووگرتن لە گەشتدا

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: دوای ئەوە دەمبینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا بەڕۆژوو دەبووین، لە پێشەوە باسم کرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ فِي السَّفَرِ لِمَنْ قَدْ صَامَ بَعْضَهُ فِي الْحَضَرِ، خِلَافَ مَذْهَبِ مَنْ أَوْجَبَ عَلَيْهِ الصَّوْمَ فِي السَّفَرِ إِذَا كَانَ قَدْ صَامَ بَعْضَهُ فِي الْحَضَرِ، تَوَهَّمَ أَنَّ قَوْلَهُ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة، أَنَّ مَنْ شَهِدَ بَعْضَ الشَّهْرِ وَهُوَ حَاضِرٌ غَيْرُ مُسَافِرٍ فَوَجَبَ عَلَيْهِ صَوْمُ جَمِيعِ الشَّهْرِ، وَإِنْ سَافَرَ فِي بَعْضِهِ

**٢٠٣٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِلَيْلَتَيْنِ خَلَتَا مِنْ رَمَضَانَ، فَخَرَجْنَا صُوَّامًا، حَتَّى بَلَغْنَا الْكَدِيدَ أُمِرْنَا بِالْفِطْرِ، فَأَصْبَحْنَا شَرِجِينَ، مِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، حَتَّى إِذَا بَلَغْنَا مَرَّ الظَّهْرَانِ، أَعْلَمَنَا بِلِقَاءِ الْعَدُوِّ، أُمِرْنَا بِالْفِطْرِ، فَأَفْطَرْنَا[1].

## باسی مۆڵەتدان بە شکاندنی ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا لە کاتی گەشتکردن، بۆ ئەو کەسەی بەشێك لە ڕۆژەکە بەڕۆژوو بووە لە شوێنی نیشتەجێبوون، پێچەوانەی مەزهەبی ئەو کەسەی پێی وایە ئەگەر بەشێك لە ڕۆژەکە بەڕۆژوو بووبێ لە شوێنی نیشتەجێبوونی ڕۆژووی لەسەر واجب دەبێت لە گەشتدا، بەهەڵەدا چووە لە تێگەیشتن لە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴿١٨٥﴾ ﴾، بێگومان هەر کەس لە شوێنی نیشتەجێبوونی ئامادەی هەندێك لە مانگەکە بوو نەك لە گەشتدا، واجبە لەسەری هەموو مانگەکە بەڕۆژوو بێت، ئەگەرچی لە هەندێکیشیدا گەشتی کرد

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین دوو شەو تێپەڕ بوو لە ڕەمەزان، بە زمانی بەڕۆژووەوە دەرچووین تا گەیشتین لە (الكَدِيدِ) (شوێنێکە لە نێوان عوسفان و قودەید) فەرمانمان پێکرا ڕۆژوو بشکێنین، بووین بە دوو بەشەوە، تیاماندا بوو بەڕۆژوو بوو، وە تیاماندا بوو بەڕۆژوو نەبوو، تا گەیشتین بە (مَرُّ الظَّهْرَانِ) (ناوی شیوێکە لە نزیك مەککە) ئاگادار کراینەوە بە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، وە فەرمانیشمان پێ کرا ڕۆژوو بشکێنین، ڕۆژووەکەمان شکاند.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ فِي السَّفَرِ يَوْمًا قَدْ مَضَى بَعْضُهُ وَالْمَرْءُ نَاوٍ لِلصَّوْمِ فِيهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ خَبَرَ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ

**٢٠٣٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ وَمَعَهُ أَصْحَابُهُ، فَشَقَّ عَلَيْهِمُ الصَّوْمُ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ، فَشَرِبَ وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ[1].

## باسی ڕێگە دراوە بە ڕۆژووشكاندن لە مانگی ڕەمەزان لە كاتی گەشتكردن، لە كاتێكدا بەندە نییەتی ڕۆژووی هێنا بێت، ئەبو بەكر دەڵێ: فەرموودەكەی ئەبو سەعیدی خودریم لەم بارەیەوە باس كرد

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێكدا بوو هاوەڵانیشی لەگەڵ بوو، ڕۆژوو زۆری بۆ هێنان، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای دەفرێ ئاوی كرد، پاشان بەسەر وشترەكەیەوە لێی خواردەوە، خەڵكەكەیش تەماشایان دەكرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْفِطْرِ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يَخْرُجُ الْمَرْءُ فِيهِ مُسَافِرًا مِنْ بَلَدِهِ، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، ضِدَّ مَذْهَبَ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّوْمِ مُقِيمًا، ثُمَّ سَافَرَ لَمْ يَجُزْ لَهُ الْفِطْرُ، وَإِبَاحَةِ الْفِطْرِ إِذَا جَاوَزَ الْمَرْءُ بُيُوتَ الْبَلْدَةِ الَّتِي يَخْرُجُ مِنْهَا وَإِنْ كَانَ قَرِيبًا يَرَى بُيُوتَهَا

**٢٠٤٠-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: رَكِبْتُ مَعَ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ ﷺ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفِينَةٍ مِنَ الْفُسْطَاطِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَدَفَعَ، ثُمَّ قَرَّبَ غَدَاءَهُ، فَقَالَ: اقْتَرِبْ، فقُلْتُ: أَلَسْتَ تَرَى الْبُيُوتَ؟ فَقَالَ أَبُو بَصْرَةَ: أَتَرْغَبُ عَنْ سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟[2]

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَسْتُ أَعْرِفُ كُلَيْبَ بْنَ ذُهْلٍ، وَلَا عُبَيْدَ بْنَ جُبَيْرٍ، وَلَا أَقْبَلُ دِينَ مَنْ لَا أَعْرِفُهُ بِعَدَالَةٍ.

**باسی ڕێگەدان بەڕۆژووشكاندن لەو ڕۆژەی بەندە تیایدا لە شارەكەی خۆی دەردەچێ بە مەبەستی گەشتكردن، ئەگەر فەرموودەكە تەواو بێت، دژی مەزهەبی ئەو كەسەی كە گومان دەبات ئەگەر بەندە لە شوێنی نیشتەجێبوونی دەستی كرد بەڕۆژووگرتن، پاشان سەفەری كرد دروست**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**نییە بۆی ڕۆژووەکەی بشکێنێ، ڕێگەدان بەڕۆژووشکاندن، ئەگەر بەندە خانووەکانی شارەکەی تێپەڕاند ئەگەرچی نزیکیش بوو و خانووەکانی دەبینی**

واتە: عوبەیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: لەگەڵ ئەبو بەصرەی غیفاری ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ سواری کەشتییەك بووم لە شارێکەوە، لە مانگی ڕەمەزاندا، دواتر دەستی بە ڕۆیشتن کرد، پاشان خواردنی نزیك کردەوە، وتی: نزیك ببەرەوە، وتم: ئایا خانووەکان نابینی؟ ئەبو بەصرە وتی: ئایا پشت دەکەی لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ؟

ئەبو بەکر دەڵێ: کولەیبی کوڕی زوهل و عوبەیدی کوڕی جوبەیر ناناسم، دین لە کەسێك وەرناگرم نەزانم دادپەروەرە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ فِي مَسِيرَةِ أَقَلَّ مِنْ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ مَنْصُورَ بْنَ زَيْدٍ الْكَلْبِيَّ هَذَا بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

**٢٠٤١-** عَنْ مَنْصُورٍ الْكَلْبِيِّ: أَنَّ دِحْيَةَ بْنَ خَلِيفَةَ خَرَجَ مِنْ قَرْيَتِهِ إِلَى قَرْيَةِ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ مِنَ الْفُسْطَاطِ فِي رَمَضَانَ، فَأَفْطَرَ، وَأَفْطَرَ مَعَهُ النَّاسُ، وَكَرِهَ آخَرُونَ أَنْ يُفْطِرُوا، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى قَرْيَتِهِ قَالَ: وَاللَّهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ الْيَوْمَ أَمْرًا، مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَرَاهُ، إِنَّ قَوْمًا رَغِبُوا عَنْ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ، يَقُولُ فِي ذَلِكَ لِلَّذِينَ صَامُوا، قَالَ عِنْدَ ذَلِكَ: اللَّهُمَّ اقْبِضْنِي إِلَيْكَ[1].

**باسی مۆڵەتدان بە ڕۆژووشکاندن لە ڕەمەزاندا لە ماوەی ڕێکردنی کەمتر لە ڕۆژ و شەوێك، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من مەنصوری کوڕی زەیدی کەلبی ناناسم بەوەی دادپەروەرە یان لەکەدارە**

واتە: مەنصوری کەلبی دەگێڕێتەوە، دیحیەی کوڕی خەلیفە لە شارەکەیەوە (موزە لە دیمەشق) دەرچوو بۆ شارەکەی عوقبەی کوڕی عامر ﷺ لە مانگی ڕەمەزان (کە نێوانیان سێ میل دەبوو)، ڕۆژووی شکاند، خەڵکەکەیش لەگەڵی ڕۆژوویان شکاند، کۆمەڵێکیان پێیان ناخۆش بوو لەگەڵی ڕۆژوو بشکێنن، کاتێ گەڕایەوە بۆ شارەکەی، وتی: سوێند بە خوا، ئەمڕۆ شتێکم بینی گومانم نەدەبرد هەرگیز ببینم، خەڵکانێك پشتیان کرد لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی، بەوانەی وت کە ڕۆژوویان گرتبوو، لەو کاتەدا وتی: خوایە گیانم بکێشە بۆ لای خۆت.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْحَامِلِ وَالْمُرْضِعِ فِي الْإِفْطَارِ فِي رَمَضَانَ وَالْبَيَانُ أَنَّ فَرْضَ الصَّوْمِ سَاقِطٌ عَنْهُمَا فِي رَمَضَانَ عَلَى أَنْ يَقْضِيَا مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَرَنَهُمَا، أَوْ إِحْدَيْهِمَا إِلَى الْمُسَافِرِ، فَجَعَلَ حُكْمَهُمَا أَوْ حُكْمَ إِحْدَيْهِمَا حُكْمَ الْمُسَافِرِ

**٢٠٤٢-** عَنْ أَيُّوبَ قَالَ: كَانَ أَبُو قِلَابَةَ حَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ، ثُمَّ قَالَ لِي: هَلْ لَكَ فِي الَّذِي حَدَّثَنِيهِ؟ فَدَلَّنِي عَلَيْهِ، فَلَقِيتُهُ، قَالَ: حَدَّثَنِي قَرِيبٌ لِي يُقَالُ لَهُ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي إِبِلٍ كَانَتْ لِي أُخِذَتْ، فَوَافَقْتُهُ وَهُوَ يَأْكُلُ، فَدَعَانِي إِلَى طَعَامِهِ، فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: «ادْنُ»، أَوْ قَالَ: «هَلُمَّ أُخْبِرُكَ عَنْ ذَاكَ، إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصَّوْمَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ، وَعَنِ الْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ»، فَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ يَقُولُ: أَلَا أَكَلْتُ مِنْ طَعَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ دَعَانِي إِلَيْهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ أَنَّ اسْمَ النِّصْفِ قَدْ يَقَعُ عَلَى جُزْءٍ مِنْ أَجْزَاءِ الشَّيْءِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ نِصْفًا عَلَى الْكَمَالِ وَالتَّمَامِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ فِي هَذَا الْخَبَرِ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ شَطْرَ الصَّلَاةِ، وَالشَّطْرُ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ النِّصْفُ، لَا الْقِبَلُ، وَلَا التِّلْقَاءُ وَالْجِهَةُ، أَعْنِي قَوْلَهُ تَعَالَى: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴿١٤٤﴾﴾ البقرة، وَلَمْ يَضَعِ اللَّهُ عَنِ الْمُسَافِرِ نِصْفَ فَرِيضَةِ الصَّلَاةِ عَلَى الْكَمَالِ وَالتَّمَامِ؛ لِأَنَّهُ لَمْ يَضَعْ مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَلَا مِنْ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ عَنِ الْمُسَافِرِ شَيْئًا.

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتی دووگیان و شیردەر ڕۆژوو نەگرن لە ڕەمەزانداو، ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ڕۆژووی فەرز لەسەریان دەکەوێ لە ڕەمەزاندا، وە پێویستە لە ڕۆژەکانی دیکەدا دووبارەی بکەنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ حوکمی هەردووکیان، یان هەر یەکێکیانی بە گەشتیار چواندووە

واتە: ئەیوب دەڵێ: ئەبو قیلابە ئەم فەرموودەی بۆم باس کرد، پاشان پێمی وت: ئایا ئەو کەسەت پێ بڵێم کە بۆی باس کردم؟ دواتر بۆی باس کردم، منیش پێی گەیشتم، وتی: کەسێکی نزیکی خۆم بۆی باس کردم پێی دەوترا ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، وتی: بە وشترێکی خۆمەوە هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نانی دەخوارد، بانگی کردم بۆ نان خواردن، وتم: من بەڕۆژووم، فەرمووی: نزیك ببەرەوە، یان فەرمووی:

---

(١) إسناده ضعيف.




بێ با هەواڵت بدەمێ دەربارەی ئەوە، خوا ﷻ ڕۆژووی لەسەر گەشتیار لابردووە هەروەها نیوەی نوێژیش، وە لەسەر ئافرەتی دووگیان و شیردەریش، جا دوای ئەوە دەیوت: لەو خواردنەی پێغەمبەری خوام ﷺ خوارد کاتێ بانگی کردم بۆی.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەو شێوازەیە کە لە کتێبی ئیهاندا ڕامگەیاندووە هەندێ جار نیوە بۆ بەشێك لە بەشەکانی شتێك بەکار دەهێنرێ، ئەگەرچی ئەو بەشە نیوەش نەبێت بەتەواوی، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەدا ڕایگەیاندووە، بەڕاستی خوا (شَطْرَ) نیوەی نوێژی لەسەر گەشتیار لابردووە، وە (الشَّطْر) لەم شوێنەدا بە واتای نیوە هاتووە، نەك ڕوو یان تەنیشت، مەبەستم فەرمایشتی خوایە کە فەرموویەتی: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴿١٤٤﴾﴾، خوا ﷻ نیوەی نوێژی فەرزی لەسەر گەشتیار لانەبردووە بەتەواوی، چونکە نە لە نوێژی بەیانی و نە لە نوێژی ئێوارە هیچی کەم نەکردۆتەوە لەسەر گەشتیار.

**٢٠٤٣-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ وَهُوَ يَتَغَدَّى، فَقَالَ: «ادْنُهْ»، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: «ادْنُهْ أُحَدِّثْكَ عَنِ الصِّيَامِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ الصِّيَامَ وَشَطْرَ الصَّلَاةِ، وَعَنِ الْحُبْلَى أَوِ الْمُرْضِعِ»[(١)].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو نانی دەخوارد، فەرمووی: نزیك بەرەوە، وتی: من بەڕۆژووم، فەرمووی: نزیك بەرەوە ئێستا دەربارەی ڕۆژوو قسەت بۆ دەکەم، بەڕاستی خوا ڕۆژووی لەسەر گەشتیار لابردووە و نوێژیشی لەسەر کردووە بە نیوە، هەروەها ڕۆژووی لەسەر ئافرەتی دووگیان و شیردەر لابردووە.

**٢٠٤٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ[(٢)].

واتە: بەهەمان شێوە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گێڕاویەتەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.




## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ فَرْضِ الصَّوْمِ عَنِ النِّسَاءِ أَيَّامَ حَيْضِهِنَّ

**٢٠٤٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ مِنَ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ، أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الْحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ، يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ»، فَقُلْنَ لَهُ: مَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَلَيْسَ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ؟» قُلْنَ: بَلَى، قَالَ: «ذَلِكَ لِنُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ؟ قَالَ: فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا»[١].

### باسی هەڵگرتنی ڕۆژووی فەرز لەسەر ئافرەتان لەو ڕۆژانەی دەکەونە حەیزەوە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان کەسی وەك ئێوە کەمژیریی و کەمدینم نەبینیوە، ئەوەندەی یەکێك لە ئێوە عەقڵی پیاوی ژیر و هۆشدار بەلای خۆیدا ببات، پێیان وت: ناتەواوی و کەموکوڕی ژیریی و دینی ئێمە لە کوێدایە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئایا شایەتی ئافرەتێك وەك شایەتی نیو پیاو نییە؟ وتیان: بەڵێ وایە، فەرمووی: ئەوە لەبەر ناتەواوی عەقڵێتی، ئەی کاتێ دەکەوێتە سووڕی مانگانەوە ئەوە نییە نە نوێژ دەکات و نە ڕۆژوو دەگرێت؟ فەرمووی: ئەوە ناتەواوی ئایینیەتی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَائِضَ يَجِبُ عَلَيْهَا قَضَاءُ الصَّوْمِ فِي أَيَّامِ طُهْرِهَا وَالرُّخْصَةِ لَهَا فِي تَأْخِيرِ قَضَاءِ الصَّوْمِ الَّذِي أَسْقَطَ الْفَرْضَ عَنْهَا فِي أَيَّامِ حَيْضِهَا إِلَى شَعْبَانَ

**٢٠٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصِّيَامُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَقْضِيهِ حَتَّى يَأْتِيَ شَعْبَانُ[٢].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئافرەتی خاوەن حەیز پێویستە لەسەری ڕۆژووی ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان قەزا بکاتەوە لەو ڕۆژانەی کە پاکە، وە مۆڵەتی پێدراوە ڕۆژووی ئەو ڕۆژانەی لە کاتی حەیزدا لەدەستی چووە، قەزاکردنەوەیان دوا بخات تا مانگی شەعبانی داهاتوو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە مانگی ڕەمەزاندا ڕۆژووم لەسەر دەبوو، قەزام نەدەكردەوە هەتا شەعبان دەهات.

**٢٠٤٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ بِمِثْلِهِ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوەی پێشوو.

**٢٠٤٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: قَدْ كَانَ عَلَيَّ شَيْءٌ مِنْ رَمَضَانَ، ثُمَّ لَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَصُومَهُ حَتَّى يَجِيءَ شَعْبَانُ، وَظَنَنْتُ أَنَّ ذَلِكَ لِمَكَانِهَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەكەوتە سەرم، پاشان نەمدەتوانی بەڕۆژوو بم تا شەعبان دەهات، بۆیە دوام دەخست بۆ ئەو مانگە، پێم وایە لەبەر ئەوە بوو كە مانگی شەعبان لای پێغەمبەر ﷺ ڕێزێكی تایبەتی هەبوو.

**٢٠٤٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا كُنْتُ أَقْضِي مَا يَبْقَى عَلَيَّ مِنْ رَمَضَانَ زَمَنَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَّا فِي شَعْبَانَ[3].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەوەی لەسەرم بووایە لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، قەزام نەدەكردەوە لە مانگی شەعباندا نەبێت.

**٢٠٥٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ بِمِثْلِهِ، وَقَالَ: حَيَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كُلَّهَا[4].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوەی پێشوو، دەڵێ: لە هەموو ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

**٢٠٥١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: مَا قَضَيْتُ شَيْئًا مِمَّا يَكُونُ عَلَيَّ مِنْ رَمَضَانَ إِلَّا فِي شَعْبَانَ حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[5].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هیچ ڕۆژێكم قەزا نەدەكردەوە لەوەی لەسەرم بوو لە مانگی ڕەمەزان تەنها لە شەعباندا نەبێت، تا پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده حسن.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح.

## بَابُ قَضَاءِ وَلِيِّ الْمَيِّتِ صَوْمَ رَمَضَانَ عَنِ الْمَيِّتِ إِذَا مَاتَ وَأَمْكَنَهُ الْقَضَاءُ فَفَرَّطَ فِي قَضَائِهِ

**٢٠٥٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ»[١].

## باسی خاوەنی مردوو ڕۆژووی ڕەمەزان قەزا دەکاتەوە لە جیاتی مردوو، ئەگەر مردو و توانای قەزاکردنەوەی هەبوو (لە ژیاندا) بەڵام کەمتەرخەمی کرد لە قەزاکردنەوەی

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بمرێ و ڕۆژووی لەسەر بێت خاوەنەکەی ڕۆژووی بۆ دەگرێ.

## بَابُ قَضَاءِ الصِّيَامِ عَنِ الْمَرْأَةِ تَمُوتُ وَعَلَيْهَا صِيَامٌ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّائِمَ إِذَا قَضَى الْحَيُّ عَنِ الْمَيِّتِ يَكُونُ سَاقِطًا عَنِ الْمَيِّتِ، كَالدَّيْنِ يُقْضَى عَنْهُ بَعْدَ الْمَوْتِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ شَبَّهَ قَضَاءَ الصَّوْمِ عَنِ الْمَيِّتِ بِقَضَاءِ الدَّيْنِ عَنْهَا

**٢٠٥٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَتَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا، قَالَ: «أَرَأَيْتِ لَوْ أَنَّ أُمَّكِ مَاتَتْ وَعَلَيْهَا دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟» قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «اقْضِي دَيْنَ أُمِّكِ»[٢].

## باسی قەزاکردنەوەی ڕۆژوو لەجیاتی ئافرەتێك مردووەو ڕۆژووی لەسەر بووە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەگەر زیندوو لەجیاتی مردوو ڕۆژوو قەزا بکاتەوە لەسەر شانی مردووەکە دەکەوێ، وەکوو چۆن قەرز دوای مردن لەجیاتی دەدرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ قەزاکردنەوەی ڕۆژووی لەجیاتی مردوو چواندووە بە دانەوەی قەرز لە جیاتی ئەو

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی دایکم مردووە و ڕۆژووی پازدە ڕۆژی لەسەرە، فەرمووی:

---

(١) صحيح.

(٢) في إسناده مقال، من أجل أبي حريز عبد الله بن حسين الأزدي، لكن الحديث صحيح من غير هذا الطريق.

ئەی پێت چۆنە ئەگەر دایکت بمردایە و قەرزی لەسەر بووایە، ئایا قەرزەکەت بۆی دەبژارد؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: قەرزی دایکت بدەرەوە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ بِالنَّذْرِ عَنِ النَّاذِرَةِ إِذَا مَاتَتْ قَبْلَ الْوَفَاءِ بِنَذْرِهَا

**٢٠٥٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ امْرَأَةً رَكِبَتِ الْبَحْرَ، فَنَذَرَتْ أَنْ تَصُومَ شَهْرًا، فَمَاتَتْ، فَسَأَلَ أَخُوهَا النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَصُومَ عَنْهَا[١].

## باسی فەرمانکردن بە قەزاکردنەوەی ڕۆژووی نەزر لەجیاتی ئەو کەسەی نەزری کردووە، ئەگەر پێش بەجێهێنانی نەزرەکەی مرد

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك سواری کەشتی بوو، نەزری کرد مانگێك بەڕۆژوو بێت، دواتر مرد، براکەی پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد لەجیاتی ئەو ڕۆژوو بگرێت.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ مَنْ قَضَى الصَّوْمَ عَنِ النَّاذِرِ وَالنَّاذِرَةِ مِنْ وَلِيٍّ، أَوْ قَرِيبٍ، أَوْ بَعِيدٍ، أَوْ ذَكَرٍ، أَوْ أُنْثَى، أَوْ حُرٍّ، أَوْ عَبْدٍ، أَوْ حُرَّةٍ، أَوْ أَمَةٍ، فَالْقَضَاءُ جَائِزٌ عَنِ الْمَيِّتِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ شَبَّهَ قَضَاءَ صَوْمِ النَّذْرِ عَنِ الْمَيِّتَةِ بِقَضَاءِ الدَّيْنِ عَنْهَا، وَالدَّيْنُ إِذَا قُضِيَ عَنِ الْمَيِّتِ أَوِ الْمَيِّتَةِ كَانَ الْقَاضِي مَنْ كَانَ، مِنْ قَرِيبٍ أَوْ بَعِيدٍ، حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، وَالدَّيْنُ سَاقِطٌ عَنِ الْمَيِّتِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَضَاءَ الصَّوْمِ عَنِ الْمَيِّتِ أَحَقُّ مِنْ قَضَاءِ الدَّيْنِ عَنْهُ؛ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَعْلَمَ أَنَّ الصَّوْمَ مِنْ حُقُوقِ اللَّهِ، وَأَنَّ قَضَاءَهُ أَحَقُّ مِنْ قَضَاءِ حُقُوقِ الْآدَمِيِّينَ

**٢٠٥٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ أُخْتِي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: «أَرَأَيْتِ إِنْ كَانَ عَلَى أُخْتِكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَضَيْتِهِ»، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «فَحَقُّ اللَّهِ أَحَقُّ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ئەو کەسەی ڕۆژوو قەزا دەکاتەوە لەجیاتی کەسێك کە نەزری کردووە، سەرپەرشتیار بێ، یان خزم، یان دوور، یان نێر، یان مێ، یان پیاوی ئازاد، یان کۆیلە، یان ژنی ئازاد، یان ژنی کۆیلە، ئەوە قەزاکردنەوە دروستە لەجیاتی مردوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ قەزاکردنەوەی ڕۆژووی نەزری لە جیاتی ئافرەتی مردوو چواندووە بە دانەوەی قەرزێك کە لەسەری بووبێ، وە قەرزیش ئەگەر لەجیاتی مردووی پیاو یان ژن درایەوە، قەرزدەرەوەکە هەر کەس بێ، لە نزیك، یان دوور، ئازاد، یان کۆیلە ئەوە لەسەر مردووەکە نامێنێ، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی قەزاکردنەوەی ڕۆژوو لەجیاتی مردوو لەپێشترە لە دانەوەی قەرز لەسەری، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە ڕۆژوو لە مافەکانی خوایە، قەزاکردنەوەی لەپێشترە لە قەزاکردنەوەی مافی ئادەمییەکان**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: بەڕاستی خوشکەکەم مردووە و دوو مانگ ڕۆژووی بەدوای یەکدیدا لەسەر پێویست بوو، فەرمووی: پێت چۆنە ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەر بووایە، ئایا تۆ بۆت دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: مافی خوا لەپێشترە بدرێتەوە.

## بَابُ الْإِطْعَامِ عَنِ الْمَيِّتِ يَمُوتُ وَعَلَيْهِ صَوْمٌ لِكُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ أَشْعَثَ بْنِ سَوَّارٍ رَحِمَهُ اللَّهُ لِسُوءِ حِفْظِهِ

**٢٠٥٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرٍ فَلْيُطْعَمْ عَنْهُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا»[١].

**باسی فیدیە بە نانندان لەجیاتی کەسێك بمرێ و ڕۆژووی لەسەر بێ، بۆ هەر ڕۆژێك نانی هەژارێك بدات، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێ، بێگومان لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەشعەسی کوڕی سەوار ڕەحمەتی خوای لێ بێ، بەهۆی خراپی لەبەرکردنیەوە**

---

(١) إسناده ضعيف.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس مرد و ڕۆژووی مانگێکی لەسەر بوو، با لە جیاتی هەر ڕۆژێك نانی هەژارێکی بۆ بدرێت.

## بَابُ قَدْرِ مَكِيلَةِ مَا يُطْعِمُ كُلَّ مِسْكِينٍ فِي كَفَّارَةِ الصَّوْمِ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ

**٢٠٥٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ رَمَضَانُ لَمْ يَقْضِهِ، فَلْيُطْعَمْ عَنْهُ لِكُلِّ يَوْمٍ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ»[١].

## باسی ئەندازەی پێوانەی کەفارەتی ڕۆژوو بۆ هەر هەژارێك، ئەگەر فەرموودەکە چەسپاو بێت، چونکە بێگومان شتێك لە دڵدا هەیە دەربارەی ئەو سەنەدە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس مردو ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر بوو، قەزای نەکردبۆیەوە، با لە جیاتی ئەو بۆ هەر ڕۆژێك نیو صاع[٢] لە گەنم بدرێ.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ وَقْتِ الْإِفْطَارِ، وَمَا يُسْتَحَبُّ أَنْ يُفْطَرَ عَلَيْهِ

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي وَقْتِ الْفِطْرِ بِلَفْظِ خَبَرٍ مَعْنَاهُ عِنْدِي مَعْنَى الْأَمْرِ

**٢٠٥٨-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ وَأَدْبَرَ النَّهَارُ وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ أَفْطَرَ الصَّائِمُ»[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ: فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ، لَفْظُ خَبَرٍ، وَمَعْنَاهُ مَعْنَى الْأَمْرِ: أَيْ: فَلْيُفْطِرِ الصَّائِمُ، إِذْ قَدْ حَلَّ لَهُ الْإِفْطَارُ، وَلَوْ كَانَ مَعْنَى هَذِهِ اللَّفْظَةِ مَعْنَى لَفْظِهِ كَانَ جَمِيعُ الصُّوَّامِ فِطْرُهُمْ وَقْتًا وَاحِدًا، وَلَمْ يَكُنْ لِقَوْلِهِ ﷺ: لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ، وَلِقَوْلِهِ: لَا يَزَالُ الدِّينُ ظَاهِرًا مَا عَجَّلَ النَّاسُ الْفِطْرَ، مَعْنًى، وَلَا كَانَ لِقَوْلِهِ ﷺ: يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَحَبُّ عِبَادِي إِلَيَّ أَعْجَلُهُمْ

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صاعێك چوار گوێلە، هەر گوێلێکیش (٥٤٤) گرامە، کەواتە چوار صاع دەکاتە دوو کیلۆ و سەد و حەفتا و شەش گرام.

(٣) صحيح.

فِطْرًا، مَعْنًى لَوْ كَانَ اللَّيْلُ إِذَا أَقْبَلَ وَأَدْبَرَ النَّهَارُ وَغَابَتِ الشَّمْسُ كَانَ الصُّوَّامُ جَمِيعًا يُفْطِرُونَ، وَلَوْ كَانَ فِطْرُ جَمِيعِهِمْ فِي وَقْتٍ وَاحِدٍ لَا يَتَقَدَّمُ فِطْرُ أَحَدِهِمْ غَيْرَهُ لَمَا كَانَ لِقَوْلِهِ ﷺ: مَنْ وَجَدَ تَمْرًا فَلْيُفْطِرْ عَلَيْهِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى الْمَاءِ، مَعْنًى، وَلَكِنَّ مَعْنَى قَوْلِهِ: فَقَدْ أَفْطَرَ، أَيْ: فَقَدْ حَلَّ لَهُ الْفِطْرُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

## كۆباسی كاتی ڕۆژووشكاندن ئەوەشی چاكترە ڕۆژووی لەسەر بشكێنرێ

## باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی كاتی ڕۆژووشكاندن، بە دەستەواژەی فەرموودەیەك ماناكەی لای من مانای فەرمان ئەدات

واتە: عومەری كوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەگەر شەو هات و ڕۆژیش پشتی هەڵكرد و خۆریش ئاوا بوو، ئەوە حەڵاڵە ڕۆژووەوان ڕۆژووەكەی بشكێنێ.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ)، دەستەواژەی فەرموودەیەكە ماناكەی مانای فەرمان هەڵدەگرێ، واتە: با ڕۆژووەوان ڕۆژووەكەی بشكێنێت، چونكە حەڵاڵە بۆی ڕۆژوو بشكێنێت، ئەگەر مانای ئەم دەستەواژەیە هەمان مانای دەستەواژەكە بدات ئەوە هەموو ڕۆژووەوانەكان ڕۆژووشكاندنیان لە یەك كاتدا دەبێت، وە فەرموودەكەی پێغەمبەریش ﷺ كە فەرموویەتی: بەردەوام خەڵك لە خێردان تا ڕۆژوو زوو بشكێنن. هەروەها فەرموودەكەی ﷺ: بەردەوام دین ئاشكرا و زاڵە تا خەڵكی زوو ڕۆژوو بشكێنن. هیچ مانایەكی نەدەگەیاند، هەروەها فەرموودەكەی ﷺ: خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ: خۆشەویستترین بەندەكانم لەلام ئەوانەن زوو ڕۆژوو دەشكێنن، هیچ مانایەكی نەدەگەیاند، ئەگەر شەو هات و ڕۆژیش پشتی هەڵكرد و خۆریش ئاوا بوو ئەوە ڕۆژووەوانەكان هەموویان ڕۆژوو دەشكێنن، جا ئەگەر ڕۆژووشكاندنی هەموویان لە یەك كاتدا بووایە و شكاندنی یەكێكیان پێشی ئەوی دیكە نەكەوتایە ئەوە فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ: هەر كەس خورمایەكی بەدی كرد با ڕۆژووەكەی پێی بشكێنێت، هەر كەسیش خورمای دەست نەكەوت با بە ئاو




ڕۆژووەکەی بشکێنێت. هیچ مانایەکی نەدەگەیاند، بەڵام مانای فەرموودەکەی: (فَقَدْ أَفْطَرَ)، واتە: بێگومان حەڵاڵە بۆی ڕۆژوو بشکێنێت، خوا زاناترە.

## بَابُ ذِكْرِ دَوَامِ النَّاسِ عَلَى الْخَيْرِ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ وَفِيهِ كَالدَّلَالَةِ عَلَى أَنَّهُمْ إِذَا أَخَّرُوا الْفِطْرَ وَقَعُوا فِي الشَّرِّ

**٢٠٥٩-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ»[١].

## باسی بەردەوام خەڵك لەسەر خێر و چاکەن تا زوو ڕۆژوو بشکێنن، وە بەڵگەشی تێدایە ئەگەر ڕۆژووشکاندن دوابخەن دەکەونە نێو خراپەوە

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵکی لە خێردان تا ئەوکاتەی پەلە بکەن لە ڕۆژووشکاندندا.

## بَابُ ذِكْرِ ظُهُورِ الدِّينِ مَا عَجَّلَ النَّاسُ فِطْرَهُمْ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الدِّينِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ شُعَبِ الْإِسْلَامِ

**٢٠٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا يَزَالُ الدِّينُ ظَاهِرًا مَا عَجَّلَ النَّاسُ الْفِطْرَ، إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى يُؤَخِّرُونَ»[٢].

## باسی دینی ئیسلام سەرکەوتووە تا خەڵك زوو ڕۆژووەکەیان بشکێنن، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ناوی دین هەندێ جار بۆ بەشێك لە لقەکانی ئیسلام بەکاردێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام ئایینی ئیسلام بەرز و شکۆمەندە تا خەڵك پەلە بکەن لە ڕۆژووشکاندندا، بێگومان جولەکە و گاورەکان ڕۆژووشکاندنیان دوا دەخەن.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ ذِكْرِ اسْتِحْسَانِ سُنَّةِ الْمُصْطَفَى مُحَمَّدٍ ﷺ مَا لَمْ يَنْتَظِرْ بِالْفِطْرِ قَبْلَ طُلُوعِ النُّجُومِ

**٢٠٦١-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَالُ أُمَّتِي عَلَى سُنَّتِي مَا لَمْ تَنْتَظِرْ بِفِطْرِهَا النُّجُومَ»، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ صَائِمًا أَمَرَ رَجُلًا فَأَوْفَى عَلَى شَيْءٍ، فَإِذَا قَالَ: غَابَتِ الشَّمْسُ، أَفْطَرَ[١].

## باسی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وا بووە بۆ ڕۆژووشكاندن چاوەڕوانی دەركەوتنی ئەستێرەكان نەكرێ

واتە: سەهلی كوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام ئوممەتەكەم لەسەر ڕێباز و سوننەتی منن تا بۆ ڕۆژووشكاندن چاوەڕێی دەرچوونی ئەستێرە نەكەن، وتی: وە پێغەمبەر ﷺ كاتێ بەڕۆژوو بووایە فەرمانی دەكرد بە پیاوێك بچووایەتە سەر بەرزاییەك، ئەگەر بیوتایە: خۆر ئاوا بوو، ڕۆژووەكەی دەشكاند.

## بَابُ ذِكْرِ حُبِّ اللَّهِ ﷻ الْمُعَجِّلِينَ لِلْإِفْطَارِ وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ بَعْضِ أَهْلِ عَصْرِنَا مِمَّنْ زَعَمَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُقَالَ: أَحَبُّ الْعِبَادِ إِلَى اللَّهِ أَعْجَلُهُمْ فِطْرًا، إِلَّا أَنْ يَكُونَ اللَّهُ يُحِبُّ جَمِيعَ عِبَادِهِ، وَخَالَفَنَا فِي بَابِ أَفْعَلَ، فَادَّعَى مَا لَا يُحْسِنُهُ، فَقَدْ بَيَّنْتُ بَابَ أَفْعَلَ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ وَالْكُتُبِ الْمُصَنَّفَةِ مِنَ الْمُسْنَدِ

**٢٠٦٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَحَبُّ عِبَادِي إِلَيَّ أَعْجَلُهُمْ فِطْرًا»[٢].

**باسی خۆشەویستی خوا ﷻ بۆ ئەوكەسانەی پەلە دەكەن لە ڕۆژووشكاندنیان، وە بەڵگەش لەسەر دژی وتەی هەندێ لە زانایانی سەردەممان ئەوەی پێی وایە دروست نییە بوترێ: خۆشەویستترینی بەندەكان لەلای خوا ئەوانەن**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**پەلە دەکەن لە ڕۆژووشکاندیان، بێگومان خوا هەموو بەندەکانی خۆی خۆش دەوێت، وە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئێمەدا لە بەشی (أَفْعَلَ) بانگەشەی شتێکی کردووە چاك لێی نازانێت، بێگومان ڕوونم کردەوە لە بەشی (أَفْعَلَ) لە چەند شوێنێکی کتێبەکانماندا لە کتێبی (مَعَانِي الْقُرْآنِ) و ئەو کتێبانەی لە موسنەدەکە نووسراون**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترینی بەندەکانم لەلام ئەوانەن زیاتر پەلە بکەن لە شکاندنی ڕۆژووەکەیان.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

**٢٠٦٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يُصَلِّي الْمَغْرِبَ حَتَّى يُفْطِرَ، وَلَوْ كَانَ شَرْبَةً مِنْ مَاءٍ[1].

## باسی بە چاك دانانی ڕۆژووشکاندن پێش ئەنجامدانی نوێژی ئێوارە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئێوارەی نەدەکرد تا ڕۆژووی نەشکاندایە، ئەگەرچی قومە ئاوێکیش بووایە.

## بَابُ إِعْطَاءِ مُفَطِّرِ الصَّائِمِ مِثْلَ أَجْرِ الصَّائِمِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْتَقِصَ الصَّائِمُ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا

**٢٠٦٤-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا أَوْ جَهَّزَ حَاجًّا، أَوْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ أَوْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أُجُورِهِمْ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْتَقِصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ»[2].

## باسی پاداشتی ئەو کەسەی بەربانگ ئامادە دەکات بۆ ڕۆژووەوانێك بە هەمان شێوەی ڕۆژووەوانەکە پاداشتی بۆ هەیە، بەبێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم بکرێتەوە

واتە: زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس جەنگاوەرێك ئامادە بکات بۆ جەنگ، یان کەسێك ئامادە بکات بۆ حەج، یان

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




چاودێری خانەوادەکەی بکات بەچاکی، یان بەربانگ بۆ ڕۆژووەوانێك ئامادە بکات، ئەوە هەمان پاداشتی ئەوانی بۆ دەنووسرێ، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بکرێتەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ عَلَى الرُّطَبِ إِذَا وُجِدَ وَعَلَى التَّمْرِ إِذَا لَمْ يُوجَدِ الرُّطَبُ

**٢٠٦٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَ صَائِمًا لَمْ يُصَلِّ حَتَّى نَأْتِيَهُ بِرُطَبٍ وَمَاءٍ فَيَأْكُلُ وَيَشْرَبُ إِذَا كَانَ الرُّطَبُ، وَأَمَّا الشِّتَاءُ لَمْ يُصَلِّ حَتَّى نَأْتِيَهُ بِتَمْرٍ وَمَاءٍ[١].

## باسی چاکتر وایە ڕۆژوو بە خورمای تەڕ و تازە بشکێنرێ ئەگەر هەبوو، وە ئەگەر خورمای تەڕ نەبوو بە خورمای وشك

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بەڕۆژوو بووایە نوێژی نەدەکرد تا خورمای تەڕ و ئاومان بۆی دەهێنا، دواتر دەیخوارد و دەیخواردەوە، ئەگەر خورمای تەڕ هەبووایە، بەڵام لە زستاندا نوێژی نەدەکرد تا خورمای وشك و ئاومان بۆی دەهێنا.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ عَلَى الْمَاءِ إِذَا أَعْوَزَ الصَّائِمَ الرُّطَبُ، وَالتَّمْرُ جَمِيعًا

**٢٠٦٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَجَدَ تَمْرًا فَلْيُفْطِرْ عَلَيْهِ، وَمَنْ لَا فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ، فَإِنَّهُ طُهُورٌ»[٢].

## باسی چاکتر وایە ڕۆژووەوان بە ئاو ڕۆژوو بشکێنێ، ئەگەر خورمای تەڕ یان وشکی دەست نەکەوت

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس خورمای لەلا هەبوو با ڕۆژووەکەی پێ بشکێنێ، هەر کەسیش لەلای نەبوو با بە ئاو بیشکێنێ، بێگومان ئەوە پاکە.

---

(١) حديث قوي لا ينزل عن رتبة الحسن.

(٢) هذا حديث معلول لا يصح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالْفِطْرِ عَلَى التَّمْرِ إِذَا كَانَ مَوْجُودًا، أَمْرَ اخْتِيَارٍ وَاسْتِحْبَابٍ طَالِبًا لِلْبَرَكَةِ إِذِ التَّمْرُ بَرَكَةٌ، وَأَنَّ الْأَمْرَ بِالْفِطْرِ عَلَى الْمَاءِ إِذَا أَعْوَزَ التَّمْرُ أَمْرَ اسْتِحْبَابٍ وَاخْتِيَارٍ إِذِ الْمَاءُ طَهُورٌ، لَا أَنَّ الْأَمْرَ بِذَلِكَ أَمْرَ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ

**٢٠٦٧-** عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَهِيَ عَلَى الْقَرِيبِ صَدَقَتَانِ، صَدَقَةٌ، وَصِلَةٌ». وَقَالَ ﷺ: «إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنَّهُ بَرَكَةٌ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَمَاءٌ، فَإِنَّهُ طُهُورٌ». وَقَالَ ﷺ: «اذْبَحُوا عَنِ الْغُلَامِ عَقِيقَتَهُ، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى، وَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا». هَذَا حَدِيثُ عَبْدِ الْجَبَّارِ. وَقَالَ الْآخَرَانِ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ، فَإِنَّهُ طُهُورٌ». وَلَمْ يَذْكُرَا قِصَّةَ الصَّدَقَةِ وَلَا الْعَقِيقَةِ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە شکاندنی ڕۆژوو بە خورما ئەگەر بەردەست بوو، فەرمانێکە بۆ سەرپشککردن و بەچاك دانان بە مەبەستی بەرەکەت، چونکە خورما بەرەکەتە، وە فەرمانکردن بە شکاندنی ڕۆژوو بە ئاو ئەگەر خورما نەبوو فەرمانێکە بۆ بەچاك دانان و سەرپشککردن، چونکە ئاو پاکە، نەك فەرمانکردن بەوانە فەرمانێك بێ بۆ پێویست بوون

واتە: سەلمانی کوڕی عامری زەبی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: بەخشین بە هەژار خێر و چاکەیە، بەڵام بۆ کەسی نزیك دوو جار چاکەیە، هەم بەخشینە، هەم بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتییە. وە فەرموویەتی ﷺ: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ڕۆژووی شکاند با بە خورما بیشکێنێت، چونکە ئەوە فەڕ و بەرەکەتە، ئەگەر بەردەست نەبوو بە ئاو، چونکە پاکە. وە فەرموویەتی ﷺ: بۆ کوڕ حەیوانێك سەر ببڕن بە گوێزەبانە و پیسی لێ دوور بخەنەوە (واتە: قژی بتاشن) و لەبری ئەو خوێن بڕێژن. ئەمە فەرموودەی عەبدولجەبارە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە). ئەو دوو گێڕەوەکەی دیکە وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ڕۆژووی شکاند با بە خورما بیشکێنێ، ئەگەر بەردەست نەبوو با بە ئاو بیشکێنێت، چونکە ئاو پاکە، باسی بەخشین و عەقیقەیان نەکرد.

---

(١) إسناده ضعيف.




## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْوِصَالِ فِي الصَّوْمِ وَذِكْرِ مَا خَصَّ اللَّهُ بِهِ نَبِيَّهُ ﷺ مِنْ إِبَاحَةِ الْوِصَالِ إِذِ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَرَّقَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أُمَّتِهِ فِي ذَلِكَ أَنْ كَانَ اللَّهُ يُطْعِمُهُ وَيَسْقِيهِ بِاللَّيْلِ دُونَهُمْ مَكْرُمَةً لَهُ ﷺ

**٢٠٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُوَاصِلُ؟ قَالَ: «إِنِّي لَسْتُ كَأَحَدِكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي»(١).

## باسی سەرزەنشتکردنی ڕۆژووگرتن بەشێوەی ویصال و، باسی ئەوەی خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ تایبەت کردووە لە ڕێگەدان بە ویصال لەسەر ڕۆژووگرتن، چونکە خوا لەوەدا جیاوازی خستۆتە نێوان ئەو و ئوممەتەکەی، خوا بە شەودا خواردن و خواردنەوە دەرخواردی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدات جگە لە ئەوان، ئەویش وەکوو ڕێز و تایبەتمەندییەك بۆی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بەدوور بگرن لە ویصال، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ویصال دەکەی؟ فەرمووی: من وەکوو هیچ یەکێك لە ئێوە نیم من لە شەودا خواردن و خواردنەوەم پێ ئەدرێ.

**٢٠٦٩-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُوَاصِلُ؟ قَالَ: «إِنِّي أَبِيتُ أُطْعَمُ وَأُسْقَى»(٢).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بەدوور بگرن لە ویصال، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ویصال دەکەی؟ فەرمووی: من لە شەودا خواردن و خواردنەوەم پێ دەدرێ.

تێبینی:

(ویصال): بریتییە لەوەی کەسێك دوو ڕۆژ بە دوای یەکدیدا بەڕۆژوو بێت لە نێوانیاندا هیچ نەخوات، بۆ نموونە: ڕۆژی شەممە بەڕۆژوو بێت ئێوارەکەی بەربانگ نەکاتەوە و بەردەوام بێت لەسەر ڕۆژووگرتن تا ئێوارەی ڕۆژی یەکشەممە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ تَسْمِيَةِ الْوِصَالِ بِتَعَمُّقٍ فِي الدِّينِ

**٢٠٧٠-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: وَاصَلَ النَّبِيُّ ﷺ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَوَاصَلَ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَبَلَغَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: «لَوْ مُدَّ لَنَا الشَّهْرُ لَوَاصَلْتُ وِصَالًا، يَدَعُ الْمُتَعَمِّقُونَ التَّعَمُّقَ، لَسْتُمْ مِثْلِي، إِنِّي أَظَلُّ، فَيُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي»[1].

## باسی ڕۆژووگرتن بە شێوەی ویصال لە ئاییندا بە ڕۆچوون و سنووربەزاندن ناوی هێنراوە

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا ویصالی دەکرد، خەڵکێکیش لە مسوڵمانان ویصالیان کرد، ئەو هەواڵەی پێ گەیشت، فەرمووی: ئەگەر مانگمان بۆ درێژ بکرایەتەوە، ئەوە من ویصالم دەکرد، تا ئەوانەی سنووریان تێپەڕاندووە و ڕۆچوون (لە وتە و کردارەکاندا) وازیان لە ڕۆچوون دەهێنا، چونکە بەڕاستی من پەروەردگارم خۆراکم دەدات و تینوێتیم دەشکێنێ.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوِصَالَ مَنْهِيٌّ عَنْهُ إِذْ ذَلِكَ يَشُقُّ عَلَى الْمَرْءِ، خِلَافَ مَا يَتَأَوَّلُهُ بَعْضُ الْمُتَصَوِّفَةِ مِمَّنْ يُفْطِرُ عَلَى اللُّقْمَةِ أَوِ الْجَرْعَةِ مِنَ الْمَاءِ فَيُعَذِّبُ نَفْسَهُ لَيَالِيَ وَأَيَّامًا

**٢٠٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ - قَالَهَا ثَلَاثًا -» قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لَسْتُمْ فِي ذَلِكَ مِثْلِي، إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي، فَاكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ»[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ویصال لە ڕۆژووگرتندا قەدەغەکراوە، چونکە ئەوە دەبێتە بارگرانی لەسەر بەندە، جیاواز لەوەی هەندێ لە سۆفییەکان لەیەکی دەدەنەوە ئەوەی بە پاروویەك نان یان قومێك ئاو ڕۆژوو دەشکێنێ بەدرێژایی شەو و ڕۆژگارەکان نەفسی خۆی سزا دەدات

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بە دووربگرن لە ویصال، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ویصال دەکەی؟ فەرمووی: ئێوە لەوەدا وەکوو من نین، من شەو دەکەمەوە خواردن و خواردنەوەم پێ دەدرێ، ئێوە ئەوەندەی لە تواناتاندایە کردەوە بکەن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْوِصَالِ إِلَى السَّحَرِ إِذْ تَعْجِيلُ الْفِطْرِ أَفْضَلَ مِنْ تَأْخِيرِهِ، إِنْ كَانَ الْوِصَالُ إِلَى السَّحَرِ قَدْ أَبَاحَهُ الْمُصْطَفَى ﷺ

**٢٠٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، فَفَعَلَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ، فَنَهَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ قَالَ: «لَسْتُمْ مِثْلِي، إِنِّي أَظَلُّ عِنْدَ رَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي»[١].

## باسی قەدەغەکردن لە ویصال تا پارشێو، لە کاتێکدا پەلەکردن لە شکاندنی ڕۆژوو چاکترە لە دواخستنی، ئەگەرچی ویصالیش تا پارشێو پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێدابێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژوو دەبوو تا پارشێو، هەندێ لە هاوەڵەکانی بەو شێوەیان کرد، دواتر قەدەغەی لێ کرد، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ ئەوە دەکەی، فەرمووی: ئێوە وەکوو من نین، من پەروەردگارم خۆراکم دەدات و تینوێتیم دەشکێنێ.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوِصَالِ إِلَى السَّحَرِ وَإِنْ كَانَ تَعْجِيلُ الْفِطْرِ أَفْضَلَ

**٢٠٧٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِثْلَهُ يَعْنِي: مِثْلَ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ فِي الْوِصَالِ قَالَ: «فَأَيُّكُمْ وَاصَلَ مِنْ سَحَرٍ إِلَى سَحَرٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەدان بە ویصال (ڕۆژووگرتن) تا پارشێو، ئەگەرچی پەلەکردن لە شکاندنی ڕۆژوو لەپێشترە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە، واتە: وەکوو فەرموودەکەی ئیبنو عومەر لە ویصال، وتی: کێ لە ئێوە بەردەوام بووە لەسەر ڕۆژووگرتن لە پارشێوەوە تا پارشێو.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَنْ أَنْ لَا فَرْضَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مِنَ الصِّيَامِ غَيْرَ رَمَضَانَ إِلَّا مَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ بِأَفْعَالِهِمْ وَأَقْوَالِهِمْ

**٢٠٧٤-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ فِي مَسْأَلَةِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الْإِسْلَامِ، قَالَ: «وَصِيَامُ رَمَضَانَ»، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: «لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی جگە لە ڕەمەزان ڕۆژووی فەرز لەسەر مسوڵمان نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە بەهۆی کردەوە و گوفتارەکانیانەوە پێویست دەبێت لەسەریان

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا ﷺ سەبارەت بە پرسیارکردنی (کابرای دەشتەکی) لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئیسلام، فەرمووی: وە ڕۆژووی ڕەمەزان، وتی: ئایا جگە لەوە هیچی دیکە لەسەرم هەیە؟ وتی: نەخێر، مەگەر ڕۆژووی زیادە بگریت.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ قَوْلِ الْمَرْءِ صُمْتُ رَمَضَانَ كُلَّهُ

**٢٠٧٥-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ صُمْتُ رَمَضَانَ كُلَّهُ، أَوْ قُمْتُ رَمَضَانَ كُلَّهُ، اللَّهُ أَعْلَمُ أَكَرِهَ التَّزْكِيَةَ عَلَى أُمَّتِهِ؟ أَوْ قَالَ: لَا بُدَّ مِنْ رَقْدَةٍ أَوْ مِنْ غَفْلَةٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی بەندە بڵێ: هەموو ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە نەڵێ: هەموو ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم، یاخود هەموو ڕەمەزان شەونوێژم کرد، (گێڕەرەوەی فەرموودەکە وتی): خوا زاناترە ئایا حەزی لە تەزکییە و خۆهەڵکێشان نەکرد لەسەر ئوممەتەکەی؟ یان فەرمووی: هەر دەبێ خەوتن یان بێئاگابوونی تووش ببێت.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَوْمِ التَّطَوُّعِ

## بَابُ فَضْلِ الصَّوْمِ فِي الْمُحَرَّمِ إِذْ هُوَ أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٠٧٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَرْفَعُهُ. إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: سُئِلَ: أَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ؟ وَأَيُّ الصِّيَامِ أَفْضَلُ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ؟ فَقَالَ: «أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْمَكْتُوبَةِ الصَّلَاةُ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، وَأَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ»[١].

## کۆباسی ڕۆژووی سوننەت

## باسی فەزڵی ڕۆژووگرتن لە مانگی موحەڕەم، چونکە ڕۆژووگرتن لەو مانگەدا چاکترین ڕۆژووە لەدوای مانگی ڕەمەزان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ چی نوێژێك چاکترینە لەدوای نوێژە فەرزەکان؟ وە چی ڕۆژوویەك چاکترینە لەدوای مانگی ڕەمەزان؟ فەرمووی: چاکترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەکان نوێژێکە لە نیوەی شەودا، وە چاکترین ڕۆژوو دوای ڕەمەزان مانگی موحەڕەمە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَوْمِ شَعْبَانَ وَوَصْلِهِ بِشَهْرِ رَمَضَانَ إِذْ كَانَ أَحَبُّ الشُّهُورِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَصُومَهُ

**٢٠٧٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: كَانَ أَحَبَّ الشُّهُورِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَصُومَهُ شَعْبَانُ، ثُمَّ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چاکتر وایە ڕۆژووی مانگی شەعبان بگەیەنرێ بە مانگی ڕەمەزان، چونکە خۆشەویسترین مانگ بوو بەلای پێغەمبەر ﷺ کە ڕۆژووی تێدا بگرێ**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: خۆشەویسترینی مانگەکان لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕۆژووی تێدا بگرتایە شەعبان بوو، پاشان (بەڕۆژووگرتن) دەیگەیاند بە ڕەمەزان.

**بَابُ إِبَاحَةِ وَصْلِ صَوْمِ شَعْبَانَ بِصَوْمِ رَمَضَانَ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَعْنَى خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فَلَا تَصُومُوا حَتَّى رَمَضَانَ أَيْ: لَا تُوصِلُوا شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ فَتَصُومُوا جَمِيعَ شَعْبَانَ، أَوْ أَنْ يُوَافِقَ ذَلِكَ صَوْمًا كَانَ يَصُومُهُ الْمَرْءُ قَبْلَ ذَاكَ، فَيَصُومُ ذَلِكَ الصِّيَامَ بَعْدَ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَانَ، لَا أَنَّهُ نَهَى عَنِ الصَّوْمِ إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ نَهْيًا مُطْلَقًا**

**٢٠٧٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنْ أَشْهُرِ السَّنَةِ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ مِنْ شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ[١].

**باسی ڕێگەدان بە گەیاندنی ڕۆژووی شەعبان بە ڕۆژووی ڕەمەزان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی مانای فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فَلَا تَصُومُوا حَتَّى رَمَضَانَ)، واتە: ڕۆژووگرتنی شەعبان مەگەیەنن بە ڕەمەزان بەجۆرێ هەموو شەعبان بەڕۆژوو بن، یان ڕۆژووەکە ڕێك بکەوێت لەگەڵ ڕۆژووی کەسێك پێشتر ڕۆژووی دەگرت (بۆ نموونە: ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو دوو ڕۆژ بەڕۆژوو نەدەبوو) ئەوە دوای نیوەی شەعبان ڕۆژووەکەی خۆی دەگرێ، نەك بەو مانایەی ئەو قەدەغەی کردووە لە ڕۆژووگرتن ئەگەر شەعبان نیوە بوو بەقەدەغەکردنێکی ڕەها**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندەی لە مانگی شەعبان بەڕۆژوو دەبوو لە مانگەکانی ساڵ بەڕۆژوو نەدەبوو، هەموو ئەو مانگە بەڕۆژوو دەبوو (جگە لە ڕەمەزان).

---

(١) صحيح.

**٢٠٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها بِمِثْلِهِ، وَزَادَ: قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ: خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَكَانَ أَحَبَّ الصَّلَاةِ إِلَيْهِ مَا دَاوَمَ عَلَيْهَا مِنْهَا - وَإِنْ قَلَّتْ - وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا[١].

**واتە: عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو، ئەوەیشی زیاد کرد: وتی: وە دەیفەرموو: ئەوەی لە تواناتاندایە لە کردەوەکان تەنها ئەوەندە ئەنجامی بدەن، چونکە بەڕاستی خوا بێزار نابێ تا ئێوە بێزار دەبن، وە خۆشەویستترین نوێژ لە لای ﷺ بەردەوامبوون بوو لەسەری -ئەگەر چی کەمیش بێت- وە کاتێ نوێژێکی بکردایە بەردەوام دەبوو لەسەری.**

## بَابُ بَدْءِ النَّبِيِّ ﷺ بِصِيَامِ عَاشُورَاءَ وَصَامَهُ

**٢٠٨٠-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ - يَعْنِي الْمَدِينَةَ - صَامَهُ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ فَكَانَ رَمَضَانُ هُوَ الْفَرِيضَةَ وَتَرَكَ عَاشُورَاءَ، فَكَانَ مَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ لَمْ يَصُمْهُ[٢].

## باسی دەستپێکی پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا، ئەو ڕۆژەی گرت

**واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: ڕۆژی عاشورا ڕۆژێك بوو قوڕەیش لە سەردەمی نەفامیدا ڕۆژوویان تیایدا دەگرت، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بوو فەرمانیشی کرد بە ڕۆژووگرتنی، کاتێ ڕەمەزان فەڕز کرا تەنها ئەوە بوو بە فەڕز، وە وازی لە ڕۆژووگرتنی عاشوڕا هێنا، هەر کەس بیویستایە بەڕۆژوو دەبوو، هەر کەسیش بیویستایە بەڕۆژوو نەدەبوو.**

**تێبینی:**

**عاشوڕا: بریتییە لە دەیەم ڕۆژ لە مانگی موحەڕەم لە ساڵنامەی کۆچی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ بَدْءَ صِيَامِ عَاشُورَاءَ كَانَ قَبْلَ فَرْضِ صَوْمِ شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٠٨١-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: دَخَلَ الْأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ ﷺ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَهُوَ يَتَغَدَّى، وَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: ادْنُ يَا أَبَا مُحَمَّدٍ فَاطْعَمْ، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: هَلْ تَدْرُونَ مَا كَانَ عَاشُورَاءُ؟ قَالَ: وَمَا كَانَ؟ قَالَ: كَانَ يَصُومُهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ رَمَضَانُ، ثُمَّ تَرَكَهُ وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ خَشْرَمٍ، وَيُوسُفُ: فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ تَرَكَهُ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی سەرەتای دەستپێکردنی ڕۆژووی عاشورا پێش فەرزبوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بوو

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: ئەشعەسی کوڕی قەیس ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای عەبدوڵا لە ڕۆژی عاشوڕا، ئەو نانی دەخوارد، عەبدوڵا پێی وت: فەرموو نزیك بەرەوە نان بخۆ، وتی: من بەڕۆژووم، عەبدوڵا وتی: ئایا دەزانن عاشوڕا کەی بوو؟ وتی: کەی بوو؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووی عاشوڕای دەگرت پێش ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان دابەزێت، پاشان وازی لێ هێنا. عەلی کوڕی خەشرەم و یوسف (کە یەکێکن لە گێڕەرەوەی ئەم فەرمودە) وتیان: کاتێ ڕەمەزان دابەزی وازی لێ هێنا.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ تَرْكَ النَّبِيِّ ﷺ صَوْمَ عَاشُورَاءَ بَعْدَ نُزُولِ فَرْضِ صَوْمِ رَمَضَانَ إِنْ شَاءَ تَرَكَهُ، لَا أَنَّهُ كَانَ يَتْرُكُهُ عَلَى كُلِّ حَالٍ، بَلْ كَانَ يَتْرُكُهُ إِنْ شَاءَ تَرَكَهُ، وَيَصُومُ إِنْ شَاءَ صَامَهُ

**٢٠٨٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ عَاشُورَاءُ يَوْمًا يَصُومُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْهُ، فَقَالَ: «يَوْمٌ مِنْ أَيَّامِ اللَّهِ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ»[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی وازهێنانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشوڕا دوای دابەزینی فەرزبوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بوو، ئەگەر بیویستایە نەیدەگرت، نەك بەو مانای بەڕەهایی وازی لە ڕۆژووگرتنی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





**شەعبان هێنا، بەڵکوو ئەگەر بیویستایە ڕۆژووی تێدا نەگرێ نەیدەگرت، وە ئەگەر بیویستایە ڕۆژووی تیایدا بگرێ دەیگرت**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: عاشورا ڕۆژێك بوو لە سەردەمی نەفامی خەڵك تیایدا بەڕۆژوو دەبوون، کاتێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرز بوو، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژە، فەرمووی: ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی خوا، هەر کەس ویستی بەڕۆژوو بێت، هەر کەسیش ویستی وازی لێ بهێنێ.

**بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ غَلَطَ فِي مَعْنَاهُ عَالِمٍ مِمَّنْ لَمْ يَفْهَمْ مَعْنَى الْخَبَرِ، وَتَوَهَّمَ أَنَّ الْأَمْرَ لِصَوْمِ عَاشُورَاءَ جَمِيعًا مَنْسُوخٌ بِفَرْضِ صَوْمِ رَمَضَانَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ: أُمِرْنَا بِصَوْمِ عَاشُورَاءَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ رَمَضَانُ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ لَمْ نُؤْمَرْ بِهِ، خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ الزَّكَاةِ**

**٢٠٨٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: كُنَّا نَصُومُ عَاشُورَاءَ قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ رَمَضَانُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَحُثُّنَا عَلَيْهِ، وَيَتَعَهَّدُنَا عَلَيْهِ، فَلَمَّا افْتُرِضَ رَمَضَانُ لَمْ يَحُثَّنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يَتَعَهَّدْنَا عَلَيْهِ، وَكُنَّا نَفْعَلُهُ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ مَبْنِيٌّ بِخَبَرِ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، وَفِيهِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّهُمْ قَدْ كَانُوا يَصُومُونَ عَاشُورَاءَ بَعْدَ نُزُولِ فَرْضِ رَمَضَانَ كَخَبَرِ ابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ لَمْ يَصُمْهُ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَأَلَنِي مُسَدَّدٌ وَهُوَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا، عَنْ مَعْنَى خَبَرِ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، فَقُلْتُ لَهُ مُجِيبًا لَهُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِذَا أَمَرَ أُمَّتَهُ بِأَمْرٍ مَرَّةً وَاحِدَةً لَمْ يَجِبْ أَنْ يَكُونَ الْأَمْرُ بِذَلِكَ فِي كُلِّ سَنَةٍ، وَلَا فِي كُلِّ وَقْتٍ ثَانٍ، وَكَانَ مَا أَمَرَ بِهِ فِي وَقْتٍ مِنَ الْأَوْقَاتِ، فَعَلَى أُمَّتِهِ فِعْلُ ذَلِكَ الشَّيْءِ إِنْ كَانَ الْأَمْرُ أَمْرَ فَرْضٍ، فَالْفَرْضُ وَاجِبٌ عَلَيْهِمْ أَبَدًا حَتَّى يُخْبِرَ فِي وَقْتٍ ثَانٍ أَنَّ ذَلِكَ الْفَرْضَ سَاقِطٌ عَنْهُمْ، وَإِنْ كَانَ الْأَمْرُ أَمْرَ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ وَفَضِيلَةٍ كَانَ ذَلِكَ الْفِعْلُ فَضِيلَةً أَبَدًا، حَتَّى يَزْجُرَهُمْ عَنْ ذَلِكَ الْفِعْلِ فِي وَقْتٍ ثَانٍ، وَلَيْسَ سَكْتُهُ فِي الْوَقْتِ الثَّانِي بَعْدَ الْأَمْرِ بِهِ فِي الْوَقْتِ الْأَوَّلِ يُسْقِطُ فَرْضًا إِنْ كَانَ أَمَرَهُمْ فِي الِابْتِدَاءِ أَمْرَ فَرْضٍ، وَلَا كَانَ سُكُوتُهُ فِي الْوَقْتِ الثَّانِي عَنِ الْأَمْرِ بِأَمْرِ الْفَضِيلَةِ مَا يُبْطِلُ أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ الْفِعْلُ فِي الْوَقْتِ الثَّانِي فِعْلَ فَضِيلَةٍ؛ لِأَنَّهُ إِذَا أَمَرَ بِالشَّيْءِ مَرَّةً كَفَى ذَلِكَ الْأَمْرُ إِلَى الْأَبَدِ،

---

(١) صحيح.




إِلَّا أَنْ يَأْمُرَ بِضِدِّهِ، وَالسَّكْتُ لَا يَفْسَخُ الْأَمْرَ. هَذَا مَعْنَى مَا أَجَبْتُ السَّائِلَ عَنْ هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ، وَلَعَلِّي زِدْتُ فِي الشَّرْحِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ عَلَى مَا أَجَبْتُ السَّائِلَ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ.

**باسی فەرموودەیەك زانایەك هەڵەی کردووە لە ماناکەیدا، لەو کەسانەی لە مانای فەرموودە تێناگەن، وە بەهەڵەدا چووە وایزانیوە هەموو ئەو فەرمانانەی کە کراون بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشوڕا نەسخ کراونەتەوە، بە فەرزبوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی عەمماری کوڕی یاسر: فەرمانمان پێ کرا بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشوڕا پێش ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز ببێ، کاتێ ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز بوو فەرمانمان پێ نەکرا، لە کتێبی زەکات باسم کردووە**

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: ئێمە ڕۆژی عاشوڕا بەڕۆژوو دەبووین پێش ئەوەی ڕەمەزان فەرز بکرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەداین و جەختی لەسەر دەکردەوە، کاتێ ڕەمەزان فەرز کرا پێغەمبەری خوا ﷺ نە هانی داین و نە جەختی لەسەر کردەوە، ئێمە هەر بەڕۆژوو دەبووین.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی جابری کوڕی سەمورە بونیاد نراوە بە فەرموودەکەی عەماری کوڕی یاسر، بەڵگەی تێدایە دوای دابەزینی فەرزبوونی ڕۆژووی ڕەمەزانیش ئەوان ڕۆژووی عاشوڕایان دەگرت، وەك لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر و عائیشەدا هاتووە، هەر کەس بیویستایە بەڕۆژوو دەبوو تیایدا، هەر کەسیش بیویستایە بەڕۆژوو نەدەبوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: موسەددەد کە یەکێکە لە هاوەڵەکانمان پرسیاری لێ کردم دەربارەی مانای فەرموودەکەی عەمار، وەڵامم دایەوە و وتم: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر فەرمانی کرد بە ئوممەتەکەی یەك جار واجب نییە هەموو ساڵێك فەرمان بەو شتە بکات، وە واجب نییە لە کاتی دووەمیشدا فەرمانمان پێ بکات، ئەوەی فەرمانی پێ کردووە لە کاتێك لە کاتەکان، (بەبێ دیاریکردنی کات) پێویستە لەسەر ئوممەتەکەی ئەو کارە بکەن ئەگەر فەرمانەکە فەرمانێکی فەرز بوو، جا فەرز پێویستە لەسەریان بەهەمیشەیی، تا لە کاتێکی دیکەدا هەواڵ دەدات ئەو فەرزە لەسەریان کەوتووە، وە ئەگەر فەرمانەکە فەرمانێك بوو





پەسەندبوون و ڕێنیشاندان و چاکە ئەوە ئەو کردەوە چاکەیە بۆ هەمیشەیی، تا لە کاتێکی دیکەدا سەرزەنشتیان دەکات لە ئەنجامدانی، جا بێدەنگبوونی لە کاتی دووەمدا دوای فەرمانکردنی پێی لە کاتی یەکەمدا فەڕزەکە هەڵناگرێ ئەگەر سەرەتا فەرمانی پێکردن بە فەرمانێکی فەڕز، هەروەها بێدەنگبوونیش لە کاتی دووەمدا لە ئاستی فەرمانەکە بە فەرمان بەوەی چاکە ئەوە پووچ ناکاتەوە لە کاتێکی دیکەدا ئەو کردەوە پووچ بێت، چونکە ئەگەر یەك جار فەرمانی بە شتێك کرد ئەو فەرمانە بەسە بۆ هەمیشەیی، مەگەر فەرمان بکات بە دژەکەی، بێدەنگبوونیش فەرمان هەڵناوەشێنێتەوە. ئەمە مانای وەڵامدانەوەمە بۆ ئەو کەسەی پرسیاری کردووە لەمبارەیەوە، وە ئەوکاتەی وەڵامی پرسیارکەرەکەم دایەوە لەبارەی ئەم بابەتە زیاتر شیم کردەوە.

**بَابُ عِلَّةِ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِصِيَامِ عَاشُورَاءَ بَعْدَ مَقْدِمِهِ الْمَدِينَةَ وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ مَذْهَبِنَا فِي مَعْنَى «أَوْلَى» ضِدَّ مَذْهَبِ مَنْ يَدَّعِي مَا لَا يُحْسِنُهُ مِنَ الْعِلْمِ، فَزَعَمَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ أَوْلَى بِفُلَانٍ مِنْ فُلَانٍ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ لِفُلَانٍ أَيْضًا وِلَايَةٌ، وَلَوْ كَانَ عَلَى مَا زَعَمَ، كَانَ الْيَهُودُ أَوْلِيَاءُ مُوسَى، وَالْمُسْلِمُونَ أَوْلَى بِهِ مِنْهُمْ**

**٢٠٨٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَجَدَ الْيَهُودَ يَصُومُونَ عَاشُورَاءَ، فَسُئِلُوا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالُوا: هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي أَظْهَرَ اللَّهُ فِيهِ مُوسَى وَبَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى فِرْعَوْنَ، وَنَحْنُ نَصُومُهُ تَعْظِيمًا لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَحْنُ أَوْلَى بِمُوسَى مِنْكُمْ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ»[1].

**باسی هۆکاری فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژووگرتنی عاشورا دوای هاتنی بۆ مەدینە، وە بەڵگە لەسەر ڕاستی مەزهەبەکەمان لە مانای (أَوْلَى)، واتە: لەپێشترە، دژی مەزهەبی ئەو کەسەی بانگەشەی شتێك دەکات لە زانست و چاکی لێ نازانێ، وا گومان دەبات دروست نییە بوترێ: فڵانە کەس لەپێشترە بە فڵانە کەس لە فڵان، ئیللا فڵانە کەسیش بەهەمان شێوە نزیکایەتی هەبێت، ئەگەر بەوشێوە بێت کە ئەو گومان دەبات، ئەوە جوولەکە پشتیوانی موسا (علیه السلام)ن، وە مسوڵمانان لەپێشترن بە موسا لەوان**

---

(١) صحیح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە جوولەکەکانی بینی ڕۆژووی عاشوڕایان دەگرت، پرسیاریان لێ کرا لەوبارەوە، وتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوا ﷻ موسا و نەوەکانی ئیسرائیلی سەرخست بەسەر فیرعەوندا، ئێمەیش بەڕۆژوو دەبین لەبەر بەگەورەدانانی ئەو ڕۆژە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێمە لەپێشترین بە موسا لە ئێوە، وە فەرمانی کرد بە ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژە.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِصِيَامِ عَاشُورَاءَ لَمْ يَكُنْ بِأَمْرِ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ بَدْءًا وَلَا عَدَدًا، وَأَنَّهُ كَانَ أَمْرَ فَضِيلَةٍ وَاسْتِحْبَابٍ

**٢٠٨٥-** عَنْ حُميد بن عبد الرحمن عن مُعَاوِيَةَ ﷺ، خَطَبَ بِالْمَدِينَةِ فِي قَدْمَةٍ قَدِمَهَا يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «هَذَا يَوْمُ عَاشُورَاءَ وَلَمْ يُكْتَبْ عَلَيْكُمْ صِيَامُهُ، وَأَنَا صَائِمٌ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصُومَ فَلْيَصُمْ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژووگرتنی عاشوڕا، نە بۆ فەرز بوو، نە بۆ واجب بوون، بەڵکوو فەرمانێك بوو بۆ بە چاك دانان

واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە موعاویەوە ﷺ، کاتێ هاتە مەدینە لە ڕۆژی عاشوڕادا وتارێکی دا، وتی: ئەی خەڵکی مەدینە زاناکانتان لە کوێن؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەمڕۆ ڕۆژی عاشوڕایە ڕۆژووگرتنی لەسەرتان فەرز نەکراوە، منیش بەڕۆژووم، هەر کەس ویستی بەڕۆژوو بێت با بەڕۆژوو بێت.

## بَابُ فَضِيلَةِ صِيَامِ عَاشُورَاءَ وَتَحَرِّي النَّبِيِّ ﷺ صِيَامَهُ لِفَضْلِهِ مِنْ بَيْنِ الْأَيَّامِ خَلَا صِيَامَ رَمَضَانَ

**٢٠٨٦-** عَنْ سفيانَ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ وَهُوَ ابْنُ أَبِي يَزِيدَ، وَأَتْقَنْتُهُ مِنْهُ، سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: مَا عَلِمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَامَ يَوْمًا يَتَحَرَّى فَضْلَهُ إِلَّا عَاشُورَاءَ؟ وَهَذَا شَهْرُ رَمَضَانَ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژووگرتنی عاشورا و پێداگری پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕۆژووگرتنی، لەبەر فەزڵ و ڕێزی لە نێوان ڕۆژەکانی دیکەدا جگە لە ڕۆژووی ڕەمەزان

واتە: سوفیان دەڵێ: عوبەیدوڵای کوڕی ئەبو یەزید بۆی باس کردین، منیش بەچاکی لێم وەرگرت، پرسیار کرا لە ئیبنو عەباس ﷺ دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا، وتی: نەمزانیوە پێغەمبەر ﷺ جگە لە ڕۆژووی ڕەمەزان، ڕۆژێك بەڕۆژوو بووبێت و پێداگری لەسەر فەزڵەکەی کردبێت جگە لە عاشورا (کە ڕۆژی دەیەمە لە مانگی موحەڕەم).

## بَابُ ذِكْرِ تَكْفِيرِ الذُّنُوبِ بِصِيَامِ عَاشُورَاءَ وَالْبَيَانِ أَنَّ الْعَمَلَ الصَّالِحِ يَتَقَدَّمُ الْفِعْلَ، الشَّيْءُ يَكُونُ بَعْدَهُ فَيُكَفِّرُ الْعَمَلُ الصَّالِحُ الذُّنُوبَ تَكُونُ بَعْدَ الْعَمَلِ الصَّالِحِ، لَا كَمَا يَتَوَهَّمُ مَنْ خَالَفَنَا فِي تَقْدِيمِ كَفَّارَةِ الْيَمِينِ قَبْلَ الْحِنْثِ، وَزَعَمَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَتَقَدَّمَ الْمَرْءُ عَمَلًا صَالِحًا يُكَفِّرُ ذَنْبًا يَكُونُ بَعْدَهُ

**٢٠٨٧-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي لَأَحْسَبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ، وَصِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ فَإِنِّي لَأَحْسَبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالَّتِي بَعْدَهُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ صِيَامَ يَوْمِ عَرَفَةَ يُكَفِّرُ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالَّتِي بَعْدَهُ، فَدَلَّ أَنَّ الْعَمَلَ الصَّالِحَ قَدْ يَتَقَدَّمُ الْفِعْلَ فَيَكُونُ الْعَمَلُ الصَّالِحُ الْمُتَقَدِّمُ يُكَفِّرُ السَّنَةَ الَّتِي تَكُونُ بَعْدَهُ.

**باسی کەفارەتی گوناهەکان بە ڕۆژووگرتنی عاشورا، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی کردەوەی چاك دەبێتە مایەی سڕینەوەی ئەو گوناهانەی دواتر ئەنجامی دەدات، بەوشێوە نییە کە ئەو کەسەی ڕای جیاوازە لەگەڵ ئێمە وا خەیاڵ دەکات ئەو کەسەی دەیەوێت سوێندەکەی بشکێنێت پێویستە پێش شکاندنی سوێندەکە سەرەتا کەفارەتەکەی بدات، هەروەها پێی وایە دروست نییە کەسێك کردەوەیەکی چاك ئەنجام بدات ببێتە کەفارەتی گوناهێك دواتر بیکات**

---

(١) صحیح.





واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشوڕا من وا حیساب دەکەم خوا بیکاتە کەفارەتی ئەو ساڵەی پێشووی، هەروەها ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عەرەفە من وا حیساب دەکەم خوا بیکاتە کەفارەتی ئەو ساڵەی پێشووی و ئەو ساڵەیشی لەدوای ئەو دێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە کە ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە دەبێتە کەفارەتی ساڵەکەی پێشووی و ئەو ساڵەیشی بەدوای ئەودا دێت، جا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کردەوەی چاك هەندێ جار پێشی ئەو کردارە (گوناهە) دەکەوێت، بۆیە کردەوەی چاك لە پێشەوە دەبێتە کەفارەتی ئەو ساڵەی کە بەدوایدا دێت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَرْكِ الْأُمَّهَاتِ إِرْضَاعَ الْأَطْفَالِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ تَعْظِيمًا ل يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ خَالِدِ بْنِ ذَكْوَانَ

**٢٠٨٨-** عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ ﷺ قَالَتْ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى قُرَى الْأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: «مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، فَكُنَّا بَعْدُ نَصُومُهُ، وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا الصِّغَارَ، وَنَذْهَبُ بِهِمْ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ أَعْطَيْنَاهُ إِيَّاهُ حَتَّى يَكُونَ عِنْدَ الْإِفْطَارِ»[١].

## باسی چاکتر وایە لە ڕۆژی عاشوڕادا دایکان واز بهێنن لە شیردانی منداڵەکانیان، لەبەر ڕێز و شکۆی ڕۆژی عاشوڕا، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی خالیدی کوڕی زەکوان[٢]

واتە: ڕەبیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفراء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرلەبەیانی عاشوڕا نێردراوی نارد بۆ گوندەکانی ئەنصار کە لە دەوروبەری مەدینە بوون: هەر کەس بەیانی کردۆتەوە بەڕۆژوو بووە با بەردەوام بێت لە ڕۆژووگرتنی، هەر کەسیش بەیانی کردۆتەوە و نانی خواردووە با ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بێت، وتی: ئێمە دوای ئەوە ڕۆژوومان دەگرت و ڕۆژوویشمان بە منداڵە بچووکەکانمان

---

(١) صحيح.

(٢) ) کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە.

دەگرت و دەمانبردن بۆ مزگەوت، هەروەها یاریمان بۆ دروست دەکردن لە خوری، ئەگەر یەکێکیان بگریایە بۆ نانخواردن پێمان دەدا هەتا کاتی ڕۆژووشکاندن.

**٢٠٨٩-** عَنْ غَلِيلَةَ بِنْتِ أُمَيْنَةَ أَمَةُ اللَّهِ وَهِيَ بِنْتُ رُزَيْنَةَ قَالَتْ: قُلْتُ لِأُمِّي ﵄: أَسَمِعْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي عَاشُورَاءَ؟ قَالَتْ: كَانَ يُعَظِّمُهُ، وَيَدْعُو بِرُضَعَائِهِ وَرُضَعَاءِ فَاطِمَةَ، فَيَتْفُلُ فِي أَفْوَاهِهِمْ، وَيَأْمُرُ أُمَّهَاتِهِنَّ أَلَّا يُرْضِعْنَ إِلَى اللَّيْلِ[١].

**واتە:** غەلیلەی کچی ئومەیە کە کچی ڕوزەینەیە وتی: بە دایکمم ﵄ وت: ئایا هیچت بیستووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی ڕۆژی عاشورا؟ وتی: بەگەورەی دادەنا، وە بانگی منداڵە شیرەخۆرەکانی دەکرد، وە شیرەخۆرەکانی فاتیمەیش، تفی دەکردە نێو دەمیان و فەرمانی دەکرد بە دایکانیان شیریان پێ نەدەن تا شەو.

**٢٠٩٠-** عَنْ عَلِيلَةَ بِنْتِ الْكُمَيْتِ الْعَتَكِيَّةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ أُمِّي أُمَيْنَةَ ﵂ بِمِثْلِهِ. وَزَادَ: فَكَانَ اللَّهُ يَكْفِيهِمْ، وَقَالَ: وَكَانَتْ أُمُّهَا خَادِمَةَ النَّبِيِّ ﷺ، يُقَالُ لَهَا: رُزَيْنَةُ[٢].

**واتە:** عەلیلەی کچی کومەیتی عەتەکییە دەڵێ: گوێم لە ئومەییەی دایکم بوو ﵄ بە هەمان شێوەی فەرموودەی پێشووی فەرموو، ئەوەیشی زیاد کرد: بێگومان خوا بێنیازیانی دەکرد، وە وتی: دایکی خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بوو پێی دەوترا: ڕوزەینە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِصِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنْ أَصْبَحَ الْمَرْءُ غَيْرَ نَاوٍ لِلصِّيَامِ غَيْرَ مُجْمِعٍ عَلَى الصِّيَامِ مِنَ اللَّيْلِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَا يُجْمِعُ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، صَوْمَ الْوَاجِبِ دُونَ صَوْمِ التَّطَوُّعِ

**٢٠٩١-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ عَاشُورَاءَ فَقَالَ: «أَصُمْتُمْ يَوْمَكُمْ هَذَا؟» فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَعَمْ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا، قَالَ: «فَأَتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمْ هَذَا، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُؤْذِنُوا أَهْلَ الْعُرُوضِ أَنْ يُتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ ذَلِكَ»[٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

**باسی فەرمانکردن بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا، ئەگەر بەندە بەیانی کردەوە لە شەوەکەیدا نییەتی ڕۆژووی نەهێنابوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (لَا صِيَامَ لِمَنْ لَا يَجْمِعُ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ)، واتە: هەر کەس لە شەودا نییەتی ڕۆژووی نەهێنا ڕۆژووی بۆ نییە ڕۆژووی واجبە نەك ڕۆژووی سوننەت**

واتە: موحەممەدی کوڕی صەیفی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ نێومان لە ڕۆژی عاشورا، فەرمووی: ئایا ئێوە ئەمڕۆ بەڕۆژوون؟ هەندێکیان وتیان: بەڵێ، هەندێکی دیکەیان وتیان: نەخێر، فەرمووی: ئەوەی ماوە لە ڕۆژەکەتان تەواوی بکەن، (واتە: دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵبگرن، لەبەر ڕێزی ئەم ڕۆژە)، خەڵکی مەککەو مەدینەو دەوروبەریان ئاگادار بکەنەوە، با ئەوبەشەی ماوە لە ڕۆژەکەیان بەو شێوەیە تەواوی بکەن.

**بَابُ الْأَمْرِ بِصِيَامِ بَعْضِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ إِذَا لَمْ يَعْلَمِ الْمَرْءُ بِيَوْمِ عَاشُورَاءَ قَبْلَ أَنْ يَطْعَمَ وَالْفَرْقُ فِي الصَّوْمِ بَيْنَ عَاشُورَاءَ وَبَيْنَ غَيْرِهِ، إِذْ صَوْمُ بَعْضِ يَوْمٍ لَا يَكُونُ صَوْمًا فِي غَيْرِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، لِمَا خَصَّ النَّبِيُّ ﷺ بِهِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَأَمَرَ بِصَوْمِ بَعْضِ ذَلِكَ الْيَوْمِ، وَإِنْ كَانَ الْمَرْءُ قَدْ طَعِمَ أَوَّلَ النَّهَارِ**

**٢٠٩٢-** عَنْ سَلَمَةَ وَهُوَ ابْنُ الْأَكْوَعِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ: «أَذِّنْ فِي قَوْمِكَ أَوْ فِي النَّاسِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ أَنَّ مَنْ أَكَلَ فَلْيَصُمْ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَكَلَ فَلْيَصُمْ»[(١)].

**باسی فەرمانکردن بە ڕۆژووگرتنی بەشێك لە ڕۆژی عاشورا، ئەگەر بەندە نەیزانی بە ڕۆژی عاشورا، جیاوازی لە نێوان ڕۆژووی عاشورا و جگە لە عاشورا، ئەوەیە ڕۆژووگرتنی بەشێك لە ڕۆژ تەنها بۆ ڕۆژی عاشورایە بۆ جگە لە عاشورا نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی عاشورای تایبەت کرد، فەرمانی کرد بە ڕۆژووگرتنی بەشێك لەو ڕۆژە، ئەگەرچی بەندە خواردنیشی خواردبوو**

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەگێڕێتەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو لە هۆزی ئەسلەم بوو: بانگەواز بکە لەنێو هۆزەکەت یان لەنێو خەڵك لە

---

(١) صحيح.

ڕۆژی عاشورا، هەر کەس نانی خواردووە با ئەو بەشەی ماوە لە ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بێت، هەر کەسیش نانی نەخواردووە با بەڕۆژوو بێت

**٢٠٩٣-** خَبَرُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، وَمُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمِنْهَالِ الْخُزَاعِيِّ، عَنْ عَمِّهِ وَأَسْمَاءَ بْنِ حَارِثَةَ، وَبَعْجَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، كُلُّهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا الْمَعْنَى، وَقَدْ خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ[1].

واتە: فەرموودەکەی هەریەك لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ و موحەممەدی کوڕی صەیفی و عەبدوڵای کوڕی مینهالی خوزاعی، لە مامیەوە، وە ئەسمائی کوڕی حاریسەو بەعجەی کوڕی عەبدوڵای جوهەنی لە باوکیەوە، هەموویان لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەم مانایە هاتووە، بێگومان لە کتێبی (الکبیر) تەخریجم کردووە.

## بَابُ ذِكْرِ التَّخْيِيرِ بَيْنَ صِيَامِ عَاشُورَاءَ وَإِفْطَارِهِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِصَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ أَمْرُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ وَفَضِيلَةٍ

**٢٠٩٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْيَوْمُ عَاشُورَاءُ، فَمَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُفْطِرْ»[2].

## باسی سەرپشککردن لە نێوان ڕۆژووگرتنی عاشورا و ڕۆژوونەگرتنی، وە بەڵگەش لەسەر فەرمان کردن بە ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا فەرمانێکە بۆ پەسەندبوون و ڕێنیشاندان و چاکە

---

(١) حديث أبي سعيد الخدري أخرجه: الطبراني في **المعجم الأوسط** (٣٢٣١)، **ومسند الشاميين** له (١٩٣٨). وحديث محمد بن صيفي سبق تخريجه عند الحديث (٢٠٩١).

وحديث عبد الله بن المنهال الخزاعي، عن عمه أخرجه: أحمد ٣٦٨/٥ و ٤٠٩، وأبو داود (٢٤٤٧)، والنسائي في **الكبرى** (٢٨٥٠) و (٢٨٥١) و (٢٨٥٢)، والطحاوي في **شرح المشكل** (٢٢٧٢) و (٢٢٧٣)، والبيهقي ٢٢١/٤.

وحديث أسماء بن حارثة أخرجه: أحمد ٤٨٤/٣، والبزار (١٠٤٨)، وابن حبان (٣٦١٨)، والطبراني في الكبير (٨٦٩)، وفي **الأوسط** له (٢٥٨٨)، وأبو نعيم في **معرفة الصحابة** (١٠٦٤)، وفي **الحلية** له ٣٤٩/١.

وأما حديث بعجة بن عبد الله الجهني، عن أبيه فأخرجه: أحمد ٤٦٧/٦، والبخاري في **التاريخ الكبير** ٢٣/٥، وابن أبي عاصم في **الآحاد والمثاني** (٢٥٨١)، والبزار (١٠٤٩)، وابن قانع في **معجم الصحابة** ٧٩/٢، والطبراني في **الأوسط** (٥٦٧٩)، وفي **مسند الشاميين** له (٢٨١٦).

(٢) صحيح.




واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەمڕۆ عاشوڕایە، هەر کەس ویستی با بەڕۆژوو بێت، هەر کەسیش ویستی با بەڕۆژوو نەبێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِأَنْ يُصَامَ قَبْلَ عَاشُورَاءَ يَوْمًا أَوْ بَعْدَهُ يَوْمًا مُخَالَفَةً لِفِعْلِ الْيَهُودِ فِي صَوْمِ عَاشُورَاءَ

**٢٠٩٥-** عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صُومُوا يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَخَالِفُوا الْيَهُودَ، صُومُوا قَبْلَهُ يَوْمًا، أَوْ بَعْدَهُ يَوْمًا»[1].

## باسی فەرمانکردن بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژێك پێش عاشوڕا، یان ڕۆژێك دوای عاشوڕا، وەکوو پێچەوانەکردنی کردەوەی جوولەکە لە ڕۆژووی عاشوڕا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی عاشوڕا بەڕۆژوو بن، وە پێچەوانەی جوولەکە بکەن، ڕۆژێك لە پێشیەوە بەڕۆژوو بن، یان ڕۆژێك لە دوایەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَوْمِ يَوْمِ التَّاسِعِ مِنَ الْمُحَرَّمِ اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ ﷺ

**٢٠٩٦-** عَنِ الْحَكَمِ بْنِ الْأَعْرَجِ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ صِيَامِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: اعْدُدْ، فَإِذَا أَصْبَحْتَ يَوْمَ التَّاسِعِ مِنْ مُحَرَّمٍ فَأَصْبِحْ صَائِمًا، قَالَ: قُلْتُ: أَكَذَاكَ كَانَ مُحَمَّدٌ ﷺ يَصُومُ؟ قَالَ: كَذَاكَ كَانَ يَصُومُ[2].

## باسی چاکتر وایە ڕۆژی نۆیەمی مانگی موحەڕەم ڕۆژووی تێدا بگیرێ، وەکوو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: حەکەمی کوڕی ئەعرەج دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەباس ﷺ کرد ئەو لە مزگەوتی حەڕامدا بوو عەباکەی خستبووە ژێر سەری، پرسیارم لێ کرد دەربارەی ڕۆژووی عاشوڕا، وتی: ڕۆژەکان بژمێرە، ئەگەر بەیانیت کردەوە لە ڕۆژی نۆیەمی

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.





مانگی موحەڕەم ئەوا ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بە، وتی: وتم: ئایا موحەممەد ﷺ بەوشێوە بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: بەوشێوە بەڕۆژوو دەبوو.

**٢٠٩٧-** عَنِ الْحَكَمِ بْنِ الْأَعْرَجِ بِمِثْلِهِ، وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ فِي زَمْزَمَ[١].

واتە: حەکەمی کوڕی ئەعرەج دەگێڕێتەوە، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو، عەباکەی خستبووە ژێر سەری لەلای زەمزەم.

**٢٠٩٨-** عَنِ الْحَكَمِ بْنِ الْأَعْرَجِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي يَوْمِ عَاشُورَاءَ قَالَ: هُوَ يَوْمُ التَّاسِعِ. قُلْتُ: كَذَلِكَ صَامَ مُحَمَّدٌ ﷺ[٢].

واتە: حەکەمی کوڕی ئەعرەج دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عەباسەوە رضي الله عنهما (پرسیاری لێ کرا) دەربارەی ڕۆژی عاشورا، وتی: ڕۆژی نۆیەمە، وتم: موحەممەد ﷺ بەوشێوە بەڕۆژوو بوو.

## بَابُ فَضْلِ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَتَكْفِيرِ الذُّنُوبِ بِلَفْظِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە و سڕینەوەی گوناهەکان بە دەستەواژەیەکی کورت و پوختکراوە (مُجْمَل) نەك شیکراوە (مُفَسَّر)، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو قەتادە هاتووە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ڕۆژووی عەرەفە دەبێتە کەفارەتی گوناهی ساڵێکی ڕابردوو، وە ساڵێکی داهاتووش. ئەم فەرموودەیەم لە بەشی ڕۆژووی عاشورا باس کردووە**

**٢٠٩٩-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرَ أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «صَوْمُ عَرَفَةَ يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ، وَالسُّنَّةَ الْمُقْبِلَةَ»، أَمْلَيْتُهُ فِي بَابِ صَوْمِ عَاشُورَاءَ»[٣].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو قەتادە هاتووە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ڕۆژووی عەرەفە دەبێتە کەفارەتی گوناهی ساڵێکی ڕابردوو، وە ساڵێکی داهاتووش. ئەم فەرموودەیەم لە بەشی ڕۆژووی عاشوڕادا باس کردووە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢١٠٠-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَوْمُ عَرَفَةَ، وَيَوْمُ النَّحْرِ، وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[1].

**باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی نەهیکردن لە ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، کورت و پوختکراوەیە (مُجْمَل) نەك شیکراوە (مُفَسَّر)**

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربانی و ڕۆژەکانی تەشریق جەژنی ئێمەی مسوڵمانە، ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ مُفَسِّرٍ لِلَّفْظَتَيْنِ الْمُجْمَلَتَيْنِ اللَّتَيْنِ ذَكَرْتُهُمَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَرِهَ صَوْمَ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَاتٍ لَا غَيْرِهِ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ: صَوْمُ يَوْمِ عَرَفَةَ يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ، وَالسَّنَةَ الْمُسْتَقْبَلَةَ بِغَيْرِ عَرَفَاتٍ

**٢١٠١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَاتٍ[2].

**باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەی هەردوو فەرموودەکەی پێشەوەیە کە باسمان کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفەی بۆ ئەو کەسە پێناخۆش بووە کە لەسەر کێوی عەرەفاتە نەك کەسانی دیکە، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: ڕۆژووی عەرەفە دەبێتە کەفارەتی گوناهیساڵی ڕابردوو، وە ساڵی داهاتوویش بۆ ئەو کەسەیە کە لە عەرەفات نییە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عەرەفە لە کێوی عەرەفات.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.




## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْإِفْطَارِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَاتٍ اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ ﷺ وَتَقَوِّيًا بِالْفِطْرِ عَلَى الدُّعَاءِ، إِذِ الدُّعَاءُ يَوْمَ عَرَفَةَ أَفْضَلُ الدُّعَاءِ أَوْ مِنْ أَفْضَلِهِ

**٢١٠٢-** عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَفْطَرَ بِعَرَفَةَ، أُتِيَ بِلَبَنٍ فَشَرِبَ[١].

**باسی چاکتر وایە بەندە لە ڕۆژی عەرەفە لە عەرەفات بەرۆژوو نەبێت، لەبەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها بۆ ئەوەی توانای هەبێت بپاڕێتەوە، چونکە پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە چاکترینی پاڕانەوەکانە، یان لە چاکترینیانە**

واتە: ئوممو فەزڵ ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە بەرۆژوو نەبوو، شیری بۆ هێنرا خواردیەوە.

## بَابُ ذِكْرِ إِفْطَارِ النَّبِيِّ ﷺ فِي عَشْرِ ذِي الْحِجَّةِ

**٢١٠٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَصُمِ الْعَشْرَ، وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ: قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَائِمًا فِي الْعَشْرِ قَطُّ[٢].

**باسی بەرۆژوونەبوونی پێغەمبەر ﷺ لە دە ڕۆژی مانگی (ذِي الْحِجَّةِ)**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ) بەرۆژوو نەبوو. ئەبو بەکر لە فەرموودەکەیدا وتی: عائیشە وتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە لە دە ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ) بەرۆژوو بێت.

## بَابُ ذِكْرِ عِلَّةٍ قَدْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتْرُكُ لَهَا بَعْضَ أَعْمَالِ التَّطَوُّعِ، وَإِنْ كَانَ يَحُثُّ عَلَيْهَا، وَهِيَ خَشْيَةَ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْهِمْ ذَلِكَ الْفِعْلُ مَعَ اسْتِحْبَابِهِ ﷺ مَا خُفِّفَ عَلَى النَّاسِ مِنَ الْفَرَائِضِ

**٢١٠٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتْرُكُ الْعَمَلَ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَفْعَلَهُ خَشْيَةَ أَنْ يُسْتَنَّ بِهِ، فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ، وَكَانَ يُحِبُّ مَا خَفَّ عَلَى النَّاسِ مِنَ الْفَرَائِضِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی پێغەمبەر ﷺ وازی لە هەندێ سوننەت دەهێنا لەبەر هۆکارێکی تایبەت، ئەگەرچی جەختی لەسەری دەکردەوە، ئەویش لەبەر مەترسی ئەوەی ئەو کردەوە فەرز نەبێت لەسەریان، لەگەڵ ئەوەدا پێی خۆش بوو ﷺ فەرزەکان لەسەر خەڵك سووك و ئاسان بکرێن

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە کردەوەیەك دەهێنا لەبەر مەترسی ئەوەی خەڵکی شوێنی بکەون و فەرز بێت لەسەریان، وە پێی خۆش بوو فەرزەکان سووك و ئاسان بن لەسەر خەڵك.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَوْمِ يَوْمٍ وَإِفْطَارِ يَوْمٍ، وَالْإِعْلَامِ بِأَنَّهُ صَوْمُ نَبِيِّ اللَّهِ دَاوُدَ ﷺ

**٢١٠٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: كُنْتُ رَجُلًا مُجْتَهِدًا، فَزَوَّجَنِي أَبِي، ثُمَّ زَارَنِي، فَقَالَ لِلْمَرْأَةِ: كَيْفَ تَجِدِينَ بَعْلَكِ؟ فَقَالَتْ: نِعْمَ الرَّجُلُ مِنْ رَجُلٍ لَا يَنَامُ، وَلَا يُفْطِرُ قَالَ: فَوَقَعَ بِي أَبِي، ثُمَّ قَالَ: زَوَّجْتُكَ امْرَأَةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَعَضَلْتَهَا؟، فَلَمْ أُبَالِ مَا قَالَ لِي مِمَّا أَجِدُ مِنَ الْقُوَّةِ وَالِاجْتِهَادِ، إِلَى أَنْ بَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: لَكِنِّي أَنَامُ وَأُصَلِّي، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، فَنَمْ وَصَلِّ، وَأَفْطِرْ، وَصُمْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ قَالَ: فَصُمْ صَوْمَ دَاوُدَ، صُمْ يَوْمًا وَأَفْطِرْ يَوْمًا، وَاقْرَأِ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ شَهْرٍ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ قَالَ: اقْرَأْهُ فِي خَمْسَ عَشْرَةَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ. قَالَ حُصَيْنٌ: فَذَكَرَ لِي مَنْصُورٌ، عَنْ مُجَاهِدٍ أَنَّهُ بَلَغَ سَبْعًا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ لِكُلِّ عَمَلٍ شِرَّةً، وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةٌ، فَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى سُنَّتِي فَقَدِ اهْتَدَى، وَمَنْ كَانَتْ فَتْرَتُهُ إِلَى غَيْرِ ذَلِكَ فَقَدْ هَلَكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَأَنْ أَكُونَ قَبِلْتُ رُخْصَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي مِثْلُ أَهْلِي وَمَالِي، وَأَنَا الْيَوْمَ شَيْخٌ قَدْ كَبِرْتُ وَضَعُفْتُ، وَأَكْرَهُ أَنْ أَتْرُكَ مَا أَمَرَنِي بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

## باسی ڕۆژووگرتنی ڕۆژ نا ڕۆژێك لە کارە چاکەکانە، ئەو ڕۆژووگرتنە ڕۆژووی پێغەمبەر داوودە ﷺ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێ: من پیاوێك بووم پەرستشم زۆر دەکرد، باوکم ژنی بۆ هێنام، پاشان سەردانی کردم، بە ژنەکەمی وت: مێردەکەت چۆن دەبینی؟ وتی:

---

(١) صحیح.

چاکترین پیاوە نە شەو دەخەوێ و نە ڕۆژیش نان دەخوا، وتی: باوکم سەرزەنشتی کردم، پاشان وتی: ئافرەتێ لە مسوڵمانانم بۆت خواستووە و پشت گوێت خستووە؟ منیش گوێم نەدا بە قسەکەی چونکە لە خۆمدا هێز و توانایەکم بەدی دەکرد لەسەر ڕۆژووگرتن، تا ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بەڵام من دەخەوم و شەونوێژ دەکەم، وە بەڕۆژوو دەبم و بەڕۆژووش نابم، تۆش بخەوە و شەونوێژ بکە، بەڕۆژوو مەبە و ڕۆژووش بگرە، لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: ڕۆژوو بگرە وەکوو ڕۆژووی داود (علیه السلام)، ڕۆژێك بەڕۆژوو بە و ڕۆژێکیش بەڕۆژوو مەبە، لە هەموو مانگێکدا قوڕئان بخوێنەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: لە پازدە ڕۆژدا بیخوێنە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەوە زیاتر دەتوانم. وە حوصەین وتی: مەنصور بۆی باس کرد لە موجاهیدەوە ئەو گەیشتە حەوت ڕۆژ، (واتە: بە حەوت ڕۆژ قوڕئان بخوێنێتەوە) پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی بۆ هەموو کردەوەیەك حەز و چالاکی سووربوون هەیە (بۆ نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە)، وە هەموو حەز و چالاکییەك ماوەیەکە، جا هەر کەس حەز و چالاکی بۆ لای سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئەوا سەرفراز بووە، هەر کەسیش حەز و ئارەزووەکەی بۆ لای جگە لە ئەوە بوو ئەوە لەنێو چووە. عەبدوڵا وتی: ئەگەر مۆڵەتەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ وەربگرتایە لەلام خۆشەویستتر بوو هاوشێوەی ماڵ و سامانم، من ئەمڕۆ پیر و لاواز بووم، وە پێم خۆش نییە دەستبەرداری ئەوە بم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووم.

## بَابُ الْإِخْبَارِ بِأَنَّ صَوْمَ يَوْمٍ، وَفِطْرَ يَوْمٍ أَفْضَلُ الصِّيَامِ، وَأَحَبُّهُ إِلَى اللَّهِ وَأَعْدَلُهُ

**٢١٠٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الصَّوْمِ، فَقَالَ: «صُمْ يَوْمًا مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ»، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «صُمْ يَوْمَيْنِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ»، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: «صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ»، قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: «صُمْ أَرْبَعَةَ أَيَّامٍ وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ»، قَالَ: إِنِّي أُطِيقُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحَبَّ الصِّيَامِ صَوْمُ دَاوُدَ، كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا»[1].

---

(١) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: «صُمْ صِيَامَ دَاوُدَ فَإِنَّهُ أَعْدَلُ الصِّيَامِ عِنْدَ اللَّهِ».

## باسی هەواڵدان لەبارەی ڕۆژووگرتنی ڕۆژ نا ڕۆژێك چاكترین و خۆشەویستترین و دادپەروەرترینی نێو ڕۆژووەكانە لای خوا ﷻ

واتە: عەبدوڵای كوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارم لێ كرد لەبارەی ڕۆژوو، فەرمووی: لە هەموو مانگێك ڕۆژێك بەڕۆژوو بە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە كە ماوەتەوە (واتە: پاداشتی بیست و نۆ ڕۆژەكەی دیكەت بۆ هەیە)، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: لە هەموو مانگێكدا دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە كە ماوەتەوە، وتم: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە كە ماوەتەوە، وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم، فەرمووی: چوار ڕۆژ بەڕۆژوو بە پاداشتی ئەو ڕۆژانەت بۆ هەیە كە ماوەتەوە، وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خۆشەویسترین ڕۆژوو لەلای خوا، ڕۆژووی داود (علیه السلام) بوو ئەو ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێكیش بەڕۆژوو نەدەبوو.

ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكەی ئەبو سەلەمە لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە هاتووە، ڕۆژوو بگرە وەكوو ڕۆژووگرتنی داود (علیه السلام) چونكە ئەوە دادپەروەرترین ڕۆژووە لەلای خوا.

**٢١٠٧-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، صُمْ صِيَامَ دَاوُدَ فَإِنَّهُ أَعْدَلُ الصِّيَامِ عِنْدَ اللَّهِ[١].

واتە: ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكەی ئەبو سەلەمە لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە هاتووە، ڕۆژوو بگرە وەكوو ڕۆژووگرتنی داود (علیه السلام) چونكە ئەوە دادپەروەرترین ڕۆژووە لەلای خوا.

---

(١) صحيح.




**٢١٠٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄، أَفْضَلُ الصِّيَامِ صِيَامُ دَاوُدَ (عليه السلام)[١].

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە، چاکترین ڕۆژوو ڕۆژووی پێغەمبەر داودە (عليه السلام).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا خَبَّرَ أَنَّ صِيَامَ دَاوُدَ أَعْدَلُ الصِّيَامِ وَأَفْضَلُهُ، وَأَحَبُّهُ إِلَى اللَّهِ إِذْ صَائِمُ يَوْمٍ، مُفْطِرُ يَوْمٍ يَكُونُ مُؤَدِّيًا لِحَظِّ نَفْسِهِ وَعَيْنِهِ وَأَهْلِهِ أَيَّامَ فِطْرِهِ، وَلَا يَكُونُ مُضَيِّعًا لِحَظِّ نَفْسِهِ وَعَيْنِهِ وَأَهْلِهِ

**٢١٠٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ يَقُولُ: بَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ أَنِّي أَسْرُدُ، وَأُصَلِّي اللَّيْلَ قَالَ: وَإِمَّا أَرْسَلَ إِلَيْهِ، وَإِمَّا لَقِيَهُ، فَقَالَ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ وَلَا تُفْطِرُ، وَتُصَلِّي اللَّيْلَ؟ فَلَا تَفْعَلْ؛ فَإِنَّ لِعَيْنَيْكَ حَظًّا، وَلِنَفْسِكَ حَظًّا، وَلِأَهْلِكَ حَظًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَنَمْ، وَصُمْ كُلَّ عَشَرَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا، وَلَكَ أَجْرُ تِسْعَةٍ»، قَالَ: فَإِنِّي أَجِدُنِي أَقْوَى لِذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ»، قَالَ: وَكَيْفَ كَانَ دَاوُدُ يَصُومُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَلَا يَفِرُّ إِذَا لَاقَى»، قَالَ: مَنْ لِي بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا هەواڵی دا ڕۆژووی داوود دادپەروەرترین و چاکترین و خۆشەویستترین ڕۆژووە لای خوا ﷻ، ئەگەر ئەو کەسەی کە ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبێ و ڕۆژێک بەڕۆژوو نابێ مافی نەفسی خۆی و چاوی و هاوسەرەکەی دابێ، بە هیچ شێوەیەک مافی نەفسی و چاوی و هاوسەرەکەی بەزایە نەدابێ

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﵄ دەڵێ: هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ کە من بەردەوام بەڕۆژوو دەبم و شەویش شەونوێژ دەکەم، وتی: یان ناردی بە شوێنیدا، یان پێی گەیشت، فەرمووی: هەواڵم پێ دراوە تۆ هەمیشە بەڕۆژوو دەبیت و بێڕۆژوو نابیت، شەوانیش بەردەوام شەونوێژ دەکەی؟ کاری وا مەکە، چونکە چاوت مافی هەیە، نەفست مافی هەیە، هاوسەرەکەت مافی هەیە، بەڕۆژوو بە و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




بەڕۆژووش مەبە، شەونوێژ بکە و بشخەوە، لە هەموو دە ڕۆژدا ڕۆژێك بەڕۆژوو بە پاداشتی نۆ ڕۆژەکەی دیکەت بۆ هەیە، وتی: من توانام لەوە زیاترە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بەڕۆژوو بە وەك ڕۆژووی داود (علیه السلام) وتی: ڕۆژووی داود (علیه السلام) چۆن بوو ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ڕۆژێك بەرۆژوو دەبوو و ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو، وە کاتێ ڕووبەڕووی دوژمن بووایەتەوە پشتی هەڵنەدەکرد، وتی: من لە کوێ بە ئەمە دەگەم ئەی پێغەمبەری خوا.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ دَاوُدَ كَانَ مِنْ أَعْبَدِ النَّاسِ إِذَا كَانَ صَوْمُهُ مَا ذَكَرْنَا

٢١١٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟». فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صُمْ صَوْمَ دَاوُدَ؛ فَإِنَّهُ كَانَ أَعْبَدَ النَّاسِ، كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا»، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي، لَعَلَّهُ أَنْ يَطُولَ بِكَ الْعُمُرُ، فَلَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ قَبِلْتُ الرُّخْصَةَ الَّتِي أَمَرَنِي بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی داود (علیه السلام) لە پەرستشکارترینی مرۆڤەکان بوو، چونکە ڕۆژووەکەی بەوشێوە بوو کە باسمان کرد

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوامدا، فەرمووی: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ بە شەو شەونوێژ دەکەیت و بە ڕۆژیش بەڕۆژوو دەبیت؟ دواتر بەدرێژیی باسی فەرموودەکەی کرد، وە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو بگرە وەکوو ڕۆژووی داود (علیه السلام) چونکە پەرستشکارترینی خەڵك بوو، ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو، پاشان فەرمووی: تۆ نازانی پێدەچێت تەمەنت درێژ بێت، خۆزگە مۆڵەتەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ وەربگرتایە کە فەرمانی پێکردم.

---

(١) صحیح.

## بَابُ ذِكْرِ تَمَنِّي النَّبِيِّ ﷺ اسْتِطَاعَةَ صَوْمِ يَوْمٍ، وَإِفْطَارِ يَوْمَيْنِ

**٢١١١-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ، وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: «وَيُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟» قَالَ: فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: «ذَاكَ صَوْمُ دَاوُدَ»، قَالَ: فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: «وَدِدْتُ أَنِّي طُوِّقْتُ ذَلِكَ»[1].

## باسی ئاواتخواستنی پێغەمبەر ﷺ بەوەی بیتوانیایە ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت و دوو ڕۆژ بەڕۆژوو نەبێت

واتە: ئەبو قەتادە رضي الله عنه دەڵێ: عومەر بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: پێت چۆنە کەسێك دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبێت؟ فەرمووی: کەسێك هەیە ئەوە بتوانێت؟ وتی: ئەی پێت چۆنە کەسێك ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت و ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەبێت؟ فەرمووی: ئەوە ڕۆژووی داوودی برامە، وتی: ئەی پێت چۆنە کەسێك ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت و دوو ڕۆژ بەڕۆژوو نەبێت؟ فەرمووی: حەزم دەکرد ئەوەم بتوانیایە.

## بَابُ فَضْلِ الصَّوْمِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَمُبَاعَدَةِ اللَّهِ الْمَرْءَ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢١١٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَصُومُ يَوْمًا عَبْدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً»[2].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژوو لەپێناوی خوادا، هەروەها خوا حەفتا پایز بەندەکەی دوور دەخاتەوە لە ئاگر بەهۆی بەڕۆژووبوونی ڕۆژێك لەپێناوی خوادا، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندەیەك نییە ڕۆژێك لەپێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، ئیللا خوا ﷻ بەهۆی ئەو ڕۆژووەوە حەفتا پایز ڕوخساری دوور دەخاتەوە لە ئاگر.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَوْمَ الْيَوْمِ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّمَا بَاعَدَ اللَّهُ صَائِمَهُ بِهِ عَنِ النَّارِ أَنَّهُ إِذَا صَامَهُ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ، إِذِ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا لَا يَقْبَلُ مِنَ الْأَعْمَالِ إِلَّا مَا كَانَ لَهُ خَالِصًا

**٢١١٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ عَنْ وَجْهِهِ وَبَيْنَ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا»[١].

## باسی فەرموودەیەك ڕوونكەرەوەی دەستەواژە كورتكراوەكەیە كە باسم كرد، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژەی كە باسمان كرد لەپێناوی خوادا، بۆیە خوا ڕۆژووگرەكەی دوور دەخاتەوە لە ئاگر، ئەگەر لەبەر ڕەزامەندی خوا بەڕۆژوو بووبێت، چونكە خوا هیچ كردەوەیەك وەرناگرێ تەنها بەدڵسۆزی بۆ ئەو نەبێ

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەك ڕۆژێك لەپێناوی خوادا بەڕۆژوو بێت، ئیللا خوا ﷻ بەهۆی ئەو ڕۆژووەوە حەفتا پایز ڕوخساری دوور دەخاتەوە لە ئاگر.

## بَابُ فَضْلِ إِتْبَاعِ صِيَامِ رَمَضَانَ بِصِيَامِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ، فَيَكُونُ كَصِيَامِ السَّنَةِ كُلِّهَا

**٢١١٤-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتَّةَ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ، فَكَأَنَّمَا صَامَ الدَّهْرَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





## باسی گەورەیی ڕۆژووگرتنی شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بەدوای ڕەمەزاندا، وەکوو ڕۆژووگرتنی ساڵەکە وایە

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، پاشان بەدوایدا شەش ڕۆژ لە شەوال بەڕۆژوو بێت، وەکوو ئەوە وایە ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَعْلَمَ أَنَّ صِيَامَ رَمَضَانَ وَسِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ يَكُونُ كَصِيَامِ الدَّهْرِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ جَعَلَ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، أَوْ يَزِيدُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ جَلَّ وَعَزَّ

**٢١١٥-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صِيَامُ رَمَضَانَ بِعَشَرَةِ أَشْهُرٍ، وَصِيَامُ السِّتَّةِ أَيَّامٍ بِشَهْرَيْنِ، فَذَلِكَ صِيَامُ السَّنَةِ، يَعْنِي رَمَضَانَ وَسِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَهُ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە ڕایگەیاندووە کە ڕۆژووی ڕەمەزان و شەش ڕۆژ ڕۆژووگرتن بەدوای مانگی ڕەمەزان وەکوو ڕۆژووی ساڵەکە وایە، چونکە خوا ﷻ چاکەیەکی داناوە بەرانبەر بە دە ئەوەندەی خۆی، یان زیاتر ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ

واتە: سەوبان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاداشتی ڕۆژووی ڕەمەزان بەرانبەرە بە دە مانگ، وە شەش ڕۆژ ڕۆژووگرتنی مانگی شەوالیش بەرانبەرە بە دوو مانگ. واتە: مانگی ڕەمەزان و شەش ڕۆژ لە شەوال دوای ڕەمەزان.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَوْمِ الِاثْنَيْنِ، وَيَوْمِ الْخَمِيسِ، وَتَحَرِّي صَوْمِهِمَا، اقْتِدَاءً بِفِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ

**٢١١٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەچاکدانانی ڕۆژووگرتنی ڕۆژی دووشەممە و پێنجشەممە، وە گرنگیدان بە ڕۆژووگرتنیان، لەبەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژانی دووشەممە و پێنجشەممە بەڕۆژوو دەبوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَوْمِ يَوْمِ الاِثْنَيْنِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ وُلِدَ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ، وَفِيهِ أُوحِيَ إِلَيْهِ، وَفِيهِ مَاتَ ﷺ

**٢١١٧-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَقْبَلَ عَلَيْهِ عُمَرُ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، صَوْمُ يَوْمِ الاِثْنَيْنِ؟ قَالَ: «يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَيَوْمٌ أَمُوتُ فِيهِ»[١].

## باسی بەچاکدانانی ڕۆژووگرتنی ڕۆژی دووشەممە، چونکە پێغەمبەر ﷺ تیایدا لەدایك بوو، وە تیایدا وەحی و نیگای بۆ هات و تیایدا کۆچی دوایی کرد

واتە: ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﵁ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووین، عومەر ڕووی تێکرد ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ڕۆژووگرتنی ڕۆژی دووشەممە چییە؟ وتی: ڕۆژێکە تیایدا لەدایك بووم، وە ڕۆژێکە تیایدا دەمرم.

**٢١١٨-** وَحَدِيثُ شُعْبَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ صَوْمِهِ، فَغَضِبَ، وَسُئِلَ عَنْ صَوْمِ الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ قَالَ: «ذَاكَ يَوْمٌ يَعْنِي الاِثْنَيْنِ، وُلِدْتُ فِيهِ وَبُعِثْتُ فِيهِ»، أَوْ قَالَ: «أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ»[٢].

واتە: وە لە فەرموودەکەی شوعبەدا هاتووە، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕۆژووگرتنی، توڕە بوو، وە پرسیاری لێکرا دەربارەی ڕۆژووگرتنی دووشەمەمان و پێنجشەمەمان، فەرمووی: ئەوە ڕۆژێکە -واتە: دووشەممە- تیایدا لەدایك بووم و تیایدا نێردراوم، یان فەرمووی: تیایدا وەحی و نیگام بۆ دابەزی.

---

(١) صحيح دون قوله: ((ويوم أموت فيه))، فهي عبارة شاذة غير صحيحة لم ترد إلا عند المصنف وجميع الروايات بدونها.

(٢) انظر: الحديث السابق.

## بَابٌ فِي اسْتِحْبَابِ صَوْمِ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ أَيْضاً، لِأَنَّ الْأَعْمَالَ فِيهِمَا تُعْرَضُ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ

**٢١١٩-** عَنْ أُسَامَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، وَيَقُولُ: «إِنَّ هَذَيْنِ الْيَوْمَيْنِ تُعْرَضُ فِيهِمَا الْأَعْمَالُ»[١].

## باسێکی دیکە بەهەمان شێوە دەربارەی بەچاکدانانی ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممە، چونکە کردەوەکان لەو دوو ڕۆژەدا بەرز دەکرێنەوە بۆ لای خوا ﷻ

واتە: ئوسامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەممە و پێنجشەممە بەڕۆژوو دەبوو، وە دەیفەرموو: بەڕاستی ئەم دوو ڕۆژە کردەوەکانی تێدا بەرز دەکرێتەوە.

**٢١٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تُعْرَضُ أَعْمَالُ النَّاسِ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّتَيْنِ: يَوْمُ الِاثْنَيْنِ، وَيَوْمُ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ مُؤْمِنٍ، إِلَّا عَبْدٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيَقُولُ: اتْرُكُوا، أَوْ أَرْجِئُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَفِيئَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە هەموو هەینییەکدا دوو جار کردەوەکانی خەڵکی دەخرێنە ڕوو: ڕۆژی دووشەممە و ڕۆژی پێنجشەممە، لە هەموو بڕوادارێك دەبووردێت جگە لە بەندەیەك لە نێوان ئەو و براکەیدا کێشە و ئاژاوەیان هەبێت، دەوترێ: واز لەم دووانە بهێنن، یان دوایان بخەن تا ئاشت دەبنەوە.

## بَابُ فَضْلِ صَوْمِ يَوْمٍ وَاحِدٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَإِعْطَاءِ اللَّهِ ﷻ صَائِمَ يَوْمٍ وَاحِدٍ مِنَ الشَّهْرِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ١٦٠﴾ الأنعام، أَنَّهُ لَا يُعْطِي بِالْحَسَنَةِ الْوَاحِدَةِ أَكْثَرَ مِنْ عَشْرِ أَمْثَالِهَا، إِذِ النَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ الْمُبَيِّنُ عَنْهُ ﷻ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ اللَّهَ يُعْطِي بِصَوْمِ يَوْمٍ وَاحِدٍ جَزَاءَ شَهْرٍ تَامٍّ

---

(١) صحيح من غير هذا الطريق.

(٢) صحيح.

**٢١٢١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الصَّوْمِ، فَقَالَ: «صُمْ يَوْمًا مِنَ الشَّهْرِ، وَلَكَ أَجْرُ مَا بَقِيَ»[1].

**باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژووگرتنی یەك ڕۆژ لە هەموو مانگێكدا، وە ئەوەی خوا ﷻ دەیبەخشێ بەوكەسەی یەك ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت لە مانگێكدا، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لە فەرمایشتەكەیدا: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ١٦٠﴾، واتە: هەر كەس چاكەیەك بكات ئەوە دە بەرانبەر چاكەی بۆ هەیە مەبەستی ئەوە نییە لەبری یەك چاكە دە ئەوەندە زیاتر پاداشت ناداتەوە، چونكە پێغەمبەر ﷺ ڕوونكەرەوەی ئایەتەكانی خوایە، ئەو ڕایگەیاندووە بێگومان خوا لەبری ڕۆژووی یەك ڕۆژ پاداشتی مانگێكی تەواو دەداتەوە**

واتە: عەبدوڵای كوڕی عەمر ﵄ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارم لێكرد لەبارەی ڕۆژوو، فەرمووی: لە مانگێكدا ڕۆژێك بەڕۆژوو بە پاداشتی ئەوەت بۆ هەیە كە ماوەتەوە (لە مانگەكە).

## بَابُ الْأَمْرِ بِصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ اسْتِحْبَابًا لَا إِيجَابًا

**٢١٢٢-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ، لَا أَدَعُهُنَّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَبَدًا، أَوْصَانِي بِصَلَاةِ الضُّحَى، وَبِالْوَتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ، وَبِصَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»[2].

**باسی فەرمانكردن بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێكدا چاكترە نەك واجب**

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ كردم بە سێ شت بەویستی خوا هەرگیز وازی لێ ناهێنم: بە نوێژی چێشتەنگاو، وە بە ویتر پێش خەوتن، وە بە سێ ڕۆژ ڕۆژووگرتن لە هەموو مانگێكدا.

**٢١٢٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ بِثَلَاثٍ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَالْوَتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خۆشەویستم باوکی قاسم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت: ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێك، ویترکردن پێش خەوتن، وە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِصَوْمِ الثَّلَاثِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ أَمْرُ نَدْبٍ لَا أَمْرُ فَرْضٍ

**٢١٢٤-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ فِي مَسْأَلَةِ الْأَعْرَابِيِّ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْإِسْلَامِ قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ: «وَصَوْمُ رَمَضَانَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە سێ ڕۆژ ڕۆژوو گرتن فەرمانێکە بۆ پەسەند بوون نەك فەرمانێك بێت بۆ فەرز بوون

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا ﷺ هاتووە سەبارەت بە پرسیاری کابرای دەشتەکی لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەوەی ئیسلام فەرزی کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وە ڕۆژووی ڕەمەزان، وتی: ئایا جگە لەوە هیچی دیکە لەسەرم هەیە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر ڕۆژووی زیادە (سوننەت) بگریت.

**٢١٢٥-** عَنْ مُطَرِّفٍ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ ﷺ الثَّقَفِيَّ دَعَا لَهُ بِلَبَنٍ يَسْقِيهِ، فَقَالَ مُطَرِّفٌ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الصَّوْمُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ، كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ». وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «صِيَامٌ حَسَنٌ، صِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ»(٢).

واتە: موتەڕیف کە لە نەوەی عامری کوڕی صەعصەعەیە دەگێڕێتەوە، عوسمانی کوڕی ئەبو لعاصی سەقەفی ﷺ، داوای کرد شیری بۆ ئەو بهێنن تا بیخواتەوە، موتەڕیف وتی: من بەڕۆژووم، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگر وەکوو قەڵغانی یەکێکتان وایە لە جەنگدا. وە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سێ ڕۆژ ڕۆژووگرتن لە مانگێکدا، چاکترین ڕۆژووە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ تَفَضُّلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى الصَّائِمِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ بِإِعْطَائِهِ أَجْرَ صِيَامِ الدَّهْرِ بِالْحَسَنَةِ الْوَاحِدَةِ عَشْرَ أَمْثَالِهَا

**٢١٢٦-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ صَوْمُ الدَّهْرِ». هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ شُعْبَةَ وَفِي حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، صَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، فَهَذَا صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْبَارُ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو فِي هَذَا الْمَعْنَى خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ قَالَ: وَفِي خَبَرِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: فَإِنَّ كُلَّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا؛ فَإِنَّ ذَاكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ، وَكَذَاكَ فِي خَبَرِ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللَّهِ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ١٦٠﴾ الأنعام.

### باسی هەر کەس لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، خوا بە فەزڵ و چاکەی خۆی پاداشتی ڕۆژووگرتنی ساڵەکەی بۆ دەنووسێ، چونکە یەك چاکە بەرانبەرە بە دە چاکە

واتە: ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگیکدا (پاداشتی) ڕۆژووی ساڵەکەی هەیە. ئەمە دەستەواژەی فەرموودەکەی شوعبەیە، وە لە فەرموودەکەی حەمادی کوڕی زەید هاتووە، ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا و ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، (پاداشتی) ڕۆژووی هەموو ساڵەکەی هەیە.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە و عەبدوڵای کوڕی عەمر هەمان ئەم مانایەی هەیە لە کتێبی (الْكَبِير) تەخریجم کردووە، وتی: وە لە فەرموودەکەی ئەبو سەلەمە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە: بێگومان هەموو چاکەیەك بە دە ئەوەندە پاداشتی بۆ هەیە، بێگومان ئەو سێ ڕۆژ بەڕۆژووبوونە (پاداشتی) ڕۆژووگرتنی هەموو ساڵەکەی هەیە، هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبو عوسماندا هاتووە لە ئەبو

---

(١) صحيح.

زەڕەوە فەرمووی: وە ڕاستی ئەوەیش لە کتێبی خوادایە: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا ﴿١٦٠﴾﴾، واتە: هەر کەسێك چاکەیەك بکات ئەوە دە بەرانبەر چاکەی بۆ هەیە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صِيَامِ هَذِهِ الْأَيَّامِ الثَّلَاثَةِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ أَيَّامِ الْبِيضِ مِنْهَا

**٢١٢٧-** عَنِ ابْنِ الْحَوْتَكِيَّةِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ: مَنْ حَاضِرُنَا يَوْمَ الْقَاحَةِ؟ قَالَ أَبُو ذَرٍّ ﷺ: أَنَا شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِأَرْنَبٍ - وَقَالَ مَرَّةً: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ بِأَرْنَبٍ -، فَقَالَ الَّذِي جَاءَ بِهَا: إِنِّي رَأَيْتُهَا كَأَنَّهَا تَدْمَى، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ مِنْهَا، فَقَالَ لَهُمْ: «كُلُوا»، فَقَالَ رَجُلٌ: إِنِّي صَائِمٌ قَالَ: «وَمَا صَوْمُكَ؟» فَأَخْبَرَهُ قَالَ: «فَأَيْنَ أَنْتَ عَنِ الْبِيضِ الْغُرِّ؟» قَالَ: وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: «صِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[١].

### باسی چاکتر وایە لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژە سپییەکە ڕۆژووی تێدا بگیرێ

واتە: ئیبنو حەوتەکیە دەڵێ: عومەر وتی: کێ لە ڕۆژی (الْقَاحَةِ)دا (کە جێگایەك بوو لە نێوان مەککە و مەدینەدا) لەگەڵماندا ئامادە بوو؟ ئەبو زەڕ ﷺ وتی: من ئامادەبووم کەروێشکێك هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (بە برژاوی) -جارێکی دیکە وتی: دەشتەکییەك کەروێشکێکی هێنا بۆ خزمەتی-، ئەو پیاوەی کە هێنابووی وتی: من بینیم خوێنی حەیزی لێ دەهات، پێغەمبەر ﷺ لێی خوارد، پاشان پێیانی فەرموو: بخۆن، پیاوێك وتی: من بەڕۆژووم، فەرمووی: ڕۆژووی چی؟ ئەویش هەواڵی پێ دا، فەرمووی: ئەی بۆچی ئەو ڕۆژانە ناگری کە شەوەکانی مانگ ڕۆشنی کردۆتەوە؟ وتی: ئەوانە کامانەن؟ فەرمووی: سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا سیازدە و چواردە و پازدە.

تێبینی: مەبەست لە سێ ڕۆژە سپییەکە: ئەو سێ ڕۆژەیە کەوا شەوەکانیان مانگەشەوی تەواوە، شەوی: (١٣، ١٤، ١٥)ی هەموو مانگێك.

**٢١٢٨-** عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ ﷺ بِالرَّبَذَةِ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ فَصُمْ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.





واتە: موسای کوڕی تەڵحە دەڵێ: گوێم لە ئەبو زەڕ بوو ﷺ لە ڕەبزە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەگەر لە مانگێکدا بەڕۆژوو بووی ئەوە سیازدە و چواردە و پازدە بەڕۆژوو بە.

## بَابُ إِبَاحَةِ صَوْمِ هَذِهِ الْأَيَّامِ الثَّلَاثَةِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ أَوَّلَ الشَّهْرِ مُبَادَرَةً بِصَوْمِهِمَا خَوْفَ أَنْ لَا يُدْرِكَ الْمَرْءُ صَوْمَهَا أَيَّامَ الْبِيضِ

**٢١٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ: كَانَ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ غُرَّةِ كُلِّ شَهْرٍ، وَيَكُونُ مِنْ صَوْمِهِ يَوْمُ الْجُمُعَةِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ يُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ كخَبَرِ أَبِي عُثْمَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ: صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ أَوَّلِ الشَّهْرِ، وَأَوْصَى بِذَلِكَ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَبِصَوْمِ أَيْضًا أَيَّامَ الْبِيضِ، فَيُجْمَعُ صَوْمَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ، مَعَ صَوْمِ أَيَّامِ الْبِيضِ، وَيُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ مَعْنَى فِعْلِهِ وَمَا أَوْصَى بِهِ أَبُو هُرَيْرَةَ مِنْ صَوْمِ الثَّلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ أَوَّلِ الشَّهْرِ مُبَادَرَةً بِهَذَا الْفِعْلِ بَدَلَ صَوْمِ الثَّلَاثَةِ أَيَّامِ الْبِيضِ، إِمَّا لِعِلَّةٍ مِنْ مَرَضٍ، أَوْ سَفْرَةٍ، أَوْ خَوْفِ نُزُولِ الْمَنِيَّةِ.

## باسی ڕێگەدراوە بە ڕۆژووگرتنی ئەو سێ ڕۆژە لە سەرەتای هەموو مانگێك، لەبەر مەترسی ئەوەی نەوەك بەندە نەگات بە ڕۆژە سپییەکان

واتە: عەبدوڵای (کوڕی مەسعود) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو لە ڕۆژە سپییەکانی هەموو مانگێك، لە ڕۆژووەکانیدا ڕۆژی هەینی تێدا بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە پێدەچێ وەکوو فەرموودەکەی ئەبو عوسمان بێت لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ (کە وتوویەتی): خۆشەویستم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم بە سێ شت: ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە سەرەتای هەر مانگێك، وە بەوەش وەسیەتی بە ئەبو هورەیرە ﷺ دەکرد، هەروەها بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژە سپییەکانیش، دواتر ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژی لە هەموو مانگێدا کۆ دەکرێتەوە لەگەڵ ڕۆژووگرتنی ڕۆژە سپییەکان، وە پێدەچێت مانای کردەوەکەی پێغەمبەر ﷺ (واتە: سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو لە ڕۆژە سپییەکانی

---

(١) إسناده حسن.




هەموو مانگێك) و ئەوەی وەسیەتی بە ئەبو هورەیرە ﷺ کردووە لە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە سەرەتای مانگ، لەبەر ئەوە فەرمانی کردووە بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە سەرەتای مانگ نەوەك بەندە نەگات بە ڕۆژە سپییەکان، جا بە هۆی نەخۆشی بێت، یان سەفەر، یان ترسی مردن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَوْمَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ يَقُومُ مَقَامَ صِيَامِ الدَّهْرِ، كَانَ صَوْمُ الثَّلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ أَوَّلِ الشَّهْرِ، أَوْ مِنْ وَسَطِهِ، أَوْ مِنْ آخِرِهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: فَإِنَّ كُلَّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا

**٢١٣٠-** عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ أَوْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَتْ: مِنْ أَيِّهِ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّهِ صَامَ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا لە جیاتی هەموو ساڵەکەیە، جا ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە سەرەتای مانگ، یان نێوەڕاستی، یان کۆتاییەکەی وەکوو یەك وایە

واتە: موعازە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگێکدا یان لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە کوێیەوە؟ وتی: کێشەی نەبوو لە هەر کوێوە بووایە ڕۆژووی بگرتایە.

## بَابُ ذِكْرِ إِيجَابِ اللَّهِ ﷻ الْجَنَّةَ لِلصَّائِمِ يَوْمًا وَاحِدًا إِذَا جَمَعَ مَعَ صَوْمِهِ صَدَقَةً، وَشُهُودَ جَنَازَةٍ، وَعِيَادَةَ مَرِيضٍ

**٢١٣١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا؟» فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، فَقَالَ: «مَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا؟» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، فَقَالَ: «مَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً؟» فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، قَالَ: «مَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا؟» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا اجْتَمَعَتْ هَذِهِ الْخِصَالُ قَطُّ فِي رَجُلٍ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ، فَلَوْ كَانَ فِي قَوْلِهِ ﷺ: مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ، دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ جَمِيعَ الْإِيمَانِ، قَوْلُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، لَكَانَ فِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ جَمِيعَ الْإِيمَانِ صَوْمُ يَوْمٍ، وَإِطْعَامُ مِسْكِينٍ، وَشُهُودُ جَنَازَةٍ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، لَكِنْ هَذِهِ فَضَائِلُ لِهَذِهِ الْأَعْمَالِ، لَا كَمَا يَدَّعِي مَنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ، وَلَا يُحْسِنُهُ.

## باسی ئەوەی خوا ﷻ بەهەشت واجب دەكات بۆ ئەو ڕۆژووەوانەی ڕۆژێك ڕۆژوو دەگرێت، لەگەڵ ڕۆژووەكەیدا ماڵ و سامان دەبەخشێت و ئامادەی بەڕێكردن و ناشتنی جەنازە دەبێت و سەردانی نەخۆش دەكات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ بەڕۆژووە؟ ئەبو بەكر وتی: من، فەرمووی: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ هەژارێكی تێر كردووە؟ ئەبو بەكر وتی: من، فەرمووی: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ شوێنی جەنازەیەك كەوتووە؟ ئەبو بەكر وتی: من، فەرمووی: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێكی كردووە؟ ئەبو بەكر وتی: من، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم خەصڵەت و نیشانانە لە هیچ كەسێكدا كۆ نابێتەوە ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە.

ئەبو بەكر (ئیبنو خوزەیمە) دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەو شێوازەیە كە لە كتێبی (الْإِيمَان) دا ڕوونم كردەوە، ئەگەر لە فەرموودەكەی پێغەمبەردا ﷺ كە فەرموویەتی: هەر كەس بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) دەچێتە بەهەشتەوە، بەڵگەی تێدا بووایە لەسەر ئەوەی هەموو ئیمان وتنی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)یە، ئەوە ئەم فەرموودەیە بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی هەموو ئیمان بریتییە لە ڕۆژێك ڕۆژووگرتن و تێركردنی هەژارێك و ئامادەبوونی جەنازەیەك و سەردان كردنی نەخۆشێك، بەڵام ئەوانە فەزڵ و چاكەیەكن بۆ ئەو كردەوانە، نەك وەكوو ئەوەی هەندێ لەوانە بانگەشەی بۆ دەكەن و هیچ لە زانست نازانن و بە چاكی وەریان نەگرتووە.

## بَابٌ فِي صِفَةِ صَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ خَلَا مَا تَقَدَّمَ ذِكْرُنَا لَهُ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢١٣٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَتْ: لَا إِلَّا أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ، وَسَأَلْتُهَا: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ شَهْرًا تَامًّا؟ قَالَتْ: لَا وَاللَّهِ،

مَا صَامَ شَهْرًا تَامًّا غَيْرَ رَمَضَانَ، حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ، وَمَا مَضَى شَهْرٌ حَتَّى يُصِيبَ مِنْهُ، وَمَا أَفْطَرَهُ حَتَّى يُصِيبَ مِنْهُ، وَسَأَلْتُهَا: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مَعَ السَّحَرِ؟ قَالَتْ: لَا، وَلَا الْمُصَلِّينَ[١].

**باسی چۆنییەتی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ جگە لەوەی لە پێشەوە باسمان کرد، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك ڕوونکراوە (مُفَسَّر)**

واتە: عەبدوڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نەخێر، مەگەر لە سەفەرێك بگەڕایەتەوە، وە پرسیارم لێکرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێك بەتەواوی بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: نەخێر، سوێند بە خوا، مانگێك بە تەواوی بەڕۆژوو نەبووە جگە لە ڕەمەزان نەبێت تا کۆچی دوایی کرد، هەروەها هیچ مانگێك تێپەڕ نەبووە ئیللا ڕۆژووی تێدا گرتووە، وە هیچ مانگێك نەبووە هیچ ڕۆژووی تێدا نەگرتبێ، هەر ڕۆژووی تێدا گرتووە، وە پرسیارم لێکرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ پارشێودا شەونوێژی دەکرد، وتی: نەخێر، هەروەها ئەوانەشی شەونوێژی زۆر دەکەن نەیانکردووە.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ عَائِشَةَ إِنَّمَا أَرَادَتْ بِقَوْلِهَا: النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يَصُمْ شَهْرًا تَامًّا غَيْرَ رَمَضَانَ، شَهْرَ شَعْبَانَ الَّذِي كَانَ يَصِلُ صَوْمَهُ بِصَوْمِ رَمَضَانَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ خَبَرَ أَبِي سَلَمَةَ، وَعَائِشَةَ فِي مُوَاصَلَةِ النَّبِيِّ ﷺ صَوْمَ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ**

**٢١٣٣-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂، عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لَا يَصُومُ، وَكَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ أَوْ عَامَّةَ شَعْبَانَ[٢].

**باسی فەرموودەیەکی شیکەرەوە بۆ ئەو دەستەواژە کورتکراوەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی عائیشە مەبەستی ئەوە بووە لە وتەکەیدا: پێغەمبەر ﷺ مانگێك بەتەواوەتی ڕۆژووی نەگرتووە جگە لە ڕەمەزان، وە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**مانگی شەعبانیش ڕۆژووی ئەو مانگەی دەگەیاند بە ڕۆژووی ڕەمەزان. ئەبو بەکر دەڵێت: فەرموودەکەی ئەبو سەلەمە و عائیشەم باس کرد لەو بەشەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ مانگی شەعبانی بە ویصال گەیاندی بە ڕەمەزان**

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری کردووە لە عائیشە ﵂: دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەوەندە (بەدوای یەکدیدا) بەڕۆژوو دەبوو تا دەمانوت ئیتر ڕۆژوو ناشکێنێت، ئەوەندەش ڕۆژووی نەدەگرت تا دەمانووت ئیتر بەڕۆژوو نابێت، ڕۆژووی مانگی شەعبانی دەگرت، یان شەعبان بەگشتی.

## بَابُ ذِكْرِ صَوْمِ أَيَّامٍ مُتَتَابِعَةٍ مِنَ الشَّهْرِ، وَإِفْطَارِ أَيَّامٍ مُتَتَابِعَةٍ بَعْدَهَا مِنَ الشَّهْرِ

**٢١٣٤-** عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: عَنْ صَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: كَانَ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى نَرَى أَنَّهُ لَا يُرِيدُ يُفْطِرُ مِنْهُ شَيْئًا، وَيُفْطِرُ مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى نَرَى أَنَّهُ لَا يُرِيدُ يَصُومُ مِنْهُ شَيْئًا، وَكُنْتَ لَا تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنَ اللَّيْلِ مُصَلِّيًا إِلَّا رَأَيْتَهُ، وَلَا نَائِمًا إِلَّا رَأَيْتَهُ[١].

**باسی ڕۆژووگرتنی چەند ڕۆژێك بەدوای یەکدیدا لە مانگێکدا، وە ڕۆژوونەگرتنی چەند ڕۆژێکی دیکە بەدوای یەکدیدا لەنێو ئەو مانگەدا**

واتە: حومەید دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لەبارەی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ، وتی: پێغەمبەر ﷺ لە مانگێکدا ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو تا واماندەبینی ئەو نایەوێ هیچی لێ بەڕۆژوو نەبێت، وە لە مانگێکدا ئەوەندە بەڕۆژوو نەدەبوو هەتا دەمانبینی ئەو نایەوێ هیچی لێ بەڕۆژوو ببێت، وە تۆ ئەگەر بتویستایە پێغەمبەر ﷺ ببینی شەونوێژ بکات ئیللا دەتبینی، وە ئەگەر بتویستایە ببینیت کە خەوتووە ئیللا دەتبینی.

**٢١٣٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ حَتَّى أَعْرِفَ عَنْهُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى أَقُولَ مَا هُوَ بِصَائِمٍ، وَكَانَ أَكْثَرُ صِيَامِهِ فِي شَعْبَانَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەوەندە بەدوای یەکدیدا) بەڕۆژوو دەبوو تا وامدەزانی ئیتر نایەوێت بەڕۆژوو نەبێت، ئەوەندەش ڕۆژووی نەدەگرت تا دەموت ئیتر ئەو ڕۆژوو ناگرێ، وە زۆربەی ڕۆژووەکانی لە مانگی شەعباندا بوو.

**بَابُ ذِكْرِ مَا أَعَدَّ اللَّهُ ﷻ فِي الْجَنَّةِ مِنَ الْغُرَفِ لِمُدَاوِمِ صِيَامِ التَّطَوُّعِ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ أَبِي شَيْبَةَ الْكُوفِيِّ، وَلَيْسَ هُوَ بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ الْمُلَقَّبِ بِعَبَّادٍ الَّذِي رَوَى عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، وَالزُّهْرِيِّ، وَغَيْرِهِمَا، هُوَ صَالِحُ الْحَدِيثِ مَدَنِيٌّ، سَكَنَ وَاسِطَ، ثُمَّ انْتَقَلَ إِلَى الْبَصْرَةِ، وَلَسْتُ أَعْرِفُ ابْنَ مُعَانِقٍ، وَلَا أَبَا مُعَانِقٍ الَّذِي رَوَى عَنْهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ**

٢١٣٦- عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَغُرَفًا، يُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا، وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَنْ هِيَ؟ قَالَ: هِيَ لِمَنْ قَالَ طَيِّبَ الْكَلَامِ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَدَامَ الصِّيَامَ، وَقَامَ لِلَّهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ»[1].

**باسی ئەوەی خوا ﷻ ئامادەی کردووە لە بەهەشتدا لە کۆشك و تەلارە بەرزەکان بۆ ئەو کەسەی بەردەوامە لەسەر ڕۆژووی سوننەت، بێگومان لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئیسحاق ئەبو شەیبەی کوفی، (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) جا ئەو پیاوە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئیسحاق نییە کە نازناوەکەی عەبادە کە لە سەعیدی مەقبوری و زوهری و جگە لە ئەوان گێڕاویەتەوە، ئەو فەرموودەی ڕاست و ڕەوانە، لە بنچینەدا خەڵکی مەدینەیە و لە واست نیشتەجێ بووە، پاشان باری کردووە بۆ بەصرە، وە ئیبنو موعانیق ناناسم، هەروەها ئەبو موعانیقیش کە یەحیای کوڕی ئەبو کەسیر لێیەوە گێڕاویەتەوە**

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە بەهەشتدا چەندین کۆشکی بەرز هەیە لە نێوەوە دەرەوەی دەبینرێت و لە دەرەوەیش نێوەوەی دەبینرێت، دەشتەکییەك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ کێیە؟ فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو کەسەیە قسەی چاك دەکات (وەکوو سڵاوکردن) و خواردن دەبەخشێت و ڕۆژوو دەگرێت و شەونوێژ دەکات بۆ خوا لە کاتێکدا خەڵك خەوتوون.

---

(١) إسناده ضعيف.

**٢١٣٧-** عَنِ ابْنِ مُعَانِقٍ، أَوْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَغُرْفَةً، قَدْ يُرَى ظَاهِرُهَا مِنْ بَاطِنِهَا، وَبَاطِنُهَا مِنْ ظَاهِرِهَا، أَعَدَّهَا اللَّهُ لِمَنْ أَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَلَانَ الْكَلَامَ، وَتَابَعَ الصِّيَامَ، وَصَلَّى بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ»[1].

واتە: ئیبنو موعانیق، یان ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لە بەهەشتدا کۆشکێك هەیە، لە نێوەوە دەرەوەی دەبینرێت و لە دەرەوەیش نێوەوەی دەبینرێت، خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسەی خواردن دەبەخشێت و قسەی نەرمونیانە و ڕۆژوو دەگرێت و شەونوێژ دەکات لە کاتێکدا خەڵك خەوتوون.

## بَابُ ذِكْرِ صَلَاةِ الْمَلَائِكَةِ عَلَى الصَّائِمِ عِنْدَ أَكْلِ الْمُفْطِرِينَ عِنْدَهُ

**٢١٣٨-** عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ بِنْتِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَهِيَ صَائِمَةٌ، فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ طَعَامًا، فَقَالَ: «تَعَالَى فَكُلِي»، فَقَالَتْ: إِنِّي صَائِمَةٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الصَّائِمُ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ»[2].

## باسی صەڵاواتدانی فریشتەکان لەسەر ڕۆژووەوان، کاتێ ڕۆژوونەگرەکان لەلایدا نان دەخۆن

واتە: ئوممو عومارەی کچی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێ بەڕۆژوو بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای، دواتر خواردنی لێی نزیك کردەوە، فەرمووی: بێ نان بخۆ، وتی: من بەڕۆژووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژووەوان کاتێ کەسێك لەلای نان بخوات فریشتەکان صەڵاواتی لەسەر ئەدەن (واتە: بۆی دەپاڕێنەوە و نزای خێری بۆ دەکەن).

**٢١٣٩-** عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ بِنْتِ كَعْبٍ ﷺ بِمِثْلِهِ سَوَاءً، وَزَادَ: حَتَّى يَفْرُغُوا، أَوْ يَقْضُوا أَكْلَهُ[3].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.




واتە: ئوممو عومارەی کچی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە، بەهەمان شێوەی پێشوو، لە کۆتاییدا ئەوەیشی زیاد کرد: تا لە خواردنەکە دەبنەوە، یان تا خواردنەکە تەواو دەکەن.

٢١٤٠- عَنْ لَيْلَى، عَنْ مَوْلَاتِهَا ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: الصَّائِمُ إِذَا أَكَلَ عِنْدَهُ الْمَفَاطِيرُ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ حَتَّى يُمْسِيَ[1].

واتە: لەیلا دەگێڕێتەوە لە مەولاکەیەوە ﷺ (ئوممو عومارە) لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ڕۆژووەوان کاتێ ڕۆژوونەگرەکان لەلایدا نان دەخۆن فریشتەکان صەڵاواتی لەسەر دەدەن. (واتە: بۆی دەپاڕێنەوە و نزای خێری بۆ دەکەن).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي صَوْمِ التَّطَوُّعِ، وَإِنْ لَمْ يَجْمِعِ الْمَرْءُ عَلَى الصَّوْمِ مِنَ اللَّيْلِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يَجْمِعِ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، وَصَوْمُ الْوَاجِبِ دُونَ صَوْمِ التَّطَوُّعِ

٢١٤١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ طَعَامَنَا، فَجَاءَ يَوْمًا فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ ذَلِكِ الطَّعَامِ؟» فَقُلْتُ: لَا، فَقَالَ: «إِنِّي صَائِمٌ»[2].

## باسی مۆڵەتدان بە ڕۆژووگرتنی سوننەت، ئەگەرچی بەندە لە شەوەکەیدا نییەتی ڕۆژووی نەهێنابێ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی: (لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ)، تەنها مەبەستی ڕۆژووی فەرز بووە نەك سوننەت

واتە: عائیشە ﷺ دایکی ئیمانداران دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە چێشتمان بوو، ڕۆژێك هات بۆ لامان فەرمووی: ئایا لەو خواردنەتان لا هەیە؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: من بەڕۆژووم.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.




**٢١٤٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ ذَكَرْنَا أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ فِي صِيَامِ عَاشُورَاءَ وَأَمْرِهِ بِالصَّوْمِ مَنْ لَمْ يَجْمَعْ صِيَامَهُ مِنَ اللَّيْلِ فِي أَبْوَابِ صَوْمِ عَاشُورَاءَ[١].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان باسی فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ کرد لە بەشەکانی ڕۆژووی عاشوڕا سەبارەت بەڕۆژووگرتنی عاشوڕا و فەرمانکردنی بەڕۆژوو گرتن بۆ ئەو کەسەی لەشەودا نییەتی ڕۆژووی نەهێناوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْفِطْرِ فِي صَوْمِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ مُضِيِّ بَعْضِ النَّهَارِ، وَالْمَرْءُ نَاوٍ لِلصَّوْمِ فِيمَا مَضَى مِنَ النَّهَارِ

**٢١٤٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟»، قُلْنَا: لَا قَالَ: «فَإِنِّي إِذًا صَائِمٌ»، قَالَتْ: ثُمَّ جَاءَ يَوْمًا آخَرَ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ، فَخَبَّأْنَا لَكَ، فَقَالَ: «أَدْنِيهِ، فَقَدْ أَصْبَحْتُ صَائِمًا فَأَكَلَ»[٢].

## باسی ڕێگەدان بە ڕۆژووشکاندن لە ڕۆژووی سوننەت، ئەگەرچی بەندە نییەتی ڕۆژووشی هێنابێ و بەشێکیش لە ڕۆژگار تێپەڕ بووبێ

واتە: عائیشە ﵂ دایکی بڕواداران دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك هاتە ژوورەوە فەرمووی: شتێکتان لا هەیە؟ وتمان: نەخێر، فەرمووی: کەواتە من بەڕۆژووم، وتی: پاشان ڕۆژێکی دیکە هات بۆ نێومان، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا خواردنی (حَيْس) مان بەدیاری بۆ هاتووە (خواردنێك بوو لە خورما و ڕۆن و شتی دیکە دروست کرابوو) بەشی تۆمان لێ هەڵگرتووە، فەرمووی: نزیکی بکەنەوە، بەڕاستی بەیانیم کردەوە و بەڕۆژوو بووم، پاشان لێی خوارد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُفْطِرَ فِي صَوْمِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ دُخُولِهِ فِيهِ مُجْمِعًا عَلَى صَوْمِ ذَلِكَ الْيَوْمِ خِلَافَ مَذْهَبِ مَنْ رَأَى إِيجَابَ إِعَادَةِ صَوْمِ ذَلِكَ الْيَوْمِ عَلَيْهِ

**٢١٤٤-** عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ آخَى بَيْنَ سَلْمَانَ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، فَجَاءَ سَلْمَانُ يَزُورُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَوَجَدَ أُمَّ الدَّرْدَاءِ مُتَبَذِّلَةً، فَقَالَ لَهَا: «مَا شَأْنُكِ؟» فَقَالَتْ: إِنَّ أَخَاكَ لَيْسَتْ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا، زَادَ يُوسُفُ: يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ قَالَا: فَلَمَّا جَاءَ أَبُو الدَّرْدَاءِ فَرَحَّبَ بِهِ، وَقَرَّبَ إِلَيْهِ طَعَامًا، فَقَالَ لَهُ: كُلْ، فَقَالَ: أَوَلَسْتُ أَطْعَمُ؟ فَقَالَ: مَا أَنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأْكُلَ، فَأَكَلَ مَعَهُ وَبَاتَ عِنْدَهُ، فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ ذَهَبَ أَبُو الدَّرْدَاءِ يَقُومُ، فَحَبَسَهُ سَلْمَانُ، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْفَجْرِ قَالَ: قُمِ الْآنَ، فَقَامَا فَصَلَّيَا، فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ: إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِأَهْلِكَ وَلِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَأَمَّا النَّبِيُّ ﷺ فَذُكِرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: صَدَقَ سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی ڕۆژووەکەی دەشکێنێت لە ڕۆژووی سوننەت دوای ئەوەی شەو نییەتی هێناوە و بەفیعلی بەڕۆژوو بووە، دروستە ڕۆژووەکەی قەزا نەکاتەوە، جیاواز لە مەزهەبی ئەو کەسەی پێی وایە واجبە ڕۆژووی ئەو ڕۆژە دووبارە بکاتەوە

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی دروست کرد لە نێوان سەلمان و ئەبو دەرداندا، وتی: سەلمان هات سەردانی ئەبو دەردائی کرد ئوممو دەردائی بینی پۆشاکێکی کۆنی لەبەردا بوو، پێی وت: ئەوە چیتە؟ وتی: براکەی تۆ هیچ پێویستییەکی بە دونیا نییە، یوسف (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) ئەوەی زیاد کرد: بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت و بە شەو شەونوێژ دەکات، هەردوو گێڕەرەوەکەی فەرموودە وتیان: کاتێ ئەبو دەرداء هاتەوە سەلمان بەخێرهاتنی کرد و خواردنی لێی نزیك کردەوە، سەلمان پێی وت: بخۆ، ئەویش وتی: من بەڕۆژووم، وتی: منیش نان ناخۆم هەتا تۆ دەخۆی، دواتر لەگەڵیدا نانی خوارد و شەو لای مایەوە، کاتێ کە شەو داهات ئەبو دەرداء هەستا بۆ شەونوێژ،

---

(١) صحیح.





سەلمان نەیهێشت، کاتێ نزیك بەرەبەیان بۆیەوە وتی: ئێستا هەستە، هەردووکیان هەستان شەونوێژیان کرد، سەلمان پێی وت: بەڕاستی پەروەردگارت مافی لەسەرت هەیە، نەفست مافی لەسەرت هەیە، خێزانت مافی لەسەرت هەیە، میوانەکەت مافی لەسەرت هەیە، هەموو خاوەنمافێك مافی خۆی پێ بدە، دواتر ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرا، فەرمووی: سەلمانی فارسی ڕاستی کرد.

## بَابُ تَمْثِيلِ الصَّوْمِ فِي الشِّتَاءِ بِالْغَنِيمَةِ الْبَارِدَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّيْءَ قَدْ يُشَبَّهُ بِمَا يُشْبِهُهُ فِي بَعْضِ الْمَعَانِي لَا فِي كُلِّهَا

**٢١٤٥-** عَنْ عَامِرِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْغَنِيمَةُ الْبَارِدَةُ الصَّوْمُ فِي الشِّتَاءِ»[١].

## باسی لێکچواندنی ڕۆژوو لە زستاندا بە دەستکەوتی بێ ماندووبوون و، بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەندێکجار شتێك دەچوێنرێ بە شتێك لە هەندێك مانایدا لەیەك دەچن نەك هەمووی

واتە: عامری کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: غەنیمەت و دەستکەوتی سارد (واتە: بەبێ ماندووبوون و جەنگ) ڕۆژووگرتنە لە زستاندا. (واتە: ڕۆژووگرتن لە زستاندا وەکوو دەستکەوتنی غەنیمەت و دەستکەوتێکە بەبێ جەنگ و ماندووبوون).

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ الْأَيَّامِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ يَنْهَى عَنِ الشَّيْءِ، وَيَسْكُتُ عَنْ غَيْرِهِ غَيْرَ مُبِيحٍ لِمَا سَكَتَ عَنْهُ، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ زَجَرَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ النَّحْرِ فِي الْأَخْبَارِ الَّتِي رُوِيَتْ عَنْهُ فِي النَّهْيِ عَنْ صَوْمِهِمَا، وَلَمْ يَكُنْ فِي نَهْيِهِ عَنْ صَوْمِهِمَا إِبَاحَةُ صَوْمِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، إِذْ قَدْ نَهَى أَيْضًا عَنْ صَوْمِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ فِي غَيْرِ هَذِهِ الْأَخْبَارِ الَّتِي نَهَى فِيهَا عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ الْأَضْحَى.

**٢١٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ، فِيهِمْ عُمَرُ، وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَنَهَى عَنْ صَوْمِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ النَّحْرِ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.




**کۆباسی باسی ڕۆژەکان، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەندێ جار نەهی لە شتێك دەکات و بێدەنگ دەبێت لە غەیری شتە، ئەوەی کە بێدەنگ بووە لێی ڕێگەی پێنەداوە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان لەو فەرموودانەی کە لێیەوە گێڕدراونەتەوە لە نەهیکردن لە ڕۆژووگرتنی ئەو دوو ڕۆژە، جا نەهیکردنی لە ڕۆژووگرتنی ئەو دوو ڕۆژە ڕێگەپێدەر نییە بە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ)، چونکە بەهەمان شێوە لە جگە لەو فەرموودانەی کە نەهی کردووە لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان، نەهی کردووە لە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان**

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوانێکی ژیر و تێگەیشتوو ئامادەبوون، عومەر یەکێك بوو لە ئەوان، بەڵکوو عومەر چاکترینیان بوو لەلام، بۆیان گێڕاومەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ لە دوای نوێژی بەیانی نییە تا خۆر هەڵدێ (و بەرز دەبێتەوە)، وە نوێژ لە دوای نوێژی عەسریشەوە نییە تا خۆر بە تەواوی ئاوا دەبێت، وە قەدەغەی کردووە لە ڕۆژووگرتنی دوو ڕۆژ: ڕۆژووی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژووی جەژنی قوربان.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ بِدَلَالَةٍ بِتَصْرِيحِ نَهْيٍ

**٢١٤٧-** عَنْ مَسْعُودِ بْنِ الْحَكَمِ، عَنْ أُمِّهِ رضي الله عنها، أَنَّهَا حَدَّثَتْهُ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى عَلِيٍّ عَلَى بَغْلَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْبَيْضَاءِ فِي شِعْبِ الْأَنْصَارِ، وَهُوَ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ أَيَّامَ صَوْمٍ، إِنَّهَا أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[1].

## باسی قەدەغەکردن لە بە ڕۆژووبوونی سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان بە بەڵگەی ڕاست و دروست

واتە: مەسعودی کوڕی حەکەم دەگێڕێتەوە، لە دایکیەوە رضي الله عنها، ئەو بۆی باس کرد وتی: هەر وەکوو ئێستا لەپێش چاومە عەلی لەسەر ئێسترە سپییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەنێو کۆمەڵەماڵێك لە ماڵی ئەنصارەکان، دەیوت: ئەی خەڵکینە، پێغەمبەری

---

(١) صحيح بطرقه.

خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو ڕۆژانە (سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان) ڕۆژانی ڕۆژووگرتن نین، ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ صِيَامِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ بِتَصْرِيحِ نَهْيٍ

**٢١٤٨-** عَنِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: دَعَا أَعْرَابِيًّا إِلَى طَعَامِهِ وَذَلِكَ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ، فَقَالَ الْأَعْرَابِيُّ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَعْنِي: «يَنْهَى عَنْ صِيَامِ هَذِهِ الْأَيَّامِ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژەکانی دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان و بە ئاشکرا قەدەغەکردنی

واتە: موتەلیب دەڵێ: ئەو دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، بانگی دەشتەکییەکی کرد بۆ نانخواردن، دەشتەکییەکە وتی: من بەڕۆژووم، ئەویش وتی: من گوێم لە عەبدوڵای کوڕی عومەر بوو رضي الله عنهما دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو قەدەغەی کرد لە ڕۆژووگرتنی ئەم ڕۆژانە.

**٢١٤٩-** عَنْ أَبِي مُرَّةَ، مَوْلَى عُقَيْلٍ، أَنَّهُ دَخَلَ هُوَ وَعَبْدُ اللَّهِ عَلَى عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما وَذَلِكَ الْغَدَ أَوْ بَعْدَ الْغَدِ مِنْ يَوْمِ الْأَضْحَى، فَقَرَّبَ إِلَيْهِمْ عَمْرٌو طَعَامًا، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَفْطِرْ؛ فَإِنَّ هَذِهِ الْأَيَّامَ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُ بِفِطْرِهَا، وَيَنْهَى عَنْ صِيَامِهَا، فَأَفْطَرَ عَبْدُ اللَّهِ، فَأَكَلَ وَأَكَلْتُ مَعَهُ[٢].

واتە: ئەبو مورەی مەولای عوقەیل دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ عەبدوڵا چوون بۆ لای عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما، لە بەیانی جەژنی قوربان یان بەیانی دوای جەژنی قوربان، عەمر خواردنی بۆ هێنان، عەبدوڵا وتی: من بەڕۆژووم، عەمر پێی وت: ڕۆژووەکەت بشکێنە، چونکە بێگومان ئەم ڕۆژانە پێغەمبەری خوا ﷺ نانی تیایاندا دەخوارد و قەدەغەی دەکرد لە ڕۆژووگرتنیان، دواتر عەبدوڵا ڕۆژووەکەی شکاند، نانی خوارد منیش لەگەڵی نانم خوارد.

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ النَّهْيِ عَنْ صِيَامِ الدَّهْرِ مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا نُهِيَ عَنْهُ

**٢١٥٠-** عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَامَ الدَّهْرَ مَا صَامَ، وَمَا أَفْطَرَ، أَوْ لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ»[١].

## باسی قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی درێژایی ساڵ بێ باسکردنی هۆکاری نەهیکردنی

واتە: موتەڕیف دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژوو بێت بەڕۆژوو نەبووە، بێڕۆژووش نەبووە، یان نە ڕۆژووی بۆ هەیە نە بێڕۆژوو بووە. (واتە: وەك ئەوە وایە بەڕۆژوو نەبووبێ لەبەر کەمی پاداشتی، وە بێڕۆژوو نەبووبێ لەبەر ئۆقرەگرتن و ئارامگرتنی لەسەر برسێتی و تینوێتی، وتراویشە: ئەوە نزایە بۆ سەرزەنشتکردنی ئەو کەسە، لەبەر ئەو کارەی کە کردوویەتی، وە وتراوە: بەڵکوو هیچ پاداشتێکی بۆ نابێ لە ڕۆژووەکەی چونکە دەبێتە عادەت و نەریت)[٢].

**٢١٥١-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ فُلَانًا لَا يُفْطِرُ نَهَارَ الدَّهْرِ قَالَ: «لَا صَامَ، وَلَا أَفْطَرَ»[٣].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا ﷺ وترا: فڵانە کەس بەدرێژایی ساڵ بێڕۆژوو نابێت، فەرمووی: نە ڕۆژووی بۆ هەیە نە بێڕۆژوو بووە.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا زَجَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صَوْمِ الدَّهْرِ

**٢١٥٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟» قُلْتُ: إِنِّي لَأَفْعَلُ قَالَ: «وَلَا تَفْعَلْ، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ عَيْنُكَ، وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ حَقًّا، وَلِأَهْلِكَ حَقًّا، وَلِعَيْنِكَ حَقًّا، فَنَمْ وَقُمْ، وَصُمْ وَأَفْطِرْ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) حاشية السندي على سنن النسائي ج٤/ص٢٠.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

## باسی هۆکاری ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە ڕۆژووگرتن بەدرێژایی ساڵ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەواڵم پێ درا تۆ بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبیت و بە شەویش شەونوێژ دەکەی؟ وتم: بەڵێ ئەوە دەکەم، فەرمووی: کاری وا مەکە، چونکە تۆ ئەگەر ئەوە بکەی چاوت بەقوڵا دەچێ و نەفس و دەروونت ماندوو دەبێ، بێگومان نەفست مافی هەیە لەسەرت، هاوسەرەکەت مافی هەیە لەسەرت، چاوەکانت مافیان هەیە لەسەرت، جا بخەوە و شەونوێژ بکە، ڕۆژوو بگرە و ڕۆژوویش مەگرە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي صَوْمِ الدَّهْرِ إِذَا أَفْطَرَ الْمَرْءُ الْأَيَّامَ الَّتِي زُجِرَ عَنِ الصِّيَامِ فِيهِنَّ

**٢١٥٣-** عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَسْرُدُ الصَّوْمَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصُومُ وَلَا أُفْطِرُ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: «إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[١].

## باسی مۆڵەتدان لە بەڕۆژووبوون بەدرێژایی ساڵ، ئەگەر بەندە ئەو ڕۆژانە بەڕۆژوو نەبوو کە سەرزەنشت کراوە لە ڕۆژووگرتن تیایاندا

واتە: حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەردەوام بەڕۆژوو دەبووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من کەسێکم بەڕۆژوو دەبم و بێرۆژوو نابم، ئایا ڕۆژوو بگرم لە گەشتدا؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژوو بە، وە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو مەبە.

## بَابُ فَضْلِ صِيَامِ الدَّهْرِ إِذَا أَفْطَرَ الْأَيَّامَ الَّتِي زُجِرَ عَنِ الصِّيَامِ فِيهَا

**٢١٥٤-** عَنِ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَامَ الدَّهْرَ ضُيِّقَتْ عَلَيْهِ جَهَنَّمُ هَكَذَا، وَعَقَدَ تِسْعِينَ»[٢].

---

(١) صحيح بطرقه.

(٢) إسناده ضعيف.





## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژووگرتن بەدرێژایی ساڵ، ئەگەر ئەو ڕۆژانە بەڕۆژوو نەبوو سەرزەنشت كراوە لە ڕۆژووگرتن تیایاندا

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژوو بێت بەمشێوەیە دۆزەخی لەسەر تەسك دەكرێت، (بەوشێوەیە) سەر پەنجەی شایەتمانی خستە بن پەنجە گەورەكەی و پەنجەی گەورەكەی دا بەسەریدا بەجۆرێك تەواو تەسكی كردەوە، وەكوو ئەڵقەیەكی بچووكی لێكرد، بە هەردوو پەنجەی دەوری دا (وەكوو بەڵگەیەك لەسەر تەسكی دۆزەخ).

**٢١٥٥-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الَّذِي يَصُومُ الدَّهْرَ تُضَيَّقُ عَلَيْهِ جَهَنَّمُ تَضَيُّقَ هَذِهِ» وَعَقَدَ تِسْعِينَ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَأَلْتُ الْمُزَنِيَّ عَنْ مَعْنَى هَذَا الْحَدِيثِ، فَقَالَ: يُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ مَعْنَاهُ: أَيْ ضُيِّقَتْ عَنْهُ جَهَنَّمُ، فَلَا يَدْخُلُ جَهَنَّمَ، وَلَا يُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ مَعْنَاهُ غَيْرَ هَذَا؛ لِأَنَّ مَنِ ازْدَادَ لِلَّهِ عَمَلًا، وَطَاعَةً، ازْدَادَ عِنْدَ اللَّهِ رِفْعَةً، وَعَلَيْهِ كَرَامَةً، وَإِلَيْهِ قُرْبَةً. هَذَا مَعْنَى جَوَابِ الْمُزَنِيِّ.

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو كەسەی بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژوو بێت بەم شێوەیە دۆزەخی لەسەر تەسك دەكرێت، بەم شێوەیە. پەنجەی گەورەكەی لەگەڵ پەنجەی شایەتمانی گرت و ئەو سێ پەنجەكەی دیكەی بەردایەوە.

ئەبو بەكر دەڵێ: پرسیارم لە موزەنی كرد دەربارەی مانای ئەم فەرموودەیە، وتی: پێدەچێ مانای ئەوە بێت: واتە: دۆزەخی لەسەر تەسك دەكرێتەوە، ناخرێتە نێو دۆزەخەوە، پێناچێت مانایەكی دیكە هەڵبگرێ جگە لەم مانایە، چونكە هەر كەس كردەوەی چاك و گوێڕایەڵی لەپێناو خوا زۆرتر بێت لای خوا پلەی بەرزتر دەبێتەوە و بەڕێز دەبێت و نزیك دەبێتەوە لێی. ئەمە مانای وەڵامەكەی موزەنییە.

---

(١) غسناده ضعيف.

**٢١٥٦-** عَنْ زُرْعَةَ بْنِ ثَوْبٍ يَقُولُ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ عَنْ صِيَامِ الدَّهْرِ، فَقَالَ: كُنَّا نَعُدُّ أُولَئِكَ فِينَا مِنَ السَّابِقِينَ، قَالَ: وَسَأَلْتُهُ عَنْ صِيَامِ يَوْمٍ، وَفِطْرِ يَوْمٍ؟ فَقَالَ: «لَمْ يَدَعْ ذَلِكَ لِصَائِمٍ مَصَامًا، وَسَأَلْتُهُ عَنْ صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ قَالَ: صَامَ ذَلِكَ الدَّهْرَ وَأَفْطَرَهُ»[1].

واتە: زورعەی کوڕی سەوب دەڵێ: پرسیارم کرد لە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی ڕۆژووی هەمیشەیی بەدرێژایی ساڵ، فەرمووی: ئێمە ئەوانەمان بە کارە هەرە چاکەکان دادەنا، وتی: وە پرسیارم لێ کرد لە ڕۆژێك ڕۆژووگرتن و ڕۆژێك نەگرتنی (واتە: ڕۆژووگرتنی ڕۆژ نا ڕۆژێك)؟ فەرمووی: ئەوە گەیشتۆتە قۆناغێکی بەرز، وە پرسیارم لێ کرد دەربارەی ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، فەرمووی: ئەو ساڵە هەم بەڕۆژوو بووە و هەم خواردنی خواردووە.

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ مُجْمَلَةٍ غَيْرِ مُفَسَّرَةٍ

**٢١٥٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ - وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ - وَرَبِّ الْكَعْبَةِ مَا أَنَا نَهَيْتُ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، مُحَمَّدٌ ﷺ، وَرَبِّ الْكَعْبَةِ نَهَى عَنْهَا[2].

## باسی ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە، دەربارەی قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی هەینی بەشێوەی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك ڕوونکراوە (مُفَسَّر)

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ -کاتێ تەوافی کەعبەی دەکرد- دەیوت: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە من قەدەغەم نەکردووە لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی هەینی، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە موحەممەد ﷺ قەدەغەی کردووە لێی.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسَّرِ فِي النَّهْيِ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّهْيَ عَنْهُ إِذَا أُفْرِدَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ بِالصِّيَامِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُصَامَ قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**٢١٥٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَصُومُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلَّا وَقَبْلَهُ يَوْمٌ، أَوْ بَعْدَهُ»[١].

## باسی فەرموودەیەکی شیکراوە دەربارەی قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی هەینی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی قەدەغە کردن لێی ئەگەر ڕۆژی هەینی بە تەنها بگیرێ بێ ئەوەی لە پێش و پاشی ڕۆژوو بگیرێ

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو مەبن مەگەر ڕۆژێك لە پێشیەوە بەڕۆژوو بن یان ڕۆژێك لە دوایەوە.**

**٢١٥٩-** يَوم رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ، عَنْ عُمَرَ بْنِ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، عَنْ أَبِيهِ[٢].

**واتە: (يَوم) بوخاری ڕیوایەتی کردووە، لە عومەری کوڕی حەفصی کوڕی غیاس ئەویش لە باوکیەوە[٣].**

**٢١٦٠-** وَمُسْلِمٌ عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي شَيْبَةَ وَيَحْيَى بْنِ يَحْيَى، عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ، عَنِ الْأَعْمَشِ[٤].

**واتە: وە موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە، لە ئەبو بەکری کوڕی ئەبو شەیبە و یەحیای کوڕی یەحیا لە ئەبو موعاویە لە ئەعمەشەوە.**

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يَوْمُ عِيدٍ، وَأَنَّ النَّهْيَ عَنْ صِيَامِهِ إِذْ هُوَ عِيدٌ، وَالْفَرْقُ بَيْنَ الْجُمُعَةِ، وَبَيْنَ الْعِيدَيْنِ الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى، إِذْ جَاءَ بِنَهْيِ صَوْمِهِمَا مُفْرَدًا، وَلَا مَوْصُولًا بِصِيَامٍ قَبْلُ وَلَا بَعْدُ

**٢١٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يَوْمُ عِيدٍ، فَلَا تَجْعَلُوا يَوْمَ عِيدِكُمْ يَوْمَ صِيَامِكُمْ، إِلَّا أَنْ تَصُومُوا قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ»[٥].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ) تێبینی: ئەم دەستەواژەیە چۆن لە ئەصلەکەیدا هاتووە گواستوومەتەوە.

(٤) صحيح.

(٥) إسناده حسن.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژی هەینی ڕۆژی جەژنە، بێگومان قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی لەبەر ئەوەیە کە ڕۆژی جەژنە، وە جیاوازی لە نێوان هەینی و هەردوو جەژنەکەی ڕەمەزان و قوربان، ئەوەیە هەردوو جەژنەکە ڕۆژووگرتن تیایاندا قەدەغە کراوە بەتەنها بن، یان ڕۆژێك لە پێش یان لە دوایانەوە ڕۆژوو بگیرێ، بە پێچەوانەی هەینی**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی ڕۆژی هەینی ڕۆژی جەژنە، ڕۆژی جەژنتان مەکەن بە ڕۆژی ڕۆژووگرتن، مەگەر ڕۆژێك لە پێشیەوە بەڕۆژوو بن یان ڕۆژێك لە دوایەوە.

## بَابُ أَمْرِ الصَّائِمِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مُفْرَدًا بِالْفِطْرِ بَعْدَ مُضِيِّ بَعْضِ النَّهَارِ

**٢١٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ وَهِيَ صَائِمَةٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: «أَصُمْتِ أَمْسِ؟» قَالَتْ: لَا قَالَ: «فَتَصُومِينَ غَدًا؟» قَالَتْ: لَا، قَالَ: «فَأَفْطِرِي»[1].

**باسی فەرمانکردن بەو کەسەی کە ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو بووە، ڕۆژووەکەی بشکێنی دوای تێپەڕبوونی بەشێکی ڕۆژەکە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی هەینی هات بۆ لای جوەیریەی کچی حارس بەڕۆژوو بوو، فەرمووی: ئایا دوێنێ بەڕۆژوو بووی؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: بەیانی بەڕۆژوو دەبیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ڕۆژووەکەت بشکێنە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ السَّبْتِ تَطَوُّعًا، إِذَا أُفْرِدَ بِالصَّوْمِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ، وَأَحْسِبُ أَنَّ النَّهْيَ عَنْ صِيَامِهِ، إِذِ الْيَهُودُ تُعَظِّمُهُ، وَقَدِ اتَّخَذَتْهُ عِيدًا بَدَلَ الْجُمُعَةِ

**٢١٦٣-** عَنِ الصَّمَّاءِ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ، إِلَّا فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا عُودَ عِنَبَةٍ، أَوْ لِحَاءَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهَا»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) هذا حديث باطل لا يصح.

**باسی قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی سوننەت لە ڕۆژی شەممەدا، ئەگەر بەتەنها ڕۆژووی ئەو ڕۆژەی گرت، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوختکراوە (مُجْمَل) نەك شیکراوە (مُفَسَّر)، بەدەستەواژەیەکی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە، پێم وایە قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی شەممە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جوولەکەکان ئەو ڕۆژەیان بەگەورە دادەنا و کردیان بە جەژن لەجیاتی ڕۆژی هەینی**

واتە: صەماء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی شەممە ڕۆژوو مەگرن مەگەر ڕۆژووەکە فەڕز کرابێ لەسەرتان، ئەگەر یەکێك لە ئێوە هیچی بەدی نەکرد جگە لە داری مێو یان توێکڵی دارێك نەبێت ئەوە با بیمژێ ڕۆژوو نەگرێ.

**٢١٦٤**- عَنِ الصَّمَّاءِ ﷺ تَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ السَّبْتِ، وَيَقُولُ: «إِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا عُودًا أَخْضَرَ فَلْيُفْطِرْ عَلَيْهِ»[١].

واتە: صەماء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی شەممە و دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هیچی بەدی نەکرد جگە لە داری سەوز نەبێت با بیخوات و ڕۆژوو نەگرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّهْيَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ السَّبْتِ تَطَوُّعًا إِذَا أُفْرِدَ بِصَوْمٍ لَا إِذَا صَامَ صَائِمٌ يَوْمًا قَبْلَهُ أَوْ يَوْمًا بَعْدَهُ

**٢١٦٥**- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي إِخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ فِي النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ إِلَّا أَنْ يُصَامَ قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ يَوْمًا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّهُ قَدْ أَبَاحَ صَوْمَ يَوْمَ السَّبْتِ إِذَا صَامَ قَبْلَهُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوْ بَعْدَهُ يَوْمًا[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قەدەغەکردن لە ڕۆژووی ڕۆژی شەممە، لە کاتێکدایە ئەگەر تەنها ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بوو نەك ڕۆژووەوان ڕۆژێك پێشتر یان دواتر لەگەڵیدا بەڕۆژوو بێت**

---

(١) هذا حديث باطل لا يصح.

(٢) صحيح.




واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە لە قەدەغەکردن لە ڕۆژووی ڕۆژی هەینی مەگەر ڕۆژێك لە پێشیەوە یان لە دوایەوە ڕۆژوو بگیرێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕێگەی داوە بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی شەممە، ئەگەر ڕۆژێك لە پێشیەوە بەڕۆژوو بوو کە ڕۆژی هەینییە یان ڕۆژێك لە دوایەوە بەڕۆژوو بوو (کە ڕۆژی یەکشەممەیە).

**٢١٦٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْجُمُعَةُ عِيدٌ، فَلَا تَجْعَلُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ صِيَامًا، إِلَّا أَنْ يُصَامَ قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَدْ رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي صَوْمِ يَوْمِ السَّبْتِ إِذَا صَامَ صَائِمٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَهُ.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەینی جەژنە، لە ڕۆژی هەینیدا ڕۆژوو مەگرن، مەگەر ڕۆژێك لە پێشیەوە یان لە دوایەوە ڕۆژوو بگیرێ.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژووی شەممە ئەگەر ڕۆژووەوان ڕۆژی هەینی لە پێشیەوە گرت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي يَوْمِ السَّبْتِ إِذَا صَامَ يَوْمَ الْأَحَدِ بَعْدَهُ

**٢١٦٧-** عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، وَنَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعَثُونِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ، أَسْأَلُهَا الْأَيَّامَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرَ لَهَا صِيَامًا؟ قَالَتْ: يَوْمُ السَّبْتِ وَالْأَحَدِ، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِمْ، فَأَخْبَرْتُهُمْ وَكَأَنَّهُمْ أَنْكَرُوا ذَلِكَ، فَقَامُوا بِأَجْمَعِهِمْ إِلَيْهَا، فَقَالُوا: إِنَّا بَعَثْنَا إِلَيْكِ هَذَا فِي كَذَا وَكَذَا، وَذَكَرَ أَنَّكِ قُلْتِ: كَذَا وَكَذَا، فَقَالَتْ: صَدَقَ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرَ مَا كَانَ يَصُومُ مِنَ الْأَيَّامِ يَوْمَ السَّبْتِ وَالْأَحَدِ، كَانَ يَقُولُ: إِنَّهُمَا يَوْمَا عِيدٍ لِلْمُشْرِكِينَ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَهُمْ[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی شەممە ئەگەر بەدوایدا ڕۆژ یەکشەممە بەڕۆژوو بوو

واتە: کورەیب مەولای ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە، ئیبنو عەباس ﷺ و خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمیان بۆ لای ئوممو سەلەمە، پرسیاری ئەو ڕۆژانەی

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده حسن.




لێ بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرترین ڕۆژووی تێدا گرتووە؟ ئوممو سەلەمە وتی: ڕۆژی شەممە و یەکشەممە، گەڕامەوە بۆ لایان ئەو قسەیەم پێ ڕاگەیاندن، وەکوو چۆن بڵێی نکووڵی قسەکەیان کرد، هەموویان هەستان چوون بۆ لای وتیان: ئێمە ئەم پیاوەمان نارد بۆ لات دەربارەی فڵانە شت و فڵانە شت، ئەویش باسی کرد کە تۆ ئاوا و ئاوات وتووە، ئوممو سەلەمە وتی: ڕاستی کرد، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ زۆربەی ئەو ڕۆژانەی ڕۆژووی تێدا دەگرت لە ڕۆژی شەممە و یەکشەممەدا بوو، ئەو دەیفەرموو: ئەو دوو ڕۆژە جەژنی هاوبەشدانەرانە منیش دەمەوێت پێچەوانەیان بکەم.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ الْمَرْأَةِ تَطَوُّعًا بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا إِذَا كَانَ زَوْجُهَا حَاضِرًا غَيْرَ غَائِبٍ عَنْهَا، بِذِكْرِ خَبَرٍ لَفْظُهُ خَاصٌّ مُرَادُهُ عَامٌّ، مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْأَمْرَ إِذَا كَانَ لِعِلَّةٍ فَمَتَى كَانَتِ الْعِلَّةُ قَائِمَةً كَانَ الْأَمْرُ وَاجِبًا

**٢١٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، بَلَغَ بِهِ: لَا تَصُومُ الْمَرْأَةُ يَوْمًا مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ ﷺ: مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ، مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْأَمْرَ إِذَا كَانَ لِعِلَّةٍ فَمَتَى كَانَتِ الْعِلَّةُ قَائِمَةً وَالْأَمْرُ قَائِمٌ، فَالْأَمْرُ قَائِمٌ، وَالنَّبِيُّ ﷺ لَمَّا أَبَاحَ لِلْمَرْأَةِ صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا، إِذْ صَوْمُ رَمَضَانَ وَاجِبٌ عَلَيْهَا، كَانَ كُلُّ صَوْمٍ صَوْمَ وَاجِبٍ مِثْلَهُ جَائِزٌ لَهَا أَنْ تَصُومَ بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا، وَلِهَذِهِ الْمَسْأَلَةِ كِتَابٌ مُفْرَدٌ، قَدْ بَيَّنْتُ الْأَمْرَ الَّذِي هُوَ لِعِلَّةٍ، وَالزَّجْرَ الَّذِي هُوَ لِعِلَّةٍ.

## باسی قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی ئافرەت بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی، ئەگەر مێردەکەی لەلای بوو، لە جێگایەکی دوور لە ئەو نەبوو، بە باسکردنی دەستەواژەیەکی تایبەتی (خَاصٌّ) مەبەستی پێش گشتییە (عَامٌّ)، لەو شێوازەیە کە دەڵێین: بەڕاستی ئەگەر لەبەر هۆکارێك فەرمان کرا، ئەوە هەر کات هۆکارەکە بوونی هەبوو فەرمانەکەش واجب دەبێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، با هیچ ئافرەتێك بەڕۆژوو نەبێت لە غەیری مانگی ڕەمەزان و مێردەکەیشی ئامادە بێت مەگەر بە مۆڵەتی ئەو.

---

(١) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ)، لەو شێوازەیە کە دەڵێین: بێگومان ئەگەر لەبەر هۆکارێك فەرمان کرا، ئەوە هەر کات هۆکارەکە بوونی هەبوو فەرمانەکەش واجب دەبێت، وە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ڕێگەی دا بە ئافرەت ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی، چونکە ڕۆژووی ڕەمەزان واجبە لەسەری، جا هەموو ڕۆژوویەکی واجب وەکوو ڕۆژووی ڕەمەزان وایە دروستە بۆی بەبێ پرسی مێردەکەی ڕۆژووەکە بگرێ، وە بۆ ئەم بابەتە کتێبێکی تایبەت هەیە، ئەو فەرمانەم ڕوون کردۆتەوە کە لەبەر هۆکارێك کراوە، وە ئەو سەرزەنشتکردنەیش کە لەبەر هۆکارێك کراوە.

**بَابُ ذِكْرِ أَبْوَابِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَالتَّأْلِيفِ بَيْنَ الْأَخْبَارِ الْمَأْثُورَةِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا مَا يَحْسِبُ كَثِيرٌ مِنْ حَمَلَةِ الْعِلْمِ مِمَّنْ لَا يَفْهَمُ صِنَاعَةَ الْعِلْمِ أَنَّهَا مُتَهَاتِرَةٌ مُتَنَافِيَةٌ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ هِيَ عِنْدَنَا بِحَمْدِ اللَّهِ وَنِعْمَتِهِ بَلْ هِيَ مُخْتَلِفَةُ الْأَلْفَاظِ مُتَّفِقَةُ الْمَعْنَى عَلَى مَا سَأُبَيِّنُهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ.**

**بَابُ ذِكْرِ دَوَامِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي كُلِّ رَمَضَانَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، وَنَفْيِ انْقِطَاعِهَا بِنَفْيِ الْأَنْبِيَاءِ**

**٢١٦٩-** عَنْ مَرْثَدٍ، أَوْ أَبُو مَرْثَدٍ، شَكَّ أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَقِينَا أَبَا ذَرٍّ ﷺ وَهُوَ عِنْدَ الْجَمْرَةِ الْوُسْطَى، فَسَأَلْتُهُ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَقَالَ: مَا كَانَ أَحَدٌ بِأَسْأَلَ لَهَا رَسُولَ اللَّهِ مِنِّي، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَيْلَةُ الْقَدْرِ أُنْزِلَتْ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ بِوَحْيٍ إِلَيْهِمْ فِيهَا، ثُمَّ تَرْجِعُ؟ فَقَالَ: بَلْ هِيَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَّتُهُنَّ هِيَ؟ قَالَ: لَوْ أُذِنَ لِي لَأَنْبَأْتُكُمْ، وَلَكِنِ الْتَمِسُوهَا فِي السَّبْعَيْنِ، وَلَا تَسْأَلْنِي بَعْدَهَا، قَالَ: ثُمَّ أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَجَعَلَ يُحَدِّثُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي أَيِّ السَّبْعَيْنِ هِيَ؟ فَغَضِبَ عَلَيَّ غَضْبَةً لَمْ يَغْضَبْ عَلَيَّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا مِثْلَهَا، ثُمَّ قَالَ: «أَلَمْ أَنْهَكَ أَنْ تَسْأَلَنِي عَنْهَا؟ لَوْ أُذِنَ لِي لَأَنْبَأْتُكُمْ عَنْهَا، لَأَنْبَأْتُكُمْ بِهَا وَلَكِنْ لَا آمَنُ أَنْ تَكُونَ فِي السَّبْعِ الْآخِرِ»[1].

---

(١) إسناده ضعيف.





## باسی بەشەکانی شەوی قەدەر، وە پێکهاتن و سازان لە نێوان ئەو هەواڵانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون دەربارەی شەوی قەدر، کە زۆرێك لە هەڵگرانی زانست لەوانەی شارەزا نین لە زانستدا وا دەزانن پێچەوانە و دژیەکەن، ستایش بۆ خوا لای ئێمە وا نییە، بەڵکوو ئەو هەواڵانە دەستەواژەکانیان جیایە و ماناکانیان یەکە بەو شێوەی کە ئێستا ڕوونی دەکەمەوە بە ویستی خوا

## باسی بەردەوامبوونی شەوی قەدر لە هەموو ڕەمەزانێك تا هاتنی ڕۆژی دوایی، وە ڕەتکردنەوەی پچڕاندنی بە نەمانی پێغەمبەران

واتە: مەرسەد یان باوکی مەرسەد -عاصم گومانی هەبوو کام لەو دووانە بووە- دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: گەیشتین بە ئەبو زەڕ ﷺ لە لای (الْجَمْرَةِ الْوُسْطَى) بوو (بەردبارانکردنی جەمرەی نێوەڕاست)، پرسیاری شەوی قەدرم لێ کرد، وتی: هیچ کەس پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد جگە لە من، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەوی قەدر بە وەحی و نیگا بۆ پێغەمبەران دابەزی، پاشان (دوای مردنی ئەوان) گەڕایەوە؟ فەرمووی: بەڵکوو شەوی قەدر هەتا ڕۆژی دواییە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ شەوی قەدر لە چی ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزاندایە؟ فەرمووی: بێگومان ئەگەر خوا ﷻ مۆڵەتی بدایە هەواڵم پێ دەدان، بەڵام لە یەکێك لەو دوو حەوتەدا بگەڕێن بە دوایدا، (واتە: ئەو حەوت ڕۆژەی تێدەپەڕێت لەدوای بیستی ڕەمەزان، کە دەکاتە شەوی بیست و حەوت، وە ئەو حەوت ڕۆژەی دەمێنێتەوە لە مانگی ڕەمەزان واتە: بیست و سێ) دوای ئەم جارە جارێکی دیکە پرسیارم لێ مەکە لەو بارەیەوە، وتی: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کرد لە هاوەڵەکانی و قسەی بۆ دەکردن، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا شەوی قەدر لە کام ئەو دوو حەوتەدایە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لێم توڕە بوو بەتوڕەبوونێك هەرگیز لە پێش ئەو جارە و لەدوای ئەو جارە ئاوا لێم توڕە نەبووبوو، پاشان فەرمووی: ئایا قەدەغەم لێ نەکردی چیتر لەوبارەیەوە پرسیارم لێ نەکەی؟ ئەگەر مۆڵەتم پێ بدرایە ئاگادارم دەکردنەوە، بەڵام پێم وایە حەوت ڕۆژی کۆتاییە. (مەبەستی بیست و حەوتی ڕەمەزانە).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لَيْلَةَ الْقَدْرِ هِيَ فِي رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ شَكٍّ، وَلَا ارْتِيَابٍ فِي غَيْرِهِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْحَالِفَ آخِرَ يَوْمٍ مِنْ شَعْبَانَ أَنَّ امْرَأَتَهُ طَالِقٌ، أَوْ عَبْدَهُ حُرٌّ، أَوْ أَمَتَهُ حُرَّةٌ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، أَنَّ الطَّلَاقَ، وَالْعِتْقَ غَيْرُ وَاقِعٍ إِلَى مُضِيِّ السَّنَةِ مِنْ يَوْمِ حَلَفَ؛ لِأَنَّهُ زَعَمَ لَا يَدْرِي لَيْلَةَ الْقَدْرِ هِيَ فِي رَمَضَانَ أَوْ فِي غَيْرِهِ، لِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْهَا

**٢١٧٠-** عَنْ مَالِكِ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: سَأَلْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ؟ فَقَالَ: أَنَا كُنْتُ أَسْأَلَ النَّاسِ عَنْهَا قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، أَفِي رَمَضَانَ أَوْ فِي غَيْرِهِ؟ فَقَالَ: «بَلْ هِيَ فِي رَمَضَانَ»، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تَكُونُ مَعَ الْأَنْبِيَاءِ مَا كَانُوا، فَإِذَا قُبِضَ الْأَنْبِيَاءُ رُفِعَتْ؟ أَمْ هِيَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «لَا، بَلْ هِيَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي أَيِّ رَمَضَانَ هِيَ؟ قَالَ: «الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأُوَلِ، وَالْعَشْرِ الْأَخِيرِ»، قَالَ: ثُمَّ حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَحَدَّثَ، فَاهْتَبَلْتُ غَفْلَتَهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ لَتُخْبِرَنِّي، أَوْ لَمَا أَخْبَرْتَنِي: فِي أَيِّ الْعِشْرِينَ هِيَ؟ قَالَ: فَغَضِبَ عَلَيَّ مَا غَضِبَ عَلَيَّ مِثْلَهُ قَبْلَهُ، وَلَا بَعْدَهُ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَوْ شَاءَ أَطْلَعَكُمْ عَلَيْهَا، الْتَمِسُوهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی شەوی قەدر لە مانگی ڕەمەزاندایە بەبێ هیچ گومان و دوو دڵییەك، دژی وتەی ئەو کەسەی کە پێی وایە ئەو کەسەی لە کۆتا شەوی شەعباندا سوێند بخوا تەڵاقی لە ژنەکەی کەوتبێت، یان کۆیلەکەی ئازادە، یان کەنیزەکەکەی ئازادە لە شەوی قەدردا، ئەوە بێگومان تەڵاقی ناکەوێت و کۆیلە و کەنیزەکەکەشی ئازاد نابێت تا ساڵێك بەسەر سوێندەکەیدا تێپەڕ نەبێت، چونکە ئەو پێی وایە نازانێت شەوی قەدر لە ڕەمەزاندایە یاخود غەیری ڕەمەزان، لەبەر وتەکەی ئیبنو مەسعود: هەر کەس بەدرێژایی ساڵێك شەو دابنیشێ شەوی قەدر دەپێکێ

واتە: مالیکی کوڕی مەرسەد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو زەڕ ﷺ کرد، وتی: وتم: پرسیارت لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی شەوی قەدر؟ وتی: من خۆم پرسیار لە خەڵك دەکەم لەوبارەوە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ دەربارەی شەوی قەدر ئایا لە ڕەمەزاندایە یان جگە لە ڕەمەزان؟

---

(١) إسناده ضعيف.

فەرمووی: بەڵکوو لە ڕەمەزاندایە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا شەوی قەدر لەگەڵ مانەوەی پێغەمبەراندایە لە دنیادا، ئەگەر پێغەمبەران بمرن بەرز دەبێتەوە، یان بەردەوامە تا ڕۆژیی دوایی؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکوو شەوی قەدر هەتا ڕۆژی دواییە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ شەوی قەدر لە چی شەوێکی مانگی ڕەمەزاندایە؟ فەرمووی: لە دە شەوی یەکەم و دە شەوی کۆتایی بگەڕێن بەدوایدا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بۆ هاوەڵەکانی کرد، منیش لە کاتی بێدەنگبوونیدا هەلێکم قۆستەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوێندت دەدەم بە خوا هەواڵم بدەرێ شەوی قەدر لە کام شەوی ئەو بیست شەوەدایە؟ وتی: پێغەمبەر ﷺ لێم توڕە بوو بەتوڕەبوونێك هەرگیز لەپێش ئەو جارە و لە دوای ئەو جارە ئاوا لێم توڕە نەبووبوو، پاشان فەرمووی: بێگومان خوا ئەگەر بیویستایە ئاگاداری دەکردنەوە لە حەوت شەوەکەی کۆتاییدا بۆی بگەڕێن. (یان بیست و سێ یان بیست و حەوت).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، خِلَافَ قَوْلِ مَنْ ذَكَرْنَا مَقَالَتَهُمْ فِي الْبَابِ قَبْلَ هَذَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَالِفَ يَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ بِطَرَفِهِ بِأَنَّ امْرَأَتَهُ طَالِقٌ، أَوْ عَبْدَهُ حُرٌّ، فَهَلَّ هِلَالُ شَوَّالٍ كَانَ الطَّلَاقُ، أَوِ الْعِتْقُ، أَوْ هُمَا لَوْ كَانَ الْحَلِفُ بِهِمَا جَمِيعًا وَاقِعًا إِذْ لَيْلَةُ الْقَدْرِ قَدْ مَضَتْ بَعْدَ حَلِفِهِ مِنْ غَيْرِ شَكٍّ وَلَا ارْتِيَابٍ، إِذْ هِيَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ لَا قَبْلَ وَلَا بَعْدَ

**٢١٧١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الْأُوَلَ مِنْ رَمَضَانَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الْوَسَطَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ عَلَى سُدَّتِهَا قِطْعَةٌ مِنْ حَصِيرٍ قَالَ: فَأَخَذَ الْحَصِيرَ بِيَدِهِ، فَنَحَّاهَا فِي نَاحِيَةِ الْقُبَّةِ، ثُمَّ أَطْلَعَ رَأْسَهُ، فَكَلَّمَ النَّاسَ، فَدَنَوْا مِنْهُ، فَقَالَ: إِنِّي اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الْأُوَلَ أَلْتَمِسُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، ثُمَّ اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الْوَسَطَ، ثُمَّ أَتَيْتُ، فَقِيلَ لِي: إِنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَعْتَكِفَ فَلْيَعْتَكِفْ فَاعْتَكَفَ النَّاسُ مَعَهُ قَالَ: وَإِنِّي أُرِيتُهَا لَيْلَةَ وِتْرٍ، وَإِنِّي أَسْجُدُ صَبِيحَتَهَا فِي طِينٍ وَمَاءٍ، فَأَصْبَحَ فِي لَيْلَةِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَقَدْ قَامَ إِلَى الصُّبْحِ، فَمَطَرَتِ السَّمَاءُ، فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ، فَأَبْصَرْتُ الطِّينَ وَالْمَاءَ فَخَرَجَ حِينَ فَرَغَ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ، وَجَبْهَتُهُ وَأَنْفُهُ فِي الْمَاءِ وَالطِّينِ، وَإِذَا هِيَ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ[1].

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندایە، پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی کە لەپێش ئەم بەشە باسمان کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی یەکەم ڕۆژی ڕەمەزان پێش خۆرئاوابوون سوێند بخوات بەوەی ئەگەر شەوی قەدر هات تەڵاقی ژنەکەی کەوتووە، یان کۆیلەکەی ئازادە، ئەوە لە یەکەمین ڕۆژی شەوالدا تەڵاقی ژنەکەی دەکەوێت، یان کۆیلەکەی ئازاد دەبێت، چونکە شەوی قەدر ڕۆیشتووە بەبێ گومان و دوودڵی، چونکە شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندایە نەک لە پێشیەوە و نەک لە دوایەوە**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دە شەوی یەکەمی مانگی ڕەمەزان ئیعتیکافی کرد، پاشان دە شەوی نێوەڕاست ئیعتیکافی کرد لەنێو دەوارێکی بچووك پارچە حەسیرێکی دابوو بە بەردەم دەرگاکەیدا، وتی: حەسیرەکەی هەڵگرت بەدەستی لە تەنیشتی دەوارەکە داینا، پاشان سەری دەرکرد قسەی لەگەڵ خەڵکەکە کرد، ئەوانیش لێی نزیك بوونەوە، فەرمووی: من دە شەوی یەکەم ئیعتیکافم کرد دەگەڕام بەدوای ئەم شەوەدا، پاشان دە شەوی نێوەڕاست ئیعتیکافم کرد، پاشان هاتم، پێم وترا: شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتاییە، هەر کەس لە ئێوە پێی خۆشە ئیعتیکاف بکات با ئیعتیکاف بکات، خەڵکەکەیش لەگەڵی ئیعتیکافیان کرد، فەرمووی: من لە خەومدا پێم نیشان درا شەوی قەدر لە شەوە تاکەکاندایە، وە من سەرلەبەیانییەکەی ئەو شەوە لەنێو قوڕ و ئاودا سووژدە دەبەم، بەیانی کردەوە لە شەوی بیست و یەك، هەستا بۆ نوێژی بەیانی باران باری و نێو مزگەوتەکەی تەڕ کرد، بە چاوی خۆم قوڕ و ئاوم بینی، پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە نوێژی بەیانی بۆیەوە دەرچوو نێوچاوانی و لووتی شوێنەواری قوڕی پێوە بوو، ئەوە شەوی بیست و یەك بوو لە دە شەوی کۆتایی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْتِمَاسِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ وَطَلَبِهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢١٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَدْعُونِي مَعَ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، فَيَقُولُ لِي: لَا تَكَلَّمْ حَتَّى يَتَكَلَّمُوا قَالَ: فَدَعَاهُمْ فَسَأَلَهُمْ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَقَالَ: أَرَأَيْتُمْ قَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: الْتَمِسُوهَا




فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، أَيُّ لَيْلَةٍ تَرَوْنَهَا؟ قَالَ: فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْلَةُ إِحْدَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْلَةُ ثَلَاثٍ، وَقَالَ آخَرُ: خَمْسٍ، وَأَنَا سَاكِتٌ قَالَ: فَقَالَ: مَا لَكَ لَا تَتَكَلَّمُ؟ قَالَ: قُلْتُ: إِنْ أَذِنْتَ لِي يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ تَكَلَّمْتُ قَالَ: فَقَالَ: مَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكَ إِلَّا لِتَتَكَلَّمَ قَالَ: فَقُلْتُ: أُحَدِّثُكُمْ بِرَأْيِي؟ قَالَ: عَنْ ذَلِكَ نَسْأَلُكَ قَالَ: فَقُلْتُ: السَّبْعُ، رَأَيْتُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ ذَكَرَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ سَبْعًا، وَخَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ سَبْعٍ وَنَبْتُ الْأَرْضِ سَبْعٌ قَالَ: فَقَالَ: هَذَا أَخْبَرْتَنِي مَا أَعْلَمُ، أَرَأَيْتَ مَا لَا أَعْلَمُ؟ مَا هُوَ قَوْلُكَ: نَبْتُ الْأَرْضِ سَبْعٌ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا ﴿٢٧﴾ ﴾عبس، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ ﴾عبس، وَالْأَبُّ نَبْتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُهُ الدَّوَابُّ، وَلَا يَأْكُلُهُ النَّاسُ قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: أَعَجَزْتُمْ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ هَذَا الْغُلَامُ الَّذِي لَمْ تَجْتَمِعْ شُئُونُ رَأْسِهِ بَعْدُ؟ إِنِّي وَاللَّهِ مَا أَرَى الْقَوْلَ إِلَّا كَمَا قُلْتَ، وَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أَمَرْتُكَ أَنْ لَا تَكَلَّمَ حَتَّى يَتَكَلَّمُوا، وَإِنِّي آمُرُكَ أَنْ تَتَكَلَّمَ مَعَهُمْ"[١].

## باسی فەرمانکردن بە گەڕان بەدوای شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان بەدەستەواژەیەکی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) ڕوونکراوە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: عومەر بانگی دەکردم لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێمی دەوت: قسە مەکە تا ئەوان قسە دەکەن، وتی: بانگی کردن پرسیاری شەوی قەدری لێ کردن، وتی: هەواڵم بدەنێ دەربارەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتایی، پێتان وایە لە چی شەوێکدایە؟ وتی: هەندێکیان وتی: شەوی بیست و یەك، هەندێکی دیکەیان وتی: شەوی بیست و سێ، یەکێکی دیکەیان وتی: شەوی بیست و پێنج، منیش بێدەنگ بووم، وتی: عومەر وتی: بۆچی قسە ناکەی؟ وتی: وتم: ئەگەر مۆڵەتم پێ بدەیت ئەی ئەمیری باوەڕداران قسە دەکەم، وتی: عومەر وتی: تەنها بۆ ئەوە ناردوومە بە شوێنتدا قسە بکەیت، وتی: وتم: بە بۆچوونی خۆم قسە دەکەم؟ وتی: ئێمەیش پرسیاری ئەوەت لێ دەکەین، وتی: وتم: شەوی بیست و حەوتە، بینیم خوا لە کتێبەکەیدا ﷻ باسی حەوت ئاسمان و حەوت زەوی کردووە، وە باسی دروستکردنی مرۆڤیشی کردووە لە حەوت قۆناغ (مەبەستی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ

---

(١) إسناده حسن.

مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾)، وە ئەوەیشی لە زەوی دەردەچێ بە حەوت قۆناغە، وتی: عومەر وتی: ئەمەی هەواڵت پێم دا زانیومە، بەڵام هەواڵم بدەرێ لەوەی نەمزانیوە؟ مەبەستت چییە لەوەی وتت: وە ئەوەیشی لە زەوی دەردەچێت بە حەوت قۆناغە؟ وتی: وتم: بێگومان خوا فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا ﴿٢٧﴾ ﴾، تا فەرمایشتی: ﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ ﴾، وە (الأب) ئەو گیایەیە کە لە زەوی دەردەچێت و ئاژەڵ دەیخوات و مرۆڤ نایخوات، وتی: عومەر وتی: ئایا دەستەوسان بوون لەوەی وەکوو ئەم منداڵە بڵێن کە هێشتا پێست و مووەکانی سەری پڕ نەبوون؟ سوێند بە خوا منیش هەمان بۆچوونی تۆم هەیە، وە وتی: من پێشتر فەرمانم پێ کردی قسە نەکەی تا ئەوان قسە دەکەن، بەڵام ئێستا فەرمانت پێ دەکەم لەگەڵ ئەواندا تۆش قسە بکە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِطَلَبِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فِي الْوِتْرِ مِنْهَا لَا فِي الشَّفْعِ

**٢١٧٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَسْأَلُنِي مَعَ الْأَكَابِرِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ يَقُولُ: لَا تَكَلَّمْ حَتَّى يَتَكَلَّمُوا، فَسَأَلَهُمْ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَقَالَ: لَقَدْ عَلِمْتُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اطْلُبُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ وِتْرًا»[1].

## باسی فەرموودەیەکی ڕوونکەرەوە بۆ ئەو دەستەواژە کورتکراوەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە گەڕان بەدوای شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان لە شەوە تاکەکان نەك جووتەکان

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: عومەر پرسیاری لێ دەکردم لەگەڵ گەورە پیاوانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا دەیوت: قسە مەکە تا ئەوان قسە دەکەن، پرسیاری

---

(١) صحيح.




لێ کردن دەربارەی شەوی قەدر، وتی: بێگومان زانیوتانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دە شەوی تاکی کۆتاییدا بگەڕێن بەدوایدا.

**٢١٧٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، مِثْلَهُ، إِلَّا أَنَّهُ قَالَ: الْأَبُّ: مِمَّا أَنْبَتَتِ الْأَرْضُ مِمَّا لَا يَأْكُلُهُ النَّاسُ، وَتَأْكُلُهُ الْأَنْعَامُ[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوە، ئەوە نەبێت ئیبنو عەباس وتی: (الأب): لەو جۆرە گژوگیایەیە کە لە زەوی سەوز دەبێت مرۆڤەکان نایخۆن، بەڵکوو ئاژەڵەکان دەیخۆن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِطَلَبِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِمَّا يَبْقَى مِنَ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ لَا فِي الْوِتْرِ مِمَّا يَمْضِي مِنْهَا

**٢١٧٥-** عَنْ عُيَيْنَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ذَكَرْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ عِنْدَ أَبِي بَكْرَةَ ﵁، فَقَالَ: مَا أَنَا بِطَالِبِهَا إِلَّا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ بَعْدَ حَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فِي تِسْعٍ بَقِينَ، أَوْ فِي سَبْعٍ بَقِينَ، أَوْ فِي خَمْسٍ بَقِينَ، أَوْ فِي ثَلَاثٍ بَقِينَ، أَوْ فِي آخِرِ لَيْلَةٍ، فَكَانَ لَا يُصَلِّي فِي الْعِشْرِينَ إِلَّا كَصَلَاتِهِ فِي سَائِرِ السَّنَةِ، فَإِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ اجْتَهَدَ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە گەڕان بەدوای شەوی قەدر لە شەوە تاکەکان لەو شەوانەدایە کە دەمێنێتەوە لە دە شەوی کۆتایی نەك لەو شەوە تاکانەی کە لێی دەڕوات

واتە: عویەینەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: باسی شەوی قەدر کرا لەلای ئەبو بەکرە ﵁، وتی: من بەدوایدا ناگەڕێم مەگەر لە دە شەوی کۆتایی، دوای ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێ بوو دەیفەرموو: لە دە شەوی کۆتایی بگەڕێن بەدوایدا، نۆ شەوی مابێت، یان حەوت شەوی مابێت، یان پێنجی مابێت، یان سێی مابێت، یان لە کۆتا شەودا، جا لە بیست شەوەکەدا نوێژی دەکرد وەکوو نوێژەکانی کە بەدرێژایی ساڵ دەیکرد، کاتێ بچوایەتە نێو دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان زیاتر پەرستشی دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢١٧٦-** عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْعَشْرِ الْأَوْسَطِ مِنْ رَمَضَانَ وَهُوَ يَلْتَمِسُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ قَبْلَ أَنْ يَتَبَيَّنَ لَهُ، ثُمَّ أَمَرَ بِالْبِنَاءِ، فَنُقِضَ، فَأُبِينَتْ لَهُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ فَأَمَرَ بِهِ فَأُعِيدَ، فَخَرَجَ إِلَيْنَا، فَقَالَ: إِنَّهَا أُبِينَتْ لِي لَيْلَةُ الْقَدْرِ، وَإِنِّي خَرَجْتُ لِأُبَيِّنَهَا لَكُمْ، فَتَلَاحَى رَجُلَانِ، فَنَسِيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالْخَامِسَةِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، إِنَّكُمْ أَعْلَمُ بِالْعَدَدِ مِنَّا، فَأَيُّ لَيْلَةٍ التَّاسِعَةُ وَالسَّابِعَةُ وَالْخَامِسَةُ؟ قَالَ: أَجَلْ، وَنَحْنُ أَحَقُّ بِذَاكَ، إِذَا كَانَتْ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، فَالَّتِي تَلِيهَا هِيَ التَّاسِعَةُ، ثُمَّ دَعْ لَيْلَةً، ثُمَّ الَّتِي تَلِيهَا السَّابِعَةُ، ثُمَّ دَعْ لَيْلَةً، ثُمَّ الَّتِي تَلِيهَا الْخَامِسَةُ، وأنَّ أَبَا سَعِيدٍ[1] الَّتِي تُسَمُّونَهَا أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ، وَسِتًّا وَعِشْرِينَ، وَاثْنَتَيْنِ وَعِشْرِينَ[2].

واتە: ئەبو نەزرە دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیکافی دەکرد لەو دە شەوەی دەکەوتە نێوەڕاستی ڕەمەزانەوە، ئەو بەدوای شەوی قەدردا دەگەڕا پێش ئەوەی بۆی ڕوون ببێتەوە، پاشان فەرمانی کرد بە دانیشتن، پاشان هەڵیوەشاندەوە، پاشان لە دە شەوی کۆتایی بۆی ئاشکرا کرا، فەرمانی کرد بە دانیشتن دووبارە گەڕایەوە بۆ نێومان، فەرمووی: بێگومان شەوی قەدرم بۆ ئاشکرا بوو، من هاتمە دەرەوە بۆتان ڕوون بکەمەوە، دوو پیاو بوو بە دەمەدەمێیان لەبیرم برایەوە، بگەڕێن بەدوایدا لە نۆیەم و حەوتەم و پێنجەم، وتی: وتم: ئەی باوکی سەعید تۆ بەو ژمارانە لە ئێمە شارەزاتری، شەوی نۆیەم و حەوتەم و پێنجەم چی شەوێکە؟ وتی: بەڵێ، ئێمە لە پێشترین بە زانینی ئەوە، ئەگەر شەوی بیست و یەك بوو، ئەوەی بەدوایدا دێت ئەوە نۆیەمە (لەو شەوانەی کە ماوە لە مانگەکە) پاشان واز لە شەوێکی دوای ئەو بێنە، پاشان شەوەکەی دوای ئەو حەوتەمە (واتە: لەوەی کەماوەتەوە لە مانگەکە) پاشان واز لە شەوێکی دوای ئەو بێنە، پاشان شەوەکەی دوای ئەو پێنجەمە (واتە: لەوەی کەماوەتەوە لە مانگەکە) ئەبو سەعید (وتی: ئەوە ئەو ڕۆژانەیە): کە ئێوە پێی دەڵێین بیست و چوار و بیست و شەش و بیست و دوو.

**٢١٧٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ، «وَزَادَ الثَّالِثَةَ»[3].

---

(١) پێم وایە ئەم بڕگەیە وشەی لێ پەڕیوە.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموو: سێیەمیشی زیاد کرد.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوِتْرَ مِمَّا يَبْقَى مِنَ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ قَدْ يَكُونُ أَيْضًا الْوِتْرَ مِمَّا مَضَى مِنْهُ، إِذِ الشَّهْرُ قَدْ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ

**٢١٧٨-** عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَمَّا اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كُنْتَ فِي غَرْفَةٍ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژە تاکەکان لەوەی ماوەتەوە لە دە شەوی کۆتایی، هەندێ شەوی تاك دەکەوێتە ئەو شەوانەی کە ڕۆیشتووە لێی، چونکە مانگ هەندێ جار بیست و نۆیە

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە خێزانەکانی دوور کەوتەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بیست و نۆ ڕۆژ لە ژوورەکەت مایتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەم مانگە بیست و نۆ بوو.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلدَّلِيلِ الَّذِي ذَكَرْتُ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِطَلَبِهَا لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ مِمَّا قَدْ مَضَى مِنَ الشَّهْرِ، وَكَانَتْ لَيْلَةَ سَابِعَةٍ مِمَّا تَبَقَّى

**٢١٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: ذَكَرْنَا لَيْلَةَ الْقَدْرِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَمْ مَضَى مِنَ الشَّهْرِ؟» قُلْنَا: مَضَى اثْنَانِ وَعِشْرُونَ، وَبَقِيَ ثَمَانٍ قَالَ: «لَا، بَلْ بَقِيَ سَبْعٌ»، قَالُوا: لَا، بَلْ بَقِيَ ثَمَانٍ قَالَ: «لَا، بَلْ بَقِيَ سَبْعٌ»، قَالُوا: لَا، بَلْ بَقِيَ ثَمَانٍ قَالَ: «لَا، بَلْ بَقِيَ سَبْعٌ، الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ». ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ، حَتَّى عَدَّ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ، ثُمَّ قَالَ: «الْتَمِسُوهَا اللَّيْلَةَ»[٢].

## باسی فەرموودەیەك ڕوونکرەوەی ئەو بەڵگەیە کە باسم کرد، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە گەڕان بەدوایدا لە شەوی بیست و سێ لەوەی کە ڕۆیشتووە لە مانگەکە، ئەوەش دەکاتە حەوتەمین شەو لەوەی ماوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: باسی شەوی قەدرمان کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مانگ چەندی لێ ڕۆیشتووە؟ وتمان: بیست و دوو، هەشتی ماوەتەوە، فەرمووی نەخێر: بەڵکوو حەوتی ماوە، وتیان: نەخێر، بەڵکوو هەشتی ماوە، فەرمووی نەخێر: بەڵکوو حەوتی ماوە، وتیان: نەخێر، بەڵکوو هەشتی ماوە، فەرمووی نەخێر: بەڵکوو حەوتی ماوە، ئەم مانگە بیست و نۆیە، پاشان بە دەستی ژماردی تا بیست و نۆ، پاشان فەرمووی: ئەمشەو بەدوایدا بگەڕێن.

**٢١٨٠-** خَبَرُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ ﷺ مِنْ هَذَا الْبَابِ: الْتَمِسُوهَا اللَّيْلَةَ، وَذَلِكَ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ[١].

**واتە: فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ﷺ لەم بەشەدا هاتووە: ئەمشەو بەدوایدا بگەڕێن، ئەو شەوە شەوی بیست و سێ بوو.**

**٢١٨١-** خَبَرُ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ صَبِيحَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَإِنَّ جَبِينَهُ وَأَرْنَبَةَ أَنْفِهِ لَفِي الْمَاءِ وَالطِّينِ مِنْ هَذَا الْجِنْسِ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ كَانَ أَعْلَمَهُمْ أَنَّهُ رَأَى أَنَّهُ يَسْجُدُ صَبِيحَةَ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي مَاءٍ وَطِينٍ، فَكَانَتْ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ الْوِتْرَ مِمَّا مَضَى مِنَ الشَّهْرِ، فَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ رَمَضَانُ فِي تِلْكِ السَّنَةِ كَانَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، فَكَانَتْ تِلْكَ اللَّيْلَةُ التَّاسِعَةُ مِمَّا بَقِيَ مِنَ الشَّهْرِ، الْحَادِيَةَ وَالْعِشْرِينَ مِمَّا مَضَى مِنْهُ[٢].

**واتە: فەرموودەکەی ئەبو سەعید ﷺ: (کە دەڵێ) پێغەمبەرم ﷺ بینی سەرلەبەیانی بیست و یەکی ڕەمەزان، نێوچاوانی و سەری لووتی قوڕی پێوە بوو. ئەم فەرموودەیش لەم شێوازەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندبوون کەوا سەرلەبەیانی شەوی قەدر لەنێو قوڕدا سووژدە دەبات، بۆیە شەوی بیست و یەك تاك بوو لەوەی ڕۆیشتبوو لە مانگەکە، پێدەچێت ڕەمەزان لەو ساڵەدا بیست و نۆ بووبێت، بۆیە ئەو شەوە شەوی نۆیەم بوو لەوەی ماوە لە مانگەکە، وە بیست و یەك بوو لەوەی کە ڕۆیشتووە لە مانگەکە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْأَمْرِ بِطَلَبِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا أَمَرَ بِالِاقْتِصَارِ عَلَى طَلَبِهَا فِي السَّبْعِ دُونَ الْعَشْرِ جَمِيعًا

٢١٨٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَرَوْنَ الرُّؤْيَا، فَيَقُصُّونَهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ عَلَى السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ يَحْتَمِلُ مَعْنَيَيْنِ: أَحَدُهُمَا: فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ أَنْ يَكُونَ ﷺ لَمَّا عَلِمَ تَوَاطُؤَ رُؤْيَا الصَّحَابَةِ أَنَّهَا فِي السَّبْعِ الْأَخِيرِ فِي تِلْكَ السَّنَةِ أَمَرَهُمْ تِلْكَ السَّنَةَ بِتَحَرِّيهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ، وَالْمَعْنَى الثَّانِي: أَنْ يَكُونَ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَهُمْ بِتَحَرِّيهَا وَطَلَبِهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ إِذَا ضَعُفُوا وَعَجَزُوا عَنْ طَلَبِهَا فِي الْعَشْرِ كُلِّهِ.

## باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، دەربارەی فەرمانکردن بە گەڕان بەدوای شەوی قەدر لە حەوت شەوی کۆتایی، بەبێ باسی هۆکارێك کە فەرمانی کردووە بە کورتکردنەوەی ئەو ڕۆژانە بۆ حەوت شەو جگە لە دە شەو

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: خەڵك خەویان دەبینی، دواتر بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ باس دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وا دەبینم خەوەکانتان یەکی گرتووە لەسەر حەوت شەوەکەی کۆتایی (مانگی ڕەمەزان) جا هەر کەس بەدوایدا دەگەڕێت با لە حەوت شەوەکەی کۆتاییدا بەدوایدا بگەڕێ.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودە دوو مانا لەخۆ دەگرێ: یەکەمیان: لە حەوت شەوی کۆتایی، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ کاتێ زانی هاوەڵان لەو ساڵەدا هەموویان خەویان بینیوە شەوی قەدر دەکەوێتە حەوت شەوی کۆتایی فەرمانی پێ کردن ئەو ساڵە لە حەوت شەوەکەی کۆتایی بگەڕێن بەدوایدا، مانای دووەم: پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمانی پێ کردن لە حەوت شەوی کۆتایی پشکنین بکەن و بگەڕێن بە دوایدا، ئەگەر نەیانتوانی هەموو دە شەوەکە دابنشین و بگەڕێن بەدوایدا.

---

(١) صحیح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى صِحَّةِ الْمَعْنَى الثَّانِي الَّذِي ذَكَرْتُ أَنَّهُ أَمَرَ بِطَلَبِهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ إِذَا ضَعُفَ وَعَجَزَ طَالِبُهَا عَنْ طَلَبِهَا فِي الْعَشْرِ كُلِّهِ

**٢١٨٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ - يَعْنِي: لَيْلَةَ الْقَدْرِ - فَإِنْ ضَعُفَ أَحَدُكُمْ أَوْ عَجَزَ فَلَا يُغْلَبَنَّ عَلَى السَّبْعِ الْبَوَاقِي»[1].

## باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ڕاستی مانای دووەم کە باسم کرد، ئەو فەرمانی کرد بە گەڕان لە حەوت شەوی کۆتایی، ئەگەر لاواز بوو، وە نەیتوانی هەموو دە شەوەکە دابنیشێ

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دە شەوی کۆتاییدا بگەڕێن بەدوایدا -واتە: شەوی قەدر- ئەگەر یەکێك لە ئێوە لاواز بوو با حەوت شەوەکەی کۆتایی لەدەست خۆی نەدات.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ اللَّيَالِي الَّتِي كَانَ فِيهَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لَيْلَةَ الْقَدْرِ تَنْتَقِلُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فِي الْوِتْرِ عَلَى مَا ثَبَتَ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لَيْلَةَ الْقَدْرِ قَدْ كَانَتْ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ الشَّهْرِ لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ فِي رَمَضَانَ.

**٢١٨٤-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ أَمْلَيْتُهُ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ[2].

## کۆباسی ئەو شەوانەی کە شەوی قەدری تێدابووە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، بەڵگەش لەسەر ئەوەی شەوی قەدر لە ڕۆژە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانەو ئەمە جێگیر بووە

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی شەوی قەدر لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە هەندێ لە مانگەکاندا شەوی بیست و یەکی ڕەمەزان بووە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودریم ﷺ باس کرد لە غەیری ئەم جێگایەدا. (کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوەی وتی).

## بَابُ ذِكْرِ الْأَمْرِ بِطَلَبِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ، إِذْ جَائِزٌ أَنْ تَكُونَ لَيْلَةُ الْقَدْرِ فِي بَعْضِ السِّنِينَ لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَفِي بَعْضٍ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ

**٢١٨٥-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْد اللَّه بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَخِيهِ فُلَانِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ قَالَ: جَلَسْنَا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ ﷺ فِي مَجْلِسِ جُهَيْنَةَ فِي هَذَا الشَّهْرِ، فَقُلْنَا: يَا أَبَا يَحْيَى هَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ الْمُبَارَكَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، جَلَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي آخِرِ هَذَا الشَّهْرِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَتَى نَلْتَمِسُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ الْمُبَارَكَةَ؟ قَالَ: «الْتَمِسُوهَا هَذِهِ اللَّيْلَةَ، ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: تِلْكَ إِذًا أُولَى ثَمَانٍ[١].

## باسی فەرمانکردن بە گەڕان بەدوای شەوی قەدر، لە شەوی بیست و سێ، چونکە دروستە شەوی قەدر لە هەندێ ساڵدا شەوی بیست و یەك بێت، لە هەندێکی دیکەدا شەوی بیست و سێ بێت

واتە: موعازی کوڕی عەبدوڵای کوڕی خوبەیب دەگێڕێتەوە لە براکەیەوە فڵانە کەسی کوڕی عەبدوڵای کوڕی خوبەیب وتی: لەم مانگەدا (کە مانگی ڕەمەزان بوو) لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ﷺ دانیشتین لە کۆڕ و دانشتنێکی هۆزی جوهەینە، وتمان: ئەی باوکی یەحیا ئایا بیستووتە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی فەرموویێت دەربارەی ئەم شەوە پیرۆزە (کە شەوی قەدرە)؟ وتی: بەڵێ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین لە کۆتایی ئەم مانگەدا، پیاوێك پێی وت: کەی بگەڕێین بۆ ئەم شەوە پیرۆزە (کە شەوی قەدرە)؟ فەرمووی: ئەم شەو بەدوایدا بگەڕێن، شەوی بیست و سێ، پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: کەواتە ئەم شەوە سەرەتای یەکەمی هەشت شەوەکەیە کە ماون.

**٢١٨٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ ﷺ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْتَمِسُوهَا اللَّيْلَةَ، وَتِلْكَ لَيْلَةُ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ»، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هِيَ إِذًا أُولَى ثَمَانٍ، فَقَالَ: «بَلْ أُولَى سَبْعٍ؛ فَإِنَّ الشَّهْرَ لَا يَتِمُّ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ﷛ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی شەوی قەدر، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەم شەو بەدوایدا بگەڕێن، ئەو شەوە شەوی بیست و سێ بوو، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەواتە ئەم شەوە سەرەتای یەکەمی هەشت شەوەکەیە کە ماون، فەرمووی: بەڵکوو لە یەکەمی حەوت شەوەکەی دیکەی کۆتاییە، چونکە ئەم مانگە سی ڕۆژ پڕ ناکاتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ كَوْنِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي بَعْضِ السِّنِينَ، إِذْ لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ إِذْ لَيْلَةُ الْقَدْرِ تَنْتَقِلُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ فِي الْوِتْرِ عَلَى مَا ذَكَرْتُ

**٢١٨٧-** عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: لَوْلَا سُفَهَاؤُكُمْ لَوَضَعْتُ يَدَيَّ فِي أُذُنَيَّ فَنَادَيْتُ: أَنَّ لَيْلَةَ الْقَدْرِ سَبْعٌ وَعِشْرُونَ، نَبَأُ مَنْ لَمْ يَكْذِبْنِي، عَنْ نَبَأِ مَنْ لَمْ يَكْذِبْهُ، يَعْنِي أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷛، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

## باسی بوونی شەوی قەدر لە هەندێ ساڵەکان دەکەوێتە بیست و حەوت، چونکە شەوی قەدر لە دە شەوە تاکەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزان دەگوازرێتەوە، وەك باسم کرد

واتە: زیری کوڕی حوبەیش دەڵێ: ئەگەر لەبەر گێل و کاڵفامەکانتان نەبووایە هەردوو دەستم دەخستە گوێم و بانگم دەکرد: بێگومان شەوی قەدر شەوی بیست و حەوتە، ئەوە هەواڵی کەسێکە درۆی لەگەڵ نەکردووم، لە کەسێکەوە وەریگرتووە هەرگیز درۆی لەگەڵ نەکردووە، واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷛ لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

**٢١٨٨-** عَنْ أُبَيٍّ ﷛ قَالَ: لَيْلَةُ الْقَدْرِ، إِنِّي لَأَعْلَمُهَا هِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي أَمَرَنَا بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هِيَ لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ[٢].

واتە: ئوبەی ﷛ دەڵێ: شەوی قەدر، من دەزانم ئەو شەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین، شەوی بیست و حەوتە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِطَلَبِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ آخِرَ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ إِذْ جَائِزٌ أَنْ يَكُونَ فِي بَعْضِ السِّنِينَ تِلْكَ اللَّيْلَةُ

**٢١٨٩-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْتَمِسُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي آخِرِ لَيْلَةٍ»[١].

**باسی فەرمانكردن بە گەڕان بەدوای شەوی قەدر لە كۆتا شەوی مانگی ڕەمەزان، چونكە دروستە هەندێ لە ساڵەكان شەوی قەدر بكەوێتە ئەو شەوە**

واتە: موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە كۆتا شەوی (ڕەمەزاندا) بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا.

## بَابُ صِفَةِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ بِنَفْيِ الْحَرِّ وَالْبَرْدِ فِيهَا، وَشِدَّةِ ضَوْئِهَا، وَمَنْعِ خُرُوجِ شَيَاطِينِهَا مِنْهَا حَتَّى يُضِيءَ فَجْرُهَا

**٢١٩٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي كُنْتُ أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، ثُمَّ نُسِّيتُهَا، وَهِيَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ لَيْلَتِهَا، وَهِيَ لَيْلَةٌ طَلْقَةٌ بَلْجَةٌ، لَا حَارَّةٌ وَلَا بَارِدَةٌ، كَأَنَّ فِيهَا قَمَرًا يَفْضَحُ كَوَاكِبَهَا، لَا يَخْرُجُ شَيْطَانُهَا حَتَّى يُضِيءَ فَجْرُهَا»[٢].

**باسی سیفاتی شەوی قەدر كە نە گەرمە و نە ساردە، هەروەها زۆر ڕووناكە، وە ڕێگریكردن لە دەرچوونی شەیتانەكانی تا بەرەبەیانی ڕۆشن دەبێتەوە**

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لە خەومدا شەوی قەدرم پێ نیشان درا، پاشان لەبیرم برایەوە، ئەویش لە دە شەوی كۆتاییە، ئەو شەوە پاك و پرشنگدارە، نە گەرمە و نە ساردە، مانگ تیایدا گەشاوەیە و ئەستێرەكانی بەڕوونی دیارە، شەیتان ناتوانێت دەربچێت هەتا شەبەق دەدا.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) في إسناده ضعف.

## بَابُ صِفَةِ الشَّمْسِ عِنْدَ طُلُوعِهَا صَبِيحَةَ لَيْلَةِ الْقَدْرِ

**٢١٩١-** عَنْ زِرٍّ يَقُولُ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ، فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فَقَالَ: يَرْحَمُهُ اللَّهُ لَقَدْ أَرَادَ أَنْ لَا يَتَّكِلُوا، وَلَقَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ قَالَ: قُلْنَا: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ بِأَيِّ شَيْءٍ يُعْرَفُ ذَلِكَ؟ قَالَ: بِالْعَلَامَةِ، أَوْ بِالْآيَةِ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ مِنْ ذَلِكَ الْيَوْمِ لَا شُعَاعَ لَهَا[1].

### باسی سیفەتی خۆر کاتێ سەرلەبەیانی شەوی قەدر دەردەچێ

واتە: زیڕ دەڵێ: پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ کرد، وتم: بەڕاستی ئیبنو مەسعودی برات دەڵێ: هەر کەس بەدرێژایی ساڵ شەونخوونی بکات شەوی قەدری بە نسیب دەبێت، وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت بێگومان ئەو ویستی ئەوە بووە خەڵکی پشت نەدەنەوە و بێخەم بن (واتە: لە پەرستشکردن)، بێگومان چاك دەیزانی شەوی قەدر لە مانگی ڕەمەزاندایە، وە لە دە شەوی کۆتاییە و لە شەوی بیست و حەوتە، وتی: وتمان: ئەی باوکی مونزیر بە چی شتێك ئەو شەوە دەناسرێتەوە؟ وتی: بەو نیشانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوین: بێگومان خۆر لەو ڕۆژەدا هیچ تیشکێکی نییە.

## بَابُ حُمْرَةِ الشَّمْسِ عِنْدَ طُلُوعِهَا وَضَعْفِهَا صَبِيحَةَ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَالِاسْتِدْلَالِ بِصِفَةِ الشَّمْسِ عَلَى لَيْلَةِ الْقَدْرِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ حِفْظِ زَمْعَةَ

**٢١٩٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ: لَيْلَةٌ طَلْقَةٌ، لَا حَارَّةٌ وَلَا بَارِدَةٌ، تُصْبِحُ الشَّمْسُ يَوْمَهَا حَمْرَاءَ ضَعِيفَةً[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی خۆر سەرلەبەیانی شەوی قەدر لە کاتی دەرچوونی سوور و لاوازە و تینی نییە، وە کردنی سیفاتی خۆر بە بەڵگە لەسەر شەوی قەدر، ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت، چونکە بەڕاستی شتێك لە دڵدا هەیە دەربارەی لەبەرکردنی زەمعە[1]

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ سەبارەت بە شەوی قەدر: شەوێکی پاکە، نە گەرمە و نە ساردە، لە ڕۆژەکەیدا خۆر سوور و لاوازە و تینی نییە.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّمْسَ لَا يَكُونُ لَهَا شُعَاعٌ إِلَى وَقْتِ ارْتِفَاعِهَا ذَلِكَ الْيَوْمَ إِلَى آخِرِ النَّهَارِ

**٢١٩٣-** عَنْ زِرٍّ قَالَ: قُلْتُ لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ: أَخْبِرْنِي عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ؛ فَإِنَّ صَاحِبَنَا - يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ - سُئِلَ عَنْهَا، فَقَالَ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْهَا قَالَ: رَحِمَ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لَقَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَلَكِنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَتَّكِلُوا، أَوْ أَحَبَّ أَنْ لَا يَتَّكِلُوا، وَاللَّهِ إِنَّهَا لَفِي رَمَضَانَ لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، لَا يَسْتَثْنِي، قَالَ: قُلْتُ: أَبَا الْمُنْذِرِ، أَنَّى عَلِمْتُ ذَلِكَ قَالَ: بِالْآيَةِ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِزِرٍّ: مَا الْآيَةُ؟ قَالَ: تَطْلُعُ الشَّمْسُ صَبِيحَةَ تِلْكَ اللَّيْلَةِ لَيْسَ لَهَا شُعَاعٌ مِثْلَ الطَّسْتِ حَتَّى تَرْتَفِعَ[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خۆری سەرلەبەیانی شەوی قەدر تیشکی نییە تا کۆتایی ڕۆژەکە

واتە: زیڕ دەڵێ: بە ئوبەی کوڕی کەعبم ﷺ وت: هەواڵم بدەرێ دەربارەی شەوی قەدر، چونکە هاوەڵەکەمان -ئیبنو مەسعود- دەڵێ: هەر کەس بەدرێژایی ساڵ شەونخوونی بکات شەوی قەدری بە نسیب دەبێت، وتی: ڕەحمەتی خوا لە باوکی عەبدوڕەحمان، بێگومان چاك دەیزانی شەوی قەدر لە مانگی ڕەمەزاندایە، بەڵام پێی ناخۆش بوو خەڵکی پشت سارد ببنەوە و بێخەم بن، یان پێی خۆش بوو خەڵك پشت سارد نەبنەوە و بێخەم نەبن (واتە: لە پەرستشکردن)، سوێند بە خوا شەوی قەدر لە

---

(١) ) یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە.

(٢) إسناده حسن.

مانگی ڕەمەزاندایە شەوی بیست و حەوتە، هیچ جیای نەکردەوە، وتی: وتم: ئەی باوکی مونزیر چۆن بزانم ئەوە شەوی قەدرە؟ وتی: بەو نیشانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوین: وتی: بە زیڕم وت: ئەو نیشانەیە چییە؟ وتی: سەرلەبەیانی ئەو شەوە خۆر دەردەچێت هیچ تیشکێکی نییە، هەر وەکوو تەشت وایە تا بەرز دەبێتەوە.

## بَابِ ذِكْرِ كَثْرَةِ الْمَلَائِكَةِ فِي الْأَرْضِ لَيْلَةَ الْقَدْرِ

**٢١٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ السَّابِعَةِ، أَوِ التَّاسِعَةِ وَعِشْرِينَ، وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ أَكْثَرُ فِي الْأَرْضِ مِنْ عَدَدِ الْحَصَى»[1].

### باسی زۆری فریشتەکان لە زەویدا لە شەوی قەدر

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەوی قەدر، شەوی بیست و حەوتە یان بیست و نۆ، بێگومان فریشتەکان لەو شەوەدا لەسەر زەوی لە ژمارەی بەردەکان زیاترن.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْمُدْرِكَ لِصَلَاةِ الْعِشَاءِ فِي جَمَاعَةٍ لَيْلَةَ الْقَدْرِ يَكُونُ مُدْرِكًا لِفَضِيلَةِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ

**٢١٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ فِي جَمَاعَةٍ فِي رَمَضَانَ فَقَدْ أَدْرَكَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ»[2].

### باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی هەر کەس نوێژی عیشای بەکۆمەڵ کرد لە شەوی قەدردا، ئەوە گەیشتووە بە خێر و پاداشتی شەوی قەدر

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس نوێژی عیشای کرد بەکۆمەڵ لە مانگی ڕەمەزان (لە شەوی قەدر) ئەوە گەیشتووە بە شەوی قەدر.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ إِنْسَاءِ اللَّهِ ﷻ النَّبِيَّ ﷺ لَيْلَةَ الْقَدْرِ بَعْدَ رُؤْيَتِهِ إِيَّاهَا

٢١٩٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، إِنِّي كُنْتُ أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا[١].

### باسی خوا ﷻ شەوی قەدری لە بیر پێغەمبەر ﷺ بردەوە دوای ئەوەی پێی نیشان دا

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی): من شەوی قەدرم لە خەودا پێ نیشان درا، پاشان لە بیرم برایەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ رُؤْيَةَ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةَ الْقَدْرِ كَانَ فِي نَوْمٍ، وَفِي يَقَظَةٍ

٢١٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، ثُمَّ أَيْقَظَنِي أَهْلِي فَنَسِيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْغَوَابِرِ»[٢].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ شەوی قەدری بینی هەم لە خەو و هەم لە بەخەبەربووندا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەوی قەدرم لە خەودا پێ نیشان درا، پاشان خێزانەکەم هەڵیساندم لەبیرم چۆیەوە، لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان بەدوایدا بگەڕێن.

## بَابُ ذِكْرِ رَجَاءِ النَّبِيِّ ﷺ وَظَنِّهِ أَنْ يَكُونَ رَفْعُ عِلْمِهِ لَيْلَةَ الْقَدْرِ خَيْرًا لِأُمَّتِهِ مِنْ إِطْلَاعِهِمْ عَلَى عِلْمِهَا، إِذِ الِاجْتِهَادُ فِي الْعَمَلِ لَيَالِيًا طَمَعًا فِي إِدْرَاكِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ أَفْضَلُ وَأَكْثَرُ عَمَلًا مِنَ الِاجْتِهَادِ فِي لَيْلَةٍ وَاحِدَةٍ خَاصَّةً

٢١٩٨- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَادَةُ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يُخْبِرُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فَتَلَاحَى رَجُلَانِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: «إِنِّي خَرَجْتُ لِأُخْبِرَكُمْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فَتَلَاحَى فُلَانٌ وَفُلَانٌ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فَرُفِعَتْ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرًا لَكُمْ، فَالْتَمِسُوهَا فِي التِّسْعِ وَالسَّبْعِ وَالْخَمْسِ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَرُفِعَتْ، يَعْنِي: مَعْرِفَتِي بِتِلْكَ اللَّيْلَةِ[١].

**باسی پێغەمبەر ﷺ ئومێدی هەبوو بەرزکردنەوەی زانیاری دەربارەی دیاریکردنی شەوی قەدر خێری تێدا بێت بۆ ئوممەتەکەی، لەوەی بیانزانیایە شەوی قەدر لە چی شەوێکدا دەبێت، چونکە هەوڵدان و خۆماندووکردن لە پەرستش لەو شەوانەدا بە مەبەستی دەستخستنی خێر و پاداشتی شەوی قەدر چاکتر و گەورەترە لە کۆششکردنی یەک شەوی دیاریکراو بە پەرستش**

واتە: ئەنەس دەڵێ: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ هەواڵی پێ دام، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ ئەوەی هەواڵی شەوی قەدرمان پێ بدات، دوو پیاو لە مسوڵمانان بوو بە دەمەقاڵێیان، فەرمووی: هاتمە دەرەوە بۆ ئەوەی هەواڵتان بدەمێ بە شەوی قەدر، فڵان و فڵان بوو بە دەمەقاڵێیان، ئینجا زانیاریم دەربارەی بەرز کرایەوە، بەدڵنیاییەوە خێری تێدایە بۆتان، لە شەوی نۆیەم و حەوتەم و پێنجەم بگەڕێن بە دوایدا (واتە: شەوی بیست و یەك یان بیست و نۆ، وە بیست و سێ یان بیست و حەوت، وە بیست و پێنج).

## بَابُ مَغْفِرَةِ ذُنُوبِ الْعَبْدِ بِقِيَامِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَاباً

**٢١٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ رِوَايَةً قَالَ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

**باسی لێخۆشبوونی گوناهەکانی بەندە بە شەونوێژکردنی شەوی قەدر و بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕوانی پاداشت بێ**

واتە: ئەبو هورەیرەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لەلای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ شُهُودِ الْبَدَوِيِّ الصَّلَاةَ فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ مِنْ رَمَضَانَ إِذَا كَانَ سَكَنُهُ قُرْبَ الْمَدِينَةِ تَحَرِّيًا لِإِدْرَاكِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فِي مَسْجِدِهَا

**٢٢٠٠-** عَنِ مُحمد بن إبراهيم عَن ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَكُونُ بِالْبَادِيَةِ، وَأَنَا بِحَمْدِ اللَّهِ أُصَلِّي بِهَا، فَمُرْنِي بِلَيْلَةٍ أَنْزِلُهَا لِهَذَا الْمَسْجِدِ أُصَلِّيهَا فِيهِ قَالَ: «انْزِلْ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ»، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبْدِ اللَّهِ: فَكَيْفَ كَانَ أَبُوكَ يَصْنَعُ؟ قَالَ: يَدْخُلُ صَلَاةَ الْعَصْرِ، ثُمَّ لَا يَخْرُجُ حَتَّى يُصَلِّيَ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ يَخْرُجُ وَدَابَّتُهُ، يَعْنِي عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَيَرْكَبُهَا فَيَأْتِي أَهْلَهُ[1].

## باسی چاکتر وایە کەسی دەشتەکی و هەوارنشین ئامادەی نوێژ بێ لە مزگەوتی مەدینە لە شەوی بیست و سێی ڕەمەزان، ئەگەر شوێنی نیشتەجێبوونی لە نزیك مەدینە بوو، بۆ ئەوەی شەوی قەدر لە مزگەوتەکەدا بێ

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لە دەشت دەژیم، سوپاس بۆ خوا لەوێ نوێژ دەکەم، فەرمانم پێ بکە شەوێك بێم بۆ ئەم مزگەوتە نوێژی تێدا بکەم، فەرمووی: شەوی بیست و سێ وەرە، وتی: بە ئیبنو عەبدوڵام وت: باوکت چی دەکرد؟ وتی: نوێژی عەسر دەچووە مزگەوتەوە دەرنەدەچوو تا نوێژی بەیانی دەکرد، پاشان دەردەچوو، وڵاخەکەی لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکە بوو، دواتر سواری دەبوو دەهاتەوە بۆ نێو خێزانی.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ أَبْوَابِ قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قِيَامَ شَهْرِ رَمَضَانَ سُنَّةُ النَّبِيِّ ﷺ خِلَافَ زَعْمِ الرَّوَافِضِ الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّ قِيَامَ شَهْرِ رَمَضَانَ بِدْعَةٌ لَا سُنَّةٌ.

**٢٢٠١-** عَنِ النَّضْرِ بْنِ شَيْبَانَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي سَلَمَةَ: أَلَا تُحَدِّثُنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ أَبِيكَ، سَمِعَهُ أَبُوكَ ﷺ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ فَقَالَ: بَلَى، أَقْبَلَ رَمَضَانُ، فَقَالَ

---

(١) إسناده حسن.

رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ رَمَضَانَ شَهْرٌ افْتَرَضَ اللَّهُ صِيَامَهُ، وَإِنِّي سَنَنْتُ لِلْمُسْلِمِينَ قِيَامَهُ، فَمَنْ صَامَهُ وَقَامَهُ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[١].

## کۆباسی شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزاندا

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی شەونوێژی مانگی ڕەمەزان، سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، پێچەوانەی ئەو ڕافیزانەی کە پێیان وایە شەونوێژی مانگی ڕەمەزان داهێنراوەو و سوننەت نییە

واتە: نەزری کوڕی شەیبان دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە، وتی: بە ئەبو سەلەمەم وت: بۆچی فەرموودەیەکمان بۆ باس ناکەیت لە باوکتەوە ﷺ گوێت لێ بووبێت، باوکیشت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێی لێ بووبێت؟ وتی: بەڵێ، ڕەمەزان هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ڕەمەزان مانگێکە خوا فەرزی کردووە ڕۆژووی تێدا بگیرێ، منیش شەونوێژم تیایدا کردووە بە سوننەت، هەر کەس بەڕۆژوو بێت تیایدا و شەونوێژ بکات بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لە لای خوا لە گوناهەکانی دەردەچێت وەکوو ئەو ڕۆژەی لە دایك بووە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِقِيَامِ رَمَضَانَ أَمْرَ تَرْغِيبٍ، لَا أَمْرَ عَزْمٍ وَإِيجَابٍ

**٢٢٠٢-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِقِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَ فِيهِ بِعَزِيمَةٍ يَقُولُ: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

### باسی فەرمانکردن بە شەونوێژی ڕەمەزان فەرمانێکە بۆ هاندان، فەرمان نییە بۆ زۆر پێداگری و عەزم و واجببوون

واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بە شەونوێژکردن لە مانگی ڕەمەزاندا، بەبێ ئەوەی لە فەرمانەکەیدا زۆر پێداگری بکات، دەیفەرموو:

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

هەر کەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات و بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لەلای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

## بَابُ ذِكْرِ مَغْفِرَةِ سَالِفِ ذُنُوبِ أُخْرَ بِقِيَامِ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا

**٢٢٠٣-** «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ»[١].

## باسی لێخۆشبوونی گوناهەکانی پێشوو بە شەونوێژکردن لە مانگی ڕەمەزاندا، بە مەرجێ بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لەلای خوا

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕەمەزان شەونوێژ بکات بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لەلای خوا، خوا لێی خۆش دەبێت.

## بَابُ الصَّلَاةِ جَمَاعَةً فِي قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ يَتَوَهَّمُ أَنَّ الْفَارُوقَ هُوَ أَوَّلُ مَنْ أَمَرَ بِالصَّلَاةِ جَمَاعَةً فِي قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٢٠٤-** عَنِ النُّعْمَانَ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ عَلَى مِنْبَرِ حِمْصَ يَقُولُ: قُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قُمْنَا مَعَهُ لَيْلَةَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قُمْنَا مَعَهُ لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ لَنْ نُدْرِكَ الْفَلَاحَ، وَكُنَّا نُسَمِّيهِ السَّحُورَ، وَأَنْتُمْ تَقُولُونَ: لَيْلَةُ سَابِعَةِ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ، وَنَحْنُ نَقُولُ: سَابِعَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، فَنَحْنُ أَصْوَبُ أَمْ أَنْتُمْ؟[٢].

## باسی شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزاندا بەکۆمەڵ لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، دژی وتەی ئەو کەسەی بەهەڵەدا دەچێ و وا دەزانێ یەکەم کەس شەونوێژی بەکۆمەڵی کرد لە ڕەمەزاندا عومەر بوو

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ لەسەر مینبەری شاری حیمص دەیوت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاین بۆ شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزان شەوی بیست و سێ تا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

سێیەکی شەو، پاشان لەگەڵی هەستاین بۆ شەونوێژ شەوی بیست و پێنج تا نیوەی شەو، پاشان شەوی بیست و حەوت لەگەڵی هەستاین بۆ شەونوێژ تا گومانمان برد نەگەین بە فەلاح، ئێمە پێیان دەوت: پارشێو، ئێوە بە شەوی حەوتەم (کە ماوەتەوە لە مانگەکە) دەڵێن: بیست و سێ، ئێمەیش بە شەوی حەوتەم دەڵێین: بیست و حەوت، جا ئەوەی ئێمە تەواوە یان ئەوەی ئێوە؟

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا خَصَّ الْقِيَامَ بِالنَّاسِ هَذِهِ اللَّيَالِيَ الثَّلَاثَ لِلَيْلَةِ الْقَدْرِ فِيهِنَّ

**٢٢٠٥-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَامَ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا أَحْسِبُ مَا تَطْلُبُونَ إِلَّا وَرَاءَكُمْ»، ثُمَّ قَامَ لَيْلَةَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا أَحْسِبُ مَا تَطْلُبُونَ إِلَّا وَرَاءَكُمْ»، ثُمَّ قُمْنَا لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ إِلَى الصُّبْحِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ إِلَّا وَرَاءَكُمْ، هُوَ عِنْدِي مِنْ بَابِ الْأَضْدَادِ، وَيُرِيدُ: أَمَامَكُمْ؛ لِأَنَّ مَا قَدْ مَضَى هُوَ وَرَاءُ الْمَرْءِ، وَمَا يَسْتَقْبِلُهُ هُوَ أَمَامُهُ، وَالنَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ: مَا أَحْسِبُ مَا تَطْلُبُونَ، أَيْ: لَيْلَةَ الْقَدْرِ، إِلَّا فِيمَا تَسْتَقْبِلُونَ، لَا أَنَّهَا فِيمَا مَضَى مِنَ الشَّهْرِ، وَهَذَا كَقَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾﴾ الكهف، يُرِيدُ: وَكَانَ أَمَامَهُمْ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە لەو سێ شەوەدا بەتایبەت شەونوێژی بۆ خەڵك کرد، چونکە شەوی قەدر لەنێو ئەو شەوانەدا بوو

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی بیست و سێی مانگی ڕەمەزان شەونوێژی پێ کردین تا سێیەکی یەکەمی شەو، پاشان فەرمووی: پێم وایە ئەوەی ئێوە دەتانەوێ لە شەوی قەدر لە پێشتانەوەیە، پاشان شەوی بیست و پێنج شەونوێژی کرد تا نیوەی شەو، پاشان فەرمووی: پێم وایە ئەوەی ئێوە دەتانەوێ لە شەوی قەدر لە پێشتانەوەیە، پاشان شەوی بیست و حەوت هەستاین تا بەیانی شەونوێژمان کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە (إِلَّا وَرَاءَكُمْ)، واتە: تەنها لە دواوەوەتان لای من

---

(١) صحيح.

لە بەشی دژیەكەكانە، مەبەستی: (أَمَامَكُمْ)، واتە: پێشەوەتان، چونكە ئەوەی تێپەڕیوە ئەوە دواوەی بەندەیە، ئەوەیشی بەرەولای دێت ئەوە پێشەوەیەتی، وە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە: (مَا أَحْسِبُ مَا تَطْلُبُونَ)، واتە: شەوی قەدر، ئەوەیە كە بەرەوپیری دەچن، نەك ئەوەی تێپەڕیوە لە مانگەكە، ئەمەیش وەكوو فەرمایشتی خوایە ﷻ كە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾﴾، مەبەستی: لە پێشەوەیان.

## بَابُ ذِكْرِ قِيَامِ اللَّيْلِ كُلِّهِ لِلْمُصَلِّي مَعَ الْإِمَامِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ حَتَّى يَفْرُغَ

**٢٢٠٦-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: صُمْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقُمْ بِنَا حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ مِنَ الشَّهْرِ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا فِي السَّادِسَةِ، وَقَامَ بِنَا فِي الْخَامِسَةِ حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ نَفَّلْتَنَا بَقِيَّةَ لَيْلَتِنَا هَذِهِ؟ قَالَ: «إِنَّهُ مَنْ قَامَ مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ»، ثُمَّ لَمْ يُصَلِّ بِنَا حَتَّى بَقِيَ ثَلَاثٌ مِنَ الشَّهْرِ، فَقَامَ بِنَا فِي الثَّالِثَةِ، وَجَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ فَقَامَ بِنَا، حَتَّى تَخَوَّفْنَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ، قُلْتُ: وَمَا الْفَلَاحُ؟ قَالَ: «السَّحُورُ»[1].

### باسی شەونوێژكردن لەگەڵ ئیمام لە مانگی ڕەمەزاندا تا لێ دەبێتەوە

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕۆژومان گرت لە ڕەمەزاندا، شەونوێژی بۆ نەكردین تا حەوت شەو مایەوە لە مانگەكە (واتە: شەوی بیست و سێ) شەونوێژی بۆ كردین تا سێیەكی شەو ڕۆیشت، پاشان لە شەشەمین شەودا (واتە: شەوی بیست و چوار) شەونوێژی پێ نەكردین، بەڵام لە شەوی پێنجەم (واتە: شەوی بیست و پێنج) شەونوێژی پێ كردین تا نیوەی شەو ڕۆیشت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆزگە ئەوەی ماوەتەوە لەم شەوە نوێژی زیادەمان تیایدا بكردایە؟، فەرمووی: بەڕاستی هەر كەس لەگەڵ ئیمامدا شەونوێژ بكات تا نوێژ تەواو دەكات، ئەوە شەونوێژی ئەو شەوەی بۆ دەنووسرێ، پاشان شەونوێژی بۆ نەكردین تا سێ شەو لە مانگەكە مابوو (واتە: شەوی بیست و حەوت) شەونوێژی بۆ كردین لە سێیەمدا، كچەكانی و خێزانەكانی كۆ كردەوە، ئەوەندە شەونوێژی پێ كردین تا ترساین لەوەی فەلاحمان لەدەست بچێت، وتم: فەلاح چییە؟ وتی: پارشێوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا تَرَكَ قِيَامَ لَيَالِي رَمَضَانَ كُلِّهِ خَشْيَةَ أَنْ يُفْتَرَضَ قِيَامُ اللَّيْلِ عَلَى أُمَّتِهِ فَيَعْجَزُوا عَنْهُ

**٢٢٠٧**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلَاتِهِ، فَأَصْبَحَ نَاسٌ يَتَحَدَّثُونَ بِذَلِكَ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الثَّالِثَةُ كَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ فَصَلَّى، فَصَلُّوا بِصَلَاتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَفِقَ رِجَالٌ مِنْهُمْ يُنَادُونَ: الصَّلَاةَ، فَلَا يَخْرُجُ، فَكَمُنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى خَرَجَ لِصَلَاةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا قَضَى الْفَجْرَ قَامَ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ، فَتَشَهَّدَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمْ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْتَرَضَ عَلَيْكُمْ صَلَاةُ اللَّيْلِ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُرَغِّبُهُمْ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَ بِعَزِيمَةِ أَمْرٍ، فَيَقُولُ: «مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَكَانَ الْأَمْرُ كَذَلِكَ فِي خِلَافَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ، حَتَّى جَمَعَهُمْ عُمَرُ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَصَلَّى بِهِمْ، فَكَانَ ذَلِكَ أَوَّلَ مَا اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَى قِيَامِ رَمَضَانَ[(١)].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە وازی لە شەونوێژی بەکۆمەڵ هێنا، لەترسی ئەوەی شەونوێژ فەرز نەبێت لەسەر ئوممەتەکەی، دواتر نەتوانن ئەنجامی بدەن

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نیوەی شەودا دەرچوو لەنێو مزگەوت نوێژی کرد، پیاوانێکیش لە پشتیەوە نوێژیان کرد، کاتێ ڕۆژ بۆیەوە خەڵکی بۆ یەکدی باسیان دەکرد، کاتێ شەوی سێیەم هات خەڵکی مزگەوت زۆر بوون، ئەویش هاتە دەرەوە بۆ نێویان نوێژی کرد، ئەوانیش وەکوو ئەو لە پشتیەوە نوێژیان کرد، بەڵام لە شەوی چوارەمدا خەڵکەکە زۆر زیاتر بوون لەنێو مزگەوتەکە جێیان نەدەبۆیەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چیتر نەهاتە دەرەوە بۆ نێویان، پیاوانێکیش لە ئەوان بانگیان دەکرد دەیانوت: کاتی نوێژە، بەڵام نەهاتە دەرەوە بۆ لایان، تا بۆ نوێژی بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە، کاتێ نوێژی بەیانی تەواو کرد هەستا ڕووی

---

(١) صحيح.

کردە خەڵکەکە و سوپاس و ستاییشی خوای کرد و پاشان فەرمووی: دوای ئەوە، بێگومان بێئاگا نەبووم لە دۆخی ئەمشەوتان، بەڵام لەوە ترسام شەونوێژتان لەسەر فەڕز بکرێت و نەتوانن پێی هەستن، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەدان لەسەر شەونوێژی ڕەمەزان بەڵام زۆر پێداگری و عەزمی نەدەکرد لەسەریان، دەیفەموو: هەر کەس ڕەمەزان هەستێت بۆ شەونوێژ، بڕوای پێی هەبێ و چاوەڕوانی پاداشت بێت لەلای خوا، خوا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد خەڵك لەسەر ئەوە بوون، پاشان لە خیلافەتی ئەبو بەکریش بەوشێوەیە بوو، وە ماوەیەکیش لە خیلافەتی عومەر، تا عومەر کۆی کردنەوە بە پێشنوێژی ئوبەی کوڕی کەعب، لە ڕەمەزاندا نوێژی بۆ کردن، جا ئەوە یەکەم کۆبوونەوە بوو لەپشت یەك قورئانخوێنەوە لە ڕەمەزاندا.

## بَابُ إِمَامَةِ الْقَارِئِ الْأُمِّيِّينَ فِي قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَلَاةَ الْجَمَاعَةِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ سُنَّةُ النَّبِيِّ ﷺ لَا بِدْعَةٌ كَمَا زَعَمَتِ الرَّوَافِضُ

**٢٢٠٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَإِذَا النَّاسُ فِي رَمَضَانَ يُصَلُّونَ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: «مَا هَؤُلَاءِ؟» فَقِيلَ: هَؤُلَاءِ نَاسٌ لَيْسَ مَعَهُمْ قُرْآنٌ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يُصَلِّي بِهِمْ، وَهُمْ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَصَابُوا، أَوْ نِعْمَ مَا صَنَعُوا»[١].

## باسی پێشنوێژیکردنی قورئانخوێن بۆ نەخوێندەوارەکان لە شەونوێژی مانگی ڕەمەزاندا، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی شەونوێژکردن بەکۆمەڵ لە مانگی ڕەمەزاندا سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ نەك بیدعە بێت، وەکوو چۆن ڕافیزەکان گومان دەبەن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا دەرچوو بۆ مزگەوت خەڵکانێك لە سووچێکی مزگەوتەکە نوێژیان دەکرد، فەرمووی: ئەوانە چی دەکەن؟ وترا: ئەوانە خەڵکانێکن قورئانیان لەبەر نییە، ئوبەی کوڕی کەعب نوێژیان بۆ دەکان، ئەوانیش لە پشتیەوە وەکوو ئەو نوێژ دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێکایان، یان چاکترین کاریان کرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَلَاةِ النِّسَاءِ جَمَاعَةً مَعَ الْإِمَامِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قِيَامَ رَمَضَانَ فِي جَمَاعَةٍ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ الْمَرْءِ مُنْفَرِدًا فِي رَمَضَانَ، وَإِنْ كَانَ الْمَأْمُومُونَ قُرَّاءً يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، لَا كَمَنِ اخْتَارَ صَلَاةَ الْمُنْفَرِدِ عَلَى صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ

**٢٢٠٩-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: وَقَدْ أُعْلِمَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ يَؤُمُّ قَوْمًا لَيْسَ مَعَهُمْ قُرْآنٌ، فَصَوَّبَ فِعْلَهُمْ، فَقَالَ: أَصَابُوا، أَوْ نِعْمَ مَا صَنَعُوا[1].

**باسی سوننەتە ئافرەتان شەونوێژی ڕەمەزان بەکۆمەڵ ئەنجام بدەن لەگەڵ ئیمامدا، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی شەونوێژ بەکۆمەڵ لە ڕەمەزاندا چاکترە لەوەی بەندە بەتەنها بۆ خۆی نوێژ بکات، ئەگەرچی نوێژخوێنەکان قورئانخوێن بن و قورئان بخوێنن، نەك وەکوو ئەو کەسەی شەونوێژکردنی بەتەنهای هەڵبژاردووە بەسەر شەونوێژی بەکۆمەڵدا لە مانگی ڕەمەزاندا.**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ هاتووە: هەواڵ درا بە پێغەمبەر ﷺ کە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ پێشنوێژی بۆ خەڵکانێك دەکات قورئانیان لەبەر نییە، کردەوەکەیانی بە پەسەند دانا، فەرمووی: پێکایان، یان چاکترین کاریان کرد.

**٢٢١٠-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ»، وَجَاءَ فِي الْخَبَرِ: فَقَامَ بِنَا فِي الثَّالِثَةِ، فَجَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ، فَقَامَ حَتَّى تَخَوَّفْنَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ، وَبَعْضُ أَصْحَابِهِ ﷺ مِمَّنْ قَدْ صَلَّى مَعَهُ قَارِئٌ لِلْقُرْآنِ، لَيْسَ كُلُّهُمْ أُمِّيِّينَ[2].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەگەڵ ئیمام نوێژی کرد تا تەواو دەبێت ئەوە شەونوێژی شەوێکی بۆ دەنووسرێ، وە لە فەرموودەکەدا هاتووە: پاشان لە سێیەم شەودا شەونوێژی بۆ کردین (واتە: شەوی بیست و حەوت) کچەکانی و خێزانەکانی کۆ کردەوە، ئەوەندە شەونوێژی کرد تا ترساین لەوەی پارشێومان لەدەست بچێت، وە هەندێ لە هاوەڵەکانی ﷺ کە نوێژیان لەگەڵی کردووە قورئانخوێن بوون، هەموویان نەخوێندەوار نەبوون.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**٢٢١١**- وَفِي قَوْلِهِ ﷺ: «مَنْ قَامَ مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَتِهِ، دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْقَارِئَ وَالْأُمِّيَّ إِذَا قَامَا مَعَ الْإِمَامِ إِلَى الْفَرَاغِ مِنْ صَلَاتِهِ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَتِهِ، وَكَتْبُ قِيَامِ لَيْلَةٍ، أَفْضَلُ مِنْ كَتْبِ قِيَامِ بَعْضِ اللَّيْلِ»[1].

واتە: وە لە فەرموودەکەیدا ﷺ هاتووە: هەر کەس لەگەڵ ئیمامدا شەونوێژ بکات، تا نوێژ تەواو دەکات ئەوە (پاداشتی) شەونوێژی شەوەکەی بۆ دەنووسرێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئانخوێن و نەخوێندەوار ئەگەر لەگەڵ پێشنوێژ شەونوێژیان کرد تا نوێژەکەی تەواو دەکات ئەوە (پاداشتی) شەونوێژی ئەو شەوەی بۆ دەنووسرێ، وە نووسینی پاداشتی شەونوێژی شەوێك چاکترە لە نووسینی پاداشتی بەشێك لە شەو.

## بَابٌ فِي فَضْلِ قِيَامِ رَمَضَانَ وَاسْتِحْقَاقِ قَائِمِهِ اسْمَ الصِّدِّيقِينَ، وَالشُّهَدَاءِ إِذَا جَمَعَ مَعَ قِيَامِهِ رَمَضَانَ صِيَامَ نَهَارِهِ، وَكَانَ مُقِيمًا لِلصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، مُؤَدِّيًا لِلزَّكَاةِ، شَاهِدًا لِلَّهِ بِالْوَحْدَانِيَّةِ، مُقِرًّا لِلنَّبِيِّ ﷺ بِالرِّسَالَةِ

**٢٢١٢**- عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ قُضَاعَةَ، فَقَالَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ شَهِدْتُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ، وَصَلَّيْتُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَصُمْتُ الشَّهْرَ، وَقُمْتُ رَمَضَانَ، وَآتَيْتُ الزَّكَاةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ مَاتَ عَلَى هَذَا كَانَ مِنَ الصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ»[2].

## باسی فەزڵ و گەورەیی شەونوێژ لە مانگی ڕەمەزاندا، خاوەنەکەی شیاوە بەوەی ناوی ڕاستگۆیان و شەهیدانی لێ بنرێ، ئەگەر لەگەڵ شەونوێژی ڕەمەزاندا لە ڕۆژەکەیشدا بەڕۆژوو بوو، هەروەها هەر پێنج نوێژە فەرزەکان بکات و زەکاتی ماڵەکەی بدات و شایەتی بدات بە تاك و تەنهایی خوا، وە دان بەوەدا بنێت کە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خواوە نێردراوە

واتە: عەمری کوڕی مورەی جوهەنی ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە هۆزی قوضاعە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هەواڵم بدەرێ دەربارەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەوەی ئەگەر شایەتیم دا بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتیم دا بەوەی تۆ پێغەمبەری خوای، هەروەها هەر پێنج نوێژە فەڕزەکەم کرد و ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم و لە ڕەمەزاندا شەونوێژم کرد و زەکاتم دەرکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس لەسەر ئەوە بمرێ ئەوە لە ڕیزی ڕاستگۆیان و شەهیدانە.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ فِي رَمَضَانَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ عَلَى عَدَدِ الرَّكَعَاتِ فِي الصَّلَاةِ بِاللَّيْلِ مَا كَانَ يُصَلِّي مِنْ غَيْرِ رَمَضَانَ

**٢٢١٣-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ يَقُولُ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها، فَقُلْتُ: أَيْ أُمَّهْ، أَخْبِرِينِي عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: كَانَتْ صَلَاتُهُ بِاللَّيْلِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ وَفِيمَا سِوَى ذَلِكَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً. وَقَالَ أَبُو هَاشِمٍ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَسَأَلْتُهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَقَالَتْ: كَانَتْ صَلَاتُهُ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا رَكْعَتَا الْفَجْرِ[١].

## باسی شەونوێژی پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی لە ڕەمەزاندا ژمارەی ڕکاتەکانی شەونوێژی زیاد نەدەکرد لەوەی لە غەیری ڕەمەزاندا دەیکرد

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە رضي الله عنها کرد وتم: ئەی دایکە، هەواڵم بدەرێ دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: شەونوێژی لە مانگی ڕەمەزاندا و جگە لە مانگی ڕەمەزان سیازدە ڕکات بوو. (ئەم فەرموودەیە لە ڕێگەی عەبدولجەبارەوە هاتووە).

واتە: وە ئەبو هاشم دەڵێ: (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەموودەیە) ئەبو سەلەمە دەڵێ: هاتم بۆ لای عائیشە پرسیارم لێ کرد دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا، وتی: سیازدە ڕکات شەونوێژی دەکرد، بە دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانیشەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ إِحْيَاءِ لَيَالِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ، وَتَرْكِ مُجَامَعَةِ النِّسَاءِ فِيهِنَّ، وَالِاشْتِغَالِ بِالْعِبَادَةِ، وَإِيقَاظِ الْمَرْءِ أَهْلَهُ فِيهِنَّ

**٢٢١٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ شَدَّ الْمِئْزَرَ، وَأَحْيَا اللَّيْلَ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ[١].

## باسی چاکتر وایە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان زیندوو بکرێتەوە بە پەرستش، هەروەها وازبهێنرێ لە جووتبوون لەگەڵ هاوسەرەکان لەو ڕۆژانەدا، سەرقاڵبوون بە پەرستشکردن و بەئاگاهێنانەوەی خێزان تیایاندا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچووایەتە نێو دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانەوە بەنەخوێنی توند دەکرد (واتە: دووردەکەوتەوە لە خێزانەکانی)و، شەوەکەی زیندوو دەکردەوە بە پەرستش و خانەوادەکەی هەڵدەستاند.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاجْتِهَادِ فِي الْعَمَلِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٢١٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مَا لَا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهِ[٢].

## باسی چاکتر وایە بۆ بەندە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا پەرستش زۆر ئەنجام بدات

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتاییدا زیاتر پەرستشی دەکرد لە غەیری ئەو دە شەوە. (بەئومێدی دەستخستنی پاداشتی شەوی قەدر تیایاندا).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَرْكِ الْمَبِيتِ عَلَى الْفِرَاشِ فِي رَمَضَانَ إِذِ الْبَائِتُ عَلَى الْفِرَاشِ أَثْقَلُ نَوْمًا، وَأَقَلُّ نَشَاطًا لِلْقِيَامِ مِنَ النَّائِمِ عَلَى غَيْرِ الْفُرُشِ الْوَطِيئَةِ الْمُمَهَّدَةِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٢١٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ رَمَضَانَ شَدَّ مِئْزَرَهُ، ثُمَّ لَمْ يَأْتِ فِرَاشَهُ حَتَّى يَنْسَلِخَ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

**باسی چاکتر وایە بەندە لە مانگی ڕەمەزاندا واز لە ڕاخەری خەوەکەی بهێنێ، چونکە ئەو کەسەی لەسەر ڕاخەر دەخەوێ خەوەکەی قورسترە و کەمتر چالاکە بۆ شەونوێژکردن، لەوکەسەی کە لەسەر راخەرێك دەخەوێت نەرم ناسك نییە**

واتە: عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچووایەتە نێو ڕەمەزانەوە بەنەخوێنی توند دەکرد (واتە: دوور دەکەوتەوە لە خێزانەکانی)، پاشان نەدەهات بۆ لای ڕاخەری خەوەکەی تا ڕەمەزان دەڕۆیشت.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الِاعْتِكَافِ

### بَابُ وَقْتِ الِاعْتِكَافِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٢١٧**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الصُّبْحَ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَكَانَ الَّذِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ فَضُرِبَ لَهُ خِبَاءٌ، وَأَمَرَتْ عَائِشَةُ، فَضُرِبَ لَهَا خِبَاءٌ، وَأَمَرَتْ حَفْصَةُ، فَضُرِبَ لَهَا خِبَاءٌ، فَلَمَّا رَأَتْ زَيْنَبُ خِبَاءَهَا أَمَرَتْ بِخِبَاءٍ، فَضُرِبَ لَهَا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَعْتَكِفْ فِي رَمَضَانَ، فَاعْتَكَفَ فِي شَوَّالٍ[1].

## کۆباسی ئیعتیکافکردن یان خەڵوەکێشان

### باسی کاتی ئیعتیکافکردن لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بیویستایە ئیعتیکاف بکات نوێژی بەیانی دەکرد، پاشان دەچوو بۆ ئەو شوێنەی دەیویست ئیعتیکافی تێدا بکات، جا کاتێ ویستی لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکاف بکات، دەوارێکی بۆ هەڵدرا، عائیشەیش فەرمانی کرد دەوارێکی بۆ هەڵدرا، وە حەفصەیش فەرمانی کرد دەوارێکی بۆ هەڵدرا، کاتێ زەینەب دەوارەکەی ئەوی بینی فەرمانی کرد دەوارێکی بۆ هەڵدرا،

---

(١) صحيح.

کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینی ئیتر ئیعتیکافی نەکرد لە ڕەمەزان، لە دە شەوی شەوالدا ئیعتیکافی کرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ ضَرْبِ الْقِبَابِ فِي الْمَسْجِدِ لِلِاعْتِكَافِ فِيهِنَّ

**٢٢١٨-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عُمَارَةَ بْنِ غَزِيَّةَ حَدِيثُ أَبِي سَعِيدٍ: اعْتَكَفَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ، خَرَّجْتُهُ فِي غَيْرِ هَذَا الْبَابِ[١].

### باسی ڕێگەدان بە دانانی دەوار لەنێو مزگەوتدا بۆ ئیعتیکاف تێدا کردن

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی عومارەی کوڕی غەزییە فەرموودەکەی ئەبو سەعید هاتووە: (لە دە شەوی یەکەمی مانگی ڕەمەزان) ئیعتیکافی کرد لەنێو دەوارێکی بچووکدا، لە بەشێکی دیکەدا ئەم فەرموودەم هێناوە جگە لەم بەشە.

## بَابٌ فِي اعْتِكَافِ شَهْرِ رَمَضَانَ كُلِّهِ

**٢٢١٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الْأُوَلَ مِنْ رَمَضَانَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الْوَسَطَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ عَلَى سُدَّتِهَا قِطْعَةُ حَصِيرٍ[٢].

### باسی ئیعتیکافکردن لە هەموو مانگی ڕەمەزاندا

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە شەوی یەکەمی مانگی ڕەمەزان ئیعتیکافی کرد، پاشان لە دە شەوی نێوەڕاست ئیعتیکافی کرد لەنێو دەوارێکی بچووکدا پارچە حەسیرێکی دابوو بە بەردەم دەرگاکەیدا.

## بَابُ الِاقْتِصَارِ فِي الِاعْتِكَافِ عَلَى الْعَشْرِ الْأَوْسَطِ، وَالْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، إِذِ الِاعْتِكَافُ كُلُّهُ فَضِيلَةٌ لَا فَرِيضَةٌ، وَالْفَضِيلَةُ لَا تَضِيقُ عَلَى الْمَرْءِ أَنْ يَزِيدَ فِيهَا، أَوْ يَنْقُصَ مِنْهَا

**٢٢٢٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: اعْتَكَفْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعَشْرَ الْوَسَطَ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ صَبِيحَةَ عِشْرِينَ وَرَجَعْنَا فَنَامَ فَأُرِيَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أُنْسِيَهَا، فَلَمَّا كَانَ الْعَشِيُّ جَلَسَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

عَلَى الْمِنْبَرِ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ قَالَ: وَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلْيَرْجِعْ إِلَى مُعْتَكَفِهِ[١].

## باسی کورتکردنەوەی ئیعتیکافکردن لەسەر دە شەوی نیوەڕاست و دە شەوی کۆتایی لە مانگی ڕەمەزاندا، بێگومان ئیعتیکافکردن هەمووی فەزڵ و چاکەیە نەك فەڕز، فەزڵ و چاکەش تەنگ ناکرێت لەسەر بەندە لەوەی بیەوێ زیاتری تێدا بکات یان کەمتر

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی نێوەڕاستی مانگی ڕەمەزان ئیعتیکافمان کرد، کاتێ بەیانی کردەوە سەرلەبەیانی بیستی ڕەمەزان، ئێمە گەڕاینەوە، دواتر پێغەمبەر ﷺ خەوت، لە خەویدا شەوی قەدری پێ نیشان درا، پاشان لەبیری برایەوە، کاتێ شەو داهات لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و وتارێکی بۆ خەڵکەکەدا، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- فەرمووی: هەر کەس لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیکافی کردووە با بگەڕێتەوە بۆ شوێنی ئیعتیکافەکەی.

## بَابُ إِبَاحَةِ الِاقْتِصَارِ مِنَ الِاعْتِكَافِ عَلَى الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ دُونَ الْعِشْرِينَ الْأَوَّلِينَ

**٢٢٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَانَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ فِيهِ عِشْرِينَ يَوْمَاً[٢].

## باسی کورتکردنەوەی ئیعتیکاف لەسەر دە شەوی کۆتایی لە مانگی ڕەمەزاندا جگە لە بیست شەوەکەی یەکەم

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو ڕەمەزانێکدا لە دە شەوی کۆتایی ئیعتیکافی دەکرد، بەڵام ئەو ساڵەی تیایدا کۆچی دوایی کرد بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِاقْتِصَارِ عَلَى اعْتِكَافِ السَّبْعِ الْوَسَطِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ دُونَ مَا قَبْلَهُ، وَمَا بَعْدَهُ مِنْ رَمَضَانَ

**٢٢٢٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: جَاوَزَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ السَّبْعَ الْأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُتَحَرِّيًا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە کورتکردنەوەی ئیعتیکافکردنی حەوت ڕۆژەکەی نێوەڕاست لە مانگی ڕەمەزان جگە لە پێشەوە و جگە لەوەش بەدوایدا دێت لە ڕەمەزان

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ حەوت شەوی نێوەڕاستی مانگی ڕەمەزانیان تێپەڕاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس لە ئێوە دەگەڕێ با لە حەوت شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان بۆی بگەڕێ. (ئەمە دوو مانا هەڵدەگرێ پێدەچێت مەبەستی پێی شەوی بیست و حەوت بێت، وە پێدەچێت مەبەستی پێی شەوی بیست و سێ بێت).

## بَابُ الْمُدَاوَمَةِ عَلَى اعْتِكَافِ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ

**٢٢٢٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ[٢].

## باسی بەردەوامبوون لەسەر ئیعتیکافکردنی دە شەوی کۆتایی لە مانگی ڕەمەزاندا

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکافی کرد تا خوا گیانی کێشا.

## بَابُ الِاعْتِكَافِ فِي شَوَّالٍ إِذَا فَاتَ الِاعْتِكَافُ فِي رَمَضَانَ، لِفَضْلِ دَوَامِ الْعَمَلِ

**٢٢٢٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ الِاعْتِكَافَ، فَاسْتَأْذَنَتْهُ عَائِشَةُ لِتَعْتَكِفَ مَعَهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ زَيْنَبُ مَعَهُ، فَأَذِنَتْ لَهَا، فَضَرَبَتْ خِبَاءَهَا، فَسَأَلَتْهَا حَفْصَةُ تَسْتَأْذِنُ لَهَا لِتَعْتَكِفَ مَعَهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

زَيْنَبُ ضَرَبَتْ مَعَهُنَّ، وَكَانَتِ امْرَأَةً غَيُورًا، فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَخْبِيَتَهُنَّ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟ الْبِرَّ يُرِدْنَ بِهَذَا؟» فَتَرَكَ الِاعْتِكَافَ حَتَّى أَفْطَرَ مِنْ رَمَضَانَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ فِي عَشْرٍ مِنْ شَوَّالٍ[1].

## باسی ئیعتیکافکردن لە مانگی شەوالدا، ئەگەر لە ڕەمەزاندا بۆی نەڕەخسا، بەهۆی فەزڵ و چاکەی بەردەوامبوون لەسەر کردەوەی چاك

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ویستی ئیعتیکاف بکات عائیشەیش داوای مۆڵەتی کرد لەگەڵی ئیعتیکاف بکات، کاتێ زەینەب عائیشەی بینی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، دواتر مۆڵەتی پێ دا ئەویش ڕەشماڵەکەی هەڵدا، ئینجا حەفصە داوای لێ کرد مۆڵەتی بدات بۆ ئەوەی ئەویش ئیعتیکاف بکات لەگەڵیدا، کاتێ زەینەب ئەوەی بینی، ئەویش لەگەڵیاندا ڕەشماڵی هەڵدا، جا ئەو ئافرەتێك بوو غیرەی زۆر بوو، پێغەمبەر ﷺ کە ڕەشماڵەکانیانی بینی، فەرمووی: ئەوە چییە؟ دەتانەوێ بەمشێوەیە چاکە بکەن، جا ئیعتیکافی شکاندو لە ڕەمەزاندا، دواتر لە دە شەوی مانگی شەوالدا ئیعتیکافی کرد (لە جیاتی دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان).

## بَابُ الِاعْتِكَافِ فِي السَّنَةِ الْمُقْبِلَةِ إِذَا فَاتَ ذَلِكَ لِسَفَرٍ، أَوْ عِلَّةٍ تُصِيبُ الْمَرْءَ

**٢٢٢٥**- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَامًا، فَاعْتَكَفَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ عِشْرِينَ لَيْلَةً[2].

## باسی ئیعتیکافکردن لە ساڵی داهاتوو، ئەگەر لە ڕەمەزاندا نەڕەخسا بەهۆی سەفەر یان هەر هۆکارێکی دیکە کە تووشی بەندە ببێ

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێك ئیعتیکافی نەکرد، لە ساڵەکەی دیکەدا بیست شەو ئیعتیکافی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٢٢٦**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَسَافَرَ عَامًا فَلَمْ يَعْتَكِفْ، فَاعْتَكَفَ فِي الْعَامِ الْمُقْبِلِ عِشْرِينَ لَيْلَةً[(١)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێك سەفەری کرد و نەیتوانی ئیعتیکاف بکات، دواتر لە ساڵی داهاتوو بیست شەو ئیعتیکافی کرد.

**٢٢٢٧**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ[(٢)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێك نەیتوانی ئیعتیکاف بکات، بەڵام لە ساڵی داهاتوو بیست شەو ئیعتیکافی کرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِوَفَاءِ نَذْرِ الِاعْتِكَافِ يَنْذُرُهُ الْمَرْءُ فِي الشِّرْكِ، ثُمَّ يُسْلِمُ النَّاذِرُ قَبْلَ قَضَاءِ النَّذْرِ، وَإِبَاحَةِ اعْتِكَافِ لَيْلَةٍ وَاحِدَةٍ فِي عَشْرِ رَمَضَانَ

**٢٢٢٨**- عَنْ نَافِعٍ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عُمْرَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْجِعْرَانَةِ، فَقَالَ: لَمْ يَعْتَمِرْ مِنْهَا، قَالَ: وَكَانَ عَلَى عُمَرَ نَذْرُ اعْتِكَافِ لَيْلَةٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَفِيَ بِهِ، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[(٣)].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ الْجِهَادِ وَقْتَ رُجُوعِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى مَكَّةَ بَعْدَ فَتْحِ حُنَيْنٍ، وَإِنَّمَا كَانَ اعْتِكَافُ عُمَرَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ بَعْدَ رُجُوعِ النَّبِيِّ ﷺ، وَإِعْطَائِهَا إِيَّاهُ مِنْ سَبْيِ حُنَيْنٍ.

## باسی فەرمانکردن بە بەجێهێنانی نەزری ئیعتیکاف، ئەگەر بەندە لە سەردەمی هاوبەشداناندا نەزری کردبێ، پاشان ئەو کەسەی نەزری کردووە پێش بەجێهێنانی نەزرەکەی مسوڵمان بووبێ، ڕێگەدان بە ئیعتیکاف کردنی یەك شەو لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: نافیع دەڵێ: لە لای ئیبنو عومەر ﷺ باسی عومرەی پێغەمبەری خوا ﷺ کرا لە جیعڕانە (لادێیەکی بچووك بوو نزیك لە مزگەوتی حەڕام دەکەوتە نێو شیوی جیعڕانە، بیست کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەککە دووره)، وتی: عومرەی تێدا نەکرد، وتی: عومەر لە سەردەمی نەفامی نەزری شەوێکی لەسەر پێویست بوو ئیعتیکاف بکات، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمانی پێکرد نەزرەکەی بەجێبێنێ، ئەو شەوە چووە نێو مزگەوتەوە، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی جیهاد کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەرم ﷺ بۆ مەککە ڕوون کردەوە لەدوای ئازادکردنی حونەین، بێگومان ئیعتیکافی عومەر لەو شەوەدا دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بوو، هەروەها دوای ئەوە بوو کە لە سەبایاکانی حونەینی پێ دا.

**٢٢٢٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ، كَانَ عَلَيْهِ نَذْرُ اعْتِكَافٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَيْلَةً، فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَكِفَ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ وَهَبَ لَهُ جَارِيَةً مِنْ سَبْيِ حُنَيْنٍ، فَبَيْنَمَا هُوَ مُعْتَكِفٌ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ دَخَلَ النَّاسُ يُكَبِّرُونَ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَرْسَلَ سَبْيَ حُنَيْنٍ قَالَ: فَأَرْسِلُوا تِلْكَ الْجَارِيَةَ، وَقَالَ بَعْضُ الرُّوَاةِ فِي خَبَرِ نَافِعٍ: عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ قَالَ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَعْتَكِفَ يَوْمًا، فَإِنْ ثَبَتَتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ فَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ الْعَرَبَ قَدْ تَقُولُ يَوْمًا بِلَيْلَتِهِ، وَتَقُولُ: لَيْلَةٌ تُرِيدُ بِيَوْمِهَا، وَقَدْ ثَبَتَتِ الْحُجَّةُ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي هَذَا[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەر لە سەردەمی نەفامی شەوێك نەزری ئیعتیکافی لەسەر بوو، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمانی پێ کرد ئیعتیکاف بکات، جا پێغەمبەر ﷺ کەنیزەکێکی لە سەبایاکانی حونەین پێبەخشیبوو، لە کاتێکدا ئەو لەنێو مزگەوتدا ئیعتیکافی دەکرد، لەپڕ خەڵکەکە هاتنە ژوورەوە تەکبیریان دەکرد، وتی: ئەو تەکبیرە چییە؟ وتیان پێغەمبەری خوا ﷺ سەبایاکانی حونەینی ئازاد کرد، وتی: ئەو کەنیزەکەیشیان برد بۆ ئازادکردن. هەندێ لە گێڕەرەوەکان وتی: لە فەرموودەکەی نافیع، لە ئیبنو عومەرەوە، عومەر وتی: من نەزرم کردووە ڕۆژێك ئیعتیکاف بکەم، ئەگەر ئەم دەستەواژەیە جێگیر بێت، ئەوە لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاندووە هەندێ جار

---

(١) صحيح.

عەرەب دەڵێ: ڕۆژێك مەبەستی پێی لەگەڵ شەوەکەیشی، وە دەڵێ: شەوێك مەبەستی پێی لەگەڵ ڕۆژەکەیشی، بێگومان لە کتێبی خوادا ئەم ڕاستییە چەسپاوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ دُخُولِ الْمُعْتَكِفِ الْبَيْتَ لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ الْغَائِطِ، وَالْبَوْلِ

**٢٢٣٠-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَعَمْرَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، كَانَتْ إِذَا اعْتَكَفَتْ فِي الْمَسْجِدِ، فَدَخَلَتْ بَيْتَهَا لِحَاجَةٍ، لَمْ تَسْأَلْ عَنِ الْمَرِيضِ إِلَّا وَهِيَ مَارَّةٌ قَالَتْ عَائِشَةُ: وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ، وَكَانَ يُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ[١].

## باسی ڕێگەدان بەوەی ئیعتیکافکار بچێتە نێو ماڵەکەیەوە لەبەر پێویستی مرۆڤ وەك سەرئاو و میزکردن

واتە: عورووەی کوڕی زوبەیرو عەمرە دەگێڕنەوە، عائیشە ﵂ کاتێ ئیعتیکافی بکردایە لە مزگەوت، دەچووە ماڵەکەیەوە لەبەر پێویستییەك (لە پێویستییەکان وەکوو سەرئاوکردن یان میزکردن) پرسیاری لە نەخۆش نەدەکرد مەگەر تێپەڕیبایە، عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەچووە ماڵەکەیەوە تەنها بۆ پێویستی مرۆڤ نەبووایە (وەك سەرئاو یان میزکردن) لەنێو مزگەوتەوە سەری دەهێنایە نێو ژوورەکەم منیش بۆم شانە دەکرد.

## بَابُ تَرْكِ دُخُولِ الْمُعْتَكِفِ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ، وَإِبَاحَةِ إِخْرَاجِ الْمُعْتَكِفِ رَأْسَهُ مِنَ الْمَسْجِدِ إِلَى الْمَرْأَةِ لِتَغْسِلَهُ وَتُرَجِّلَهُ

**٢٢٣١-** عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ، بِمِثْلِ حَدِيثِ يُونُسَ بْنِ عَبْدِ الْأَعْلَى سَوَاءً، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: إِلَيَّ رَأْسَهُ[٢].

## باسی ئەوە کە ئیعتیکافکار نەچێتە ماڵ مەگەر بۆ پێویستی مرۆڤ، ڕێگەدان بەوەی ئیعتیکافکار سەری لەنێو مزگەوتەوە دەربێنێ بۆ لای هاوسەرەکەی بۆ ئەوەی بیشوات یان شانەی بکات

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عورِوە و عەمرِە دەگێڕنەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی یونسی کوڕی عەبدولَا، ئەوە نەبێ ئەو وتی: سەری دەهێنا بۆ لام.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْجِيلِ الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ رَأْسَ الْمُعْتَكِفِ، وَمَسِّهَا إِيَّاهُ، وَهِيَ خَارِجَةٌ مِنَ الْمَسْجِدِ

**٢٢٣٢-** عَنْ هشام بن عروة عن عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ مُعْتَكِفًا فِي الْمَسْجِدِ فَتَجِيءُ عَائِشَةُ فَيُخْرِجُ رَأْسَهُ، فَتُرَجِّلُهُ وَهِيَ حَائِضٌ[1].

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتێك لە حەیزدا بێ قژی ئیعتیکافکار شانە بکات و دەستی لێ بدات، بە مەرجێ ئافرەتەکە لە دەرەوەی مزگەوت بێت

واتە: هیشامی کوڕی عورِوە دەگێڕێتەوە، لە عائیشەوە ﵂، پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت لە ئیعتیکافدا بوو، عائیشە دەهات بۆ لای، ئەویش سەری دەردەکرد (لە مزگەوت بۆ نێو ژوورەکەی عائیشە)، ئەویش شانەی دەکرد، لە کاتێکدا لە حەیزیشدا بوو.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي زِيَارَةِ الْمَرْأَةِ وَزَوْجَهَا فِي اعْتِكَافِهِ وَمُحَادَثَتِهَا إِيَّاهُ عِنْدَ زِيَارَتِهَا إِيَّاهُ

**٢٢٣٣-** عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُعْتَكِفًا فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلًا، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ، فَانْقَلَبْتُ، فَقَامَ لِيَقْلِبَنِي، وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ، فَمَرَّ رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ ﷺ أَسْرَعَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ»، فَقَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الْإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَرًّا، أَوْ قَالَ: شَيْئًا»[2].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ئافرەت سەردانی مێردەکەی بکات لە کاتی ئیعتیکافکردنیدا و گفتوگۆی لەگەڵ بکات لە کاتی سەردانی کردنەکەی

واتە: صەفیەی کچی حویەی ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیعتیکافدا بوو، شەو هاتم بۆ ئەوەی سەردانی بکەم قسەم لەگەڵی دەکرد، پاشان هەستام بگەڕێمەوە،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ڕۆیشتم ئەویش لەگەڵم هەستا ڕەوانەم بکات، ماڵەکەی لە خانووی ئوسامەی کوڕی زەیددا بوو، دوو پیاو لە ئەنصارەکان تێپەڕ بوون، کاتێ پێغەمبەریان ﷺ بینی سەریان دانەواند و بەپەلە ڕۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەرخۆ بن، ئەوە صەفیەی کچی حویەیە، وتیان: پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بەڕاستی شەیتان بەنێو (جەستەی) نەوەی ئادەم تێدەپەڕێ بەو شوێنەی خوێن تێپەڕ دەبێت، بێگومان من ترسام لەوەی شەڕ و خراپەیەك بخاتە نێو دڵەکانتانەوە، یان فەرمووی: شتێك (بخاتە نێو دڵەکانتانەوە).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا بَلَغَ مَعَ صَفِيَّةَ حِينَ أَرَادَ قَلْبَهَا إِلَى مَنْزِلِهَا بَابَ الْمَسْجِدِ لَا أَنَّهُ خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ فَرَدَّهَا إِلَى مَنْزِلِهَا

**٢٢٣٤-** عَنْ صَفِيَّةَ رضي الله عنها زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهَا جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، ثُمَّ قَامَتْ لِتَنْقَلِبَ، وَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ لِيَقْلِبَهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ الَّذِي عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ مَرَّ بِهَا رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ صەفیەی تا بەردەرگای مزگەوت ڕەوانە کرد، بەڵام لە مزگەوت دەرنەچوو تا ماڵەوە ڕەوانەی بکات

واتە: صەفیەی رضي الله عنها خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ئیعتیکافدا بوو لەنێو مزگەوت بەمەبەستی سەردانیکردنی، لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، ساتێك لەلای مایەوە گفتوگۆی لەگەڵی کرد، پاشان هەستا بگەڕێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ هەستا ڕەوانەی بکات، تا کاتێ گەیشتە لای دەرگای مزگەوت کە لەلای ماڵی ئوممو سەلەمەوە بوو، دوو پیاو لە ئەنصارەکان تێپەڕین بەلایدا.

---

(١) صحيح.




## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي السَّمَرِ لِلْمُعْتَكِفِ مَعَ نِسَائِهِ فِي الِاعْتِكَافِ، خَبَرُ صَفِيَّةَ مِنْ هَذَا الْبَابِ

**٢٢٣٥-** عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كُنْتُ أَسْمُرُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا خَبَرٌ لَيْسَ لَهُ مِنَ الْقَلْبِ مَوْقِعٌ، وَهُوَ خَبَرٌ مُنْكَرٌ، لَوْلَا مَا اسْتَدْلَلْتُ مِنْ خَبَرِ صَفِيَّةَ عَلَى إِبَاحَةِ السَّمَرِ لِلْمُعْتَكِفِ لَمْ يَجُزْ أَنْ يُجْعَلَ لِهَذَا الْخَبَرِ بَابٌ عَلَى أَصْلِنَا؛ فَإِنَّ هَذَا الْخَبَرَ لَيْسَ مِنَ الْأَخْبَارِ الَّتِي يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِهَا، إِلَّا أَنَّ فِي خَبَرِ صَفِيَّةَ غُنْيَةً فِي هَذَا، فَأَمَّا خَبَرُ صَفِيَّةَ ثَابِتٌ صَحِيحٌ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ مُحَادَثَةَ الزَّوْجَةِ زَوْجَهَا فِي اعْتِكَافِهِ لَيْلًا جَائِزٌ، وَهُوَ السَّمَرُ نَفْسُهُ.

## باسی مۆڵەتدان بە ئیعتیکافکار لە کاتی ئیعتیکاف لەگەڵ هاوسەرەکانی بمێنێتەوە، فەرموودەکەی صەفیە لەم بەشەدا بەسە بکرێت بە بەڵگە

واتە: ئەبو مەعمەڕ دەگێڕێتەوە، لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: من شەو دەمامەوە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لە ئیعتیکافدا بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لە دڵدا هیچ پلەیەکی نییە، ئەمە فەرموودەیەکی (مُنْكَرٌ) ڕەتکراوەیە، ئەگەر فەرموودەکەی صەفیەم بە بەڵگە نەهێنابایەوە لەسەر مانەوە لەگەڵ ئیعتیکافکاردا، ئەوە دروست نەدەبوو بەشێك دابنرێ بۆ ئەم فەرموودەیە، چونکە ئەم فەرموودەیە لەو فەرموودانە نییە کە دروستە بەڵگەی پێ بهێنرێتەوە، بەڵام فەرموودەکەی صەفیە بەسە بۆ ئەو بەشە، چونکە فەرموودەکەی صەفیە جێگیر و تەواوە، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی دروستە ژن گفتوگۆ لەگەڵ مێردەکەی بکات، چونکە ئەوە خودی مانەوەیە.

## بَابُ الِافْتِرَاشِ فِي الْمَسْجِدِ، وَوَضْعِ السَّرِيرِ فِيهِ لِلِاعْتِكَافِ

**٢٢٣٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا اعْتَكَفَ طُرِحَ لَهُ فِرَاشُهُ، أَوْ وُضِعَ لَهُ سَرِيرُهُ وَرَاءَ أُسْطُوَانَةِ التَّوْبَةِ[2].

---

(١) هذا حديث باطل منكر.

(٢) إسناده ضعيف.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أُسْطُوَانَةُ التَّوْبَةِ هِيَ الَّتِي شَدَّ أَبُو لُبَابَةَ بْنُ عَبْدِ الْمُنْذِرِ عَلَيْهَا وَهِيَ عَلَى غَيْرِ الْقِبْلَةِ.

## باسی ڕاخستنی ڕاخەرەكان لەنێو مزگەوت، وە دانانی جێگەی خەوەكان تیایدا بۆ ئیعتیكاف

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ كاتێ ئیعتیكافی بكردایە ڕاخەرەكەی بۆ دادەخرا، یان جێگاكەی بۆ دادەنرا لەپشت پایەی تەوبە.

ئەبو بەكر دەڵێ: (أُسْطُوَانَةُ التَّوْبَةِ)، بریتییە لەو پایەی كە ئەبو لوبابەی كوڕی مونزیر بەسترا پێیەوە، ئەو پایە لەلای قیبلە نەبوو.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي بِنَاءِ بُيُوتِ السَّعَفِ فِي الْمَسْجِدِ لِلِاعْتِكَافِ فِيهَا

**٢٢٣٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: بُنِيَ لِنَبِيِّ اللَّهِ ﷺ بَيْتٌ مِنْ سَعَفٍ، اعْتَكَفَ فِي رَمَضَانَ، حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةً أَخْرَجَ رَأْسَهُ فَسَمِعَهُمْ يَقْرَءُونَ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا صَلَّى يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلْيَعْلَمْ أَحَدُكُمْ مَا يُنَاجِيهِ، يَجْهَرُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ، يُرِيدُ إِنْكَارَ الْجَهْرِ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ»[1].

## باسی مۆڵەتدان بە دروستكردنی ژوور لەنێو مزگەوت بە لقوپۆی دارخورما بۆ ئیعتیكاف كردن تیایدا

واتە: عەبدوڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: ژوورێك لەنێو مزگەوت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست كرا لە لقوپۆی دارخورما بۆ ئیعتیكاف، لە مانگی ڕەمەزاندا ئیعتیكافی كرد، هەتا شەوێك سەری دەرهێنا لە ژوورەكە و گوێی لێ بوو قورئانیان دەخوێند، فەرمووی: بەڕاستی نوێژخوێن كاتێ نوێژ دەكات بەئەسپایی قسە لەگەڵ پەروەردگاری دەكات، با هەر یەكێك لە ئێوە بزانێت چۆن بەئەسپایی قسەی لەگەڵ دەكات، هەندێكتان دەنگ بەسەر هەندێكتاندا بەرز دەكەنەوە، مەبەستی نكووڵیكردن بوو لە دەنگ بەرزكردنەوەی هەندێكیان بەسەر هەندێكی دیكەیان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي وَضْعِ الْأَمْتِعَةِ الَّتِي يَحْتَاجُ إِلَيْهَا الْمُعْتَكِفُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ

**٢٢٣٨**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: اعْتَكَفْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْعَشْرِ الْأَوْسَطِ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمَّا كَانَ صَبِيحَةُ عِشْرِينَ ذَهَبْنَا نَنْقِلُ مَتَاعَنَا، فَقَالَ لَنَا: «مَنْ كَانَ مِنْكُمُ اعْتَكَفَ فَلْيَرْجِعْ إِلَى مُعْتَكَفِهِ، فَإِنِّي أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، فَنُسِّيتُهَا، وَأُرِيتُنِي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە ئیعتیکافکار کەلوپەلەکەی لە شوێنی ئیعتیکافەکەی دابنێت لەنێو مزگەوت

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە دە شەوی نێوەڕاستی مانگی ڕەمەزان ئیعتیکافمان کرد، سەرلەبەیانی بیستی ڕەمەزان ڕۆیشتین کەلوپەلەکانمان بگوازینەوە، پێمانی فەرموو: هەر کەس لە ئێوە ئیعتیکافی کردووە با بگەڕێتەوە بۆ شوێنی ئیعتیکافەکەی، چونکە بەڕاستی من ئەمشەو شەوی قەدرم پێ نیشان درا، دواتر لە بیرم برایەوە، وە لە خەومدا پێم نیشاندرا لە نێوان ئاو و قوڕدا سووژدەم دەبرد.

## بَابُ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى إِجَازَةِ الِاعْتِكَافِ بِلَا مُقَارَنَةٍ لِلصَّوْمِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِاعْتِكَافِ لَيْلَةٍ، وَلَا صَوْمَ فِي اللَّيْلِ

**٢٢٣٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوْفِ بِنَذْرِكَ»[٢].

## باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ڕێگەدان بە ئیعتیکافکردن لە شەودا بەبێ ڕۆژووگرتن لەگەڵی، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ئیعتیکافکردنی شەوێك، لە شەویشدا ڕۆژووگرتن نییە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وتی: من لە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کرد شەوێك ئیعتیکاف بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەزرەکەت بەجێ بهێنە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلنِّسَاءِ فِي الِاعْتِكَافِ فِي مَسْجِدِ الْجَمَاعَاتِ مَعَ أَزْوَاجِهِنَّ إِذَا اعْتَكَفُوا

٢٢٤٠- فِي خَبَرِ عَائِشَةَ ﷺ: فَاسْتَأْذَنَتْهُ عَائِشَةُ لِتَعْتَكِفَ مَعَهُ فَأَذِنَ لَهَا، ثُمَّ اسْتَأْذَنَتْ لِحَفْصَةَ، قَدْ أَمْلَيْتُ الْحَدِيثَ بِتَمَامِهِ[١].

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتان لەگەڵ مێردەکانیان ئیعتیکاف بکەن لە مزگەوتێك نوێژی بەکۆمەڵی تێدا بکرێ، ئەگەر مێردەکانیان ئیعتیکافیان کرد

واتە: لە فەرموودەکەی عائیشەدا ﷺ هاتووە: عائیشە داوای مۆڵەتی کرد بۆ ئەوەی لەگەڵی ئیعتیکاف بکات، ئەویش مۆڵەتی پێ دا، پاشان مۆڵەتی دا بە حەفصە، پێشتر فەرموودەکەم بەتەواوی باس کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْمُعْتَكِفِ يَنْذُرُ فِي اعْتِكَافِهِ مَا لَيْسَ لَهُ فِيهِ طَاعَةٌ، وَلَيْسَ بِنَذْرٍ يَتَقَرَّبُ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ

٢٢٤١- عَنِ الشَّافِعِيِّ قَالَ: وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْتَكِفَ قَائِمًا، فَلَا يُكَلِّمْ أَحَدًا، وَلَا يَأْكُلْ، وَلَا يَضْطَجِعْ عَلَى فِرَاشٍ عَلَى مَعْنَى التَّقَرُّبِ بِلَا يَمِينٍ، جَلَسَ وَتَكَلَّمَ وَأَكَلَ وَافْتَرَشَ بِلَا كَفَّارَةٍ، وَإِنَّمَا يُوفِي مِنَ النَّذْرِ بِمَا كَانَتْ لِلَّهِ فِيهِ طَاعَةٌ، فَأَمَّا مَنْ نَذَرَ مَا لَيْسَ لِلَّهِ فِيهِ طَاعَةٌ فَلَا يَفِي بِهِ، وَلَا يُكَفِّرْ. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ»[٢].

## باسی ئیعتیکافکار لە ئیعتیکافەکەیدا نەزرێك بکات گوێڕایەڵی و پەرستشی تێدا نەبێت بۆی، هەروەها نەزرێك نەبێت لە خوا نزیکی بکاتەوە

واتە: شافیعی دەڵێ: هەر کەس نەزری کرد بەپێوە ئیعتیکاف بکات، قسە لەگەڵ کەس نەکات و هیچ نەخوات و لەسەر ڕاخەر ڕانەکشێ بەنیازی نزیکبوونەوە لە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

خوا، بەبێ سوێندخواردن، با دابنیشێ و نان بخوات و لەسەر ڕاخەر ڕابکشێ بەبێ کەفارەتدان، بەڵکوو لەوەدا نەزر بەجێ دەهێنرێ پەرستشی خوای تێدا بێت، بەڵام هەر کەس نەزری کرد بەوەی پەرستشی خوای تێدا نەبێت با نەزرەکەی بەجێ نەهێنی و کەفارەتیش نەدات. عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس نەزری کرد لەسەر خۆی کە گوێڕایەڵی خوا بکات (کارێکی خێر ئەنجام بدات) با گوێڕایەڵی بکات، هەر کەسیش نەزری کرد لەسەر خۆی سەرپێچی خوای تێدا بوو، با سەرپێچی نەکات.

**٢٢٤٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى أَبَا إِسْرَائِيلَ قَائِمًا فِي الشَّمْسِ، فَقَالَ: «مَا لَهُ قَائِمٌ فِي الشَّمْسِ؟» قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَصُومَ، وَأَنْ لَا يَجْلِسَ وَلَا يَسْتَظِلَّ قَالَ: «مُرُوهُ فَلْيَجْلِسْ، وَلْيَسْتَظِلَّ، وَلْيَصُمْ»، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْوَفَاءِ بِالصَّوْمِ الَّذِي هُوَ طَاعَةٌ، وَتَرْكِ الْقِيَامِ فِي الشَّمْسِ، إِذْ لَا طَاعَةَ فِي الْقِيَامِ فِي الشَّمْسِ، وَإِنْ كَانَ الْقِيَامُ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ بِمَعْصِيَةٍ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ فِيهِ تَعْذِيبٌ، فَيَكُونُ حِينَئِذٍ مَعْصِيَةً، قَدْ خَرَّجْتُ هَذَا الْجِنْسَ عَلَى الِاسْتِقْصَاءِ فِي كِتَابِ النُّذُورِ[1].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباسدا ﷺ هاتووە، پێغەمبەر ﷺ باوکی ئیسرائیلی بینی لەبەر خۆر ڕاوەستا بوو، فەرمووی: بۆچی لەبەر خۆر وەستاوە؟ وتیان: نەزری کردووە بەڕۆژوو بێت و دانەنیشێ و نەچێتە سێبەر، فەرمووی: با بچێتە سێبەر و دابنیشێت و بەڕۆژوو بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد ڕۆژووەکەی بەجێ بهێنێ کە ئەوە گوێڕایەڵییە، وازیش لە وەستان بهێنێ لەبەر خۆر، چونکە هیچ گوێڕایەڵییەك لە وەستاندا نییە لەبەر خۆر، ئەگەرچی وەستان لەبەر خۆر سەرپێچی نییە، مەگەر ببێتە مایەی سزا بۆ جەستەی، ئەوە ئەوکاتە دەبێتە سەرپێچی، بێگومان ئەم شێوازەم باس کرد بەتێروتەسەلی لە کتێبی (النُّذُور) نەزرەکان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ وَقْتِ خُرُوجِ الْمُعْتَكِفِ مِنْ مُعْتَكَفِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُعْتَكِفَ يَخْرُجُ مِنْ مُعْتَكَفِهِ مُصْبِحًا لَا مُمْسِيًا

**٢٢٤٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الْوَسَطِ مِنْ رَمَضَانَ، فَاعْتَكَفَ عَامًا، حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ وَهِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي يَخْرُجُ مِنْ صَبِيحَتِهَا مِنَ اعْتِكَافِهِ قَالَ: «مَنِ اعْتَكَفَ مَعَنَا فَلْيَعْتَكِفْ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ»[1].

**باسی کاتی دەرچوونی ئیعتیکافکار لە شوێنی ئیعتیکافەکەی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئیعتیکافکار سەرلەبەیانی دەردەچێت لە شوێنی ئیعتیکافەکەی نەك ئێوارە**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێك ئیعتیکافی کرد، تا کاتێ شەوی بیست و یەك هات، ئەویش ئەو شەوە بوو کە سەرلەبەیانییەکەی دەرچوو لە ئیعتیکافەکەی و فەرمووی: هەر کەس ئیعتیکاف دەکات لەگەڵمان با دە شەوی کۆتایی ئیعتیکاف بکات.

---

(١) صحيح.

## كِتَابُ الزَّكَاةِ الْمُخْتَصَرُ مِنَ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُسْنَدِ عَلَى الشَّرِيطَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي أَوَّلِ الْكِتَابِ.

## بَابُ الْبَيَانِ أَنَّ إِيتَاءَ الزَّكَاةِ مِنَ الْإِسْلَامِ بِحُكْمِ الْأَمِينَيْنِ: أَمِينِ السَّمَاءِ جِبْرِيلَ، وَأَمِينِ الْأَرْضِ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِمَا.

**٢٢٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ يَمْشِي، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: «أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكِتَابِهِ وَلِقَائِهِ وَرُسُلِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ لَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِحْسَانُ قَالَ: «الْإِحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنَّكَ إِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا إِذَا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّهَا - يَعْنِي السَّرَارِيَّ - فَقَالَ: فَذَلِكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا وَإِذَا تَطَاوَلَ رِعَاءُ الْبَهْمِ فِي الْبُنْيَانِ، فَذَلِكَ أَشْرَاطُهَا، وَإِذَا صَارَ الْعُرَاةُ الْحُفَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ، فَذَلِكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ تَلَا: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾﴾لقمان، إِلَى آخِرِ السُّورَةِ»، ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَذَا جِبْرِيلُ يُعَلِّمُ النَّاسَ دِينَهُمْ»[١].

## پەرتوکی زەکات، پوختەیەك لە پوختکراوەی ئەو فەرموودانەی سەنەدیان دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو مەرجەی کە لە سەرەتای پەرتوکەکەدا باسمان کرد

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی زەکاتدان لە ئیسلامەتییەوەیە بە حوکم و بڕیاری ئەو دوو ئەمینە: ئەمینی ئاسمان کە جبریلە، وە ئەمینی سەر زەوی کە موحەممەدە ﷺ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لەنێو خەڵکێکدا بوو، لەپڕ پیاوێك هات بۆ خزمەتی ڕێی دەکرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیمان چییە؟ فەمووی: ئەوەیە بڕوا بهێنی بە خوا و فریشتەکانی و پێغەمبەرانی و گەیشتن پێی، وە

---

(١) صحيح.

بڕوا بهێنی بە ڕۆژی دوایی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیسلام چییە؟ فەرمووی: خوا بپەرستە و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدە و نوێژە فەرزکراوەکان ئەنجام بدە و ئەو زەکاتانەیش فەرز کراون دەریان بکە و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیحسان و چاکە چییە؟ فەرمووی: ئیحسان ئەوەیە خوا بپەرستی هەر وەك ئەوەی دەیبینی، ئەگەر تۆیش ئەو نەبینی بێگومان ئەو تۆ دەبینێ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەی ڕۆژی دوایی دێت؟ فەرمووی: پرسیارلێکراو هەر ئەوەندەی پرسیارکەری لێ دەزانێ، بەڵام ئێستا قسەت بۆ دەکەم لەبارەی نیشانەکانی، کاتێك کەنیزەك منداڵی دەبێ لە گەورەکەی و منداڵەکەی دەبێتە سەید و گەورەی دایکی، فەرمووی: ئەوە لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە، وە ئەگەر شوان و گاوانەکان خانووەکانیان بەرز کردەوە، ئەوە نیشانەی ڕۆژی دواییە، وە ئەگەر خەڵکانی ڕووت و قوت و پێخاوس و پەتی و بنە سەرمەشقی خەڵکی ئەوەش یەکێکە لە نیشانەکانی، یەکێکە لەو پێنج شتەی جگە لە خوا کەس نایزانێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴿٣٤﴾ ﴾، تا کۆتایی سوڕەتەکە، پاشان پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە جبریل بوو هات خەڵکی فێری ئایینەکەیان بکات.

## بَابُ الْبَيَانِ أَنَّ إِيتَاءَ الزَّكَاةِ مِنَ الْإِيمَانِ، إِذِ الْإِيمَانُ وَالْإِسْلَامُ اسْمَانِ لِمَعْنًى وَاحِدٍ

**٢٢٤٥**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى الرَّسُولِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا الْحَيَّ مِنْ رَبِيعَةَ، وَقَدْ حَالَتْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كُفَّارُ مُضَرَ، وَلَسْنَا نَخْلُصُ إِلَّا فِي شَهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِشَيْءٍ نَأْخُذُهُ وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا قَالَ: «آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، آمُرُكُمْ بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ، وَشَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَأَنْ تُؤَدُّوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ»[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی دەرکردنی زەکاتی ماڵ و سامان لە ئیمانەوەیە، چونکە ئیمان و ئیسلام دوو ناون بۆ یەك مانا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: نوێنەرانی عەبدولقەیس هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم هۆزە هۆزی ڕەبیعە، بێباوەڕانی هۆزی موضەڕ

---

(١) صحيح.

بوون بە بەربەست لە نێوانماندا، ناتوانین بگەین بە تۆ تەنها لە مانگی حەرامدا نەبێ، فەرمانمان پێ بکە بە شتێ لێتی وەربگرین، بانگەوازی خەڵکی دوای خۆمانیشی پێ بکەین، فەرمووی: فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار شت و ڕێگریتان لێ دەکەم لە چوار شت: فەرمانتان پێ دەکەم بە بڕواهێنان بە خوا، وە شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات، وە پێنجیەکی غەنیمەت و دەستکەوتەکانتان بدەن، وە ڕێگریتان لێ دەکەم لە گرتنەوەی شلەمەنی لەنێو کولەکەی زەرد (الْحَنْتَمِ) و گۆزە (النَّقِيرِ) و قەدی دارخورمای هەڵکۆڵدراو (الْمُزَفَّتِ) و قاپی بۆیەکرا و بە زفت. (ئەوانە چەند قاپێك بوون لەنێو عەرەبدا بەکاریان دەهێنا، لە دار دروست کرابوون، هەڵیان دەکۆڵی و بەکاریان دەهێنا بۆ جۆرەها خواردنەوە، ئەو قاپانە دەبوونە هۆکار و یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ئەو خواردنەوانە زووتر ببنە سەرخۆشکەر).

**٢٢٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ، وَقَالَ: «الْإِيمَانُ بِاللَّهِ ثُمَّ فَسَّرَهَا لَهُمْ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ»[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: نوێنەرانی عەبدولقەیس هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو، وە فەرمووی: بڕوابوون بە خوا، پاشان شی کردەوە بۆیان: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ التَّغْلِيظِ فِي مَنْعِ الزَّكَاةِ.

**بَابُ الْأَمْرِ بِقِتَالِ مَانِعِ الزَّكَاةِ، اتِّبَاعًا لِأَمْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِقِتَالِ الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يَتُوبُوا مِنَ الشِّرْكِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، وَائْتِمَارًا لِأَمْرِهِ جَلَّ وَعَلَا بِتَخْلِيَتِهِمْ بَعْدَ إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ. قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ:** ﴿فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴿٥﴾﴾ **التوبة، إِلَى قَوْلِهِ:** ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ﴿٥﴾﴾ **التوبة، وَقَالَ:** ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿١١﴾﴾ **التوبة.**

---

(١) صحيح.

**٢٢٤٧-** عَنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ارْتَدَّتِ الْعَرَبُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَتُرِيدُ أَنْ تُقَاتِلَ الْعَرَبَ؟ قَالَ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ»، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِنَاقًا مِمَّا كَانُوا يُعْطُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَيْهِ. قَالَ: قَالَ عُمَرُ: فَلَمَّا رَأَيْتُ رَأْيَ أَبِي بَكْرٍ قَدْ شَرَحَ عَلَيْهِ عَلِمْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ[1].

## كۆباسی هەڕەشەكردن لە ڕێگریكردن لە دەركردنی زەكات

**باسی فەرمانكردن بە جەنگان لەگەڵ ئەوانەی زەكات نادەن، وە جێبەجێكردنی فەرمانی خوا ﷻ بە جەنگكردن لەگەڵ هاوبەشدانەران تا تەوبە دەكەن لە هاوبەشدانان، وە نوێژەكان بەجێ دەهێنن و زەكاتی ماڵ و سامانیان دەدەن، وە ملكەچبوون بۆ فەرمانی خوا بە وازهێنان لێی دوای ئەنجامدانی نوێژ و دەركردنی زەكاتی ماڵ و سامانەكان. خوا ﷻ فەرموویەتی:** ﴿فَٱقْتُلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴿٥﴾﴾، **تا فەرمایشتی:** ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ ﴿٥﴾﴾، **وە فەرموویەتی:** ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿١١﴾﴾

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد، عەرەبەكان هەڵگەڕانەوە، عومەری كوڕی خەتاب وتی: ئەی ئەبو بەكر ئایا چۆن دەتەوێ لەگەڵ عەرەبەكان بجەنگی؟ وتی: ئەبو بەكر وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێ كراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا شایەتی ئەدەن بە: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) و منیش پێغەمبەری خوام، وە نوێژ دەكەن و زەكاتیش دەدەن، سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگری بكەن گوریسێكم نەدەنێ كە پێشتر دابێتیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگیان لەگەڵ دەكەم لەسەر نەدانی، وتی: عومەر وتی: كاتێ بۆچوونی ئەبو بەكرم بینی دڵی كراوەتەوە بۆم دەركەوت ئەو لەسەر حەقە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ دَمَ الْمَرْءِ وَمَالَهُ إِنَّمَا يَحْرُمَانِ بَعْدَ الشَّهَادَةِ بِإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ إِذَا وَجَبَتْ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ جَعَلَهُمْ إِخْوَانَ الْمُسْلِمِينَ بَعْدَ التَّوْبَةِ مِنَ الشِّرْكِ وَبَعْدَ إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ إِذَا وَجَبَتَا

**٢٢٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ، حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، ثُمَّ حُرِّمَتْ عَلَيَّ دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خوێن و ماڵی بەندە حەرام دەبن دوای شایەتمان و ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات، چونکە خوا کردوونی بە برای یەکدی دوای تەوبەکردن لە هاوبەشدانان و دوای بەجێهێنانی نوێژ و دەرکردنی زەکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێ کراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا شایەتی ئەدەن بە: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، وە نوێژ دەکەن و زەکاتیش دەدەن، پاشان خوێن و ماڵیان لەسەرم حەرام کراوە و لێپرسینەوەشیان لەلای خوایە.

## بَابُ ذِكْرِ إِدْخَالِ مَانِعِ الزَّكَاةِ النَّارَ مَعَ أَوَائِلِ مَنْ يَدْخُلُهَا، بِاللَّهِ نَتَعَوَّذُ مِنَ النَّارِ

**٢٢٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُرِضَ عَلَيَّ أَوَّلُ ثُلَّةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، وَأَوَّلُ ثُلَّةٍ يَدْخُلُونَ النَّارَ، فَأَمَّا أَوَّلُ ثُلَّةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: فَالشَّهِيدُ، وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، وَنَصَحَ لِسَيِّدِهِ، وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ، وَأَمَّا أَوَّلُ ثُلَّةٍ يَدْخُلُونَ النَّارَ: فَأَمِيرٌ مُسَلَّطٌ، وَذُو ثَرْوَةٍ مِنْ مَالٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّ اللَّهِ فِي مَالِهِ، وَفَقِيرٌ فَخُورٌ»[2].

## باسی ئەوانەی زەکاتی ماڵ و سامانەکەیان دەرناکەن لەگەڵ یەکەمینەکان دەچنە نێو ئاگرەوە، پەنا دەگرین بە خوا لە ئاگر

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم کۆمەڵم بۆ خرایە ڕوو کە دەچنە بەهەشتەوە، هەروەها یەکەم کۆمەڵیش کە دەچنە ئاگرەوە، جا یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە: شەهید و کۆیلەیەك بەچاکی پەرستشی بۆ پەروەردگاری کردبێ و مافی گەورەکەشی دابێ، وە کەسێکی خاوەن خێزان دەستی بۆ شتی حەرام نەبردبێ و داوایشی لە خەڵك نەکردبێت (واتە: سواڵی نەکردبێ)، وە یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە ئاگرەوە: کاربەدەستێکە بەزۆر خۆی سەپاندبێ، وە خاوەن سەروەت و سامانێکە زەکاتی ماڵ و سامانەکەی دەرنەکات، وە ئەو کەسەش کە هەژارێکی لووتبەرز و لەخۆباییە.

## بَابُ ذِكْرِ لَعْنِ لَاوِي الصَّدَقَةِ الْمُمْتَنِعِ مِنْ أَدَائِهَا

**٢٢٥٠**- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: آكِلُ الرِّبَا، وَمُوكِلُهُ، وَشَاهِدَاهُ إِذَا عَلِمَاهُ، وَالْوَاشِمَةُ وَالْمُوتَشِمَةُ وَلَاوِي الصَّدَقَةِ، وَالْمُرْتَدُّ أَعْرَابِيًّا بَعْدَ الْهِجْرَةِ مَلْعُونُونَ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[1].

## باسی نەفرینکردن لەوکەسەی زەکاتی ماڵەکەی دەرناکات و ڕێگری دەکات لە زەکاتدان

واتە: مەسروق دەڵێ: عەبدوڵا ﷺ وتی: ئەوەی ڕیبا دەخوا و ئەوەیشی بریکارێتی و ئەوەیشی شاهیدی بۆ دەدات ئەگەر بەوەیان زانی، هەروەها ئەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و ئەوەیشی خاڵی بۆ دەکوترێ بۆ جوانی، ئەوەیشی زەکاتی ماڵەکەی دەرناکات، وە ئەو دەشتەکییەی هەڵدەگەڕێتەوە لەدوای هیجرەتکردنی، نەفرینیان لێ کراوە لەسەر زاری موحەممەد ﷺ لە ڕۆژی دواییدا.

---

(١) في إسناده مقال، من أجل يحيى بن عيسى الرملي فقد تكلم فيه يحيى بن معين والنسائي وابن حبان والجوزجاني وابن عدي. ووثقه العجلي، وقال الذهبي: صويلح وقد جمع ابن حجر بين أقوال النقاد، فقال في التقريب (٧٦١٩): ((صدوق يخطئ)) وللحديث طريق آخر لكن فيه الحارث الأعور، وهو ضعيف جدا.

## بَابُ صِفَاتِ أَلْوَانِ عِقَابِ مَانِعِ الزَّكَاةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَبْلَ الْفَصْلِ بَيْنَ الْخَلْقِ، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِهِ

**٢٢٥١-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ إِسْحَاقُ: قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: «هُمُ الْأَخْسَرُونَ، وَرَبِّ الْكَعْبَةِ»، قَالَ: فَجَلَسْتُ، فَلَمْ أَتَقَارَّ أَنْ قُمْتُ فَقُلْتُ: مَنْ هُمْ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي؟ قَالَ: «هُمُ الْأَكْثَرُونَ إِلَّا مَنْ قَالَ بِالْمَالِ هَكَذَا أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، وَقَلِيلٌ مَا هُمْ، وَمَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ، وَلَا بَقَرٍ، وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ، وَأَسْمَنُهُ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَتَطَأُهُ بِأَخْفَافِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا عَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ»[1].

## باسی سیفەتی جۆرەکانی سزای ئەو کەسەی ڕێگری لە دەرکردنی زەکات دەکات لە ڕۆژی دوایی، پێش لێپرسینەوە لە دروستکراوەکان، پەنا دەگرین بە خوا لێی

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە سێبەری کەعبە دانیشتبوو، کاتێ بینیمی فەرمووی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوانە زەرەرمەند بوون، وتی: دانیشتم، خۆم پێ ڕانەگیرا هەستام و وتم: ئەوانە کێن دایك و باوکم بەقوربانت بن، فەرمووی: ئەوانەی ماڵ و سامانیان زۆرە جگە لە کەسێ نەبێت بەوشێوە ببەخشێ، چوار جار، ئەوانەیش کەمینەن، وە هەر خاوەنوشترێ یان مانگایەك یان مەڕ و ماڵاتێك بمرێ و زەکاتی دەرنەکات حەتمەن لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر گەورەترو قەڵەوتر دێت، بە سمەکانی دەیشێلێت و بە شاخەکانی قۆچی لێ دەدا، کاتێ کۆتاییەکەیان تەواو دەبێ یەکەمینیان دەست پێ دەکاتەوە تا بڕیار و دادگەری لە نێوان خەڵکیدا دەدرێت.

**بَابُ ذِكْرِ بَعْضِ أَلْوَانِ مَانِعِ الزَّكَاةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ جَهِلَ مَعْنَى قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ ﴿٣٤﴾﴾التوبة، فَزَعَمَ أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ إِنَّمَا نَزَلَتْ فِي الْكُفَّارِ لَا فِي الْمُؤْمِنِينَ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ إِنَّمَا نَزَلَتْ فِي الْمُؤْمِنِينَ لَا فِي الْكُفَّارِ، إِذْ مُحَالٌ أَنْ يُقَالَ: يُعَذَّبُ الْكُفَّارُ إِلَى وَقْتِ كَذَا وَكَذَا، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ، إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ؛ لِأَنَّ الْكَافِرَ يَكُونُ مُخَلَّدًا فِي النَّارِ لَا يَطْمَعُ أَنْ يُخَلَّى سَبِيلُهُ بَعْدَ تَعْذِيبِ بَعْضِ الْعَذَابِ قَبْلَ**

---

(١) صحيح.

## الْفَصْلِ بَيْنَ النَّاسِ، ثُمَّ يُخَلَّى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، بَلْ يُخَلَّدُ فِي النَّارِ بَعْدَ الْفَصْلِ بَيْنَ النَّاسِ

٢٢٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ إِلَّا أُتِيَ بِهِ وَبِمَالِهِ فَأُحْمِيَ عَلَيْهِ صَفَائِحُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، فَتُكْوَى بِهِ جَنْبَاهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ، حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَ عِبَادِهِ يَوْمًا مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ، إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، وَلَا عَبْدٍ لَا يُؤَدِّي صَدَقَةَ إِبِلِهِ إِلَّا أُتِيَ بِهِ، وَإِبِلُهُ عَلَى أَوْفَرَ مَا كَانَتْ فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَتَسِيرُ عَلَيْهِ كُلَّمَا مَضَى آخِرُهَا رَدَّ أَوَّلُهَا حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، وَلَا عَبْدٍ لَا يُؤَدِّي صَدَقَةَ غَنَمِهِ إِلَّا أُتِيَ بِهِ وَبِغَنَمِهِ عَلَى أَوْفَرَ مَا كَانَتْ فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَتَسِيرُ عَلَيْهِ كُلَّمَا مَضَى عَنْهُ آخِرُهَا رَدَّ أَوَّلُهَا تَطَأُهُ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ، وَلَا جَلْحَاءُ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْخَيْلُ قَالَ: «الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالْخَيْلُ لِثَلَاثَةٍ هِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ». فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، قَالُوا: الْحُمُرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ فِيهَا شَيْئًا إِلَّا هَذِهِ الْآيَةَ الْجَامِعَةَ الْفَاذَّةَ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨﴾ الزلزلة، الْجَلْحَاءُ: الَّتِي لَيْسَ لَهَا قَرْنٌ. وَالْعَقْصَاءُ: الْمَكْسُورَةُ الْقَرْنِ[1].

**باسی هەندێ لە جۆرەکانی سزای ئەوانەی زەکات نادەن، وە بەڵگەش لەسەر دژی وتەی ئەو کەسەی تێنەگەیشتووە لە مانای فەرمایشتەکەی خوا ﷻ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ ۝٣٤﴾ التوبة، وا گومانی بردووە ئەم ئایەتە بۆ بێباوەڕان دابەزیوە نەك ئیمانداران، وە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە بێگومان ئەم ئایەتە بۆ بڕواداران دابەزیوە نەك بۆ بێباوەڕان، چونکە مەحاڵە بوترێ: بێباوەڕان سزا ئەدرێن تا فڵانە کات و فڵانە کات، پاشان دەرئەنجامی پێ نیشان بدرێ، یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر، چونکە بێباوەڕ بەهەمیشەیی لە ئاگردا دەمێنێتەوە تەماحی ئەوەی نییە دوای هەندێ لە**

---

(١) صحيح.

## سزادان و پێش بڕیاری یەکلاکەرەوە لە نێوان بەندەکان تەماشای حاڵی بکرێت یان بۆ بەهەشت یان بۆ ئاگر، بەڵکوو بەهەمیشەیی لە ئاگردا دەمێنێتەوە لەدوای بڕیاری یەکلاکەرەوە لە نێوان خەڵك

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەك ماڵ و سامانێکی هەبێت زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکات ئیللا لە ڕۆژی دواییدا خۆی و ماڵ و سامانەکەی دەهێنرێ دەکرێت بە ئاگرێك نێوچاوان و پشتی پێ سوور دەکرێتەوە هەتا خوا دادگەری لە نێوان بەندەکاندا دەکات لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی هەزار ساڵی ئێوە دەبێت لەوەی دەیژمێرن، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، یان بۆ بەهەشتە یان بۆ ئاگر، وە هەر خاوەنوشترێك زەکاتی وشترەکانی دەرنەکات، ئیللا دەهێنرێ لەسەر ڕوو فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، ئەو وشترانە لەوسا بەهێزتر و بەتواناترن بەسەریدا دەڕۆن، هەر کاتێ دواهەمینیان بەسەریدا تێپەڕی سەر لەنوێ یەکەمینیان دەداتەوە بەسەریدا، هەتا خوا دادگەری لە نێوان بەندەکانیدا دەکات لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی هەزار ساڵی ئێوە دەبێت، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، یان بۆ بەهەشتە یان بۆ ئاگر، وە هەر خاوەن مەڕوماڵاتێ زەکاتی مەڕوماڵاتەکەی دەرنەکات ئیللا خۆی و مەڕوماڵاتەکەی دەهێنرێ لەسەر ڕوو فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، ئەو مەڕانە لەوسا بەهێزتر و بەتواناترن بە سمەکانیان دەدەن بەسەریدا و قۆچی لێ دەدەن بە شاخەکانیان، نە بێشاخیان تێدایە و نە شاخشکاو، هەر کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان بەدوایدا دێت، هەتا خوا دادگەری لە نێوان بەندەکاندا دەکات لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی هەزار ساڵی ئێوە دەبێت، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، یان بۆ بەهەشتە یان بۆ ئاگر، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەسپ؟ فەرمووی: نێوچاوانی ئەسپ تا ڕۆژی دوایی خێری تێدایە، ئەسپ بۆ سێ کەسە: بۆ کەسێك پاداشتە، بۆ کەسێك داپۆشینە (بۆ دۆخی ژیانی و بۆ پاراستنی لە دوژمن)، وە لەسەر کەسێکیش قورسی و بارگرانی و تاوانە، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا گوێدرێژ چۆنە؟ فەرمووی: خوا لەبارەیەوە هیچ شتێکی بۆم دانەبەزاندووە جگە لەم ئایەتە گشتگیرە نەبێت: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾، واتە: هەر کەس کردەوەی

چاکی کردبێ لە دنیادا بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەك، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت ئەجر و پاداشتەکەی وەردەگرێ، هەر کەسیش کردەوەی خراپی کردبێ بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەك، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەیبینێتەوە. (الْجَلْحَاءُ): ئەو ئاژەڵەیە کە شاخی نییە، وە (الْعَقْصَاءُ): ئەو ئاژەڵەیە کە شاخی شکاوە.

**٢٢٥٣-** عَنْ سُهَيْلِ بْنِ أَبِي صَالِحٍ بِهَذَا الْإِسْنَادِ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ فِي كُلِّهَا: «فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، وَقَالَ أَيْضًا: ثُمَّ تَسْتَنُّ عَلَيْهِ»[١].

واتە: سوهەیلی کوڕی ئەبو صاڵح دەگێڕێتەوە بەهەمان سەنەدی پێشوو، -بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- لە باسی هەموویاندا وتی: لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵی ئێوە دەبێت لەوەی دەیژمێرن، هەروەها وتی: پاشان بەسەریدا دەڕوات.

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْكَنْزِ مُجْمَلَةً غَيْرَ مُفَسَّرَةٍ

**٢٢٥٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَكُونُ كَنْزُ أَحَدِكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ ذَا زَبِيبَتَيْنِ يَتْبَعُ صَاحِبَهُ، وَهُوَ يَتَعَوَّذُ مِنْهُ، فَلَا يَزَالُ يُتْبِعُهُ، وَهُوَ يَفِرُّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقِمَهُ أُصْبُعُهُ»[٢].

## باسی چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە، سەبارەت بە (الْكَنْز) گەنجینە، فەرموودەکە کورتکراوە و پوختە نەك ڕوونکراوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەنجینەی یەکێك لە ئێوە لە ڕۆژی دواییدا دەبێتە پیرە مارێکی کەچەڵ دوو خاڵی ڕەش لە سەروی هەردوو چاویەتی، شوێنی خاوەنەکەی دەکەوێت ئەویش پەنای لێ دەگرێ، بەردەوام شوێنی دەکەوێت و ئەویش لێی هەڵدێت، هەتا (دەیگرێت و) پەنجەکانی دەبات بە دەمیدا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٢٥٥**- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ بَعْدَهُ كَنْزًا مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ يُتْبِعُهُ، فَيَقُولُ: وَيْلَكَ مَا أَنْتَ، فَيَقُولُ: أَنَا كَنْزُكَ الَّذِي تَرَكْتَهُ بَعْدَكَ، فَلَا يَزَالُ يَتْبَعُهُ حَتَّى يُلْقِمَهُ يَدَهُ فَيُقَصْقِصُهَا، ثمَّ يَتْبَعَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ»[١].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دوای خۆی گەنجینەیەك بەجێ بهێڵێت و (زەکاتی دەرنەکات) بۆی وێنا دەکرێ بە پیرەمارێکی کەچەڵ دوو خاڵی ڕەش لە سەرووی هەردوو چاویەتی، شوێنی دەکەوێت، دەڵێ: هاوار بۆ تۆ، تۆ کێی؟ ئەویش دەڵێ: من ئەو گەنجینەتم کە دوای خۆت بەجێت هێشت، بەردەوام شوێنی دەکەوێت هەتا دەستی دەبات بە دەمیدا و دەیهاڕێ، پاشان هەموو جەستەی بەوشێوەیە شوێنی دەکەوێت.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلْكَنْزِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَنْزَ هُوَ الْمَالُ الَّذِي لَا يُؤَدَّى زَكَاتُهُ، لَا الْمَالُ الْمَدْفُونُ الَّذِي يُؤَدَّى زَكَاتُهُ

**٢٢٥٦**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ رَجُلٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهُ، إِلَّا جُعِلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعٌ طُوِّقَ فِي عُنُقِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ: ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۝١٨٠﴾ آل عمران[٢].

## باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەی وشەی (الْكَنْز)، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی (الْكَنْز) ئەو ماڵ و سامانەیە کە زەکاتی لێ دەرناکرێ، نەك ئەو ماڵ و سامانەی کە شاراوەیە و زەکاتی لێ دەردەکرێ

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێك زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکات، ئیللا لە ڕۆژیی دواییدا بۆی دەبێتە پیرەمارێك لە گەردنی دەئاڵێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئەیاتەی وەکوو بەڵگە بۆمان خوێندەوە: ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۝١٨٠﴾، واتە: بەزوویی ئەوەی چرووکییان پێ دەکرد وەکوو تەوق دەکرێتە گەردنیان لە ڕۆژیی دواییدا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٢٥٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الَّذِي لَا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ يُمَثَّلُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعٌ أَقْرَعُ لَهُ زَبِيبَتَانِ، فَيَلْزَمُهُ أَوْ يُطَوِّقُهُ، يَقُولُ أَنَا كَنْزُكَ»[1].

واته: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی (خوا ماڵێکی پێ بەخشیبێت) زەکاتی ماڵەکەی دەرنەکات، لە ڕۆژی دواییدا ئەو ماڵە دەبێتە پیرەمارێکی کەچەڵ دوو خاڵی ڕەش لە سەرووی هەردوو چاویەتی، دەیگرێ یان وەکوو تەوق لە گەردنی دەئاڵێ و دەڵێ: من ماڵەکەتم من گەنجینەکەتم.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا وَاجِبَ فِي الْمَالِ غَيْرُ الزَّكَاةِ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الْوَعِيدَ بِالْعَذَابِ لِلْمُكْتَنِزِ وَلِمَنْ لَا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ دُونَ مَنْ يُؤَدِّيهَا وَإِنْ كَانَ الْمَالُ مَدْفُونًا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ: عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ، وَفِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ. فَقَالَ فِي الْخَبَرِ: وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْخَبَرِ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا، قَدْ أَمْلَيْتُ هَذَيْنِ الْخَبَرَيْنِ فِيمَا مَضَى مِنَ الْكِتَابِ. وَفِي خَبَرِ أَبِي أُمَامَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: صَلُّوا خَمْسَكُمْ، وَصُومُوا شَهْرَكُمْ، وَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ، وَأَطِيعُوا ذَا أَمْرِكُمْ تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُمْ.**

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی جگە لە زەکات هیچی شتێك واجب نییە لە ماڵ و سامان، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی هەڕەشەکردن بە سزادان بۆ ئەو کەسەیە کە زەکاتی ماڵ و سامانەکەی دەرناکات ئەگەرچی مایەکەشی شاراوە بێت، نەك ئەو کەسەی زەکاتی ماڵەکەی دەردەکات، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵادا ﷺ هاتووە: (عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ)، واتە: ئایا جگە لەوە هیچی دیکە لەسەرم هەیە؟ فەرمووی: نەخێر، مەگەر زیادە ببەخشیت. وە لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ هاتووە: (أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَمِلْتُهُ دَخَلْتُ الْجَنَّةَ)، واتە: کابرایەکی دەشتنشین هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: کردەوەیەکم پێ نیشان بدە ئەگەر کردم بچمە بەهەشتەوە. لە فەرموودەکەدا فەرمووی: (وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ)، واتە: وە زەکاتی**

---

[1] صحيح.

ماڵ و سامانەکەت بدەی کە فەرز کراوە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەدا فەرمووی: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا)، واتە: هەر کەس پێی خۆشە تەماشای پیاوێك بکات لە ئەهلی بەهەشت با تەماشای ئەو پیاوە بکات، ئەم دوو فەرموودەیەم لە پێشەوە باس کرد لەم کتێبەدا، هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبو ئومامەدا هاتووە: (صَلُّوا خَمْسَكُمْ، وَصُومُوا شَهْرَكُمْ، وَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ، وَأَطِيعُوا ذَا أَمْرِكُمْ تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُمْ)، واتە: پێنج فەرزە نوێژەکانتان بکەن و ڕۆژووی مانگەکەتان بگرن و زەکاتی ماڵ و سامانەکانتان دەربکەن، وە گوێڕایەڵی ئەمیر و فەرماندەکانتان بکەن دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتان

## بَابُ ذِكْرِ دَلِيلٍ آخَرَ عَلَى أَنَّ الْوَعِيدَ لِلْمُكْتَنِزِ هُوَ لِمَانِعِ الزَّكَاةِ دُونَ مَنْ يُؤَدِّيهَا

**٢٢٥٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ، فَقَدْ أَذْهَبْتَ عَنْكَ شَرَّهُ»[١].

## باسی بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوەی هەڕەشە بۆ ئەو کەسەیە کە زەکاتی ماڵەکەی نادات جگە لەوەی دەیدات

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر زەکاتی ماڵ و سامانەکەتت دەرکرد، ئەوە بێگومان خراپەکەیت لە خۆت دوورخستۆتەوە.

## بَابُ بَيْعَةِ الْإِمَامِ النَّاسَ عَلَى إِيتَاءِ الزَّكَاةِ

**٢٢٥٩-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی بەیعەتدانی خەڵك بە ئیمام لەسەر دەرکردنی زەکات

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷛ دەڵێ: بەیعەتم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات و ئامۆژگاری و دڵسۆزی نواندن بۆ هەموو مسوڵمانێك.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ فَرْضَ الزَّكَاةِ كَانَ قَبْلَ الْهِجْرَةِ إِلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ مُقِيمٌ بِمَكَّةَ قَبْلَ هِجْرَتِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ

**٢٢٦٠-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ الْمَخْزُومِيِّ، عَن أُمِّ سَلَمَةَ بِنْتِ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلْنَا أَرْضَ الْحَبَشَةِ جَاوَرْنَا بِهَا حِينَ جَاءَ النَّجَاشِيُّ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ فِي الْحَدِيثِ قَالَتْ: وَكَانَ الَّذِي كَلَّمَهُ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ قَالَ لَهُ: أَيُّهَا الْمَلِكُ كُنَّا قَوْمًا أَهْلَ جَاهِلِيَّةٍ نَعْبُدُ الْأَصْنَامَ، وَنَأْكُلُ الْمَيْتَةَ، وَنَأْتِي الْفَوَاحِشَ، وَنَقْطَعُ الْأَرْحَامَ، وَنُسِيءُ الْجِوَارَ، وَيَأْكُلُ الْقَوِيُّ مِنَّا الضَّعِيفَ، فَكُنَّا عَلَى ذَلِكَ حَتَّى بَعَثَ اللَّهُ إِلَيْنَا رَسُولًا مِنَّا نَعْرِفُ نَسَبَهُ، وَصِدْقَهُ، وَأَمَانَتَهُ، وَعَفَافَهُ، فَدَعَانَا إِلَى اللَّهِ لِتَوْحِيدِهِ، وَلِنَعْبُدَهُ وَنَخْلَعَ مَا كُنَّا نَعْبُدُ نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِنْ دُونِهِ مِنَ الْحِجَارَةِ وَالْأَوْثَانِ، وَأَمَرَنَا بِصِدْقِ الْحَدِيثِ، وَأَدَاءِ الْأَمَانَةِ، وَصِلَةِ الرَّحِمِ، وَحُسْنِ الْجِوَارِ، وَالْكَفِّ عَنِ الْمَحَارِمِ وَالدِّمَاءِ، وَنَهَانَا عَنِ الْفَوَاحِشِ، وَقَوْلِ الزُّورِ، وَأَكْلِ مَالِ الْيَتِيمِ، وَقَذْفِ الْمُحْصَنَةِ، وَأَنْ نَعْبُدَ اللَّهَ لَا نُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَأَمَرَنَا بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّيَامِ، قَالَتْ: فَعَدَّدَ عَلَيْهِ أُمُورَ الْإِسْلَامِ، فَصَدَّقْنَاهُ وَآمَنَّا بِهِ، وَاتَّبَعْنَاهُ عَلَى مَا جَاءَ بِهِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ، فَعَبَدْنَا اللَّهَ وَحْدَهُ، وَلَمْ نُشْرِكْ بِهِ وَحَرَّمْنَا مَا حَرَّمَ عَلَيْنَا، وَأَحْلَلْنَا مَا أَحَلَّ لَنَا، ثُمَّ ذَكَرَ بَاقِيَ الْحَدِيثِ[١].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی فەرزبوونی زەکات پێش کۆچ کردن بوو بۆ حەبەشە، ئەوە لە کاتێدا بوو پێغەمبەر ﷺ نیشتەجێی مەککە بوو پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە

واتە: ئوممو سەلەمەی کچی ئەبو ئومەیەی کوڕی موغیرە ﵂ دەڵێ: کاتێ دابەزینە زەوی حەبەشە بەمیوانی ماینەوە تا نەجاشی هات، -دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- لە فەرموودەکەدا وتی: ئوممو سەلەمە وتی: ئەو کەسەی قسەی

---

(١) صحيح.

لەگەڵ کرد جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب بوو، پێی وت: ئەی پاشا ئێمە خەڵکێکی نەفام بووین، بتەکانمان دەپەرست و گۆشتی مردارەوەبوومان دەخوارد و داوێنپیسیمان دەکرد و خراپ بووین لەگەڵ هاوماڵ و دراوسێدا، ئەوەی بەهێز و بەتوانا بووایە لاوازەکانی دەکردە ژێردەستەی خۆی، ئێمە حاڵمان بەو شێوە بوو تا خوا پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ناردین ڕەچەڵەك و ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی و داوانپاکیمان دەناسی، بانگی کردین بۆ لای یەکتاپەرستی خوا، وە بیپەرستین و دەستبەرداری هەموو ئەوانە بین کە باوباپیرانمان دەیانپەرست لە بەرد و بتەکان، وە فەرمانی پێ کردین بە ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی و پەیوەندی خزمایەتی و چاکبوون لەگەڵ دراوسێ و دەستهەڵگرتن لە قەدەغەکراوەکان و خوێنڕشتن، وە ڕێگری لێ کردین لە داوێنپیسی و شایەتی درۆ و خواردنی ماڵی هەتیو بەناحەق و تۆمەتبارکردنی ئافرەتی داوێنپاك، وە خوا بپەرستین و هاوبەشی بۆ دانەنێین وە فەرمانی پێ کردین بە نوێژ و زەکات و ڕۆژوو، -وتی: ئەوەی ئیسلام فەرمانی کردبوو بۆی ژمارد- ئێمەیش بە ڕاستمان دانا و بڕوامان پێ هێنا و شوێنی کەوتین لەوەی لەلایەن خواوە بۆی هاتبوو، دواتر خوامان پەرست بەتاك و تەنها و هاوبەشمان بۆی دانەنا، ئەوەیشی خوا قەدەغەی کرد لەسەرمان بە قەدەغەمان دانا، وە ئەوەیشی خوا حەڵاڵی کرد بە حەڵاڵمان دانا، پاشان باسی ئەو قسانەی کرد کە مابوو.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ صَدَقَةِ الْمَوَاشِي مِنَ الْإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَمِ

### بَابُ فَرْضِ صَدَقَةِ الْإِبِلِ وَالْغَنَمِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً ﴿١٠٣﴾ ﴾التوبة، بَعْضَ الْأَمْوَالِ لَا كُلَّهَا، إِذِ اسْمُ الْمَالِ قَدْ يَقَعُ عَلَى مَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ وَعَلَى مَا دُونَ الْأَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ

**٢٢٦١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، لَمَّا اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ حِينَ وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ، فَكَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَالَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَهَا فَوْقَهَا فَلَا يُعْطِهِ فِي أَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الْإِبِلِ، فَمَا دُونَهُ الْغَنَمُ، فِي كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ، فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا

ابْنَةُ مَخَاضٍ، فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلَاثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَفِيهَا ابْنَةُ لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ، فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّينَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَفِيهَا جَذَعَةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعِينَ، فَفِيهَا ابْنَتَا لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِين حِقَّةٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلَّا أَرْبَعَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا مِنَ الْإِبِلِ، فَفِيهَا شَاةٌ، وَصَدَقَةُ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، شَاةٌ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى الْعِشْرِينَ وَالْمِائَةِ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ الْمِائَتَيْنِ فَفِيهَا شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى الْمِائَتَيْنِ إِلَى ثَلَاثِمِائَةٍ، فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلَاثِمِائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ وَاحِدَةٌ، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا. ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[1].

**کۆباسی زەکاتی ئاژەڵداری لە وشتر و مانگا و مەڕ و بزن.**

**باسی فەرزبوونی زەکاتی مەڕوماڵات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بێگومان خوا ﷻ لە فەرمایشتەکەیدا: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةً ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) صەدەقە وەربگرە لە ماڵ و سامانیان. مەبەستی بەشێك لە ماڵ و سامانەکەیانە نەك هەمووی، چونکە ناوی ماڵ و سامان بەکار دەهێنرێ بۆ کەمتر لە پێنج وشتر، وە بۆ کەمتر لە چل مەڕ**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکری صدیق کاتێ کرا بە خەلیفە، نووسراوەی بۆ کرد کاتێ ناردی بۆ یەمەن: بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەمانە فەرزی زەکاتن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەرزی کردووە، وە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووە بە پێغەمبەرەکەی، هەر مسوڵمانێك داوای لێ بکرێت بەشێوەیەکی تەواو پێویستە زەکاتەکەی بدات (بە کاربەدەستی مسوڵمانان) هەر کەس زیاد لەوە داوای لێ بکرێ ئەوە دەتوانێ نەیدات، لە بیست و چوار وشتر لە هەر پێنج دانەیەك بەرخێکی مێی یەك ساڵ دەکرێت بە زەکات، ئەگەر گەیشت بە بیست و پێنج هەتا سی و پێنج وشتر فەرخە وشترێکی مێی یەکساڵە ئەدرێ، ئەگەر وشترێکی مێی یەکساڵە

---

(١) صحيح.

نەبوو، ئەوە وشترێکی دووساڵەی نێر دەدات، ئەگەر گەیشت بە سی و شەش تا دەگاتە چل و پێنج، وشترێکی مێی دوو ساڵە دەدرێ، ئەگەر گەیشتە چل و شەش تا شەست، ئەوە وشترێکی مێی سێساڵە ئەدرێ، ئەگەر گەیشت بە شەست و یەك تا حەفتا و پێنج، ئەوە وشترێکی مێی چوارساڵە دەدرێ، ئەگەر گەیشتە حەفتا و شەش تا دەگاتە نەوەد، ئەوە دوو وشتری مێی دووساڵە دەدرێن، جا ئەگەر گەیشتە نەوەد و یەك هەتا دەگاتە سەد و بیست و یەك، ئەوە دوو وشتری مێی سێساڵە دەدرێن، جا ئەگەر زیادی کرد لەسەر سەد و بیست، ئەوە لە هەموو چل دانەدا وشترێکی مێی دووساڵە دەدرێ، وە لە هەموو پەنجا دانەیەك وشترێکی مێی سێساڵە دەدرێ، هەر کەسیش وشتری نەبوو جگە لە چوار دانە نەبێت، ئەوە زەکاتی تێدا نییە مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات، وە هەر کاتێ گەیشتە پێنج سەر مەڕێك زەکاتیەتی، وە زەکاتی مەڕ و بزن ئەگەر گەیشت بە چل دانە هەتا دەگاتە سەد و بیست ئەوە کاوڕێکی مێی یەکساڵە دەدرێ، ئەگەر لە سەد و بیست زیاتر بوو تا دەگاتە دوو سەد ئەوە دوو کاوڕی مێی یەک ساڵە دەدرێ، ئەگەر لە دوو سەد زیاتر بوو تا سێ سەد، سێ سەر زەکاتەکەیەتی، ئەگەر لە سێ سەد سەر زیاتر بوو لە هەموو سەد دانەیەك یەك سەر دەکاتە زەکات، ئەگەر مەڕ و بزنی یەکێك لە چل سەر یەکێکی کەم بوو ئەوە زەکاتی تێدا نییە، مەگەر خاوەنەکەی خۆی بیەوێت، دواتر درێژەی دا بە قسەکەی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صِغَارَ الْإِبِلِ وَالْغَنَمِ وَكِبَارَهُمَا تُعَدُّ عَلَى مَالِكِهَا عِنْدَ أَخْذِ السَّاعِي الصَّدَقَةَ مِنْ مَالِكِهَا

**٢٢٦٢-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ شَيْءٌ، فَإِذَا كَانَتْ خَمْسَ عَشْرَةَ، فَفِيهَا ثَلَاثَةُ شِيَاهٍ إِلَى عِشْرِينَ»، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ. فَإِذَا كَثُرَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ شَيْءٌ فَإِذَا كَانَتْ خَمْسًا فَفِيهَا شَاةٌ إِلَى عَشْرٍ، فَإِذَا كَانَتْ عَشْرًا، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى خَمْسَ عَشْرَةَ، فَإِذَا كَانَتْ خَمْسَ عَشْرَةَ، فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ إِلَى عِشْرِينَ»، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ. فَإِذَا كَثُرَتِ الْإِبِلُ، فَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَلَا تُؤْخَذُ هَرِمَةٌ، وَلَا ذَاتُ عَوْرَاءَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ الْمُصَدِّقُ، وَيَعُدُّ صَغِيرَهَا وَكَبِيرَهَا، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ أَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ شَيْءٌ، فَإِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ فَفِيهَا شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةٌ، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى الْمِائَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةٌ فَفِيهَا ثَلَاثٌ إِلَى ثَلَاثِمِائَةٍ، فَإِذَا كَثُرَتِ الْغَنَمُ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، وَلَا

تُؤْخَذُ هَرِمَةٌ وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ الْمُصَدِّقُ، وَيَعُدُّ صَغِيرَهَا وَكَبِيرَهَا، وَلَا يَجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی وشتر و مەڕوماڵات لە کاتی دەرکردنی زەکات هەمووی لەسەر خاوەنەکەی حیساب دەکرێت، کاتێ کۆکەرەوەی زەکات وەریدەگرێ**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، ئەگەر پێنج سەر بوو تا دە سەر ئەوە مەڕێکی تێدایە، ئەگەر دە سەر بوو تا پازدە سەر ئەو دوو مەڕی تێدایە، وە ئەگەر پازدە سەر بوو بۆ بیست سەر ئەوە سێ سەری تێدایە، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد بەدرێژی- ئەگەر وشترەکان زیاتر بوون، ئەوە لە هەر پەنجا دانەیەك وشترێکی مێینەی سێساڵ دەدرێ بە زەکات، ئاژەڵی پیر و پەککەوتە و کوێر و عەیبدار وەرناگیرێ، مەگەر کۆکەرەوەی زەکات خۆی مەیلی لێی بێت (بە قازانجی بزانێت)، وە گەورە و بچووکیان دەژمێردرێت و حیساب دەکرێ، وە زەکاتی مەڕوماڵات کەمتر بێت لە چل سەر زەکاتی ناکەوێت، ئەگەر چل سەر بۆ سەد و بیست سەر بوو یەك سەری تێدایە بە زەکات، ئەگەر یەك دانەی زیادی کرد (واتە: بووبە سەد و بیست و یەك سەر) تا دوو سەد سەر ئەوە دوو مەڕی تێدایە، ئەگەر یەك دانەی زیادی کرد (واتە: بووبە دوو سەد و یەك سەر) تا سێ سەد، ئەوە سێ دانەی تێدایە، ئەگەر مەڕوماڵاتەکە لەوە زیاتر بوو ئەوە لە هەموو سەد دانەیەك یەك دانەی تێدایە، ئاژەڵی پیر و پەککەوتە و کوێر و عەیبدار وەرناگیرێ، مەگەر کۆکەرەوەی زەکات خۆی مەیلی لێی بێت، وە گەورە و بچووکیان دەژمێردرێت، هەروەها ئاژەڵی جیا تێکەڵ ناکرێت و ئاژەڵی تێکەڵیش جیا ناکرێتەوە لە ترسی زەکاتدان.

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَجِبُ، فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ وَلَا فِيمَا دُونَ الْأَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الصَّدَقَةِ وَاقِعٌ عَلَى عُشْرِ الْحُبُوبِ وَالثِّمَارِ، وَعَلَى زَكَاةِ الْمَنَاضِّ مِنَ الْوَرِقِ، وَعَلَى صَدَقَةِ الْمَوَاشِي، إِذِ الْعَامَّةُ تُفَرِّقُ بَيْنَ الزَّكَاةِ وَالصَّدَقَةِ وَالْعُشْرِ، لِجَهْلِهَا بِالْعِلْمِ، فَتَتَوَهَّمُ أَنَّ اسْمَ الصَّدَقَةِ**

---

(١) إسناده حسن.

**إِنَّمَا تَقَعُ عَلَى صَدَقَةِ الْمَوَاشِي دُونَ عُشْرِ الْحُبُوبِ وَالثِّمَارِ، وَتَتَوَهَّمُ أَنَّ الْوَاجِبَ فِي النَّاضِّ إِنَّمَا يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ الزَّكَاةِ، لَا اسْمُ الصَّدَقَةِ، وَالنَّبِيُّ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ قَدْ سَمَّى جَمِيعَ ذَلِكَ صَدَقَةً، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عَلِيٍّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ الْأَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ شَيْءٌ.**

**٢٢٦٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ. وَفِي حَدِيثِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، لَيْسَ فِيمَا دُونَ الْأَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ شَيْءٌ»[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەكات لە خوار پێنج وشترەوە واجب نابێ، هەروەها لە خوار چل مەڕ و بزنیشەوە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی ناوی صەدەقە بۆ دەیەكی دانەوێڵە و بەروبوومەكانیش بەكار هاتووە، هەروەها بۆ زەكاتی كانزا لە زیو كە لە زەوی دەردەهێنرێ، وە بۆ زەكاتی ئاژەڵەكانیش، لە كاتێكدا خەڵك جیاوازی دەكات لە نێوان زەكات و صەدەقە و دەیەك، لەبەر ناشارەزایی بە زانستی شەرعی، وا خەیاڵ دەكەن صەدەقە بۆ ئاژەڵەكان بەكار هاتووە، نەك دانەوێڵە و بەروبوومەكان، هەروەها وا خەیاڵ دەكەن ئەوەی واجبە لە كانزای ژێر زەوی ناوی زەكاتی بۆ بەكارهاتووە نەك ناوی صەدەقە، پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەوانەی ناو هێناوە بە صەدەقە، ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكەی عەلی لە پێغەمبەرەوە ﷺ: (لَيْسَ فِيمَا دُونَ الْأَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ شَيْءٌ)، واتە: مەڕومالاَت چل سەر كەمتر بوو زەكاتی تێدا نییە**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێنج سەر وشتر كەمتر بێت زەكاتی تێدا نییە، وە لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق كەمتر زەكاتی ناكەوێ (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ كغم)، وە لە فەرموودەكەی عەلیدا هاتووە: مەڕومالاَت چل سەر كەمتر بوو هیچی ناكەوێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الزَّكَاةِ أَيْضًا وَاقِعٌ عَلَى صَدَقَةِ الْمَوَاشِي، إِذِ الصَّدَقَةُ وَالزَّكَاةُ اسْمَانِ لِلْوَاجِبِ فِي الْمَالِ

---

(١) صحيح.

**٢٢٦٤** - عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ، وَلَا بَقَرٍ، وَلَا غَنَمٍ، لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ بِتَمَامِهِ»[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ناوی زەکات بۆ صەدەقە بەکار هاتووە لە ئاژەڵەکاندا، چونکە صەدەقە و زەکات دوو ناون بۆ ئەوەی واجبە لە ماڵ و سامان**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر خاوەن وشترو مانگاو مەڕوماڵاتێك زەکاتی دەرنەکات، (دانەر دەڵێ): پێشتر بەتەواوی باسم کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّدَقَةَ إِنَّمَا تَجِبُ فِي الْإِبِلِ وَالْغَنَمِ فِي سَوَائِمِهَا دُونَ غَيْرِهِمَا، ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ فِي الْإِبِلِ الْعَوَامِلِ صَدَقَةً

**٢٢٦٥**- فِي خَبَرِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ: وَصَدَقَةُ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ شَاةٌ، قَدْ أَمْلَيْتُ قَبْلُ[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکات تەنها لە وشتر و مەڕوماڵاتێکدا واجب دەبێ لە دەشت بلەوەڕێ نەك ئاڵفیان پێ بدرێت، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات لەو وشترانەدا زەکات هەیە کە ئیشیان پێ دەکرێ**

واتە: وە لە فەرموودەکەی ئەبو بەکردا ﷺ هاتووە لە زەکاتی مەڕوماڵات کە لە دەشت دەلەوەڕێن و ئاڵفیان پێ نادرێ ئەگەر چل سەر بوون تا سەد و بیست، ئەوە یەك مەڕیان دەکەوێت، پێشتر ئەم فەرموودەم باس کرد.

**٢٢٦٦**- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، لَا يُفَرَّقُ إِبِلٌ مِنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِرًا فَلَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ مَنَعَهَا، فَإِنَّا آخِذُهَا وَشَطْرَ إِبِلِهِ عَزْمَةٌ مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا، لَا يَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) هذا الحديث ضعيف بهذه السياقة، إذ تفرد بهز بن حكيم عن أبيه عن جده بلفظة: (فإنا آخذوها وشطر ماله))، وهو ممن لا يحتمل تفرده في مثل هذا الموضع، وقد نقل البيهقي في السنن الكبرى (١٠٥١٤) عن الشافعي قوله: ((لا يثبت أهل العلم بالحديث أن تؤخذ الصدقة وشطر إبل الغال لصدقته، ولو ثبت قلنا به)) ثم إن يضعف به هذا

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەگێڕێتەوە، لە باوکی لە باپیریەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە هەر چل سەر وشترێکدا کە لە دەشت بلەوەڕێ وشترێکی مێی دووساڵە دەدرێ، هیچ جیا ناکرێتەوە هەمووی دەژمێردرێ، هەر کەس زەکاتەکەی دا بەنییەتی ئەوەی پاداشتی دەست بکەوێت، ئەوە پاداشتەکەی دەست دەکەوێت، هەر کەسیش زەکاتەکەی نەدا ئەوە ئێمە لێی وەردەگرین، بەشێك لەماڵەکەی مافێکە لە مافەکانی پەروەردگارمان، هیچ لەوانە حەڵاڵ نییە بۆ خانەوادەی موحەممەد ﷺ.

**٢٢٦٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ الصَّدَقَةَ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَى عُمَّالِهِ حَتَّى قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ، وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ. وَقَالَ فِي الْغَنَمِ: «فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ سَائِمَةً وَحَدَّهَا شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ». ثُمَّ ذَكَرَ بَاقِيَ الْحَدِيثِ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ زەکاتی نووسی، دەرنەچوو بۆ لای کرێکارەکانی (ئەوانەی زەکاتیان وەردەگرت) تا پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، -دواتر بەدرێژیی باسی فەرموودەکەی کرد- وە دەربارەی زەکاتی مەڕومالآت فەرمووی: لە هەموو چل سەردا کە تەنها لە دەشت دەلەوەڕێ و ئالفی پێ نادرێ یەك سەری تێدایە تا دەگاتە سەد و بیست. پاشان باسی ئەوەی کرد کە مابوو لە فەرموودەکە.

## بَابُ صَدَقَةِ الْبَقَرِ بِذِكْرِ لَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٢٦٨-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، بَعَثَهُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، وَأَخْبَرَهُ: «أَنْ يَأْخُذَ مِنَ الْبَقَرِ مِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ بَقَرَةً تَبِيعًا، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ بَقَرَةً بَقَرَةً مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَارًا أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ»[٢].

## باسی زەکاتی مانگا و ڕەشەوڵاخ، بە باسکردنی دەستەواژەیەکی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) ڕوونکراوە

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ یەمەن و پێی ڕاگەیاند: لە مانگادا لە هەر سی دانەیەك گوێرەکەیەکی یەکساڵەی نێر بێت یان مێ بە زەکات

---

الحديث إعلاله بعدم العمل به، فلم ينقل عن النبي ﷺ ولا عن أحد من الصحابة الغرامة.

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وەربگریێت، وە لە هەموو چل دانەیەك گوێرەکەیەکی دووساڵە وەربگریێ، وە لە هەموو کەسێکی باڵغ دینارێك یان لەبری ئەوە پۆشاك بەبەهای دینارەکە وەربگیرێت بە سەرانە.

**٢٢٦٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ لَهُ كِتَابًا فِيهِ: «وَفِي الْبَقَرِ فِي ثَلَاثِينَ بَقَرَةً تَبِيعٌ وَفِي الْأَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ»[1].

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم دەگێڕێتەوە، لە باوکی لە باپیریەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ نووسراوێکی بۆ نووسی لە نووسراوەکەدا هاتبوو: لە مانگادا لە سی سەر گوێرەکەیەکی یەکساڵەی نێر بێت، یان مێ بە زەکات وەربگریێ، وە لە چل سەردا گوێرەکەیەکی دووساڵە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَوْجَبَ الصَّدَقَةَ فِي الْبَقَرِ فِي سَوَائِمِهَا دُونَ عَوَامِلِهَا

**٢٢٧٠-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَفِي الْغَنَمِ وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلَّا تِسْعَةٌ وَثَلَاثِينَ فَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ، وَفِي الْأَرْبَعِينَ شَاةٌ، ثُمَّ لَيْسَ عَلَيْكَ فِيهَا شَيْءٌ حَتَّى تَبْلُغَ عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى الْمِائَتَيْنِ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى الْمِائَتَيْنِ شَاةٌ فِيهَا أَيْ فَفِيهَا». وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو: أَوْ فَفِيهَا ثَلَاثٌ إِلَى ثَلَاثِمِائَةٍ، ثُمَّ فِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، وَفِي الْبَقَرِ فِي ثَلَاثِينَ تَبِيعٌ، وَفِي الْأَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ، وَلَيْسَ عَلَى الْعَوَامِلِ شَيْءٌ، ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[2].

## باسی فەرموودەیەك ڕوونکەرەوەی ئەو دەستەواژە ناڕوونەیە کە باسمان کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ زەکاتی لەو مانگایانەدا واجب کرد کە لە دەشت دەلەوەڕێن نەك ئەوانەی کاریان پێ دەکرێ

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: لە زەکاتی مەڕ و بزن لە هەموو چل دانەیەك کاوڕێکی مێی یەکساڵە دەدرێ، ئەگەر تەنها سی و نۆ سەر بوو زەکاتی نییە، وە لە چل سەردا دانەیەك زەکاتە، پاشان دوای ئەوە زەکاتت لەسەر نییە تیایدا، تا دەگاتە سەد و بیست، ئەگەر زیاتر بوو لە سەد و بیست، ئەوە

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

دوو سەری تێدایە تا دەگاتە دوو سەد، ئەگەر لە دوو سەد سەر زیاتر بوو ئەوە (لە هەموو سەد سەرێك) یەك سەری تێدایە، موحەممەدی كوڕی عەمر (كە یەكێكە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: یان سێ دانەی تێدایە تا دەگاتە سێ سەد، پاشان لە هەموو سەد دانەیەك یەك سەری تێدایە، وە لە مانگادا لە هەر سی دانەیەك گوێرەكەیەكی یەكساڵەی نێر بێت یان مێ بە زەكات وەربگرێت، وە لە چل سەردا گوێرەكەیەكی دووساڵەی تێدایە، زەكاتی ئەوانە نادرێت كە كاریان پێ دەكرێ، پاشان بەدرێژی باسی فەرموودەكەی كرد.

**٢٢٧١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَيْسَ عَلَى مُثِيرِ الْأَرْضِ زَكَاةٌ[١].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئەو ئاژەڵەی ئیشی پێ دەكرێ لەنێو زەوی و زار زەكاتی تێدا نییە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ أَخْذِ اللَّبُونِ فِي الصَّدَقَةِ بِغَيْرِ رِضَى صَاحِبِ الْمَاشِيَةِ

**٢٢٧٢-** عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَهُ سَاعِيًا، فَقَالَ أَبُوهُ: لَا تَخْرُجْ حَتَّى تُحْدِثَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَهْدًا، فَلَمَّا أَرَادَ الْخُرُوجَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا قَيْسُ لَا تَأْتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِكَ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةٌ لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةٌ لَهَا يُعَارٌ، وَلَا تَكُنْ كَأَبِي رِغَالٍ»، فَقَالَ سَعْدٌ: وَمَا أَبُو رِغَالٍ؟ قَالَ: مُصَدِّقٌ بَعَثَهُ صَالِحٌ، فَوَجَدَ رَجُلًا بِالطَّائِفِ فِي غُنَيْمَةٍ قَرِيبَةٍ مِنَ الْمِائَةِ شِصَاصٍ إِلَّا شَاةً وَاحِدَةً، وَابْنٌ صَغِيرٌ لَا أُمَّ لَهُ، فَلَبَنُ تِلْكَ الشَّاةِ عَيْشُهُ، فَقَالَ صَاحِبُ الْغَنَمِ: مَنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ: أَنَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرَحَّبَ قَالَ: هَذِهِ غَنَمِي فَخُذْ أَيَّهَا أَحْبَبْتَ، فَنَظَرَ إِلَى الشَّاةِ اللَّبُونِ، فَقَالَ: هَذِهِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: هَذَا الْغُلَامُ كَمَا تَرَى لَيْسَ لَهُ طَعَامٌ وَلَا شَرَابٌ غَيْرُهَا، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ تُحِبُّ اللَّبَنَ، فَأَنَا أُحِبُّهُ، فَقَالَ: خُذْ شَاتَيْنِ مَكَانَهَا، فَأَبَى، فَلَمْ يَزَلْ يَزِيدُهُ، وَيَبْذُلُ حَتَّى بَذَلَ لَهُ خَمْسَ شِيَاهٍ شِصَاصٍ مَكَانَهَا، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عَمَدَ إِلَى قَوْسِهِ فَرَمَاهُ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ: مَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِهَذَا الْخَبَرِ أَحَدٌ قَبْلِي، فَأَتَى صَاحِبُ الْغَنَمِ صَالِحًا النَّبِيَّ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ صَالِحٌ: اللَّهُمَّ الْعَنْ أَبَا رِغَالٍ اللَّهُمَّ الْعَنْ أَبَا رِغَالٍ، فَقَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اعْفُ قَيْسًا مِنَ السِّعَايَةِ[٢].

---

(١) صحيح موقوفا.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی قەدەغەکردن لە وەرگرتنی مەڕی شیردەر بە زەکات بەبێ ڕازیبوونی خاوەن مەڕوماڵاتەکە

واتە: قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ کۆکردنەوەی زەکات، باوکی پێی وت: دەرمەچۆ تا پەیمانێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەردەگریت،کاتێ ویستی دەربچێت هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی قەیس لە ڕۆژی دواییدا نەیەیت وشترێك لەسەر گەردنت بێت بباڕێنێ، یان مانگایەك بهۆڕێنێ، یان مەڕێك بباڕێنێ، هەروەها وەکوو ئەبو ڕیغال مەبە، سەعد وتی: ئەبو ڕیغال چی کرد؟ فەرمووی: کۆکەرەوەی زەکات بوو صالح (علیه السلام) ناردی، پیاوێکی لە تائیف بینی لەنێو مەڕوماڵاتەکەی، نزیکەی سەد مەڕی بینی کەم شیر بوون جگە لە دانەیەکیان نەبێت، ئەو پیاوە منداڵێکی بچووکی هەبوو دایکی نەبوو، شەوان شیری ئەو مەڕەی پێ دەدا، خاوەنی مەڕوماڵاتەکە وتی: تۆ کێی؟ وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ، ئەویش بەخێرهاتنی کرد و وتی: ئەوە مەڕوماڵاتەکەمە کامەت پێ خۆش بوو ببە، ئەویش تەماشای مەڕە شیردەرەکەی کرد، وتی: ئەوەم دەوێ، پیاوەکە وتی: ئەو منداڵەی کە دەیبینی هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی نییە جگە لە شیری ئەو مەڕە نەبێت، وتی: تۆ ئەگەر حەزت لە شیرە، ئەوە منیش حەزم لێیەتی، وتی: دوو مەڕ ببە لە جێگاکەی، ڕازی نەبوو، بەردەوام بۆی زیاد دەکرد تا کردی بە پێنج مەڕ کە شیریان کەم بوو لە جێگای مەڕە شیردەرەکە، بەڵام هەر ڕازی نەبوو، کاتێ کە ئەوەی بینی دەستی برد بۆ تیرەکەی و تیرێکی لێ دا و کوشتی، وتی: ئینجا وتی: نابێت هیچ کەس پێش من ئەم هەواڵە بگەیەنێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر خاوەن مەڕوماڵاتەکە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ دا، صالح وتی: ئەی خوایە: نەفرین بکە لە ئەبو ریغال، ئەی خوایە: نەفرین بکە لە ئەبو ریغال، سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە قەیس خۆش بە با نەچێت بۆ کۆکردنەوەی زەکات.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِخْرَاجِ الْهَرِمَةِ وَالْمَعِيبَةِ وَالتَّيْسِ فِي الصَّدَقَةِ بِغَيْرِ مَشِيئَةِ الْمُصَّدِّقِ وَإِبَاحَةِ أَخْذِهِنَّ إِذَا شَاءَ الْمُصَّدِّقُ وَأَرَادَ

**٢٢٧٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ لَمَّا اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ حِينَ وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ فَكَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: «وَلَا تَخْرُجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ، وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ، وَلَا تَيْسٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ الْمُصَّدِّقُ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لە دەرهێنانی حەیوانی پیر و پەککەوتە و کوێر و سابرێن لە دەرکردنی زەکات، بەبێ ویستی کۆکەرەوەی زەکات، وە دروستە وەربگیرێت ئەگەر کۆکەرەوەی زەکات ویستی لەسەر بوو

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر کاتێ کرا بە خەلیفە، نووسراوی بۆ کرد کاتێ ناردی بۆ یەمەن: بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەمانە فەرزی زەکاتن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەرزی کردووە، وە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، -دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- وە وتی: ئاژەڵی پیر و پەککەوتە و کوێر و عەیبدار و سابرێن وەرناگیرێ، مەگەر کۆکەرەوەی زەکات خۆی مەیلی لێی بێت.

## بَابُ إِبَاحَةِ دُعَاءِ الْإِمَامِ عَلَى مُخْرِجِ مُسِنِّ مَاشِيَتِهِ فِي الصَّدَقَةِ بِأَنْ لَا يُبَارَكَ لَهُ فِي مَاشِيَتِهِ وَدُعَائِهِ لِمُخْرِجِ أَفْضَلِ مَاشِيَتِهِ فِي الصَّدَقَةِ بِأَنْ يُبَارَكَ لَهُ فِي مَالِهِ

**٢٢٧٤-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ بَعَثَ إِلَى رَجُلٍ فَبَعَثَ إِلَيْهِ بِفَصِيلٍ مَخْلُولٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَاءَ مُصَدِّقُ اللَّهِ، وَمُصَدِّقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَعَثَ بِفَصِيلٍ مَخْلُولٍ اللَّهُمَّ لَا تُبَارِكْ لَهُ فِيهِ، وَلَا فِي إِبِلِهِ»، فَبَلَغَ ذَلِكَ الرَّجُلَ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ بِنَاقَةٍ مِنْ حُسْنِهَا وَجَمَالِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ وَفِي إِبِلِهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ڕێگە دراوە ئیمام بپاڕێتەوە و نزا بکات لەوکەسەی ئاژەڵێکی لەڕولات دەردەکات بە زەکات، بەوەی خوا فەڕوبەرەکەت نەخاتە نێو ئاژەڵەکانی، وە بپاڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی چاکترینی ئاژەڵەکانی بە زەکات دەردەکات بەوەی خوا فەڕوبەرەکەتی تێبخات بۆی**

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کۆکەرەوەی زەکاتی نارد بۆ لای پیاوێك ئەویش وشترێکی لەڕولاتی بۆی نارد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کۆکەرەوەی زەکات لە لایەن خوا و لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بە وشترێکی لەڕولاتەوە هاتەوە، خوایە فەڕوبەرەکەت نەخەیتە خۆی و وشترەکانیشی، دواتر هەواڵ گەیشتە ئەو پیاوە لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو، ئینجا وشترێکی نارد لە چاکترین و جوانترینی وشترەکانی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوایە فەڕوبەرەکەت بخەیتە خۆی و وشترەکانیشی.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ أَخْذِ الْمُصَدِّقِ خِيَارَ الْمَالِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٢٧٥**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: «إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَإِنْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ إِنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ، فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ؛ فَإِنَّهُ لَيْسَ لَهَا دُونَ اللَّهِ حِجَابٌ»[١].

**باسی سەرزەنشتکردن لەوەی کۆکەرەوەی زەکات چاکترینی ماڵ و سامان بە زەکات وەربگرێت، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) ڕوونکراوە**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: تۆ دەچیت بۆ لای میللەتێك لە خاوەنکتێبەکان، ئەگەر چوویت بۆ

---

(١) صحيح.

لایان بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتی بدەن بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد بەو شایەتمانە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا ﷻ پێنج نوێژی لەسەریان فەرز کردووە لە هەموو ڕۆژ و شەوێکدا، خۆ ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا زەکاتی لەسەریان فەرز کردووە لە ماڵ و سامانەکانیان، لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەگەڕێنرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیان کردی لەوەدا، دەخیلە وریا بە دەست نەبەی بۆ ماڵە زۆر چاکەکانیان، هەروەها لە نزای ستەملێکراو بترسە، چونکە لە نێوان ئەو و خوادا پەردە نییە.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا زَجَرَ عَنْ أَخْذِ كَرَائِمِ أَمْوَالِ مَنْ تَجِبُ عَلَيْهِ الصَّدَقَةُ فِي مَالِهِ إِذَا أَخَذَ الْمُصَدِّقُ كَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ بِغَيْرِ طِيبِ أَنْفُسِهِمْ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَبَاحَ أَخْذَ خِيَارِ أَمْوَالِهِمْ إِذَا طَابَتْ أَنْفُسُهُمْ بِإِعْطَائِهَا، وَدَعَا لِمُعْطِيهَا بِالْبَرَكَةِ فِي مَالِهِ وَفِي إِبِلِهِ.**

**٢٢٧٦-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ فَبَعَثَ بِنَاقَةٍ مِنْ حُسْنِهَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ وَفِي إِبِلِهِ[1].

**باسی فەرموودەیەکی ڕوونکەرەوە بۆ ئەو دەستەواژە نارۆونەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە سەرزەنشتی کردووە لە وەرگرتنی چاکترین ماڵی ئەو کەسەی زەکاتی لەسەر پێویست دەبێت، ئەگەر کۆکەرەوەی زەکات بەبێ پێخۆشبوونی خاوەنماڵ چاکترینی ماڵەکەی بە زەکات وەرگرت، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە وەرگرتنی چاکترینی ماڵەکانیان ئەگەر بە حەز و ئارەزووی خۆی ماڵەکەی دا، وە نزای خێر و بەرەکەتی بۆ بەخشەرەکە کرد لە ماڵ و سامان و وشترەکانیدا**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی وائیلی کوڕی حوجردا هاتووە: دواتر چاکترین وشتری نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: خوایە فەڕو بەرەکەت بخەیتە خۆی و وشترەکانیشی.

---

(١) صحيح.

**٢٢٧٧-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُصَدِّقًا عَلَى بَلِيٍّ وَعُذْرَةَ، وَجَمِيعِ بَنِي سَعْدِ بْنِ هُذَيْمٍ مِنْ قُضَاعَةَ قَالَ: فَصَدَّقْتُهُمْ حَتَّى مَرَرْتُ بِأَحَدِ رَجُلٍ مِنْهُمْ، وَكَانَ مَنْزِلُهُ وَبَلَدُهُ مِنْ أَقْرَبِ مَنَازِلِهِمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ قَالَ: فَلَمَّا جَمَعَ لِي مَالَهُ لَمْ أَجِدْ عَلَيْهِ فِيهِ إِلَّا ابْنَةَ مَخَاضٍ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَدِّ ابْنَةَ مَخَاضٍ، فَإِنَّهَا صَدَقَتُكَ، فَقَالَ: ذَاكَ مَا لَا لَبَنَ فِيهِ، وَلَا ظَهْرَ، وَايْمُ اللَّهِ مَا قَامَ فِي مَالِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَا رَسُولٌ لَهُ قَبْلَكَ، وَمَا كُنْتُ لِأُقْرِضَ اللَّهَ مِنْ مَالِي مَا لَا لَبَنَ فِيهِ، وَلَا ظَهْرَ، وَلَكِنْ خُذْ هَذِهِ نَاقَةً فَتِيَّةً عَظِيمَةً سَمِينَةً فَخُذْهَا، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِآخِذٍ مَا لَمْ أُؤْمَرْ بِهِ، وَهَذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مِنْكَ قَرِيبٌ، فَإِمَّا أَنْ تَأْتِيَهُ فَتَعْرِضَ عَلَيْهِ مَا عَرَضْتَ عَلَيَّ، فَافْعَلْ فَإِنْ قَبِلَهُ مِنْكَ قَبِلَهُ، وَإِنْ رَدَّ عَلَيْكَ رَدَّهُ قَالَ: فَإِنِّي فَاعِلٌ فَخَرَجَ مَعِي، وَخَرَجَ بِالنَّاقَةِ الَّتِي عَرَضَ عَلَيَّ حَتَّى قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَتَانِي رَسُولُكَ لِيَأْخُذَ صَدَقَةَ مَالِي، وَايْمُ اللَّهِ مَا قَامَ فِي مَالِي رَسُولُ اللَّهِ، وَلَا رَسُولٌ لَهُ قَطُّ قَبْلَهُ، فَجَمَعْتُ لَهُ مَالِي، فَزَعَمَ أَنَّ مَا عَلَيَّ فِيهِ ابْنَةَ مَخَاضٍ، وَذَلِكَ مَا لَا لَبَنَ فِيهِ، وَلَا ظَهْرَ، وَقَدْ عَرَضْتُ عَلَيْهِ نَاقَةً فَتِيَّةً عَظِيمَةً سَمِينَةً لِيَأْخُذَهَا، فَأَبَى عَلَيَّ، وَهَا هِيَ ذِهْ قَدْ جِئْتُكَ بِهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَخُذْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ذَلِكَ الَّذِي عَلَيْكَ، وَإِنْ تَطَوَّعْتَ بِخَيْرٍ، آجَرَكَ اللَّهُ فِيهِ وَقَبِلْنَاهُ مِنْكَ، قَالَ: فَهَا هِيَ ذِهْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ جِئْتُكَ بِهَا فَخُذْهَا قَالَ: فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَبْضِهَا وَدَعَا لَهُ فِي مَالِهِ بِالْبَرَكَةِ[1].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی کردم بۆ وەرگرتنی زەکات لە (بَلِيّ) و (عُذْرَة)، (بَلِيّ: هۆزێکی گەورەیە دەدرێتە پاڵ بەلی کوڕی عەمری کوڕی ئیکافی کوڕی قوزاعە) و (عُذْرَة) دەدرێتە پاڵ عوزرەی کوڕی سەعدی کوڕی قوزاعە)، وە هەموو نەوەکانی سەعدی کوڕی هودەیم لە هۆزی قوزاعەن، وتی: زەکاتم لێ وەرگرتن تا گەیشتم بە پیاوێکیان، ماڵەکەی و لادێکەی نزیکترینی شوێنەکان بوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ و شاری مەدینەوە، وتی: کاتێ ماڵەکەی کۆ کردەوە بۆم هیچم نەبینییەوە بیدات بە زەکات جگە لە فەرخە وشترێکی مێی یەکساڵە نەبێت، وتی: پێم وت: بێگومان ئەوە زەکاتی تۆیە، وتی: ئەوە هیچ شیری نییە و بۆ سواریش ناشێت، سوێند بە خوا پێش تۆ نە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە هەستاوە نە نێردراوەکەی، منیش هەرگیز شتێك بە قەرز نادەم بە خوا نە شیری بێت و نە بۆ سواری بشێت، بەڵکوو ئەو وشترە گەورە و قەڵەوە ببە، وتم: من شتێك نابەم کە فەرمانم پێ نەکراوە ببیەم، ئەوە

---

(١) إسناده حسن.

پێغەمبەری خوایە ﷺ لێتەوە نزیکە، ئەگەر دەتەوێ بچۆ بۆ لای ئەوەی بۆ بخەرە ڕوو وەکوو چۆن بۆ من خستتە ڕوو، ئەگەر لێتی وەرگرت ئەوە وەریدەگرێ، ئەگەر وەریشی نەگرت ڕەتی دەکاتەوە، وتی: من ئەوە دەکەم لەگەڵم هات، ئەو وشترەی لەگەڵ خۆی هێنا کە خستبوویە ڕوو بۆم تا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، نێردراوەکەت هات بۆ لام بۆ ئەوەی زەکاتی ماڵەکەم وەربگرێ، سوێند بە خوا پێش ئەو نە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە هەستاوە نە نێردراوی، ماڵەکەم بۆی کۆ کردەوە، پێی وا بوو ئەوەی لەسەرم پێویستە بیدەم فەرخە وشترێکی مێی یەکساڵەیە، ئەویش نە شیری هەیە و نە بۆ سواری دەشێت، من وشترێکی گەورەی قەڵەوم بۆی خستە ڕوو بۆ ئەوەی بیبات، ڕازی نەبوو، ئەویش ئەم وشترەیە بۆتم هێناوە ئەی پێغەمبەری خوا لێمی وەربگرە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەیانت لەسەر واجبە ئەگەر زیاتریش بدەیت ئەوا خوای گەورە لەسەری پاداشتت دەداتەوە و ئێمەش لێتی وەردەگرین، وتی: ئەوەیە هێناومە ئەی پێغەمبەری خوا لێمی وەربگرە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لێی وەربگیرێ و نزای فەڕوبەرەکەتی کرد بۆ ماڵەکەی.

**٢٢٧٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عُمَارَةَ بْنَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ قَالَ: فَضَرَبَ الدَّهْرُ مَنْ ضَرَبَهُ حَتَّى إِذَا كَانَتْ وِلَايَةُ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، وَأَمَّرَ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ عَلَى الْمَدِينَةِ، بَعَثَنِي مُصَدِّقًا عَلَى بَلِيٍّ وَعُذْرَةَ، وَجَمِيعِ بَنِي سَعْدِ بْنِ هُذَيْمٍ مِنْ قُضَاعَةَ قَالَ: فَمَرَرْتُ بِذَلِكَ الرَّجُلِ، وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ فِي مَالِهِ فَصَدَقْتُهُ بِثَلَاثِينَ حِقَّةً فِيهَا فَحْلُهَا عَلَى أَلْفِ بَعِيرٍ وَخَمْسِمِائَةِ بَعِيرٍ. قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَنَحْنُ نَرَى أَنَّ عُمَارَةَ لَمْ يَأْخُذْ مَعَهَا فَحْلَهَا إِلَّا وَهِيَ سَنَةٌ إِذَا بَلَغَتْ صَدَقَةُ الرَّجُلِ ثَلَاثِينَ حِقَّةً ضَمَّ إِلَيْهَا فَحْلَهَا[1].

واتە: یەحیای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، عومارەی کوڕی عەمری کوڕی حەزم دەڵێ: ساڵ هات و ڕۆیی تا سەردەمی دەسەڵاتی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان هات ﷺ، وە مەڕوانی کوڕی حەکەم کە دەسەڵاتداری مەدینە بوو، ڕایسپاردم زەکاتی (بَلِيّ) و (عُذْرَةَ) وە هەموو نەوەکانی سەعدی کوڕی هودەیم لە

---

(١) إسناده حسن.

قوزاعە کۆ بکەمەوە، وتی: تێپەڕیم بەلای ئەو پیاوەدا، (کە چاکترین وشتری بە زەکات دا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش نزای بۆ کرد خوا فەڕوبەرەکەت بخاتە نێو ماڵەکەیەوە) پیاوێکی گەورەی بەساڵاچوو بوو زەکاتی ماڵەکەی بریتی بوو لە سی وشتری مێی سێساڵە نێرینەکەیشی لەگەڵدا بوو، لە کۆی هەزار و پێنج سەد وشتر.

ئیبنو ئیسحاق وتی: ئێمە پێمان وایە عومارە نێرینەکەی لەگەڵ خۆی نەدەهێنا مەگەر ساڵێك بووایە، ئەگەر زەکاتی کەسێك لە ساڵێکدا بگەیشتایەتە سی وشتری مێی سێساڵە ئەوە بەرانەکەی لەگەڵدا وەردەگرت.

**بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْجَمْعِ بَيْنَ الْمُتَفَرِّقِ وَالتَّفْرِيقِ بَيْنَ الْمُجْتَمِعِ فِي السَّوَائِمِ خِيفَةَ الصَّدَقَةِ وَتَرَاجُعِ الْخَلِيطَيْنِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ فِيمَا أَخَذَ الْمُصَدِّقُ مَاشِيَتَهُمَا جَمِيعًا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخَلِيطَيْنِ فِي الْمَاشِيَةِ فِيمَا يَجِبُ عَلَيْهِمَا مِنَ الصَّدَقَةِ كَالْمَالِكِ الْوَاحِدِ، إِذْ لَوْ كَانَا خَلِيطَيْنِ كَالْمَالِكَيْنِ إِذًا لَمْ يَكُونَا خَلِيطَيْنِ لَمْ يَكُنْ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا أَنْ يَرْجِعَ عَلَى صَاحِبِهِ بِشَيْءٍ مِمَّا أُخِذَ مِنْهُ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخَلِيطَيْنِ قَدْ يَكُونَانِ وَإِنْ عَرَفَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَاشِيَتَهُ مِنْ مَاشِيَةِ خَلِيطِهِ، كَانَتِ الْمَاشِيَةُ بَيْنَهُمَا مُشْتَرَكَةً، فَمَا أَخَذَ الْمُصَدِّقُ مِنْ مَاشِيَتِهِمَا مِنَ الصَّدَقَةِ فَمِنْ مَالِهِمَا أَخَذَهَا كَشِرْكَتِهِمَا فِي أَصْلِ الْمَالِ، وَلَا مَعْنَى لِرُجُوعِ أَحَدِهِمَا عَلَى صَاحِبِهِ، إِذْ مَا أَخَذَ الْمُصَدِّقُ فَمِنْ مَالِهِمَا جَمِيعًا أَخَذَهُ، لَا مِنْ مَالِ أَحَدِهِمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى فِي قِصَّةِ دَاوُدَ وَدُخُولِ الْخَصْمَيْنِ عَلَيْهِ: قَالَ أَحَدُهُمَا: ﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً ﴿٢٣﴾﴾ص، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴿٢٤﴾﴾ص، فَأَوْقَعَ اسْمَ الْخَلِيطَيْنِ عَلَى الْخَصْمَيْنِ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَحَدُ الْخَصْمَيْنِ فِي الدَّعْوَى أَنَّ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمُدَّعِي قَبْلَهُ شَرِكَةً فِي الْغَنَمِ، إِنَّمَا ادَّعَى أَنَّ لَهُ نَعْجَةً وَاحِدَةً وَلِصَاحِبِهِ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ**

٢٢٧٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، لَمَّا اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ، فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ، وَقَالُوا: لَا يَجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ، فَهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ[1].

---

(١) صحيح.

باسی سەرزەنشتکردن لە کۆکردنەوەی ئاژەڵی جیا و جیاکردنەوەی ئاژەڵی تێکەڵ لە ترسی ئەوەی زەکات نەدات، هەروەها ئەو دووانەی کە ئاژەڵیان تێکەڵە زەکاتەکە لە نێوانیاندا بەیەکسانی دابەش دەکەن لەوەی کۆکەرەوەی زەکات لە ئاژەڵەکانیان بردوویەتی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئاژەڵی تێکەڵکراو لەلایەن دوو کەسەوە وەك ماڵی یەك کەس تەماشا دەکرێت لە وەرگرتنی زەکات، چونکە ئەگەر ئاژەڵی تێکەڵکراو وەکوو ماڵی دوو کەس تەماشا بکرایە، ئەوە ئەوی دیکەیان کاتێ یەکێك لە ئاژەڵەکانی کۆکەرەوەی زەکات دەیبات مافی ئەوەی نەبوو بەشەکەی خۆی لە هاوەڵەکەی وەربگرێت، جا کۆکەرەوەی زەکات لە ئاژەڵی هەر کامەیان زەکات ببات ئەوە لە ماڵی هەردووکیانی بردووە ئەگەرچی هەردووکیان ماڵی خۆیان بناسنەوە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاژەڵی تێکەڵکراو زەکاتی لەسەر هەردووکیانە، ئەگەرچی هەریەکە و ئاژەڵەکانی خۆی بناسێتەوە لە ئاژەڵی هاوڕێیەکەی، ئاژەڵەکان لە نێوان هەردووکیاندا هاوبەشە، جا کۆکەرەوەی زەکات چەن دانە لە ئاژەڵەکانیان ببات وەکوو زەکات ئەوە هەردووکیان تیایدا بەشدارن، جا ئەگەر کۆکەرەوەی زەکات، زەکاتی لە ماڵی هەردووکیان دەرهێنا، نابێ یەکێکیان دەستبەرداری هاوڕێیەکەی بێت، چونکە کۆکەرەوەی زەکات لە ماڵی هەردووکیان زەکاتی دەرهێناوە نەك لە ماڵی یەکێکیان، خوا ﷻ لە سەرگوزەشتەی داوودو (علیه السلام) هاتنەژوورەوەی دوو پیاوە ناکۆکەکە بۆ لای، بە یەکێکیانی فەرموو: ﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسۡعٌ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ ٢٣﴾، تا فەرموودەکەی: ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ٢٤﴾، جا ناوی تێکەڵکردنی ماڵی بەسەر هەردوو دژیەکەکەدا سەپاندووە، یەکێك لەو دووانە کە ناکۆك بوون لە سکاڵاکەیدا باسی ئەوەی نەکرد پێشتر لە نێوانیاندا شەریکی هەبووە لە مەڕوماڵاتەکەدا، بەڵکوو تەنها باسی ئەوەی کرد ئەو یەك مەڕی هەیە هاوەڵەکەیشی نەوەد و نۆ

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ کاتێ کرا بە خەلیفە، نووسراوی بۆ کرد: بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەمانە فەڕزی زەکاتن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەڕزی کردووە، وە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووە بە پێغەمبەرەکەی، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: وە ئاژەڵی جیا

تێکەڵ ناکرێت و ئاژەڵی تێکەڵیش جیا ناکرێتەوە لە ترسی زەکاتدان، هەر زەکاتێ وەرگیرا لە دوو کەس ئاژەڵەکانیان تێکەڵن، ئەوە دابەشی دەکەن لە نێوان خۆیاندا بەیەکسانی (واتە: بەگوێرەی ژمارەی ئاژەڵەکان).

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْجَلْبِ عِنْدَ أَخْذِ الصَّدَقَةِ مِنَ الْمَوَاشِي، وَالْأَمْرِ بِأَخْذِ صَدَقَةِ الْمَوَاشِي فِي دِيَارِ مَالِكِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يُؤْمَرُوا بِجَلْبِ الْمَوَاشِي إِلَى السَّاعِي لِيَأْخُذَ صَدَقَتَهَا

**٢٢٨٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، وَهُوَ يَقُولُ: «أَيُّهَا النَّاسُ مَا كَانَ مِنْ حِلْفٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَإِنَّ الْإِسْلَامَ لَمْ يَزِدْهُ إِلَّا شِدَّةً، وَلَا حِلْفَ فِي الْإِسْلَامِ، الْمُسْلِمُونَ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ يُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَيُرَدُّ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ، وَيُرَدُّ سَرَايَاهُمْ، عَلَى قَعْدِهِمْ لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، دِيَةُ الْكَافِرِ نِصْفُ دِيَةِ الْمُؤْمِنِ، لَا جَلَبَ وَلَا جَنَبَ، وَلَا تُؤْخَذُ صَدَقَاتُهُمْ إِلَّا فِي دِيَارِهِمْ». قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْتُبُ عَنْكَ مَا سَمِعْتُ قَالَ: «نَعَمْ»، قُلْتُ: فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَى؟ قَالَ: «نَعَمْ، فَإِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لِي أَنْ أَقُولَ فِي ذَلِكَ إِلَّا حَقًّا»[1].

## باسی قەدەغەکردن لە (الْجَلَبُ) لە کاتی وەرگرتنی زەکاتی مەڕوماڵات، وە فەرمانکردن بە وەرگرتنی زەکاتی مەڕوماڵات لە جێگای خاوەنەکەی، بەبێ ئەوەی فەرمانیان پێ بکرێت بە هێنانی مەڕوماڵاتەکانیان بۆ لای کۆکەرەوەی زەکات تا زەکاتەکەیان لێ وەربگرێ

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ وتی: لە ساڵی ئازادکردنی مەککە گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر هاوپەیمانییەك لە سەردەمی نەفامی کراوە، (وەك بەهێزکردنی پەیوەندی خزمایەتی و کاری چاك و برایەتی، جگە لە هاوپەیمانی لەسەر کوشتنی یەکدی و ستەمکردن) ئەوە ئایینی ئیسلام بەهێزتر و پتەوتری کردووە، وە هیچ هاوپەیمانییەك لە ئیسلامدا نییە، مسوڵمانان یەکدەستن بەرانبەر غەیری خۆیان، لاوازترینیان لە پێدانی ئەمان وەکوو بەرزترینیان وایە، ( واتە: چی پیاوێکی ئاسایی ئەمان بدات چی پیاوێکی بەناوبانگ ئەمان بدات

---

(١) إسناده حسن.

وەکوو یەکە)، وە ئەوانەیشی لەنێو سوپادا لە پشتەوەی مسوڵمانان پشتیوانییان دەکەن دەبێ لە دەستکەوت بەشیان بدرێ، بڕوادار بە بێباوەڕ ناکوژرێتەوە، خوێنبایی بێباوەڕ نیوەی خوێنبایی بڕوادارە، نە (جَلَبُ) و نە (جَنَبَ) لە ئیسلامدا دروست نییە، زەکاتی بڕواداران وەرناگیرێت لە وڵاتی خۆیاندا نەبێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی گوێم لێ بوو کە فەرمووت بینووسمەوە، فەرمووی: بەڵێ، وتم: لە کاتی توڕەیی و ئاساییشدا؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڕاستی نابێت من قسە بکەم جگە لە حەق نەبێت.

(ڕوونکردنەوە: (الْجَلَبُ) واتە: با کۆکەرەوەی زەکات لە جێگایەك دانەنیشێت و خەڵکیش ئاژەڵی زەکات بهێنن بۆی، بەڵکوو با خۆی بچێت بۆ لایان، بۆ ئەوەی خاوەنئاژەڵەکان تووشی ناڕەحەتی نەبن، وە (الْجَنَبُ) واتە: با خاوەنماڵ ئاژەڵەکانی دوور نەخاتەوە بەجۆرێ قورس بێت لەسەر کۆکەرەوەی زەکات بگات پێیان).

## بَابُ أَخْذِ الْغَنَمِ وَالدَّرَاهِمِ فِيمَا بَيْنَ أَسْنَانِ الْإِبِلِ الَّتِي يَجِبُ فِي الصَّدَقَةِ إِذَا لَمْ يُوجَدِ السِّنُّ الْوَاجِبَةُ فِي الْإِبِلِ، وَالْبَيَانِ ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ بَيْنَ السِّنَّيْنِ قَدْرَ قِيمَةِ مَا بَيْنَهُمَا، وَهَذَا الْقَوْلُ إِغْفَالٌ مِنْ قَائِلِهِ، أَوْ هُوَ خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ وَكُلُّ قَوْلٍ خِلَافَ سُنَّتِهِ فَمَرْدُودٌ غَيْرُ مَقْبُولٍ

٢٢٨١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَتَبَ لَهُ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالُوا: فِي الْحَدِيثِ مِنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْجَذَعَةِ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ، وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ، وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِذَا اسْتَيْسَرَتَا أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ حِقَّةٌ، وَعِنْدَهُ جَذَعَةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْجَذَعَةُ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ الْحِقَّةَ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلَّا ابْنَةُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ ابْنَةُ لَبُونٍ، وَيُعْطَى مَعَهَا شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ ابْنَةُ لَبُونٍ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ، وَيُعْطِيهِ مَعَهَا الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ ابْنَةُ لَبُونٍ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ مَخَاضٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ ابْنَةُ مَخَاضٍ، وَيُعْطَى مَعَهَا عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ ابْنَةُ مَخَاضٍ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ ابْنَةُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ

لَبُونٍ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ ابْنَةُ مَخَاضٍ عَلَى وَجْهِهَا، وَعِنْدَهُ ابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ، وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ»[1].

**باسی وەرگرتنی مەڕ و پارە وەکوو باقی لە نێوان تەمەنی وشترەکان کە واجب دەبێت لە زەکاتدا، ئەگەر وشتری دیاریکراو بەپێی تەمەن بەردەست نەبوو لای خاوەنماڵ، وە ڕوونکردنەوە دژی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات نێوان دوو سەر کە تەمەنیان جیاوازە قیمەتی زیادەکەی تەمەنی دەدرێ نەك مەڕ و شتی دیکە، ئەم وتەیە لە بێئاگاییەوەیە لەلایەن خاوەنەکەی، یان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، وە هەر وتەیەك پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت ئەوە ڕەتکراوەیە و وەرنەگیراوە**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکری صدیق (کاتێ کرا بە خەلیفە)، نووسراوی بۆ کرد: بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەمانە فەڕزی زەکاتن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەڕزی کردووە، وە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووە بە پێغەمبەرەکەی، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتیان: لە فەرموودەکەدا هاتووە: وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی چوارساڵەی لەسەر بوو، بەڵام ئەو وشترەی لەلا دەست نەدەکەوت، وشترێکی مێی سێساڵەی لەلا هەبوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ، لەگەڵ ئەو وشترەدا دوو بەرخی یەکساڵەش بە زەکات دەدات ئەگەر لەبەردەستی بوو، یان بیست درهەم، هەر کەسیش زەکاتی وشترێکی مێی سێساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام ئەو وشترەی لەلا نەبوو، لە بەرانبەردا وشترێکی مێی چوارساڵەی لەلا بوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ و ئەو کەسەی وەریگرتووە بیست درهەم یان دوو بەرخی یەکساڵەی پێ دەدات، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی دووساڵەی لەسەر پێویست بوو، ئەو وشترەی لەلا نەبوو جگە لە وشترێکی مێی سێساڵە نەبێت، ئەوە لێی وەردەگیرێ لەگەڵ ئەوەشدا کۆکەرەوەی زەکات بیست درهەم یان دوو بەرخی مێی یەکساڵەی پێ دەدات، هەر کەسیش زەکاتی وشترێکی مێی دووساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام هیچی لەلا نەبوو جگە لە فەرخە وشترێکی مێی یەکساڵە،

---

(١) صحيح.

ئەوە لێی وەردەگیرێ، وە ئەو کەسەی زەکاتەکەی وەرگرتووە بیست درهەم یان دوو بەرخی مێی یەکساڵە دەدات، وە هەر کەس زەکاتی وشترێکی مێی یەکساڵەی لەسەر پێویست بوو، بەڵام هیچی لەلا نەبوو جگە لە وشترێکی مێی دووساڵە، ئەوە لێی وەردەگیرێ و کۆکەرەوەی زەکاتیش بیست درهەم یان دوو بەرخی مێی یەکساڵەی پێ دەدات، وە هەر کەس وشترێکی مێی یەکساڵەی لەلا نەبوو، وە وشترێکی نێری دووساڵەی لەلا بوو، ئەوە لێی وەردەگیرێ و هیچی لەگەڵدا پێ نادرێتەوە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِسِمَةِ إِبِلِ الصَّدَقَةِ إِذَا قُبِضَتْ فِي الصَّدَقَةِ لِيَعْرِفَ الْوَالِي وَالرَّعِيَّةُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ مِنْ غَيْرِهَا لِيَقْسِمَهَا عَلَى أَهْلِ سُهْمَانِ الصَّدَقَةِ دُونَ غَيْرِهَا، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ

**٢٢٨٢-** عَنْ عِكْرَاشِ بْنِ ذُؤَيْبٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي بَنُو مُرَّةَ بْنُ عُبَيْدٍ بِصَدَقَاتِ أَمْوَالِهِمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَدِمْتُ عَلَيْهِ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدْتُهُ جَالِساً بَيْنَ الْمُهَاجِرِينَ، وَالْأَنْصَارِ، فَقَدِمْتُ عَلَيْهِ بِإِبِلٍ كَأَنَّهَا عُذُوقُ الْأَرْطَأَ، فَقَالَ: مَنِ الرَّجُلِ؟ فَقُلْتُ: عِكْرَاشُ بْنُ ذُؤَيْبٍ قَالَ: ارْفَعْ فِي النَّسَبِ، قُلْتُ: ابْنُ حَرْقُوصِ بْنِ خَوْرَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ النَّزَّالِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَهَذِهِ صَدَقَاتُ بَنِي مُرَّةَ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «هَذِهِ إِبِلُ قَوْمِي، هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِي، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا أَنْ تُوسَمَ بِمِيْسَمِ إِبِلِ الصَّدَقَةِ، وَتُضَمَّ إِلَيْهَا، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي، فَانْطَلَقَ بِي إِلَى بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ»[1].

## باسی فەرمانکردن بە نیشانەکردن یان دیاریکردنی وشتری زەکات ئەگەر بە زەکات وەرگیرا، بۆ ئەوەی فەرمانڕەوا و خەڵکەکەی وشتری زەکات بناسنەوە لە غەیری وشتری زەکات، وە بۆ ئەوەی دابەشی بکات بەسەر ئەوانەی پشکیان بۆ هەیە جگە لەوانەی کە پشکیان بۆ نییە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێ

واتە: عیکراشی کوڕی زوئەیب ﷺ دەڵێ: نەوەکانی مورەی کوڕی عوبەید زەکاتی ماڵ و سامانەکانیان بە مندا نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش لە مەدینە چوومە خزمەتی بینیم دانیشتبوو لە نێوان موهاجیر و ئەنصارەکاندا، بە کۆمەڵە وشترێکەوە هاتمە خزمەتی هەر وەکوو ڕیشەی درەخت سوور و جوان بوون، فەرمووی: ئەوە پیاوە کێیە؟ وتم: عیکراشی کوڕی زوئەیب، فەرمووی: باسی ڕەچەڵەکی خۆت بکە،

---

(١) إسناده ضعيف.

وتم: کوڕی حەڕقوصی کوڕی خەوڕەی کوڕی عەمری کوڕی نەزالی کوڕی موڕەی کوڕی عوبەید، ئەمەش زەکاتی نەوەکانی موڕەی کوڕی عوبەیدە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بزەیەکی پێکەنینی کرد، پاشان فەرمووی: ئەوە وشتری کەسوکارەکەی منە، ئەوە زەکاتی کەسوکارەکەی منە، پاشان فەرمانی کرد وشتری زەکات بە ئاسن دیاری بکرێ (واتە: داخ بکرێ) و بخرێتە نێو وشترەکانی دیکە، پاشان دەستمی گرت و بردمی بۆ ماڵی ئوممو سەلەمە، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

## بَابُ سِمَةِ غَنَمِ الصَّدَقَةِ إِذَا قُبِضَتْ

**٢٢٨٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: حِينَ وَلَدَتْ أُمِّي انْطَلَقْتُ بِالصَّبِيِّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ لِيُحَنِّكَهُ، فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ فِي مِرْبَدٍ لَهُ، يَسِمُ غَنَمًا، قَالَ شُعْبَةُ: أَكْثَرُ عِلْمِي أَنَّهُ قَالَ: فِي آذَانِهَا[1].

## باسی دیاریکردنی (واتە: داخکردنی) مەڕی زەکات کاتێ وەردەگیرێ

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ دایکم منداڵی بوو، منداڵەکەم برد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی گۆشی بکات، پێغەمبەر ﷺ لەنێو پەچای مەڕدا بوو ئەو مەڕانەی دیاری دەکرد (کە هی زەکات بوون لە فەتحی مەککە بۆی هاتبوو). شوعبە وتی: پێم وایە ئەنەس وتی: گوێیانی دیاری دەکرد (واتە: داخ دەکرد بۆ ئەوەی بناسرێنەوە).

## بَابُ إِسْقَاطِ الصَّدَقَةِ - صَدَقَةِ الْمَالِ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ - بِذِكْرِ لَفْظٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُسْتَقْصًى فِي الرَّقِيقِ خَاصَّةً

**٢٢٨٤-** عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَدْ عَفَوْتُ لَكُمْ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَأَدُّوا زَكَاةَ الْأَمْوَالِ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا». قَالَ: وَقَالَ عَلِيٌّ: فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ دِينَارًا، وَفِي كُلِّ عِشْرِينَ دِينَارًا نِصْفُ دِينَارٍ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## باسی هەڵگرتنی زەکاتی ئەسپ و کۆیلە بە باسکردنی دەستەواژەیەکی کورتکراوە نەك شیکراوە بەتایبەت لە کۆیلەدا

واتە: عاصمی کوڕی زەمرە دەگێڕێتەوە، لە عەلییەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لێتان خۆش بووم لە دەرکردنی زەکاتی ئەسپ و کۆیلە، بەڵکوو زەکاتی ماڵ و سامانەکانتان دەربکەن لە هەموو چل درهەمێکدا، وتی: عەلی وتی: لە هەموو چل دینارێکدا، وە لە هەموو بیست دینارێك نیو دینار زەکات دەدرێت.

**٢٢٨٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَرْفَعُهُ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ، وَلَا فَرَسِهِ صَدَقَةٌ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ ڕەفعی کردووە: زەکات لەسەر مسوڵمان نییە نە لە کۆیلە و نە لە ئەسپەکەیدا.

**٢٢٨٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَرْفَعُهُ، لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ، وَلَا عَبْدِهِ صَدَقَةٌ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ ڕەفعی کردووە: زەکات لەسەر مسوڵمان نییە نە لە ئەسپەکەی و نە لە کۆیلەکەیدا.

**٢٢٨٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَلَمْ يَرْفَعْهُ يَزِيدُ قَالَ: لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ، وَلَا عَبْدِهِ صَدَقَةٌ[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، یەزید (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) ڕەفعی نەکردووە: زەکات لەسەر مسوڵمان نییە نە لە ئەسپەکەی و نە لە کۆیلەیدا.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُسْتَقْصِي لِلَفْظَةِ الْمُخْتَصَرَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي صَدَقَةِ الرَّقِيقِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا عَفَا عَنِ الصَّدَقَةِ فِي الرَّقِيقِ صَدَقَةِ الْأَمْوَالِ دُونَ صَدَقَةِ الْفِطْرِ

**٢٢٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ، وَلَا فَرَسِهِ صَدَقَةٌ إِلَّا صَدَقَةَ الْفِطْرِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح موقوفا وقد صح مرفوعا.

(٤) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك ڕوونكەرەوەی ئەو دەستەواژە كورتەیە كە باسمان كرد دەربارەی زەكاتی كۆیلە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە زەكاتی كۆیلە خۆشبووە نەك زەكاتی سەرفیترە، (واتە: دەبێ خاوەنەكەی زەكاتی سەرفیترەكەی بدات)**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەکات لەسەر مسوڵمان نییە نە لە کۆیلەی و نە لە ئەسپەکەیدا جگە لە زەکاتی سەرفیترەی (کۆیلەکەی).

**٢٢٨٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لَيْسَ فِي الْعَبْدِ صَدَقَةٌ إِلَّا صَدَقَةَ الْفِطْرِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: لە کۆیلەدا زەکات نییە جگە لە زەکاتی سەرفیترە.

**بَابُ ذِكْرِ السُّنَّةِ الدَّالَّةِ عَلَى مَعْنَى أَخْذِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ الصَّدَقَةَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا أَخَذَهَا مِنْهُمْ إِذْ جَادَتْ أَنْفُسُهُمْ وَكَانَتْ بِإِعْطَائِهَا مُتَطَوِّعِينَ بِالدَّفْعِ، لَا أَنَّ الصَّدَقَةَ كَانَتْ وَاجِبَةً عَلَى الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، إِذِ الْفَارُوقُ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ الْقَوْمَ الَّذِينَ أَخَذَ مِنْهُمْ صَدَقَةَ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَالصِّدِّيقَ ﷺ قَبْلَهُ لَمْ يَأْخُذَا صَدَقَةَ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ**

**٢٢٩٠-** عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُضَرِّبٍ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ إِلَى عُمَرَ ﷺ، فَقَالُوا: إِنَّا قَدْ أَصَبْنَا أَمْوَالًا: خَيْلًا، وَرَقِيقًا، نُحِبُّ أَنْ يَكُونَ لَنَا فِيهَا زَكَاةٌ وَطَهُورٌ، فَقَالَ: مَا فَعَلَهُ صَاحِبَايَ قَبْلِي، فَأَفْعَلُهُ، فَاسْتَشَارَ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَفِيهِمْ عَلِيٌّ، فَقَالَ عَلِيٌّ: هُوَ حَسَنٌ إِنْ لَمْ تَكُنْ جِزْيَةً يُؤْخَذُونَ بِهَا رَاتِبَةً[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَسُنَّةُ النَّبِيِّ ﷺ فِي أَنْ لَيْسَ فِي أَرْبَعٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَقَوْلُهُ فِي الْغَنَمِ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ وَاحِدَةٌ، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، وَفِي الرِّقَّةِ رُبْعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلَّا تِسْعِينَ وَمِائَةٍ، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

رَبُّهَا، دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ صَاحِبَ الْمَالِ إِنْ أَعْطَى صَدَقَةً مِنْ مَالِهِ، وَإِنْ كَانَتِ الصَّدَقَةُ غَيْرَ وَاجِبَةٍ فِي مَالِهِ، فَجَائِزٌ لِلْإِمَامِ أَخْذُهَا إِذَا طَابَتْ نَفْسُ الْمُعْطِي، وَكَذَلِكَ الْفَارُوقُ لَمَّا أَعْلَمَ الْقَوْمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، وَالصِّدِّيقَ قَبْلَهُ لَمْ يَأْخُذَا صَدَقَةَ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَطَابَتْ أَنْفُسُهُمْ بِإِعْطَاءِ الصَّدَقَةِ مِنَ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ مُتَطَوِّعِينَ جَازَ لِلْفَارُوقِ أَخْذُ الصَّدَقَةِ مِنْهُمْ كَمَا أَبَاحَ الْمُصْطَفَى ﷺ أَخْذَ الصَّدَقَةِ مِمَّا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ، وَدُونَ أَرْبَعِينَ مِنَ الْغَنَمِ، وَدُونَ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ مِنَ الْوَرِقِ.

**باسی ئەو سوننەتەی کە بەڵگەیە لەسەر مانای ئەوەی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ زەکاتی لە ئەسپ و کۆیلە وەرگرت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بۆیە زەکاتی لێ وەرگرتن، چونکە خۆیان هاتن و پێیان خۆش بوو ئەوە بدەن، نەك بەو مانایەی زەکاتی ئەسپ و کۆیلە لەسەریان واجب بێت، چونکە عومەر ﷺ ئەو خەڵکەی ئاگادار کردەوە کە زەکاتی ئەسپ و کۆیلەی لێ وەرگرتن، پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ﷺ پێش ئەو زەکاتی ئەسپ و کۆیلەیان وەرنەگرتووە**

واتە: حارسی کوڕی موزەیب دەڵێ: خەڵکێك لە شامەوە هاتن بۆ لای عومەر ﷺ وتیان: ئێمە ماڵ و سامانێکی زۆرمان دەست کەوتووە: لە ئەسپ و کۆیلە، حەز دەکەین زەکاتی دەربکەین، وتی: دوو هاوڕێیەکەم پێش من ئەوەیان نەکردووە (واتە: پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر) دواتر ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی موحەممەد ﷺ کرد، عەلیشیان تێدا بوو، عەلی وتی: ئەوە کارێکی چاکە ئەگەر سەرانەیەك نەبێت لێیان وەربگیرێ.

ئەبو بەکر دەڵێ: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەوشێوە بووە لە چوار وشتردا زەکات نییە مەگەر خاوەنەکەی بە ویستی خۆی بیدات، وە فەرموودەکەی دەربارەی زەکاتی مەڕوماڵات: ئەگەر مەڕوماڵاتی کەسێك یەك سەر کەمتر بوو لە چل ئەوە زەکاتی ناکەوێ مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات، وە لە زیودا چواریەکی دەیەك زەکات دەدات، (کە نیو مسقاڵ دەکات) ئەگەر تەنها سەد و نەوەد درهەمی هەبوو ئەوە زەکاتی لەسەر نییە مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بێگومان خاوەنماڵ ئەگەر زەکاتێك بدات لە ماڵەکەی ئەگەرچی ئەو زەکاتە واجب نەبوو لە ماڵ و سامانەکەی، ئەوە دروستە بۆ ئیمام لێی وەربگرێت ئەگەر بەحەز و ئارەزووی خۆی زەکاتەکەی دا، بەهەمان شێوە عومەر کاتێ خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە

پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر زەکاتی ئەسپ و کۆیلەیان وەرنەگرت، ئەوان خۆیان پێیان خۆش بوو زەکاتی ئەسپ و کۆیلەکانیان بدەن، بۆیە دروستە بۆ عومەر زەکاتەکەیان لێ وەربگرێ، هەر وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دا بە وەرگرتنی زەکات لەخوار پێنج وشترەوە، وە لەخوار چل سەر مەڕومالآت و لەخوار دوو سەد درهەم لە زیو.

## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ الصَّدَقَةِ عَنِ الْحُمُرِ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى إِسْقَاطِهَا عَنِ الْخَيْلِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّمَا أَمَرَ نَبِيَّهُ ﷺ بِأَخْذِ الصَّدَقَةِ مِنْ بَعْضِ أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ، لَا مِنْ جَمِيعِ أَمْوَالِهِمْ فِي قَوْلِهِ ﷻ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴿١٠٣﴾﴾ التوبة، إِذِ اسْمُ الْمَالِ وَاقِعٌ عَلَى الْخَيْلِ وَالْحَمِيرِ جَمِيعًا، فَبَيَّنَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، الَّذِي وَلَّاهُ اللَّهُ بَيَانَ مَا أَنْزَلَ عَلَيْهِ، أَنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَمَرَهُ بِأَخْذِ الصَّدَقَةِ مِنْ بَعْضِ أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ لَا مِنْ جَمِيعِهَا

**٢٢٩١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ لَهِ مَالٌ لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهُ إِلَّا جُمِعَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُحْمَى عَلَيْهِ صَفَائِحُ فِي جَهَنَّمَ، وَكُوِيَ بِهَا جَنْبُهُ، وَظَهْرُهُ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ، إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي قِصَّةِ الْإِبِلِ وَالْغَنَمِ»، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَالْخَيْلُ قَالَ: «الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالْخَيْلُ لِثَلَاثَةٍ: هِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَيُعِدُّهَا لَهُ لَا يَغِيبُ فِي بُطُونِهَا شَيْئًا إِلَّا كَتَبَ لَهُ بِهَا أَجْرٌ، وَلَوْ عَرَضَ مَرْجًا أَوْ مَرْجَيْنِ فَرَعَاهَا صَاحِبُهَا فِيهِ كُتِبَ لَهُ مِمَّا غَيَّبَتْ فِي بُطُونِهَا أَجْرٌ، وَلَوِ اسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ خَطَاهَا أَجْرٌ، وَلَوْ عَرَضَ نَهَرٌ فَسَقَاهَا بِهِ، كَانَتْ لَهُ بِكُلِّ قَطْرَةٍ غُيِّبَتْ فِي بُطُونِهَا مِنْهُ أَجْرٌ، حَتَّى ذَكَرَ الْأَجْرَ فِي أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا، وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ سِتْرٌ فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا تَعَفُّفًا وَتَجَمُّلًا وَتَسَتُّرًا، وَلَا يَحْبِسُ حَقَّ ظُهُورِهَا وَبُطُونِهَا فِي يُسْرِهَا وَعُسْرِهَا، وَأَمَّا الَّذِي عَلَيْهِ وِزْرٌ فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا أَشَرًا وَبَطَرًا وَبَذَخًا عَلَيْهِمْ»، قَالُوا: فَالْحُمُرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ فِيهَا شَيْئًا إِلَّا هَذِهِ الْآيَةَ الْجَامِعَةَ الْفَاذَّةَ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾﴾ الزلزلة»[1].

(١) صحيح.

**باسی زەکات لە گوێدرێژدا نییە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەسپیش زەکاتی تێدا نییە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ زەکاتی هەندێ لە ماڵ و سامانی مسوڵمانان وەربگرێ نەك هەموو ماڵەکانیان، وەك فەرموویەتی: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴿١٠٣﴾ ﴾، چونکە ناوی ماڵ و سامان بۆ ئەسپ و گوێدرێژیش بەکار دێت، جا پێغەمبەر ﷺ کە خوا ﷻ ڕایسپاردووە کتێبەکەی ڕوون بکاتەوە، ڕوونی کردۆتەوە، بێگومان خوا فەرمانی پێکردووە بە وەرگرتنی هەندێ لە ماڵ و سامانی مسوڵمانان نەك هەمووی**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەك ماڵ و سامانێکی هەبێت زەکاتەکەی دەرنەکات ئیللا لە ڕۆژی دواییدا ماڵ و سامانەکەی دەهێنرێ دەکرێ بە ئاگرێك نێوچاوان و تەنیشت و پشتی پێ سوور دەکرێتەوە هەتا خوا دادگەری لە نێوان بەندەکاندا دەکات لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزارساڵی ئێوە دەبێت لەوەی دەیژمێرن، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، یان بۆ بەهەشتە یان بۆ ئاگر، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد لە باسی زەکاتی وشتر و مەڕدا، ئینجا وتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەسپ، فەرمووی: نێوچاوانی ئەسپ تا ڕۆژی دوایی خێری تێدایە، ئەسپ بۆ سێ کەسە: بۆ کەسێك پاداشتە، بۆ کەسێك داپۆشینە (لە هەژاری و لە دوژمن)، وە لەسەر کەسێکیش قورسی و بارگرانی و تاوانە، جا ئەوەی کە بۆی دەبێتە خێر و پاداشت، ئەو کەسەیە کە لەپێناوی خوادا بەکاری دەهێنێ (واتە: جیهادی پێ دەکات) و ئامادەی دەکات بۆی، ئەسپەکەی هیچ شتێك ناخوات ئیللا بۆی دەبێتە خێر و پاداشت، وە ئەگەر بیخاتە لەوەڕگایەك یان دوو لەوەڕگا خاوەنەکەی سەرپەرشتی بکات، چەندە دەخوات بە ئەندازەی ئەوە پاداشتی بۆ دەبێت، وە ئەگەر بیباتە سەر تەپۆڵکەیەك یان دوو تەپۆڵکە بلەوەڕێ ئەوە بۆ هەر هەنگاوێکی پاداشتی بۆ دەنووسرێ، وە ئەگەر بیباتە لای دەریایەك ئاوی بدات، ئەوە بە ئەندازەی هەموو دڵۆپێك کە خواردوویەتی دەبێتە پاداشت بۆی، تەنانەت باسی پاداشتی کرد لە تەرسەقول و میزەکەیشیدا، وە ئەوەی کە بۆی دەبێتە داپۆشەر لە هەژاری، ئەوە بۆ کەسێکە بەچاکی بەخێوی بکات و ئیشوکاری ڕۆژانەی خۆی پێ

ڕاپەڕێنێ، وە مافی سواربوونی و سکی بەند نەکات (واتە: ئەگەر کەسێك پێویستی پێی بوو هاوکاری پێ بکات) لە خۆشی و ناخۆشیدا، وە ئەو کەسەی کە بۆی دەبێتە مایەی گوناه و تاوان ئەو کەسەیە ڕاگیری دەکات بۆ فیز و کەشخەکردن بەسەر خەڵکدا. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی گوێدرێژ؟ فەرمووی: خوا لەبارەیەوە هیچ شتێکی بۆم دانەبەزاندووە جگە لەم ئایەتە گشتگیرە نەبێت: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾، واتە: هەر کەس کردەوەی چاکی کردبێ لە دنیادا بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەك، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت ئەجر و پاداشتەکەی وەردەگرێ * هەر کەسیش کردەوەی خراپی کردبێ بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەك، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەیبینێتەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَأْخِيرِ الْإِمَامِ قَسْمَ الصَّدَقَةِ بَعْدَ أَخْذِهِ إِيَّاهَا وَإِبَاحَةِ بِعْثَةِ مَوَاشِي الصَّدَقَةِ إِلَى الرَّعْيِ إِلَى أَنْ يَرَى الْإِمَامُ قَسْمَهَا

**٢٢٩٢-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ يَقُولُ: اجْتَمَعَتْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَنَمٌ مِنْ غَنَمٍ لِلصَّدَقَةِ قَالَ: «ابْدُ فِيهَا يَا أَبَا ذَرٍّ»، قَالَ: فَبَدَوْتُ فِيهَا إِلَى الرَّبَذَةِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[١].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ئیمام دابەشکردنی زەکات دوابخات دوای وەرگرتنی، وە ڕێگەدان بەوەی مەڕوماڵات بدرێتە لای شوانێك چاودێرییان بکات تا ئیمام بڕیاری دابەشکردنیان دەدات

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: مەڕوماڵاتی زەکات کۆ کرایەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ وشترەکان ببە (بۆ چاودێری)، وتی: منیش بەشێکم لێ برد بۆ (الرَّبَذَةِ) (ناوچەیەکە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاری مەدینە سەد و حەفتا کیلۆمەتر دوورە لێیەوە)، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ صَدَقَةِ الْوَرِقِ.

## بَابُ إِسْقَاطِ فَرْضِ الزَّكَاةِ عَمَّا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ.

**٢٢٩٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ»[١].

## کۆباسی بەشەکانی زەکاتی زیو.

## باسی زیو زەکاتی ناکەوێت ئەگەر کەمتر بوو لە پێنج ئوقیە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ (هەر ئوقیەیەکیش چل درهەمە، کەواتە: پێنج ئوقیە دەکاتە دوو سەد درهەم زیو).

**٢٢٩٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ (هەر ئوقیەیەکیش چل درهەمە، کەواتە: پێنج ئوقیە دەکاتە دوو سەد درهەم زیو)، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە دەغڵ و دان خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم).

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخَمْسَةَ الْأَوَاقِ هِيَ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ

**٢٢٩٥-** «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَالْأَوَاقُ مِائَتَا دِرْهَمٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێنج ئوقیە بریتییە لە دوو سەد درهەم

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم)، وە لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە پێنج (الْأَوَاقُ): دوو سەد درهەمە.

### بَابُ ذِكْرِ مَبْلَغِ الزَّكَاةِ فِي الْوَرِقِ إِذَا بَلَغَ خَمْسَ أَوَاقٍ

**٢٢٩٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حِينَ اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَهُ - فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ - وَقَالُوا فِي الْحَدِيثِ: وَفِي الرِّقَةِ رُبْعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلَّا تِسْعِينَ وَمِائَةً، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا[١].

### باسی ئەندازەی دەرکردنی زەکات لە زیودا، ئەگەر ڕێژەکەی گەیشتە پێنج ئوقیە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەبو بەکری صدیق کاتێ کرا بە خەلیفە، نووسراوی بۆ کرد: بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان، ئەمانە فەرزی زەکاتن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانان فەرزی کردووە خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووە بە پێغەمبەرەکەی، -دواتر باسی فەرموودەکەیان کرد- لە فەرموودەکەدا وتیان: وە لە زیودا چواریەکی دەیەك زەکات دەدات، (کە نیو مسقاڵ دەکات) ئەگەر تەنها سەد و نەوەد درهەمی هەبوو ئەوە زەکاتی لەسەر نییە مەگەر خاوەنەکەی حەز بکات.

### بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الزَّكَاةَ وَاجِبَةٌ عَلَى مَا زَادَ عَلَى الْمِائَتَيْنِ مِنَ الْوَرِقِ ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الزَّكَاةَ غَيْرُ وَاجِبَةٍ عَلَى مَا زَادَ عَلَى الْمِائَتَيْ دِرْهَمٍ حَتَّى تَبْلُغَ الزِّيَادَةُ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا

**٢٢٩٧-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَاتُوا رُبْعَ الْعُشُورِ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ الْمِائَتَيْنِ شَيْءٌ، فَإِذَا كَانَتْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، فَمَا زَادَ فَعَلَى ذَلِكَ الْحِسَابِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## باسی ڕوونکردنەوە لەسەر ئەوەی زەکات واجب دەبێت لە زیادەی دوو سەد درهەمەکەش، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە زەکات واجب نابێت ئەگەر زیاتر بوو لە دوو سەد درهەم تا دەگاتە دوو سەد و چل درهەم

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە هەموو چل درهەمێك چواریەکی دەیەك بە زەکات بدەن، لەخوار دوو سەد درهەمەوە هیچ زەکات نییە، ئەگەر گەیشتە دوو سەد درهەم، ئەوە پێنج درهەمی تێدایە، ئەگەر لەوە زیاتر بوو بەوشێوەیە حیساب دەکرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الزَّكَاةَ غَيْرُ وَاجِبَةٍ عَلَى الْحُلِيِّ، إِذِ اسْمُ الْوَرِقِ فِي لُغَةِ الْعَرَبِ الَّذِينَ خُوطِبْنَا بِلُغَتِهِمْ لَا يَقَعُ عَلَى الْحُلِيِّ الَّذِي: هُوَ مَتَاعٌ مَلْبُوسٌ

**٢٢٩٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يَعْنِي بِمِثْلِ حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکات واجب نییە لە خشڵ و خۆڕازاندنەوە، چونکە ناوی (الْوَرِقِ) لە زمانی عەرەبدا کە ئێمە لەگەڵیان دواوین بۆ (الْحُلِيِّ) خشڵ و خۆڕازاندنەوە بەکار نەهاتووە کە: کەلوپەلێکە دەپۆشرێ

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، واتە: بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی ئەبو سەعید: لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ.

**٢٢٩٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. قَالَ يُونُسُ: يَعْنِي لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، یونس (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: لە زیودا پێنج ئوقیە کەمتر بێت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

زەکاتی ناکەوێ (هەر ئوقیەیەکیش چل درهەمە، کەواتە: پێنج ئوقیە دەکاتە دوو سەد درهەم زیو)، وە لە پێنج سەر وشتر کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێ، وە لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم).

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَدَقَةِ الْحُبُوبِ وَالثِّمَارِ.

## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ الصَّدَقَةِ عَمَّا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ.

**٢٣٠٠-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ[١].

## کۆباسی زەکاتی دانەوێڵە و بەروبوومەکان

## باسی دانەوێڵە و بەروبوومەکان ئەگەر پێنج ویسق یاخود پێنج بار کەمتر بن زەکاتیان ناکەوێ

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لەوبارەوە فەرموودەکەی ئەبو سەعید ﷺ هاتووە: وە لە دەغڵ و دان و خورمادا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی ناکەوێ.

## بَابُ ذِكْرِ إِيجَابِ الصَّدَقَةِ فِي الْبُرِّ وَالتَّمْرِ إِذَا بَلَغَ الصِّنْفُ الْوَاحِدُ مِنْهُمَا خَمْسَةَ أَوْسُقٍ

**٢٣٠١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَحِلُّ فِي الْبُرِّ وَالتَّمْرِ زَكَاةٌ، حَتَّى يَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَلَا تَحِلُّ فِي الْوَرِقِ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَ أَوَاقٍ، وَلَا تَحِلُّ فِي الْإِبِلِ زَكَاةٌ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ ذَوْدٍ»[٢].

## باسی واجببوونی زەکات لە گەنم و خورمادا، ئەگەر ڕێژەی هەر یەکێکیان گەیشتە پێنج ویسق یان پێنج بار

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات لە گەنم و خورمادا دروست نییە تا ڕێژەیان دەگاتە پێنج ویسق (ئەویش بەرانبەرە بە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٦٥٢ کغم) وە لە زیودا زەکات ناکەوێ تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە، وە لە وشتریشدا زەکات ناکەوێ هەتا دەگاتە پێنج سەر.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، إِنَّمَا أَوْجَبَ فِي الْبُرِّ الزَّكَاةَ إِذَا بَلَغَ الْبُرُّ خَمْسَةَ أَوْسَاقٍ، وَفِي التَّمْرِ إِذَا بَلَغَ خَمْسَةَ أَوْسَاقٍ، لَا إِذَا بَلَغَ الْبُرُّ وَالتَّمْرُ خَمْسَةَ أَوْسَاقٍ إِذَا ضُمَّ أَحَدُهُمَا إِلَى الْآخَرِ

**٢٣٠٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا لە گەنمدا زەکاتی واجب کرد ئەگەر گەیشتە پێنج ویسق، وە لە خورمایشدا ئەگەر گەیشتە پێنج ویسق، نەك ئەگەر گەنم و خورما بگەنە پێنج ویسق، ئەگەر یەکێکیان بدرێتە پاڵ ئەوی دیکە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: زەکات (لە گەنم و جۆ و خورمادا) دروست نییە تا ڕێژەیان دەگاتە پێنج ویسق (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم)، وە لە زیودا زەکات ناکەوێ تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە، وە لە وشتریشدا زەکات ناکەوێ هەتا دەگاتە پێنج سەر.

**٢٣٠٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ ذَوْدٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةُ أَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە زیودا زەکات ناکەوێ تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ئوقیە، وە لە وشتریشدا زەکات ناکەوێ هەتا دەگاتە پێنج سەر، وە لە خورمادا زەکات نییە تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ویسق (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِيجَابِ الصَّدَقَةِ فِي الزَّبِيبِ إِذَا بَلَغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَفِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ، لَيْسَ هَذَا الْخَبَرُ مِمَّا سَمِعَهُ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، مِنْ جَابِرٍ عِلْمِي

**٢٣٠٤-** عَن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ عَلَى الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ زَكَاةٌ فِي كَرْمِهِ، وَلَا زَرْعِهِ إِذَا كَانَ أَقَلَّ مِنْ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ»[١].

**باسی واجببوونی زەکات لە مێوژدا، ئەگەر ڕێژەکەی گەیشتە پێنج ویسق، وە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم سەنەدە، ئەم فەرموودە لەو فەرموودە نییە کە عەمری کوڕی دینار لە جابرەوە بیستوویەتی بەپێی شارەزایی من**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات لەسەر پیاوی مسوڵمان نییە لە ترێیەکەی و لە کشتوکاڵەکەی ئەگەر کەمتر بوو لە پێنج ویسق.

**٢٣٠٥-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ لَمْ يَسْمَعْهُ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ مِنْ جَابِرٍ ﵁[٢].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: (دوای ئەوەی کۆمەڵە سەنەدێکی هێنایەوە): ئەم فەرموودەیە عەمری کوڕی دینار لە جابرەوە ﵁ نەیبیستووە.

**٢٣٠٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ الْحَبِّ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ الْحُلْوِ صَدَقَةٌ[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَعْنِي بِالْحُلْوِ التَّمْرَ.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: لە دانەوێڵەدا زەکات نییە تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ویسق (ئەویش بەرانبەرە بە ٦٥٢ کغم)، وە لە خورمادا زەکات نییە تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ویسق.

ئەبو بەکر دەڵێ: مەبەست لە (الْحُلْوِ) خورمایە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ مَبْلَغِ الْوَاجِبِ مِنَ الصَّدَقَةِ فِي الْحُبُوبِ وَالثِّمَارِ، وَالْفَرْقِ بَيْنَ الْوَاجِبِ فِي الصَّدَقَةِ فِيمَا سَقَتْهُ السَّمَاءُ أَوِ الْأَنْهَارُ أَوْ هُمَا، وَبَيْنَ مَا سُقِيَ بِالرِّشَاءِ، وَالدَّوَالِي

**٢٣٠٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ الْعُشْرِ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْرِ»[١].

## باسی ئەو ئەندازەی کە واجبە لە زەکاتی دانەوێڵە و بەروبوومدا، هەروەها جیاوازی لە نێوان ئەوەی واجبە لە زەکات لەوەی بە باران ئاو دەخوات یان بە ڕووبار یان بە هەردووکیان، لە نێوان ئەوەی بە حەبل و سەتڵ ئاو دەدرێ

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو میوە و دانەوێڵەی بە باران و ڕووبار و کانیاو ئاو دراوە ئەوە دەیەك زەکاتی دەکەوێ، وە ئەویشی بە هۆی ئاژەڵەوە ئاو دراوە ( یان هەر ئامێرێکی ئاودان بێت و مەسرەفی زۆر لە ئاودانەکەیدا بکات) نیوەی دەیەك زەکاتی دەکەوێ.

**٢٣٠٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيًّا الْعُشُورُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ، نِصْفُ الْعُشْرِ[٢].

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ: ئەو (میوە و دانەوێڵەی) بە باران و کانیاو ئاو درابوو، یان ئەو درەختەی تەنها ڕەگەکەی ئاو لە زەوییەوە دەخواتەوە و پێویستی بە ئاودان نییە، ئەوە دەیەك زەکاتەکەیەتی، وە ئەوەیشی بە هەر ئامێرێك ئاو درابوو نیوەی دەیەك (ی لێ دەدرێ بە زەکات).

**٢٣٠٩-** عَنْ عَمْرٍو: وَحَدَّثَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَذْكُرُ؛ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِيمَا سَقَتِ الْأَنْهَارُ وَالْغَيْمُ الْعُشُورُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعَشْرِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عەمر دەڵێ: ئەبو زوبەیر بۆی باسکردم ئەو گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ بوو، باسی دەکرد: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو (میوەو دانەوێڵەی) بە ڕووبار و باران ئاو درابوو دەیەك زەکاتەکەیەتی، وە ئەوەیشی بە هۆی ئاژەڵ (یان بە هەر ئامێرێکی دیکە) ئاو درابوو نیوەی دەیەك زەکاتەکەیەتی.

## بَابُ ذِكْرِ مَبْلَغِ الْوَسْقِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، وَلَا خِلَافَ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ فِي مَبْلَغِهِ عَلَى مَا رُوِيَ فِي هَذَا الْخَبَرِ إِلَّا أَنَّ أَبَا الْبَخْتَرِيِّ لَا أَحْسَبُهُ سَمِعَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ

**٢٣١٠-** عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، يَرْفَعُهُ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسَاقٍ زَكَاةٌ. وَالْوَسْقُ: سِتُّونَ مَخْتُوماً[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يُرِيدُ الْمَخْتُومُ، الصَّاعُ، وَلَا خِلَافَ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ أَنَّ الْوَسْقَ سِتُّونَ صَاعًا، وَقَدْ بَيَّنْتُ مَبْلَغَ الصَّاعِ فِي كِتَابِ الْأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ فِي ذِكْرِ كَفَّارَةِ الْيَمِينِ.

## باسی ئەندازەی ویسق ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێ، وە جیاوازی لە نێوان زانایاندا نییە لە ئەندازەکەی لەسەر شێوەی ئەم فەرموودەی گێڕدراوەتەوە، ئەوە نەبێ پێموا نییە ئەبولبەختەری لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ بیستبێتی

واتە: ئەبولبەختەری دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ، ڕەفعی کردووە دەڵێ: (لە دانەوێڵە و بەروبوومدا) زەکات نییە تا ڕێژەی دەگاتە پێنج ویسق. وە ویسقێك بریتییە لە شەست (مَخْتُوم).

ئەبو بەکر دەڵێ: مەبەستی لە (الْمَخْتُومُ)، صاعە، جیاوازی نییە لە نێوان زانایان کە ویسقێك شەست صاعە، بێگومان ئەندازەی صاعم ڕوون کردەوە لە کتێبی (الْأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ) لە باسی کەفارەتی سوێند.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ إِخْرَاجِ الْحُبُوبِ وَالثُّمُورِ الرَّدِيئَةِ فِي الصَّدَقَةِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ﴿٢٦٧﴾﴾ البقرة

---

(١) إسناده ضعيف.

**٢٣١١-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أُنَاسٌ يَتَلَاءَمُونَ بِشَرِّ ثِمَارِهِمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ﴿٢٦٧﴾ ﴾البقرة، قَالَ: فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لَوْنَيْنِ الْجُعْرُورِ، وَعَنْ لَوْنِ حُبَيْقٍ[١].

**باسی سەرزەنشتکردن لەوەی دانەوێڵەو خورمای خراپ بە زەکات دەربکرێ، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ﴿٢٦٧﴾ ﴾، واتە: مەڕۆن لەوە ببەخشن کە خراپە لە کاتێکدا خۆتان ئەو شتە خراپە وەرناگرن مەگەر چاوی لێ بپۆشن**

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك هەبوون خراپترینی بەروبوومەکانیان بە زەکات دەردەکرد، دواتر خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ﴿٢٦٧﴾ ﴾، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد دوو جۆر خورما بە زەکات دەربکرێ، خورمای جەعرور (جۆرە خورمایەکی بچووکە سوودی لێ نابینرێ)، وە خورمای حوبەیق (جۆرە خورمایەکی خراپە دراوەتە پاڵ ناوی پیاوێك).

**٢٣١٢-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، فِي هَذِهِ الْآيَةِ الَّتِي قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴾ البقرة، قَالَ: هُوَ الْجُعْرُورُ وَلَوْنُ حُبَيْقٍ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُؤْخَذَا فِي الصَّدَقَةِ[٢].

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ، بۆی باس کردم دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴾، وتی: ئەوە خورمای جەعرور (کە خورمایەکی بچووکە و سوودی لێ نابینرێ) و خورمای حوبەیقە (کە جۆرە خورمایەکی خراپە دراوەتە پاڵ ناوی پیاوێك)، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە ئەو دوو خورما خراپە بە زەکات وەربگیرێ.

**٢٣١٣-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالصَّدَقَةِ فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ هَذَا السَّخْلِ بِكَبَايِسَ - قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِي الشِّيصَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَاءَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

بِهَذَا وَكَانَ لَا يَجِيءُ أَحَدٌ بِشَيْءٍ إِلَّا نُسِبَ إِلَى الَّذِي جَاءَ بِهِ»، وَنَزَلَتْ: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾ ﴾البقرة، قَالَ: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْجُعْرُورِ، وَلَوْنِ الْحُبَيْقِ أَنْ تُؤْخَذَا فِي الصَّدَقَةِ، قَالَ الزُّهْرِيُّ: لَوْنَانِ ثَمَرٌ مِنْ ثَمَرِ الْمَدِينَةِ[1].

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە دەرکردنی زەکات، پیاوێك هات چەند بۆڵە خورمایەکی ناکامڵ و خراپی هێنابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ ئەمەی هێنا؟ جا ئەو کاتە هەر کەس شتێکی بهێنایە ئەو شتە دەدراوە پاڵ ئەو، وە ئەم ئایەتەیش دابەزی: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾ ﴾، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد خورمای جەعرور و حوبەیق بە زەکات وەربگیرێن، زوهری وتی: دوو جۆر بەروبووم بوون لە بەروبوومی مەدینە.

**٢٣١٤-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ تَبُوكَ حَتَّى جِئْنَا وَادِي الْقُرَى، فَإِذَا امْرَأَةٌ فِي حَدِيقَةٍ لَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: «اخْرُصُوا»، فَخَرَصَ الْقَوْمُ، وَخَرَصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْمَرْأَةِ: «أَحْصِي مَا يَخْرُجُ مِنْهَا حَتَّى أَرْجِعَ إِلَيْكِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى تَبُوكَ، ثُمَّ أَقْبَلَ وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ حَتَّى جِئْنَا وَادِي الْقُرَى، فَقَالَ لِلْمَرْأَةِ: «كَمْ جَاءَ حَدِيقَتُكِ؟» قَالَ: عَشَرَةُ أَوْسُقٍ خَرْصُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[2].

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لەساڵی تەبووك هەتا هاتینە (وَادِي الْقُرَى) (دەکەوێتە نێوان تەیماء و خەیبەر). ئافرەتێکمان بینی لەنێو باخچەیەکی خۆیدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: بەری ئەم باخە بخەملێنن، خەڵکەکە خەملاندیان و پێغەمبەری خواش ﷺ بە دە ویسق خەملاندی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئافرەتەکەی فەرموو: چەندی لێ دەرچوو بیژمێرە هەتا دەگەڕێمەوە بۆ لات، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ تەبووك، پاشان هاتەوە و ئێمەیش لەگەڵی هاتینەوە هەتا گەیشتینە (وَادِي الْقُرَى)، بە ئافرەتەکەی فەرموو: باخەکەت چەندی بەرهەم هێنا؟ وتی: دە ویسق، وەکوو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ خەملاندی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**بَابُ وَقْتِ بِعْثَةِ الْإِمَامِ الْخَارِصَ يَخْرُصُ الثِّمَارَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الثِّمَارَ تُخْرَصُ كَيْ تُحْصَى الزَّكَاةُ عَلَى مَالِكِ الثَّمَرَةِ قَبْلَ أَنْ تُؤْكَلَ الثَّمَرَةُ وَتُفَرَّقَ، وَيُخَيِّرُ الْخَارِصُ صَاحِبَ الثَّمَرَةِ بَيْنَ أَنْ يَأْخُذَ جَمِيعَ الثَّمَرَةِ وَيَضْمَنَ الْعُشْرَ أَوْ نِصْفَ الْعُشْرِ لِلصَّدَقَةِ، وَبَيْنَ أَنْ يَدْفَعَ جَمِيعَ الثَّمَرِ إِلَى الْخَارِصِ، وَيَضْمَنَ لَهُ الْخَارِصُ تِسْعَةَ أَعْشَارِ الثَّمَرَةِ، أَوْ تِسْعَةَ عَشَرَ سَهْمًا مِنْ عِشْرِينَ سَهْمًا إِذَا يَبِسَتْ، إِنْ كَانَتِ الثِّمَارُ مِمَّا سُقِيَتْ بِالرِّشَاءِ وَالدَّوَالِي، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ ابْنُ جُرَيْجٍ لَمْ يَسْمَعْ هَذَا الْخَبَرَ مِنِ ابْنِ شِهَابٍ**

**٢٣١٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ وَهِيَ تَذْكُرُ شَأْنَ خَيْبَرَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَبْعَثُ ابْنَ رَوَاحَةَ فَيَخْرُصُ النَّخْلَ حِينَ يَطِيبُ أَوَّلُ الثَّمَرِ قَبْلَ أَنْ تُؤْكَلَ، ثُمَّ يُخَيِّرُ الْيَهُودَ بِأَنْ يَأْخُذُوهَا بِذَلِكَ الْخَرْصِ أَمْ يَدْفَعُهُ الْيَهُودُ بِذَلِكَ، وَإِنَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِالْخَرْصِ لِكَيْ تُحْصَى الزَّكَاةُ قَبْلَ أَنْ تُؤْكَلَ الثَّمَرَةُ وَتُفَرَّقَ[1].

**باسی ئەو کاتەی کە ئیمام خەمڵێنەر دەنێرێ بۆ خەمڵاندنی بەروبوومەکان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بەروبوومەکان بۆیە دەخەمڵێنرێت، تا زەکاتی بەروبوومەکان لەسەر خاوەنەکەی بژمێردرێ، پێش ئەوەی بەروبوومەکە بخورێت و بەش بەش بکرێ، وە خەمڵێنەر خاوەنی بەروبوومەکە سەرپشك دەکات لە نێوان ئەوەی هەموو بەروبوومەکە دەبات و زەمانەتی دەیەك یان نیوەی دەیەکی زەکاتەکە دەکات، یان هەموو بەروبوومەکە دەدات بە خەمڵێنەر، خەمڵێنەریش زەمانەتی نۆ بەش یان نۆزدە بەشی بەروبوومەکەی بۆ دەکات لە بیست بەش ئەگەر وشك بوو، ئەگەر بەروبوومەکە بە حەبل و سەتڵ ئاو بدرێ یان هەر ئامێرێکی دیکە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من دەترسم لەوەی ئیبنو جورەیج ئەم فەرموودەی لە ئیبنو شیهابەوە نەبیستبێ**

واتە: عائیشە ﵂ لە باسی خەیبەردا دەڵێ: کاتێ کە خورماکان پێ دەگەیشتن یەکەمجار پێش ئەوەی بخورێن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئیبنو ڕەواحەی دەنارد دەیخەمڵاندن، پاشان جوولەکەکانی سەرپشك دەکرد بەو خەمڵاندنە ببەن، یان بەوشێوەی بیدەن (بە نوێنەری پێغەمبەر ﷺ، ئەویش زەمانەتی بەشەکەیان بکات) وە پێغەمبەری خوا

---

(١) إسناده ضعيف.

ﷺ بۆیە فەرمانی کرد بە خەملاندن بۆ ئەوەی زەکات بژمێردرێ پێش ئەوەی لێی بخورێت و بەش بەش بکرێ.

تێبینی: خەملاندن بریتییە لەوەی ئەگەر ترێ یان خورما بە دارەکەوە پێ گەیشت خەملێنەر ئەندازەی دەکات ئەم ترێیە ئەگەر بکرێ بە مێوژ چەن دەردەکات، ئەگەر بە پێنج ویسق خەملێنرا ئەوە زەکاتی دەکەوێ).

## بَابُ السُّنَّةِ فِي خَرْصِ الْعِنَبِ لِتُؤْخَذَ زَكَاتُهُ زَبِيبًا كَمَا تُؤْخَذُ زَكَاةُ النَّخْلِ تَمْرًا

**٢٣١٦**- عَنْ عَتَّابِ بْنِ أُسَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي زَكَاةِ الْكَرْمِ: «تُخْرَصُ كَمَا يُخْرَصُ النَّخْلُ، ثُمَّ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ زَبِيبًا كَمَا تُؤَدَّى زَكَاةُ النَّخْلِ تَمْرًا»[١].

## باسی شێوازی خەملاندنی ترێ بەپێی سوننەت، بۆ ئەوەی زەکاتەکەی بە مێوژ وەربگیرێ وەکوو چۆن زەکاتی خورمای تەڕ بەوشکی دەخەملێنرێ

واتە: عەتابی کوڕی ئوسەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە زەکاتی مێو یان ترێدا فەرمووی: دەخەملێنرێ وەکوو چۆن خورما دەخەملێنرێ، پاشان زەکاتەکەی بە مێوژ دەدرێ وەکوو چۆن زەکاتی خورمای تەڕ بەوشکی دەدرێ.

**٢٣١٧**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَمَرَ عَتَّابَ بْنَ أُسَيْدٍ أَنْ يَخْرُصَ الْعِنَبَ كَمَا يَخْرُصُ النَّخْلَ، ثُمَّ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ زَبِيبًا كَمَا تُؤَدَّى تَمْرًا، قَالَ: فَتِلْكَ سُنَّةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي النَّخْلِ وَالْعِنَبِ[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە عەتابی کوڕی ئوسەید ترێ بخەملێنێ وەکوو چۆن خورما دەخەملێنێ، پاشان زەکاتەکەی بە مێوژ بدرێت وەکوو چۆن زەکاتی خورما دەدرێت، وتی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە خورما و ترێدا.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

**٢٣١٨-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ عن عَتَّابِ بْنِ أُسَيْدٍ ﷺ، بِهَذَا الْخَبَرِ دُونَ قَوْلِهِ، فَتِلْكَ سُنَّةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي النَّخْلِ وَالْعِنَبِ[١].

واتە: بە سەنەدێکی دیکە هاتووە لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە، لە عەتابی کوڕی ئوسەید ﷺ، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە جگە لە وتەکەی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە خورما و ترێدا.

## بَابُ السُّنَّةِ فِي قَدْرِ مَا يُؤْمَرُ الْخَارِصُ بِتَرْكِهِ مِنَ الثِّمَارِ فَلَا يَخْرِصُهُ عَلَى صَاحِبِ الْمَالِ لِيَكُونَ قَدْرَ مَا يَأْكُلُهُ رُطَبًا وَيَطْعَمُهُ قَبْلَ يَبْسِ الثَّمْرِ، غَيْرَ دَاخِلٍ فِيمَا يَخْرُجُ مِنْهُ الْعَشْرُ أَوْ نِصْفُ الْعَشْرِ

**٢٣١٩-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَسْعُودِ بْنِ نِيَارٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: أَتَانا وَنَحْنُ فِي السُّوقِ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا خَرَصْتُمْ، فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ فَإِنْ لَمْ تَأْخُذُوا أَوْ تَدْعُوا الثُّلُثَ شَكَّ شُعْبَةُ فِي الثُّلُثِ فَدَعُوا الرُّبُعَ»[٢].

## باسی سوننەت وایە ئەو ئەندازەی کە فەرمان کراوە بە خەمڵێنەر واز لە بەروبوومەکان بهێنێ لەسەر خاوەنماڵ نەیخەمڵێنێ، بۆ ئەوەی ئەو ئەندازەی خۆیان دەیخۆن و دەیدەن بە خەڵك پێش وشکبوونی خورماکە لە چوارچێوەی ئەو دەیەکە یان نیوەی دەیەکەکە نەبێ

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی مەسعودی کوڕی دینار دەگێڕێتەوە، سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ هات بۆ لامان ئێمە لە بازاڕ بووین وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەمڵاندتان (ئەی ئەو کەسانەی زەکات کۆ دەکەنەوە، زەکاتی ئەوە) ببەن (کە خەمڵاندووتانە) و یەك لەسەر سێی بەجێ بهێڵن، جا ئەگەر وەرتانەگرت یان وازتان لە یەك لەسەر سێیەکە نەهێنا، -شوعبە گومانی هەبوو لە سێ یەکەکە- ئەوە یەك لەسەر چواری بەجێ بهێڵن (بەتەڕی بۆ خاوەنماڵەکە و مەیخەمڵێنن).

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

**٢٣٢٠-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا خَرَصْتُمْ، فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ، فَإِنْ لَمْ تَدَعُوا الثُّلُثَ، فَدَعُوا الرُّبُعَ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ (بەروبووم) خەمڵاندتان (ئەی ئەو کەسانەی زەکات کۆ دەکەنەوە، زەکاتی ئەوە) وەربگرن (کە خەمڵاندووتانە) و یەك لەسەر سێیەکەی دیکەی بەجێ بهێڵن، ئەگەر وازتان لە یەك لەسەر سێیەکە نەهێنا، ئەوە یەك لەسەر چواری بەجێ بهێڵن (بۆ ئەوەی بۆ خۆی بیدات بە خزم و کەسوکاری).

## بَابُ فَرْضِ إِخْرَاجِ الصَّدَقَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَالتَّغْلِيظِ فِي مَنْعِ الزَّكَاةِ فِي الْعُسْرِ

**٢٣٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا مِنْ نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا إِلَّا جِيءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَخْبَطُهُ بِقَوَائِمِهَا وَتَطَؤُهُ عِقَافُهَا كُلَّمَا تَصَرَّمَ آخِرُهَا رُدَّ أَوَّلُهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْخَلَائِقِ، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ. وَمَا مِنْ صَاحِبِ بَقَرٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا مِنْ نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا إِلَّا جِيءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَوْفَرُ مَا كَانَتْ، وَأَكْثَرُ مَا كَانَتْ فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا كُلَّمَا تَصَرَّمَ آخِرُهَا كَرَّ عَلَيْهِ أَوَّلُهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْخَلَائِقِ، ثُمَّ يَرَى سَبِيلَهُ. وَمَا مِنْ صَاحِبِ غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا مِنْ نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا إِلَّا جِيءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَوْفَرُ مَا كَانَتْ، وَأَكْثَرُ مَا كَانَتْ فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَأُهُ بِأَظْلَافِهَا كُلَّمَا تَصَرَّمَ آخِرُهَا كَرَّ عَلَيْهِ أَوَّلُهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْخَلَائِقِ، ثُمَّ يُرَى سَبِيلَهُ أَوْ سَبِيلُهُ»[2].

## باسی زەکاتدەرکردن فەرزە لە کاتی گرانی و هەرزانیداو، هەڕەشەکردن لەو کەسەی لە گرانیدا زەکات دەرناکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر خاوەن وشترێك مافی نەدات (واتە: زەکاتەکی دەرنەکات) لە گرانی و هەرزانیدا، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا بەشێوەیەك دێت لەوسا بەهێزتر و چالاکتر و هارترە، لەسەر ڕوو فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، ئەویش بە سمەکانی دەیشێلێت، هەر

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

کاتێ کۆتاهەمینیان تەواو بوو یەکەمینیان دووبارە دێتەوە بەسەریدا تا دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەکرێ، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، وە هەر خاوەن مانگا و ڕەشەوڵاخێك مافی نەدات (واتە: زەکاتەکی دەرنەکات) لە گرانی و هەرزانیدا، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دێت لەوسا بەهێزتر و چالاکتر و هارترە، پاشان ئەو کەسە فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، پاشان بە سمەکانی دەیشێلێت، بە شاخیشی قۆچی لێ دەدات، هەر کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان بەدوایدا دێتەوە، تا دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەکرێ، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، وە هەر خاوەن مەڕومالاتێك (پێم وایە: هەر خاوەن مانگایەك، چونکە لە فەرموودەکەی خوارەوە بەڕوونی باسی دەکات) مافی نەدات (واتە: زەکاتەکەی دەرنەکات) لە گرانی و هەرزانیدا، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێ لەوسا بەهێزتر و چالاکتر و هارترە، پاشان ئەو کەسە فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، بە شاخیشی قۆچی لێ دەدا و بە سمەکانیشی دەیشێلێت، کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان بەدوایدا دێت و دەدات بەسەریدا، تا دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەکرێ، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِالنَّجْدَةِ وَالرِّسْلِ «فِي هَذَا الْمَوْضِعِ» الْعُسْرَ وَالْيُسْرَ، وَأَرَادَ بِقَوْلِهِ مِنْ نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا أَيْ: فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا

**٢٣٢٢-** عَنْ أَبِي عُمَرَ الْغُدَانِيِّ، أَنَّهُ مَرَّ عَلَيْهِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَامِرٍ، فَقِيلَ: هَذَا مِنْ أَكْثَرِ النَّاسِ مَالًا، فَدَعَاهُ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: نَعَمْ، لِي مِائَةُ حُمُرٍ ولِي مِائَةٍ أَدَمًا، وَلِي كَذَا وَكَذَا مِنَ الْغَنَمِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِيَّاكَ وَإِخْفَافَ الْإِبِلِ، وَإِيَّاكَ وأَظْلَافَ الْغَنَمِ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ رَجُلٍ يَكُونُ لَهُ إِبِلٌ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا، عُسْرِهَا وَيُسْرِهَا إِلَّا بَرَزَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَجَاءَتْهُ كَأَغَذِّ مَا يَكُونُ وَأَشَدُّهُ مَا أَسْمَنَهُ أَوْ أَعْظَمَهُ - شَكَّ شُعْبَةُ - فَتَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا كُلَّمَا جَازَتْ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ، وَمَا مِنْ عَبْدٍ يَكُونُ لَهُ غَنَمٌ، لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا»، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَنَجْدَتُهَا وَرِسْلُهَا، عُسْرُهَا وَيُسْرُهَا إِلَّا بَرَزَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ كَأَغَذِّ مَا يَكُونُ وَأَشَدُّهُ وَأَسْمَنَهُ وَأَعْظَمَهُ - شَكَّ شُعْبَةُ - فَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا كُلَّمَا جَازَتْ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا

أُعِيدَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَرَى سَبِيلَهُ. وَمَا مِنْ رَجُلٍ لَهُ بَقَرٌ لَا يُؤَدِّي حَقَّهَا فِي نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا»، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَنَجْدَتُهَا وَرِسْلُهَا، عُسْرُهَا وَيُسْرُهَا، إِلَّا بَرَزَ لَهُ بِقَاعٍ قَرْقَرٍ كَأَغَذِّ مَا يَكُونُ، وَأَشَدُّهُ وَأَسْمَنَهُ أَوْ أَعْظَمَهُ - شَكَّ شُعْبَةُ -، فَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا كُلَّمَا جَازَتْ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا أُعِيدَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ». فَقَالَ لَهُ الْعَامِرِيُّ: وَمَا حَقُّ الْإِبِلِ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: تُعْطِي الْكَرِيمَةَ، وَتَمْنَحُ الْعَزِيزَةَ، وَتُفْقِرُ الظَّهْرَ، وَتُطْرِقُ الْفَحْلَ، وَتَسْقِي اللَّبَنَ[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە (النَّجْدَةِ وَالرِّسْلِ) «لەم شوێنەدا» گرانی و هەرزانییە

واتە: ئەبو عومەری غودانی دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە نەوەکانی عامر تێپەڕی بەلایدا وترا: ئەو پیاوە خاوەن زۆرترین ماڵ و سامانە، ئەبو هورەیرە ﷺ بانگی کرد لەوبارەوە پرسیاری لێ کرد، وتی: بەڵێ، سەد وشتری سوور، وە سەد وشتری خۆڵەمێشی ڕەشم هەیە و ئەوەندە و ئەوەندەیش مەڕم هەیە، ئەبو هورەیرە وتی: دەخیلە وریا بە لە سمی وشترەکان و سمی مەڕەکان، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر پیاوێك وشتری هەبێت و زەکاتی دەرنەکات لە گرانی و هەرزانیدا، ئیللا لە ڕۆژی دواییدا بەشێوەیەك دێت لەوسا بەهێزتر و چالاکتر و هارترە، لەسەر ڕوو فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، ئەویش بە سمەکانی دەیشێلێت، هەر کات کۆتاهەمینیان تەواو بوو یەکەمینیان دووبارە دێتەوە بەسەریدا، لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، تا دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەکرێ، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ، وە هەر بەندەیەك مەڕوماڵاتێکی هەبێت زەکاتی دەرنەکات لە (نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا) گرانی و هەرزانیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا)، گرانی و هەرزانییە، ئیللا (لە ڕۆژی دواییدا) بۆی دەردەکەوێت لەوسا بەهێزتر و چالاکتر و هارترە، ئەو کەسە فڕێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، پاشان بە سمەکانی دەیشێلێت، بە شاخیشی قۆچی لێ دەدا، هەر کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان دووبارە دێتەوە بەسەریدا، لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، تا دادگەری لە نێوان

---

(١) صحيح.

خەڵکدا دەکرێ، دواتر دەرەنجامی خۆی دەبینێ، وە هەر پیاوێك مانگا و ڕەشەوڵاخی هەبێت زەکاتی دەرنەکات لە (نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا) گرانی و هەرزانیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (نَجْدَتِهَا وَرِسْلِهَا)، گرانی و هەرزانییە، ئیللا (لە ڕۆژی دواییدا) بۆی دەردەکەوێت لەوسا بەهێزتر و چالاکتر و هارترە، ئەو کەسە فرێ دەدرێتە دەشتاییەکی فراوانی تەخت، بە سمەکانی دەیشێلێت و بە شاخیشی قۆچی لێ دەدا، کاتێ کۆتاییەکەی تێدەپەڕێ یەکەمینیان بەدوایدا دێت و دەدات بەسەریدا، تا دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەکرێ، پاشان دەرەنجامی خۆی دەبینێ. عامیری پێی وت: ئەی ئەبو هورەیرە مافی وشتر چییە لە زەکاتدا؟ وتی: وشتری چاك بدەی بە زەکات، وە ئەوەی شیری زۆرە بیدەیتە لای خەڵك تا سوود لە شیرەکەی وەربگرن، وە بەئامانەت بیدەیتە لای خەڵك بۆ سواربوون، وە هەر کەس داوای کرد بۆ بەکەڵدان کرێی لێ وەرنەگری، وە لە شیرەکەی خەڵك بێبەش نەکەی.

## بَابُ ذِكرِ أَخْذِ الصَّدَقَةِ مِنَ الْمَعَادِنِ إِنَّ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنَ اتِّصَالِ هَذَا الْإِسْنَادِ

٢٣٢٣- عَنِ الْحَارِثِ بْنِ بِلَالٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَخَذَ مِنْ مَعَادِنِ الْقَبِيلَةِ الصَّدَقَةَ، وَأَنَّهُ أَقْطَعَ بِلَالَ بْنَ الْحَارِثِ الْعَقِيقَ أَجْمَعَ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ قَالَ لِبِلَالٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَقْطَعْكَ لِتَحْجِزَهُ عَنِ النَّاسِ، لَمْ يَقْطَعْكَ إِلَّا لِتَعْمَلَ، قَالَ: فَقَطَعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لِلنَّاسِ الْعَقِيقَ[1].

## باسی وەرگرتنی زەکات لە کانزا ئەگەر فەرموودەکە صەحیح بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە لە گەیاندنی ئەم سەنەدە بە یەکدی

واتە: حاریسی کوڕی بیلال دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی لە کانزای هۆزێك وەرگرت، وە ناوچەی (الْعَقِيقَ أَجْمَعَ)ی (کە لە نزیك مەدینە بوو) دا بە بیلالی کوڕی حاریس، کاتێ عومەر بوو بە خەلیفە، بە بیلالی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوە پێی نەدایت قەدەغەی بکەیت لە خەڵك، بەڵکوو بۆ ئەوە پێی دایت کاری پێ بکەیت، وتی: عومەر زەوییەکەی (الْعَقِيق)ی دا بە خەڵك.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ صَدَقَةِ الْعَسَلِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ

**٢٣٢٤-** عَنْ مُغِيرَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنِي أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ بَنِي شَبَابَةَ بَطْنٌ مِنْ فَهْمٍ، كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَسَلٍ لَهُمُ الْعُشْرَ، مِنْ كُلِّ عَشْرِ قِرَبٍ قِرْبَةٌ، وَكَانَ يَحْمِي لَهُمْ وَادِيَيْنِ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، اسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ سُفْيَانَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الثَّقَفِيَّ، فَأَبَوْا أَنْ يُؤَدُّوا إِلَيْهِ شَيْئًا، وَقَالُوا: إِنَّمَا ذَاكَ شَيْءٌ كُنَّا نُؤَدِّيهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَتَبَ سُفْيَانُ إِلَى عُمَرَ بِذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: إِنَّمَا النَّحْلُ ذُبَابُ غَيْثٍ يَسُوقُهُ اللَّهُ رِزْقًا إِلَى مَنْ يَشَاءُ، فَإِنْ أَدُّوا إِلَيْكَ مَا كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاحْمِ لَهُمْ وَادِيَهُمْ، وَإِلَّا فَخَلِّ بَيْنَ النَّاسِ وَبَيْنَهُمَا فَأَدُّوا إِلَيْهِ مَا كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَحَمَى لَهُمْ وَادِيَيْهِمْ[1].

## باسی زەکاتی هەنگوین ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم سەنەدە

واتە: موغیرەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، عەبدوڕەحمانی باوکم بۆی باس کردم لە عەمری کوڕی شوعەیب، لە باوکی، لە باپیریەوە ﷺ، نەوەکانی شەبابە نەوەی سکێك بوون لە هۆزی فەهم، دەیەکی هەنگوینیان دەبرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لە دە جەوەنە جەوەنەیەك، ئەویش پارێزگاری ئەو دوو شیوەی بۆیان دەکرد، کاتێ عومەر بوو بە خەلیفە، سوفیانی کوڕی عەبدوڵای سەقەفی کردە کاربەدەستیان، ئەوان ڕازی نەبوون هیچی بدەنێ، وتیان: ئەوە شتێك بوو ئێمە دەماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، سوفیان نووسراوی کرد بۆ عومەر لەوبارەیەوە، عومەری کوڕی خەتابیش نووسراوی بۆ کردن: مێشەنگ مێشێکە خوا ویستی هەبێت ڕزقی هەر کەسێك بدات دەیبات بۆ لای، ئەگەر ئەوەی دەیاندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە تۆیشیاندا ئەوە پارێزگاری هەردوو شیوەکە بکە بۆیان، ئەگەرنا واز لە خەڵکی بهێنە با وەکوو ئەوان بچنە ئەو دوو شیوە، ئەوانیش ئەوەی دایان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەویشیاندا، ئەویش پارێزگاری هەردوو شیوەکەی بۆ کردن.

---

(١) إسناده حسن.

**٢٣٢٥-** عَن عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أن بَنِي شَبَابَةَ، بَطْنٌ مِنْ فَهْمٍ، فَذَكَرَ مِثْلَ حَدِيثِ الْمُغِيرَةِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ سَوَاءً[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ إِنْ ثَبَتَ فَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ بَنِي شَبَابَةَ، إِنَّمَا كَانُوا يُؤَدُّونَ مِنَ الْعَسَلِ الْعُشْرَ لِعِلَّةٍ لَا؛ لِأَنَّ الْعُشْرَ وَاجِبٌ عَلَيْهِمْ فِي الْعَسَلِ بَلْ مُتَطَوِّعِينَ بِالدَّفْعِ لِحِمَاهُمُ الْوَادِيَيْنِ أَلَا تَسْمَعُ احْتِجَاجَهُمْ عَلَى سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، وَكِتَابَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ إِلَى سُفْيَانَ، لِأَنَّهُمْ إِنْ أَدَّوا مَا كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَحْمِيَ لَهُمْ وَادِيَيْهِمْ، وَإِلَّا خَلَّى بَيْنَ النَّاسِ وَبَيْنَ الْوَادِيَيْنِ، وَمِنَ الْمُحَالِ أَنْ يَمْتَنِعَ صَاحِبُ الْمَالِ مِنْ أَدَاءِ الصَّدَقَةِ الْوَاجِبِ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ إِنْ لَمْ يُحْمَى لَهُ مَا يَرْعَى فِيهِ مَاشِيَتَهُ مِنَ الْكَلَاءِ، وَغَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَحْمِيَ الْإِمَامُ لِبَعْضِ أَهْلِ الْمَوَاشِي أَرْضًا ذَاتَ الْكَلَإِ لِيُؤَدِّيَ صَدَقَةَ مَالِهِ، إِنْ لَمْ يَحْمِ لَهُمْ تِلْكَ الْأَرْضَ، وَالْفَارُوقُ رَحِمَهُ اللَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ بِأَنَّ بَنِي شَبَابَةَ قَدْ كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْعَسَلِ الْعُشْرَ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَحْمِي لَهُمُ الْوَادِيَيْنِ فَأَمَرَ عَامِلَهُ سُفْيَانَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ أَنْ يَحْمِيَ لَهُمُ الْوَادِيَيْنِ إِنْ أَدُّوا مِنْ عَسَلِهِمْ مِثْلَ مَا كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَإِلَّا خَلَّى بَيْنَ النَّاسِ، وَبَيْنَ الْوَادِيَيْنِ، وَلَوْ كَانَ عِنْدَ الْفَارُوقِ رَحِمَهُ اللَّهُ أَخْذُ النَّبِيِّ ﷺ الْعُشْرَ مِنْ غَلِّهِمِ عَلَى مَعْنَى الْإِيجَابِ كَوُجُوبِ صَدَقَةِ الْمَالِ الَّذِي يَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ لَمْ يَرْضَ بِامْتِنَاعِهِمْ مِنْ أَدَاءِ الزَّكَاةِ، وَلَعَلَّهُ كَانَ يُحَارِبُهُمْ لَوِ امْتَنَعُوا مِنْ أَدَاءِ مَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنَ الصَّدَقَةِ، إِذْ قَدْ تَابَعَ الصِّدِّيقُ رَحِمَهُ اللَّهُ مَعَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى قِتَالِ مَنِ امْتَنَعَ مِنْ أَدَاءِ الصَّدَقَةِ مَعَ حَلِفِ الصِّدِّيقِ أَنَّهُ مُقَاتِلٌ مَنِ امْتَنَعَ مِنْ أَدَاءِ عِقَالٍ كَانَ يُؤَدِّيهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَالْفَارُوقُ رَحِمَهُ اللَّهُ قَدْ وَاطَأَهُ عَلَى قِتَالِهِمْ، فَلَوْ كَانَ أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ الْعُشْرَ مِنْ نَحْلِ بَنِي شَبَابَةَ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ عَلَى مَعْنَى الْوُجُوبِ، لَكَانَ الْحُكْمُ عِنْدَهُ فِيهِمْ كَالْحُكْمِ فِيمَنِ امْتَنَعَ عِنْدَ وَفَاةِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ أَدَاءِ الصَّدَقَةِ إِلَى الصِّدِّيقِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە باپیریەوە ﷺ، نەوەکانی شەبابە نەوەی سکێك بوون لە هۆزی فەهم، باسی کرد بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی موغیرەی کوڕی عەبدوڕەحمان.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە ئەگەر تەواو بێت بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی نەوەکانی شەبابە لەبەر هۆکارێك دەیەکیان لە هەنگوینەکە دا نەك لەبەر ئەوەی دەیەك واجب بێت لەسەریان، بەڵکوو بەحەز و ئارەزووی خۆیان دەیاندا چونکە ئەوانیش**

---

(١) إسناده حسن.

لەبەرانبەردا پارێزگاری شیوەكەیان بۆ دەكردن، ئایا نەتبیست چۆن بەڵگەیان هێنایەوە بۆ سوفیانی كوڕی عەبدوڵا، هەروەها نووسراوەكەی عومەریش بۆ سوفیان، چونكە ئەوەی دایان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان شێوە دایان بە ئەوانیش بۆ ئەوەی پارێزگاری دوو شیوەكەیان بۆ بكەن، ئەگەر نەیاندایە ئەوانیش خەڵكیان ئازاد دەكرد وەكوو ئەوان بچنە ئەو شیوە، بێگومان شتێكی مەحاڵە خاوەن مەڕوماڵات ڕێگری زەكات بكات ئەگەر پارێزگاری لە لەوەڕگا نەكەن بۆی، وە دروستیش نییە كاربەدەست پارێزگاری لە زەوییەك بكات لەوەڕی تێدا بێت بۆ هەندێ لە خاوەن مەڕوماڵاتەكان بۆ ئەوەی زەكاتی مەڕوماڵاتەكەی بدات، وە عومەر ئەم حوكمەی دەزانی كە نەوەكانی شەبابە دەیەكی هەنگوینیان دەدا بە پێغەمبەر ﷺ، وە پێغەمبەریش ﷺ لەبەرانبەردا پارێزگاری دوو شیوەكەی بۆ دەكردن، بۆیە فەرمانی كرد بە سوفیانی كوڕی عەبدوڵا پارێزگاری لە دوو شیوەكە بكات ئەگەر بەهەمان شێوەی ئەو هەنگوینە بدەن كە دەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەگەرنا خەڵكی ئازاد دەكات بۆ خۆیان بچنە ئەو دوو شیوە، ئەگەر عومەر پێی وا بووایە ئەو هەنگوینەی پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرتن واجب بووە لەسەریان وەكوو واجبوونی زەكات ئەوە ڕازی نەدەبوو زەكات نەدەن، بەڵكوو ئەگەر ئەوەی واجبە لەسەر شانیان نەیاندایە جەنگی لەگەڵ دەكردن، چونكە ئەبو بەكری صدیق لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ جەنگی ڕاگەیاند لە دژی ئەوانەی ڕێگری لە زەكاتدان دەكەن لەگەڵ ئەوەدا سوێندی خوارد لەگەڵیان بجەنگێت تا ئەوەی دەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ بیدەن بە ئەویش تەنانەت ئەگەر حەبلێكیش بێت، وە عومەریش یەكدەنگ بوو لەگەڵی لەسەر جەنگكردنیان، جا ئەگەر وەرگرتنی دەیەك لە هەنگوینی نەوەكانی شەبابە لای عومەری كوڕی خەتاب بە شێوەی واجبوون بووایە، ئەوە حوكمی ئەوانیش وەكوو حوكمی ئەوان بوو كە لە كاتی مردنی پێغەمبەر ﷺ ڕێگرییان كرد زەكات بدەن بە ئەبو بەكر، خوا زاناترە.

## بَابُ إِيجَابِ الْخُمُسِ فِي الرِّكَازِ

**٢٣٢٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَجْمَاءُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازُ الْخُمُسِ»[1].

---

(١) صحيح.

## باسی واجب بوونی پێنجیەك لە دۆزینەوەی خەزێنە (واتە: دۆزینەوەی کەلوپەلی گرانبەها کە دەگەڕێتەوە بۆ پێشی ئیسلام)

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاژەڵ (هەر زیانێك بدات بەبێ کەمتەرخەمی لە لایەن خاوەنەکەیەوە) ئەوە بە فیڕۆ دەڕوات، وە بیر هیچی تێدا نییە (واتە: ئەگەر کەسێك لە زەوییەکی خۆیدا بیرێك هەڵبکەنێ دواتر کەسێك یان شتێك بکەوێتە نێویەوە ئەوە خوێنبایی نییە، یان ئەگەر کەسێك پیاوێك بە کرێ بگرێ بیری بۆ هەڵبکەنێ شتێك کەوت بەسەریدا و مرد بەبێ کەمتەرخەمی خاوەنماڵ ئەوە خوێنبایی نییە)، وە کانزا و مەعدەنیش هیچی تێدا نییە (ئەگەر کەسێك لە زەوییەکی خۆیدا یان زەوییەك هی کەس نەبێت چاڵ هەڵبکەنێ دواتر کەسێك بکەوێتە نێوی، بەبێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی ئەوە خوێنبایی بۆ نییە)، وە لە دۆزینەوەی هەموو ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی (لە سەردەمی جاهیلی) لەژێر زەویدا شاردرانەتەوە، پێویستە) پێنجیەکی دەربکرێ.

## بَابُ وُجُوبِ الْخُمُسِ فِيمَا يُوجَدُ فِي الْخَرِبِ الْعَادِيِّ مِنْ دَفْنِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الرِّكَازَ لَيْسَ بِدَفْنِ الْجَاهِلِيَّةِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ، إِنْ ثَبَتَ هَذَا الْخَبَرُ عَنْهُ، قَدْ فَرَّقَ بَيْنَ الْمَوْجُودِ فِي الْخَرِبِ الْعَادِيِّ وَبَيْنَ الرِّكَازِ فَأَوْجَبَ فِيهِمَا جَمِيعًا الْخُمُسَ»

**٢٣٢٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄، أَنَّ رَجُلًا مِنْ مُزَيْنَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَكَيْفَ تَرَى فِيمَا يُوجَدُ فِي الطَّرِيقِ الْمِيتَاءِ أَوْ فِي الْقَرْيَةِ الْمَسْكُونَةِ قَالَ: «عَرِّفْهُ سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ بَاغِيهِ فَادْفَعْهُ إِلَيْهِ، وَإِلَّا فَشَأْنُكَ بِهِ، فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْمًا مِنَ الدَّهْرِ، فَأَدِّهَا إِلَيْهِ، وَمَا كَانَ فِي الطَّرِيقِ غَيْرِ الْمِيتَاءِ، وَالْقَرْيَةِ غَيْرِ الْمَسْكُونَةِ فَفِيهِ وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»[١].

---

(١) إسناده حسن.

**باسی واجببوونی پێنجیەك لەوەی دەبینرێتەوە لە کەلاوە و پاشماوەی ئەو شتانەی لە سەردەمی نەفامی کەوتۆتە ژێر زەوی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی (الرِّكَازُ) ئەو شتانە نییە کە لە سەردەمی نەفامی شاردراوەتەوە، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت، چونکە جیاوازی کردووە لە نێوان ئەوەی دەدۆزرێتەوە لە لادێیەکی کۆن کە کەسی تێدا نیشتەجێ نییە و لە نێوان (الرِّكَازُ) لە هەردووکیاندا پێنجیەکی واجب کردووە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە هۆزی موزەینە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: چی دەڵێی دەربارەی شتێك لەسەر ڕێگایەك کە زۆرترین خەڵك بەسەریدا تێپەڕ دەبێت بدۆزرێتەوە، یان لە لادێیەك خەڵکی تێدا نیشتەجێ بێت، فەرمووی: یەك ساڵ بیناسێنە، ئەگەر خاوەنەکەی هات بیدەرەوە پێی، ئەگەرنا ئەوە بۆ خۆت مامەڵەی پێوە بکە، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان خاوەنەکەی هاتەوە، ئەوە بیدەرەوە پێی، وە ئەوەیشی لەسەر ڕێگایەك بوو ئاوەدان نەبوو، وە لادێیەك کەسی تێدا نیشتەجێ نەبوو، وە لە گەنجینەی دۆزراوە، ئەوە پێنجیەکی تێدایە بە زەکات.

**٢٣٢٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلًا مِنْ مُزَيْنَةَ يَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ[١].

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پیاوێك بوو لە موزەینە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَقْدِيمِ الصَّدَقَةِ قَبْلَ حُلُولِ الْحَوْلِ عَلَى الْمَالِ وَالْفَرْقِ بَيْنَ الْفَرْضِ الَّذِي يَجِبُ فِي الْمَالِ وَبَيْنَ الْفَرْضِ الْوَاجِبِ عَلَى الْبَدَنِ

**٢٣٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةٍ، فَقَالَ بَعْضُ مِمَّنْ يَلْمِزُ: مَنَعَ ابْنَ جَمِيلٍ، وَخَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَالْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْ يَتَصَدَّقُوا[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان لە پێشخستنی زەکات پێش ئەوەی ساڵ بەسەر ماڵ و سامانەکە تێپەڕ ببێ، وە جیاوازی لە نێوان ئەو فەڕزەی کە واجبە لە ماڵ و ساماندا و لە نێوان ئەو فەڕزەی واجبە لە وشتردا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە دەرکردنی زەکات، (پێش ئەوەی ساڵ بەسەریدا تێپەڕ بێت) یەکێك لەوانەی ڕەخنە و توانجیان دەگرت (لە پێغەمبەر ﷺ کاتێ صەدەقە و زەکاتی دابەش دەکرد)، وتی: ئیبنو جەمیل و خالیدی کوڕی وەلید و عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ڕێگرییان کرد لەوەی ببەخشن (واتە: زەکات بدەن).

**٢٣٣٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ سَاعِيًا عَلَى الصَّدَقَةِ[١].

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ عُمَرُ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةٍ، فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنَ جَمِيلٍ وَخَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَالْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ فَقِيرًا أَغْنَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْبُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَمَّا الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ فِي خَبَرِ وَرْقَاءَ: وَأَمَّا الْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَهِيَ عَلَيَّ، وَمِثْلُهَا مَعَهَا. وَقَالَ فِي خَبَرِ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ: أَمَّا الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَهِيَ لَهُ وَمِثْلُهَا مَعَهَا. وَقَالَ فِي خَبَرِ شُعَيْبِ بْنِ أَبِي حَمْزَةَ: أَمَّا الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَهِيَ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ وَمِثْلُهَا مَعَهَا. فَخَبَرُ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ: فَهِيَ لَهُ وَمِثْلُهَا مَعَهَا يُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ مَا قَالَ وَرْقَاءُ أَيْ فَهِيَ لَهُ عَلَيَّ». فَأَمَّا اللَّفْظَةُ الَّتِي ذَكَرَهَا شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ، فَهِيَ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ فَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ مَعْنَاهَا فَهِيَ لَهُ عَلَيَّ. مَا بَيَّنْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْعَرَبَ تَقُولُ: عَلَيْهِ يَعْنِي لَهُ، وَلَهُ يَعْنِي عَلَيْهِ، كَقَوْلِهِ جَلَّ وَعَلَا: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ٢٥﴾ الرعد، فَمَعْنَى لَهُمُ اللَّعْنَةُ أَيْ عَلَيْهِمُ اللَّعْنَةُ، وَمُحَالٌ أَنْ يَتْرُكَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ صَدَقَةً قَدْ وَجَبَتْ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ، وَبَعْدَهُ تَرَكَ صَدَقَةً أُخْرَى إِذَا وَجَبَتْ عَلَيْهِ، وَالْعَبَّاسُ مِنْ صَلِيبَةِ بَنِي هَاشِمٍ مِمَّنْ حُرِّمَ عَلَيْهِ صَدَقَةُ غَيْرِهِ أَيْضًا فَكَيْفَ صَدَقَةُ نَفْسِهِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ، قَدْ أَخْبَرَ أَنَّ الْمُمْتَنِعَ مِنْ أَدَاءِ صَدَقَتِهِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ يُعَذَّبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي يَوْمٍ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ بِأَلْوَانِ عَذَابٍ قَدْ ذَكَرْنَاهَا فِي مَوْضِعِهَا فِي

---

(١) صحيح.

هَذَا الْكِتَابِ، فَكَيْفَ يَكُونُ أَنْ يَتَأَوَّلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَتْرُكَ لِعَمِّهِ صِنْوِ أَبِيهِ صَدَقَةً قَدْ وَجَبَتْ عَلَيْهِ لِأَهْلِ سُهْمَانِ الصَّدَقَةِ أَوْ يُبِيحُ لَهُ تَرْكَ أَدَائِهَا وَإِيصَالِهَا إِلَى مُسْتَحِقِّيهَا هَذَا مَا لَا يَتَوَهَّمُهُ عِنْدِي عَالِمٌ، وَالصَّحِيحُ فِي هَذِهِ اللَّفْظَةِ قَوْلُهُ: فَهِيَ لَهُ، وَقَوْلُهُ فَهِيَ عَلَيَّ، وَمِثْلُهَا مَعَهَا أَيْ إِنِّي قَدِ اسْتَعْجَلْتُ مِنْهُ صَدَقَةَ عَامَيْنِ، فَهَذِهِ الصَّدَقَةُ الَّتِي أُمِرْتُ بِقَبْضِهَا مِنَ النَّاسِ هِيَ لِلْعَبَّاسِ عَلَيَّ وَمِثْلُهَا مَعَهَا أَيْ صَدَقَةٌ ثَانِيَةٌ عَلَى مَا رَوَى الْحَجَّاجُ بْنُ دِينَارٍ، وَإِنْ كَانَ فِي الْقَلْبِ مِنْهُ عَنِ الْحَكَمِ عَنْ حُجَيَّةَ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَنَّ الْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ.

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری نارد بۆ سەرپەرشتیکردنی کۆکردنەوەی زەکات.**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: عومەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە دەرکردنی زەکات، (پێش ئەوەی ساڵ بەسەریدا تێپەڕ بێت) وترا: ئیبنو جەمیل و خالیدی کوڕی وەلید و عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب نەیاندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیبنو جەمیل بیانووی نییە مەگەر ئەوە نەبێت کە هەژار بوو خوا دەوڵەمەندی کرد، بەڵام خالیدی کوڕی وەلید ئێوە ستەمی لێ دەکەن، چونکە ئەو زرێ و کەلوپەلەکانی کردووەتە وەقف لەپێناوی خوادا، بەڵام عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی وەرقائدا فەرمووی: بەڵام عەباس مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ و زەکاتەکەی ئەو لەسەر منە و ئەوەندەی دیکەش لەگەڵیدا، وە لە فەرموودەکەی موسای کوڕی عوقبەدا فەرمووی: بەڵام عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ئەوە بۆ ئەوە و ئەوەندەی دیکەش لەگەڵی، وە لەفەرموودەکەی شوعەیبی کوڕی ئەبو حەمزەدا فەرمووی: بەڵام عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی لەسەرە و ئەوەندەیش لەگەڵی، جا فەرموودەکەی موسای کوڕی عوقبە: ئەوە بۆ ئەوە و ئەوەندەی دیکەش لەگەڵی، پێ دەچێ مەبەستی پێی ئەوە بێ کە وەرقاء وتی، واتە: ئەوە بۆ ئەوە و لەسەر منە. ئەو دەستەواژەیەی کە شوعەیبی کوڕی ئەبو حەمزە باسی کرد، زەکاتی لەسەرە، پێ دەچێ مانای ئەوە بێت: ئەوە بۆ ئەوە و لەسەر

منه. وەك لە چەند شوێنێکدا ڕوونم کردۆتەوە لە کتێبەکانماندا کە عەرەب دەڵێ: (عَلَيْهِ)، واتە: (لَهُ)، وە دەڵێ: (لَهُ) واتە: (عَلَيْهِ)، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ٢٥﴾، جا مانای (لَهُمُ اللَّعْنَةُ)، واتە: (عَلَيْهِمُ اللَّعْنَةُ)، وە مەحاڵە پێغەمبەر ﷺ وازی لە زەکاتێك هێنابێت کە واجب بووە لە ماڵ و سامانی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، وە دوای ئەوە وازی لە زەکاتی دیکە هێنابێت کاتێ کە واجب بووە لەسەری، بێگومان عەباس لە پشتی نەوەکانی هاشم بووە لەوانە بوو زەکاتی لەسەر قەدەغە کرابوو، ئیتر چۆن دەبێ زەکاتی خۆی بخوات، وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە ئەو کەسەی زەکاتی ماڵەکەی نادات لە گرانی و هەرزانیدا لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێت لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە بە جۆرەها سزا، بێگومان لە شوێنی خۆیدا لەم کتێبە باسمان کرد، جا چۆن دەبێ بەوشێوە لەیەك بدرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وازی لە زەکاتی مامی هێنابێت کە واجب بووە لەسەری، یان ڕێگەی پێ بدات زەکاتی ماڵەکەی نەدات و نەگات بەوانەی شیاون، پێم وایە پیاوی زانا لەمەدا تووشی هەڵە نابێت، ئەوەی تەواوە لەم دەستەواژەدا فەرموودەکەیەتی: ئەوە بۆ ئەو، وە فەرموودەکەی: ئەوە لەسەر منە و ئەوەندەی دیکەش لەگەڵی، واتە: من زەکاتی دوو ساڵم لێ وەرگرت، ئەو زەکاتەی کە داوام لەخەڵك کرد پێشتر لە عەباسم وەرگرتبوو، وە ئەوەندەی

دیکەش لەگەڵی، واتە: لە پێشەوە زەکاتی ساڵێکم لێ وەرگرت، وەك حەجاجی کوڕی دینار گێڕاویەتەوە، ئەگەر چی لە دڵیشمدا شتێك هەیە دەربارەی حەکەم لە حوجیەی کوڕی عەدی لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشخستنی زەکاتەکەی پێش ئەوەی کاتی خۆی بێت، مۆڵەتی پێ دا زەکاتەکەی پێش بخات.

**٢٣٣١-** عَنِ الْحَجَّاجِ بْنِ دِينَارٍ، غَيْرَ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لَمْ يَقُلْ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ[1].

**واتە:** لە حەجاجی کوڕی دینارەوە، ئەوە نەبێت عەلی کوڕی عەبدوڕەحمان نەیوت پێش ئەوەی کاتی زەکات بێت.

---

(١) إسناده ضعيف.

**بَابُ احْتِسَابِ مَا قَدْ حَبَسَ الْمُؤْمِنُ السِّلَاحَ وَالْعَبْدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مِنَ الصَّدَقَةِ إِذَا وَجَبَتْ، فَهَذِهِ الْمَسْأَلَةُ أَيْضًا مِنْ بَابِ تَقْدِيمِ الصَّدَقَةِ قَبْلَ وُجُوبِهَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ: فَأَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْبُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَجَازَ لِخَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ أَنْ يَحْتَسِبَ مَا قَدْ حَبَسَ مِنَ الْأَدْرَاعِ وَالْأَعْبُدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، مِنَ الصَّدَقَةِ الَّتِي أَمَرَ بِقَبْضِهَا.**

**باسی وەقفکردنی ئەوەی بڕوادار وەقفی کردووە لە چەك و کۆیلە لەپێناو خوادا، لە زەکات و صەدەقە، ئەگەر واجب بوو، هەروەها ئەم مەسەلە لە بەشی پێشخستنی زەکات و صەدەقەیە پێش واجببوونی، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەدا هاتووە: (فَأَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْبُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)، واتە: بەڵام خالید بەڕاستی ئێوە ستەم لە خالید دەکەن، ئەو زرێیەکانی و کۆیلەکانی لەپێناوی خوادا وەقف کردووە، وە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دا بە خالیدی کوڕی وەلید ئەوەی کە کردوویەتی بە وەقف لە زرێیەکان و کۆیلەکان لەپێناوی خوا، لەو زەکاتە حیسابی بکات کە خوا فەرمانی پێکردووە**

**بَابُ اسْتِسْلَافِ الْإِمَامِ الْمَالَ لِأَهْلِ سُهْمَانِ الصَّدَقَةِ وَرَدِّهِ ذَلِكَ مِنَ الصَّدَقَةِ إِذَا قُبِضَتْ بَعْدَ الِاسْتِسْلَافِ**

**٢٣٣٢-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﵁ مَوْلَى النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْرًا، فَقَالَ: «إِذَا جَاءَتِ الصَّدَقَةُ قَضَيْنَا»، فَلَمَّا جَاءَتِ الصَّدَقَةُ قَالَ لِأَبِي رَافِعٍ: «أَعْطِ الرَّجُلَ بَكْرَهُ»، فَنَظَرْتُ فَلَمْ أَرَ إِلَّا رُبَاعًا أَوْ صَاعِدًا، فَأَخْبَرْتُ بِذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «أَعْطِهِ فَإِنَّ خَيْرَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً»[1].

**باسی دروستە ئیمام و پێشەوا ماڵ و سامان بەقەرز وەربگرێ بۆ ئەو کەسانەی پشکیان بەردەکەوێ لە زەکات، دواتر لە زەکات ئەو ماڵ و سامانە بگێڕێتەوە**

واتە: ئەبو ڕافیع ﵁ مەولای پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ وشترێکی تازەپێگەیشتووی بەقەرز وەرگرت لە پیاوێك، فەرمووی: ئەگەر زەکاتمان بۆ هات

---

(١) صحيح.




دەیدەینەوە پێت، کاتێ زەکاتی بۆ هات، بە ئەبو ڕافیعی فەرموو: وشترەکەی کابرا بدەرەوە، منیش تەماشام کرد وشترەکە لە وشترەکەی خۆی باشتر بوو، هەواڵم دا بە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیدەرێ چونکە چاکترینی نێو خەڵك ئەو کەسەیە بەچاکترین شێوە قەرزەکەی دەداتەوە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ السِّعَايَةِ عَلَى الصَّدَقَةِ

## بَابُ ذِكْرِ التَّغْلِيظِ عَلَى السِّعَايَةِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٣٣٣-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَدْخُلُ صَاحِبُ مَكْسٍ الْجَنَّةَ». قَالَ يَزِيدُ: يَعْنِي الْعُشَّارَ[(١)].

### کۆباسی سەرپەرشتیارێتی لەسەر وەرگرتنی زەکات

### باسی هەڕەشەکردن لە وەرگرتنی ماڵ و سامانی خەڵك بەناحەق، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوختکراو (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) ڕوونکراوە

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ناچێتە بەهەشت کەسی گومرگوەرگر. یەزید وتوویەتی: واتە: (الْعُشَّارَ): عوشاریش ئەو کەسەیە لە دە بەش یەك بەش لە خەڵك دەستێنێت بەگومرگ بەناحەق.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ التَّغْلِيظَ فِي الْعَمَلِ عَلَى السِّعَايَةِ الْمَذْكُورَ فِي خَبَرِ عُقْبَةَ هُوَ فِي السَّاعِي، إِذَا لَمْ يَعْدِلْ فِي عَمَلِهِ وَجَارَ وَظَلَمَ، وَفَضْلِ السِّعَايَةِ عَلَى الصَّدَقَةِ إِذَا عَدَلَ السَّاعِي فِيمَا يَتَوَلَّى مِنْهَا وَتَشْبِيهِهِ بِالْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ

**٢٣٣٤-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالْحَقِّ كَالْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ»[(٢)].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده حسن.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەڕەشەكردن لە گەڕان بۆ وەرگرتنی ماڵی خەڵك بەناحەق كە لە فەرموودەكەی عوقبە باس كرا بۆ ئەو كەسەیە كە زەكات كۆ دەكاتەوە و ستەم و ناحەقی دەكات، وە چاكەی ئەو كەسەی بەدادپەروەری زەكات كۆ دەكاتەوە چوێنراوە بەوكەسەی لە ڕێی خوادا جیهاد دەكات

واتە: ڕافیعی كوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو كەسەی زەكات كۆ دەكاتەوە بەدادپەروەرانە وەكوو ئەو كەسە وایە لەپێناوی خوادا غەزا بكات تا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەكەی.

## بَابٌ فِي التَّغْلِيظِ فِي الِاعْتِدَاءِ فِي الصَّدَقَةِ وَتَمْثِيلِ الْمُعْتَدِي فِيهَا بِمَانِعِهَا

**٢٣٣٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا إِيمَانَ لِمَنْ لَا أَمَانَ لَهُ، وَالْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ كَمَانِعِهَا»[١].

## باسی هەڕەشەكردن لە ستەم و دەستدرێژیكردن لە زەكاتدا، وە چواندنی دەستدرێژیكار تیایدا بەوكەسەی زەكات نادات

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو كەسەی ئەمانەتپارێز و دەستپاك نەبێت ئیمانی نییە (واتە: ئیمانی تەواو نییە)، وە دەستدرێژیكار لە زەكاتدا وەكوو ئەو كەسە وایە كە زەكات دەرناكات.

**٢٣٣٦-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ يَوْمٌ فِي بَيْتِهَا وَعِنْدَهُ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُونَ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَدَقَةُ كَذَا وَكَذَا مِنَ التَّمْرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَذَا وَكَذَا»، قَالَ الرَّجُلُ: فَإِنَّ فُلَانًا تَعَدَّى عَلَيَّ فَأَخَذَ مِنِّي كَذَا وَكَذَا، فَازْدَادَ صَاعًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَكَيْفَ إِذَا سَعَى عَلَيْكُمْ مَنْ يَتَعَدَّى عَلَيْكُمْ أَشَدَّ مِنْ هَذَا التَّعَدِّي؟»، فَخَاضَ النَّاسُ وَبَهَرَهُمُ الْحَدِيثُ حَتَّى قَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كَانَ رَجُلًا غَائِبًا عِنْدَ إِبِلِهِ وَمَاشِيَتِهِ وَزَرْعِهِ، فَأَدَّى زَكَاةَ مَالِهِ فَتَعَدَّى عَلَيْهِ الْحَقَّ فَكَيْفَ يَصْنَعُ؟ وَهُوَ عَنْكَ غَائِبٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَدَّى زَكَاةَ مَالِهِ طَيِّبَ النَّفْسِ بِهَا يُرِيدُ وَجْهَ اللَّهِ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ لَمْ يُغَيِّبْ شَيْئًا مِنْ مَالِهِ، وَأَقَامَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ أَدَّى الزَّكَاةَ فَتَعَدَّى عَلَيْهِ الْحَقَّ، فَأَخَذَ سِلَاحَهُ فَقَاتَلَ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەکەمدا دانیشتبوو پیاوانێکیش لە هاوەڵانی لەلای دانیشتبوون قسە وباسیان دەکرد، لەپڕ پیاوێك هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندە و ئەوەندە خورما زەکاتەکەی چەندە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەندە و ئەوەندەیە، پیاوەکە وتی: بەڕاستی فڵانە کەس ستەمی لێکردم ئەوەندە و ئەوەندە لە ماڵەکەمی برد چەند صاعێك زیاتری وت لە حەقی شەرعی خۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی چۆنە ئەگەر کەسێك بەسەرتاندا بگەڕێت بۆ کۆکردنەوەی زەکات ستەمتان لێ بکات لەم ستەمە زیاتر؟ خەڵکەکە سەریان سووڕما لە فەرموودەکە تا پیاوێکیان وتی: ئەگەر پیاوێك دوورەدەست بوو بە خۆی و وشتر و مەڕوماڵات و کشتوکاڵەکەی زەکاتی ماڵەکەی دا و بەناحەق دەستدرێژی لێکرا چی بکات؟ ئەو لە تۆوە دوور بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس زەکاتی ماڵەکەی دەرکرد بەخۆشی خۆی و مەبەستی پێی تەنها خوا و ڕۆژی دوایی بوو هیچ شتێکی لە ماڵەکەی نەشاردەوە، وە نوێژەکانی کرد، پاشان زەکاتی ماڵەکەی دەرکرد، لەسەر حەقی خۆی دەستدرێژی کرایە سەری، ئەویش چەکەکەی هەڵگرت و لەگەڵی جەنگا و دواتر کوژرا ئەوە شەهیدە.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي غُلُولِ السَّاعِي مِنَ الصَّدَقَةِ

**٢٣٣٧-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى الْعَصْرَ ذَهَبَ إِلَى بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، فَتَحَدَّثَ عِنْدَهُمْ حَتَّى يَتَحَدَّثَ لِلْمَغْرِبِ قَالَ أَبُو رَافِعٍ: فَبَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ مُسْرِعًا إِلَى الْمَغْرِبِ مَرَرْنَا بِالْبَقِيعِ، فَقَالَ: أُفٍّ لَكَ أُفٍّ لَكَ، فَكَبُرَ ذَلِكَ فِي ذَرْعِي، فَاسْتَأْخَرْتُ وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يُرِيدُنِي، فَقَالَ: مَا لَكَ؟ امْشِ. فَقُلْتُ: أَحْدَثْتَ حَدَثًا قَالَ: وَمَا لَكَ؟ قُلْتُ: أَفَّفْتَ لِي قَالَ: لَا وَلَكِنَّ هَذَا فُلَانٌ بَعَثْتُهُ سَاعِيًا عَلَى بَنِي فُلَانٍ فَغَلَّ نَمِرَةً، فَدُرِّعَ عَلَى مِثْلِهَا مِنَ النَّارِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْغُلُولُ الَّذِي يَأْخُذُ مِنَ الْغَنِيمَةِ عَلَى مَعْنَى السَّرِقَةِ.

### باسی هەڕەشەی توند لەوەی کۆکەرەوەی زەکات لە زەکات دزی بکات

واتە: ئەبو ڕافیع ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی عەسری کرد چوو بۆ لای نەوەکانی (عَبْدُ الأَشْهَل) لەلایان مایەوە و قسەی بۆ کردن، تا نزیك ئێوارە، ئەبو ڕافیع

وتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە گەڕانەوەیدا پەلەی دەکرد بۆ نوێژی ئێوارە تێپەڕین بەلای گۆڕستانی بەقیعدا، فەرمووی: ئۆف لە تۆ. ئۆف لە تۆ، ئەوە بەلامەوە گران بوو وامزانی لەگەڵ منیەتی، بۆیە خۆم دوا خست و وامزانی بە من دەڵێ، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ ڕێکە، وتم: قسەیەکت کرد؟ فەرمووی: چی؟ وتم: ئۆفت کرد لێم؟ فەرمووی: نەخێر. بەڵکوو ئۆفم لە فڵانە کەس کرد ناردم بۆ وەرگرتنی زەکات لەلای نەوەکانی فڵان زرێیەکی ڕەنگاوڕەنگی دزی ئێستا بە وێنەی ئەوە زرێیەکی ئاگرینی لەبەردایە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەو غولولەی کە لە غەنیمەت دەیبات بە مانای دزیکردنە.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ مَا كَتَمَ السَّاعِي مِنْ قَلِيلِ الْمَالِ أَوْ كَثِيرِهِ عَنِ الْإِمَامِ كَانَ مَا كَتَمَ غُلُولًا قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۝١٦١﴾ آل عمران.**

**٢٣٣٨-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ لَنَا عَلَى عَمَلٍ فَكَتَمَنَا مِنْهُ مِخْيَطًا فَمَا فَوْقَهُ فَهُوَ غُلٌّ يَأْتِي بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ أَسْوَدُ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اقْبَلْ مِنِّي عَمَلَكَ قَالَ: «لِمَ؟» قَالَ: سَمِعْتُكَ تَقُولُ: كَذَا وَكَذَا قَالَ: «وَأَنَا أَقُولُ ذَلِكَ مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَلْيَجِئْ بِقَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، فَمَا أُوتِيَ مِنْهُ أَخَذَهُ وَمَا نُهِيَ عَنْهُ انْتَهَى»[1].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی کۆکەرەوەی زەکات هەر شتێك بشارێتەوە لە ئیمام زۆر بێت یان کەم ئەوەی شاردوویەتیەوە دزێتییە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۝١٦١﴾، واتە: هەر کەس دزی و خیانەت بکات (لە غەنیمەت) ئەوە لە ڕۆژی دواییدا بەو دزی و خیانەتەی کردوویەتی دێ**

واتە: عەدی کوڕی عەمیرەی کیندی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس لەئێوە کارێکی بۆ ئێمە کرد (واتە: ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی پێ سپێردرا) دەرزییەك یان لەوە زیاتری لێ شاردینەوە، ئەوە دزی و خیانەتی کردووە لە ڕۆژی دواییدا بەوەی دزیویەتی دێت، پیاوێکی ڕەشپێست لە ئەنصارەکان هەستا، هەر

---

(١) صحيح.

وەكوو ئەوەی ئێستا لەپێش چاومە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەو كارە لامبە، فەرمووی: بۆچی؟ وتی: گوێم لێ بوو ئەوەت دەفەرموو كە فەرمووت، فەرمووی: ئێستاش ئەوە دەڵێمەوە: هەر كەس لە ئێوە كردمان بە كاربەدەست (بەسەر ماڵ و دارایی مسوڵمانانەوە) ئەوە با كەم و زۆرەكەی بهێنێتەوە، ئەوەی پێی درا وەریبگرێت ئەوەیشی ڕێگری لێ كرا با وازی لێ بێنێ.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي قَبُولِ الْمُصَدِّقِ الْهَدِيَّةَ مِمَّنْ يَتَوَلَّى السِّعَايَةَ عَلَيْهِمْ

**٢٣٣٩-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَعْمَلَ رَجُلًا مِنَ الْأَزْدِ يُقَالُ لَهُ: ابْنُ اللُّتْبِيَّةِ عَلَى صَدَقَةٍ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: هَذَا لَكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي، فَخَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ الْعَامِلِ نَبْعَثُهُ فَيَجِيءُ فَيَقُولُ: هَذَا لِي وَهَذَا أُهْدِيَ إِلَيَّ فَهَلَّا جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَبَيْتِ أُمِّهِ، فَلْيَنْظُرْ هَلْ تَأْتِيهِ هَدِيَّةٌ أَمْ لَا، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَا يَأْتِي أَحَدٌ مِنْكُمْ بِشَيْءٍ إِلَّا طِيفَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى عُنُقِهِ إِنْ كَانَ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ أَوْ ثَوْرًا لَهُ ثُوَارٌ - وَرُبَّمَا قَالَ: يَتْعَرُ - قَالَ: ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْنَا عُفْرَتَيْ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ ثَلَاثًا»[١].

## باسی هەڕەشەی توند لەوەی كۆكەرەوەی زەكات دیاری وەربگرێ

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی لە هۆزی ئەزد لەسەر كۆكردنەوەی زەكات دانا پێی دەوترا: ئیبنو لوتبیە، كاتێ هاتەوە، وتی: ئەمە بۆ ئێوە و ئەوەیش بەدیاری پێم دراوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێكی بۆ خەڵكەكە دا، سوپاس و ستاییشی خوای كرد، پاشان فەرمووی: ئەوە چییە ئێمە كۆكەرەوەی زەكات دەنێرین، دێتەوە و دەڵێ: ئەمە بۆ منە و ئەمەیش بەدیاری پێم دراوە، ئەی بۆچی لە ماڵی باوك و دایكی دانەنیشت، دواتر تەماشا بكات ئایا دیاری بۆ دێت یان نا، سوێند بەو خوایەی گیانی موحەممەدی ﷺ بەدەستە، هەر كەس لە ئێوە (بەبێ حەقی خۆی شتێك) ببات ئیللا لەڕۆژی دواییدا دێت ئەو شتە بەسەر گەردنیەوەیە هەڵیگرتووە، ئەگەر وشتر بێت دەباڕێنێ، یان مانگا بێت دەهۆڕێنێ، یان

---

(١) صحيح.

گا بێت دەبارێنێ، پاشان دەستی درێژ کرد هەتا سپیایی بنباڵیان بینی، پاشان سێ جار فەرمووی: ئەی خوایە ئەوە من پەیامی خوام ڕاگەیاند.

## بَابُ صِفَةِ إِتْيَانِ السَّاعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَا غَلَّ مِنَ الصَّدَقَةِ، وَأَمْرِ الْإِمَامِ بِمُحَاسَبَةِ السَّاعِي إِذَا قَدِمَ مِنْ سِعَايَتِهِ

**٢٣٤٠-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا مِنَ الْأَزْدِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ يُقَالُ لَهُ: ابْنُ اللُّتْبِيَّةِ فَلَمَّا جَاءَ حَاسَبَهُ قَالَ: هَذَا مَا لَكُمْ وَهَذَا هَدِيَّةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهَلَّا جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا»، ثُمَّ خَطَبَنَا فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ مِنْكُمْ عَلَى الْعَمَلِ مِمَّا وَلَّانِيهِ اللَّهُ، فَيَأْتِي فَيَقُولُ: هَذَا مَا لَكُمْ وَهَذِهِ هَدِيَّةٌ لِي أَفَلَا جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا، وَاللَّهِ لَا يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْكُمْ شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ إِلَّا لَقِيَ اللَّهَ يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَلَأَعْرِفَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَقِيَ اللَّهَ يَحْمِلُ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ»، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رُئِيَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ بَصَرَ عَيْنِي وَسَمْعَ أُذُنَيَّ»[١].

## باسی چۆنییەتی هاتنی کۆکەرەوەی زەکات لە ڕۆژی دواییدا بەوەی دزیویەتی لە زەکات، وە فەرمانکردن بە ئیمام لێپرسینەوە لە کۆکەرەوەی زەکات بکات ئەگەر هاتەوە لە کۆکردنەوەی

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی لە هۆزی ئەزد لەسەر کۆکردنەوەی زەکاتی نەوەکانی سولەیم دانا، پێی دەوترا: ئیبنو لوتبیە کاتێ هاتەوە (پێغەمبەر ﷺ) حیساباتی لەگەڵ کرد، وتی: ئەمە بۆ ئێوە و ئەوەیش بەدیاری پێم دراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا بۆچی لە ماڵی باوك و دایکت دانەنیشتی هەتا دیاریت بۆ بێت، ئەگەر ڕاست دەکەی، پاشان وتارێکی بۆ داین سوپاس و ستاییشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: دوای ئەوە، من پیاوێك لە ئێوە ئەرکێکی پێ دەسپێرم لەوەی خوا کردوومی بە سەرپەرشتیار، دواتر دێت و دەڵێ: ئەمە بۆ ئێوە و ئەوەیش بەدیاری پێم دراوە، ئایا بۆچی لە ماڵی باوك و دایکی دانەنیشت هەتا

---

(١) صحيح.

دیارییەکەی بۆ بێت، ئەگەر ڕاست دەکات، سوێند بە خوا هەر کەس لە ئێوە بەبێ حەقی خۆی شتێك ببات ئیللا لەڕۆژی دوواییدا دەگاتە خزمەتی خوا ئەو شتە بەسەر گەردنیەوەیەتی هەڵیگرتووە، بەدڵنیاییەوە دەزانم یەکێك لە ئێوە دەگاتە خزمەتی خوا وشترێك بەسەر شانیەوەیە دەباڕێنێ، یان مانگایەك دەهۆڕێنێ، یان مەڕێك دەباڕێنێ، پاشان دەستی درێژ کرد هەتا سپیایی بنباڵی بینرا، پاشان فەرمووی: ئەی خوایە ئەوە من پەیامەکەم ڕاگەیاند. بە چاوم بینیم بە گوێیەکانم بیستیان.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِرْضَاءِ الْمُصَدِّقِ وَإِصْدَارِهِ رَاضِيًا عَنْ أَصْحَابِ الْأَمْوَالِ

**٢٣٤١-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَتَاكُمُ الْمُصَدِّقُ فَلْيَصْدُرْ مِنْ عِنْدِكُمْ، وَهُوَ عَنْكُمْ رَاضٍ»[١].

## باسی ڕازیکردنی کۆکەرەوەی زەکات لەلایەن خاوەنماڵ، وە کاتێ دەگەڕێتەوە ڕازی بێت لە خاوەنماڵ و سامانەکان

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵای بەجەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر کۆکەرەوەی زەکات هات بۆ لاتان (بەجوانی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن و بەچاکی زەکاتەکەی بدەنێ) با کاتێ دەگەڕێتەوە لەلاتان لێتان ڕازی بێت.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ اسْتِعْمَالِ مَوَالِي النَّبِيِّ ﷺ، عَلَى الصَّدَقَةِ إِذَا طَلَبُوا الْعِمَالَةَ، إِذْ هُمْ مِمَّنْ لَا تَحِلُّ لَهُمُ الصَّدَقَةُ الْمَفْرُوضَةُ

**٢٣٤٢-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ، وَالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَا: لِعَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: ائْتِيَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُولَا لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ بَلَغْنَا مَا تَرَى مِنَ السِّنِّ، وَأَحْبَبْنَا أَنْ نَتَزَوَّجَ، وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَبَرُّ وَأَوْصَلُهُمْ، وَلَيْسَ عِنْدَ أَبَوَيْنَا مَا يُصْدِقَانِ عَنَّا فَاسْتَعْمِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَى الصَّدَقَاتِ، فَلْنُؤَدِّ إِلَيْكَ كَمَا يُؤَدِّي إِلَيْكَ الْعُمَّالُ، وَلْنُصِيبَ مِنْهَا مَا كَانَ فِيهَا مِنْ مَرْفَقٍ قَالَ: فَأَتَى عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَنَحْنُ فِي تِلْكَ الْحَالِ، فَقَالَ لَنَا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ لَا وَاللَّهِ لَا يَسْتَعْمِلُ أَحَدًا مِنْكُمْ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَقَالَ لَهُ رَبِيعَةُ بْنُ الْحَارِثِ: هَذَا مِنْ حَسَدِكَ، وَقَدْ نِلْتَ خَيْرَ

---

(١) صحيح.

رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ نَحْسُدْكَ عَلَيْهِ، فَأَلْقَى رِدَاءَهُ، ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: أَنَا أَبُو حَسَنٍ الْقَوْمِ، وَاللَّهِ لَا أَرِيمُ مَكَانِي هُنَا حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْكُمَا ابْنَاكُمَا بِحُورِ مَا بَعَثْتُمَا بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ عَبْدُ الْمُطَّلِبِ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ، حَتَّى تَوَافَقَ صَلَاةُ الظُّهْرِ قَدْ قَامَتْ فَصَلَّيْنَا مَعَ النَّاسِ، ثُمَّ أَسْرَعْتُ أَنَا، وَالْفَضْلُ إِلَى بَابِ حُجْرَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، فَقُمْنَا بِالْبَابِ حَتَّى أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَخَذَ بِأُذُنِي وَأُذُنِ الْفَضْلِ، ثُمَّ قَالَ: أَخْرِجَا مَا تُصَرِّرَانِ، ثُمَّ دَخَلَ فَأَذِنَ لِي وَالْفَضْلَ، فَدَخَلْنَا فَتَوَاكَلْنَا الْكَلَامَ قَلِيلًا، ثُمَّ كَلَّمْتُهُ أَوْ كَلَّمَهُ الْفَضْلُ - قَدْ شَكَّ فِي ذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْحَارِثِ - قَالَ: فَلَمَّا كَلَّمْنَاهُ بِالَّذِي أَمَرَنَا بِهِ أَبَوَانَا، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَاعَةً، وَرَفَعَ بَصَرَهُ قِبَلَ سَقْفِ الْبَيْتِ حَتَّى طَالَ عَلَيْنَا أَنَّهُ لَا يَرْجِعُ شَيْئًا حَتَّى رَأَيْنَا زَيْنَبَ تُلْمِعُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ بِيَدِيهَا أَلَّا نَعْجَلَ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ فِي أَمْرِنَا، ثُمَّ خَفَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ، فَقَالَ لَنَا: «إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ، وَلَا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلَا لِآلِ مُحَمَّدٍ، أُدْعُ لِي نَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ»، فَدَعَى نَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ فَقَالَ: «يَا نَوْفَلُ أَنْكِحْ عَبْدَ الْمُطَّلِبِ فَأَنْكَحَنِي»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُدْعُ مَحْمِيَةَ بْنَ جَزْءٍ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُبَيْدٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى الْأَخْمَاسِ»، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمَحْمِيَةَ: «أَنْكِحِ الْفَضْلَ فَأَنْكَحَهُ مَحْمِيَةُ بْنُ جَزْءٍ»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُمْ فَأَصْدِقْ عَنْهُمَا مِنَ الْخُمُسِ كَذَا وَكَذَا»[١].

## باسی سەرزەنشت کردن لەوەی خزمانی پشتی پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەکات دابنرێ، ئەگەر داوای ئەوەیان کرد بکرێن بە کۆکەرەوەی زەکات، چونکە زەکاتی فەرز کراو حەڵاڵ نییە بۆ ئەوان

واتە: ڕەبیعەی کوڕی حاریس عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب دەگێڕنەوە، ئەوان بە عەبدولموتەلیبی کوڕی ڕەبیعە و فەزلی کوڕی عەباسیان ﷺ وت: بچن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە گەیشتینە ئەو تەمەنە، حەز دەکەین هاوسەرگیری بکەین، تۆش ئەی پێغەمبەری خوا لە هەموویان چاکتریت و پەیوەندی خزمایەتی چاکتر بەجێ دێنی، باوکمان ئەوەندە ماڵ و سامانیان نییە هاوکاریمان بکەن، بمانکە بە کۆکەرەوەی زەکات ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەی کۆکەرەوەکانی دیکە بۆت دێنن ئێمەیش بۆت دێنین، وە ئەوەیش وەردەگرین کە ئەوان وەریدەگرن، وتی: لەو باسەدا بووین عەلی کوڕی ئەبو تالیب هات بۆ لامان،

---

(١) صحيح.

پێیانی وت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کام لە ئێوە لەسەر کۆکردنەوەی زەکات دانانێت، ڕەبیعە پێی وت: ئەمە تەنها حەسوودییە بە ئێمەی دەبەیت، تۆ چاکترینی پێغەمبەری خوات ﷺ بەدەست هێناوە و بووی بە زاوای ئێمە هیچ حەسوودییەکمان پێ نەبردوویت، پاشان ڕاکشا، ئینجا وتی: من باوکی حەسەنم لە شوێنی خۆم ناجولێم تا منداڵەکانی هەردووکتان دەگەڕێنەوە بۆ لاتان بەوەی کە ناردتان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبدولموتەلیب وتی: من و فەزل دەرچووین تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات، دواتر لەگەڵ خەڵکەکە نوێژمان کرد، پاشان من و فەزل بەپەلە ڕۆیشتین بۆ لای دەرگای ژوورەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو ڕۆژە ئەو لای زەینەبی کچی جەحش بوو، لەبەر دەرگاکە وەستاین تا پێغەمبەری خوا ﷺ هات، گوێی من و گوێی فەزلی گرت، پاشان فەرمووی: ئەوەی لە دڵتاندایە ئاشکرای بکەن، پاشان هاتە ژوورەوە مۆڵەتی بە من و فەزل دا، هاتینە ژوورەوە کەمێ قسەمان کرد، پاشان من قسەم لەگەڵ کرد یان فەزل -عەبدوڵای کوڕی حاریس گومانی هەبوو کامیان قسەی کرد- وتی: کاتێ قسەمان لەگەڵی کرد بەوەی باوکمان پێیانی وت، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەندازەیەك بێدەنگ بوو، سەری بەرز کردەوە بۆ سوانەی خانووەکە، هەتا زۆری پێچوو، وتی: زەینەب ئاماژەی بۆ کردین لەپشت پەردەوە پەلەی لێ نەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیار لەوەی ئێمە دەدا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەری داگرت، پێیانی فەرموو: بەڕاستی ئەم زەکاتە پیسیی خەڵکە، نە بۆ موحەممەد ﷺ حەڵاڵە نە بۆ کەسوکاری، فەرمووی: نەوفەلی کوڕی حاریسم بۆ بانگ بکە، بانگی نەوفەلی کوڕی حاریسم کرد فەرمووی: ئەی نەوفەل کچەکەت مارە بکە لە عەبدولموتەلیب، ئەویش لێمی مارە کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەحمیەی کوڕی جەزئم بۆ بانگ بکە، پیاوێك بوو لە نەوەکانی زوبەید، پێغەمبەری خوا ﷺ دینابوو بە کۆکەرەوەی پێنجیەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەحمیەی فەرموو: کچەکەت مارە بکە لە فەزل، مەحمیەی کوڕی جەزئیش کچەکەی لێی مارە کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەستە لە پێنجیەك ئەوەندە و ئەوەندەی پێ ببەخشە.

**٢٣٤٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ الْهَاشِمِيِّ بِمِثْلِهِ، وَقَالَ: لَيْسَ عِنْدَ أَبَوَيْنَا مَا يُصْدِقَانِ عَنَّا، وَزَادَ قَالَ: فَرَجَعْنَا وَعَلِيٌّ مَكَانَهُ فَقَالَ: أَخْبِرَانَا مَا جِئْتُمَا بِهِ قَالَا: وَجَدْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَبَرَّ النَّاسِ وَأَوْصَلَهُمْ قَالَ: هَلِ اسْتَعْمَلَكُمَا عَلَى شَيْءٍ مِنْ هَذِهِ الصَّدَقَةِ؟ قَالَا: لَا، بَلْ صَنَعَ بِنَا خَيْرًا مِنْ ذَلِكِ

أَنْكَحَنَا، وَأَصْدَقَ عَنَّا، فَقَالَ: أَنَا أَبُو الْحَسَنِ أَلَمْ أَكُنْ أَخْبَرْتُكُمَا أَنَّهُ لَنْ يَسْتَعْمِلَكُمَا عَلَى شَيْءٍ مِنْ هَذِهِ الصَّدَقَةِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ أَنْكَحَنَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَقُولُ: إِنَّ الْعَرَبَ تُضِيفُ الْفِعلَ إِلَى الْآمِرِ كَمَا تُضِيفُهُ إِلَى الْفَاعِلِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِإِنْكَاحِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَالْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، فَفُعِلَ ذَلِكَ بِأَمْرِهِ، فَأُضِيفَ الْإِنْكَاحُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، إِذْ هُوَ الْآمِرُ بِهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ هُوَ مُتَوَلِّيًا عَقْدَ النِّكَاحِ.

واتە: عەبدوڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەلی هاشمی بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو گێڕاویەتەوە، وتی: باوکمان ئەوەندە ماڵ و سامانیان نییە یارمەتیمان بدەن، وە ئەوەیشی زیاد کرد وتی: دواتر گەڕاینەوە عەلیش لە شوێنی خۆی بوو، وتی: هەواڵمان بدەنێ چیتان کرد، وتیان: پێغەمبەری خوامان ﷺ بینی چاکترینی نێو خەڵکە و لە هەموویان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دێنێ، وتی: ئایا داینان بە کۆکەرەوەی زەکات؟ وتیان: نەخێر، بەڵکوو شتێکی بۆ کردین لەوە چاکتر مارەی ژنی بۆ بڕین و لە جیاتی ئێمە مارەییەکەی دا، باوکی حەسەن وتی: من باوکی حەسەنم ئایا هەواڵم پێ نەدان هەرگیز داتاننانێت بە کۆکەرەوەی زەکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە (أَنْكَحَنَا) لەو شێوازەیە کە دەڵێم: عەرەب (الْفِعلَ) دەداتە لای فەرمان (الْأَمْرِ)، وەکوو چۆن دەیداتە پاڵ بکەر (الْفَاعِلِ)، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ژنمارەکردن بۆ عەبدولموتەلیب و فەزلی کوڕی عەباس، بە فەرمانی ئەو ئەوە کرا، جا مارەکردنەکە درایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا ئەو فەرمانی پێ کرد، خاوەنداریێتی گرێبەستەکەی نەکرد.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ اسْتِعْمَالِ مَوَالِي النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الصَّدَقَةِ إِذَا طَلَبُوا الْعُمَالَةَ عَلَى السِّعَايَةِ، إِذِ الْمَوَالِي مِنْ أَنْفُسِ الْقَوْمِ، وَالصَّدَقَةُ تَحْرُمُ عَلَيْهِمْ كَتَحْرِيمِهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، صَدَقَةُ الْفَرْضِ دُونَ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ

**٢٣٤٤**- عَنِ ابْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، مَوَالِي النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَقَالَ لِي: اصْحَبْنِي، فَقُلْتُ: لَا حَتَّى آتِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَسْأَلُهُ قَالَ: فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: «إِنَّا لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ، وَإِنَّ مَوَالِيَ الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**سەرزەنشتکردن لەوەی ئەو بەندانەی پێغەمبەر ﷺ ئازادی کردوون و بوون بە مەولای ئەو نابێت بکرێن بە کۆکەرەوەی زەکات، چونکە مەولاکان ئەندامێکن لە قەومەکانیان، زەکات بۆیان حەرامە وەکوو چۆن لەسەر پێغەمبەر ﷺ حەرامە، زەکاتی فەرز نەك خێر و صەدەقەی دیکە**

واتە: ئیبنو ئەبو ڕافیع دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، مەولای پێغەمبەر ﷺ بوو (واتە: کۆیلە بوو پێغەمبەر ﷺ ئازادی کرد)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی نارد لە نەوەکانی مەخزوم بۆ کۆکردنەوەی زەکات، پێمی وت: هاوەڵیم بکە، وتم: نەخێر هاوەڵیت ناکەم، تا دەچمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێ دەکەم، وتی: چوو بۆ خزمەتی پرسیاری لێ کرد، وتی: زەکات بۆ ئێمە حەڵاڵ نابێت، بێگومان مەولای هەر قەومێك لە ئەوانە.

**بَابُ صَلَاةِ الْإِمَامِ عَلَى الْمَأْخُوذِ مِنْهُ الصَّدَقَةُ إِتْبَاعًا لِأَمْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِنَبِيِّهِ ﷺ فِي قَوْلِهِ:** ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴿١٠٣﴾﴾ **التوبة**

**٢٣٤٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا تَصَدَّقَ إِلَيْهِ أَهْلُ بَيْتٍ بِصَدَقَةٍ صَلَّى عَلَيْهِمْ فَتَصَدَّقَ أَبِي بِصَدَقَةٍ إِلَيْهِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى»[(١)].

**باسی پاڕانەوەی ئیمام بۆ ئەو کەسەی زەکاتی لێ وەرگیراوە، وەك شوێنکەوتنی فەرمانی خوا ﷻ بەهۆی پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە فەرمایشتەکەیدا:** ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴿١٠٣﴾﴾**، واتە: وەربگرە لە ماڵ و دارایی یان صەدەقەیەك بە هۆیەوە پاکیان دەکەیتەوە لە گوناە و دڵیان پوخت و خاوێن دەکەیت بەو ماڵ و بەخشینە، وە بۆیان بپاڕێرەوە چونکە پاڕانەوەی تۆ ئارامییە بۆ ئەوان**

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر خانەوادەیەك زەکاتیان بۆی بهێنایە صەڵاواتی دەدا لەسەریان (واتە: بۆیان دەپاڕایەوە، پاڕانەوەی

---

(١) صحيح.

ئەویش هێمنی و ئارامییە بۆیان)، باوکم زەکاتی بۆی هێنا، فەرمووی: خوایە فەڕوبەرەکەت بخەرە نێو ماڵ و سامانی ئەبو ئەوفا.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ قَسْمِ الْمُصَّدَّقَاتِ، وَذِكْرِ أَهْلِ سُهْمَانِهَا

## بَابُ الْأَمْرِ بِقَسْمِ الصَّدَقَةِ فِي أَهْلِ الْبَلْدَةِ الَّتِي تُؤْخَذُ مِنْهُمُ الصَّدَقَةُ

**٢٣٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ وَالِيًا قَالَ: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ كِتَابٍ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا لَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِذَا هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ»[١].

## کۆباسی دابەشکردنی زەکات و باسی ئەوانەی پشکیان بەردەکەوێ

## باسی فەرمانکردن بە دابەشکردنی زەکات بۆ خەڵکی ئەو شارەی کە زەکاتەکەیان لێ وەردەگیرێ

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن وەکوو کاربەدەست فەرمووی: تۆ دەچیت بۆ لای میللەتێك لە خاوەنکتێبەکان، (کاتێ چوویت بۆ لایان) بانگیان بکە بۆ ئەوەی شایەتی بدەن بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە منیش پێغەمبەری خوام، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد بەو شایەتمانە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا ﷻ پێنج نوێژی لەسەریان فەڕز کردووە لە هەموو ڕۆژ و شەوێکدا، خۆ ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی تۆیان کرد، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە کە بەڕاستی خوا زەکاتی لەسەریان فەڕز کردووە لە ماڵ و سامانەکانیان، لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەگەڕێنرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵییان کردی لەوەدا، دەخیلە وریا بە دەست نەبەی بۆ ماڵە چاکەکانیان، هەروەها لە نزای ستەملێکراو بترسە، چونکە لە نێوان ئەو و خوادا پەردە نییە.

---

(١) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ تَحْرِيمِ الصَّدَقَةِ الْمَفْرُوضَةِ عَلَى النَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ ۝٦٠﴾ التوبة، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، بَعْضَ الْفُقَرَاءِ أَوْ بَعْضَ الْمَسَاكِينِ، وَبَعْضَ الْعَامِلِينَ، وَبَعْضَ الْغَارِمِينَ، وَبَعْضَ أَبْنَاءِ السَّبِيلِ، فَوَلَّى النَّبِيَّ ﷺ بَيَانَ مَا نَزَّلَ عَلَيْهِ فِي الْكِتَابِ، فَبَيَّنَ ﷺ أَنَّ هَذِهِ الْأَلْفَاظَ أَلْفَاظٌ عَامٌّ مُرَادُهَا خَاصٌّ، إِذْ كُلُّ هَؤُلَاءِ الْأَصْنَافِ الْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ، وَمَنْ ذُكِرَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ مَوْجُودُونَ فِي آلِ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَدْ أَعْلَمَ ﷺ أَنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ لَهُ وَلَا لِمَوَالِيهِمْ**

**٢٣٤٧-** عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ رضي الله عنهما مَا تَذْكُرُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: أَذْكُرُ أَنِّي أَخَذْتُ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ فَجَعَلْتُهَا فِي فِيَّ فَنَزَعَهَا مِنْ فِيَّ، وَقَالَ: إِنَّا آلَ مُحَمَّدٍ لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ[1].

**باسی قەدەغەکردنی زەکات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لە فەرمایشتەکەیدا: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ ۝٦٠﴾، تا کۆتایی ئایەتەکە، مەبەستی هەندێ لە هەژارەکانە، یان هەندێ لە نەدارەکان و هەندێ کۆکەرەوەکان و هەندێ لە قەرزارەکان و هەندێ لە ڕێبوارەکانە، جا خوا ﷻ پێغەمبەری ﷺ ناردووە فەرمانی پێ کردووە کتێبەکەی ڕوون بکاتەوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕوونی کردۆتەوە کە بەڕاستی ئەم دەستەواژانە گشتگیرن و مەبەستیان پێی تایبەتە، چونکە هەموو ئەو چینانە هەژار و نەدارن، ئەوەیشی لەم ئایەتەدا باس کراوە بوونیان هەیە لە خانەوادەی موحەممەد ﷺ، بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە زەکات حەڵاڵ نییە بۆ ئەو و بۆ ئەوانەشی مەولای ئەون**

واتە: ئەبولحەوڕاء دەڵێ: پرسیارم لە حەسەنی کوڕی عەلی رضي الله عنهما کرد چیت بیر دێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ وتی: ئەوەم وەبیر دێتەوە من خورمایەکم هەڵگرت لە خورمای زەکات و خستمە نێو دەمم، لە دەمم دەریهێنا و فەرمووی: ئێمەی کەسوکاری مۆحەممەد ﷺ زەکات بۆمان حەڵاڵ نییە.

---

(١) صحيح.

**٢٣٤٨-** عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ ﷺ: مَا تَذْكُرُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: أَذْكُرُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنِّي أَخَذْتُ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلْتُهَا فِي فِيَّ فَانْتَزَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلُعَابِهَا، فَأَلْقَاهَا فِي التَّمْرِ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلَيْكَ مِنْ هَذِهِ التَّمْرَةِ لِهَذَا الصَّبِيِّ قَالَ: إِنَّا آلَ مُحَمَّدٍ لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ، وَكَانَ يَقُولُ: «دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يَرِيبُكَ؛ فَإِنَّ الْخَيْرَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الْكَذِبَ رِيبَةٌ». ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ(١).

واتە: ئەبولـحەوراء دەڵێ: بە حەسەنم ﷺ وت: چیت بیر دێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ وتی: ئەوەم وەبیر دێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ من خورمایەکم هەڵگرت لە خورمای زەکات و خستمە نێو دەمم، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەمم دەریهێنا و خستیە نێو خورماکانەوە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەو خورمایەت لە دەمی ئەو منداڵە دەرهێنا؟ فەرمووی: ئێمەی کەسوکاری موحەممەد ﷺ زەکات بۆمان حەڵاڵ نییە، وە دەیفەرموو: واز لەوە بهێنە کە گومانی لێ دەکەیت، وە ئەوە بکە کە گومانت لێی نییە، بێگومان خێر و چاکە لە دڵنیایی و ئاسوودەییدایە، گومان و دوودڵیش درۆیە (و شەڕ و خراپە بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ). پاشان باسی فەرموودەکەی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ عَلَى أَوْلِيَاءِ الْأَطْفَالِ مِنْ آلِ النَّبِيِّ ﷺ مَنْعَهُمْ مِنْ أَكْلِ مَا حَرَّمَ عَلَى الْبَالِغِينَ

**٢٣٤٩-** عَنِ ابْنِ شَيْبَانَ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ: مَا تَذْكُرُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: أَذْكُرُ أَنَّهُ أَدْخَلَنِي مَعَهُ غُرْفَةَ الصَّدَقَةِ، فَأَخَذْتُ تَمْرَةً، فَأَلْقَيْتُهَا فِي فِيَّ، فَقَالَ: أَلْقِهَا فَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا أَحَدٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ(٢).

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێویستە لەسەر سەرپەرشتیارانی منداڵان لە کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لەسەر باڵغەکانیان قەدەغەیە لەسەر منداڵەکانیشیان قەدەغەی بکەن

واتە: ئیبنو شەیبان دەڵێ: بە حەسەنی کوڕی عەلیم ﷺ وت: چیت بیر دێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ وتی: ئەوەم وەبیر دێتەوە لەگەڵ خۆی بردمی بۆ نێو ئەو ژوورەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کە زەکاتی تێدا بوو، خورمایەکم هەڵگرت و خستمە نێو دەمم، فەرمووی: فڕێی بدە چونکە ئەوە نە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵاڵە نە بۆ هیچ کام لە کەسوکارەکەی.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّدَقَةَ الْمُحَرَّمَةَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ هِيَ الصَّدَقَةُ الْمَفْرُوضَةُ الَّتِي أَوْجَبَهَا اللَّهُ فِي أَمْوَالِ الْأَغْنِيَاءِ لِأَهْلِ سُهْمَانِ الصَّدَقَةِ دُونَ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا قَالَ: إِنَّا أَهْلَ بَيْتٍ لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ، أَيِ: الصَّدَقَةُ الَّتِي هَاجَ هَذَا الْجَوَابُ، وَمِنْ أَجْلِهَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ هَذِهِ الْمَقَالَةَ**

٢٣٥٠- قَالَ أَبُو بَكْرٍ، فِي خَبَرِ أَبِي رَافِعٍ ﷺ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا مِنْ مَخْزُومٍ عَلَى الصَّدَقَةِ قَالَ: أَصْحِبْنِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّمَا بَعَثْتُ الْمَخْزُومِيَّ عَلَى أَخْذِ الصَّدَقَةِ الْفَرِيضَةِ، فَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ لِأَبِي رَافِعٍ: إِنَّا لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ، كَانَ جَوَابًا عَلَى الصَّدَقَةِ الَّتِي كَانَ الْجَوَابُ مِنْ أَجْلِهَا[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو صەدەقەی قەدەغەکراوە لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەو صەدەقەیە کە خوا فەرزی کردووە لە ماڵ و سامانی دەوڵەمەندەکان، بۆ ئەوانەی دیاریکراون، نەك صەدەقە و بەخشینی زیادە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمووی: (إِنَّا أَهْلَ بَيْتٍ لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ)، واتە: ئەو صەدەقەی لە میانەی ئەو پرسیارەدا هات، (کە کۆکردنەوەی زەکات بوو) وە لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئەم فەرموودەی فەرموو**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئەبو ڕافیعدا ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی نارد لە هۆزی مەخزوم بۆ کۆکردنەوەی زەکات، وتی: هاوەڵیم بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کابرای مەخزومیم نارد بۆ کۆکردنەوەی صەدەقەی فەرز (واتە: زەکات)، جا فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ صەدەقە بۆ ئێمە حەڵاڵ نییە. وەڵامێك بوو بۆ ئەو صەدەقەی کە وەڵامدانەوەکە لەو پێناوەدا بوو.

٢٣٥١- وَفِي خَبَرِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ: أَخَذْتُ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ التَّمْرُ مِنَ الْعُشْرِ - أَوْ مِنْ نِصْفِ الْعُشْرِ - الصَّدَقَةُ الَّتِي يَجِبُ فِي التَّمْرِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: وە لە فەرموودەکەی حەسەنی کوڕی عەلیدا ﷺ هاتووە: خورمایەکم هەڵگرت لە خورمای زەکات، ئەو خورمایە لە خورمای دەیەك بوو -یان نیوەی دەیەك- ئەو زەکاتە بوو کە لە خورمادا واجب بوو.

**٢٣٥٢-** وَفِي خَبَرِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ رَبِيعَةَ، وَمَصِيرِهِ مَعَ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَمَسْأَلَتِهِمَا إِيَّاهُ اسْتِعْمَالَهُمَا عَلَى الصَّدَقَةِ، وَإِعْلَامِ النَّبِيِّ ﷺ إِيَّاهُمَا: أَنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ، وَلَا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلَا لِآلِ مُحَمَّدٍ، وَإِنَّمَا كَانَتْ مَسْأَلَتُهُمَا اسْتِعْمَالَهُمَا عَلَى الصَّدَقَاتِ الْمَفْرُوضَاتِ، فَقَوْلُهُ ﷺ، فِي إِجَابَتِهِ إِيَّاهُمَا إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ، أَيِ الَّتِي سَأَلْتُمَانِي اسْتَعْمِلْكُمَا عَلَيْهَا: إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ، وَلَا تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ، وَلَا لِآلِ مُحَمَّدٍ[1].

واتە: وە لە فەرموودەکەی عەبدولموتەلیبدا هاتووە، وە ڕێکردنی لەگەڵ فەزلی کوڕی عەباس ﷺ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و داواکردنیان لێی تا لەسەر زەکات دایانبنێت، وە ئاگادارکردنەوەیان لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ: بەڕاستی ئەم زەکاتە پیسیی خەڵکە، نە بۆ موحەممەد حەڵاڵە نە بۆ کەسوکاری موحەممەدیش. داواکردنیان بۆ ئەوە بوو لەسەر صەدەقەی فەڕز دایاننێت (واتە: زەکات)، جا وەڵامدانەوەی لە میانەی پرسیارەکەی ئەوان بوو کە فەرمووی ﷺ: بەڕاستی ئەو صەدەقەی کە ئێوە داواتان لێ کردم لەسەری داتانبنێم، بێگومان ئەوە پیسیی خەڵکە، نە بۆ موحەممەد حەڵاڵە نە بۆ کەسوکاری موحەممەدیش.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلَائِلِ الْأُخْرَى عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ، صَدَقَةَ الْفَرِيضَةِ دُونَ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ

**٢٣٥٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ مِنْ هَذَا الْمَالِ»، فَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ خَبَّرَ أَنَّ لِآلِهِ أَنْ يَأْكُلُوا مِنْ صَدَقَتِهِ إِذْ كَانَتْ صَدَقَتُهُ لَيْسَتْ مِنَ الصَّدَقَةِ الْمَفْرُوضَةِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) ذكره ابن خزيمة معلقا، وقد أخرجه: مالك في **الموطأ** (٢٨٤٠) برواية الليثي، وأحمد ١٤٥/٦ و ٢٦٢، والبخاري ١١٥/٥ (٤٠٤٣) و ١٨٥/٨ (٦٧٢٧) و ١٨٧/٨ (٦٧٣٠)، ومسلم ١٥٣/٥ (١٧٥٨) (٥١)، وأبو داود (٢٩٧٦) و (٢٩٧٧)، والترمذي في **الشمائل** (٤٠٢)، والنسائي في **الكبرى** (٦٣١١) من طرق عن عروة، به.

## باسی کۆمـەڵە بەڵگەیەکی دیکە لەسـەر ئەوەی پێغەمـبەر ﷺ لە فەرموودەکەیدا کە فەرموویەتی: (إِنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ)، مەبەستی صەدەقەی فەرز بووە (زەکات) نەك خێر و بەخشین

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێمە میراتمان لێ نابرێ ئەوەی بەجێمان هێشتووە صەدەقە و بەخشینە، بێگومان کەسوکاری موحەممەد لەم ماڵە دەخۆن (بۆیان نییە لە بژێوی خۆیان زیاتر ببەن)، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەسوکاری بۆیان هەیە لە صەدەقەکەی بخۆن ئەگەر صەدەقەکەی لە صەدەقە فەرزکراوەکان نەبوو (واتە: زەکات).

**٢٣٥٤-** وَفِي خَبَرِ حُذَيْفَةَ، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الْخَطْمِيِّ ﵃، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، فَلَوْ كَانَ الْمُصْطَفَى ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ إِنَّا آلَ مُحَمَّدٍ لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ تَطَوُّعًا، وَفَرِيضَةً لَمْ تَحِلَّ أَنْ تُصْطَنَعَ إِلَى أَحَدٍ مِنْ آلِ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ مَعْرُوفًا إِذِ الْمَعْرُوفُ كُلُّهُ صَدَقَةٌ بِحُكْمِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَوْ كَانَ كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ الْجُهَّالِ لَمَا حَلَّ لِأَحَدٍ أَنْ يُفْرِغَ أَحَدٌ مِنْ إِنَائِهِ فِي إِنَاءِ أَحَدٍ مِنْ آلِ النَّبِيِّ ﷺ مَاءً إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ إِفْرَاغَ الْمَرْءِ مِنْ دَلْوِهِ فِي إِنَاءِ الْمُسْتَسْقِي صَدَقَةٌ، وَلَمَا حَلَّ لِأَحَدٍ مِنْ آلِ النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يُنْفِقَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ عِيَالِهِ إِذَا كَانُوا مِنْ آلِهِ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ خَبَّرَ أَنَّ نَفَقَةَ الْمَرْءِ عَلَى عِيَالِهِ صَدَقَةٌ[١].

واتە: وە لە فەرموودەکەی حوزەیفە و جابری کوڕی عەبدوڵاو عەبدوڵای کوڕی یەزیدی خەتمیەوە ﵃ لە پێغەمبەرەوە ﷺ: هەموو چاکەیەك صەدەقەیە، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەیدا: ئێمەی کەسوکاری موحەممەد صەدەقە (زەکات) حەڵاڵ نییە بۆمان. مەبەستی صەدەقەی ئاسایی و فەرز بووایە، ئەوە حەڵاڵ نەبوو هیچ چاکەیەك بۆ کەسوکاری موحەممەد ﷺ بکرێت، چونکە هەموو چاکەیەك صەدەقەیە، بە حوکمی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر بەوشێوە بووایە وەك چۆن هەندێ لە جاهیلەکان

---

(١) ذكره ابن خزيمة معلقا، وقد أخرجه: أحمد ٣٨٣/٥ و ٣٩٧ و ٣٩٨، والبخاري في **الأدب المفرد** (٢٣٣)، ومسلم ٨٢/٣ (١٠٠٥) (٥٢)، وأبو داود (٤٩٤٧) عن حذيفة.

وأخرجه: عبد بن حميد (١٠٨٣)، والبخاري ١٣/٨ (٦٠٢١)، وفي **الأدب المفرد** له (٢٢٤) عن جابر بن عبد الله.

وأرجه: أحمد ٣٠٧/٤، والبخاري في **الأدب المفرد** (٢٣١) عن عبد الله بن يزيد.

خەیاڵ دەکەن، ئەوە حەڵاڵ نەدەبوو بۆ هیچ کەسێك ئاوی نێو دەفرەکەی بکاتە ناو پەرداخێك بۆ کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە ئەگەر بەندە بە دەفرەکەی ئاو بکاتە ناو پەرداخی کەسێکی تینوو صەدەقەیە، وە حەڵاڵ نەدەبوو بۆ هیچ کەسێك لە کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ ببەخشێ بە خێزان و منداڵەکانی، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بەخشینی بەندە بۆ خێزان و منداڵەکانی خێر و صەدەقەیە.

**٢٣٥٥-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحِمْيَرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي ثَلَاثَةٌ مِنْ بَنِي سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، كُلُّهُمْ يُحَدِّثُهُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى سَعْدٍ يَعُودُهُ بِمَكَّةَ قَالَ: فَبَكَى سَعْدٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا يُبْكِيكَ؟» قَالَ: خَشِيتُ أَنْ أَمُوتَ بِأَرْضِي الَّتِي هَاجَرْتُ مِنْهَا كَمَا مَاتَ سَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا، اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي مَالًا كَثِيرًا، وَإِنَّمَا تَرِثُنِي بِنْتٌ أَفَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَالثُّلُثَيْنِ: قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَالنِّصْفُ: قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَالثُّلُثُ قَالَ: «الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ إِنَّ صَدَقَتَكَ مِنْ مَالِكَ صَدَقَةٌ، وَإِنَّ نَفَقَتَكَ عَلَى عِيَالِكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِنَّ مَا تَأْكُلُ امْرَأَتُكَ مِنْ طَعَامِكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِنَّكَ إِنْ تَدَعْ أَهْلَكَ بِخَيْرٍ - أَوْ قَالَ بِعَيْشٍ - خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ، وَقَالَ بِيَدِهِ»[١].

واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی حیمەیری دەڵێ: سێ لە منداڵەکانی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص بۆیان باس کردم، هەموویان لە باوکیانەوە ﷺ دەیانگێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای سەعد لە مەککە سەردانی کرد، وتی: سەعد گریا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ دەگری؟ وتی: دەترسم لەو زەوییەدا بمرم کە هیجرەتم لێی کردووە، وەکوو چۆن سەعدی کوڕی خەولە مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە شیفای سەعد بدەی، خوایە شیفای سەعد بدەی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە و تەنها کچێکم هەیە میراتم لێ ببات، ئایا وەسیەت بکەم هەموو ماڵەکەم لەپێناو خوا ﷻ ببەخشم؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی دوو لەسەر سێی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: سێیەك، سێیەکیش زۆرە، بەڕاستی ئەوەی دەیبەخشی بە ماڵەکەت صەدەقەیە، وە خەرجیکێشانی ماڵ و منداڵت صەدەقەیە، وە ئەوەی خێزانت لە سەروەت و سامانت دەیخوات بۆ تۆ صەدەقەیە، وە تۆ ئەگەر منداڵەکانت

---

(١) صحيح.

بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵێت چاکترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بهێڵێت دەست لە خەڵك پان بكەنەوە. بە دەستی ئاماژەی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ هُمْ مِنْ آلِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِينَ حُرِمُوا الصَّدَقَةَ، لَا كَمَا قَالَ مَنْ زَعَمَ أَنَّ آلَ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِينَ حُرِمُوا الصَّدَقَةَ، آلُ عَلِيٍّ، وَآلُ جَعْفَرٍ، وَآلُ الْعَبَّاسِ

**٢٣٥٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁، أَنَّ آلَ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِينَ حُرِمُوا الصَّدَقَةَ، آلُ عَلِيٍّ، وَآلُ عُقَيْلٍ، وَآلُ الْعَبَّاسِ، وَآلُ الْمُطَّلِبِ. وَكَانَ الْمُطَّلِبِيُّ يَقُولُ: إِنَّ آلَ النَّبِيِّ ﷺ بَنُو هَاشِمٍ، وَبَنُو الْمُطَّلِبِ الَّذِينَ عَوَّضَهُمُ اللَّهُ مِنَ الصَّدَقَةِ سَهْمَ الصَّدَقَةِ مِنَ الْغَنِيمَةِ فَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ بِقَسْمِهِ سَهْمَ ذِي الْقُرْبَى مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ إِنَّ اللَّهَ أَرَادَ بِقَوْلِهِ ذَوِي الْقُرْبَى بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ دُونَ غَيْرِهِمْ مِنْ أَقَارِبِ النَّبِيِّ ﷺ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نەوەکانی عەبدولموتەلیب ئەو کەسوکارەی پێغەمبەرن ﷺ کە بێبەش کراون لە زەکات، نەك وەکوو ئەوەی کە گومانی وایە و وتوویەتی: کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی بێبەش کراون لە زەکات، خانەوادەی عەلی و خانەوادەی جەعفەر و خانەوادەی عەباسن

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵁ دەگێڕێتەوە، کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ کە بێبەش کراون لە زەکات، بریتین لە: خانەوادەی عەلی و خانەوادەی عوقەیل و خانەوادەی عەباس و خانەوادەی موتەلیب، جا کەسێکی موتەلیبی دەیوت: کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ بریتین لە: نەوەکانی هاشم و نەوەکانی موتەلیب ئەوانە خوا قەرەبووی کردوونەتەوە لە زەکات بە پشکێك لە غەنیمەت، پێغەمبەر ﷺ بەشی خزمە نزیکەکانی ڕوون کردۆتەوە، لە نەوەکانی هاشم و نەوەکانی موتەلیب، خوا مەبەستی لە فەرمایشتەکەی: (ذَوِي الْقُرْبَى)، نەوەکانی هاشم و نەوەکانی موتەلیبە، جگە لە خزمەکانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ.

**٢٣٥٧-** عَنْ يَزِيدَ بْنِ حَيَّانَ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَحُصَيْنُ بْنُ سَمُرَةَ، وَعَمْرُو بْنُ مُسْلِمٍ، إِلَى زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁، فَجَلَسْنَا إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: يَا زَيْدُ رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَصَلَّيْتَ خَلْفَهُ، وَسَمِعْتَ

---

(١) صحيح.

حَدِيثَهُ، وَغَزَوْتَ مَعَهُ لَقَدْ أَصَبْتَ يَا زَيْدُ خَيْرًا كَثِيرًا. حَدِّثْنَا يَا زَيْدُ حَدِيثًا سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَمَا شَهِدْتَ مَعَهُ قَالَ: بَلَى، ابْنَ أَخِي، لَقَدْ قَدِمَ عَهْدِي، وَكَبُرَتْ سِنِي، وَنَسِيتُ بَعْضَ الَّذِي كُنْتُ أَعِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَمَا حَدَّثْتُكُمْ فَاقْبَلُوهُ، وَمَا لَمْ أُحَدِّثْكُمُوهُ، فَلَا تُكَلِّفُونِي قَالَ: قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا خَطِيبًا بِمَاءٍ يُدْعَى خُمًّ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَوَعَظَ وَذَكَّرَ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَيُّهَا النَّاسُ، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَنِي رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَهُ، وَإِنِّي تَارِكٌ فِيكُمُ الثَّقَلَيْنِ: أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللَّهِ، فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، مَنِ اسْتَمْسَكَ بِهِ وَأَخَذَ بِهِ كَانَ عَلَى الْهُدَى، وَمَنْ تَرَكَهُ وَأَخْطَأَهُ كَانَ عَلَى الضَّلَالَةِ، وَأَهْلُ بَيْتِي أُذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. قَالَ حُصِينٌ: فَمَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ يَا زَيْدُ؟ أَلَيْسَتْ نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ؟ قَالَ: بَلَى، نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، وَلَكِنَّ أَهْلَ بَيْتِهِ مَنْ حُرِمَ الصَّدَقَةَ، قَالَ: مَنْ هُمْ؟ قَالَ: آلُ عَلِيٍّ، وَآلُ عُقَيْلٍ، وَآلُ جَعْفَرٍ، وَآلُ الْعَبَّاسِ قَالَ حَصِينٌ: وَكُلُّ هَؤُلَاءِ حُرِمَ الصَّدَقَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ[١].

واتە: یەزیدی کوڕی حەیان دەڵێ: من و حوصەینی کوڕی سەموڕە و عەمری کوڕی موسلیم چووین بۆ لای زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ، لەلای دانیشتین، حوصەین پێی وت: ئەی زەید پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە و لە پشتیەوە نوێژت کردووە و لەگەڵی غەزات کردووە، بەڕاستی ئەی زەید خێرێکی زۆرت بەدەست هێناوە، ئەی زەید فەرموودەیەکمان بۆ باس بکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێت لێی بووبێت و لەگەڵی بووبیت، وتی: بەڵێ، ئەی برازام، بەڕاستی سەردەمم تێپەڕی بەساڵا چووم و هەندێ لەوانەم بیر چووە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەمزانی، ئەوەی بۆتانم باس کرد وەریبگرن، ئەوەیشی بۆتانم باس نەکرد زۆرم لێ مەکەن، وتی: وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لەنێومان هەستا وتارێکی دا لەلای ئاوێك پێی دەوترا: (خُمّ) (لە نێوان مەککە و مەدینە)، سوپاس و ستاییشی خوای کرد و ئامۆژگاری کردین و یادی هێنانەوە، پاشان فەرمووی: دوای ئەوە، ئەی خەڵکینە، بێگومان من مرۆڤم نزیکە نێردراوی خوا بێت بۆ لام (فریشتەی گیانکێشان) وەڵامی بدەمەوە، (گیانم بکێشێ) من دوو شتی سەنگین لەنێو ئێوەدا بەجێ دەهێڵم: یەکەمینیان: کتێبی خوایە هیدایەت و ڕووناکی تێدایە، هەر کەس دەستی پێوە بگرێت ئەوە لەسەر ئەو هیدایەتەیە، هەر کەسیش وازی لێ بهێنێت ئەوە لەسەر گومڕاییە، هەروەها خانەوادەکەم، دەتانترسێنم و خواتان دەهێنمەوە یاد دەربارەی خانەوادەکەم،

---

(١) صحيح.

سێ جار فەرمووی، حوصەین وتی: کێ کەسوکار و خانەوادەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەی زەید؟ ئایا هاوسەرەکانی لە خانەوادەی ئەو نین؟ وتی: بەڵێ، خێزانەکانی لە خانەوادەی ئەون، بەڵام خانەوادەکەی ئەوانەشن کە زەکات و صەدەقەیان لێ قەدەغە کراوە، وتی: ئەوانە کێن؟ وتی: خانەوادەی عەلی و خانەوادەی عوقەیل و خانەوادەی جەعفەر و خانەوادەی عەباس، حوصەین وتی: هەموو ئەوانە بێبەش کراون لە زەکات و صەدەقە؟ وتی: بەڵێ.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْفُقَرَاءِ مِنَ الصَّدَقَةِ إِتْبَاعًا لِأَمْرِ اللَّهِ فِي قَوْلِهِ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ ﴿٦٠﴾﴾ التوبة

٢٣٥٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جُلُوسٌ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ قَالَ فَقُلْنَا لَهُ: هَذَا الْأَبْيَضُ، الرَّجُلُ الْمُتَّكِئُ، فَقَالَ: يَا ابْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ أَجَبْتُكَ»، قَالَ لَهُ الرَّجُلُ: إِنِّي سَائِلُكَ، فَمُشَدِّدٌ مَسْأَلَتَكَ، فَلَا تَأْخُذَنَّ فِي نَفْسِكَ عَلَيَّ قَالَ: «سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ»، قَالَ: أَنْشُدُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ كَانَ قَبْلَكَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، قَالَ: أَنْشُدُ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، قَالَ فَأَنْشُدُكَ اللَّهَ، آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمُهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ نَعَمْ»، قَالَ الرَّجُلُ: قَدْ آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ، أَخُو سَعْدِ بْنِ الْحَكَمِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الصَّدَقَةَ الْمَفْرُوضَةَ غَيْرُ جَائِزٍ دَفْعُهَا إِلَى غَيْرِ الْمُسْلِمِينَ، وَإِنْ كَانُوا فُقَرَاءَ أَوْ مَسَاكِينَ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْلَمَ أَنَّ اللَّهَ أَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَاءِ الْمُسْلِمِينَ، وَيَقْسِمُهَا عَلَى فُقَرَائِهِمْ لَا عَلَى فُقَرَاءِ غَيْرِهِمْ.

**باسی پێدانی زەکات بە هەژاران، لەبەر شوێنکەوتنی فەرمانی خوا ﷻ وەك لە فەرمایشتەکەیدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ ﴿٦٠﴾﴾، واتە: بێگومان زەکات بۆ هەژارەکانە**

---

(١) صحيح.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین لەنێو مزگەوتدا، کابرایەك هاتە ژوورەوە و وشترەکەی خۆی لەنێو مزگەوتدا یەخ دا و پاشان بەستیەوە، پاشان وتی: کامەتان موحەممەدە ﷺ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ شانی دادابوو لە نێوانیاندا، وتی: پێیان وت: ئەو پیاوە سپیپێستەیە کە شانی داداوە، وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: گوێم لێتە، پیاوەکە پێی وت: من پرسیارت لێ دەکەم من سوورم لەسەر پرسیارەکانم دڵت هیچ نەکات لەبارەی منەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی دێت بە بیرتدا پرسیار بکە، پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە پەروەردگاری تۆ و پەروەردگاری ئەوانەی پێش تۆش: ئایا خوا تۆی ڕەوانە کردووە بۆ ئەم خەڵکە هەمووی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی لە ڕۆژ و شەوێکدا پێنج نوێژ بکەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا خوا فەرمانی پێ کردوویت زەکات لە دەوڵەمەندەکانمان وەربگریت و دابەشی بکەیت بەسەر هەژارەکانماندا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: ئەوا ئیمانم هێنا بەوەی تۆ هێناوتە، من نێردراوی قەومەکەی خۆمم ناردوویانم، من زیمامی کوڕی سەعلەبەم برای سەعدی کوڕی حەکەم.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زەکاتی فەرزکراو دروست نییە بدرێت بە غەیری مسوڵمانان، ئەگەرچی هەژار و نەداریش بن، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە خوا فەرمانی پێ کردووە زەکات وەربگرێت لە دەوڵەمەندەکانی مسوڵمانان و دابەشی بکات بەسەر هەژارەکانیاندا نەك هەژاری جگە لە ئەوان.

## بَابُ صَدَقَةِ الْفَقِيرِ الَّذِي يَجُوزُ لَهُ الْمَسْأَلَةُ فِي الصَّدَقَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا وَقْتَ فِيمَا يُعْطَى الْفَقِيرُ مِنَ الصَّدَقَةِ إِلَّا قَدْرًا يَسُدُّ خُلَّتَهُ وَفَاقَتَهُ

٢٣٥٩- عَنْ قَبِيصَةَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَسْتَعِينُهُ فِي حَمَالَةٍ، فَقَالَ: «أَقِمْ عِنْدَنَا، فَإِمَّا أَنْ نَتَحَمَّلَهَا عَنْكَ، وَإِمَّا أَنْ نُعِينَكَ فِيهَا وَاعْلَمْ: أَنَّ الْمَسْأَلَةَ لَا تَحِلُّ لِأَحَدٍ إِلَّا لِأَحَدِ ثَلَاثَةٍ: رَجُلٌ يَحْمِلُ حَمَالَةً عَنْ قَوْمٍ، فَسَأَلَ فِيهَا حَتَّى يُؤَدِّيَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ أَذْهَبَتْ بِمَالِهِ، فَيَسْأَلُ حَتَّى يُصِيبَ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، أَوْ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ فَشَهِدَ لَهُ ثَلَاثَةٌ

مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ، أَوْ مِنْ ذِي الصَّلَاحِ أَنْ قَدْ حَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ فِيهَا حَتَّى يُصِيبَ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، وَقَوَامًا مِنْ عَيْشٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ، وَمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الْمَسَائِلِ سُحْتٌ يَأْكُلُهُ صَاحِبُهُ يَا قَبِيصَةُ سُحْتًا»[١].

## باسی زەكاتدان بەو هەژارەی كە ڕێگەی پێدراوە داوای صەدەقە و زەكات بكات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی تەنها ئەندازەی ئەوەندە دەدرێ بە هەژارەكە كەموكوڕی و هەژارییەكەی پێ پڕ بكاتەوە

واتە: قەبیصە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ یارمەتیم بدات لەوەی ئەركێكم خستبووە ئەستۆی خۆم (لە خوێنبایی، یان غەرامەیەك توانای دانەوەی نەبوو)، فەرمووی: لەلامان بمێنەوە، یان ئەركەكە لەسەر شانت لادەبەین، یاخود هاوكاریت دەكەین، وە بزانە: داواكردن تەنها بۆ سێ كەس دروستە: پیاوێك ئاشتەوایی نێوان دوو كۆمەڵی خستبێتە ئەستۆی خۆی (بە بڕێك لە سامان)، دروستە بۆی داوا بكات هەتا كەموكوڕییەكەی پڕ دەكاتەوە، پاشان دەبێت خۆی بگرێتەوە، وە پیاوێك ماڵەكەی لەدەست چووبێ (بەهۆی سوتان یان كەوتنە ژێر ئاو) ئەوە حەڵاڵە بۆی داوا بكات هەتا كەموكوڕییەكانی پێ پڕ دەكاتەوە لە بژێوی ژیان و پڕكردنەوەی نەداری، پاشان دەبێت خۆی بگرێتەوە، پیاوێكیش تووشی هەژاری بووبێ سێ كەسی ژیر و باوەڕپێكراو لە كەسوكارەكەی، یان كەسانێكی چاكەكار شایەتی بۆ بدەن، (بەڕاستی فڵانە كەس تووشی هەژاری بووە) ئەوە حەڵاڵە بۆی داوا بكات هەتا كەموكوڕییەكانی پڕ دەكاتەوە، لە بژێوی ژیان و پڕكردنەوەی نەداری، پاشان دەبێت خۆی بگرێتەوە، جگە لەوانە لە داواكردن ناڕەوا و حەرامە خاوەنەكەی بەحەرامی دەیخوا، ئەی قەبیصە.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ شَهَادَةَ ذَوِي الْحِجَا فِي هَذَا الْمَوْضِعِ هِيَ الْيَمِينُ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ سَمَّى الْيَمِينَ فِي اللِّعَانِ شَهَادَةً

٢٣٦٠- عَنْ كِنَانَةَ بْنِ نُعَيْمٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ قَبِيصَةَ ﷺ جَالِسًا فَأَتَاهُ نَفَرٌ مِنْ قَوْمِهِ يَسْأَلُونَهُ فِي نِكَاحِ صَاحِبِهِمْ، فَأَبَى أَنْ يُعْطِيَهُمْ، وَأَنْتَ سَيِّدُ قَوْمِكَ، فَلِمَ لَمْ تُعْطِهِمْ شَيْئًا؟ قَالَ: إِنَّهُمْ سَأَلُونِي فِي

---

(١) صحيح.

غَيْرِ حَقٍّ لَوْ أَنَّ صَاحِبَهُمْ عَمَدَ إِلَى ذَكَرِهِ فَعَضَّهُ حَتَّى يَيْبَسَ لَكَانَ خَيْرًا لَهُ مِنَ الْمَسْأَلَةِ الَّتِي سَأَلُونِي: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَحِلُّ الْمَسْأَلَةُ إِلَّا لِثَلَاثَةٍ: لِرَجُلٍ أَصَابَتْ مَالَهُ حَالِقَةٌ، فَيَسْأَلُ حَتَّى يُصِيبَ سَوَادًا مِنْ مَعِيشَةٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ. وَرَجُلٌ حَمَلَ بَيْنَ قَوْمِهِ حَمَالَةً، فَيَسْأَلُ حَتَّى يُؤَدِّيَ حَمَالَتَهُ، ثُمَّ يُمْسِكُ عَنِ الْمَسْأَلَةِ. وَرَجُلٌ يُقْسِمُ ثَلَاثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ بِاللَّهِ لَقَدْ حَلَّتْ لِفُلَانٍ الْمَسْأَلَةُ، فَمَا كَانَ سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ سُحْتٌ لَا يَأْكُلُ إِلَّا سُحْتًا»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی شایەتیدانی خەڵکی باوەڕپێکراو لەم جێگایەدا بریتییە لە سوێندخواردن، چونکە خوا لە سوێندەکەیدا ناوی لیعانی بە شایەتی هێناوە

واتە: کینانەی کوڕی نوعەیم دەڵێ: ئێمە لەلای قەبیصە ﷺ بووین چەند کەسێك لە هۆزەکەی هاتن داوایان دەکرد یارمەتیان بدات بۆ مارەبڕینی هاوڕێیەکیان، ئەویش ڕازی نەبوو هیچیان پێ بدات، (وترا): خۆ تۆ سەرۆکی هۆزەکەتی بۆچی پێیان نابەخشی؟ وتی: ئەوان داوای شتێك دەکەن حەق و ڕەوا نییە، ئەگەر هاوڕێیەکەیان گاز بگرێ لە ئەندامی نێرینەی و ببڕێ تا وشك دەبێت ئەوە چاکترە بۆی لەوەی ئەو داوایە بکات کە داوایان لە من کرد، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: داواکردن حەڵاڵ نییە مەگەر بۆ سێ کەس: پیاوێك ماڵەکەی لەدەست چووبێ (بەهۆی سوتان یان کەوتنە ژێر ئاو، ئەوە حەڵاڵە بۆی) داوا بکات هەتا کەموکوڕییەکانی پێ پڕ دەکاتەوە لە بژێوی ژیانی، پاشان دەبێت خۆی بگرێتەوە لە داواکردن، وە پیاوێك لەنێو هۆزەکەی ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی خستبێتە ئەستۆی خۆی (بە بڕێك لە سامان، دروستە بۆی) داوا بکات هەتا کەموکوڕییەکەی پڕ دەکاتەوە، پاشان دەبێت خۆی بگرێتەوە لە داواکردن، پیاوێکیش (تووشی هەژاری بووبێ) سێ کەسی ژیر و باوەڕپێکراو لە هۆزەکەی سوێند بخۆن بە خوا بەڕاستی فڵانە کەس تووشی هەژارییەك بووە حەڵاڵە بۆی داوا بکات، هەر شتێکی دیکە جگە لەوانە لە داواکردن ناڕەوا و حەرامە خاوەنەکەی بەحەرامی دەیخوات.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِعْطَاءِ مَنْ لَهُ ضَيْعَةٌ مِنَ الصَّدَقَةِ، إِذَا أَصَابَتْ غَلَّتَهُ جَائِحَةٌ أَذْهَبَتْ غَلَّتَهُ قَدْرَ مَا يَسُدُّ فَاقَتَهُ

**٢٣٦١-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ الْمُخَارِقِ الْهِلَالِيِّ ﷺ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، أَسْأَلُهُ فِيهَا، فَقَالَ: «أَقِمْ يَا قَبِيصَةُ، حَتَّى تَأْتِيَنِي الصَّدَقَةُ فَآمُرُ لَكَ بِهَا»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الصَّدَقَةَ لَا تَحِلُّ إِلَّا لِأَحَدِ ثَلَاثَةٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ - أَوْ قَالَ سِدَادًا - مِنْ عَيْشٍ. وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ فَاجْتَاحَتْ مَالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ أَوْ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ. وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ، فَحَلَّتْ لَهُ الصَّدَقَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، فَمَا سِوَى ذَلِكَ يَا قَبِيصَةُ، سُحْتٌ يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتًا»[1].

## باسی مۆڵەتدان بە بەخشین لە صەدەقە و زەکات بۆ ئەو کەسەی بەڵایەك بەسەر ماڵ و سامانەکەیدا هاتووە و تووشی هەژاری بووە بە ئەندازەی ئەوەی شتە سەرەتاییەکانی دابین دەکات

واتە: قەبیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی ﷺ دەڵێ: ئەرکێکم لەنێو هۆزەکەمدا خستە ئەستۆی خۆم (لە خوێنبایی، یان غەرامەیەك توانای دانەوەی نەبوو)، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای هاوکاری لێ بکەم، فەرمووی: ئەی قەبیصە لەلامان بمێنەوە تا صەدەقەم بۆ دێت، فەرمان دەکەم پێت بدرێ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی داواکردنی صەدەقە تەنها بۆ یەکێك لەم سێ شتە دروستە: پیاوێك ئەرکێکی نێو هۆزەکەی خستبێتە ئەستۆی خۆی (لە خوێنبایی، یان غەرامەیەك توانای دانەوەی نەبوو)، حەڵاڵە بۆی داوا بکات هەتا کەموکوڕییەکەی پڕ دەکاتەوە، پیاوێکیش ماڵەکەی لەدەست چووبێ (بەهۆی سوتان یان کەوتنە ژێر ئاو) ئەوە حەڵاڵە بۆی داوا بکات هەتا کەموکوڕییەکانی پێ پڕ دەکاتەوە، پیاوێکیش تووشی هەژارییەك بووبێت، ئەوە حەڵاڵ بۆی داوا بکات هەتا کەموکوڕییەکانی پڕ دەکاتەوە، هەر شتێکی دیکە جگە لەوانە ئەی قەبیصە ئەوە ناڕەوا و حەرامە خاوەنەکەی بەحەرامی دەیخوات.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْيَتَامَى مِنَ الصَّدَقَةِ إِذَا كَانُوا فُقَرَاءَ، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ فَإِنَّ فِي النَّفْسِ مِنْ أَشْعَثَ بْنِ سَوَّارٍ، وَإِنْ لَمْ يَثْبُتْ هَذَا الْخَبَرُ، فَالْقُرْآنُ كَافٍ فِي نَقْلِ الْخَبَرِ الْخَاصِّ فِيهِ، قَدْ أَعْلَمَ اللَّهُ فِي مُحْكَمِ تَنْزِيلِهِ أَنَّ لِلْفُقَرَاءِ قِسْمٌ فِي الصَّدَقَاتِ، فَالْفَقِيرُ - كَانَ يَتِيمًا أَوْ غَيْرَ يَتِيمٍ - فَلَهُ فِي الصَّدَقَةِ قِسْمٌ بِنَصِّ الْكِتَابِ

**٢٣٦٢-** عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَخَذَ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا، فَجَعَلَهَا فِي فُقَرَائِنَا، وَكُنْتُ غُلَامًا يَتِيمًا فَأَعْطَانِي مِنْهُ قَلُوصًا[١].

## باسی بەخشین بە هەتیوەکان لە صەدەقە و زەکات ئەگەر هەژار بوون، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت، چونکە لە دەروونمدا شتێك هەیە دەربارەی ئەشعەسی کوڕی سوار (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە)، وە ئەگەر ئەم فەرموودەیەش جێگیر نەبێت ئەوە قورئان بەسە لە گواستنەوەی هەواڵی تایبەت لەوبارەوە، خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا ڕایگەیاندووە هەژاران پشکێکیان بۆ هەیە لە زەکاتدا، جا هەژار -ئەگەر هەتیو بێت یان جگە لە هەتیو- ئەوە لە زەکاتدا پشکێکی بۆ هەیە بەپێی ئایەتی قورئان

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: کۆکەرەوەی زەکات لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هات بۆ لامان، زەکاتی لە دەوڵەمەندەکانمان وەرگرت و دای بە هەژارەکانمان، منیش منداڵێکی هەتیو بووم وشترێکی پێدام.

## بَابُ ذِكْرِ صِفَةِ الْمُسْلِمِينَ الَّذِينَ أَمَرَ اللَّهُ بِإِعْطَائِهِمْ مِنَ الصَّدَقَةِ

**٢٣٦٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِالطَّوَّافِ، وَلَا بِالَّذِي تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ، وَلَا اللُّقْمَتَانِ، وَلَا التَّمْرَةُ وَلَا التَّمْرَتَانِ، وَلَكِنَّ الْمِسْكِينَ الْمُتَعَفِّفَ الَّذِي لَا يَسْأَلُ النَّاسَ شَيْئًا، وَلَا يُفْطَنُ لَهُ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی سیفاتی ئەو مسوڵمانانەی كە خوا ﷻ فەرمانی كردووە لە زەكات پێیان ببەخشرێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەژاری (ڕاستەقینە) ئەو كەسە نییە (بەسواڵكردن) بەسەر خەڵكیدا دەگەڕێت بۆ خواردنێك، یان پاروویەك یان دوو پاروو، خورمایەك یان دوو خورما بەشی دەكات و پێی ڕازییە، بەڵكوو هەژاری (ڕاستەقینە) ئەو كەسەیە هیچ شتێكی نییە بەشی بكات شەرم دەكات زۆر داوا لە خەڵكی بكات، وە هەستی پێ ناكرێ تا پێی ببەخشرێ.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْعَامِلِ عَلَى الصَّدَقَةِ مِنْهَا رِزْقًا لِعَمَلِهِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا ﴿٦٠﴾﴾ التوبة

**٢٣٦٤-** عَنِ ابْنِ السَّاعِدِيِّ الْمَالِكِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنْهَا، وَأَدَّيْتُهَا إِلَيْهِ أَمَرَ لِي بِعُمَالَةٍ، فَقُلْتُ: إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ، وَأَجْرِي عَلَى اللَّهِ، فَقَالَ: خُذْ مَا أَعْطَيْتُكَ، فَإِنِّي قَدْ عَمِلْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَعَمَّلَنِي، فَقُلْتُ: مِثْلَ قَوْلِكَ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُعْطِيتَ شَيْئًا مِنْ غَيْرِ أَنْ تَسْأَلَ فَكُلْ وَتَصَدَّقْ»[١].

## باسی پێدانی كرێی كۆكەرەوەی زەكات لەبەر ئەو كارەی كە كردوویەتی، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا ﴿٦٠﴾﴾، واتە: بەڕاستی خێرەكان تەنها بۆ بێنەوایان و هەژاران و كرێكارانێكە كە بەسەریەوەن

واتە: ئیبنو ساعیدی مالیكی دەڵێ: عومەری كوڕی خەتاب ﷺ ڕایسپاردم بە كۆكردنەوەی زەكات، كاتێ تەواو بووم و زەكاتەكانم بۆی برد، كرێی پێ دام، وتم: من بۆ خوا كردوومە و پاداشتم لەلای خوایە، وتی: ئەوەی پێم دای وەریبگرە، چونكە منیش لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ زەكاتم كۆكردەوە، كرێی پێ دام، هەمان قسەی تۆم كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەگەر شتێكت پێ درا بەبێ داواكردن ئەوە بیخۆ و لێی ببەخشە.

---

(١) صحيح.

**٢٣٦٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي خِلَافَتِهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَلَمْ أُحَدَّثْ إِنَّكَ تَلِي مِنْ أَعْمَالِ النَّاسِ عَمَلًا، فَإِذَا أُعْطِيتَ الْعُمَالَةَ كَرِهْتَهَا؟ فَقُلْتُ: بَلَى قَالَ عُمَرُ: فَمَا أَنْزَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ: لِي أَفْرَاسٌ وَأَعْبُدٌ، وَأَنَا بِخَيْرٍ، فَأُرِيدُ أَنْ يَكُونَ عَمَلِي صَدَقَةً عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: فَلَا تَفْعَلْ، فَإِنِّي قَدْ كُنْتُ أَرَدْتُ الَّذِي أَرَدْتَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْطِينِي الْعَطَاءَ، فَأَقُولُ أَعْطِهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذْ فَتَقَوَّ بِهِ، أَوْ تَصَدَّقْ، وَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ، وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ، وَلَا سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[(١)].

واتە: عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح دەگێڕێتەوە، ئەو ڕۆیشت بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لە خیلافەتەکەیدا، عومەر پێی وت: هەواڵم پێ گەیشتووە تۆ کارێك ڕادەپەڕێنی لە کاروباری مسوڵمان لەسەر ئەو کارە کرێت پێ دراوە بەڵام پێت ناخۆش بووە وەریبگری، وتی: بەڵێ، عومەر وتی: مەبەستت چییە لەوەدا؟ وتم: من چەندین ئەسپ و بەندەم هەیە و لەشم ساغە، دەمەوێت کارەکەم چاکەیەك بێت بۆ مسوڵمانان، عومەر پێی وت: کاری وا مەکە منیش ڕەتم کردەوە وەکوو چۆن تۆ ڕەتت کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخششی پێ دەبەخشیم، دەموت: بیبەخشە بە کەسێك لە من هەژارتر بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەریبگرە خۆتی پێ بەهێز بکە، یان بیبەخشە، هەر شتێکت پێ درا لەو ماڵ و سامانە بەبێ چاوتێبڕین و داواکردن وەریبگرە، ئەگەرنا چاوی تێ مەبڕە و بەدوای مەکەوە.

**٢٣٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُعْطِي ابْنَ الْخَطَّابِ، فَيَقُولُ عُمَرُ: أَعْطِهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ: «خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ، أَوْ تَصَدَّقْ»[(٢)].

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەرکێکی دەخستە ئەستۆی عومەر، ئەویش ڕایدەپەڕاند، پێغەمبەری خواش ﷺ شتێکی بە عومەر دەبەخشی، عومەر دەیوت: بیبەخشە بە کەسێك لە من هەژارتر بێت، فەرمووی: بیبە و بیکە موڵکی خۆت، یان بیبەخشە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْعَامِلَ عَلَى الصَّدَقَةِ إِنْ عَمِلَ عَلَيْهَا مُتَطَوِّعًا بِالْعَمَلِ بِغَيْرِ إِرَادَةٍ وَنِيَّةٍ لِأَخْذِ عُمَالَةٍ عَلَى عَمَلِهِ فَأَعْطَاهُ الْإِمَامُ لِعُمَالَتِهِ رِزْقًا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ وَلَا إِشْرَافٍ، فَجَائِزٌ لَهُ أَخْذُهُ

**٢٣٦٧-** عَنْ أَسْلَمَ، أَنَّهُ لَمَّا كَانَ عَامُ الرَّمَدَاتِ، وَأَجْدَبَتْ بِبِلَادِ الْأَرْضِ، كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ: مِنْ عَبْدِ اللَّهِ عُمَرَ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، إِلَى الْعَاصِ بْنِ الْعَاصِ لَعَمْرِي مَا تُبَالِي إِذَا سَمِنْتَ، وَمَنْ قِبَلَكَ أَنْ أَعْجَفَ أَنَا وَمَنْ قِبَلِي، وَيَا غَوْثَاهُ. فَكَتَبَ عَمْرٌو: سَلَامٌ، أَمَّا بَعْدُ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ أَتَتْكَ عِيرٌ أَوَّلُهَا عِنْدَكَ، وَآخِرُهَا عِنْدِي، مَعَ أَنِّي أَرْجُو أَنْ أَجِدَ سَبِيلًا أَنْ أَحْمِلَ فِي الْبَحْرِ، فَلَمَّا قَدِمَتْ أَوَّلُ عِيرٍ دَعَا الزُّبَيْرَ، فَقَالَ: اخْرُجْ فِي أَوَّلِ هَذِهِ الْعِيرِ، فَاسْتَقْبِلْ بِهَا نَجْدًا، فَاحْمِلْ إِلَى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ قَدَرْتَ عَلَى أَنْ تُحَمِّلَهُمْ، وَإِلَى مَنْ لَمْ تَسْتَطِعْ حَمْلَهُ فَمُرْ لِكُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ بِبَعِيرٍ بِمَا عَلَيْهِ، وَمُرْهُمْ فَلْيَلْبَسُوا كِيَاسَ الَّذِينَ فِيهِمُ الْحِنْطَةُ، وَلْيَنْحَرُوا الْبَعِيرَ، فَلْيَجْمُلُوا شَحْمَهُ، وَلْيَقْدُوا لَحْمَهُ، وَلْيَأْخُذُوا جِلْدَهُ، ثُمَّ لِيَأْخُذُوا كَمِّيَّةً مِنْ قَدِيدٍ، وَكَمِّيَّةً مِنْ شَحْمٍ، وَحِفْنَةً مِنْ دَقِيقٍ، فَيَطْبُخُوا، فَيَأْكُلُوا حَتَّى يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ بِرِزْقٍ، فَأَبَى الزُّبَيْرُ أَنْ يَخْرُجَ، فَقَالَ: أَمَا وَاللَّهِ لَا تَجِدُ مِثْلَهَا حَتَّى تَخْرُجَ مِنَ الدُّنْيَا، ثُمَّ دَعَا آخَرَ أَظُنُّهُ طَلْحَةَ، فَأَبَى، ثُمَّ دَعَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، فَخَرَجَ فِي ذَلِكَ فَلَمَّا رَجَعَ بَعَثَ إِلَيْهِ بِأَلْفِ دِينَارٍ، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: إِنِّي لَمْ أَعْمَلْ لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ، وَلَسْتُ آخُذُ فِي ذَلِكَ شَيْئًا، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ أَعْطَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَشْيَاءَ بَعَثَنَا لَهَا فَكَرِهْنَا، فَأَبَى ذَلِكَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَاقْبَلْهَا أَيُّهَا الرَّجُلُ فَاسْتَعِنْ بِهَا عَلَى دُنْيَاكَ وَدِينِكَ فَقَبِلَهَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی کۆکەرەوەی زەکات ئەگەر بەخۆبەخش زەکاتی کۆکردەوە بێ ئەوەی نییەتی هەبێ کرێ وەربگرێ لەسەری، دواتر ئیمام کرێی کارەکەی پێدا بێ داواکردن و چاوتێبڕین، دروستە بۆی وەریبگرێ

واتە: ئەسلەم دەگێڕێتەوە، کاتێ ساڵی گرانی قاتوقڕی هات و زەوی وڵات بێبارانی بەخۆیەوە بینی، عومەری کوڕی خەتاب نووسراوێکی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص ﷺ: لە بەندەی خوا عومەر ئەمیری باوەڕداران، بۆ عاصی کوڕی عاص، سوێند بە تەمەنم (ئەوە وشەیەك بووە عەرەب لەسەر زاریان بەکاریان هێناوە مەبەستیان پێی

---

(١) صحیح.

سوێندی حەقیقی نەبووە بە تەمەن) تۆ بە خەیاڵتدا نایەت ئەگەر خۆت تێر بیت و ئەوانەی پێشەوەت برسی و لاوازبن، من و ئەوانەی لە لای منن، ئەی هاوار یارمەتیمان بدەن، عەمر نووسراوێکی بۆ نووسی: سڵاو، دوای ئەوە، لە خزمەتدام لە خزمەتدام، کاروانییەکم ناردووە سەرەتای لای تۆیە و کۆتاییەکەیشی لای منە، لەگەڵ ئەوەدا هەوڵ دەدەم ڕێگایەك بدۆزمەوە بە دەریادا بینێرم، کاتێ یەکەم کاروانی گەیشت زوبەیری بانگ کرد، وتی: لەپێش ئەو کاروانییەوە دەرچۆ، بیبە بۆ نەجد، بۆ هەر خانەوادەیەك بارێکیان پێ بدە ئەوەندەی لە تواناتدایە بیگەیەنی پێیان، ئەوەیشی نەتتوانی بیگەیەنی بە دەستیان، ئەوە فەرمان بکە بە هەموو خانەوادەیەك وشتر و بارەکەیشی پێیان بدە، وە کیسەیشیان پێ بدە کە گەنمی تێدایە، وە با وشترەکە سەرببڕن و بەزەکە بتوێننەوە و گۆشتەکەی بکوڵێنن، سوودیش لە پێستەکەی وەربگرن، پاشان بەشێك لە گۆشتەکەی بەدرێژی ببڕن و خوێی بکەن و بیخەنە بەر خۆر تا وشك دەبێتەوە، لەگەڵ بەشێك لە بەزەکەی و مەنجەڵێك لە ئارد، دواتر بیکوڵێنن، لێی بخۆن تا خوا دەروویان لێ دەکاتەوە، زوبەیر ڕازی نەبوو دەربچێت، وتی: سوێند بە خوا پاداشتی وەکوو ئەوەت دەست ناکەوێت تا لە دنیا دەردەچیت، پاشان یەکێکی دیکەی بانگ کرد پێم وا بوو تەڵحە بوو، ئەویش ڕازی نەبوو بڕوات، پاشان ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی بانگ کرد، ئەویش فەرمانەکەی جێبەجێ کرد و دەرچوو، کاتێ کە گەڕایەوە هەزار دیناری بۆی نارد، ئەبو عوبەیدە وتی: من بۆ ئەوە ئەو کارەم نەکردووە ئەی کوڕەکەی خەتاب، بەڵکوو ئەو کارەم تەنها بۆ خوا کردووە، لەبەرانبەر ئەوە هیچ وەرناگرم، عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەنجامدانی هەندێ کاردا کە دەمانکرد شتی پێ دەداین بەڵام ئێمە پێمان ناخۆش بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبوو بەو پێناخۆشبوونەمان، ئەی پیاو وەریبگرە کەموکوڕی دین و دنیاتی پێ پڕ بکەرەوە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح وەریگرت، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ إِعْطَاءِ الْعَامِلِ عَلَى الصَّدَقَةِ عُمَالَةً مِنَ الصَّدَقَةِ وَإِنْ كَانَ غَنِيًّا

**٢٣٦٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلَّا لِخَمْسَةٍ: الْعَامِلِ عَلَيْهَا، أَوْ غَارِمٍ، أَوْ مُشْتَرِيهَا، أَوْ عَامِلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ جَارٍ فَقِيرٍ يَتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، أَوْ أَهْدَى إِلَيْهِ»[1].

---

(١) صحيح من غير هذا الطريق.

## باسی پێدانی کرێی کۆکردنەوە و سەرپەرشتی کردنی زەکات، بۆ ئەو کەسەی زەکات کۆ دەکاتەوە ئەگەرچی دەوڵەمەندیش بێت

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات و صەدەقە حەڵاڵ نییە بۆ هیچ دەوڵەمەندێك جگە لە پێنج چین (دەوڵەمەند نەبێت، حەڵاڵە بۆیان وەریبگرن): ئەوەی کۆی دەکاتەوە و سەرپەرشتی دەکات، یان قەرزدارە، (قەرزێکی لەسەر بێت و نەتوانێت بیداتەوە، یان کەسێك ئاشتەوایی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵ بە بڕێك لە ماڵ و سامان یا هەر غەرامەیەکی دیکە)، یان کەسێك ئەو زەکاتە بکڕێ (لەوکەسەی پێی دراوە، وە بزانێت ئەوە زەکاتێکە دراوە بە هەژار)، یان کەسێك دەرچووبێت بۆ غەزاکردن لە ڕێی خوادا، یان بۆ کەسێکی (دەوڵەمەند) دراوسێیەکی هەژاری هەبێت، زەکات بدرێت بە پیاوە هەژارەکە ئەویش بەدیاری بیدات بە دەوڵەمەندەکە، (ئەوە دەبێتە دیاری بۆ دەوڵەمەندەکە و گوناهبار نابێت بە وەرگرتنی).

## بَابُ فَرْضِ الْإِمَامِ لِلْعَامِلِ عَلَى الصَّدَقَةِ رِزْقًا مَعْلُوماً

**٢٣٦٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنَ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ رِزْقًا، فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ غُلُولٌ»[1].

## باسی پێشەوا بەشێك دیاری بکات بۆ ئەو کەسەی زەکات کۆ دەکاتەوە و سەرپەرشتی دەکات

واتە: عەبدوڵای کوڕی بوڕەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئەرکێکمان پێی سپارد ئەنجامی بدات، دواتر کرێمان پێی دا، دوای ئەوە هەرچی برد ئەوە دزییە و خیانەتی کردووە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِذْنِ الْإِمَامِ لِلْعَامِلِ بِالتَّزْوِيجِ وَاتِّخَاذِ الْخَادِمِ وَالْمَسْكَنِ مِنَ الصَّدَقَةِ

**٢٣٧٠-** عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ لَنَا عَامِلًا، فَلْيَكْتَسِبْ زَوْجَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ خَادِمٌ، فَلْيَكْتَسِبْ خَادِمًا، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَسْكَنٌ، فَلْيَكْتَسِبْ مَسْكَنًا»[1].

## باسی مۆڵەتدانی پێشەوا بە کۆکەرەوەی زەکات ژن بهێنێ و خزمەتکارێك بۆ خۆی دابین بکات لەگەڵ شوێنی نیشتەجێبووندا لە ماڵی زەکات

واتە: موستەوریدی کوڕی شەداد ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس سەرپەرشتی زەکاتی کرد بۆ ئێمە با هاوسەرگیری لێ بکات (واتە: حەڵاڵە بۆی بە ئەندازەی مارەیی هاوسەرەکەی ببات بەبێ زیادەڕەوی) ئەگەر خزمەتکاری نەبوو با (لە خەزێنەی مسوڵمانان) خزمەتکارێکیش بۆ خۆی دابین بکات، ئەگەر شوێنی نیشتەجێبوونی نەبوو با (لە خەزێنەی مسوڵمانان) شوێنێکی نیشتەجێبوونیش بۆ خۆی دابین بکات. (مانای فەرموودەکە ئەوەیە: کۆکەرەوەی زەکات یان هەر کاربەدەستێك بۆی هەیە لە خەزێنەی مسوڵمانان تێچووی هاوسەرگیری ببات، وە خزمەتکارێك و شوێنی نیشتەجێبوونیش بۆ خۆی دابین بکات، بۆ ئەوەی لە ماوەی دەسەڵاتیدا یەکلا بێتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی).

## بَابُ ذِكْرِ إِعْطَاءِ الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ مِنَ الصَّدَقَةِ لِيَسْلَمُوا لِلْعَطِيَّةِ

**٢٣٧١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُسْأَلْ شَيْئًا عَلَى الْإِسْلَامِ إِلَّا أَعْطَاهُ قَالَ: فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَسَأَلَهُ، فَأَمَرَ لَهُ بِشِيَاءٍ كَثِيرَةٍ بَيْنَ جَبَلَيْنِ مِنْ شِيَاءِ الصَّدَقَةِ قَالَ: فَرَجَعَ إِلَى قَوْمِهِ، فَقَالَ: يَا قَوْمِ أَسْلِمُوا فَإِنَّ مُحَمَّدًا يُعْطِي عَطَاءً لَا يَخْشَى الْفَاقَةَ[2].

## باسی بەخشینی زەکات بەو کەسانەی دڵیان دادەهێنرێ بۆ هاتنە نێو ئیسلام بەهۆی بەخشینەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هەر شتێکی لێ بکرایە لە ئیسلامدا حەتمەن دەیدا پێی، پیاوێك هات بۆ خزمەتی داوای لێ کرد، فەرمانی کرد مەڕوماڵاتێکی زۆری پێ دا لە زەکات بەقەد نێوان دوو کێو، پیاوەکە گەڕایەوە بۆ نێو هۆزەکەی وتی: ئەی هۆزەکەم مسوڵمان بن، سوێند بە خوا موحەممەد ﷺ ئەوەندە ماڵ و سامان دەداتە پیاو هەرگیز ترسی هەژاری و نەداری نامێنێت.

**٢٣٧٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ لَهُ بِشِيَاءٍ بَيْنَ جَبَلَيْنِ فَرَجَعَ إِلَى قَوْمِهِ، فَقَالَ: أَسْلِمُوا؛ فَإِنَّ مُحَمَّدًا يُعْطِي عَطَاءَ رَجُلٍ لَا يَخْشَى الْفَاقَةَ[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ (داوای بەخشینی لێ کرد)، فەرمانی کرد مەڕوماڵاتێکی زۆری پێ دا لە زەکات بەقەد نێوان دوو کێو، پیاوەکە گەڕایەوە بۆ نێو هۆزەکەی وتی: مسوڵمان بن، چونکە بەڕاستی موحەممەد ﷺ ئەوەندە ماڵ و سامان دەداتە پیاو هەرگیز ترسی هەژاری و نەداری نامێنێت.

## بَابُ إِعْطَاءِ رُؤَسَاءِ النَّاسِ وَقَادَتِهِمْ عَلَى الْإِسْلَامِ تَأَلُّفًا بِالْعَطِيَّةِ

**٢٣٧٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِذَهَبٍ لَمْ يُخْلَصْ مِنْ تُرَابِهَا فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةٍ: الْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ الْحَنْظَلِيِّ، وَعُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنٍ الْمُرَادِيِّ، وَعَلْقَمَةَ بْنِ عُلَاثَةَ الْجَعْفَرِيِّ، أَوْ عَامِرِ بْنِ الطُّفَيْلِ - هُوَ شَكٌّ -، وَزِيدٍ الطَّائِيِّ، فَوَجَدَ مِنْ ذَلِكَ قَوْمٌ مِنْ أَصْحَابِهِ مِنَ الْأَنْصَارِ وَغَيْرِهِمْ، فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَقَالَ: أَلَا تَأْتَمِنُونِي، وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ يَأْتِينِي خَبَرُ مَنْ فِي السَّمَاءِ صَبَاحَ مَسَاءَ[2].

## باسی بەخشین بە سەرگەورە و دەسەڵاتداری خەڵك لە ئیسلامدا، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو بەخشینەوە دامەزراوبن لەسەر ئیسلام

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: عەلی لە یەمەنەوە بەشێ لە زێڕی تێکەڵکراو بە خۆڵی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ دابەشی کرد لە نێوان چوار کەسدا:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەقرەعی کوڕی حابیسی حەنزەلی و عویەینەی کوڕی حیصنی موڕادی و عەلقەمەی کوڕی عولاسەی جەعفەری، یان عامری کوڕی توفەیل -گومانی هەبوو کام لەو دووانەیە- وە زەیدی تائیش، خەڵکانێك لە هاوەڵەکانی لە ئەنصارەکان و جگە لەوانیش، شتێك لە دڵیاندا دروست بوو، (وتیان: ئێمە لەپێشترین بەم بەخشینە)، ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: ئایا نامکەن بە ئەمین لە کاتێکدا من ئەمینی ئەو زاتەم کە لە ئاسمانە، هەواڵی ئاسمانم بۆ دێت بەیانی و ئێوارە.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْغَارِمِينَ مِنَ الصَّدَقَةِ وَإِنْ كَانُوا أَغْنِيَاءَ بِلَفْظِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٣٧٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ يَعْنِي إِلَّا لِخَمْسَةٍ: الْعَامِلِ عَلَيْهَا، وَرَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ، أَوْ غَارِمٍ، أَوْ غَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ مِسْكِينٍ تُصُدِّقَ عَلَيْهِ فَأَهْدَى مِنْهَا لَغَنِيٍّ»[١].

## باسی بەخشینی زەکات بە قەرزدارەکان ئەگەرچی دەوڵەمەندیش بن، بە دەستەواژەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات و صەدەقە حەڵاڵ نییە (بۆ هیچ دەوڵەمەندێك) جگە لە پێنج (چین دەوڵەمەند نەبێت، حەڵاڵە بۆیان وەریبگرن): ئەوەی کۆی دەکاتەوە و سەرپەرشتی دەکات، یان کەسێك ئەو زەکاتە بکڕێ (لەوکەسەی پێی دراوە، وە بزانێت ئەوە زەکاتێکە دراوە بە هەژار)، یان قەرزدار، (قەرزێکی لەسەر بێت و نەتوانێت بیداتەوە، یان کەسێك ئاشتەوایی بخاتە نێوان دوو کۆمەڵ بە بڕێك لە ماڵ و سامان یا هەر غەرامەیەکی دیکە)، یان کەسێك دەرچووبێت بۆ غەزاکردن لە ڕێی خوادا، یان بەخشرابێت بە هەژارێك ئەویش بەدیاری دابێتی بە دەوڵەمەندێك (ئەوە دەبێتە دیاری بۆ دەوڵەمەندەکە و گوناهبار نابێت بە وەرگرتنی).

---

(١) صحیح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْغَارِمَ الَّذِي يَجُوزُ إِعْطَاؤُهُ مِنَ الصَّدَقَةِ وَإِنْ كَانَ غَنِيًّا هُوَ الْغَارِمُ فِي الْحِمَالَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ يُعْطَى قَدْرَ مَا يُؤَدِّي الْحِمَالَةَ، لَا أَكْثَرَ

**٢٣٧٥-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ ﷺ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَسْأَلُهُ فِيهَا، فَقَالَ: نُؤَدِّيهَا عَنْكَ وَنُخْرِجُهَا مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ، ثُمَّ قَالَ: يَا قَبِيصَةُ إِنَّ الْمَسْأَلَةَ حَرُمَتْ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً حَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُؤَدِّيَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ اجْتَاحَتْ مَالَهُ حَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ أَوْ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، وَفَاقَةٌ حَتَّى يَتَكَلَّمَ أَوْ يَشْهَدَ ثَلَاثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ أَنَّهُ قَدْ حَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ، حَتَّى يُصِيبَ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ أَوْ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، ثُمَّ يُمْسِكُ فَمَا سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ سُحْتٌ[1].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو قەرزدارەی کە دروستە لە زەکات ماڵ و سامانی پێ بدرێت ئەگەرچی دەوڵەمەندیش بێت، ئەو کەسەیە کە بەهۆی ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵەوە قەرزدار بووە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەوەندەی پێ دەبەخشرێ کە بۆ نێوان ئاشتەوایی ئەو دوو کۆمەڵە لە ئەستۆی گرتووە

واتە: قەبیصەی کوڕی موخاریقی ﷺ دەڵێ: ئەرکێکم خستە ئەستۆی خۆم (لە خوێنبایی، یان غەرامەیەك توانای دانەوەی نەبوو)، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای یارمەتی لێ بکەم، فەرمووی: لە وشتری زەکات ئەوە و ئەوەت بۆ دەدەین، پاشان فەرمووی: ئەی قەبیصە داواکردن حەرامە مەگەر بۆ سێ کەس: پیاوێك ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی خستبێتە ئەستۆی خۆی بە بڕێك لە سامان، حەڵاڵە بۆی داوا بکات هەتا دەیداتەوە، پاشان دەبێت دەست هەڵبگرێت لە داواکردن. وە پیاوێك ماڵەکەی لەدەست چووبێت (بەهۆی سوتان یان ژێر ئاو کەوتنەوە) حەڵاڵە بۆی داوا بکات هەتا بژێوی ژیانی پێ دابین دەکات، یان کەموکوڕییەکانی پێ پڕ دەکاتەوە، پاشان دەبێت دەست هەڵبگرێت لە داواکردن. پیاوێکیش ماڵەکەی لەدەست چووبێت (بەهۆی سوتان یان ژێر ئاو کەوتنەوە) و تووشی هەژاری بووبێ، هەتا خۆی قسە بکات

---

(١) صحيح.

لەسەر حاڵ و گوزەرانی، یاخود سێ کەسی ژیر و متمانەپێکراو لە کەسوکارەکەی شایەتی بۆ بدەن کە بەڕاستی تووشی هەژاری بووە، ئەوە حەڵاڵ بۆی داوا بکات هەتا کەموکوڕییەکانی پڕ دەکاتەوە، لە بژێوی ژیان و پڕکردنەوەی نەداری، پاشان دەبێت دەست هەڵبگرێت لە داواکردن، جگە لەمانە لە داواکردن ناڕەوا و حەرامە بۆ خاوەنەکەی.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِعْطَاءِ مَنْ يَحُجُّ مِنْ سَهْمِ سَبِيلِ اللَّهِ، إِذِ الْحَجُّ مِنْ سَبِيلِ اللَّهِ

**٢٣٧٦-** عَنْ أُمِّ مَعْقِلٍ ﵂ قَالَتْ: تَجَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْحَجِّ، وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَجَهَّزُوا مَعَهُ قَالَتْ: وَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَخَرَجَ النَّاسُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَدِمَ جِئْتُهُ، فَقَالَ: «مَا مَنَعَكِ أَنْ تَخْرُجِي مَعَنَا فِي وَجْهِنَا هَذَا يَا أُمَّ مَعْقِلٍ؟» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ تَجَهَّزْتُ فَأَصَابَتْنَا هَذِهِ الْقُرْحَةُ، فَهَلَكَ أَبُو مَعْقِلٍ، وَأَصَابَنِي مِنْهَا سَقَمٌ، وَكَانَ لَنَا جِمْلٌ نُرِيدُ أَنْ نَخْرُجَ عَلَيْهِ، فَأَوْصَى بِهِ أَبُو مَعْقِلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ: «فَهَلَّا خَرَجْتِ عَلَيْهِ؛ فَإِنَّ الْحَجَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[1].

## باسی مۆڵەتدان بەوکەسەی دەچێت بۆ حەج بەخشینی پێ بدرێ لە پشکی ئەو کەسانەی کە خوا لە ئایەتی زەکاتدا نێوی هێناون بە (فی سبیل الله)، چونکە حەجکردنیش هەر لە ڕێی خوادایە

واتە: ئوممو مەعقیل ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئامادە کرد بۆ حەج، فەرمانیشی کرد بە خەڵك خۆیان ئامادە بکەن لەگەڵی، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، خەڵکەکەیش لەگەڵی دەرچوون، کاتێ هاتەوە بۆ مەدینە چوومە خزمەتی، فەرمووی: چی ڕێگری لێ کردی لەگەڵمان دەرنەچیت بۆ حەجی ئەمساڵ ئەی ئوممو مەعقیل؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خۆم ئامادە کرد بەڵام تووشی ئەو نەخۆشییە بووین، ئەبو مەعقیل نەخۆش کەوت، منیش نەخۆش کەوتم، وشترێکمان هەبوو ویستمان بەو وشترە دەربچین، ئەبو مەعقیل وەسیەتی کرد، کردی بە وەقف لە ڕێی خوادا، فەرمووی: ئەی بۆ پێی دەرنەچووی، چونکە حەجیش لە ڕێی خوادایە.

---

(١) صحیح.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْإِمَامِ الْحَاجَّ إِبِلَ الصَّدَقَةِ لِيَحُجُّوا عَلَيْهَا

**٢٣٧٧-** عَنْ أَبِي لَاسٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ قَالَ: حَمَلَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِبِلٍ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ ضِعَافٍ لِلْحَجِّ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَرَى أَنْ تَحْمِلَنَا هَذِهِ؟ فَقَالَ: «مَا مِنْ بَعِيرٍ إِلَّا عَلَى ذُرْوَتِهِ شَيْطَانٌ، فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِذَا رَكِبْتُمُوهَا كَمَا أَمَرَكُمْ، ثُمَّ امْتَهِنُوهَا لِأَنْفُسِكُمْ، فَإِنَّمَا يَحْمِلُ اللَّهُ»[1].

### باسی ئیمام وشتری زەکات بدات بەوانەی حەج دەکەن بۆ ئەوەی حەجی پێوە بکەن

واتە: ئەبو لاسی خوزاعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشتری کردین لە وشتری زەکات بۆ حەج، وشترەکان لاواز بوون (توانای ئەو ڕێگا دوورەی حەجیان نەبوو)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا پێمان وا نییە ئەم وشترانە توانایان هەبێت ئێمە هەڵبگرن؟ فەرمووی: هیچ وشترێك نییە ئیللا شەیتانێك لەسەر چلەپۆپەی بەرزایی پشتێتی، کاتێ سواری بوون ناوی خوا بێنن وەکوو چۆن فەرمانی پێ کردوون، پاشان بۆ خۆتان بەکاری بێنن، خوا هێز و توانای تێ دەخات بۆتان.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِعْطَاءِ الْإِمَامِ الْمُظَاهِرَ مِنَ الصَّدَقَةِ مَا يُكَفِّرُ بِهِ عَنْ ظِهَارِهِ، إِذَا لَمْ يَكُنْ وَاجِدًا لِلْكَفَّارَةِ

**٢٣٧٨-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: كُنْتُ امْرَأً قَدْ أُوتِيتُ مِنْ جِمَاعِ النِّسَاءِ مَا لَمْ يُؤْتَ غَيْرِي، فَلَمَّا دَخَلَ رَمَضَانُ تَظَاهَرْتُ مِنَ امْرَأَتِي مَخَافَةَ أَنْ أُصِيبَ مِنْهَا شَيْئًا فِي بَعْضِ اللَّيْلِ، فَأَتَتَابَعُ فِي ذَلِكَ، فَلَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَنْزِعَ حَتَّى يُدْرِكَنِي الصُّبْحُ، فَبَيْنَا هِيَ ذَاتُ لَيْلَةٍ تَخْدُمُنِي إِذْ تَكَشَّفَ لِي مِنْهَا شَيْءٌ فَوَثَبْتُ عَلَيْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ غَدَوْتُ عَلَى قَوْمِي، فَأَخْبَرْتُهُمْ خَبَرِي، فَقُلْتُ: انْطَلِقُوا مَعِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَأُخْبِرُهُ قَالُوا: لَا، وَاللَّهِ لَا نَذْهَبُ مَعَكَ نَخَافُ أَنْ يَنْزِلَ فِينَا قُرْآنٌ أَوْ يَقُولُ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَقَالَةً يَبْقَى عَلَيْنَا عَارُهَا، فَاذْهَبْ أَنْتَ وَاصْنَعْ مَا بَدَا لَكَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ خَبَرِي قَالَ: أَنْتَ بِذَاكَ؟ قَالَ: أَنَا بِذَاكَ، وَهَا أَنَا ذَا فَامْضِ فِيَّ حُكْمَ اللَّهِ فَإِنِّي صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ قَالَ: أَعْتِقْ رَقَبَةً، فَضَرَبْتُ صَفْحَةَ رَقَبَتِي بِيَدِي، فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَصْبَحْتُ أَمْلِكُ غَيْرَهَا قَالَ: صُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَهَلْ أَصَابَنِي مَا

---

(١) إسناده حسن.

أَصَابَنِي إِلَّا فِي الصِّيَامِ؟ قَالَ: أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، لَقَدْ بِتْنَا لَيْلَتَنَا هَذِهِ حَشَاءً مَا نَجِدُ عَشَاءً قَالَ: فَانْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ الصَّدَقَةِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ، فَمُرْهُ فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ فَأَطْعِمْ مِنْهَا وَسْقًا وَسِتِّينَ مِسْكِينًا، وَاسْتَعِنْ بِسَائِرِهَا عَلَى عِيَالِكَ فَأَتَيْتُ قَوْمِي، فَقُلْتُ: وَجَدْتُ عِنْدَكُمُ الضِّيقَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ أَفْهَمْ عَنِ الدَّوْرَقِيِّ مَا بَعْدَهَا وَقَالَ الْآخَرُونَ: وَجَدْتُ عِنْدَكُمُ الضِّيقَ، وَسُوءَ الرَّأْيِ وَوَجَدْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ السَّعَةَ وَالْبَرَكَةَ قَدْ أَمَرَ لِي بِصَدَقَتِكُمْ فَادْفَعُوهَا إِلَيَّ قَالَ: فَدَفَعُوهَا إِلَيَّ.

## باسی مۆڵەتدان بەوەی پێشەوا ئەوەندە زەکات ببەخشێت بەوکەسەی (ظِهاري) کردووە کە کەفارەتەکەی پێ بدات، ئەگەر ئەوەندە ماڵ و سامانی نەبوو کەفارەتی پێ بدات

واتە: سەلەمەی کوڕی صەخری ئەنصاری‌ﷺ دەڵێ: من کەسێك بووم ئەوەندە دەچوومە لای خێزانمەوە هیچ کەس ئەوەندە نەدەچووە لای خێزانیەوە، (واتە شەهوەتی زۆر بووە)، جا کاتێ مانگی ڕەمەزان هات (ظِهارم)م کرد لە خێزانم، لە ترسی ئەوەی لە شەودا تووشی شتێك نەبم لەگەڵیدا ڕامبکێشێت و بەردەوامیم پێ بدات تاوەکو بەیانی دەکەمەوە، جا لە کاتێکدا خێزانەکەم شەوێکیان خزمەتی دەکردم، لەناکاو بەشێکی جەستەی دەرکەوت و منیش خۆم بۆ نەگیرا و پەلامارم دا و جیماعم لەگەڵدا کرد، جا کە بەیانیم کردەوە دەرچووم بۆ لای قەومەکەم و هەواڵەکەی خۆمم پێ ڕاگەیاندن (کە تووشی کارێکی ئاوا بووم) و وتم: لەگەڵم وەرن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی هەواڵی بدەمێ، ئەوانیش وتیان: نا سوێند بە خوا لەگەڵت نایەن، دەترسین لەوەی قوڕئان دەربارەمان دابەزێت، یان پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکت دەربارەمان بکات عەیب و شورەییەکەی بۆمان بمێنێتەوە، خۆت بڕۆ و چیت پێ باشە بیکە، بۆیە بەتەنها چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و چیرۆکی خۆم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (ئەی سەلەمە) تۆ ئەوەت کردووە؟ وتم: من کردوومە، ئەوە منم حوکمم بکە بەوەی خوا پێی نیشان داوی، ئارامگرم و چاوەڕوانی پاداشتم، فەرمووی: کەواتە بەندەیەك ئازاد بکە، منیش دام لە پشتەملم و وتم: سوێند بەوەی تۆی ڕەوانە کردووە

---

(١) إسناده ضعيف.

بەحەق خاوەنی هیچ بەندە و کەسێك نیم جگە لەم ملە (واتە تەنها خاوەنی خۆمم نە بەندە و نە پارەی بەندەم نییە تا ئازادی بکەم)، فەرمووی: کەواتە دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەی تووشم بووە هەر لەبەر ڕۆژوو بوو؟ (خۆم بۆ ناگیری دڵنیام تووشی خێزانم دەبمەوە)، فەرمووی: کەواتە نانی شەست هەژار بدە: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە ئەم شەو شەومان کردۆتەوە بەبرسییەتی، هیچ خواردنێکمان نییە، فەرمووی: کەواتە بچۆ بۆ لای خاوەنی زەکاتی بەنی زوڕەیق، فەرمانی پێ بکە با پێت بدات، تۆش ویسقێك (شەست صاع) لە خورما بدە بە شەست هەژار و خۆت و خانەوادەکەشت ئەوەی دیکە بخۆن، (وتی): دواتر چووم بۆ لای قەومەکەم و وتم: لەلای ئێوە بەرتەسکی و بۆچوونی خراپم بینی.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە دەوڕەقییەوە دوای ئەوە تێنەگەیشتم، بەڵام گێڕەرەوەکانی دیکە وتیان: لەلای ئێوە بەرتەسکی و بۆچوونی خراپم بینی، لەلای پێغەمبەری خواش ﷺ فراوانی و بۆچوونی چاك و فەڕوبەرەکەتم دەست کەوت، فەرمانی پێ کردم بەوەی زەکاتی ئێوە وەربگرم، زەکاتەکەتانم پێ بدەن، وتی: زەکاتەکەیان پێ دام.

## بَابُ الْإِمَامِ الْمُصَدِّقِ بِقَسْمِ الصَّدَقَةِ حَيْثُ يَقْبِضُ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ أَشْعَثَ بْنِ سَوَّارٍ، وَإِنْ لَمْ يَثْبُتْ هَذَا الْخَبَرُ، فَخَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ مُعَاذًا بِأَخْذِ الصَّدَقَةِ مِنْ أَغْنِيَاءِ أَهْلِ الْيَمَنِ وَقَسْمِهَا فِي فُقَرَائِهِمْ، كَانَ مِنْ هَذَا الْخَبَرِ

**٢٣٧٩-** عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا سَاعِيًا عَلَى الصَّدَقَةِ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنَ الْأَغْنِيَاءِ فَيَقْسِمُهُ عَلَى الْفُقَرَاءِ، فَأَمَرَ لِي بِقَلُوصٍ(١).

**باسی فەرمانکردنی ئیمام بە کۆکەرەوەی زەکات، هەر کات زەکاتی وەرگرت دابەشی بکات، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی فەرموودەکەی ئەشعەسی کوڕی سوار، (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وە ئەگەر فەرموودەکەش تەواو نەبێت،**

---

(١) إسناده ضعيف.

### ئەوە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس بەڵگەیە لەسەری، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە موعاز زەکات لە دەوڵەمەندەکانی خەڵکی یەمەن وەربگرێ و دابەشی بکات بەسەر هەژارەکانیاندا

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی نارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات، فەرمانی پێ کرد لە دەوڵەمەندەکان وەریبگرێت و دابەشی بکات بەسەر هەژارەکاندا، وشترێکیشی بە من دا.

## بَابُ حَمْلِ صَدَقَاتِ أَهْلِ الْبَوَادِي إِلَى الْإِمَامِ؛ لِيَكُونَ هُوَ الْمُفَرِّقُ لَهَا

**٢٣٨٠-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى صَدَقَاتٍ يُرِيدُ جُهَيْنَةَ، فَكَانَ آخِرُ مَنْ أَتَيْتُ رَجُلًا مِنْهُمْ مِنْ أَدْنَاهُمْ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَجَمَعَ لِي مَالَهُ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، إِلَى قَوْلِهِ، وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ، قَالَ يَحْيَى: يَعْنِي ابْنَ الْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ فِي زَمَنِ مُعَاوِيَةَ مُصَدِّقًا فَصَدَّقَهُ مَالَهُ ثَلَاثِينَ حِقَّةً مَعَهَا فَحْلُهَا، فَبَلَغَ مَالُهُ أَلْفًا وَخَمْسَمِائَةٍ[١].

### باسی هێنانی زەکاتی خەڵکانی دەشتنشین بۆ لای ئیمام، بۆ ئەوەی خۆی بڕیار لەسەر دابەشکردنی بدات

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی هۆزی جوهەینە، جا کۆتا کەسیان کە چووم بۆ لای ماڵیان نزیکترین ماڵ بوو لە مەدینەوە، ماڵ و سامانەکەی بۆم کۆ کردەوە، -دواتر فەرموودەکەی باس کرد-، تا ئەوەی کە وتی: نزای فەڕوبەرەکەتی بۆی کرد، یەحیای کوڕی وەلیدی کوڕی عوقبە لە سەردەمی موعایە کۆکەرەوەی زەکات بوو وتی: ئەو پیاوە زەکاتەکەی کۆکردەوە سی سەر وشتری مێی سێساڵە بوو بەرانەکەیشی لەگەڵ بوو، ماڵ و سامانەکەی گەیشتە هەزار و پێنج سەد وشتر.

**٢٣٨١-** وَفِي خَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ، فَأَتَاهُ آتٍ بِصَدَقَةِ قَوْمِهِ[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

واتە: وە لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ هاتووە: کەسێك هات بۆ لای زەکاتی قەومەکەی هێنا.

## بَابُ حَمْلِ الصَّدَقَةِ مِنَ الْمُدُنِ إِلَى الْإِمَامِ لِيَتَوَلَّى تَفْرِقَتَهَا عَلَى أَهْلِ الصَّدَقَةِ

**٢٣٨٢-** عَن أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ عَلَى زَكَاتِهَا فَجَاءَ بِسَوَادٍ كَثِيرٍ، «فَإِذَا أَرْسَلْتُ إِلَيْهِ مَنْ يَتَوَفَّاهُ مِنْهُ» قَالَ: هَذَا لِي وَهَذَا لَكُمْ، فَإِنْ سُئِلَ مِنْ أَيْنَ لَكَ هَذَا؟ قَالَ: أُهْدِيَ لِي فَهَلَّا إِنْ كَانَ صَادِقًا أُهْدِيَ لَهُ، وَهُوَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ أَوْ أُمِّهِ، ثُمَّ قَالَ: لَا أَبْعَثُ رَجُلًا عَلَى عَمَلٍ فَيَغْتَلُّ مِنْهُ شَيْئًا إِلَّا جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَةِ بَعِيرٍ لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةٍ تَخُورُ، أَوْ شَاةٍ تَيْعَرُ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ». فَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ لِأَبِي حُمَيْدٍ أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: نَعَمْ[١].

## باسی هەڵگرتنی زەکات لە شارەکانەوە بۆ لای ئیمام بۆ ئەوەی خۆی سەرپەرشتی دابەشکردنی بکات

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی لە خەڵکی یەمەن نارد بۆ کۆکردنەوەی زەکاتەکانیان، دواتر هاتەوە حەیوانێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنا بوو، (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی): جا کاتێ کەسێکم نارد حەق و حیسابی لەگەڵ بکات، وتی: ئەمە هی منە و ئەویش هی ئێوەیە، ئەگەر پرسیاری لێ بکرێ ئەوەت لەکوێ هێنا؟ دەڵێ: بەدیاری پێم دراوە، ئەگەر ڕاست دەکات ئەی بۆ لە ماڵی باوکی یان دایکی دانەنیشت تا دیاری بۆ بهێنرێ، پاشان فەرمووی: هەر کەس بنێرم بۆ کۆکردنەوەی زەکات شتێکی لێ لابدات بۆ خۆی ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دێت وشترێك بەسەر شانیەوەیە دەباڕێنێ، یان مانگایەك دەهۆڕێنێ، یان مەڕێك دەباڕێنێ، پاشان فەرمووی: ئەی خوایە ئەوە من پەیامەکەم ڕاگەیاند. ئیبنو زوبەیر بە ئەبو حومەیدی وت: تۆ ئەمەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي قَسْمِ الْمَرْءِ صَدَقَتَهُ مِنْ غَيْرِ دَفْعِهَا إِلَى الْوَالِي قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ﴿٢٧١﴾ ﴾ البقرة

٢٣٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا غُلَامَ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: «وَعَلَيْكَ»، قَالَ: إِنِّي رَجُلٌ مِنْ بَيَاضِ الَّذِي مِنْ بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ، وَأَنَا رَسُولُ قَوْمِي إِلَيْكَ وَوَافِدُهُمْ، وَإِنِّي سَائِلُكَ، فَمُشَدِّدٌ مَسْأَلَتِي إِيَّاكَ، وَمُنَاشِدُكَ، فَمُشَدِّدٌ مُنَاشَدَتِي إِيَّاكَ قَالَ: «خُذْ عَنْكَ يَا أَخَا ابْنِ سَعْدٍ»، قَالَ: مَنْ خَلَقَكَ؟ وَمَنْ خَلَقَ مَنْ قَبْلَكَ؟ وَمَنْ هُوَ خَالِقُ مَنْ بَعْدَكَ؟ قَالَ: «اللَّهُ»، قَالَ: فَنَشَدْتُكَ بِذَلِكَ هُوَ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا فِي كِتَابِكَ، وَأَمَّرَتْنَا رُسُلًا أَنْ تَأْخُذَ مِنْ حَوَاشِي أَمْوَالِنَا، فَتَرُدُّ عَلَى فُقَرَائِنَا، فَنَشَدْتُكَ بِذَلِكَ أَهُوَ أَمَرَكَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ﴿٢٧١﴾ ﴾ البقرة، مِنْ هَذَا الْبَابِ أَيْضًا.

## باسی ڕوخسەت دراوە بەوەی بەندە زەکاتەکەی دابەش بکات بەبێ ئەوەی بیدات بە کاربەدەستان، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ﴿٢٧١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر صەدەقە و خێرتان کرد ئاشکرای بکەن ئەوە شتێکی چاکە بۆتان

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وتی: سڵاوی خوات لێ بێت ئەی کوڕی نەوەی عەبدولموتەلیب، فەرمووی: لەسەر تۆیش، وتی: من پیاوێکم لە بەیاز کە لە نەوەکانی سەعدی کوڕی بەکرە، من نێردراوی قەومەکەی خۆمم بۆ لای تۆ، وە نوێنەریانم، من پرسیارت لێ دەکەم، لە پرسیارەکانمدا سوورم و سوێندت دەدەم، وە سوورم لەسەر ئەوەی سوێندت بدەم، فەرمووی: ئەی برای نەوەکانی سەعد چی پرسیارێکت هەیە بیکە؟ وتی: کێ تۆی دروست کرد؟ وە کێ پێش تۆی دروست کرد؟ وە کێ دروستکەری دوای تۆیە؟ فەرمووی: خوایە، وتی: سوێندت ئەدەم بەو خوایە ئەو تۆی ڕەوانە کردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: ئێمە لە نووسراوەکەتدا بینیومانە، فەرمانت کردووە بە نێردراوەکەت زەکاتی ماڵەکانمان

---

(١) صحيح.

وەربگرێت و دابەشی بکات بەسەر هەژارەکانمان، سوێندت ئەدەم بەو خوایە ئایا ئەو فەرمانی پێ کردوی بەوە؟ فەرمووی: بەڵێ.

ئەبو بەکر وتی: فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿ إِن تُبۡدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَ ﴿٢٧١﴾ ﴾، بەهەمان شێوە لەم بەشەیە.

## بَابُ إِعْطَاءِ الْإِمَامِ دِيَةَ مَنْ لَا يُعْرَفُ قَاتِلُهُ مِنَ الصَّدَقَةِ، وَهَذَا عِنْدِي مِنْ جِنْسِ الْحِمَالَةِ لِشَبَهِ أَنْ يَكُونَ الْمُصْطَفَى ﷺ، تَحَمَّلَ بِهَذِهِ الدِّيَةِ فَأَعْطَاهَا مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ

**٢٣٨٤**- عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِهِ يُقَالُ لَهُ: ابْنُ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ نَفَرًا مِنْهُمُ انْطَلَقُوا إِلَى خَيْبَرٍ، فَتَفَرَّقُوا فِيهَا فَوَجَدُوا أَحَدَهُمْ قَتِيلًا، فَقَالُوا: لِلَّذِينَ وَجَدُوهُ عِنْدَهُمْ، قَتَلْتُمْ صَاحِبَنَا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا انْطَلَقْنَا إِلَى خَيْبَرَ - فَذَكَرَ الْحَدِيثَ - وَقَالَ فِي آخِرِهِ: فَكَرِهَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُطَلَّ دَمُهُ فَفَدَاهُ بِمِائَةٍ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ[1].

## باسی ئیمام و پێشەوای مسوڵمان خوێنبایی ئەو کەسە ئەدات لە زەکات کە نازانێ بکوژەکەی کێیە؟ ئەمەش لەلای من لە شێوەی لە ئەستۆگرتنی خوێنباییە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ خوێنبایی ئەو کەسەی لەئەستۆ گرت و لە وشتری زەکات خوێنباییەکەی دا

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە خانەوادەکەی پێی دەوترا: ئیبنو ئەبو حەسمە ﷺ هەواڵی پێ دا، چەند پیاوێك لە ئەوان چوون بۆ خەیبەر، لەوێ لە یەکدی جیا بوونەوە (هەریەکە و چوو بەلای کاری خۆیەوە) دواتر بینیان یەکێکیان کوژراوە، بە خەڵکی ئەو گەڕەکەیان وت: کە لەلایان بینیانەوە، ئێوە هاوەڵەکەی ئێمەتان کوشتووە، (پاشان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە چووین بۆ خەیبەر -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- لە کۆتاییەکەیدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی نەکرد خوێنەکەی بەفیرۆ بڕوات سەد وشتری لە وشتری زەکات بە خوێنبایی دا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ إِيثَارِ الْمَرْءِ بِصَدَقَتِهِ قَرَابَتَهُ دُونَ الْأَبَاعِدِ، لِانْتِظَامِ الصَّدَقَةِ، وَصِلَةٍ مَعًا بِتِلْكَ الْعَطِيَّةِ

**٢٣٨٥-** عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَإِنَّهَا عَلَى ذِي رَحِمٍ اثْنَتَانِ، إِنَّهَا صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»[١].

## باسی چاکتر وایە بۆ بەندە زەکات و صەدەقە بدات بە خزمە نزیکەکانی نەك ئەوانەی دوورن، بۆ ئەوەی بەو بەخشینە صەدەقە و پەیوەندیی خزمایەتی ڕێك بخات

واتە: سەلمانی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خێر و صەدەقە بۆ هەژار صەدەقەیە، بەڵام بۆ خزم و کەسوکار دووانە، هەم صەدەقەیە و هەم بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتییە.

## بَابُ فَضْلِ الصَّدَقَةِ عَلَى ذِي الرَّحِمِ الْكَاشِحِ

**٢٣٨٦-** عَنْ أُمِّهِ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ - قَالَ سُفْيَانُ: وَكَانَتْ قَدْ صَلَّتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقِبْلَتَيْنِ - قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ عَلَى ذِي الرَّحِمِ الْكَاشِحِ»[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی صەدەقە و خێرکردن بۆ خزمێك لە ناخەوە پڕ دڵی لە ڕق و کینە بێت

واتە: ئوممو کەلسومی کچی عوقبە -سوفیان وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردوو قیبلەکە نوێژی کرد- وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاکترین صەدەقە و خێرکردن ئەوەیە بیدەی بە خزمێك لە دڵەوە و دوژمن بێت (واتە: ئەو خزمەی دەزانی لە دڵەوە ڕقی لێتە بەڵام دەری نابڕێ، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە خۆشەویستی بچێتە دڵیەوە).

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ تَحْرِيمِ الصَّدَقَةِ عَلَى الْأَصِحَّاءِ الْأَقْوِيَاءِ عَلَى الْكَسْبِ، وَالْأَغْنِيَاءِ بِكَسْبِهِمْ عَنِ الصَّدَقَاتِ، وَإِنْ لَمْ يَكُونُوا أَغْنِيَاءَ بِمَالٍ يَمْلِكُونَهُ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٣٨٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَبْلُغُ بِهِ: لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ وَلَا ذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ[١].

## باسی قەدەغەکردنی صەدەقە و زەکات بەو کەسانەی لەشیان ساغە و بەهێز و بەتوانان لەسەر کەسابەت ئەگەرچی دەوڵەمەندیش نەبن و ماڵ و سامانیان نەبێت، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە هەواڵی پێ گەیشتووە (لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی): صەدەقە (واتە: زەکات) حەڵاڵ نییە بۆ دەوڵەمەند، هەروەها بۆ کەسێکیش توانای کارکردنی هەبێت و لەشساغ و سەلامەت بێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِهَذِهِ الصَّدَقَةِ - الَّتِي أَعْلَمَ أَنَّهَا لَا تَحِلُّ لِلْغَنِيِّ وَلَا لِلسَّوِيِّ - صَدَقَةَ الْفَرِيضَةِ دُونَ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ.

**٢٣٨٨-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ بَيَّنْتُ هَذَا فِي عَقِبِ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّا آلَ مُحَمَّدٍ لَا تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لەم صەدەقەیە -کە ڕایگەیاند حەڵاڵ نییە بۆ دەوڵەمەند و لەشساغ- صەدەقەی زەکاتی فەرزە، نەك صەدەقەی ئاسایی

---

(١) صحيح.

(٢) ذكره ابن خزيمة معلقا، وقد أخرجه: أحمد ٣٨٣/٥ و ٣٩٧ و ٣٩٨، والبخاري في **الأدب المفرد** (٢٣٣)، ومسلم ٨٢/٣ (١٠٠٥) (٥٢)، وأبو داود (٤٩٤٧) عن حذيفة.

وأخرجه: عبد بن حميد (١٠٨٣)، والبخاري ١٣/٨ (٦٠٢١)، وفي **الأدب المفرد** له (٢٢٤) عن جابر بن عبد الله.

وأرجه: أحمد ٣٠٧/٤، والبخاري في **الأدب المفرد** (٢٣١) عن عبد الله بن يزيد.

واتە: ئەبو بەكر دەڵێ: ئەمەم ڕوون كردەوە لەدوای فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ: صەدەقە (واتە: زەكات) بۆ ئێمەی خانەوادەی موحەممەد حەڵاڵ نییە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِعْطَاءِ الْإِمَامِ مِنَ الصَّدَقَةِ مَنْ يَذْكُرُ حَاجَةً وَفَاقَةً لَا يَعْلَمُ الْإِمَامُ مِنْهُ خِلَافَهُ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ عَنْ حَالِهِ، أَهُوَ فَقِيرٌ مُحْتَاجٌ أَمْ لَا؟

**٢٣٨٩-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ ﵁ فِي ذِكْرِهِ لِلنَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُمْ يَأْتُونَ وَحْشًا لَيْسَ لَهُمْ عَشَاءٌ، وَبِعْثَةُ النَّبِيِّ ﷺ إِيَّاهُ إِلَى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ لِيَقْبِضَ صَدَقَتَهُمْ، وَلَيْسَ فِي الْخَبَرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَأَلَ غَيْرَهُ، وَفِي الْخَبَرِ أَيْضًا دِلَالَةٌ عَلَى إِبَاحَةِ دَفْعِ صَدَقَةِ قَبِيلَةٍ إِلَى وَاحِدٍ، لَا أَنَّهُ يَجِبُ عَلَى الْإِمَامِ تَفْرِقَةُ صَدَقَةِ كُلِّ امْرِئٍ، وَصَدَقَةِ كُلِّ يَوْمٍ عَلَى جَمِيعِ الْأَصْنَافِ الْمَوْجُودِينَ مِنْ أَهْلِ سُهْمَانِ الصَّدَقَةِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ سَلَمَةَ بْنَ صَخْرٍ بِقَبْضِ صَدَقَاتِ بَنِي زُرَيْقٍ مِنْ مُصَدِّقِهِمْ[1].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ئیمام و پێشەوا زەكات بدات بەوكەسەی باسی حاڵی خۆی دەكات لە هەژاری و كەمدەستی، ئیمام بە حاڵی ئەو كەسە نەزانێت و پرسیار نەكات لە حاڵی، ئایا هەژارە، یان نەدارە یان نا؟

واتە: ئەبو بەكر دەڵێ: فەرموودەكەی سەلەمەی كوڕی صەخەر ﵁ لەوەی بۆ پێغەمبەری ﷺ باس كرد، ئەوان خواردنی شەویان نییە، وە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای خاوەنی زەكاتی نەوەكانی زوڕەیق بۆ ئەوەی زەكاتەكەیان بۆ خۆی وەربگرێ، لە فەرموودەكەدا نەهاتووە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری حاڵی كردبێت، (ئایا لەشی ساغە یان نەخۆشە) هەروەها فەرموودەكە بەڵگەی تێدایە لەسەر ڕێگەدان بەوەی هۆزێك زەكاتی خۆیان بدەن بە یەك كەس، نەك واجب بێت لەسەر ئیمام زەكاتی هەموو كەسێك جیا بكاتەوە، وە زەكاتی هەموو ڕۆژێك بدات بە هەموو چینەكان لەوانەی پشكیان لە زەكات بەردەكەوێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە سەلەمەی كوڕی صەخر بە وەرگرتنی زەكاتەكانی نەوەكانی زوڕەیق لە كۆكەرەوەی زەكاتەكانیان.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاسْتِعْفَافِ عَنْ أَكْلِ الصَّدَقَةِ لِمَنْ يَجِدُ عَنْهَا إِغْفَاءً بِمَعْنًى مِنَ الْمَعَانِي، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِهَا إِذْ هِيَ غُسَالَةُ ذُنُوبِ النَّاسِ

**٢٣٩٠-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِلْعَبَّاسِ: سَلِ النَّبِيَّ ﷺ، يَسْتَعْمِلُكَ عَلَى الصَّدَقَةِ قَالَ: مَا كُنْتُ لِأَسْتَعْمِلُكَ عَلَى غُسَالَةِ ذُنُوبِ النَّاسِ[1].

## باسی چاکتر وایە بەندە خۆی بپارێزێ لە خواردنی زەکات، بۆ ئەو کەسەی تا ئەندازەیەك حاڵی باشە، ئەگەرچی زەکاتەکە هی کەسوکاری خۆیشی بێت، چونکە زەکات دەرچوونی گوناهەکانی خەڵکە

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: بە عەباسم وت: داوا بکە لە پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەکات داتبمەزرێنێت، وتی: فەرمووی: لەسەر دەرچوونی گوناهی خەڵك داتنامەزرێنم. (واتە: زەکات ئەو وردە گوناهانەیە کە خاوەن زەکات لە کاتی پەیداکردنی ماڵ و سامانەکەدا ئەنجامی داوە، خوا زاناترە).

## بَابُ كَرَاهَةِ الْمَسْأَلَةِ مِنَ الصَّدَقَةِ إِذَا كَانَ سَائِلُهَا وَاجِدًا غَدَاءً أَوْ عَشَاءً يُشْبِعُهُ يَوْمًا وَلَيْلَةً وَإِنْ كَانَ أَخْذُهُ لِلصَّدَقَةِ - مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ - جَائِزًا

**٢٣٩١-** عَنْ سَهْلِ بْنِ الْحَنْظَلِيَّةِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ مَسْأَلَةً، وَهُوَ يَجِدُ عَنْهَا غَنَاءً فَإِنَّمَا يَسْتَكْثِرُ مِنَ النَّارِ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا الْغَنَاءُ الَّذِي لَا يَنْبَغِي مَعَهُ الْمَسْأَلَةُ قَالَ: «أَنْ يَكُونَ لَهُ شِبَعُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ أَوْ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ»[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلِلسُّؤَالِ أَبْوَابٌ كَثِيرَةٌ خَرَّجْتُهَا فِي كِتَابِ الْجَامِعِ».

## باسی داواکردنی زەکات کەراهەتی هەیە ئەگەر داواکەرەکەی خواردنی ڕۆژێك یان شەوێکی هەبوو تێری بکات، ئەگەرچی وەرگرتنی زەکات -بەبێ داواکردن- دروستە

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

واتە: سەهلی کوڕی حەنزەلییە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس داوا بکات و ئەوەندەی هەبێت بێنیازی بکات ئەوە لە (پشکۆی) ئاگر بۆ خۆی زیاد دەکات، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بێنیازبوون و دەوڵەمەندییە چییە کە نابێت لەگەڵیدا داوا بکات؟ فەرمووی: ئەوەندە خواردنی هەبێت ڕۆژ و شەوێك یان شەو و ڕۆژێکی پێ بکاتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: داواکردن بەشی زۆرە لە کتێبێکی تایبەتدا باسم کردووە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَدَقَةِ الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ.

**بَابُ ذِكْرِ فَرْضِ زَكَاةِ الْفِطْرِ، وَالْبَيَانِ عَلَى أَنَّ زَكَاةَ الْفِطْرِ عَلَى مَنْ يَجِبُ عَلَيْهِ زَكَاتُهُ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهَا سُنَّةٌ غَيْرُ فَرِيضَةٍ، وَالْمُبَيِّنِ عَنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مَا أَنْزَلَ عَلَيْهِ مِنْ وَحْيِهِ أَعْلَمَ أُمَّتَهُ أَنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ فَرْضٌ عَلَيْهِمْ، كَمَا أَعْلَمَهُمْ أَنَّ فِي خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةً، وَبَيَّنَ لَهُمْ جَمِيعَ الْفَرْضِ الَّذِي يَجِبُ فِي مَوَاشِيهِمْ وَنَاضِهِمْ، وَثِمَارِهِمْ، وَحُبُوبِهِمْ، وَاللَّهُ جَلَّ وَعَلَا إِنَّمَا أَجْمَلَ ذِكْرَ الصَّدَقَةِ وَالزَّكَاةِ فِي كِتَابِهِ، وَقَالَ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً ﴿١٠٣﴾﴾التوبة، وَقَالَ لِعِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٤٣﴾﴾البقرة، فَوَلَّى نَبِيَّهُ الْمُصْطَفَى ﷺ بَيَانَ الزَّكَاةِ، الَّتِي هِيَ صَدَقَةٌ وَزَكَاةٌ، إِذْ هُمَا اسْمَانِ لِمَعْنًى وَاحِدٍ، فَبَيَّنَ الْمُصْطَفَى ﷺ أَنَّ صَدَقَةَ الْفِطْرِ فَرِيضَةٌ كَمَا بَيَّنَ سَائِرَ الصَّدَقَاتِ الَّتِي أَخْبَرَهُمْ وَأَعْلَمَهُمْ أَنَّهَا فَرِيضَةٌ، فَكَيْفَ يَجُوزُ لِعَالِمٍ أَنْ يَقْبَلَ بَعْضَ بَيَانِهِ، وَيَدْفَعَ بَعْضَهُ.**

**٢٣٩٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ «حِينَ فَرَضَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ فَكَانَ لَا يُخْرِجُ إِلَّا التَّمْرَ»[1].

### کۆباسی زەکاتی سەرفیترە لە ڕەمەزاندا

**باسی فەرزبوونی زەکاتی سەرفیترە، وە ڕوونکردنەوە لەسەر ئەوەی زەکاتی سەرفیترە لەسەر ئەو کەسەیشە زەکاتی ماڵەکەی دەردەکات، دژی وتەی ئەو کەسەی گومانی وایە زەکاتی سەرفیترە سوننەتە و فەرز نییە، وە**

---

(١) صحيح.

**پێغەمبەر ﷺ کە ڕوونکەرەوەی ئایەتەکانی خوایە لە وەحی و نیگادا هیچی بۆ دانەبەزیوە زانیاری بدات بە ئوممەتەکەی ئەم زەکاتی سەرفیترەیە فەرزە لەسەریان، وەکوو چۆن پێی ڕاگەیاندوون لە پێنج وشتردا زەکاتی تێدایە، وە سەرجەم فەرزەکانی دیکەی بۆیان ڕوون کردۆتەوە کە واجبە لەسەریان لە مەڕومالآت و زیوو بەروبووم و دانەوێڵەکانیان، بەڵکوو خوا ﷻ بەپوختی باسی صەدەقە و زەکاتی کردووە لە کتێبەکەیدا، بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمووە: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً ﴿١٠٣﴾ ﴾، وە بە بەندە باوەڕدارەکانی فەرمووە: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٤٣﴾ ﴾، ئەرکی ڕوونکردنەوەی زەکاتی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ سپاردووە کە ئەویش صەدەقە و زەکاتی فەرزە، ئیتر چۆن دروستە بۆ زانایەك هەندێ لە ڕوونکردنەوەکانی وەربگرێت و هەندێکی دیکەی ڕەت بکاتەوە**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێ زەکاتی سەرفیترە فەرز بوو، دەیفەرموو: صاعێك لە خورما، یان صاعێك[1] لە جۆ، جا زەکاتی سەرفیترەی دەرنەدەکرد خورما نەبووایە.

**٢٣٩٣**- عَنِ نافعٍ عَن ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُخْرِجُ عَنِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ وَالْمَمْلُوكِ مِنْ أَهْلِهِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ فَأَعْوَزَهُ مَرَّةً، فَاسْتَلَفَ شَعِيراً، فَلَمَّا كَانَ زَمَانُ مُعَاوِيَةَ عَدَلَ النَّاسُ مُدَّيْنِ مِنْ قَمْحٍ بِصَاعٍ مِنْ شَعِيرٍ[2].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە ڕەمەزاندا) زەکاتی سەرفیترەی فەرز کرد صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە جۆ، جا عەبدوڵا زەکاتی سەرفیترەی بچووك و گەورە و کۆیلەی خانەوادەکەی دەردەکرد بە صاعێك لە خورما، جارێك نەیتوانی خورما بدات، جۆی دەرکرد، کاتێ سەردەمی موعاویە هات خەڵکی دوو گوێلیان لە گەنم دەدا بە صاعێك لە جۆ.

تێبینی: (المُد): پێوانەیەکی ناسراو بووە لەو سەردەمەدا، وتراویشە: لەبەر ئەوە ناو براوە بە (المُد) چونکە مرۆڤ هەردوو دەستی دابنیایە پڕی دەکرد.

---

(١) ) صاعێك چوار گوێلە، هەر گوێلێکیش (٥٤٤) گرامە، کەواتە چوار صاع دەکاتە دوو کیلۆ و سەد و حەفتا و شەش گرام.

(٢) صحیح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ كَانَ قَبْلَ فَرْضِ لِزَكَاةِ الْأَمْوَالِ

**٢٣٩٤**- عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الزَّكَاةُ، لَمْ يَأْمُرْنَا، وَلَمْ يَنْهَنَا وَنَحْنُ نَفْعَلُهُ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە زەکاتی سەرفیترە، پێش فەرزبوونی زەکاتی ماڵ و سامان بوو

واتە: قەیسی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە صەدەقەی سەرفیترە پێش فەرزبوونی زەکات، کاتێ زەکات فەرز بوو، نە فەرمانی پێ کردین نە قەدەغەی لێ کردین، ئێمەیش سەرفیترەمان دەدا.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ فَرْضَ صَدَقَةِ الْفِطْرِ عَلَى الذَّكَرِ وَالْأُنْثَى وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِذَا أَمَرَنَا لِأَمْرٍ مَرَّةً، لَمْ يَنْسَخْ أَمْرَهُ السَّكْتُ بَعْدَ ذَلِكَ، وَلَا يُنْسَخُ أَمْرُهُ إِلَّا أَنْ يُعْلِمَ ﷺ أَنَّ مَا كَانَ أَمَرَهُمْ بِهِ سَاقِطٌ عَنْهُمْ

**٢٣٩٥**- عَنِ نَافِعِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ رَمَضَانَ عَلَى الذَّكَرِ وَالْأُنْثَى وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ، صَاعَ تَمْرٍ أَوْ صَاعَ شَعِيرٍ قَالَ: فَعَدَلَ النَّاسُ نِصْفَ صَاعِ بُرٍّ. فَقَالَ نَافِعٌ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي التَّمْرَ إِلَّا عَامًا وَاحِدًا أَعْوَزَ مِنَ التَّمْرِ فَأَعْطَى الشَّعِيرَ[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکاتی سەرفیترە فەرزە لەسەر نێر و مێ و ئازاد و کۆیلە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر جارێك فەرمانی پێ کردین بە فەرمانێك، ئەوە بێدەنگبوونی لەدوای ئەوە حوکمی ئەو فەرمانەی هەڵناوەشێنێتەوە (نەسخ ناکاتەوە)، وە فەرمانەکەی هەڵناوەشێنرێتەوە (نەسخ ناکرێتەوە) مەگەر بزانرێ ئەوەی فەرمانی پێ کردوون لەسەریان هەڵگیراوە

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ صەدەقەی سەرفیترەی ڕەمەزانی فەرز کرد لەسەر نێر و مێ و ئازاد و کۆیلە، صاعێك لە خورما،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

یان صاعێك لە جۆ، وتی: دواتر خەڵکی دوو گوێل لە گەنمیان دەدا. نافیع وتی: ئیبنو عومەر خورمای دەدا جگە لە یەك ساڵ نەبێت نەیتوانی خورما بدات جۆی دا.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَنِ الْمَمْلُوكِ وَاجِبٌ عَلَى مَالِكِهِ، لَا عَلَى الْمَمْلُوكِ كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ النَّاسِ

**٢٣٩٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ، وَلَا فِي عَبْدِهِ، وَلَا وَلِيدَتِهِ صَدَقَةٌ إِلَّا صَدَقَةُ الْفِطْرِ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکاتی سەرفیترە لە کۆیلە واجبە لەسەر خاوەنەکەی، نەك لەسەر کۆیلەکە، وەکوو چۆن هەندێ لە خەڵك وا گومان دەبەن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات لەسەر مسوڵمان نییە لە ئەسپەکەی و کۆیلەکەی و منداڵەکەی جگە لە زەکاتی سەرفیترە.

## بَابُ ذِكْرِ دَلِيلٍ ثَانٍ أَنَّ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَنِ الْمَمْلُوكِ وَاجِبٌ عَلَى مَالِكِهِ، وَأَنَّ مَعْنَى قَوْلِهِ ﷺ فِي خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ عَلَى الْمَمْلُوكِ مَعْنَاهُ: عَنِ الْمَمْلُوكِ، لَا أَنَّهَا وَاجِبَةٌ عَلَى الْمَمْلُوكِ كَمَا زَعَمَ مَنْ قَالَ أَنَّ الْمَمَالِيكَ يَمْلِكُونَ

**٢٣٩٧-** عَنِ نَافع عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ رَمَضَانَ عَنِ الْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ قَالَ: فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعِ بُرٍّ قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا أَعْطَى أَعْطَى التَّمْرَ إِلَّا عَامًا وَاحِدًا أَعْوَزَ مِنَ التَّمْرِ فَأَعْطَى شَعِيرًا قَالَ: قُلْتُ: مَتَى كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي الصَّاعَ؟ قَالَ: إِذَا قَعَدَ الْعَامِلُ، قُلْتُ: مَتَى كَانَ الْعَامِلُ يَقْعُدُ؟ قَالَ: قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگەی دووەم لەسەر ئەوەی زەکاتی سەرفیترە لە کۆیلە واجبە لەسەر خاوەنەکەی، وە مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر (عَلَى الْمَمْلُوكِ)، مانای ئەوەیە: لەبری کۆیلەدا، نەك بە مانای ئەوەی سەرفیترە واجب بێت لەسەر کۆیلە، وەکوو چۆن هەندێ لەوانە پێی وایە و دەڵێ: کۆیلەکان خاوەندارێتییان هەیە**

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ صەدەقەی سەرفیترەی ڕەمەزانی فەرز کرد لەسەر ئازاد و کۆیلە و نێر و مێ، صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە جۆ، وتی: دواتر خەڵکی نیو صاع لە گەنمیان دەدا. نافیع وتی: ئیبنو عومەر کاتێ سەرفیترەی بدایە خورمای دەدا جگە لە یەك ساڵ نەبێت نەیتوانی خورما بدات جۆی دا. وتی: وتم: ئیبنو عومەر کەی صاعێکی دەدا؟ وتی: کاتێ کرێکار دانیشتبایە، وتم: کرێکار کەی دادەنیشت؟ وتی: پێش جەژن بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ.

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَدَقَةَ الْفِطْرِ يَجِبُ أَدَاؤُهَا عَنِ الْمَمَالِيكِ الْمُسْلِمِينَ دُونَ الْمُشْرِكِينَ، خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهَا وَاجِبَةٌ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبِيدِهِ الْمُشْرِكِينَ**

**٢٣٩٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ عَلَى كُلِّ نَفْسٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، رَجُلٍ أَوِ امْرَأَةٍ، صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکاتی سەرفیترە لە کۆیلەیەك واجب دەبێت کە مسوڵمان بێت نەك هاوبەشدانەر، جیاواز لە وتەی ئەو کەسەی پێی وایە زەکاتی سەرفیترە واجب دەبێت لەسەر مسوڵمان لە کۆیلە هاوبەشدانەرەکانی**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی لە ڕەمەزاندا فەرز کرد لەسەر هەموو نەفسێك لە مسوڵمانان ئازاد یان کۆیلە، پیاو یان ژن، بچووك یان گەورە، صاعێك لە خورما یان صاعێك لە جۆ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ صَدَقَةِ الْفِطْرِ فَرْضٌ عَلَى كُلِّ مَنِ اسْتَطَاعَ أَدَاؤُهَا خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ فَرْضَهَا سَاقِطٌ عَنْ مَنْ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ زَكَاةُ الْفِطْرِ

**٢٣٩٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ فِي رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ وَعَبْدٍ ذَكَرٍ وَأُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکاتی سەرفیترە فەڕزە لەسەر هەموو کەسێك توانای هەبێت بیدات، جیاواز لە وتەی ئەو کەسەی پێی وایە فەڕزبوونی لەسەر ئەو کەسە دەکەوێت کە زەکاتی سەرفیترە واجب نییە لەسەری

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی لە ڕەمەزاندا فەڕز کرد لەسەر خەڵك صاعێك لە خورما یان صاعێك لە جۆ، لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد و کۆیلە و نێر و مێیەك لە مسوڵمانان.

**٢٤٠٠**- حَدَّثَنَا يُونُسُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى، أَخبرنَا ابْنُ وَهْبٍ؛ أَنَّ مَالِكًا أَخْبَرَهُ بِمِثْلِهِ سَوَاءً؛ وَقَالَ: مِنْ رَمَضَانَ. وَقَالَ: ذَكَرٌ أو أُنْثَى[٢].

واتە: فەرموودەکەی پێشوو بەهەمان شێوە بەم سەنەدەش هاتووە، بەجیاوازییەکی کەم، وە وتوویەتی: لە ڕەمەزاندا، وە وتوویەتی: نێر بێ، یان مێ بێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ زَكَاةَ رَمَضَانَ إِنَّمَا تَجِبُ بِصَاعِ النَّبِيِّ ﷺ، لَا بِالصَّاعِ الَّذِي أُحْدِثَ بَعْدُ، إِذِ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ كَانَ صَاعَهُ

**٢٤٠١**- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ أَنَّهُمْ، كَانُوا يُخْرِجُونَ زَكَاةَ الْفِطْرِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْمُدِّ الَّذِي يَقْتَاتُ بِهِ أَهْلُ الْمَدِينَةِ أَوِ الصَّاعِ الَّذِي يَقْتَاتُونَ بِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ كُلُّهُمْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی زەکاتی سەر فیترەی ڕەمەزان، تەنها بەو صاعە دەبێت کە پێغەمبەر ﷺ بەکاری هێناوە، نەك ئەو صاعەی دوای ئەو دروست کرا، چونکە صاع لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە تەنها صاعی ئەو بوو**

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە، ئەوان زەکاتی سەرفیترەیان دەردەکرد لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە ئەو (الْمُدِّ) پێوانەی کە خەڵکی مەدینە پێوانەیان پێ دەکرد، یان ئەو صاعەی کە خەڵکی مەدینە کاریان پێ دەکرد.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ فَرْضَ صَدَقَةِ الْفِطْرِ عَلَى مَنْ يَسْتَطِيعُ أَدَاءَهَا دُونَ مَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ

**٢٤٠٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ مِنْ شَيْءٍ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرزبوونی زەکاتی سەرفیترە لەسەر ئەو کەسەیە کە تواناى هەیە بیدات نەك ئەو کەسەی توانای نییە**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ: جا ئەگەر فەرمانم پێکردن بە شتێك پارێز لە خوا بکەن ئەوەندەی لە تواناتاندایە.

## بَابُ إِيجَابِ صَدَقَةِ الْفِطْرِ عَلَى الصَّغِيرِ خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهَا سَاقِطَةٌ عَنْ مَنْ سَقَطَ عَنْهُ فَرْضُ الصَّلَاةِ

**٢٤٠٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ، وَقَالَ نَصْرٌ: صَدَقَةَ رَمَضَانَ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالْحُرِّ وَالْعَبْدِ، صَاعَ تَمْرٍ أَوْ صَاعَ شَعِيرٍ[2].

**باسی واجببوونی زەکاتی سەرفیترە لەسەر منداڵی بچووك، پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە زەکاتی سەرفیترە لەسەر ئەو کەسە نییە نوێژی لەسەر فەرز نەکراوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی (لە ڕەمەزاندا) فەڕز کرد، نەصر (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: صەدەقەی ڕەمەزان، لەسەر بچووك و گەورە و ئازاد و کۆیلەیە، صاعێك لە خورما یان صاعێك لە جۆ.

## بَابُ تَوْقِيتِ فَرْضِ زَكَاةِ الْفِطْرِ فِي مَبْلَغِهِ مِنَ الْكَيْلِ

**٢٤٠٤**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: جَعَلَ النَّاسُ عَدْلَ الشَّعِيرِ وَالتَّمْرِ مُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ[١].

## باسی دیاریکردنی ئەندازەی زەکاتی سەرفیترە بەپێوانە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی دەردەکرد، صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە جۆ، عەبدوڵایش وتی: خەڵکی لەبەرانبەر جۆ و خورما دوو گوێل لە گەنمیان دەدا.

**٢٤٠٥**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ بِالصَّاعِ مِنَ التَّمْرِ، وَالصَّاعِ مِنَ الشَّعِيرِ قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَقُولُ: جَعَلَ النَّاسُ عَدْلَ كَذَا بِمُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی دەردەکرد، بە صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە جۆ، وتی: عەبدوڵای کوڕی عومەریش دەیوت: خەڵکی لە بەرانبەر جۆ و خورما دوو گوێل لە گەنمیان دەدا.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِصَدَقَةِ نِصْفِ الصَّاعِ مِنْ حِنْطَةٍ أَحْدَثَهُ النَّاسُ بَعْدَ النَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ

**٢٤٠٦**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَمْ تَكُنِ الصَّدَقَةُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ وَالشَّعِيرُ، وَلَمْ تَكُنِ الْحِنْطَةُ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە نیو صاع لە گەنم لە زەکاتی سەرفیترە خەڵکی دوای پێغەمبەر ﷺ دایانهێناوە

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەکاتی سەرفیترە نەبوو جگە لە خورما و مێوژ و جۆ نەبێت، ئەو کاتە گەنم نەبوو.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُمْ أُمِرُوا نِصْفَ صَاعِ حِنْطَةٍ إِذَا كَانَ ذَلِكَ قِيمَةَ صَاعِ تَمْرٍ أَوْ شَعِيرٍ، وَالْوَاجِبُ عَلَى هَذَا الْأَصْلِ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِآصِعٍ مِنْ حِنْطَةٍ فِي بَعْضِ الْأَزْمَانِ وَبَعْضِ الْبُلْدَانِ

**٢٤٠٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: لَمْ نَزَلْ نُخْرِجُ عَلَى عَهْدِ الرَّسُولِ ﷺ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ وَصَاعًا مِنْ شَعِيرٍ وَصَاعًا مِنْ أَقِطٍ، فَلَمْ تَزَلْ حَتَّى كَانَ مُعَاوِيَةُ، فَقَالَ: أَرَى إِنَّ صَاعًا مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعَيْ تَمْرٍ فَأَخَذَ بِهِ النَّاسُ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەوان فەرمانیان پێ کراوە نیو صاع گەنم بدەن، ئەگەر ئەو نیو صاعە گەنمە نرخی صاعێك خورما یان جۆ بێت، واجب لەسەر ئەم بنەمایە ئەوەیە لە هەندێ سەردەم و هەندێ وڵات چەند صاعێك لە گەنم بدرێ

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: ئێمە بەردەوام لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد، صاعێك لە خورما و صاعێك لە جۆ و صاعێك لە کەشك، بەردەوام بەوشێوە زەکاتی سەرفیترەمان دەدا تا سەردەمی موعاویە، وتی: وا دەبینم صاعێك لە گەنمی شام یەکسانە بە دوو صاع خورما، ئینجا خەڵکی کاریان بەوە کرد.

## بَابُ ذِكْرِ أَوَّلِ مَا أُحْدِثَ الْأَمْرُ بِنِصْفِ صَاعِ حِنْطَةَ، وَذِكْرِ أَوَّلِ مَنْ أَحْدَثَهُ

**٢٤٠٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ، حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ مِنَ الشَّامِ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ، فَخَطَبَ

---

(١) صحيح.





النَّاسَ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثُمَّ ذَكَرَ زَكَاةَ الْفِطْرِ، فَقَالَ: إِنِّي لَأَرَى مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَكَانَ أَوَّلَ مَا ذَكَرَ النَّاسَ بِالْمُدَّيْنِ حِينَئِذٍ[1].

## باسی بەکارهێنانی نیو صاع گەنم لە یەکەم جاردا، وە باسی یەکەم کەس کە دایهێنا

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ صاعێك لە خۆراك یان صاعێك لە كەشك، یان صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە مێوژ، یان صاعێك لە جۆ، ئێمە بەردەوام بەوشێوە دەرماندەکرد، تاوەکو موعاویە لە شامەوە هات بۆ لامان (بۆ مەدینە) لە کاتێکدا حەج یان عومرەی کردبوو، موعاویە ئەوکاتە خەلیفە بوو، لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی دا، وتی: پاشان باسی زەکاتی سەرفترەی کرد، وتی: من پێم وایە دوو مود (گوێل) لە گەنمی شام دەکاتە صاعێك لە خورما، جا ئەو یەکەم کەس بوو ئەو کاتە باسی دوو مودی بۆ خەڵك کرد.

## بَابُ إِخْرَاجِ التَّمْرِ وَالشَّعِيرِ فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ

**٢٤٠٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بَعْدُ بِمُدَّيْنِ مِنْ بُرٍّ[2].

## باسی دەرکردنی خورما و جۆ بە زەکاتی سەرفیترە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە صەدەقەی سەرفیترە لە هەموو بچووك و گەورە و ئازاد یان کۆیلە، صاعێك لە جۆ یان صاعێك لە خورما، دواتر خەڵك بەرانبەریان کرد بە دوو مود (گوێل) لە گەنم.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٤١٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ الصُّعَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَامَ خَطِيبًا، فَأَمَرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ صَاعَ تَمْرٍ أَوْ صَاعَ شَعِيرٍ عَنْ كُلِّ وَاحِدٍ أَوْ عَنْ كُلِّ رَأْسٍ عَنِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ وَالْحُرِّ وَالْعَبْدِ(١).

واتە: عەبدوڵای کوڕی سەعلەبەی کوڕی صوعەیر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا وتارێکی دا، فەرمانی کرد بە زەکاتی سەرفیترە صاعێك لە خورما یان صاعێك لە جۆ بۆ هەموو کەسێك، یان بۆ هەر سەرێك، لە بچووك و گەورە و ئازاد و کۆیلە.

## بَابُ إِخْرَاجِ الزَّبِيبِ وَالْأَقِطِ فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ

**٢٤١١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَرَضَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَلَى الْحُرِّ وَالْعَبْدِ وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ(٢).

## باسی دەرکردنی مێوژ و کەشك بە زەکاتی سەرفیترە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ زەکاتی سەرفترەی فەڕز کرد لەسەر ئازاد و بەندە و نێر و مێ و بچووك و گەورە لە مسوڵمانان، صاعێك لە جۆ، یان صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە مێوژ، یان صاعێك لە کەشك.

**٢٤١٢-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الزَّكَاةُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ صَاعُ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ»(٣).

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم، لە باپیرمەوە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکاتی سەرفیترە لەسەر مسوڵمانان صاعێك لە خورمایە، یان صاعێك لە مێوژە، یان صاعێك لە کەشکە، یان صاعێك لە جۆیە.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف جدا.

**٢٤١٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ، كَانَ يَأْمُرُهُمْ بِصَدَقَةِ رَمَضَانَ نِصْفَ صَاعٍ حِنْطَةً أَوْ صَاعَ تَمْرٍ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: لَا نُعْطِي إِلَّا مَا كُنَّا نُعْطِي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، موعاویەی کوڕی ئەبو سفیان، (کاتێ بوو بە دەسەڵاتداری مسوڵمانان) فەرمانی پێ دەکردن بە زەکاتی ڕەمەزان، نیو صاع گەنم یان صاعێك خورما بدەن، ئەبو سەعید وتی: هیچ نادەین جگە لەوەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دەماندا صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە کەشك، یان صاعێك لە مێوژ، یان صاعێك لە جۆ.

## بَابُ إِخْرَاجِ السُّلْتِ صَدَقَةَ الْفِطْرِ إِنْ كَانَ ابْنُ عُيَيْنَةَ وَمَنْ دُونَهُ حَفِظَهُ أَوْ صَحَّ خَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَإِلَّا فَإِنَّ فِي خَبَرِ مُوسَى بْنِ عُقْبَةَ كِفَايَةً إِنْ شَاءَ اللَّهُ

**٢٤١٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ يَقُولُ: أَخْرَجْنَا فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ أَوْ صَاعًا مِنْ سُلْتٍ[2].

## باسی دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە بە جۆی سپی، ئەگەر ئیبنو عویەینە و ئەوەیشی لەخوار ئەوەوەیە فەرموودەکەیان لەبەر کردبێت، یان ئەگەر فەرموودەکەی ئیبنو عەباس تەواو بێت، ئەگەرنا فەرموودەکەی موسای کوڕی عوقبە بەسە ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەکاتی سەرفترەمان دەردەکرد صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە جۆ، یان صاعێك لە مێوژ، یان صاعێك لە کەشك، یان صاعێك لە جۆی سپی.

**٢٤١٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُؤَدِّيَ زَكَاةَ رَمَضَانَ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ عَنِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ مَنْ أَدَّى سُلْتًا قُبِلَ مِنْهُ، وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَمَنْ أَدَّى دَقِيقًا قُبِلَ مِنْهُ، وَمَنْ أَدَّى سَوِيقًا قُبِلَ مِنْهُ[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردین زەكاتی ڕەمەزان دەربكەین صاعێك لە خۆراك بۆ بچووك و گەورە و ئازاد و كۆیلە، هەر كەسیش جۆی سپی بدات لێی وەردەگیرێ، پێم وایە وتی: هەر كەس ئاردیش بدات لێی وەردەگیرێ، هەر كەسیش سەویق بدات (خواردنێكە لە ئارد و ڕۆن دروست دەكرێت) لێی وەردەگیرێ.

**٢٤١٦**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَدَقَةُ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ سُلْتٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەكاتی سەرفیترە صاعێكە لە جۆ یان صاعێكە لە خورما یان صاعێكە لە جۆی سپی.

## بَابُ إِخْرَاجِ جَمِيعِ الْأَطْعِمَةِ فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْهَلَيْلِجَ، وَالْفُلُوسَ جَائِزٌ إِخْرَاجُهَا فِي صَدَقَةِ الْفِطْرِ

**٢٤١٧**- عَنِ مُحَمَّدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: صَدَقَةُ رَمَضَانَ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ مَنْ جَاءَ بِبُرٍّ قُبِلَ مِنْهُ، وَمَنْ جَاءَ بِشَعِيرٍ قُبِلَ مِنْهُ وَمَنْ جَاءَ بِتَمْرٍ قُبِلَ مِنْهُ، وَمَنْ جَاءَ بِسُلْتٍ قُبِلَ مِنْهُ، وَمَنْ جَاءَ بِزَبِيبٍ قُبِلَ مِنْهُ وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَمَنْ جَاءَ بِسَوِيقٍ أَوْ دَقِيقٍ قُبِلَ مِنْهُ[٢].

## باسی دەركردنی هەموو خواردنەكان لە زەكاتی سەرفیترە، وە بەڵگەش لەسەر دژی وتەی ئەو كەسەی پێی وایە بەرهەمی (الْهَلَيْلِجَ) (كە جۆرە درەختێكە بەرهەمەكەی تامی مزرە، لە هیندستان بوونی هەیە) و پارە دروستە لە زەكاتی سەرفیترەدا دەربكرێ

واتە: موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ ئەو دەیوت: زەكاتی سەرفیترەی ڕەمەزان صاعێكە لە خۆراك، هەر كەس گەنمی هێنا لێی وەرگیراوە، هەر كەسیش جۆی هێنا لێی وەرگیراوە، هەر كەسیش خورمای هێنا لێی وەرگیراوە، هەر كەسیش جۆی سپی هێنا لێی وەرگیراوە، هەر كەسیش مێوژی هێنا لێی وەرگیراوە، پێم وایە وتی: هەر كەس سەویق یان ئاردی هێنا لێی وەرگیراوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٤١٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ صَدَقَةَ الْفِطْرِ إِذْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، وَلَمْ نَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ مِنَ الشَّامِ إِلَى الْمَدِينَةِ قَدْمَةً، وَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ مَا أَرَى مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ إِلَّا تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ هَذِهِ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: لَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَبَدًا أَوْ مَا عِشْتُ[١].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوماندا بوو، صاعێك لە خۆراك، یان صاعێك لە خورما، یان صاعێك لە جۆ، یان صاعێك لە مێوژ، یان صاعێك لە کەشك، بەردەوام بەو شێوە زەکاتی سەرفیترەمان دەدا هەتا موعاویە لە شامەوە هات بۆ مەدینە، جا لە چوارچێوەی ئەو قسانەی بۆ خەڵکی کردی ئەوە بوو: پێم وایە دوو مود (گوێل) لە گەنمی شام یەکسانە بە صاعێك لەمە، ئینجا خەڵکی کاریان بەوە کرد، ئەبو سەعید وتی: بەردەوام من بەوشێوە دەریدەکەم وەکوو چۆن لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرمدەکرد بەهەمیشەیی، یان تا لە ژیاندا بم.**

**٢٤١٩-** عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ قَالَ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: وَذَكَرُوا عِنْدَهُ صَدَقَةَ رَمَضَانَ فَقَالَ: لَا أُخْرِجُ إِلَّا مَا كُنْتُ أُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، صَاعَ تَمْرٍ أَوْ صَاعَ حِنْطَةٍ أَوْ صَاعَ شَعِيرٍ أَوْ صَاعَ أَقِطٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: لَوْ مُدَّيْنِ مِنْ قَمْحٍ، فَقَالَ: لَا، تِلْكَ قِيمَةُ مُعَاوِيَةَ لَا أَقْبَلُهَا وَلَا أَعْمَلُ بِهَا[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: ذِكْرُ الْحِنْطَةِ فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ غَيْرُ مَحْفُوظٍ، وَلَا أَدْرِي مِمَّنِ الْوَهْمِ، قَوْلُهُ وَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَوْ مُدَّيْنِ مِنْ قَمْحٍ إِلَى آخِرِ الْخَبَرِ دَالٌّ عَلَى أَنَّ ذِكْرَ الْحِنْطَةِ فِي أَوَّلِ الْقِصَّةِ خَطَأٌ أَوْ وَهْمٌ إِذْ لَوْ كَانَ أَبُو سَعِيدٍ قَدْ أَعْلَمَهُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُخْرِجُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَاعَ حِنْطَةٍ لَمَا كَانَ لِقَوْلِ الرَّجُلِ أَوْ مُدَّيْنِ مِنْ قَمْحٍ مَعْنًى.

**واتە: عیازی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو سەرح دەڵێ: کاتێ کە لەلای ئەبو سەعید ﷺ باسی زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزانیان کرد وتی: من دەریناکەم مەگەر وەکوو ئەوە نەبێت کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرم دەکرد، صاعێك خورما، یان**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

صاعێك گەنم، یان صاعێك جۆ، یان صاعێك كەشك، پیاوێك لە خەڵكەكە پێی وت: ئەی ئەگەر دوو مود (گوێل) لە گەنم بێت، وتی: نەخێر ئەوە نرخاندنی موعاویە بوو نە وەریدەگرم و نە كاری پێ دەكەم.

ئەبو بەكر دەڵێ: باسی گەنم لە فەرموودەكەی ئەبو سەعید پارێزراو نییە، نازانم هەڵەكە لەلایەن كێوەیە، وتەی پیاوێك لە خەڵكەكە پێی وت: یان دوو مود (گوێل) لە گەنم تا كۆتایی فەرموودەكە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باسی گەنم لە سەرەتای چیرۆكەكەدا هەڵەیە یان لێتێكچوونە، چونكە ئەگەر ئەبو سەعید پێیانی بوتایە ئەوان لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ صاعێك لە گەنمیان دەدا، ئەوە قسەی پیاوەكە: یان دوو مود (گوێل) لە گەنم، هیچ مانایەكی نەدەبوو.

## بَابُ ذِكْرِ ثَنَاءِ اللَّهِ ﷻ عَلَى مُؤَدِّي صَدَقَةِ الْفِطْرِ

**٢٤٢٠-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ ﵁ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾ الأعلى، فَقَالَ أُنْزِلَتْ فِي زَكَاةِ الْفِطْرِ[١].

## باسی خوا ﷻ ستاییش و پیاهەڵدانی ئەو كەسە دەكات زەكاتی سەرفیترە دەدات

واتە: كەسیری كوڕی عەبدوڵای موزەنی، دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە ﵁ دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾، فەرمووی: دەربارەی زەكاتی سەرفیترە دابەزی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِأَدَاءِ صَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى صَلَاةِ الْعِيدِ

**٢٤٢١-** عَنْ نافع عن عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِإِخْرَاجِ زَكَاةِ الْفِطْرِ، قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ، وَأَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، كَانَ يُؤَدِّي قَبْلَ ذَلِكَ بِيَوْمٍ وَيَوْمَيْنِ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف جدا.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانکردن بە دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە پێش دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژی جەژن

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە پێش دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژی جەژن، وە عەبدوڵای کوڕی عومەر ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش نوێژی جەژن زەکاتی سەرفیترەی دەردەکرد.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِأَدَائِهَا فِي يَوْمِ الْفِطْرِ لَا فِي غَيْرِهِ

**٢٤٢٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ يَوْمَ الْفِطْرِ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە دانی سەرفیترە لە ڕۆژی جەژنە نەك لە غەیری ئەو ڕۆژە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەکاتی سەرفیترە بدرێ پێش دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژ، لە ڕۆژی جەژن.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّلَاةَ الَّتِي أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِأَدَاءِ صَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ الْخُرُوجِ إِلَيْهَا صَلَاةُ الْعِيدِ لَا غَيْرُهَا

**٢٤٢٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَمَرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الْمُصَلَّى[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو نوێژەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد پێش دەرچوون بۆی زەکاتی سەرفیترە بدرێ نوێژی جەژن بوو نەك نوێژێکی دیکە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەکاتی سەرفیترە بدرێ پێش دەرچوونی خەڵك بۆ نوێژگە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَأْخِيرِ الْإِمَامِ قَسْمَ صَدَقَةِ الْفِطْرِ عَنْ يَوْمِ الْفِطْرِ إِذَا أُدِّيَتْ إِلَيْهِ

**٢٤٢٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْ أَحْفَظَ زَكَاةَ رَمَضَانَ فَأَتَانِي آتٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، فَجَعَلَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ فَأَخَذْتُهُ، فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: دَعْنِي فَإِنِّي مُحْتَاجٌ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ مَا صَلَّى الْغَدَاةَ «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ اللَّيْلَةَ أَوْ قَالَ: الْبَارِحَةَ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْتَكَى حَاجَةً فَخَلَّيْتُهُ وَزَعَمَ أَنَّهُ لَا يَعُودُ، فَقَالَ: أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ، وَسَيَعُودُ قَالَ فَرَصَدْتُهُ، وَعَلِمْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَجَاءَ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ، فَقُلْتُ: لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَشَكَى حَاجَةً، فَخَلَّيْتُ عَنْهُ فَأَصْبَحْتُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ اللَّيْلَةَ أَوِ الْبَارِحَةَ» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ شَكَى حَاجَةً فَخَلَّيْتُهُ، وَزَعَمَ أَنَّهُ لَا يَعُودُ، فَقَالَ: أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ، وَعَلِمْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ، فَأَخَذْتُهُ، فَقُلْتُ لَأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «دَعْنِي حَتَّى أُعَلِّمَكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهِنَّ» قَالَ: وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الْخَيْرِ قَالَ: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ، فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾البقرة، فَإِنَّهُ لَنْ يَزَالَ مَعَكَ مِنَ اللَّهِ حَافِظًا، وَلَا يَقْرَبَكَ الشَّيْطَانُ، حَتَّى تُصْبِحَ فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ»، فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: «صَدَقَكَ وَإِنَّهُ لَكَاذِبٌ، تَدْرِي مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلَاثِ لَيَالٍ، ذَاكَ الشَّيْطَانُ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە پێشەوا کە دابەشکردنی زەکاتی سەرفیترە دوابخەن لە ڕۆژی جەژن، ئەگەر بۆی هێنرا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری کردمەوە چاودێری زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزان بکەم (کە لە جێگایەکی تایبەت دانرابوو)، کەسێك لە نیوەی شەودا هات بۆ لام، لە خۆراکەکەی برد، منیش گرتم، وتم: ئێستا دەتبەم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: وازم لێ بێنە من موحتاجم، منیش وازم لێ هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی نوێژی بەیانی کرد، فەرمووی: دیلەکەی ئەمشەوت چی کرد؟ یان فەرمووی: دیلەکەی دوێنێت چی کرد؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سکاڵای

---

(١) صحيح.

پێویستییەکی کرد لەلام، منیش وازم لێ هێنا و پێی وا بوو ناگەڕێتەوە، فەرمووی: ئەوە درۆی کرد لەگەڵت، دێتەوە، وتی: منیش بۆی دانیشتم، زانیم دەگەڕێتەوە لەبەر وتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: دیسان هاتەوە خواردنی برد، وتم: دەبێ بتبەم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، سکاڵای نەبوونی خۆی کرد، منیش وازم لێ هێنا، پێی وا بوو ئیتر نایەتەوە، دواتر کە بەیانیم کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: دیلەکەی ئەمشەوت چی کرد؟ یان فەرمووی: دیلەکەی دوێنێت چی کرد؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سکاڵای نەداری خۆی کرد منیش وازم لێ هێنا، پێی وا بوو ئیتر ناگەڕێتەوە، فەرمووی: ئەو درۆی کرد لەگەڵت، دێتەوە، منیش زانیم دەگەڕێتەوە لەبەر وتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر هاتەوە هەندێ خواردنی برد، منیش گرتم، وتم: دەبێ بتبەم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: وازم لێ بێنە چەند وشەیەکت فێر دەکەم خوا بەهۆیانەوە سوودت پێدەگەیەنێ، وتی: هاوەڵان زۆر سوور بوون لەسەر دەستخستنی خێر، وتی: کاتێ چوویتە سەر جێگاکەت، (آيَةَ الْكُرْسِيِّ) بخوێنە: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾، چونکە بەردەوام پارێزەرێکت لەگەڵدایە لەلایەن خواوە، وە شەیتانیش لێت نزیك نابێتەوە تا ڕۆژ دەکەیتەوە، منیش وازم لێ هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە دیلەکەی دوێنێت چی کرد، ئەویش هەواڵی پێ دا، فەرمووی: ڕاستی کرد، بەڵام خۆی درۆزنە، دەزانی ئەو سێ شەوە لەگەڵ کێ قسەت کرد، ئەوە شەیتان بوو.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ

## بَابُ فَضْلِ الصَّدَقَةِ وَقَبْضِ الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ إِيَّاهَا لِيُرَبِّيَهَا لِصَاحِبِهَا وَالْبَيَانِ أَنَّهُ لَا يَقْبَلُ إِلَّا الطَّيِّبَ

**٢٤٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَتَصَدَّقُ بِصَدَقَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ وَلَا يَقْبَلُ اللَّهُ إِلَّا الطَّيِّبَ إِلَّا اللَّهُ يَأْخُذُهَا بِيَمِينِهِ، فَيُرَبِّيهَا لَهُ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ، فَلُوَّهُ أَوْ قَالَ فَصِيلَهُ، حَتَّى تَبْلُغَ التَّمْرَةُ مِثْلَ أُحُدٍ»[1].

---

(١) صحيح.

## کۆباسی صەدەقە و بەخشینی زیادە (واتە: جگە لە زەکات)

## باسی فەزڵ و گەورەیی خێر و بەخشین، وە پەروەردگاری ﷻ وەریدەگرێ و بۆ خاوەنەکەی زیاد دەکات، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی خوا هیچ کردەوەیەك وەرناگرێ جگە لە پاك و حەڵاڵ نەبێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندەیەکی مسوڵمان نییە ببەخشێ بەخشینێك لە ماڵی پاك و حەڵاڵ، خوا ﷻ وەرناگرێ جگە لە پاك و حەڵاڵ نەبێ، خوای بەخشندە بە دەستی ڕاستی وەریدەگرێ، دواتر بۆی زیاد دەکات وەك چۆن یەکێ لە ئێوە بێچووە ئەسپەکەی یان بێچووە وشترەکەی پەروەردە دەکات، هەتا دەنکە خورمایەك ئەوەندەی کێوی ئوحودی لێ دێت.

**٢٤٢٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا تَصَدَّقَ مِنْ طَيِّبٍ تَقَبَّلَهَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَخَذَهَا بِيَمِينِهِ، فَرَبَّاهَا كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ مُهْرَهُ أَوْ فَصِيلَهُ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَصَدَّقُ بِاللُّقْمَةِ، فَتَرْبُو فِي يَدِ اللَّهِ أَوْ قَالَ: فِي كَفِّ اللَّهِ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ فَتَصَدَّقُوا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەندە ئەگەر لە ماڵی پاك و حەڵاڵی خۆی بەخشی، خوا ﷻ لێی قبوڵ دەکات، وە بە دەستی ڕاستی لێی وەردەگرێ، دواتر بۆی زیاد دەکات وەك چۆن یەکێ لە ئێوە بێچووە ئەسپەکەی یان بێچووە وشترەکەی پەروەردە دەکات، بێگومان پیاوی وا هەیە بەقەد یەك پاروو خێر و صەدەقە دەکات، لە دەستی خوادا زیاد دەکات، یان لە لەپی خوادا تا ئەوەندەی کێوێکی لێ دێت، بۆیە ببەخشن.

**٢٤٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَحْوَ حَدِيثِ عَبْدِ الرَّازِقِ، زَادَ جَعْفَرٌ فِي حَدِيثِهِ، وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللَّهِ: ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴿٢٧٦﴾ ﴾ البقرة[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی عەبدوڕەزاق، جەعفەر لە فەرموودەکەیدا ئەوەیشی زیاد کردووە،

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وە ڕاستی و دروستی ئەوەیش لە کتێبی خوادا هاتووە: ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ ﴿٢٧٦﴾ ﴾، واتە: خوا فەڕ و پیتی سووخۆری ناهێڵێت، وە خێر و خێراتی ماڵ و سامانی صەدەقە زیاد دەکات.

## بَابُ الْأَمْرِ بِاتِّقَاءِ النَّارِ - نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْهَا - بِالصَّدَقَةِ وَإِنْ قَلَّتْ

**٢٤٢٨-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ ذَكَرَ النَّارَ، فَتَعَوَّذَ مِنْهَا، وَأَشَاحَ بِوَجْهِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا ثُمَّ قَالَ: «اتَّقُوا النَّارَ، وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[١].

## باسی فەرمان بە خۆپارێزی لە ئاگر -پەنا دەگرین بە خوا لێی- بە خێر و صەدەقە ئەگەرچی کەمیش بێت

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ باسی ئاگری کرد، پەنای گرت لێی و پشتی هەڵکرد و ڕووی وەرگێڕا، دوو جار یان سێ جار، پاشان فەرمووی: خۆتان بپارێزن لە ئاگر، ئەگەرچی بە لەتەخورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەوەیشتان دەست نەکەوت ئەوە بە وشەیەکی چاك.

**٢٤٢٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ئاگر، ئەگەرچی بە لەتەخورمایەکیش بێت.**

**٢٤٣٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «افْتَدُوا مِنَ النَّارِ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ئاگر، ئەگەرچی بە لەتەخورمایەکیش بێت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح من غير هذا الطريق.

(٣) صحيح.

## بَابُ إِظْلَالِ الصَّدَقَةِ صَاحِبَهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى الْفَرَاغِ مِنَ الْحُكْمِ بَيْنَ الْعِبَادِ

**٢٤٣١-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ امْرِئٍ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ حَتَّى يُفْصَلَ بَيْنَ النَّاسِ، أَوْ قَالَ: حَتَّى يُحْكَمَ بَيْنَ النَّاسِ» قَالَ يَزِيدُ: فَكَانَ أَبُو الْخَيْرِ لَا يُخْطِئُهُ يَوْمٌ لَا يَتَصَدَّقُ مِنْهُ بِشَيْءٍ، وَلَوْ كَعْكَةً وَلَوْ بَصَلَةً[1].

## باسی خێر و صەدەقە سێبەر بۆ خاوەنەکەی دەکات لە ڕۆژی دواییدا تا دادگەری لە نێوان بەندەکان تەواو دەبێت

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو کەسێك (لە ڕۆژی دواییدا) لە سێبەری بەخشینەکەیدایە هەتا خەڵکی لە یەکدی جیا دەکرێتەوە، یان فەرمووی: هەتا دادگەری دەکرێ لە نێوان خەڵکی، یەزید وتی: باوکی خەیر هیچ ڕۆژێکی بەسەردا نەدەهات شتێکی نەکردایە بە خێر، ئەگەر چی شرینییەك یان پیازێکیش بووایە.**

**٢٤٣٢-** عَنْ يَزِيدِ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ عَنْ مَرْثَدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ قَالَ: كَانَ أَوَّلُ أَهْلِ مِصْرَ يَرُوحُ إِلَى الْمَسْجِدِ، وَمَا رَأَيْتُهُ دَاخِلًا الْمَسْجِدَ قَطُّ إِلَّا وَفِي كُمِّهِ صَدَقَةٌ، إِمَّا فُلُوسٌ، وَإِمَّا خُبْزٌ، وَإِمَّا قَمْحٌ حَتَّى رُبَّمَا رَأَيْتُ الْبَصَلَ يَحْمِلُهُ قَالَ: فَأَقُولُ يَا أَبَا الْخَيْرِ إِنَّ هَذَا يُنْتِنُ ثِيَابَكَ قَالَ: فَيَقُولُ: يَا ابْنَ حَبِيبٍ أَمَا إِنِّي لَمْ أَجِدْ فِي الْبَيْتِ شَيْئًا أَتَصَدَّقُ بِهِ غَيْرَهُ، إِنَّهُ حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «ظِلُّ الْمُؤْمِنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَدَقَتُهُ»[2].

**واتە: یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیب دەگێڕێتەوە، لە مەرسەدی کوڕی عەبدوڵای موزەنییەوە، (یەزید) دەڵێ: ئەو یەکەم کەس بوو لە خەڵکی شار دەچوو بۆ مزگەوت، هەرگیز نەمبینیبوو بچێتە نێو مزگەوتەوە ئیللا خێر و صەدەقەیەك لە گیرفانیدا بوو، یان پارە بوو، یان نان، یان گەنم، تەنانەت کەم جارێك پیازم بینی هەڵیگرتبوو، وتی: دەموت: ئەی باوکی خەیر ئەو پیازە بۆنی جلەکانت ناخۆش دەکات، وتی: دەیوت: ئەی کوڕی حەبیب من هیچ شتێکم نەبینی لەماڵەوە بیبەخشم جگە لەوە**

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

نەبێت، پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێبەری بڕوادار لە ڕۆژی دواییدا صەدەقەکەیەتی.

## بَابُ فَضْلِ الصَّدَقَةِ عَلَى غَيْرِهَا مِنَ الْأَعْمَالِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَعْرِفُ أَبَا فَرْوَةَ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ

**٢٤٣٣-** عَنْ أَبِي فَرْوَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ المسَيِّبِ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ ذُكِرَ لِي قَالَ: يَقُولُ: «إِنَّ الْأَعْمَالَ تَتَبَاهَى، فَتَقُولُ الصَّدَقَةُ أَنَا أَفْضَلُكُمْ»(١).

**باسی فەزل گەورەیی خێر و بەخشین بەسەر کردەوەکانی دیکەوە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من نازانم ئەبو فەڕوە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) کەسێکی دادپەروەرە یان لەکەدارە**

واتە: ئەبو فەڕوە دەڵێ: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەییب بوو گێڕایەوە، عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وتی: بۆم باس کرا، وتی: دەیوت: بەڕاستی کردەوەکان شانازی بە خۆیانەوە دەکەن، بەخشین دەڵێ من چاکترینتانم.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّدَقَةَ بِالْمَمْلُوكِ أَفْضَلُ مِنْ عِتْقِ الْمُتَصَدِّقِ إِيَّاهُ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ

**٢٤٣٤-** عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ، أَنَّهَا سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ خَادِمًا فَأَعْطَاهَا، فَأَعْتَقَهَا، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّكِ لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لِأَجْرِكِ»(٢).

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خاوەنکۆیلە کۆیلەکەی ببەخشێ بە کەسێکی نزیکی خۆی چاکترە لەوەی ئازادی بکات، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت (دەڵێم: ئەگەر فەرموودەکەش تەواو بێت بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی بەخشینی کۆیلە چاکترە لە ئازادکردنی، پێدەچی ئەو فەرموودە تایبەت بووبێت بەوکەسە نەك هەموو ئوممەت، چونکە چەندین ئایەت و چەندین فەرموودە هاتوون باسی ئازادکردنی کۆیلەکان دەکەن نەك بەخشینەوەیان، خوا زاناترینە)**

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: مەیمونە ﵂ دەگێڕێتەوە، ئەو داوای خزمەتکارێکی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، پێی بەخشی، دواتر ئەویش ئازادی کرد، فەرمووی: بەڵام تۆ ئەگەر بتبەخشیایە بە خاڵۆکانت (لە نەوەکانی هیلال) ئەوە پاداشتەکەت گەورەتر بوو.

## بَابُ فَضْلِ الْمُتَصَدِّقِ عَلَى الْمُتَصَدَّقِ عَلَيْهِ

**٢٤٣٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْأَيْدِي ثَلَاثَةٌ، يَدُ اللَّهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَاسْتَعِفَّ عَنِ السُّؤَالِ مَا اسْتَطَعْتَ»[1].

## باسی فەزڵ و ڕێزی بەخشەر لەسەر پێ بەخشراو

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستەکان سیانن: دەستی خوا ﷻ لە سەرەوەیە، وە دەستی ئەو کەسەیش دەبەخشێت بەدوایدا دێت، وە دەستی داواکەر (ئەو کەسەی سواڵ دەکات) تا ڕۆژی دوایی لە خوارەوەیە، ئەوەندەی لە تواناتدایە خۆت بگرەوە لە داواکردن.

**٢٤٣٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا أَبْقَتْ غَنَاءً، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ مَنْ تَعُولُ تَقُولُ امْرَأَتُكَ: أَنْفِقْ عَلَيَّ أَوْ طَلِّقْنِي وَيَقُولُ مَمْلُوكُكَ: أَنْفِقْ عَلَيَّ أَوْ بِعْنِي وَيَقُولُ وَلَدُكَ: إِلَى مَنْ تَكِلُنَا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترین بەخشین ئەوەیە خاوەنەکەی دوای بەخشینەکە بەدەوڵەمەندی بمێنێتەوە، وە دەستی سەرەوە چاکترە لە دەستی خوارەوە، بەوە دەست پێ بکە کە بژێوی و بەخێوکردنی لە ئەستۆتە، هاوسەرەکەت دەڵێ: خەرجیم بۆ دابین بکە یان تەڵاقم بدە، بەندەکەیشت دەڵێ: خەرجیم بۆ دابین بکە یان بمفرۆشە، منداڵەکەیشت دەڵێ: دەماندەیتە دەستی کێ.

## بَابُ ذِكْرِ نَمَاءِ الْمَالِ بِالصَّدَقَةِ مِنْهُ، وَإِعْطَاءِ الرَّبِّ ﷻ الْمُتَصَدِّقَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ:

﴿وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥ ۝٣٩﴾ سبأ

---

(١) في إسناده مقال، من أجل الهجري وقد اختلف في رفعه ووقفه، لكن الحديث صحيح لما له من شواهد.

(٢) صحيح.

**٢٤٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَثَلُ الْمُنْفِقِ وَالْبَخِيلِ، كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ مِنْ لَدُنْ ثَدْيَيْهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا، فَإِذَا أَرَادَ الْمُتَصَدِّقُ، وَالْمُنْفِقُ أَنْ يُنْفِقَ أُسْبِغَتْ عَلَيْهِ الدِّرْعُ أَوْ وُفِّرَتْ حَتَّى تَقَعَ عَلَى بَنَانِهِ وَتَعْفُو أَثَرَهُ، وَإِذَا أَرَادَ الْبَخِيلُ أَنْ يُنْفِقَ قَلَصَتْ وَأَخَذَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ مَوْضِعَهَا حَتَّى أَخَذَتْ بِتَرْقُوَتِهِ أَوْ بِعُنُقِهِ»، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنِّي رَأَيْتُهُ يَقُولُ بِيَدِهِ وَهُوَ يُوَسِّعُهَا وَلَا تَتَّسِعُ[١].

**باسی ماڵ و سامان بە بەخشین زیاد دەکات و بەرەکەتی تێ دەکەوێ، وە پەروەردگار ﷻ دەبەخشێ بە بەخشەر، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ٣٩ ﴾، واتە: ئێوە هەر شتێك ببەخشن ئەوە خوا جێگەی پڕ دەکاتەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نموونەی پیاوی بەخشندە و ڕەزیل و پیسکە، وەکوو دوو پیاو وان دوو عەبای ئاسنیان لەبەردا بێت، لە گۆی مەمکیانەوە هەتا دەفەی شانیان داپۆشێ، ئەگەر بەخشەر و بەخشندەکەش هەرچەندە خێر و چاکە بکات وردە وردە زرێکەی فراوانتر دەبێت و پێستەکەی دادەپۆشێت هەتا سەرپەنجەکانی دەشارێتەوە، لە زەویش دەخشێت هەتا شوێنپێکانی دەسڕێتەوە، ڕەزیلیش هەرکاتێ ویستی شتێك ببەخشێت ئەڵقەکانی ئەو زرێیە هەریەك دەنووسێن بە شوێنی خۆیانەوە، تا گیر دەبن لە شانی یان گەردنی، کابرا دەیەوێت فراوانی بکات کەچی فراوان نابێت. ئەبو هورەیرە وتی: شایەتی دەدەم پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەدەستی ئاماژەی دەکرد بۆ زرێیەکەی ملی فراوانی بکات کەچی فراوان نەدەبوو.

**٢٤٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا يَعْفُو إِلَّا عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵ بە بەخشین کەم ناکات، هەروەها خوا ﷻ عیزەت و سەربەرزی دەبەخشێ بە مرۆڤی لێبووردە، وە هەر بەندەیەك لەپێناوی خوادا خۆی بەکەم بزانێ ئیللا خوا بەرزی دەکاتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ الصَّدَقَةِ عَنِ ظَهْرِ غِنًى يَفْضُلُ عَمَّنْ يَعُولُ الْمُتَصَدِّقُ

**٢٤٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»(١).

## باسی بەخشین لەسەر دەوڵەمەندی فەزڵی زیاترە لەوەی مرۆڤ تەنها بژێوی بۆ ئەوانە دابین بکات کە لە ئەستۆیەتی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین بەخشین ئەوەیە لەسەر دەوڵەمەندی بێت، بەوە دەست پێ بکە بەوەی کە بژێوی و بەخێوکردنی لە ئەستۆتە.

**٢٤٤٠-** عَنْ مَالِكِ بْنِ نَضْلَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَيْدِي ثَلَاثَةٌ، فَيَدُ اللَّهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى، فَأَعْطِ الْفَضْلَ، وَلَا تَعْجَزْ عَنْ نَفْسِكِ»(٢).

واتە: مالیکی کوڕی نەزلە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستەکان سیانن: دەستی خوا ﷻ لە سەرەوەیە، وە دەستی ئەو کەسەیش دەبەخشێت بەدوایدا دێت، وە دەستی داواکەر (ئەو کەسەی سواڵ دەکات) (تا ڕۆژی دوایی) لە خوارەوەیە، ئەوەی زیادەیە ببیەخشە، لەبەرانبەر نەفست دەستەوسان مەبە ئەگەر ڕێگری لێت کرد لە بەخشین..

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ صَدَقَةِ الْمَرْءِ بِمَالِهِ كُلِّهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: عَنْ ظَهْرِ غِنًى، عَمَّا يُغْنِيهِ وَمَنْ يَعُولُ لَا عَنْ كَثْرَةِ الرَّجُلِ

**٢٤٤١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِبَيْضَةٍ مِنْ ذَهَبٍ أَصَابَهَا مِنْ بَعْضِ الْمَعَادِنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خُذْ هَذِهِ مِنِّي صَدَقَةً، فَوَاللَّهِ مَا أَصْبَحْتُ أَمْلِكُ غَيْرَهَا فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ أَتَاهُ مِنْ شِقِّهِ الْأَيْمَنِ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ أَتَاهُ مِنْ شِقِّهِ الْأَيْسَرِ، فَقَالَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: «هَاتِهَا مُغْضَبًا فَحَذَفَهُ بِهَا حَذْفَةً لَوْ أَصَابَهُ لَشَجَّهُ أَوْ عَقَرَهُ، ثُمَّ قَالَ: يَأْتِي أَحَدُكُمْ بِمَالِهِ كُلِّهِ فَيَتَصَدَّقُ بِهِ وَيَتَكَفَّفُ النَّاسَ إِنَّمَا الصَّدَقَةُ عَنْ ظَهْرِ غِنًى»[١].

**باسی سەرزەنشتکردن لەوەی بەندە هەموو ماڵ و سامانەکەی ببەخشێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (عَنْ ظَهْرِ غِنًى)، لەوە زیاتر بێت لە بژێوی ئەوانەی بەخێوکردنیان لە ئەستۆیەتی**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: من لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، لەناکاو پیاوێك هات بۆ لای بە ئەندازەی هێلکەیەك زێڕی پێ بوو، لە هەندێ لە کانزاکان بەدەستی هێنا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم بەخشینەم لێ وەربگرە، سوێند بە خوا جگە لەمە ماڵی دیکەم نییە، پێغەمبەر ﷺ پشتی تێ کرد، پاشان لە لای ڕاستیەوە هات بۆ لای و هەمان وتەی پێی وت، پێغەمبەر ﷺ پشتی تێ کرد، پاشان لە لای چەپیەوە هات بۆ لای و هەمان وتەی پێ وت، پێغەمبەر ﷺ پشتی تێ کرد، پاشان لە چوارەم جاردا فەرمووی: بمدەرێ بەتوڕەییەوە (لێی وەرگرت و) بە فڕێدانێك فڕێی دا ئەگەر بەری بکەوتایە برینداری دەکرد یان ئازاری پێی دەگەیاند، پاشان فەرمووی: یەکێك لە ئێوە دێت هەموو ماڵ و سامانەکەی دەهێنێ ببەخشێ، پاشان دادەنیشێ و دەست لە خەڵکی پان دەکاتەوە، بێگومان بەخشین لە کاتێکدایە خاوەنەکەی بێنیاز بێت.

**٢٤٤٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ تِيبَ عَلَيْهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَنْخَلِعُ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمْسِكْ بَعْضَ مَالِكَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»[٢].

واتە: عەبدوڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، کاتێ خوا لێی خۆش بوو بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا من هەموو ماڵەکەم دەکەمە صەدەقە بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەشێك لە ماڵ و سامانەکەت بهێڵەوە، ئەوە بۆ تۆ چاکترە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ صَدَقَةِ الْمُقِلِّ إِذَا أَبْقَى لِنَفْسِهِ قَدْرَ حَاجَتِهِ

**٢٤٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفٍ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَسْبِقُ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفٍ قَالَ رَجُلٌ كَانَ لَهُ دِرْهَمَانِ، فَأَخَذَ أَحَدَهُمَا فَتَصَدَّقَ بِهِ، وَآخَرُ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ فَأَخَذَ مِنْ عَرَضِهَا مِائَةَ أَلْفٍ[١].

## باسی بەخشین لەلایەن کەسێکەوە ماڵ و سامانی کەم بێت، بە مەرجێ ئەندازەی پێویست بۆ خۆی بهێڵێتەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەك درهەم پێشی سەد هەزار درهەم کەوت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن درهەمێك پێشی سەد هەزار درهەم دەکەوێت؟ فەرمووی: پیاوێك تەنها دوو درهەمی بوو، یەکێکیانی بەخشی، پیاوێکدیکەش ماڵ و سامانێکی زۆری هەبوو سەد هەزار درهەمی لێ دەرکرد و کردی بە خێر.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا فَضَّلَ صَدَقَةَ الْمُقِلِّ إِذَا كَانَ فَضْلًا عَمَّنْ يَعُولُ، لَا إِذَا تَصَدَّقَ عَلَى الْأَبَاعِدِ وَتَرَكَ مَنْ يَعُولُ جِيَاعًا عُرَاةً إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِبَدْءِ مَنْ يَعُولُ

**٢٤٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «جَهْدُ الْمُقِلِّ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[٢].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا فەزڵ و چاکەی بەخشینی کەسێکی کەمدەستی داوە، ئەگەر ماڵ و سامانەکەی زیاتر بوو لە بژێوی ئەوانەی بەخێوکردنیان لە ئەستۆیەتی، نەك ئەگەر ببەخشێتە خزمی دوور و واز لەوانە بهێنێ کە بەخێوکردنیان لە ئەستۆیەتی، بەبرسێتی**

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

### و ڕەشوڕووتی، چونکە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا بەوانە دەستی پێ کرد کە بەخێوکردنیان لە ئەستۆیەتی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بەخشینێك چاکترینە؟ فەرمووی: بەخشینی کەسێکی هەژار بەپێی توانای خۆی، وە بەوە دەست پێ بکە کە بژێوی و بەخێوکردنی لە ئەستۆتە.

**٢٤٤٥**- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فَقِيرًا فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلًا فَعَلَى عِيَالِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلًا فَعَلَى قَرَابَتِهِ أَوْ ذِي رَحِمِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلًا فَهُنَا وَهَهُنَا»[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەژار بوو با سەرەتا لە نەفسی خۆیەوە دەست پێ بکات، ئەگەر زیاتری هەبوو بیدا بە خانەوادەکەی، ئەگەر زیاتر بوو لە خانەوادەکەی با بیدا بە خزمە نزیکەکانی، ئەگەر زیاتر بوو لە خزمە نزیکەکانی، ئەوە بەملا و بەولادا بیبەخشێ.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي مَسْأَلَةِ الْغَنِيِّ مِنَ الصَّدَقَةِ

**٢٤٤٦**- عَنْ حُبْشِيِّ بْنِ جُنَادَةَ السَّلُولِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الْجَمْرَ»[٢].

### باسی هەڕەشەکردن لەوەی کەسی دەوڵەمەند داوای خێر و بەخشین بکات

واتە: حەبەشی کوڕی جونادەی سەلولی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس داوا بکات و ئەوەندە ماڵ و سامانی هەبێت بێنیازی بکات لە داواکردن ئەوە پشکۆی ئاگر دەخوات.

## بَابُ ذِكْرِ الْغَنِيِّ تَكُونُ الْمَسْأَلَةُ مَعَهُ إِلْحَافًا

**٢٤٤٧**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَأَلَ وَلَهُ قِيمَةُ أُوقِيَّةٍ، فَهُوَ مُلْحِفٌ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی دەوڵەمەند داوای ماڵ و سامان (لە خەڵك) بکات، ئەوە پێداگری کردووە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس داوای ماڵ و سامان بکات (لە خەڵك) و نرخی یەك ئوقیەی هەبێت ئەوە پێداگری کردووە لە داواکردندا (ئوقیەیەك لەو سەردەمەدا یەکسان بووە بە: چل درهەم).

## بَابُ تَشْبِيهِ الْمُلْحِفِ بِمَنْ يَسَفُّ الْمَسْأَلَةَ

**٢٤٤٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَأَلَ وَلَهُ أَرْبَعُونَ دِرْهَمًا فَهُوَ مُلْحِفٌ وَهُوَ مِثْلُ سَفِّ الْمَسْأَلَةِ. يَعْنِي: الرَّمَلَ»[1].

## باسی چواندنی پێداگریکەر لە داواکردنی ماڵ و سامان لە خەڵك بەوکەسەی داوای شتی بێ بەها بکات

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس داوای ماڵ و سامان بکات (واتە: سواڵ لە خەڵك بکات) و چل درهەمی هەبێت، ئەوە پێداگری کردووە لە داواکردندا، هەر وەکوو داواکردنی شتی زۆر بێنرخ وایە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّدَقَةِ عَلَى مَنْ يَمُونُهُ مُتَطَوِّعًا

**٢٤٤٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأُتِيَ بِطَعَامٍ لَيْسَ مَعَهُ لَحْمٌ، فَقَالَ: «أَلَمْ أَرَ لَكُمْ بُرْمَةً؟» قُلْتُ: بَلَى ذَاكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: «هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ مِنْهَا هَدِيَّةٌ»[2].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بەوەی زەکات بدرێ بە کۆیلە و ئەویش لێی ببەخشێ بە گەورەکەی

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام خواردنێکی بۆ هێنرا گۆشتی لەگەڵ نەبوو، فەرمووی: ئایا گۆشتم نەبینی دەتانکرد بە چێشت؟ وتم: بەڵێ، ئەوە گوشتێکە بەخشراوە بە بەریرە، فەرمووی: گوشتەکە بۆ ئەو صەدەقەیە، وە لە ئەوەوە دیارییە بۆ ئێمە.

## بَابُ فَضْلِ الصَّدَقَةِ عَلَى الْمَمَالِيكِ إِذَا كَانُوا عِنْدَ مَلِيكِ السُّوءِ، إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ

**٢٤٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ صَدَقَةٍ أَفْضَلُ مِنْ صَدَقَةٍ تَصَدَّقَ بِهَا عَلَى مَمْلُوكٍ عِنْدَ مَلِيكِ سَوْءٍ»[1].

## باسی فەزڵ و چاکەی بەخشین بە کۆیلەکان ئەگەر لەلای کەسێکی خراپ بوون، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەخشینێك نییە چاکتر بێت لەو بەخشینەی ببەخشێ بە کۆیلەیەك لەلای کەسێکی خراپ بێت.

## بَابُ ذِكْرِ إِعْطَاءِ الْمَرْءِ الْمَالَ نَاوِيًا الصَّدَقَةَ، وَإِلْقَائِهِ ذَلِكَ الْمَالَ مَوْضِعَ الصَّدَقَةِ مِنْ غَيْرِ نُطْقٍ مِنْهُ بِأَنَّهُ صَدَقَةٌ

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا فَضَّلَ صَدَقَةَ الْمُقِلِّ إِذَا كَانَ فَضْلًا عَمَّنْ يَعُولُ، لَا إِذَا تَصَدَّقَ عَلَى الْأَبَاعِدِ وَتَرَكَ مَنْ يَعُولُ جِيَاعًا

**٢٤٥١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «جَهْدُ الْمُقِلِّ وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»[2].

---

(١) إسناده ضعيف جدا.

(٢) صحيح.

## باسی بەخشینی ماڵ و سامان بە کەسێك بە نییەتی زەکات، وە دانانی ئەو ماڵ و سامانە لە جێگای زەکات، بەبێ ئەوەی بە زمان دەری ببڕێت ئەوە صەدەقە و زەکاتە

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا فەزڵ و چاکەی بەخشینی کەسێکی کەمدەستی داوە، ئەگەر ماڵ و سامانەکەی زیاتر بوو لە بژێوی ئەوانەی بەخێوکردنیان لەئەستۆیەتی، نەك ئەگەر ببەخشێتە خزمی دوور و واز لەوانە بهێنێ کە بەخێوکردنیان لەئەستۆیەتی، بەبرسێتی و ڕەشوڕووتی[1]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷛، دەگێڕێتەوە ئەو وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بەخشینێك چاکترینە؟ فەرمووی: بەخشینی کەسێکی هەژار بەپێی توانای خۆی، وە بەوە دەست پێ بکە کە بژێوی و بەخێوکردنی لەئەستۆتە.

**٢٤٥٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷛، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فَقِيرًا فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلًا فَعَلَى عِيَالِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلًا فَعَلَى قَرَابَتِهِ أَوْ ذِي رَحِمِهِ، فَإِنْ كَانَ فَضْلًا فَهَا هُنَا وَهَا هُنَا»[2].

واتە: جابر ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەژار بوو با سەرەتا لە نەفسی خۆیەوە دەستی پێ بکات، ئەگەر زیاتری هەبوو بیدا بە خانەوادەکەی، ئەگەر زیاتر بوو لە خانەوادەکەی با بیدا بە خزمە نزیکەکانی، ئەگەر زیاتر بوو لە خزمە نزیکەکانی، ئەوە بەملا و بەولادا ببیەخشێ.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ عَيْبِ الْمُتَصَدِّقِ الْمُقِلِّ بِالْقَلِيلِ مِنَ الصَّدَقَةِ، وَلَمْزِهِ، وَالزَّجْرِ عَنْ رَمْيِ الْمُتَصَدِّقِ بِالْكَثِيرِ مِنَ الصَّدَقَةِ بِالرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هُوَ الْعَالِمُ بِإِرَادَةِ الْمُرَادِ، وَلَا إِرَادَةَ مِمَّا تُكِنُّهُ الْقُلُوبُ، وَلَمْ يُطْلِعِ اللَّهُ الْعِبَادَ عَلَى مَا فِي ضَمَائِرِ غَيْرِهِمْ مِنَ الْإِرَادَةِ

**٢٤٥٣-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷛ قَالَ: كُنَّا نَتَحَامَلُ فَكَانَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالصَّدَقَةِ الْعَظِيمَةِ، فَيُقَالُ مُرَائِي، وَيَجِيءُ الرَّجُلُ بِنِصْفِ صَاعٍ فَيُقَالُ: إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ هَذَا، فَنَزَلَتْ: ﴿ٱلَّذِينَ

---

(١) ) ئەم سەرباسە لەگەڵ فەرموودەکە دووبارەیە، ئێمەش وەکوو خۆی داماناوە.

(٢) صحيح.

يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ﴿٧٩﴾ ﴾التوبة[1].

**باسی سەرزەنشتکردنی ئەو کەسەی تانەوتەشەر دەدات لە کەسێك، شتێکی کەم ببەخشێ و عەیبی لێ دەربکات، وە سەرزەنشتکردن لە تۆمەتبارکردنی ئەو پیاوەی ماڵ و سامانی زۆر دەبەخشێ بە ڕیاباز و ناوبانگ، چونکە تەنها خوا بە مەبەست و نیازی بەندەکانی دەزانێ، کەس نازانێ بە ناخی کەس جگە لە خوا**

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: (کاتێ ئایەتی هاندان لەسەر صەدەقە و بەخشین دابەزی) ئێمە هەر یەکەمان بەپێی توانای خۆی ماڵ و سامانی دەهێنا بۆ بەخشین، پیاوی وا هەبوو شتێکی گەورەی دەهێنا و دەیبەخشیەوە، دەوترا: (دووڕووەکان دەیانوت): ئەوە بۆ ڕیاییە، پیاوی واش هەبوو دەهات نیو صاع خۆراکی دەهینا، دەوترا: خوا ﷻ بێنیازە لەو بەخشینە پاشان ئەم ئایەتە دابەزییە خوارەوە: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: ئەو کەسانەی کە تانەوتەشەر دەدەن لەو بڕوادارانەی جگە لە زەکات ماڵ و سامانیان دەبەخشن وە لەوانەیشی کە تەنها کەمێکیان هەیە بە زەحمەت پەیدایان کردووە.

## بَابُ فَضْلِ صَدَقَةِ الصَّحِيحِ الشَّحِيحِ الْخَائِفِ مِنَ الْفَقْرِ الْمُؤَمِّلِ طُولَ الْعُمُرِ عَلَى صَدَقَةِ الْمَرِيضِ الْخَائِفِ نُزُولَ الْمَنِيَّةِ بِهِ

٢٤٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْبَقَاءَ، وَلَا حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومُ، قُلْتُ لِفُلَانٍ كَذَا وَلِفُلَانٍ كَذَا، أَلَا وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەزڵ و گەورەیی بەخشینی کەسێك لەشی ساغ بێت و بترسێ لە هەژاری، ئومێدی تەمەندرێژی هەبێت، لەسەر بەخشینی کەسێك نەخۆش بێت و مەترسی مردنی هەبێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کام خێر و بەخشین (لای خوا) مەزنترین پاداشتی هەیە؟ فەرمووی: کاتێ خێر بکەی لەشت ساغ بێت و لە هەژاری بترسی و ئومێدی مانەوەت هەبێت، خاوەخاو نەکەی هەتا گیانت دەگاتە قورقوڕاگەت، بڵێی: ئەوەندە بۆ فلان و ئەوەندە بۆ فلان، کە بێگومان ئەوەیش هەر بۆ فلانە کەسە (مەبەستی پێی میراتگرەکەی بوو).

## بَابُ فَضْلِ صَدَقَةِ الْمَرْءِ بِأَحَبِّ مَالِهِ لِلَّهِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَفَى إِدْرَاكَ الْبِرِّ عَمَّنْ لَا يُنْفِقُ مِمَّا يُحِبُّ. قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾ آل عمران

٢٤٥٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾ آل عمران، أَتَى أَبُو طَلْحَةَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَيْسَ لِي أَرْضٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَرْضِي بَيْرَحَى، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بَيْرَحَى خَيْرٌ رَايِحٌ أَوْ خَيْرُ رَابِحٌ» - يَشُكُّ الشَّيْخُ - فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: وَإِنِّي أَتَقَرَّبُ بِهَا إِلَى اللَّهِ، فَقَالَ: «اجْعَلْهَا فِي قَرَابَتِكَ، فَقَسَمَهَا بَيْنَهُمْ حَدَائِقَ»[1].

## باسی فەزڵ و گەورەیی بەخشینی چاکترین ماڵ و سامان لەلایەن بەندەوە بۆ خوا، چونکە خوا ڕەتی کردۆتەوە مرۆڤ بگات بە ئەوپەڕی چاکە تا ئەوەی لەلای زۆر خۆشەویستە نەیبەخشێت، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾، واتە: هەرگیز ناگەن بە چاکە تا ئەوەی خۆشتان دەوێ لە ماڵ و دارایی نەیبەخشن

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾، ئەبو تەڵحە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو لەسەر مینبەر بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زەوییەکەم نییە ئەوەندەی

---

(١) صحيح.

زەوی (بَيْرَحَى) خۆشەویستتر بێت لەلام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بَيْرَحَى) خێرێکی پڕ لە قازانجە، ئەبو تەڵحە وتی: من دەیبەخشم بۆ ئەوەی پێی نزیك ببمەوە لە خوا، فەرمووی: بیبەخشە بە خزمەکانت، ئەویش کردی بە چەند باخچەیەك و دابەشی کرد لە نێوانیاندا.

**بَابُ ذِكْرِ حُبِّ اللَّهِ ﷻ الْمُخْفِي بِالصَّدَقَةِ، إِذِ اللَّهُ ﷻ قَدْ فَضَّلَهَا عَلَى صَدَقَةِ الْعَلَانِيَةِ. قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿إِن تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴿٢٧١﴾﴾ البقرة**

**٢٤٥٦-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ؓ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ، وَثَلَاثَةٌ يُبْغِضُهُمُ اللَّهُ، أَمَّا الَّذِينَ يُحِبُّهُمْ، فَرَجُلٌ أَتَى قَوْمًا فَسَأَلَهُمْ بِاللَّهِ وَلَمْ يَسْأَلْهُمْ بِقَرَابَةٍ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ فَتَخَلَّفَ رَجُلٌ بِأَعْقَابِهِمْ فَأَعْطَاهُ سِرًّا لَا يَعْلَمُ بِعَطِيَّتِهِ إِلَّا اللَّهُ وَالَّذِي أَعْطَاهُ، وَقَوْمٌ سَارُوا لَيْلَتَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ النَّوْمُ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِمَّا يَعْدِلُ بِهِ نَزَلُوا فَوَضَعُوا رُءُوسَهُمْ، فَقَامَ يَتَمَلَّقُنِي، وَيَتْلُو آيَاتِي، وَرَجُلٌ كَانَ فِي سَرِيَّةٍ، فَلَقِيَ الْعَدُوَّ فَهُزِمُوا، فَأَقْبَلَ بِصَدْرِهِ حَتَّى يُقْتَلَ أَوْ يُفْتَحَ لَهُ، وَالثَّلَاثَةُ الَّذِينَ يُبْغِضُهُمُ اللَّهُ: الشَّيْخُ الزَّانِي وَالْفَقِيرُ الْمُخْتَالُ، وَالْغَنِيُّ الظَّلُومُ»[1].

**باسی خۆشەویستی خوا ﷻ بۆ ئەو کەسەی بەنهێنی دەبەخشێت، چونکە خوا ﷻ فەزڵی داوە بەسەر بەخشینی ئاشکرادا، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِن تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴿٢٧١﴾﴾، واتە: ئەگەر خێر و بەخشینەکانتان بەئاشکرا ئەنجام بدەن ئەوە کارێکی چاکە، وە ئەگەر بیانشارنەوە و بیدەن بە هەژاران ئەوە باشترە بۆ ئێوە**

واتە: ئەبو زەڕ ؓ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا خۆشی دەوێن، سیانی دیکەش خوا ڕقی لێیانە، جا ئەوانەی کە خوا خۆشی دەوێن: پیاوێکە دەچێت بۆ لای خەڵکێك داوایان لێ دەکات لەبەر خوا یارمەتی بدەن، نەك لەبەر خزمایەتی لە نێوان ئەو و ئەوان، پیاوێك لەنێو ئەوان جێ بمێنێ و بەنهێنی یارمەتی بدات، کەس بە بەخشینەکەی نەزانێ جگە لە خوا و ئەو کەسەیشی پێی

---

(١) صحيح من غير هذا الطريق.

بەخشیوە، خەڵکێکیش شەوڕەوی بکەن هەتا وایان لێ دێت خەو لەلایان لە هەموو شتێ خۆشەویستتر دەبێت، دابەزن بۆ پشوودان و سەریان دابنێن بۆ ئەوەی بخەون، کەسێك لەنێویاندا هەستێت بپاڕێتەوە لێم و ئایەتەکانم بخوێنێتەوە، پیاوێکیش لەنێو لەشکرێکدا بێت، ڕوبەڕووی دوژمن ببنەوە و هەڵبێن، ئەو بەتەنها ڕوبەڕوویان ببێتەوە و بجەنگێت هەتا دەکوژرێ یان دەروی بۆ دەکرێتەوە، ئەو سیانەشی کە خوا ڕقی لێیانە: پیاوێکی بەساڵاچووی زیناکار و هەژارێکی لەخۆبایی و دەوڵەمەندێکی ستەمکار.

**بَابُ ذِكْرِ مَثَلٍ ضَرَبَهُ النَّبِيُّ ﷺ لِلْمُتَصَدِّقِ وَمَنْعَ الشَّيَاطِينُ إِيَّاهُ مِنْهَا بِتَخْوِيفِ الْفَقِيرِ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَقِفُ هَلْ سَمِعَ الْأَعْمَشُ مِنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ أَمْ لَا؟ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ﴿٦٨﴾ ﴾ البقرة**

**٢٤٥٧-** عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا يُخْرِجُ رَجُلٌ شَيْئًا مِنَ الصَّدَقَةِ حَتَّى يَفُكَّ عَنْهَا لَحْيَيْ سَبْعِينَ شَيْطَانًا»[1].

**باسی نموونەیەك پێغەمبەر ﷺ هێناویەتەوە بۆ بەخشەر و ڕێگری شەیتانەکان لەبەردەمیدا بە ترساندنی لە هەژاری، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من نازانم ئەعمەش ئەو فەرموودەی لە ئیبنو بورەیدەوە بیستووە یان نا؟ خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: شەیتان دەتانترسێنێ بە هەژاری وە فەرمانتان پێ دەدات بە خراپە**

واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندە هەر شتێك دەربکات بۆ بەخشین حەفتا شەیتان وەسوەسە و ختوورەی بۆ دروست دەکەن.

**بَابُ الْأَمْرِ بِإِتْيَانِ الْقَرَابَةِ بِمَا يَتَقَرَّبُ بِهِ الْمَوَالِي إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُرَادَ إِذَا قَالَ: مَا لِي وَنِصْفُهُ هُوَ لِلَّهِ، كَانَتْ صَدَقَةً.**

---

(١) إسناده ضعيف.




**مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَرْضَ أَوِ الدَّارَ أَوِ الْحَائِطَ أَوِ الْبُسْتَانَ أَوِ الْخَانَ أَوِ الْحَانُوتَ إِذَا جَعَلَهُ الْمَرْءُ لِلَّهِ كَانَتْ صَدَقَةً، وَإِنْ لَمْ يَذْكُرْ حُدُودَهَا، لَا كَمَا تَوَهَّمَهُ الْعَامَّةُ أَنَّ مَا لَمْ تُذْكَرِ الْحُدُودُ مِمَّا عُدَّ لَمْ يَثْبُتْ بَيْعُهُ، وَلَا هِبَتُهُ حَتَّى تُذْكَرَ حُدُودُهُ**

**٢٤٥٨**- عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ ﷺ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾ آل عمران، قَالَ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا ۝٢٤٥﴾ البقرة، قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَائِطِي الَّذِي فِي كَذَا وَكَذَا هُوَ لِلَّهِ، وَلَوِ اسْتَطَعْتُ أَنْ أُسِرَّهُ لَمْ أُعْلِنْهُ، فَقَالَ: «اجْعَلْهُ فِي فُقَرَاءِ أَهْلِكَ، أَدْنَى أَهْلِ بَيْتِكَ»[1].

**باسی فەرمانکردن بەوکەسەی دەبەخشێ بۆ ئەوەی لە خوا نزیك ببێتەوە پێی، با سەرەتا ببەخشێ بە خزمە نزیکەکانی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەگەر وتی:ماڵەکەم و نیوەی بۆ خوایە، مەبەست پێی بەخشینە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی زەوی یان خانوو یان باخ یان باخچە یان دوکان و بازاڕ ئەگەر بۆ خوا بەخشی، ئەگەرچی باسی سنوورەکانیشی نەکرد، نەك وەکوو ئەوەی خەڵکی بەهەڵەدا چوون وا دەزانن ئەگەر باسی سنوورەکان نەکرا، ئەوە فرۆشتن و بەخشینی دانامەزرێ، تا باسی سنوورەکانی دەکرێ**

واتە: حومەید دەڵێ: ئەنەس ﷺ وتی: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۝٩٢﴾، واتە: هەرگیز ناگەن بە چاکە تا ئەوەی خۆشتان دەوێ لە ماڵ و دارایی نەیبەخشن. وتی: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا ۝٢٤٥﴾، واتە: کێیە ئەو کەسەی قەرز بدات بە خوا بە قەرزێکی باش. ئەبو تەڵحە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو باخەم کە ئەوەندە و ئەوەندەیە ئەوە لەپێناوی خوادا بەخشیم، ئەگەر بمتوانیایە بیشارمەوە ئاشکرام نەدەکرد، فەرمووی: بیدە بە کەسوکارە هەژارەکانت، نزیکترینی خزمەکانت.

**٢٤٥٩**- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ. فَذَكَرَ نَحْوَهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی. دواتر بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو باسی کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ احْتِمَالَ الشَّهَادَةِ بِصَدَقَةِ الْعَقَارِ جَائِزٌ لِلشُّهُودِ إِذَا عَلِمُوا الْعَقَارَ الْمُتَصَدَّقَ بِهِ مِنْ غَيْرِ تَحْدِيدٍ، إِذِ الْعَقَارُ مَشْهُورٌ بِالْمُتَصَدِّقِ مَنْسُوبٌ إِلَيْهِ مُسْتَغْنٍ بِشُهْرَتِهِ وَنِسْبَتِهِ إِلَى الْمُتَصَدِّقِ بِهِ عَنْ ذِكْرِ تَحْدِيدِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى إِبَاحَةِ الْحَاكِمِ احْتِمَالَ الشَّهَادَةِ إِذَا شَهِدَ عَلَيْهَا

**٢٤٦٠-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَرَى رَبَّنَا يَسْأَلُنَا أَمْوَالَنَا، فَأُشْهِدُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ جَعَلْتُ أَرْضِي بَيْرَحَى لِلَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اجْعَلْهَا فِي قَرَابَتِكَ»، قَالَ: فَجَعَلَهَا فِي حَسَّانِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دانانی شایەتی لە بەخشینی زەوی دروستە بۆ شایەتەکان، ئەگەر زەوییە بەخشراوەکەیان ناسی بەبێ دیاریکردن، لە کاتێکدا زەوییەکە بەناوبانگ بێت و درابێتە پاڵی بەخشەر پێویست بەوە نەکات ڕووبەری دیاری بکرێت، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕێگە دراوە کەسی دەسەڵاتدار بکرێت بە شایەت ئەگەر زەوییەکەی ناسی

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴿٩٢﴾﴾، ئەبو تەڵحە وتی: پێم وایە پەروەردگارمان پرسیارمان لێ دەکات دەربارەی ماڵ و سامانەکانمان، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ دەکەم بە شایەت من زەوییەکەی (بَيْرَحَى)م لەپێناوی خوا بەخشی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیبەخشە بە خزم و کەسەکانت، وتی: بەخشی بە حەسانی کوڕی سابیت و ئوبەی کوڕی کەعب.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ إِتْيَانِ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا وَوَلَدَهَا بِصَدَقَةِ التَّطَوُّعِ عَلَى غَيْرِهِمْ مِنَ الْأَبَاعِدِ إِذْ هُمْ أَحَقُّ بِأَنْ يُتَصَدَّقَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْأَبَاعِدِ

**٢٤٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ انْصَرَفَ مِنَ الصُّبْحِ يَوْمًا، فَأَتَى النِّسَاءَ فِي الْمَسْجِدِ فَوَقَفَ عَلَيْهِنَّ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ مَا رَأَيْتُ مِنْ نَوَاقِصِ عُقُولٍ قَطُّ وَدِينٍ أَذْهَبَ بِقُلُوبِ ذَوِي الْأَلْبَابِ مِنْكُنَّ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنَّكُنَّ أَكْثَرُ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَتَقَرَّبْنَ إِلَى اللَّهِ بِمَا

---

(١) صحيح.

اسْتَطَعْتُنَّ»، وَكَانَ فِي النِّسَاءِ امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَانْقَلَبَتْ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَأَخْبَرَتْهُ بِمَا سَمِعَتْ مِنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَخَذَتْ حُلِيَّهَا قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَيْنَ تَذْهَبِينَ بِهَذَا الْحُلِيِّ؟ قَالَتْ: أَتَقَرَّبُ بِهِ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ قَالَ: وَيْحَكِ هَلُمِّي تَصَدَّقِي بِهِ عَلَيَّ وَعَلَى وَلَدِي، فَإِنَّا لَهُ مَوْضِعٌ، فَقَالَتْ: لَا حَتَّى أَذْهَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَذَهَبَتْ تَسْتَأْذِنُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذِهِ زَيْنَبُ تَسْتَأْذِنُ قَالَ: أَيُّ الزَّيَانِبِ هِيَ؟ قَالَ: امْرَأَةُ ابْنُ مَسْعُودٍ قَالَ: إِيذَنُوا لَهَا، فَدَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي سَمِعْتُ مِنْكَ مَقَالَةً فَرَجَعْتُ إِلَى ابْنِ مَسْعُودٍ، فَحَدَّثْتُهُ، وَأَخَذْتُ حُلِيًّا لِي أَتَقَرَّبُ بِهِ إِلَى اللَّهِ، وَإِلَيْكَ رَجَاءً أَنْ لَا يَجْعَلَنِي اللَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَقَالَ لِي ابْنُ مَسْعُودٍ: تَصَدَّقِي بِهِ عَلَيَّ وَعَلَى ابْنِي فَإِنَّا لَهُ مَوْضِعٌ، فَقُلْتُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَصَدَّقِي بِهِ عَلَيْهِ وَعَلَى بَنِيهِ فَإِنَّهُمْ لَهُ مَوْضِعٌ»[1].

## باسی چاکتر وایە ژن منداڵ و مێردەکەی پێش بخات لە بەخشیندا بەسەر جگە لەواندا لە خزمە دوورەکان، چونکە منداڵ و مێردەکەی لەپێشترن خێریان پێ بکرێ لە خزمە دوورەکان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك نوێژی بەیانی تەواو کرد، هات بۆ لای ئافرەتانی نێو مزگەوتەکە و بەسەریانەوە ڕاوەستا، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان کەسی وەك ئێوە کەمعەقڵ و کەمدینم نەبینیوە، کەچی عەقڵی پیاوی ژیر و هۆشدار دەبەن، بەڕاستی من ئێوەم بینی زۆرترین ئەهلی دۆزەخ بوون لە ڕۆژی دواییدا، هەرچی لە تواناتاندا هەیە خۆتان لە خوا نزیك بکەنەوە، لەنێو ئافرەتەکاندا خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعودی تێدا بوو، گەڕایەوە بۆ لای عەبدوڵای کوڕی مەسعود، ئەوەی بیستی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هەواڵی پێ دا، خشڵ و زێڕەکانی هەڵگرت، ئیبنو مەسعود وتی: ئەم خشڵانە بۆ کوێ دەبەی؟ وتی: خۆم پێی نزیك دەکەمەوە لە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، وتی: هاوار بۆ تۆ بیبەخشە بە من و منداڵەکەم، ئێمە شیاوین بەوە، وتی: نەخێر تا دەچم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ڕۆیشت مۆڵەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرێ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا زەینەب هاتووە داوای مۆڵەتت لێ دەکات؟ فەرمووی: کام زەینەبە؟ فەرمووی:

---

(١) صحيح.

خێزانی ئیبنو مەسعود، وتی: مۆڵەتی پێ بدەن، دواتر هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من گوێم لە وتەیەکت بوو گەڕامەوە بۆ لای ئیبنو مەسعود، بۆم باس کرد و خشڵەکانم هەڵگرت تا خۆم پێی نزیك بکەمەوە لە خوا و لە تۆ، بەئومێدی ئەوەی خوا لە ئەهلی دۆزەخ دامنەنێ، ئیبنو مەسعود پێمی وت: بیبەخشە بە من و منداڵەکەم ئێمە شیاوین بەوە، وتم: با مۆڵەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیبەخشە بە ئەو و منداڵەکەی، چونکە ئەوان شیاون.

**٢٤٦٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ، زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ، فَهَذَا الْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى أَنَّ بَنِيَّ ابْنِ مَسْعُودٍ الَّذِينَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ: وَعَلَى بَنِيهِ، كَانُوا بَنِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ مِنْ زَيْنَبَ[1].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە زەینەبی فەرموو: ئیبنو مەسعود ڕاستی کرد، مێردەکەت و منداڵەکەت لەپێشترن پێیان ببەخشی.، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی منداڵەکانی ئیبنو مەسعود کە لە فەرموودەکەی ئەبو هوڕەیڕەدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وە لەسەر منداڵەکانیشی، منداڵەکانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود بوو لە زەینەبەوە.

## بَابُ ذِكْرِ تَضْعِيفِ صَدَقَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى زَوْجِهَا وَعَلَى مَا فِي حِجْرِهَا عَلَى الصَّدَقَةِ عَلَى غَيْرِهِمْ

**٢٤٦٣-** عَنْ زَيْنَبَ ﷺ، امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالصَّدَقَةِ، وَقَالَ: تَصَدَّقْنَ يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ، قَالَتْ: وَكُنْتُ أَعُولُ عَبْدَ اللَّهِ، وَبَنَاتِي فِي حِجْرِي، فَقُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ: إِيتِ النَّبِيَّ ﷺ فَسَلْهُ، هَلْ تُجْزِئُ ذَلِكَ عَلَى أَنْ أُوجِبَهُ عَنْكُمْ مَعَ الصَّدَقَةِ؟ قَالَ: لَا بَلِ ائْتِيهِ، فَسَلِيهِ قَالَتْ: فَأَتَيْتُهُ، فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، وَكَانَتْ قَدْ أُلْقِيَتْ عَلَيْهِ الْمَهَابَةُ، فَوَجَدْتُ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ حَاجَتُهَا مِثْلُ حَاجَتِي، فَخَرَجَ عَلَيْنَا بِلَالٌ، فَقُلْنَا: سَلْهُ وَلَا تُحَدِّثْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَنْ نَحْنُ، فَقَالَ: امْرَأَتَانِ تَعُولَانِ أَزْوَاجَهُمَا وَيَتَامَى فِي حُجُورِهِمَا، أَتُجْزِئُ ذَلِكَ عَنْهُمَا مِنَ الصَّدَقَةِ؟

---

(١) صحيح.

فَقَالَ لَهُ: مَنْ هُمَا؟ قَالَ: زَيْنَبُ وَامْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ قَالَ: أَيُّ الزَّيَانِبِ؟ قَالَ: امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، وَامْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ قَالَ: نَعَمْ لَهُمَا أَجْرَانِ أَجْرُ الْقَرَابَةِ، وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ(١).

## باسی خێر و بەخشینی ژن بۆ مێردەکەی و ئەوانەیشی لەلای ئەون بە چەندین قات پاداشتی زیاترە، لەوەی بیبەخشێ بە جگە لەوان

واتە: زەینەب ﷺ خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە بەخشین، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، ببەخشن، تەنانەت لەو زێڕ و زیوانەیشتان کە خۆتانی پێ دەڕازێننەوە، وتی: من پێویستیی عەبدوڵا و هەردوو کچە هەتیوەکەم خستبووە ئەستۆ کە لەلام بوون، بە عەبدوڵام وت: بچۆ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ بکە، ئایا دەبێت بیبەخشم بە ئێوە وەکوو صەدەقە؟ وتی: نەخێر، بەڵکوو تۆ بچۆ بۆ لای پرسیاری لێ بکە، وتی: منیش چووم بۆ لای، لەلای دەرگاکە دانیشتم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەیبەتێکی پێ بەخشرابوو، ئافرەتێکم بینی لە ئەنصارەکان هەمان داواکاری منی هەبوو، بیلال هات بۆ لامان، وتمان: پرسیارمان بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ناوی ئێمە مەهێنە، وتی: دوو ئافرەت هاتوون بژێوی مێردەکانیان و منداڵانێکی هەتیویان خستووەتە ئەستۆ کە لەلایانن، ئایا پاداشتیان بۆ دەنووسرێ لەوەی دەیبەخشین بە مێردەکانمان و ئەو هەتیوانەی لەلایانن؟ پێی فەرموو: ئەو دووانە کێن؟ وتی: زەینەب و ئافرەتێکە لە ئەنصارەکان، فەرمووی: کام زەینەبەکان؟ وتی: زەینەبی خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود و ئافرەتێك لە ئەنصارەکان، فەرمووی: بەڵێ دوو پاداشتیان دەست دەکەوێ: پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی بەخشینیش.

**٢٤٦٤-** عَنْ زَيْنَبَ ﷺ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَتْ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ وَنَحْنُ بِالْمَسْجِدِ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ، وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ»(٢).

واتە: زەینەب ﷺ خێزانی عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین بە بەخشین، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، ببەخشن، تەنانەت لەو زێڕ و زیوانەیشتان کە خۆتانی پێ دەڕازێننەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ صَدَقَةِ الْمَرْءِ عَلَى وَلَدِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّدَقَةَ إِذَا رَجَعَتْ إِلَى الْمُتَصَدِّقِ بِهَا إِرْثًا عَنِ الْمُتَصَدَّقِ عَلَيْهِ جَازَ لَهُ. وَالْفَرْقُ بَيْنَ مَا يَمْلِكُهُ الرَّجُلُ مِنَ الصَّدَقَةِ إِرْثًا وَبَيْنَ مَا يَمْلِكُهُ بِابْتِيَاعٍ أَوِ اسْتِيهَابٍ إِذِ الْإِرْثُ يَمْلِكُهُ الْوَارِثُ أَحَبَّ ذَلِكَ أَمْ كَرِهَ، وَلَا يَمْلِكُ الْمَرْءُ مِلْكًا بِغَيْرِ نِيَّةٍ، وَأَخْبَرَ أَنَّهُ مِلْكٌ بِمَعْنًى مِنَ الْمَعَانِي سِوَى الْمِيرَاثِ

**٢٤٦٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَجُلًا تَصَدَّقَ عَلَى وَلَدِهِ بِأَرْضٍ فَرَدَّهَا إِلَيْهِ الْمِيرَاثُ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: «وَجَبَ أَجْرُكَ، وَرَجَعَ إِلَيْكَ مِلْكُكَ»[1].

## باسی بەخشینی باوك بۆ کوڕەکەی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بەخشین ئەگەر گەڕایەوە بۆ بەخشەر بە میرات لە پێبەخشراوەوە دروستە بۆی، وە جیاوازی لە نێوان ئەو صەدەقەی دەبێتە موڵکی پیاو بە میرات و لە نێوان ئەوەی بە کڕین یان بەخشین دەبێت بە موڵکی، چونکە میرات دەبێتە موڵکی میراتگر پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت، بەڵام ماڵ و سامان بەبێ نییەت نابێتە موڵك، وە هەواڵی داوە ئەو بەخشینە موڵکە بە مانایەك لە ماناکان جگە لە میرات

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ﷺ، پیاوێك زەوییەکی بەخشی بە کوڕەکەی، (دوای مردنی کوڕەکەی) بە میرات بۆی گەڕایەوە، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێی فەرموو: پاداشتت (پەیوەندی خزمایەتی) واجب بوو، موڵکەکەیشت بە میرات بۆ گەڕایەوە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالصَّدَقَةِ مِنَ الثِّمَارِ قَبْلَ الْجِذَاذِ مِنْ كُلِّ حَائِطٍ بِقِنْوٍ يُوضَعُ فِي الْمَسْجِدِ

**٢٤٦٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ مِنْ كُلِّ حَائِطٍ بِقِنْوٍ لِلْمَسْجِدِ[2].

## باسی فەرمانکردن پێش بڕینی هەموو باخێك هێشوویەك خورما لە مزگەوت دابنرێ

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لە هەموو باخێك هێشوویەك خورما لە مزگەوت دابنرێت.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الصَّدَقَةِ بِالْحَشَفِ مِنَ الثِّمَارِ، وَإِنْ كَانَتِ الصَّدَقَةُ تَطَوُّعًا، إِذِ الصَّدَقَةُ بِخَيْرِ الثِّمَارِ وَأَوْسَاطِهَا أَفْضَلُ مِنَ الصَّدَقَةِ بِشِرَارِهَا

**٢٤٦٧-** عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، وَإِقْنَاءٌ مُعَلَّقَةٌ، وَقِنْوٌ مِنْهَا حَشَفٌ، وَمَعَهُ عَصًا فَطَعَنَ بِالْعَصَى الْقِنْوَ قَالَ: «لَوْ شَاءَ رَبُّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ تَصَدَّقَ بِأَطْيَبَ مِنْهَا، إِنَّ صَاحِبَ هَذِهِ الصَّدَقَةِ يَأْكُلُ الْحَشَفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

## باسی بەخشینی شتی خراپ لە بەروبوومەکان کەراهەتی هەیە، ئەگەرچی بەخشینەکەش ئاسایی بێت (واتە: زەکات نەبێت)، چونکە بەخشینی چاکترین بەروبوومەکان و مامناوەندەکەیان چاکترە لە بەخشینی خراپترینیان

واتە: عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە نێو مزگەوتەوە، گۆچانێك بە دەستیەوە بوو، چەند هێشووە خورمایەکیش لەنێو مزگەوت هەڵواسرابوو، هێشوویەکی تێدا بوو خراپ بوو، بە گۆچانەکەی دای لە هێشووەکە، فەرمووی: ئەگەر خاوەنی ئەم بەخشینە بیویستایە لەمە چاکتری دەبەخشی، بەڕاستی خاوەنی ئەم بەخشینە لە ڕۆژی دواییدا لەو خورما خراپە دەخوات.

## بَابُ إِعْطَاءِ السَّائِلِ مِنَ الصَّدَقَةِ وَإِنْ كَانَ زِيُّهُ زِيَّ الْأَغْنِيَاءِ فِي الْمَرْكَبِ وَالْمَلْبَسِ

**٢٤٦٨-** عَنْ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِلسَّائِلِ حَقٌّ، وَإِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ»[٢].

## باسی بەخشین بەوکەسەی کە داوا دەکات ئەگەرچی دیمەنیشی دیمەنی دەوڵەمەند بێت لە کەرەستەی سواربوون و جلوبەرگدا

واتە: حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داواکەر مافی هەیە، ئەگەرچی بەسەر ئەسپیشەوە بێت. (ئەم فەرموودەیە ئەوەی تێدایە پێویستە لەسەر مسوڵمان گومانی چاك بۆ برا مسوڵمانەکەی ببات و هەوڵبدات دڵخۆشی بکات، وە وا دابنێت ئەو ئەسپەی لەژێریدایە بەئامانەت وەریگرتووە، یان هەر گومانێ دیکەی چاکی پێ ببات).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ مَبْلَغِ الثِّمَارِ الَّذِي يُسْتَحَبُّ وَضْعُ قِنْوٍ مِنْهُ لِلْمَسَاكِينِ فِي الْمَسْجِدِ إِذَا بَلَغَ جُذَاذُ الرَّجُلِ مِنَ الثِّمَارِ ذَلِكَ الْمَبْلَغَ

**٢٤٦٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا الْوَسْقَ وَالْوَسْقَيْنِ وَالثَّلَاثَةَ وَالْأَرْبَعَةَ، وَقَالَ: «فِي جَادٍّ كُلِّ عَشَرَةِ أَوْسُقٍ، فَيُوضَعُ لِلْمَسَاكِينِ فِي الْمَسْجِدِ قِنْوٌ»[1].

## باسی ڕێژەی ئەو بەروبوومەی کە چاکتر وایە لەگەڵیدا هێشوویەك خورما لە مزگەوت دابنرێ بۆ هەژاران، ئەگەر گەیشتە ئەو ئەندازەیە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە عەڕایا (بەخەمڵاندن بیفرۆشن) یەك ویسق و دوو ویسق و سێ ویسق و چوار ویسق. (تێبینی: ئەگەر لە پێنج ویسق زیاتر بوو ئەوە دەبێت بە ڕیبا). (العرايا: واتە: کڕینی خورمای تەڕ بە خورمای وشك بەخەمڵاندن)، وە وتی: لە بەرهەمی هەموو ئەو باخە خورمایانەی کە بە کانیاو ئاو ئەدرێن لە هەر دە ویسقێکدا هێشوێك خورما لەنێو مزگەوت دابنرێ بۆ هەژاران.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِوَضْعِ الْقِنْوِ الَّذِي ذَكَرْنَا فِي الْمَسْجِدِ لِلْمَسَاكِينِ، أَمْرُ نَدْبٍ، وَإِرْشَادٍ لَا أَمْرُ فَرِيضَةٍ، وَإِيجَابٍ، خَبَرُ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ مِنْ هَذَا الْبَابِ

**٢٤٧٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ فَقَدْ أَذْهَبْتَ عَنْكَ شَرَّهُ»[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە دانانی ئەو هێشووە خورمایەی کە باسمان کرد لە مزگەوت دابنرێ بۆ هەژاران، فەرمانێك بوو بۆ پەسەندبوون و ڕێنیشاندان نەك فەرمانێك بێت بۆ فەرزبوون و واجببوون، فەرموودەکەی تەلحەی کوڕی عەبدوڵا لە چوارچێوەی ئەم باسەیە

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر زەکاتی ماڵەکەت دەرکرد ئەوە شەڕ و خراپەیت لە خۆت دوور خستووەتەوە.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده ضعيف.

**٢٤٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ، فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ، وَمَنْ جَمَعَ مَالًا حَرَامًا، ثُمَّ تَصَدَّقَ بِهِ لَمْ يَكُنْ لَهُ فِيهِ أَجْرٌ، وَكَانَ أَجْرُهُ عَلَيْهِ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر زەکاتی ماڵەکەت دەرکرد، ئەوە ئەرکی سەرشانت بەجێ گەیاندووە، هەر کەسیش ماڵێکی حەرام کۆ بکاتەوە، پاشان بیکات بە خێر و صەدەقە، هیچ پاداشتێکی تێدا نییە بۆ ئەو، گوناهەکەی لەسەریەتی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِعْطَاءِ السَّائِلِ وَإِنْ قَلَّتِ الْعَطِيَّةُ وَصَغُرَتْ قِيمَتُهَا، وَكَرَاهِيَةِ رَدِّ السَّائِلِ مِنْ غَيْرِ إِعْطَاءٍ إِذَا لَمْ يَكُنْ لِلْمَسْئُولِ مَا يَجْزِلُ الْعَطِيَّةَ

**٢٤٧٢-** عَنِ ابْنِ بُجَيْدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، السَّائِلُ يَأْتِينِي، وَلَيْسَ عِنْدِي مَا أُعْطِيهِ قَالَ: «لَا تَرُدِّي سَائِلَكِ لَوْ بِظِلْفٍ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە بەخشین بە داواکەر ئەگەرچی بەخشینەکەیش کەم بێت و نرخی بچووك بێت، وە کەراهەتی هەیە داواکەر (سواڵکەر) ڕەت بکرێتەوە بەبێ ئەوەی شتێکی پێ بدرێت، ئەگەر داوالێکراو شتێکی باشی نەبوو بیبەخشێ

**واتە:** ئیبنو بوجەید دەگێڕێتەوە، لە داپیریەوە ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، داواکەر (سواڵکەر) دێت بۆ لام، هیچم لەلا نییە بیدەم پێی، فەرمووی: ئەو کەسەی داوات لێ دەکات ڕەتی مەکەرەوە ئەگەرچی بە سمێکی سووتاویش بێت.

**٢٤٧٣-** عَنْ أُمِّ بُجَيْدٍ ﷺ، وَكَانَتْ - زَعَمَ - مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: وَاللَّهِ إِنَّ الْمِسْكِينَ لَيَقُومُ عَلَى بَابِي، فَمَا أَجِدُ شَيْئًا أُعْطِيهِ إِيَّاهُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنْ لَمْ تَجِدِي شَيْئًا تُعْطِيهِ إِيَّاهُ إِلَّا ظِلْفًا مُحْرَقًا فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ فِي يَدِهِ»[٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئوممو بوجەید ﷺ دەگێڕێتەوە، -ڕاوی پێی وا بوو- یەکێك بوو لەوانەی بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ، بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: سوێند بە خوا هەژار لەبەر دەرگام دەوەستێ هیچ شك نابەم بیدەم پێی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر هیچت دەست نەکەوت پێی ببەخشی جگە لە سمێکی سووتاو بیدە بەدەستیەوە.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الرُّجُوعِ عَنْ صَدَقَةِ التَّطَوُّعِ وَتَمْثِيلِهِ بِالْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ

**٢٤٧٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الَّذِي يَتَصَدَّقُ بِالصَّدَقَةِ ثُمَّ يَرْجِعُ فِي صَدَقَتِهِ مَثَلُ الْكَلْبِ يَقِيءُ ثُمَّ يَأْكُلُ قَيْئَهُ»[١].

**باسی هەڕەشەی توند لەوکەسەی پەشیمان دەبێتەوە لە بەخشینەکەی، وە چواندنی بە سەگێك بڕشێتەوە، پاشان بگەڕێتەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی (و بیخوات)**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی صەدەقەیەك دەبەخشێ پاشان پەشیمان دەبێتەوە لە بەخشینەکەی، وەکوو سەگێك وایە بڕشێتەوە، پاشان ڕشانەوەکەی بخوات.

**٢٤٧٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْإِعْلَانِ بِالصَّدَقَةِ نَاوِيًا لِاسْتِنَانِ النَّاسِ بِالْمُتَصَدِّقِ فَيُكْتَبُ لِمُبْتَدِئِ الصَّدَقَةِ مِثْلُ أَجْرِ الْمُتَصَدِّقِ اسْتِنَانًا بِهِ

**٢٤٧٧**[٣]**-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَحَثَّ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَبْطَأَ أُنَاسٌ حَتَّى رُئِيَ فِي وَجْهِهِ الْغَضَبُ، ثُمَّ إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ جَاءَ بِصُرَّةٍ، فَأَعْطَاهَا، فَتَتَابَعَ النَّاسُ حَتَّى رُئِيَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) فەرموودەی ژمارە (٢٤٧٦) لە نوسخەی ئەسڵی بەجێ هێشتراوە بەهۆی لەبیرچوون.

فِي وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ السُّرُورُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً؛ فَإِنَّ لَهُ أَجْرَهَا وَأَجْرَ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا، وَمَثَلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ»[١].

## باسی چاکتر وایە بەندە بەئاشکرا ببەخشێت بە مەبەست و نییەتی ئەوەی خەڵکی چاوی لێ بکەن، جا پاداشت بۆ یەکەم کەس دەنووسرێ وەکوو پاداشتی ئەو کەسەی دوای ئەو کردەوەی پێ دەکات

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆ داین هانی داین لەسەر خێر و صەدەقە، خەڵکانێك خاوەخاویان کرد تا تورەیی لە ڕوخساریدا بینرا، پاشان پیاوێك لە ئەنصارەکان تورەکەیەکی هێنا بەخشی، خەڵکەکەیش بە شوێن ئەودا دەستیان کرد بە بەخشین تا خۆشی و شادی لە ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ بینرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس (لە ئیسلامدا) ڕێگایەکی چاك بگرێتەبەر (لەدوای ئەو خەڵکی کردەوەی پێ بکەن) ئەوە پاداشتی ئەو ڕێگا چاکەی بۆ هەیە، وە پاداشتی ئەو کەسەیش کردەوەی پێ دەکات لەدوای ئەو، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی کەسیان کەم بکات، هەر کەس لە ئیسلامدا سوننەتێکی خراپ دابهێنێ، (خەڵکی لەدوای ئەو کردەوەی پێ بکەن) ئەوە گوناهەکەی لەسەریەتی، وە وەکوو گوناهی ئەو کەسەیشی کردەوەی پێ دەکات لەدوای ئەو، بەبێ ئەوەی لە گوناهی هیچ یەکێکیان کەم بکات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْخُيَلَاءِ عِنْدَ الصَّدَقَةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ ابْنِ عَتِيكٍ خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ الْجِهَادِ

**٢٤٧٨-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَيْرَتَانِ إِحْدَاهُمَا يُحِبُّهَا اللَّهُ، وَالْأُخْرَى يَبْغَضُهَا اللَّهُ: الْغَيْرَةُ فِي الرِّمْيَةِ يُحِبُّهَا اللَّهُ وَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رَمْيَةٍ يَبْغَضُهَا اللَّهُ، وَالْمَخِيلَةُ إِذَا تَصَدَّقَ الرَّجُلُ يُحِبُّهَا اللَّهُ، وَالْمَخِيلَةُ فِي الْكِبَرِ يَبْغَضُهَا اللَّهُ، وَقَالَ: ثَلَاثَةٌ تُسْتَجَابُ دَعْوَتُهُمْ، الْوَالِدُ وَالْمُسَافِرُ وَالْمَظْلُومُ، وَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الْجَنَّةَ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ ثَلَاثَةً، صَانِعَهُ وَالْمُمِدَّ بِهِ، وَالرَّامِيَ بِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی مۆڵەتدان بە خۆبەزلزانین بەسەر نەفس و دەروون لە کاتی بەخشین، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرمودەکەی ئیبنو عەتێك لە کتێبی (الْجِهَادِ) باسم کردووە بەڵگەیە لەسەر ئەوە

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوو غەیرەبردن هەیە، یەکێکیان خوا خۆشی دەوێ، ئەوی دیکەیان خوا ڕقی لێیەتی: غەیرەبردن لە نیشانشکێنیدا، خوا خۆشی دەوێ، وە غەیرەبردن لە جگە لە نیشانشکێنی خوا ڕقی لێیەتی، وە خۆ بەزلزانین (بەسەر نەفس و دەروون کە زۆر جار لە کاتی بەخشین لە هەژاری دەترسێ) کاتێ پیاو دەبەخشێ خوا خۆشی دەوێ، وە خۆبەزلزانینێك لە لووتبەرزییەوە سەرچاوە بگرێت خوا ڕقی لێیەتی، وە فەرمووی: سێ کەس نزایان وەردەگیرێ، باوك و گەشتیار و ستەملێکراو، وە فەرمووی: خوا بە یەك تیر سێ کەس دەخاتە بەهەشتەوە، ئەوەی دروستی کردووە و ئەوەیشی بەخشیویەتی (بە مسوڵمانان بە مەبەستی جیهادکردن) و ئەوەیشی لە ڕێی خوادا هاوێشتوویەتی.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ مَنْعِ الصَّدَقَةِ إِذْ مَانِعُهَا مَانِعُ اسْتِقْرَاضِ رَبِّهِ، إِذِ اللَّهُ ﷻ سَمَّى الصَّدَقَةَ قَرْضًا اسْتَقْرَضَ اللَّهُ عِبَادَهُ، وَوَعَدَ عَلَى ذَلِكَ بِتَضْعِيفِ الصَّدَقَةِ أَضْعَافًا كَثِيرَةً قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴿٢٤٥﴾﴾ البقرة

**٢٤٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: اسْتَقْرَضْتُ عَبْدِي فَلَمْ يُقْرِضْنِي، وَشَتَمَنِي عَبْدِي، وَهُوَ لَا يَدْرِي يَقُولُ: وَادَهْرَاهُ وَادَهْرَاهُ، وَأَنَا الدَّهْرُ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ: وَأَنَا الدَّهْرُ، أَيْ وَأَنَا آتِي بِالدَّهْرِ أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ أَيْ بِالرَّخَاءِ وَالشِّدَّةِ، كَيْفَ شِئْتُ إِذْ بَعْضُ أَهْلِ الْكُفْرِ زَعَمَ أَنَّ الدَّهْرَ يُهْلِكُهُمْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ حِكَايَةً عَنْهُمْ: ﴿وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية، فَأَعْلَمَ أَنَّهُ لَا عِلْمَ لَهُمْ بِذَلِكَ وَأَنَّ مَقَالَتَهُمْ تِلْكَ ظَنٌّ مِنْهُمْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية، وَأَخْبَرَ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّ شَاتِمَ مَنْ يُهْلِكُهُمْ هُوَ شَاتِمُ رَبِّهُ جَلَّ وَعَزَّ لِأَنَّهُمْ كَانُوا يَزْعُمُونَ أَنَّ الدَّهْرَ يُهْلِكُهُمْ فَيَشْتُمُونَ مُهْلِكَهُمْ، وَاللَّهُ يُهْلِكُهُمْ لَا الدَّهْرُ فَكُلُّ كَافِرٍ يَشْتِمُ مَهْلِكَهُ، فَإِنَّمَا تَقَعُ الشَّتِيمَةُ مِنْهُمْ عَنْ خَالِقِهِمُ الَّذِي يُهْلِكُهُمْ لَا عَلَى الدَّهْرِ الَّذِي لَا فِعْلَ لَهُ إِذِ اللَّهُ خَالِقُ الدَّهْرِ.

---

(١) إسناده حسن.

**باسی ڕێگریکردن لە بەخشین کەڕاهەتی هەیە، چونکە ڕێگریکەرەکەی ڕێگری قەرزدان بە پەروەردگاری دەکات، چونکە خوا ﷻ بەخشینی ناو ناوە بە قەرزدان بە خوا، وە پەیمانیشی داوە بە چەندین ئەوەندە بۆی زیاد بکات، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ ﴿٢٤٥﴾ ﴾، واتە: کێیە ئەو کەسەی قەرز بدات بە خوا بەقەرزێکی باش ئینجا خوا بۆی زیاد دەکات بەزیادکردنێکی زۆر**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ دەفەرمووێ: داوای قەرزم لە بەندەکەم کرد قەرزی پێ نەدام، وە بەندەکەم جنێوی پێ دام لە کاتێکدا نازانێ، دەڵێ: ئای زەمانە، ئای زەمانە، من (بەدیهێنەر و هەڵسووڕێنەری) زەمانەم.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی: (أَنَا الدَّهْرُ)، واتە: من بەدیهێنەری زەمانەم چۆن بمەوێ شەو و ڕۆژی دەگۆڕم، بە خۆشی و ناخۆشی، چونکە هەندێ لە بێباوەڕان وا گومان دەبەن زەمانە لەناویان دەبات، خوا ﷻ لە زمانحاڵی ئەوانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: جگە لە زەمانە هیچ شتێك ئێمە لەنێو نابات. وە ڕایگەیاندووە ئەوان هیچ زانیاریان نییە لەوەی کە وتوویانە جگە لە گومان نەبێت، خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانە بەو قسانە هیچ زانیارییان نییە تەنها گومان دەبەن. وە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە هەر کەس جنێو بە زەمانە بدات کە گوایە ئەو لەناوی بردووە، ئەوە جنێوی بە پەروەردگاری داوە، چونکە ئەوان گومانیان وا بوو زەمانە لەناویان دەبات، بۆیە جنێویان بە لەناوبەرەکەیان دەدا، خواش لەناویان دەبات نەك زەمانە، هەموو بێباوەڕێك جنێو بە لەناوبەرەکەی دەدات، بۆیە جنێوەکەیان تەنها بۆ بەدیهێنەرەکەیان دەگەڕێتەوە کە لەناویان دەبات نەك بۆ ئەو زەمانەی هیچ کردارێکی نییە، چونکە خوا بەدیهێنەری زەمانەیە.




## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ لِأَهْلِ الصَّدَقَةِ بَابًا مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَخُصُّونَ بِدُخُولِهَا مِنْ ذَلِكَ الْبَابِ

**٢٤٨٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ مِنْ مَالِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ دَعَتْهُ خَدَمَةُ الْجَنَّةِ، وَلِلْجَنَّةِ أَبْوَابٌ فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلَى أَحَدٍ مِنْ ضَرُورَةٍ مِنْ أَيِّهَا دُعِيَ، فَهَلْ يُدْعَى مِنْهَا كُلِّهَا أَحَدٌ؟ قَالَ: نَعَمْ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی دەرگایەك هەیە لە دەرگاكانی بەهەشت تایبەتە بەوانەی دەبەخشن، لەو دەرگاوە دەچنە نێویەوە

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەس دوو دانە لە ماڵ و سامانەكەی لە یەك جۆر ببەخشێ لەپێناوی خوا (بۆ نموونە: دوو وشتر، یان دوو مەڕ یان... هتد)، خزمەتكارانی بەهەشت بانگی دەكەن، بەهەشتیش چەندین دەرگای هەیە، جا هەر كەس لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەكرێ، هەر كەسیش لە ئەهلی بەخشین بێت لە دەرگای بەخشینەوە بانگ دەكرێ، هەر كەسیش لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەكرێ، هەر كەس لە ئەهلی ڕۆژوو بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەكرێ، ئەبو بەكر وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا، گرنگ كەسێك لە كام دەرگایانەوە بانگ بكرێ (گرنگ ئەوەیە بانگ بكرێ، چونكە لە هەر دەرگایەكیانەوە چووە ژوورەوە ڕزگاری دەبێت)، ئایا كەسێك هەیە لە هەموو دەرگاكانەوە بانگ بكرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئومێد دەكەم تۆ لەوانە بیت.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي مَسْأَلَةِ الْغَنِيِّ الصَّدَقَةَ

**٢٤٨١**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: ذَكَرَ أَنَّ رَجُلًا جَاءَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فِي هَيْئَةٍ بَذَّةٍ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## باسی هەڕەشەکردن لەوەی دەوڵەمەند داوای خێر و صەدەقە بکات

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە ڕۆژی هەینی بە جلێکی کۆنە و شڕەوە هات، پێغەمبەری خواش ﷺ وتاری دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد ببەخشن، خەڵکەکە کۆمەڵە پۆشاکێکیان دانا، فەرمانی کرد دوو پۆشاکی پێ بدرێت، وە فەرمانیشی پێ کرد دوو ڕکات نوێژی کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ وتاری دەدا.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الصَّدَقَةِ مُرَآةً وَسُمْعَةً، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُرَائِيَ بِالصَّدَقَةِ مِنْ أَوَائِلِ مَنْ تَسْتَعِرُ بِهِمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ، وَاللَّهَ نَسْأَلُ أَنْ يُعِيذَنَا مِنَ النَّارِ بِعَفْوِهِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾﴾ الإسراء

٢٤٨٢- عَنْ عُقْبَةَ بْن مُسْلِمٍ، أَنَّ شُفَيًّا، حَدَّثَهُ: أَنَّهُ دَخَلَ الْمَدِينَةَ، فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِ النَّاسُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ حَتَّى قَعَدْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَهُوَ يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَلَمَّا سَكَتَ وَخَلَا، قُلْتُ: أَنْشُدُكَ بِحَقٍّ وَحَقٍّ لَمَّا حَدَّثْتَنِي حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَقَلْتَهُ وَعَلِمْتَهُ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَفْعَلُ، لَأُحَدِّثَنَّكَ حَدِيثًا حَدَّثَنِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَلِمْتُهُ، ثُمَّ نَشَغَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَشْغَةً، فَمَكَثَ قَلِيلًا، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: لَأُحَدِّثَنَّكَ حَدِيثًا حَدَّثَنِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَا الْبَيْتِ مَا مَعَنَا أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُهُ، ثُمَّ نَشَغَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَشْغَةً أُخْرَى، فَمَكَثَ بِذَلِكَ، ثُمَّ أَفَاقَ وَمَسَحَ وَجْهَهُ قَالَ: أَفْعَلُ لَأُحَدِّثَنَّكَ بِحَدِيثٍ حَدَّثَنِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا وَهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ مَا مَعَنَا أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُهُ، ثُمَّ نَشَغَ أَبُو هُرَيْرَةَ نَشْغَةً شَدِيدَةً، ثُمَّ مَالَ خَارًّا عَلَى وَجْهِهِ أَسْنَدْتُهُ طَوِيلًا، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ نَزَلَ إِلَى الْعِبَادِ لِيَقْضِيَ بَيْنَهُمْ، وَكُلُّ أُمَّةٍ جَاثِيَةٌ، فَأَوَّلُ مَنْ يَدْعُو بِهِ رَجُلٌ جَمَعَ الْقُرْآنَ، وَرَجُلٌ يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ كَثِيرُ الْمَالِ، فَيَقُولُ لِلْقَارِئِ: أَلَمْ أُعَلِّمْكَ مَا أَنْزَلْتُ عَلَى رَسُولِي؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ قَالَ: فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا عُلِّمْتَ؟ قَالَ: كُنْتُ أَقُومُ بِهِ أَثْنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللَّهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ، وَيُؤْتَى بِصَاحِبِ الْمَالِ فَيَقُولُ اللَّهُ: أَلَمْ أُوَسِّعْ عَلَيْكَ حَتَّى لَمْ أَدَعْكَ تَحْتَاجُ إِلَى أَحَدٍ؟ قَالَ: بَلَى قَالَ: فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا آتَيْتُكَ؟ قَالَ: كُنْتُ أَصِلُ الرَّحِمَ، وَأَتَصَدَّقُ؟ فَيَقُولُ اللَّهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ، فَيَقُولُ اللَّهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ جَوَّادٌ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ، وَيُؤْتِي بِالَّذِي قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَيُقَالُ لَهُ: فِيمَ قُتِلْتَ؟ فَيَقُولُ: أُمِرْتُ بِالْجِهَادِ فِي

سَبِيلِكَ، فَقَاتَلْتُ حَتَّى قُتِلْتُ، فَيَقُولُ اللَّهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ جَرِيءٌ: فَقَدْ قِيلَ ذَلِكَ، ثُمَّ ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رُكْبَتَيَّ، فَقَالَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أُولَئِكَ الثَّلَاثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ اللَّهِ تُسَعَّرُ بِهِمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[1].

**باسی هەڕەشەی توند لە بەخشین بۆ ڕیایی و ناوبانگ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەر کەس ماڵ و سامان بۆ ڕیایی و مەرامی تایبەتی خۆی ببەخشێ لە یەکەمینی ئەوانەیە کە ئاگریان پێ هەڵدەگیرسێنرێ لە ڕۆژی دواییدا، پەنا دەگرین بە خوا لە ڕیایی و ناوبانگ، داوا لە خوا دەکەین بمانپارێزێ لە ئاگر بە لێبووردەیی خۆی، خوا ﷻ فەرموویەتی:** ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾﴾، **واتە: هەر کەس تەنها ژیانی دنیای بوێ لە دنیادا زوو پێی دەدەین ئەوەی بمانەوێ بۆ هەر کەسێك، پاشان دۆزەخمان بۆ ساز داوە دەچێتە نێوی بەلۆمەکراوی و دەرکراوی لە میهرەبانی خوا**

واتە: عوقبەی کوڕی موسلیم دەگێڕێتەوە شوفەیەی (ئەصبەحی) بۆی باس کرد: ئەو چووە نێو مزگەوتی مەدینە، تەماشای کرد خەڵکەکە دەوری پیاوێکیان داوە وتی: ئەوە کێیە؟ وتیان ئەبو هورەیرەیە ﷺ، (وتی): لێی نزیك بوومەوە هەتا لەبەردەمیدا دانیشتم، ئەویش قسەی دەکرد بۆ خەڵکەکە، کاتێ بێدەنگ بوو، وە دەوری چۆڵ بوو، وتم: سوێندت دەدەم بە خوا ئەگەر فەرموودەیەکم بۆ باس بکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرتگرتبێ و فێری بووبیت، ئەبو هورەیرە وتی: باشە، فەرموودەیەکت بۆ باس دەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردم وەرمگرت و فێری بووم، پاشان ئەبو هورەیرە بێهۆش بوو ماوەیەکی کەم مایەوە، پاشان هاتەوە هۆشی خۆی، وتی: فەرموودەیەکت بۆ باس دەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردم، من و ئەو لەو ماڵەدا بووین کەس لەگەڵماندا نەبوو جگە لە من و ئەو، پاشان ئەبو هورەیرە جارێکی دیکە بێهۆش کەوت بەهەمان شیوە ماوەیەك مایەوە، پاشان هاتەوە هۆشی خۆی ڕوخساری خۆی سڕی، وتی: باشە فەرموودەیەکت بۆ باس دەکەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە، من و ئەویش لەم ماڵەدا بووین کەسی لەگەڵدا نەبوو جگە لە من و خۆی، پاشان جارێکی

---

(١) صحيح.

دیکە بەسەختی بێهۆش کەوت بەلادا کەوت بەسەر ڕوخساریدا ماوەیەکی درێژ پاڵی بەمنەوە دا، پاشان هاتەوە هۆشی خۆی، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردم: کاتێ ڕۆژی دوایی دێت خوا دادەبەزێ بۆ سەر بەندەکان بۆ ئەوەی دادوەری لە نێوانیاندا بکات، هەموو ئوممەتەکان بەچۆکدا هاتوون، یەکەم کەسێك بانگ دەکرێت پیاوێکە قورئانی لەبەر کردووە، وە پیاوێك لەپێناوی خوا جەنگاوە، وە پیاوێك ماڵ و سامانێکی زۆری هەبووە، خوا بە قورئانخوێنەکە دەفەرمووێ: ئایا فێرم نەکردی ئەوەی دامبەزاند بۆ پێغەمبەرەکەم؟ دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، دەفەرمووێ: چۆن کارت کرد بەوەی فێرم کردی؟ دەڵێ: من بەدرێژایی شەو و ڕۆژ کارم پێ دەکرد، دەڵێ: خوای گەورە پێی دەفەرمووێ: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد، خوا دەفەرمووێ: بەڵکوو ویستت پێت بوترێ فلانە کەس قورئانخوێنە، بێگومان ئەوەت پێ وترا. ئینجا کەسێکی خاوەن سەروەت و سامان دەهێنن خوا پێی دەفەرمووێ: ئایا ئەوەندە ماڵ و داراییم پێ نەدایت هەتا پێویستیت بە خەڵکی نەبێت؟ دەڵێ: بەڵێ، پێت دام، دەفەرمووێ: ئەی چیت کرد بەو ماڵ و سامانەی پێم بەخشیت؟ دەڵێ: من پەیوەندی خزمایەتیم پێی بەجێ دەهێنا و لێم دەبەخشی، خوا پێی دەفەرمووێ: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد، خوا دەفەرمووێ: بەڵکوو لەبەر ئەوە بەخشیوتە هەتا پێت بڵێن پیاوێکی بەخشندە و سەخی بوو، بێگومان پێت وترا، ئینجا ئەو کەسە دەهێنن کە لەپێناوی خوادا کوژراوە، پێی دەوترێ: بۆچی کوژرای، دەڵێ: فەرمانم پێ کراوە جیهاد بکەم لەپێناوی تۆدا، منیش شەڕم کرد هەتا کوژرام، خوا پێی دەفەرموێ: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد، خوا دەفەرمووێ: بەڵکوو ویستت بڵێن فلانە کەس بوێرە، بێگومان ئەوەت پێ وترا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دای بەسەر ئەژنۆمدا فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەو سێ کۆمەڵە یەکەمی دروستکراوەکانی خوان ئاگریان پێ هەڵدەگیرسێ لە ڕۆژی دواییدا.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الصَّدَقَاتِ وَالْمُحَبَّسَاتِ

### بَابُ ذِكْرِ أَوَّلِ صَدَقَةٍ مُحَبَّسَةٍ تُصُدِّقَ بِهَا فِي الْإِسْلَامِ، وَاشْتِرَاطِ الْمُتَصَدِّقِ صَدَقَةَ الْمُحَرَّمَةِ حَبْسَ أُصُولِ الصَّدَقَةِ وَالْمَنْعِ مِنْ بَيْعِ رِقَابِهَا وَهِبَتِهَا وَتَوْرِيثِهَا، وَتَسْبِيلِ مَنَافِعِهَا وَغَلَّاتِهَا عَلَى الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى وَالرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ وَالضَّعِيفِ

**٢٤٨٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ عُمَرَ أَصَابَ أَرْضًا بِخَيْبَرٍ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ لِيَسْتَأْمِرَ فِيهَا قَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرٍ لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ بِهِ قَالَ: إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا، قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ أَنْ لَا تُبَاعَ أُصُولُهَا، لَا تُبَاعُ وَلَا تُوهَبُ، وَلَا تُوَرَّثُ، فَتَصَدَّقَ بِهَا عَلَى الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى وَالرِّقَابِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَالضَّعِيفِ لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ أَوْ يُطْعِمُ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهَا[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَرَوَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ الْعُمَرِيُّ أَنَّ نَافِعًا حَدَّثَهُمْ قَالَ: سَمِعْتُ ابْن عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: أَوَّلُ صَدَقَةٍ تُصُدِّقَ بِهَا فِي الْإِسْلَامِ صَدَقَةُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، وَأَنَّ عُمَرَ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ لِي مَالًا وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «احْبِسْ أَصْلَهُ وَسَبِّلْ ثَمَرَهُ».

## کۆباسی بەخشینەکان و وەقفەکان

### باسی یەکەم بەخشینی وەقفکراو کە لە ئیسلامدا بەخشرا، وە مەرجدانانی بەخشەر لەسەر ئەوەی پارێزگاری لە خود و بنچینەی وەقفکراوەکە بکرێت، وە ڕێگریکردن لە فرۆشتنی و بەخشینەوەی، وە دابەشکردنی بەرهەمەکەی بەسەر هەژاران و خزمە نزیکەکان و کۆیلەکان و ئەوانەی لەپێناوی خوادا جیهاد دەکەن و ڕێبواران و لاوازەکان

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، عومەر لە خەیبەر زەوییەکی بەرکەوت هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی پرسی پێ بکات وتی: من زەوییەکم بەرکەوتووە لە خەیبەر، هەرگیز ماڵێکم بەرنەکەوتووە لەوە بەنرختر بێت لەلام، فەرمانم پێ دەکەی چی لێ بکەم؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بنچینەکەی دەهێڵیتەوە و بەرهەمەکەیشی

---

(١) صحيح.

دەکەی بە خێر، وتی: عومەر زەوییەکەی بەخشی بە هەژاران و خزمە نزیکەکانی و کۆیلەکان و ئەوانەی جیهاد دەکەن لەپێناوی خوادا و ڕێبوار و کەسانی لاواز و بێتوانا، بە مەرجێك بنچینەی زەوییەکە نەفرۆشرێ و نەکرێ بە میرات، وە ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات گوناهی ناگات بە ئەندازەی پێویستی خۆی لێی بخوات یاخود لێی بدات بە هاوڕێیەکی بە ئەندازەی پێویستی، نەك بۆ خۆی لێی جیا بکاتەوە (بەڵکوو لێی بخوات و بەشێوەیەکی چاك بەبێ ستەمکردن).

ئەبو بەکر دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەری عەمری گێڕاویەتەوە نافیع بۆی باس کردن وتی: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو دەیوت: یەکەمین بەخشین لە ئیسلامدا بەخشرا بەخشینەکەی عومەری کوڕی خەتاب بوو، جا عومەر بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: من زەوییەکم هەیە دەمەوێ بیبەخشم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زەوییەکە بکە بە وەقف و بەرهەمەکەی لەپێناوی خوادا ببەخشە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْحَبْسِ عَلَى مَنْ لَا يُحْصَوْنَ لِكَثْرَةِ الْعَدَدِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَبْسَ إِذَا كَانَ عَلَى قَوْمٍ لَا يُحْصَوْنَ عَدَدًا لِكَثْرَتِهِمْ جَائِزٌ أَنْ تُعْطَى مَنَافِعُ تِلْكَ الصَّدَقَةِ بَعْضَ أَهْلِ تِلْكَ الصِّفَةِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْوَصِيَّةَ إِذَا أُوصِيَ بِهَا لِقَوْمٍ لَا يُحْصَوْنَ لِكَثْرَةِ عَدَدِهِمْ أَنَّ الْوَصِيَّةَ بَاطِلَةٌ غَيْرُ جَائِزَةٍ عَلَى اتِّفَاقِهِمْ مَعَنَا أَنَّهُ إِذَا أَوْصَى لِلْمَسَاكِينِ وَالْفُقَرَاءِ بِثُلُثِهِ أَوْ بِبَعْضِ ثُلُثِهِ أَنَّ الْوَصِيَّةَ جَائِزَةٌ وَلَوْ أَعْطَى وَصِيَّةً بَعْضَ الْفُقَرَاءِ أَوْ بَعْضَ الْمَسَاكِينِ أَوْ جَمِيعَ الْمَسَاكِينِ وَجَمِيعَ الْفُقَرَاءِ لَا يُحْصَوْنَ كَثْرَةً

**٢٤٨٤-** عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ بِتَمَامِهِ. لَمْ يَذْكُرِ الصَّنْعَانِيُّ ابْنَ السَّبِيلِ، وَقَالَ: غَيْرُ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. وَقَالَ: فَقَالَ مُحَمَّدٌ: غَيْرُ مُتَأَثِّلٍ[١].

**باسی ڕێگەدان بە وەقفکردنی ماڵ و سامان لەسەر ئەوانەی لەبەر زۆری ژمارەیان ناژمێردرێن، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی وەقفکردن ئەگەر لەسەر خەڵکێك کرا لە ژماردن نەدەهاتن لەبەر زۆری ژمارەیان دروستە سوود و قازانجی ئەو بەخشینە بدرێ بە هەندێ لەوکەسانەی ئەو سیفەتەیان**

---

(١) صحيح.

**هەڵگرتووە، دژی وتەی ئەو كەسەی پێی وایە وەسیەتكردن ئەگەر وەسیەتی پێ بكرێ بە خەڵكێك لەبەر زۆری ژمارەیان ناژمێردرێن ئەوە وەسیەتەكە پووچە و دروست نییە، بەڵام یەكدەنگن لەگەڵمان ئەگەر وەسیەتی كرد بۆ نەداران و هەژاران بە سێیەكی یان هەندێ لە سێیەك ئەوە وەسیەتەكە دروستە، ئەگەرچی بەشی هەندێ لە هەژاران یان هەندێ لە نەداران یان هەموو نەداران و هەموو هەژاران لە ژمارە نەدەهاتن**

واتە: ئیبنو عەون دەگێڕێتەوە، دواتر فەرموودەكەیان بەتەواوی باس كرد. صەنعانی باسی (ابْنَ السَّبِيلِ) ڕێبواری نەكرد، وە وتی: (غَيْرُ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ) واتە: نەك بۆ نەفسی خۆی لێی جیا بكاتەوە (بەڵكوو لێی بخوات و بەچاكە). وە وتی: موحەممەد (كە یەكێكە لە گێڕەرەوەكانی ئەم فەرموودە) وتی: (غَيْرُ مُتَأَثِّلٍ)، واتە: خودی ماڵەكە بۆ نەفسی خۆی كۆ نەكاتەوە.

## بَابُ إِجَازَةِ الْحَبْسِ عَلَى قَوْمٍ مَوْهُومِينَ غَيْرِ مُسَمَّيْنَ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي الضَّيْفِ مِنْ غَيْرِ اشْتِرَاطِ حِصَّةِ سَبِيلِ اللَّهِ، وَحِصَّةِ الرِّقَابِ، وَحِصَّةِ الضَّيْفِ مِنْهَا، وَإِبَاحَةِ اشْتِرَاطِ الْمُحْبِسِ لِلْقَيِّمِ بِهَا الْأَكْلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ مِنْ غَيْرِ تَوْقِيتِ طَعَامٍ بِكَيْلٍ مَعْلُومٍ أَوْ وَزْنٍ مَعْلُومٍ، وَاشْتِرَاطِهِ إِطْعَامَ صَدِيقِهِ إِنْ كَانَ لَهُ، مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ قَدْرِ مَا يُطْعِمُ الصَّدِيقَ مِنْهَا

**٢٤٨٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِتَمَامِهِ، وَقَالَ: «فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ أَنْ لَا يُبَاعَ أَصْلُهَا، لَا تُبَاعُ، وَلَا تُوهَبُ، وَلَا يُوَرَّثُ، لِلْفُقَرَاءِ وَالْأَقْوِيَاءِ، وَالرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالضَّيْفِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ»[1].

**باسی وەقفكردن دروستە بۆ خەڵكانێك پشكیان دیاری نەكرابێت و ناویان نەهێنرابێت، (وەك لە فەرموودەكەدا هاتووە): وە لە ئەوانەی لە ڕێی خوا كۆشش دەكەن، ئەوانەشی كۆیلەن، ئەوانەشی میوانن، بەبێ مەرجی دیاریكردنی پشكی لە ڕێی خوا، پشكی كۆیلەكان و پشكی میوانەكان تیایدا، وە ڕێگە دراوە بە وەقفكەر مەرج دابنێت بۆ ئەو كەسەی سەرپەرشتی دەكات،**

---

(١) صحیح.

**لێی بخوات بەبێ زیادەڕەوی و بەبێ دیاریکردنی ڕێژەی خواردنەکە بە پێوانەی دیاریکراو، یان بە کێشانەی دیاریکراو، وە مەرج دابنێت سەرپەرشتیار بۆی هەیە خواردن بدات بە هاوڕێیەکەی بەبێ زیادەڕەوی بەبێ باسکردنی ئەندازەی ئەوەی هاوڕێیەکەی لێی دەخوات**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: عومەر زەوییەکی بەرکەوت لە زەوییەکانی خەیبەر، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، -دواتر فەرموودەکەی بەتەواوی باس کرد- وە وتی: عومەر زەوییەکەی بەخشی بە مەرجێ بنچینەکەی نەفرۆشرێ و نەبەخشرێ و نەکرێ بە میرات، بەڵکوو بۆ هەژاران و بەهێزەکان و کۆیلەکان و ئەوانەی لە ڕێی خوا جیهاد ئەکەن و میوان و کاروانی، گوناهیش نییە لەسەر ئەو کەسەی سەرپەرشتی دەکات لێی بخوات بەشێوەیەکی چاك بەپێی پێویستی، یاخود بیدات بە هاوڕێیەکی، نەك بۆ نەفسی خۆی لێی جیا بکاتەوە (بەڵکوو لێی بخوات بەچاکە).

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ: تَصَدَّقْ بِهَا عَلَى الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى، إِنَّمَا أَرَادَ: تَصَدَّقْ بِأَصْلِهَا حَبْسًا، وَجَعْلَ ثَمَرِهَا مُسَبَّلَةً عَلَى مَنْ وَصَفَهُمْ مِنَ الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى، وَمَنْ ذُكِرَ مَعَهُمْ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَبْسَ إِذَا لَمْ يُخْرِجْهُ الْمُحْبِسُ مِنْ يَدِهِ كَانَ صَحِيحًا جَائِزًا، إِذْ لَوْ كَانَ الْحَبْسُ لَا يَصِحُّ إِلَّا بِأَنْ يُخْرِجَهُ الْمُحْبِسُ مِنْ يَدِهِ لَكَانَ الْمُصْطَفَى ﷺ يَأْمُرُ عُمَرَ لَمَّا أَمَرَ بِهَذِهِ الصَّدَقَةِ أَنْ يُخْرِجَهَا مِنْ يَدِهِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ فِي خَبَرِ يَزِيدِ بْنِ زُرَيْعٍ أَنْ يُمْسِكَ أَصْلَهَا، فَقَالَ: إِنْ شِئْتَ أَمْسِكْ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْ بِهَا. وَلَوْ كَانَ الْحَبْسُ لَا يَتِمُّ إِلَّا بِأَنْ يُخْرِجَهُ الْمُحْبِسُ مِنْ يَدِهِ لَمَا أَمَرَ الْمُصْطَفَى ﷺ الْفَارُوقَ بِإِمْسَاكِ أَصْلِهَا**

**٢٤٨٦**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ عُمَرَ أَسْتَأْمَرَ النَّبِيَّ ﷺ فِي صَدَقَتِهِ، فَقَالَ: «احْبِسْ أَصْلَهَا، وَسَبِّلْ ثَمَرَتَهَا»، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَحَبَسَهَا عُمَرُ عَلَى السَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَفِي الرِّقَابِ وَالْمَسَاكِينِ، وَجَعَلَ مِنْهَا يَأْكُلُ وَيُؤَكِّلُ غَيْرَ مُمَاثِلٍ مَالًا[(١)].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (تَصَدَّقْ بِهَا عَلَى الْفُقَرَاءِ وَالْقُرْبَى)، واتە: زەوییەکە بکە بە خێر و صەدەقە بەسەر هەژاران و خزمە نزیکەکاندا، مەبەستی ئەوەیە خودی زەوییەکە بکە وەقف، وە**

---

(١) صحيح.

**بەروبوومەکەشی دابنێ بۆ هەژاران و خزمە نزیکەکان و ئەوەشی لەگەڵ ئەوان ناوی هێنراوە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی وەقف ئەگەر خاوەنەکەی لەژێر دەستی خۆی دەرینەکات ئەوە دروستە، چونکە ئەگەر وەقف دروست نەبووایە تا خاوەنەکەی لەژێر دەستی خۆی دەرینەکات ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بە عومەر -کاتێ فەرمانی کرد بە زەوییەکەی- لەژێر دەستی خۆی دەریبکات، بەڵام لە فەرموودەکەی یەزیدی کوڕی زورەیعدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەست بگرێ بە بنچینە و خودی زەوییەکە، فەرمووی: (إِنْ شِئْتَ أَمْسِكْ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْ بِهَا)، واتە: ئەگەر ویستت دەست بە زەوییەکەتەوە بگرە و بەخشینی پێوە بکە، جا ئەگەر وەقف دانەمەزرابایە بەوە نەبێت وەقفکەر ماڵەکەی لەژێر دەستی خۆی دەربکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەدەکرد بە عومەر دەست بگرێ بە خودی زەوییەکەیەوە**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەر داوای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ بکات بە بەخشینی زەوییەکەی ( کە لە (ثَمْغ) بوو، لە مەدینە)، فەرمووی: زەوییەکە بکە بە وەقف و بەرهەمەکەی لەپێناوی خوادا ببەخشە، عەبدوڵا وتی: عومەر وەقفی کرد بۆ هەژاری داواکەر و داوانەکەر و ڕێبوار و ئەوانەیشی جیهاد دەکەن لەپێناو خوادا، بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و نەدارەکان، وە ئەو کەسەیشی کە بەخێوی دەکات لێی بخوات و بەشی کەسانیدیکەش بدات، بەبێ ئەوەی وەکوو ماڵی خۆی تەماشای بکات.

## بَابُ إِبَاحَةِ حَبْسِ آبَارِ الْمِيَاهِ

**٢٤٨٧-** عَنِ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ، فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلًا فِي قَتْلِ عُثْمَانَ، وَقَالَ: فَإِذَا عَلِيٌّ، وَالزُّبَيْرُ، وَطَلْحَةُ، وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، وَأَنَا كَذَلِكَ إِذْ جَاءَ عُثْمَانُ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ يَبْتَاعُ بِئْرَ رُومَةَ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ»، فَابْتَعْتُهَا بِكَذَا وَكَذَا وَأَتَيْتُهُ، فَقُلْتُ: قَدِ ابْتَعْتُهَا بِكَذَا قَالَ: «اجْعَلْهَا سِقَايَةً لِلْمُسْلِمِينَ»، وَأَجْرُهَا لَكَ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ[١].

## باسی ڕێگەدان بە وەقفکردنی بیرە ئاوەکان

واتە: ئەحنەفی کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەیەکی کرد دەربارەی کوشتنی عوسمان، وتی: عەلی و زوبەیر و تەڵحە و سەعدی کوڕی ئەبو

---

(١) إسناده حسن لغيره.

وەقاص ﷺ ئامادە بوون، هەروەها منیش، لەپڕ عوسمانی کوڕی عەفان هات، وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە ئەو، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ بیری (رُومَةَ) بکڕێ ئەوە خوا ﷻ لێی خۆش دەبێت؟، منیش بە ئەوەندە و بە ئەوەندە کڕیم، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتم: بە ئەوەندە کڕیم، فەرمووی: بیکە بە موڵکی مسوڵمانان بۆ ئاو لێخواردنەوە و پاداشتەکەیشی بۆ تۆیە، وتیان: شاهیدی دەدەین بەڵێ وا بوو.

## بَابُ الْوَصِيَّةِ بِالْحَبْسِ مِنَ الضِّيَاعِ وَالْأَرَضِينَ

**٢٤٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تُقَسَّمُ وَرَثَتِي شَيْئًا مِمَّا تَرَكْتُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ»، وَكَانَتْ هَذِهِ الصَّدَقَةُ بِيَدِ عَلِيٍّ غَلَبَ عَلَيْهَا عَبَّاسًا وَطَالَتْ فِيهَا خُصُومَتُهَا فَأَبَى عُمَرُ أَنْ يَقْسِمَهَا بَيْنَهُمَا حَتَّى أَعْرَضَ عَنْهَا عَبَّاسٌ غَلَبَهُ عَلَيْهَا عَلِيٌّ، ثُمَّ كَانَتْ عَلَى يَدِ حَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، ثُمَّ بِيَدِ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ، ثُمَّ بِيَدِ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، وَحَسَنِ بْنِ حُسَيْنٍ، فَكَانَا يَتَدَاوَلَانِهَا، ثُمَّ بِيَدِ زَيْدِ بْنِ حَسَنٍ، وَهِيَ صَدَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَقًّا[1].

## باسی وەسیەتکردن بە وەقفکردنی باخ و باخات و زەوی و زار

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەوەی بەجێم هێشتووە لە میراتی دابەش ناکرێت، ئەوەی بەجێمان هێشتووە صەدەقەیە، جا ئەو صەدەقەیە، بەدەستی عەلییەوە بوو زاڵ بوو بەسەر عەباسدا، ناکۆکی نێوانیان درێژەی خایاند، دواتر عومەر ڕازی نەبوو دابەشی بکات لە نێوانیاندا هەتا عەباس پشتی تێ کرد و کەوتە دەستی عەلی، پاشان لە دەستی حەسەنی کوڕی عەلیدا بوو، پاشان لە دەستی حوسەینی کوڕی عەلیدا بوو، پاشان لە دەستی عەلی کوڕی حوسێن و حەسەنی کوڕی حوسەیندا بوو، جا دەستاودەستیان پێ دەکرد، پاشان کەوتە دەستی زەیدی کوڕی حەسەن، ئەوە صەدەقەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

---

(١) صحيح.

**٢٤٨٩-** عَنْ جُوَيْرِيَةَ ﷺ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ مَوْتِهِ دِينَارًا، وَلَا دِرْهَمًا، وَلَا عَبْدًا وَلَا أَمَةً إِلَّا بَغْلَتَهُ وَسِلَاحَهُ وَأَرْضًا تَرَكَهَا صَدَقَةً[1].

واتە: جوەیرییە ﷺ دەڵێ: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی مردنیدا نە دینارێك و نە درهەمێك و نە کۆیلەیەك و نە کەنیزەکێکی بەجێ نەهێشت، جگە لە ئێسترەکەی (کە سواری دەبوو)، هەروەها چەکەکەی، وە زەوییەکیشی هەبوو لەپێناوی خوادا کردی بە صەدەقە.

## بَابُ فَضَائِلِ بِنَاءِ السُّوقِ لِأَبْنَاءِ السَّابِلَةِ، وَحَفْرِ الْأَنْهَارِ لِلشَّارِبِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ فِي خَبَرِ الْعَلَاءِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَخَبَرِ أَبِي قَتَادَةَ فِي قَوْلِهِ: أَنَّ صَدَقَةً، قَدْ جَرَتْ تِلْكَ اللَّفْظَةُ بِنَاءَ الْمَسَاجِدِ، وَبِنَاءَ الْبُيُوتِ لِلسَّابِلَةِ، وَحَفْرَ الْأَنْهَارِ لِلشَّارِبَةِ أَنَّ كُلَّ مَا يَنْتَفِعُ بِهِ الْمُسْلِمُونَ مِمَّا يَفْعَلُهُ الْمَرْءُ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ الصَّدَقَةِ

**٢٤٩٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنُ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْمًا عَلِمَهُ وَنَشَرَهُ، أَوْ وَلَدًا صَالِحًا تَرَكَهُ، أَوْ مَسْجِدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لِابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهَرًا كَرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِهِ فِي صِحَّتِهِ وَحَيَاتِهِ، تَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ»[2].

## باسی چاکەکانی دروستکردنی خانوو بۆ ڕێبوار، وە هەڵکەندنی بیر بۆ خواردنەوە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی وتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە لە فەرموودەکەی عەلا و، لە باوکی، لە ئەبو هورەیرە، وە فەرموودەکەی ئەبو قەتادە لە وتەکەی پێغەمبەر ﷺ: (أَنَّ صَدَقَةً) ئەو دەستەواژەیە هاتووە دەربارەی دروستکردنی مزگەوت و دروستکردنی خانوو بۆ ڕێبوارەکان و هەڵکەندنی بیرەکان بۆ ئاوخواردنەوە، هەر شتێك مسوڵمانان سوودی لێ وەربگرن لەوەی بەندە ئەنجامی بدات، ناوی صەدەقەی بەسەردا دەسەپێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەوەی لەدوای مردن دەگات بە بڕوادار لە کردەوە و چاکەکانی زانستەکەیەتی کردەوەی پێ کردبێت و

---

(١) صحيح.

(٢) حسن بشواهده.

بڵاوی کردبێتەوە، یان منداڵێکی چاکی بەجێ هێشتبێ، یان مزگەوتێکی بونیاد نابێت، یان ماڵێکی بۆ ڕێبوار دروست کردبێت، یان بیرێکی هەڵکەندبێت، یان شتێکی لە ماڵ و سامانەکەی بەخشیبێت لە کاتی لەشساغی ژیانیدا، دوای مردن پێی دەگات.

## بَابُ حَبْسِ آبَارِ الْمِيَاهِ عَلَى الْأَغْنِيَاءِ وَالْفُقَرَاءِ وَابْنِ السَّبِيلِ

**٢٤٩١-** عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ قَالَ: لَمَّا حُصِرَ عُثْمَانُ ﷺ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ مِنْ فَوْقِ دَارِهِ، ثُمَّ قَالَ: أُذَكِّرُكُمْ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رُومَةَ لَمْ يَكُنْ يَشْرَبُ مِنْهَا أَحَدٌ إِلَّا بِثَمَنٍ فَابْتَعْتُهَا مِنْ مَالِي فَجَعَلْتُهَا لِلْغَنِيِّ وَالْفَقِيرِ وَابْنِ السَّبِيلِ؟ قَالُوا: نَعَمْ[١].

## باسی وەقفکردنی ئاوی بیرەکان لەسەر دەوڵەمەند و هەژاران و ڕێبواران

واتە: ئەبو عەبدوڕەحمانی سوللەمی دەڵێ: کاتێ عوسمان ﷺ گەمارۆ درا (لەلایەن خەواریج و هاوئاوازەکانیان) لە سەربانەکەیەوە تێیانی ڕوانی، پاشان وتی: یادتان دەخەمەوە ئایا دەزانن بیری (رُومَةَ) کەس نەیدەتوانی ئاوی لێ بخواتەوە بە نرخێك نەبێت، من بە ماڵ و سامانی خۆم کڕیم سازم کرد بۆ دەوڵەمەند و هەژار و ڕێبوار؟ وتیان: بەڵێ وا بوو.

## بَابُ إِبَاحَةِ شُرْبِ الْمُحْبِسِ مِنْ مَاءِ الْآبَارِ الَّتِي حَبَسَهَا

**٢٤٩٢-** عَنِ الْقُشَيْرِيُّ قَالَ: شَهِدْتُ الدَّارَ يَوْمَ أُصِيبَ عُثْمَانُ ﷺ، وَأَشْرَفَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ أَنْشُدُكُمُ اللَّهَ وَالْإِسْلَامَ هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ بِهَا بِئْرٌ مُسْتَعْذَبٌ إِلَّا رُومَةُ؟ فَقَالَ: «مَنْ يَشْتَرِي رُومَةَ؟» فَيَجْعَلُ دَلْوَهُ فِيهَا كَدِلَاءِ الْمُسْلِمِينَ بِخَيْرٍ لَهُ مِنْهَا فِي الْجَنَّةِ، قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ قَالَ: «فَاشْتَرَيْتُهَا مِنْ خَالِصِ مَالِي وَأَنْتُمْ تَمْنَعُونِي أَنْ أَفْطَرَ عَلَيْهَا حَتَّى أَفْطَرَ عَلَى مَاءِ الْبَحْرِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

باسی ڕێگە دراوە بە ئەو کەسەی بیرە ئاوی وقف کردووە خۆی لێی بخواتەوە

واتە: قوشەیری دەڵێ: ئەو ڕۆژەی عوسمان ﷺ شەهید کرا من ئامادە بووم، چووە شوێنێکی بەرز، وتی: ئەی خەڵکینە سوێندتان دەدەم بە خوا و پرسیارتان لێ دەکەم بە حەقی ئیسلام کە لەئەستۆتانە، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە و هیچ بیرێکی تێدا نەبوو ئاوەکەی شیرین بێت جگە لە بیری ڕومە نەبێت؟ فەرمووی: کێ بیری ڕومە دەکڕێ؟ سەتڵەکەی ئەویش وەکوو سەتڵی مسوڵمانان بێت ئەوە لەوە چاکتری بۆ دەبێت لە بەهەشتدا، وتیان: بەڵێ وایە، وتی: بەماڵی خۆم کڕیم، ئێوەیش ئێستا ڕێگریم لێ دەکەن ڕۆژووی پێ بشکێنم، تا بە ئاوی دەریا ڕۆژووی شکاند.

**٢٤٩٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ مَوْلَى أَبِي أُسَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: أَشْرَفَ عَلَيْهِ يَعْنِي عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ، هَلْ عَلِمْتُمْ أَنِّي اشْتَرَيْتُ رُومَةَ مِنْ مَالِي يُسْتَعْذَبُ مِنْهَا، وَجَعَلْتُ رِشَايَ فِيهَا كَرِشَايِ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ قَالَ: فَعَلَامَ تَمْنَعُونِي أَشْرَبُ مِنْهَا حَتَّى أُفْطِرَ عَلَى مَاءِ الْبَحْرِ[1].

واتە: ئەبو سەعید مەولای ئەبو ئوسەیدی ئەنصاری، دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ چووە شوێنێکی بەرز، وتی: سویندتان دەدەم بە خوا، ئایا زانیوتانە من بیری ڕومەم کڕی لە ماڵ و سامانی خۆم بۆ ئەوەی لە ئاوە سازگارەکەی بخورێتەوە، پشکی خۆمیشم وەکوو پشکی پیاوێك لە مسوڵمانان دانا، وتیان: بەڵێ، وتی: ئیتر لەبەرچی ڕێگریم لێ دەکەن لێی بخۆمەوە تا بە ئاوی دەریا ڕۆژوو بشکێنم.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَجْرَ الصَّدَقَةِ الْمُحَبَّسَةِ يُكْتَبُ لِلْمُحَبِّسِ بَعْدَ مَوْتِهِ مَا دَامَتِ الصَّدَقَةُ جَارِيَةً

**٢٤٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عَمَلٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پاداشتی بەخشینی وەقفکراو بۆ وەقفکەر دەنووسرێ تا بەخشینەکە بەردەوام سوودی هەبێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مرۆڤ مرد کردەوەکانی دەپچڕێ جگە لە سێ کردەوە نەبێ: خێرێکی بەردەوام، زانستێك سوودی لێ ببینرێ، یان منداڵێکی چاك نزای بۆ بکات.

**٢٤٩٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «خَيْرُ مَا يَخْلُفُ الْمَرْءُ بَعْدَهُ ثَلَاثًا: وَلَدًا صَالِحًا يَدْعُو لَهُ فَيَبْلُغُهُ دُعَاؤُهُ، أَوْ صَدَقَةً تَجْرِي فَيَبْلُغُهُ أَجْرُهَا، أَوْ عِلْمًا يُعْمَلُ بِهِ بَعْدَهُ»[١].

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چاکترین شت بەندە دوای خۆی بەجێی بهێڵێ سێ شتە: منداڵێکی چاك بۆی بپاڕێتەوە، پاڕانەوەکەی پێی دەگات، یان بەخشینێك سوودی بەردەوام بێت، پاداشتەکەی پێی دەگات، یان زانستێك دوای ئەو کردەوەی پێ بکرێت.

## بَابُ فَضْلِ سَقْيِ الْمَاءِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ

**٢٤٩٦-** عَنْ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ أَفَأَتَصَدَّقُ عَنْهَا؟ فَقَالَ: «نَعَمْ»، فَقُلْتُ: أَيُّ صَدَقَةٍ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِسْقَاءُ الْمَاءِ»[٢].

## باسی فەزڵی ئاودان ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی دایکم کۆچی دوایی کرد ئایا بۆی ببەخشم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: چی بەخشینێك چاکترینە؟ فەرمووی: ئاودان.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**٢٤٩٧-** وعَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِسْقَاءُ الْمَاءِ»[١].

واتە: سەعدی کوڕی عوبادە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چی بەخشینێك چاکترینە؟ فەرمووی: ئاودان.

## بَابُ الصَّدَقَةِ عَنِ الْمَيِّتِ عَنْ غَيْرِ وَصِيَّةٍ مِنْ مَالِ الْمَيِّتِ، وَتَكْفِيرِ ذُنُوبِ الْمَيِّتِ بِهَا

**٢٤٩٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنَّ أَبِي مَاتَ، وَتَرَكَ مَالًا، وَلَمْ يُوصِ، فَهَلْ يُكَفِّرُ عَنْهُ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهُ، فَقَالَ: «نَعَمْ»[٢].

## باسی بەخشین بۆ مردوو بەو ماڵ و سامانەی دوای خۆی بەجێی هێشتووە، وە ئەو بەخشینە دەبێتە سڕینەوەی گوناهەکانی مردوو

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: بەڕاستی باوکم کۆچی دوایی کرد و ماڵ و سامانێکی بەجێهێشت، وەسیەتی نەکرد، ئایا ئەگەر خێر و بەخشینی بۆ بکەم دەبێتە کەفارەت بۆی، فەرمووی: بەڵێ.

## بَابُ ذِكْرِ كِتَابَةِ الْأَجْرِ لِلْمَيِّتِ عَنْ غَيْرِ وَصِيَّةٍ بِالصَّدَقَةِ عَنْهُ مِنْ مَالِهِ

**٢٤٩٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا وَإِنِّي أَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ أَوْصَتْ بِصَدَقَةٍ فَهَلْ لَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا قَالَ: «نَعَمْ»[٣].

## باسی پاداشتی خێر و بەخشین بۆ مردوو دەنووسرێ لە ماڵ و سامانەکەی، بەبێ ئەوەی وەسیەتی کردبێت

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی دایکم کۆچی دوایی کرد، من گومانم وایە ئەگەر قسەی بکردایە وەسیەتی دەکرد بە بەخشین، ئایا پاداشتی بۆ هەیە ئەگەر من بۆی ببەخشم، فەرمووی: بەڵێ.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ الصَّدَقَةِ عَنِ الْمَيِّتِ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْ غَيْرِ وَصِيَّةٍ، وَانْتِفَاعِ الْمَيِّتِ فِي الْآخِرَةِ بِهَا

**٢٥٠٠-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ بْنِ سَعِيدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ فَحَضَرَتْ أُمَّ سَعْدٍ الْوَفَاةُ، فَقِيلَ لَهَا: أُوصِي، فَقَالَتْ: فِيمَا أُوصِي؟ إِنَّمَا الْمَالُ مَالُ سَعْدٍ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ يَقْدُمَ سَعْدٌ، فَلَمَّا قَدِمَ سَعْدٌ ذُكِرَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ يَنْفَعُهَا أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ سَعْدٌ: حَائِطُ كَذَا وَكَذَا صَدَقَةٌ عَنْهَا، لِحَائِطٍ قَدْ سَمَّاهُ[1].

## باسی بەخشین لە جیاتی مردوو ئەگەر بەبێ وەسیەتکردن مرد، هەروەها سوودی ئەو خێر و بەخشینە دەگات بە مردوو

واتە: سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی شورەحبیلی کوڕی سەعیدی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە، لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ، ئەو وتی: سەعدی کوڕی عوبادە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لە یەکێك لە غەزاکانیدا، دواتر ئوممو سەعد کەوتە سەرەمەرگ، پێی وترا: وەسیەت بکە، وتی: بەچی وەسیەت بکەم؟ ماڵ و سامانەکە تەنها هی سەعدە، دواتر کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی سەعد بگەڕێتەوە، کاتێ سەعد گەڕایەوە ئەوەی بۆ باس کرا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەگەر لەجیاتی ئەو ببەخشم سوودی هەیە بۆی؟ فەرمووی: بەڵێ، سەعد وتی: فڵانە باخ و فڵانە باخم لەجیاتی ئەو بەخشی، ناوی باخەکەی هێناوە.

**٢٥٠١-** عن ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ أَخَا بَنِي سَاعِدَةَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ، وَأَنَا غَائِبٌ، فَهَلْ يَنْفَعُهَا إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا بِشَيْءٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: فَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حَائِطِي الَّذِي بِالْمِخْرَافِ صَدَقَةٌ عَنْهَا[2].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی عوبادە برای نەوەکانی ساعیدە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی دایکم کۆچی دوایی کردووە، لەو کاتەدا منیش لە ماڵ نەبووم، ئایا سوودی پێ دەگەیەنی ئەگەر شتێکی بۆ بکەم بە خێر و صەدەقە؟

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فەرمووی: بەڵێ، وتی: من تۆ دەکەم بە شایەت باخەکەم کە لە (الْمِخْرَافِ) کردم بە خێر و صەدەقە بۆی.

**٢٥٠٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أُمَّهُ تُوُفِّيَتْ أَفَيَنْفَعُهَا إِنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا؟. وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ، وَقَالَ: «فَإِنَّ لِي مَخْرَفًا - يَعْنِي: بُسْتَانًا»[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ وت: بەڕاستی دایکی کۆچی دوایی کردبوو، ئایا سوودی پێ دەگەیەنی ئەگەر شتێکی بۆ بکەم بە خێر و صەدەقە؟ وە ئەحمەدی کوڕی مەنیع (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی دایکم کۆچی دوایی کردووە، وە وتی: من باخچەیەکم هەیە.

## بَابُ إِيجَابِ الْجَنَّةِ بِسَقْيِ الْمَاءِ مَنْ لَا يَجِدُ الْمَاءَ إِلَّا غِبًّا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ: «مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ» مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي قَدْ بَيَّنْتُهُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ أَنَّ هَذَا مِنْ فَضَائِلِ الْقَوْلِ وَالْأَعْمَالِ، لَا أَنَّهُ جَمِيعُ الْإِيمَانِ، إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ الِاسْتِقَاءَ عَلَى بَعِيرِهِ الْمَاءَ، وَسَقْيَهُ مَنْ لَا يَجِدُ الْمَاءَ إِلَّا غِبًّا لَيْسَ بِجَمِيعِ الْإِيمَانِ

**٢٥٠٣-** عَنْ كُدَيْرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ قَالَ: «تَقُولُ الْعَدْلَ وَتُعْطِي الْفَضْلَ» قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنْ لَمْ أَسْتَطِعْ. قَالَ: «فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟» قال: نَعَمْ قَالَ: «فَاعْهَدْ إِلَى بَعِيرٍ مِنْ إِبِلِكَ وَسِقَاءٍ، فَانْظُرْ إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ لَا يَشْرَبُونَ الْمَاءَ إِلَّا غِبًّا؛ فَإِنَّهُ لَا يَعْطَبُ بَعِيرُكَ، وَلَا يَنْخَرِقُ سِقَاؤُكَ حَتَّى تَجِبَ لَكَ الْجَنَّةُ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَسْتُ أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ أَبِي إِسْحَاقَ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ كُدَيْرٍ.

## باسی بەهەشت واجب دەبێت بۆ ئەو کەسەی ئاو دەدات بە خانەوادەیەك زۆر ئاویان پێویستە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ)، لەو شێوازەیە کە لە کتێبی (الْإِيمَانِ)دا

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**ڕوونم کردەوە، ئەوانە لە فەزڵ و چاکەی وتە و کردارەکانە، نەك ئەوە هەموو ئیمان بێت، جونکە هەموو کەس ئەوە دەزانێت ئاودان بە جەوەنە لەسەر وشتر بۆ ئەو خانەوادەی زۆر پێویستییان بە ئاوە بە مانای هەموو ئیمان نایەت**

واتە: کودەیری زەبی ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم پێ نیشان بدە بمخاتە بەهەشتەوە، فەرمووی: قسەی دادپەروەرانە بکە و ماڵ و سامانی چاکت ببەخشە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر نەمتوانی، فەرمووی: ئایا وشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بچۆ بۆ لای وشترێك لە وشترەکانت و جەوەنەیەك ئاو لەگەڵ خۆت ببە، بزانە چی ماڵێك زۆر پێویستییان بە ئاوی خواردنەوەیە، بێگومان بە هەرگیز وشترەکەت ماندوو نابێت و جەوەنەکەت کون نابێت، تا بەهەشتت بۆ واجب دەبێت.

ئەبو بەکر وتی: من زانیاریم نییە ئەبو ئیسحاق ئەم فەرموودەی بیستبێت لە کودەیر.



# كِتَابُ الْمَنَاسِكِ

# پەرتووکی حەج و دروشمەکانی



## كِتَابُ الْمَنَاسِكِ «الْمُخْتَصَرُ مِنَ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُسْنَدِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الشَّرْطِ الَّذِي ذَكَرْنَا فِي أَوَّلِ كِتَابِ الطَّهَارَةِ»

### بَابُ فَرْضِ الْحَجِّ عَلَى مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴿٩٧﴾ ﴾ آل عمران، وَالْبَيَانِ أَنَّ الْحَجَّ عَلَى مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ السَّبِيلَ مِنَ الْإِسْلَامِ

**٢٥٠٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ ﷺ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَحُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حَاجَّيْنِ وَمُعْتَمِرَيْنِ، فَقُلْنَا: لَوْ أَتَيْنَا رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَلَقِينَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ ذَاتُ يَوْمٍ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، وَلَا نَعْرِفُهُ فَدَنَا حَتَّى وَضَعَ رُكْبَتَيْهِ وَوضَعَ يَدَيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِسْلَامِ، مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: «أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتِ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا». قال: صَدَقْتَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى، حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ مُعَاذٍ، حَدَّثَنَا كَهْمَسٌ بِهَذَا الْحَدِيثِ نَحْوِهِ[١].

## پەرتوکی حەج و دروشمەکانی، پوختەیەك لە پوختكراوەی ئەو فەرموودانەی سەنەدیان دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو مەرجەی کە لە سەرەتای پەرتووکەکەدا باسمان کرد

### باسی فەرزبوونی حەجکردنی ماڵی خوا لەسەر ئەو کەسەی توانای گەیشتنی ئەو ماڵەی هەیە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴿٩٧﴾ ﴾، واتە: بۆ خوا هەیە بەسەر ئادەمییەوە حەجکردنی ئەو ماڵە هەر کەسێك کە توانای گەیشتنی هەبێت بۆی. وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی حەجکردن لە ئیسلامدا واجبە لەسەر ئەو کەسەی توانای گەیشتنی هەبێت

واتە: یەحیای کوڕی یەعمەر ﷺ دەڵێ: من و حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەرچووین بە نییەتی حەج و عومرە، وتمان: خۆزگە دەچووین بۆ لای پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، دواتر گەیشتین بە عەبدوڵای کوڕی عومەر، وتی: عومەر

---

(١) صحيح.

بۆی باس کردم وتی: لە کاتێکدا ڕۆژێك ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لەپڕ پیاوێك دەرکەوت جلوبەرگی زۆر سپی بوو، مووەکانی زۆر ڕەش بوون، نەماندەناسی، دواتر نزیك بۆیەوە تا هەردوو ئەژنۆی دانا و هەردوو دەستی خستە سەر هەردوو ڕانی، ئینجا وتی: ئەی موحەممەد هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئیسلام، ئیسلام چییە؟ فەرمووی: شایەتی بدەی بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدەیت و زەکاتی ماڵەکەیشت دەربکەیت و ڕۆژووی ڕەمەزانیش بگری، وە حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر توانای گەیشتنت هەبوو.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الْإِسْلَامِ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ الْأَلِفِ وَاللَّامِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ شُعَبِ الْإِسْلَامِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَجَابَ جِبْرِيلَ فِي الْخَبَرِ الَّذِي ذَكَرْنَا عَنْ أَصْلِ الْإِسْلَامِ وَأَسَاسِهِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَعْلَمَ أَنَّ الْإِسْلَامَ بُنِيَ عَلَى هَذِهِ الْخَمْسِ، وَمَا بُنِيَ مِنَ الْإِسْلَامِ عَلَى هَذِهِ الْخَمْسِ سِوَى هَذِهِ الْخَمْسِ، إِذِ الْبِنَاءُ عَلَى الْأَسَاسِ سِوَى الْأَسَاسِ، وَقَدْ أَوْقَعَ النَّبِيُّ ﷺ اسْمَ الْإِسْلَامِ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَلِفِ وَاللَّامِ عَلَى أَجْزَاءِ الْإِسْلَامِ الَّتِي هِيَ سِوَى هَذِهِ الْخَمْسِ الَّتِي أَعْلَمَ فِي إِجَابَتِهِ جِبْرِيلَ أَنَّهَا الْإِسْلَامُ»**

**٢٥٠٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْإِسْلَامَ بُنِيَ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ناوی ئیسلام بە دەستەواژەی ناسراو (الْأَلِفِ وَاللَّامِ) هەندێ جار بەشێك لە لقەکانی ئیسلامیش دەگرێتەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەیدا کە باسمان کرد وەڵامی جبریلی دایەوە دەربارەی بنەماو بنچینەکانی ئیسلام، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاند ئیسلام لەسەر ئەم پێنجە بونیاد نراوە، وە ئیسلام بونیاد نەنراوە لەسەر جگە لەم پێنج بنچینە نەبێت، بێگومان پێغەمبەر ﷺ ناوی ئیسلامی هێناوە بە دەستەواژەی ناسراو بە (الْأَلِفِ وَاللَّامِ) لەسەر بەشەکانی ئیسلام**

---

(١) صحيح.

### کە ئەو بەشانە جگە لەو پێنج بەشەن کە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی جبریل ڕایگەیاند ئەوانە لە ئیسلامن

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج پایە بونیاد نراوە، شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە بەجێهێنانی نوێژ و دەرکردنی زەکات و حەجکردنی ماڵی خوا و ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان.

### بَابُ الْأَمْرِ بِتَعْجِيلِ الْحَجِّ خَوْفَ فَوْتِهِ بِرَفْعِ الْكَعْبَةِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَعْلَمَ أَنَّهَا تُرْفَعُ بَعْدَ هَدْمٍ مَرَّتَيْنِ

**٢٥٠٦**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَمْتِعُوا مِنْ هَذَا الْبَيْتِ؛ فَإِنَّهُ قَدْ هُدِمَ مَرَّتَيْنِ وَيُرْفَعُ فِي الثَّالِثِ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ: يُرْفَعُ فِي الثَّالِثِ، يُرِيدُ بَعْدَ الثَّالِثَةِ، إِذْ رَفْعُ مَا قَدْ هُدِمَ مُحَالٌ؛ لِأَنَّ الْبَيْتَ إِذَا هُدِمَ لَا يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ بَيْتٍ إِذَا لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ بِنَاءٌ.

### باسی فەرمانکردن بە زوو ئەنجامدانی حەج لە ترسی لەدەستچوونی بەهۆی بەرزبوونەوەی کەعبە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە دوای ئەوە کە دوو جار ڕوخێنرا بەرز دەکرێتەوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چێژ لەم کەعبەیە وەربگرن، چونکە دوو جار ڕوخێنراوە (بەهۆی لافاوەوە) لە سێیەم جاردا (کابرای حەبەشی کە خاوەن دوو لاقی باریکە دەیڕوخێنێ) فەڕوبەرەکەتی بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان.

ئەبو بەکر دەڵێ: (يُرْفَعُ فِي الثَّالِثِ)، مەبەستی پێی دوای جاری سێیەمە، لە کاتێکدا بەرزکردنەوەی خانوو کە ڕوخێنرابێ ئەستەمە، چونکە خانوو ئەگەر ڕوخێنرا پێی ناوترێ خانوو، بۆیە خانوو نامێنێ تا پێی بوترێ خانوو.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ رَفْعَ الْبَيْتِ يَكُونُ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ بَعْدَ مُدَّةٍ، لَا قَبْلَ خُرُوجِهِمَا إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ يُعْتَمَرُ وَيُحَجُّ الْبَيْتُ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ

٢٥٠٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيُحَجَّنَّ هَذَا الْبَيْتُ، وَلَيُعْتَمَرَنَّ بَعْدَ خُرُوجِ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەرزبوونەوەی ماڵی خوا کەعبەی پیرۆز ماوەیەك لەدوای دەرچوونی یەئجوج و مەئجوجەوە دەبێت، نەك پێش دەرچوونیان، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە دوای دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج عومرە و حەجی ماڵی خوا دەکرێت

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان حەجی ماڵی خوا دەکرێت، هەروەها عومرەیش دەکرێت دوای دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج.

## بَابُ ذِكْرِ بَيَانِ فَرْضِ الْحَجِّ وَأَنَّ الْفَرْضَ حَجَّةٌ وَاحِدَةٌ عَلَى الْمَرْءِ لَا أَكْثَرَ مِنْهَا

٢٥٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّاسَ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ»، فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ حَتَّى أَعَادَهَا ثَلَاثًا، فَقَالَ: «لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ لَوَجَبَتْ، وَلَوْ وَجَبَتْ مَا قُمْتُمْ بِهَا»، وَقَالَ: «ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَمَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ، فَأْتُوهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَانْتَهُوا عَنْهُ » قَالَ: فَأُنْزِلَتْ: ﴿لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴿١٠١﴾﴾ المائدة»[٢].

## باسی ڕوونکردنەوەی فەرزبوونی حەج، بێگومان ئەوەی فەرزە لەسەر بەندە تەنها یەك حەجە نەك زیاتر

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا، فەرمووی: بەڕاستی خوا ﷻ حەجی لەسەرتان فەرز کردووە، پیاوێك وتی: لە هەموو ساڵێکدا

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەی پێغەمبەری خوا؟ بێدەنگ بوو هەتا سێ جار دووبارەی کردەوە، پاشان فەرمووی: ئەگەر بموتایە بەڵێ، ئەوە واجب دەبوو لەسەرتان، ئەگەر واجبیش بووایە، نەتاندەتوانی بەجێی بهێنن، وە فەرمووی: وازم لێ بێنن لەوەی وازم لێ هێناوە بۆتان، چونکە پێش ئێوە لەنێو چوون بەهۆی ئەوەی پرسیاری زۆریان دەکرد و جیاواز بوون لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان، جا ئەگەر فەرمانم پێ کردن بە شتێ هەرچی لە تواناتاندایە لێی وەربگرن، وە ئەگەر شتێکم لێ قەدەغە کردن لێی دوور بکەونەوە، وتی: دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴿١٠١﴾﴾، واتە: پرسیار مەکەن لە شتانێك ئەگەر ئاشکرا بکرێن ناخۆش و خراپ دەبێت بۆتان.

## بَابُ إِبَاحَةِ إِعْطَاءِ الْإِمَامِ إِبِلَ الصَّدَقَةِ مَنْ يَحُجُّ عَلَيْهَا

٢٥٠٩- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَبِي لَاسٍ الْخُزَاعِيِّ قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي كِتَابِ الزَّكَاةِ[١].

## باسی ڕێگە دراوە ئیمام وشتری زەکات بدات بە کەسانێك بۆ ئەوەی حەجی پێ بکەن

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لەوبارەیەوە فەرموودەکەی ئەبو لاسی خوزاعی، لە کتێبی زەکاتدا باسم کرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْحَجِّ عَلَى الدَّوَابِّ الْمُحْبَسَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

٢٥١٠- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أُمِّ مَعْقِلٍ قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي كِتَابِ الصَّدَقَاتِ أَيْضًا[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە حەجکردن لەسەر ئاژەڵی وەقفکراو لەپێناوی خوادا

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لەوبارەیەوە فەرموودەکەی ئوممو مەعقیلم باس کرد لە کتێبی صەدەقات.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ الْحَجِّ إِذِ الْحَاجُّ مِنْ وَفْدِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ

**٢٥١١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَفْدُ اللَّهِ ثَلَاثَةٌ: الْغَازِي وَالْحَاجُّ وَالْمُعْتَمِرُ»[1].

### باسی فەزڵ و گەورەیی حەج، چونکە حەجکەر لە میوانە بەڕێزەکانی خوایە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: میوانە بەڕێزەکانی خوا سیانن: ئەو کەسەی جەنگ و جیهاد دەکات، ئەو کەسەی حەج دەکات، ئەو کەسەی عومرە دەکات.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْمُتَابَعَةِ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، وَالْبَيَانِ أَنَّ الْفِعْلَ قَدْ يُضَافُ إِلَى الْفِعْلِ، لَا أَنَّ الْفِعْلَ يَفْعَلُ فِعْلًا كَمَا ادَّعَى بَعْضُ أَهْلِ الْجَهْلِ

**٢٥١٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا تَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ، وَالذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَيْسَ لِلْحَجَّةِ الْمَبْرُورَةِ ثَوَابٌ دُونَ الْجَنَّةِ»[2].

### باسی فەرمانکردن بە حەج و عومرەکردن بەدوای یەکدا، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی هەندێ جار کردەوە دەدرێتە پاڵ کردەوە، (وەك باسکردنی حەج و عومرە بەدوای یەکدا) نەك بەو مانایەی ئەگەر حەجی کرد دەبێت بەدوایدا عومرەش بکات، وەکوو هەندێ لە نەفامەکان بانگەشەی بۆ دەکات

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەج و عومرە یەکێکیان بەدوای ئەوی دیکەدا بکەن (ئەگەر حەجتان کرد بەدوایدا عومرە بکەن، ئەگەر عومرەشتان کرد بەدوایدا حەج بکەن)، چونکە ئەو دووانە: هەژاری و گوناهەکان دوور دەخەنەوە، وەکوو چۆن ئاگری کوورە (یان ئەو ئامرازەی ئاسنگەر ئاگری

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




پێ گەش دەکات) پیسی ئاسن و زێڕ و زیو دوور دەخاتەوە، حەجی وەرگیراویش پاداشتی نییە جگە لە بەهەشت.

**٢٥١٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرە بۆ عومرە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانی مسوڵمان، وە حەجی وەرگیراویش هیچ پاداشتێکی نییە جگە لە بەهەشت.

## بَابُ فَضْلِ الْحَجِّ الَّذِي لَا رَفَثَ فِيهِ، وَلَا فُسُوقَ فِيهِ، وَتَكْفِيرِ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا بِهِ

**٢٥١٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَجَّ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَأَنَّمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ئەو حەجکردنەی کە قسەی پڕوپووچ و کردەوەی نابەجێی تێدا ناکرێ، وە سڕینەوەی گوناە و تاوانەکان بەهۆیەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺدەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس حەجی ماڵی خوا بکات و گوفتار و ڕەفتاری خراپ نەکات، ئەوە دەگەڕێتەوە وەك ئەو کاتەی لەدایك بووە (واتە: بەبێ گوناە و بەپاکی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە وەکوو سەردەمی ساوایی).

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ مِنَ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا

**٢٥١٥-** عَنِ ابْنِ شِمَاسَةَ قَالَ: حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ ﷺ، وَهُوَ فِي سِيَاقَةِ الْمَوْتِ، فَبَكَى طَوِيلًا، وَقَالَ: فَلَمَّا جَعَلَ اللَّهُ الْإِسْلَامَ فِي قَلْبِي أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْسُطْ يَمِينَكَ لِأُبَايِعَكَ، فَبَسَطَ يَدَهُ، فَقَبَضْتُ يَدِي، فَقَالَ: «مَا لَكَ يَا عَمْرُو؟». قَالَ: أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ قَالَ: «تَشْتَرِطُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مَاذَا؟»، قال: أَنْ يُغْفَرَ لِي قَالَ: «أَمَا عَلِمْتَ يَا عَمْرُو أَنَّ الْإِسْلَامَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ، وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهَدَّمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا، وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ»[١].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی حەجکردن گوناە و تاوانەکانی پێش خۆی دەسڕێتەوە

واتە: ئیبنو شیماسە وتی: ئامادە بووین لەگەڵ عەمری کوڕی عاص ﷺ، ئەو لە سەرەمەرگدا بوو، زۆر گریا، وتی: خوا ئیسلامی خستە دڵمەوە، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەستی ڕاستت درێژ بکە بۆ ئەوەی بەیعەتت پێ بدەم، دەستی درێژ کرد، منیش دەستم نوقاند، فەرمووی: چیتە ئەی عەمر؟ وتم: ویستم مەرج دابنێم، فەرمووی: مەرجی چی دادەنێیت؟ وتم: خوا لێم خۆش بێت، فەرمووی: ئایا نەتزانیوە ئەی عەمر مسوڵمانبوون (گوناهەکانی) پێش خۆی لا دەبات، وە کۆچکردن (گوناهەکانی) پێش خۆی لا دەبات، وە حەجکردن (گوناهەکانی) پێش خۆی لا دەبات.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ دُعَاءِ الْحَاجِّ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدِ اسْتَغْفَرَ لَهُمْ وَلِمَنِ اسْتَغْفَرُوا لَهُ

**٢٥١٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْحُجَّاجِ، وَلِمَنِ اسْتَغْفَرَ لَهُ الْحَاجُّ»[٢].

## باسی چاکترە وایە حەجکەران نزای خێر بکەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەوان و ئەوانەش کردووە کە ئەوان داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە لە حەجکەران خۆش بە، وە ئەوانەیشی حەجکەران داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْخُرُوجِ إِلَى الْحَجِّ يَوْمَ الْخَمِيسَ تَبَرُّكًا بِفِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ، إِذْ كَانَ ﷺ قَلَّمَا يَخْرُجُ فِي سَفَرٍ إِلَّا يَوْمَ الْخَمِيسِ

**٢٥١٧-** عَنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ فِي سَفَرِ الْجِهَادِ وَغَيْرِهِ إِلَّا يَوْمَ الْخَمِيسِ[١].

**باسی چاکتر وایە بەندە لە ڕۆژی پێنجشەممە دەربچێت بۆ حەج،وەك فەڕوبەرەکەتێك بە شوێنکەوتنی کرداری پێغەمبەر ﷺ، چونکە پێغەمبەر ﷺ جگە لە پێنجشەممان بەکەمی دەردەچوو بۆ سەفەر**

واتە: عەبدوڕحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، ئەو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە پێنجشەمان لە ڕۆژەکانی دیکەدا بەکەمی دەردەچوو بۆ سەفەری جیهادکردن و جگە لە ویش.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّزَوُّدِ لِلسَّفَرِ اقْتِدَاءً بِالنَّبِيِّ ﷺ وَمُخَالَفَةً لِبَعْضِ مُتَصَوِّفَةِ أَهْلِ زَمَانِنَا

**٢٥١٨-** عن عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْنِي إِلَى بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ، فَاسْتَأْذَنَ، فَأَذِنَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ». قال أَبُو بَكْرٍ: الصَّحَابَةَ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ «نَعَمْ»، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَجَهَّزْتُهُمَا أَحَثَّ الْجِهَازِ فَصَنَعْتُ لَهُمَا سَفْرَةً فِي جِرَابٍ، فَقَطَعَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بِكْرٍ قِطْعَةً مِنْ نِطَاقِهَا، فَأَوْكَتْ بِهِ الْجِرَابَ، فَبِذَلِكَ كَانَتْ تُسَمَّى ذَاتَ النِّطَاقِ[٢].

**باسی چاکتر وایە بۆ بەندە خۆی ئامادە بکات بۆ سەفەر، وەکوو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، بە پێچەوانەی هەندێ لە سۆفییەکانی ئەم سەردەممان**

واتە: عائیشە ﷺ (لە باسی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە لە میانەی قسەکانیدا) وتی: ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ماڵی ئەبو بەکر، داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کرد، ئەویش مۆڵەتی پێ دا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من مۆڵەت دراوم کە ئێرە بەجێ بهێڵم، ئەبو بەکر وتی: هاوڕێیەتیت بکەم، باوکم لەدەورت گەڕێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، عائیشە وتی: کەلوپەلمان بۆیان ئامادە کرد، هەروەها هەندێ خۆراکمان لە مەشکەیەکدا بۆ دانان، ئەسمائی کچی ئەبو بەکر پارچەیەکی لە پشتوێنەکەی کردەوە و دەمی مەشکەکەی پێ بەست، لەبەر ئەوە ناو نرا خاوەنی پشتوێنەکە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ سَفَرِ الْمَرْأَةِ مَعَ غَيْرِ ذِي مَحْرَمٍ وَغَيْرِ زَوْجِهَا بِذِكْرِ خَبَرٍ فِي التَّأْقِيتِ غَيْرِ دَالٍ تَوْقِيتُهُ عَلَى أَنَّ مَا كَانَ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ التَّأْقِيتِ مِنَ السَّفَرِ مُبَاحٌ سَفَرُ الْمَرْأَةِ مَعَ غَيْرِ مَحْرَمٍ وَغَيْرِ زَوْجِهَا إِذَا كَانَ سَفَرُهَا أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ

**٢٥١٩**- عَنِ الْأَعْمَشِ، وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ ﷺ: عَامَ الْحَجِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُسَافِرُ سَفَرًا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ أَبُوهَا أَوِ ابْنُهَا أَوْ أَخُوهَا أَوْ زَوْجُهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی ئافرەت سەفەر بکات لەگەڵ جگە لە مەحرەمی خۆی و جگە لە مێردەکەی بە باسکردنی فەرموودەیەك باس لە دیاریکردنی کاتی دیاریکراو دەکات، بەڵام بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی ئەگەر کەمتر بێت لەو کاتەی دیاری کردووە سەفەرکردنی ئافرەت دروستە لەگەڵ جگە لە مەحرەم و جگە لە مێردی خۆی، ئەگەر سەفەرەکەی کەمتر بێت لە سێ ڕۆژ

واتە: ئەعمەش دەگێڕێتەوە، موعاویە ﷺ لەساڵی حەجدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێك بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت سێ ڕۆژ زیاتر گەشت بکات مەگەر کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا بێت، باوکی، یان کوڕەکەی، یان براکەی، یان مێردی، یان مەحرەمێکی دیکە.

**٢٥٢٠**- عَنِ الْأَعْمَشِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ نَحْوَهُ[٢].

واتە: لە ئەعمەشەوە، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٥٢١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى أَنْ تُسَافِرَ الْمَرْأَةُ ثَلَاثًا إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە ئافرەت سێ ڕۆژ سەفەر بکات مەگەر کەسێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵدا بێت.

**بَابُ الزَّجْرِ عَنْ سَفَرِ الْمَرْأَةِ يَوْمَيْنِ مَعَ غَيْرِ زَوْجِهَا وَغَيْرِ ذِي رَحِمِهَا «وَالدَّلِيلِ عَلَى صِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُبِحْ بِزَجْرِهِ عَنْ سَفَرِهَا ثَلَاثًا لَهَا أَنْ تُسَافِرَ أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ مَعَ غَيْرِ زَوْجِهَا وَغَيْرِ ذِي رَحِمِهَا، بِذِكْرِ لَفْظَةٍ فِي تَوْقِيتِ الْيَوْمَيْنِ لَمْ يُرِدِ النَّبِيُّ ﷺ بِتَوْقِيتِهِ يَوْمَيْنِ إِبَاحَةَ مَا هُوَ أَقَلُّ مِنْهَا»**

**٢٥٢٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُسَافِرُ الْمَرْأَةُ يَوْمَيْنِ إِلَّا مَعَ زَوْجِهَا أَوْ ذِي مَحْرَمٍ»[٢].

**باسی سەرزەنشتکردن لە گەشتکردنی ئافرەت بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەگەڵ جگە لە مێردەکەی و جگە لە مەحرەمێکی دیکەی، وە بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەوەی لەیەکم دایەوە پێغەمبەر ﷺ بە سەرزەنشتکردنی لە گەشتکردنی ئافرەت بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ڕێگەی نەداوە کەمتر لە سێ ڕۆژ گەشت بکات لەگەڵ جگە لە مێردەکەی و جگە لە مەحرەمێکی دیکەی، بە باسکردنی دەستەواژەیەك دەربارەی دیاریکردنی دوو ڕۆژ، پێغەمبەر ﷺ لە باسکردنی دوو ڕۆژەکە مەبەستی ئەوە نەبووە کەمتر لە دوو ڕۆژ بۆی هەیە گەشت بکات**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئافرەت گەشت نەکات دوو ڕۆژ مەگەر لەگەڵ مێردی یان مەحرەمێکی.

**بَابُ الزَّجْرِ عَنْ سَفَرِ الْمَرْأَةِ يَوْمًا وَلَيْلَةً إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُبِحْ بِزَجْرِهِ إِيَّاهَا عَنْ سَفَرِ يَوْمَيْنِ سَفَرَ مَا هُوَ أَقَلُّ مِنْ يَوْمَيْنِ، إِذْ قَدْ زَجَرَهَا ﷺ أَنْ تُسَافِرَ يَوْمًا وَلَيْلَةً إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ»**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٥٢٣-** عَنْ مَالِك عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيد عَنْ أَبيه عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ يَوْمًا وَلَيْلَةً إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ»[1].

**باسی سەرزەنشتکردن لە گەشتکردنی ئافرەت بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێك مەگەر لەگەڵ کەسێکی مەحرەمیدا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە سەرزەنشتکردنی بۆ ماوەی دوو ڕۆژ ڕێگەی نەداوە بە کەمتر لە دوو ڕۆژ گەشت بکات، چونکە سەرزەنشتی کردووە بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێك گەشت بکات مەگەر لەگەڵ کەسێکی مەحرەمیدا**

واتە: مالیك دەگێڕێتەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێك بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەبێت گەشت بکات بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێك مەگەر کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدا بێت.

**٢٥٢٤-** عَنْ مَالِكِ عَنْ سَعِيد عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي الْخَبَرِ: هُوَ صَحِيحٌ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. رَوَاهُ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، وَابْنُ عَجْلَانَ، وَابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ[2].

واتە: مالیك دەگێڕێتەوە، لە سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدەوە، لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، ئەبو بەکر لەم فەرموودەیەدا وتی: ئەوەیان تەواوە لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە. چونکە لەیسی کوڕی سەعد و ئیبنو عەجلان و ئیبنو ئەبو زیئب گێڕاویانەتەوە لە سەعید، لە باوکی، لە ئەبو هورەیرەوە، لە کتێبی (الْكَبِيرِ)دا تەخریجم کردووە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُبِحْ بِزَجْرِهِ عَنْ سَفَرِهَا مَعَ غَيْرِ ذَوِي مَحْرَمٍ يَوْمًا وَلَيْلَةً السَّفَرَ الَّذِي هُوَ أَقَلُّ مِنْهُ، إِذْ قَدْ زَجَرَ ﷺ أَيْضًا أَنْ تُسَافِرَ لَيْلَةً وَاحِدَةً مَعَ غَيْرِ ذِي مَحْرَمٍ اللَّهُمَّ إِلَّا أَنْ يَكُونَ هَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْعَرَبَ تَذْكُرُ يَوْمًا تُرِيدُ بِلَيْلَتِهِ، وَلَيْلَةً تُرِيدُ بِيَوْمِهَا، قَالَ اللَّهُ**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**عَزَّ وَجَلَّ فِي سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ: ﴿ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗا ﴿٤١﴾ ﴾، وَقَالَ فِي سُورَةِ مَرْيَمَ: ﴿ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ ﴾، فَبَانَ وَثَبَتَ أَنَّهُ أَرَادَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ بِلَيَالِيهَا، وَصَحَّ أَنَّهُ أَرَادَ ثَلَاثَ لَيَالٍ بِأَيَّامِهِنَّ**

**٢٥٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُسَافِرِ امْرَأَةٌ مَسِيرَةَ لَيْلَةٍ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَقَدِ اسْتَقْصَيْتُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەرزەنشتی کرد لەوەی ئافرەت لەگەڵ جگە لە کەسی مەحرەمی شەو و ڕۆژێك گەشت بکات، ڕێگەی نەداوە گەشت بکات بە کەمتر لەو ماوەیە، چونکە بەهەمان شێوە سەرزەنشتی کردووە یەك شەو گەشت بکات لەگەڵ کەسی نامەحرەم، ئەوە نەبێت مەگەر ئەمیش لەو شێوازە بێت کە ڕامگەیاندووە لە چەند شوێنێکی کتێبەکانماندا عەرەب باسی ڕۆژێك دەکات مەبەستی پێی بە شەوەکەیشیەوە، وە باسی شەوێك دەکات مەبەستی پێی بە ڕۆژەکەیشیەوە، خوا ﷻ لە سورەتی ئالی عیمراندا فەرموویەتی: ﴿ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗا ﴿٤١﴾ ﴾، وە لە سورەتی مەریەمدا فەرموویەتی: ﴿ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ ﴾، جا ڕوون بۆیەوە و جێگیر بوو مەبەستی پێی سێ ڕۆژە بە شەوەکانیەوە، وە تەواویشە ئەو مەبەستی لە سێ شەوەکە بە ڕۆژەکانیشیەوەیە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئافرەت گەشت نەکات ماوەی ڕێکردنی شەوێك بخایەنێ مەگەر لەگەڵ کەسێکی مەحرەمیدا.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەو فەرموودانەی لەو بارەوە هاتوون لە (كتاب الكبير)دا هێناومن.

**بَابُ الزَّجْرِ عَنْ سَفَرِ الْمَرْأَةِ بَرِيدًا مَعَ غَيْرِ ذِي مَحْرَمٍ «وَالدَّلِيلِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ بِزَجْرِهِ إِيَّاهَا عَنْ سَفَرِ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ أَنَّهُ مُبَاحٌ لَهَا سَفَرٌ مَا هُوَ أَقَلُّ مِنْ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ»**

**٢٥٢٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُسَافِرُ امْرَأَةٌ بَرِيدًا إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْبَرِيدُ: اثْنَا عَشَرَ مِيلًا بِالْهَاشِمِيِّ.

## باسى سەرزەنشتكردن لە گەشتكردنى ئافرەت بە ئەندازەى بەريدێك لەگەڵ نامەحرەمدا، وە بەڵگە لەسەر ئەوەى پێغەمبەر ﷺ مەبەستى لە سەرزەنشتكردنەكەى لە گەشتكردنى بۆ ماوەى شەو و ڕۆژێكە، ڕێگەى پێ دراوە گەشت بكات كەمتر لە ماوەى شەو و ڕۆژێك

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئافرەت گەشت نەكات بە ئەندازەى بەريدێك مەگەر كەسێكى مەحرەمى لەگەڵدا بێت.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەندازەى (الْبَرِيد)ێك بریتییە لە: دوازدە میلى هاشمییە (كە هەر میلێكى هاشمى دەكاتە شەش هەزار باسك بە باسكى دەست، ئەویش بریتییە لە دوازدە هەزار پێ).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ زَجْرَ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ سَفَرِهَا بِلَا مَحْرَمٍ زَجْرُ تَحْرِيمٍ لَا زَجْرُ تَأْدِيبٍ

٢٥٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُسَافِرُ ثَلَاثًا إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ عَلَيْهَا»[1].

## باسى بەڵگە لەسەر ئەوەى سەرزەنشتكردنى پێغەمبەر ﷺ لە گەشتكردنى ئافرەت بەبێ مەحرەم سەرزەنشتكردنێكە بۆ قەدەغەكردن نەك بۆ پەروەردە و تەمێكردن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێك گەشت بكات بۆ ماوەى سێ ڕۆژ ئیللا دەبێ كەسێكى مەحرەمى لەگەڵ بێت بەسەریەوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ سَفَرِ الْمَرْأَةِ مَعَ عَبْدِ زَوْجِهَا أَوْ مَوْلَاهُ «إِذَا كَانَ الْعَبْدُ أَوِ الْمَوْلَى يُوثَقُ بِدِينِهِ وَأَمَانَتِهِ وَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْعَبْدُ أَوِ الْمَوْلَى بِمَحْرَمٍ لِلْمَرْأَةِ إِنْ كَانَ حُكْمُ سَائِرِ النِّسَاءِ حُكْمَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَا أَخَالُ؛ لِأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَخْبَرَ أَنَّهُنَّ أُمَّهَاتُ الْمُؤْمِنِينَ، فَجَائِزٌ أَنْ يَكُونَ الْعَبْدُ وَالْأَحْرَارُ مَحْرَمًا لِأَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ فَكَانَ سَفَرُ مَيْمُونَةَ مَعَ أَبِي رَافِعٍ أَنَّ مَيْمُونَةَ أُمُّ أَبِي رَافِعٍ إِذْ كَانَتْ مَيْمُونَةُ زَوْجَةَ النَّبِيِّ ﷺ»

---

(١) صحيح.

**٢٥٢٨-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ بَعْثٍ مَرَّةً، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اذْهَبْ فَآتِنِي بِمَيْمُونَةَ»، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ إِنِّي فِي الْبَعْثِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَسْتَ تُحِبُّ مَا أُحِبُّ؟» قُلْتُ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «اذْهَبْ، فَآتِنِي بِهَا». قال فَذَهَبْتُ فَجِئْتُهُ بِهَا[1].

**باسی ڕێگە دراوە ئافرەت لەگەڵ كۆیلەی مێردەكەی یان مەولای مێردەكەی گەشت بكات، ئەگەر متمانە بكرێ بە دین و ئەمانەتی كۆیلەكە یان مەولاكە، ئەگەرچی كۆیلەكە یان مەولاكە مەحرەمی ئافرەتەكەش نەبێت، ئەگەر حوكمی سەرجەم ئافرەتان حوكمی خێزانەكانی پێغەمبەری ﷺ هەبێت، پێموا نییە بەوشێوە بێت، چونكە خوا ﷻ هەواڵی داوە ئەوان دایكانی بڕوادارانن، جا دروستە بەندە و ئازادەكان مەحرەم بن بۆ خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە گەشتی مەیمونە لەگەڵ ئەبو ڕافیع لەو چوارچێوەدایە كە مەیمونە دایكی ئەبو ڕافیعە، چونكە مەیمونە خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو**

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: من جارێك لەگەڵ كاروانییەك بووم، (پێدەچی بۆ حەج چووبێتن) پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: بڕۆ مەیمونەم بۆ بهێنە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەنێو كاروانییەكەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوەی تۆ پێت خۆشە، هەر ئەوە نییە كە من پێم خۆشە؟ وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا پێم خۆشە، فەرمووی: بڕۆ بۆم بهێنە، وتی: ڕۆیشتم بۆم هێنا.

## بَابُ ذِكْرِ خُرُوجِ الْمَرْأَةِ لِأَدَاءِ فَرْضِ الْحَجِّ بِغَيْرِ مَحْرَمٍ، وَأَمْرِ الْحَاكِمِ زَوْجَهَا بِاللَّحَاقِ بِهَا لِلْحَجِّ بِهَا

**٢٥٢٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ: «أَلَا لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ»، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، وَانْطَلَقَتِ امْرَأَتِي حَاجَّةً قَالَ: «انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی دەرچوونی ئافرەت بە مەبەستی بەجێگەیاندنی حەج بەبێ مەحرەم، وە فەرمانکردنی کاربەدەست بە مێردەکەی بۆ ئەوەی بچێت حەجی پێ بکات

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو وتاری دەدا: ئاگاداربن با هیچ پیاوێك بەتەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا نەبێت مەگەر کەسێکی مەحرەمی لەگەڵ بێت. پیاوێك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ناوی خۆم تۆمار کرد لە فڵان و فڵان غەزادا بەشداری بکەم، خێزانەکەیشم دەرچووە بۆ حەج، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ حەج لەگەڵ خێزانەکەت بکە.

**٢٥٣٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ يَقُولُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ نَحْوَهُ، وَقَالَ: «فَاذْهَبْ فَحُجَّ بِامْرَأَتِكَ»[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر مینبەر وتاری دەدا و دەیفەرموو، دواتر فەرموودەکەی باس کرد وەکوو ئەوەی پێشوو، وە فەرمووی: بڕۆ حەج بە هاوسەرەکەت بکە.

## بَابُ تَوْدِيعِ الْمُسْلِمِ أَخَاهُ عِنْدَ إِرَادَةِ السَّفَرِ

**٢٥٣١-** عَنِ الْقَاسِمِ يَقُولُ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ أَرَدْتُ سَفَرًا، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: انْتَظِرْ حَتَّى أُوَدِّعَكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوَدِّعُنَا: «اسْتَوْدِعِ اللَّهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ»[٢].

## باسی خواحافیزیکردنی مسوڵمان لە براکەی لە کاتی گەشتکردندا

واتە: قاسم دەڵێ: من لەلای ئیبنو عومەر بووم ﷺ، پیاوێك هات وتی: ئەمەوێت گەشت بکەم، عەبدوڵا وتی: چاوەڕوان بە تا بتسپێرم وەکوو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی خواحافیزی دەیسپاردین: من ئایینەکەت و ئەمانەتەکەت (واتە: خێزانت و ئەوەی بەجێت هێشتووە لە ماڵ و سامان) و عاقیبەتی کردەوەکانت بە خوا دەسپێرم.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ دُعَاءِ الْمَرْءِ لِأَخِيهِ الْمُسْلِمِ عِنْدَ إِرَادَةِ السَّفَرِ

**٢٥٣٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ سَفَرًا فَزَوِّدْنِي قَالَ: «زَوَّدَكَ اللَّهُ التَّقْوَى». قال: زِدْنِي قَالَ: «وَغَفَرَ ذَنْبَكَ». قال: زِدْنِي بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي قَالَ: «وَيَسَّرَ لَكَ حَيْثُ مَا كُنْتَ»(١).

### باسی پاڕانەوەی بەندە بۆ برا مسوڵمانەكەی لە كاتی سەفەركردندا

واتە: ئەنەس ﷺ وتی: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەمەوێ گەشتێك بكەم، بۆم بپاڕێرەوە (تا پاڕانەوەكەت وەكوو توێشوویەك بێت لە گەشتەكەمدا)، فەرمووی: خوا خۆپارێزی و لەخواترسانت پێ ببەخشێ (واتە: بێنیازت بكات لە دروستكراوەكان، وە فەرمانەكانی بەجێ بهێنیت و دوور بكەویتەوە لە قەدەغەكراوەكانی)، وتی: بۆم زیاد بكە، فەرمووی: وە لە گوناهەكانت خۆش بێت، وتی: بۆم زیاد بكە باوك و دایكم لەدەورت گەڕێن، فەرمووی: وە كاروبارت بۆ ئاسان بكات لە هەر شوێنێك بیت.

## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْخُرُوجِ إِلَى السَّفَرِ

**٢٥٣٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا سَافَرَ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ، اللَّهُمَّ اصْحَبْنَا فِي سَفَرِنَا، وَاخْلُفْنَا فِي أَهْلِنَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَمِنَ الْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَمِنْ دَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَمِنْ سُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ»(٢).

### باسی پاڕانەوە لە كاتی دەرچوون بۆ گەشتكردن

واتە: عەبدوڵای كوڕی سەرجیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ گەشتی بكردایە دەیفەرموو: خوایە تۆ هاوڕێ و هاودەمی لە سەفەردا، وە پارێزەری ماڵ و منداڵیشی لەم

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

گەشتەدا، خوایە هاوەڵیمان بکە لەم گەشتەماندا، وە ماڵ و منداڵیشمان بپارێزە، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ناخۆشی و ناڕەحەتیی گەشت، لە گەڕانەوە بەخەم و پەژارەوە، لە گەڕانەوە لە تەواوییەوە بۆ ناتەواوی، (یان لە ئیمانەوە بۆ کوفر، یان لە گوێڕایەڵی بۆ سەرپێچی یان لە خۆشگوزەرانییەوە بۆ دەستکورتی)، وە پەنات پێ دەگرم لە نزای ستەملێکراو (واتە: پەنا دەگرم بە خوا لەوەی ستەم بکەم و ستەملێکراویش نزام لێ بکات)، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپترین شتێك کە لە ماڵ و منداڵ و سامانم ببینم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْخُرُوجِ إِلَى الْحَجِّ مَاشِيًا لِمَنْ قَدَرَ عَلَى الْمَشْيِ وَلَمْ يَكُنْ عِيَالًا عَلَى رُفَقَائِهِ

**٢٥٣٤-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقَامَ بِالْمَدِينَةِ تِسْعَ سِنِينَ، لَمْ يَحُجَّ ثُمَّ أُذِنَ بِالْحَجِّ، فَقِيلَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَاجٌّ فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كُلُّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ "، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ وَقَالَ: ثُمَّ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَعْنِي مِنَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ فَرَكِبَ وَمَعَهُ بَشَرٌ كَثِيرٌ رُكْبَانٌ وَمُشَاةٌ. ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

## باسی مۆڵەتدان بە دەرچوون بۆ حەج بەپیادە بۆ کەسێك توانای ڕۆیشتنی هەبێت و نەبێتە ئەرك بۆ هاوەڵانی

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ساڵ لە مەدینە مایەوە حەجی نەکرد، پاشان مۆڵەتی حەجکردنی پێ درا، وترا: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ حەج بکات، بۆیە خەڵکێکی زۆر لە مەدینەوە لەگەڵی دەرچوون، هەموویان حەزیان دەکرد پەیڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، -دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- وە وتی: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو: واتە: لە مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) سواری وڵاخەکەی بوو خەڵکێکی زۆریش لەگەڵی بوون بەسواری و بەپیادە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ رَبْطِ الْأَوْسَاطِ بِالْأُزُرِ وَسُرْعَةِ الْمَشْيِ إِذَا كَانَ الْمَرْءُ مَاشِيًا

**٢٥٣٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ مُشَاةً مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، وَقَالَ: «ارْبُطُوا أَوْسَاطَكُمْ بِأُزُرِكُمْ»، وَمَشَى خِلْطَ الْهَرْوَلَةِ[1].

## باسی چاکتر وایە بەندە کاتێ ڕێی کرد بەشی خوارەوەی پۆشاکەکەی ببەستێ و بەخێرایی ڕێ بکات

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەپیادە چوون بۆ حەج لە مەدینەوە بۆ مەککە، فەرمووی: بەشی خوارەوەی پۆشاکەکانتان ببەستن. وە ڕێی دەکرد بەشێوەی تێکەڵ بەهەروەلە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ النَّسْلِ فِي الْمَشْيِ عِنْدَ الْإِعْيَاءِ مِنَ الْمَشْيِ لِيَخِفَّ النَّاسِلُ وَيَذْهَبَ بَعْضُ الْإِعْيَاءِ عَنْهُ

**٢٥٣٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: خَرَجَ عَامَ الْفَتْحِ، ثُمَّ اجْتَمَعَ إِلَيْهِ الْمُشَاةُ مِنْ أَصْحَابِهِ وَصَفُّوا لَهُ، وَقَالُوا: نَتَعَرَّضُ لِدَعَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: اشْتَدَّ عَلَيْنَا السَّفَرُ، وَطَالَتِ الشُّقَّةُ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَعِينُوا» - قَالَ عَبْدُ الْوَهَّابِ: أَظُنُّهُ- قَالَ: «بِالنَّسْلِ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ عَنْكُمُ الْأَرْضَ وَتَخِفُّونَ لَهُ»، فَفَعَلْنَا ذَلِكَ، وَخِفْنَا لَهُ، وَذَهَبَ مَا كُنَّا نَجِدُ[2].

## باسی چاکتر وایە بەندە کاتێ ماندوو دەبێت لە ڕێکردن بەپەلە ڕێ بکات بۆ ئەوەی لەشی سووک بێت و بەشێک لە ماندووبوونەکەی دەربچێ

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککە دەرچوو، پاشان هاوەڵەکانی کە بەپیادە دەڕۆیشتن کۆبوونەوە لە خزمەتیدا و ڕیزیان بەست، وتیان: بەڵکوو بەر پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوین، وتیان ئەم

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

گەشتە زۆری بۆ هێناوین و ماندووی کردووین، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: لە ڕێگادا پەلە بکەن، چونکە بەوشێوە زوو ڕێگاکە دەبڕن، وە لەشتان سووك دەبێت. وتی: ئەوەمان کرد لەشمان سووك بوو، وە ماندوویەتیشمان دەرچوو.

**٢٥٣٧-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: شَكَا نَاسٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَشْيَ فَدَعَا بِهِمْ، وَقَالَ: «عَلَيْكُمْ بِالنَّسْلَانُ»، فَنَسَلْنَا فَوَجَدْنَاهُ أَخَفَّ عَلَيْنَا[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای ئەوەیان کرد لە کاتی ڕێکردندا قاچیان ئێش دەکات: فەرمووی: بەپەلە ڕێ بکەن. دواتر بەپەلە ڕێمان کرد بینیمان لەشمان سووك بوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ مُصَاحَبَةِ الْأَرْبَعَةِ فِي السَّفَرِ

**٢٥٣٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ الصَّحَابَةِ أَرْبَعَةٌ، وَخَيْرُ السَّرَايَا أَرْبَعُمِائَةٍ، وَخَيْرُ الْجُيُوشِ أَرْبَعَةُ آلَافٍ، وَلَنْ يُغْلَبَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا مِنْ قِلَّةٍ»[2].

## باسی چاکتر وایە بەندە بەهاوڕێیەتیی چوار کەس گەشت بکات

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین هاوەڵێکردن بۆ گەشت چوار کەسە (پێکەوە دەربچن)، چاکترین لەشکریش چوار سەدە، چاکترین سوپاش چوار هەزارە، وە هەرگیز دوازدە هەزار سەرباز لەبەر کەمی تێ ناشکێن.

## بَابُ حُسْنِ الصَّحَابَةِ فِي السَّفَرِ، إِذْ خَيْرُ الْأَصْحَابِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ

**٢٥٣٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الْأَصْحَابِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده معلول بالإرسال.

(٣) صحيح.

## باسی هاوەڵیەتی کەسانی چاك لە گەشتدا، چونکە چاکترینی نێو هاوەڵان ئەوەیانە کە چاکترینیانە بۆ هاوەڵەکەی

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاکترینی هاوەڵان لەلای خوا ئەوەیانە کە چاکترینیانە بۆ هاوەڵەکەی ، وە چاکترین دراوسێکان لەلای خوا ئەوەیانە کە چاکترینیان بۆ دراوسێکەی.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَأْمِيرِ الْمُسَافِرِينَ أَحَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ، وَالْبَيَانِ أَنَّ أَحَقَّهُمْ بِذَلِكَ أَكْثَرُهُمْ جَمْعًا لِلْقُرْآنِ

**٢٥٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْثًا، وَهُمْ نَفَرٌ فَدَعَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ؟»، فَاسْتَقْرَأَهُمْ كَذَلِكَ حَتَّى مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ هُوَ مِنْ أَحْدَثِهِمْ سِنًّا قَالَ: «مَاذَا مَعَكَ يَا فُلَانُ؟». قال: مَعِيَ كَذَا وَكَذَا، وَسُورَةُ الْبَقَرَةِ قَالَ: «اذْهَبْ، فَأَنْتَ أَمِيرُهُمْ»[١].

## باسی چاکتر وایە گەشتیاران کەسێك بکەن بە فەرماندەی خۆیان، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی شیاوترینیان بەوەی بکرێتە فەرماندەیان ئەو کەسەیانە زۆرترین ئایەتی قورئانی لەبەرە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نێردراوێکی نارد، چەند کەسێك بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن، یەك یەك پرسیاری لێ کردن فەرمووی: چەندە قورئانت لەبەرە؟ تا گەیشتە پیاوێك تەمەنی لە هەموویان منداڵتر بوو، فەرمووی: چەندە قورئانت لەبەرە؟ وتی: ئەوەندە و ئەوەندە سورەتم لەبەرە، وە سورەتی بەقەرەیش، فەرمووی: بڕۆ تۆ فەرماندەیانیت.

**٢٥٤١-** عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ: إِذَا كَانَ نَفَرٌ ثَلَاثٌ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ، ذَاكَ أَمِيرٌ أَمَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح موقوفا.

واتە: زەیدی کوڕی وەهب دەڵێ: عومەر ﷺ وتی: ئەگەر سێ کەس بوون با یەکێکیان بکەن بە لێپرسراوی خۆیان، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو جۆرە فەرمانی کردووە.

## بَابُ التَّكْبِيرِ وَالتَّسْبِيحِ وَالدُّعَاءِ عِنْدَ رُكُوبِ الدَّوَابِّ عِنْدَ إِرَادَةِ الْمَرْءِ الْخُرُوجَ مُسَافِرًا

**٢٥٤٢-** قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَلِيًّا الْأَزْدِيَّ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ عَلَّمَهُمْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ كَبَّرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: «سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ، اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى، اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ»، فَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ وَزَادَ فِيهِنَّ: «آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ»[١].

## باسی تەکبیر و تەسبیح و پاڕانەوە لە کاتی سواربوونی وڵاخ، کاتێ بەندە ویستی گەشت بکات

واتە: ئیبنو جوڕەیج وتی: ئەبو زوبەیر هەواڵی پێ دام، عەلی ئەزدی هەواڵی پێ داوە، ئیبنو عومەر ﷺ فێری کردن: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەردەچوو بۆ سەفەرێك کە لەسەر وشترەکەی ڕاست ببووایەتەوە، سێ جار تەکبیر (الله أكبر)ی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەم شتانەی بۆ ژێربار و ئاسان کردووین کە ئەگەر خوای گەورە نەبووایە ئێمە توانا و دەسەڵاتمان نەبوو بەکاریان بێنین، وە ئێمە لە پاش مردن بۆ لای خوا ﷻ ئەگەڕێینەوە، خوایە ئێمە لەم گەشتەماندا داوای چاکە و خۆپارێزیت لێ دەکەین، وە کردەوەیەك ئەنجام بدەین تۆ پێی ڕازی بیت، خوایە گەشتەکەمان لەسەر ئاسان بکەیت، وە دووریمان بۆ نزیك بکەیتەوە، خوایە تۆ هاوڕێ و هاودەمی لە سەفەردا، وە پارێزەری ماڵ و مناڵیشی لەم گەشتەدا، خوایە هاوەڵیمان بکە لەم گەشتەماندا، وە ماڵ و منداڵیشمان بپارێزە، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە ناخۆشی و ناڕەحەتی ئەم گەشتە، لە گەڕانەوە بەخەم و بەژارەوە، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپترین شتێك کە لە ماڵ و منداڵ و سامانم ببینم.

---

(١) صحيح.

کاتێ بگەڕایەتەوە ئەوانەی دەفەرموو، ئەمەیشی زیاد دەکرد تیایدا: گەڕاینەوە (لە گەشتەکەمان) بەتەوبەکاری و بەبەندایەتییەوە، سوپاس و ستاییشی پەروەردگارمان دەکەین.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَسْمِيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ الرُّكُوبِ وَإِبَاحَةِ الْحَمْلِ عَلَى الْإِبِلِ فِي الْمَسِيرِ قَدْرَ طَاقَتِهَا

**٢٥٤٣-** عَنْ أَبِي لَاسٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ قَالَ: حَمَلَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِبِلٍ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ خِفَافٍ لِلْحَجِّ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نَرَى أَنْ تَحْمِلَنَا هَذِهِ، فَقَالَ: «مَا مِنْ بَعِيرٍ إِلَّا وَعَلَى ذُرْوَتِهِ شَيْطَانٌ فَاذْكُرُوا اللَّهَ إِذَا رَكِبْتُمُوهَا كَمَا أَمَرَكُمْ، ثُمَّ امْتَهِنُوهَا لِأَنْفُسِكُمْ فَإِنَّمَا يَحْمِلُ اللَّهُ»[1].

## باسی فەرمانکردن بە ناوهێنانی خوا (بسم الله) لە کاتی سواربوون، وە ڕێگەدان بەوەی بار بخرێتە سەر وشتر لە کاتێ ڕێکردن بە ئەندازەی توانای

واتە: ئەبو لاسی خوزاعی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوار وشتری کردین لە وشتری زەکات بۆ حەج، وشترەکان لاواز بوون (توانای ئەو ڕێگا دوورەی حەجیان نەبوو)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا پێمانوا نییە ئەم وشترانە تواناییان هەبێت ئێمە هەڵبگرن؟ فەرمووی: هیچ وشترێك نییە ئیللا شەیتانێك لەسەریەتی، کاتێ سواری بوون ناوی خوا بێنن وەکوو چۆن فەرمانی پێ کردوون، پاشان بۆ خۆتان بەکاری بێنن، خوا هێز و توانای تێ دەخات بۆتان.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ اتِّخَاذِ الدَّوَابِّ كَرَاسِيَّ بِوَقْفِهَا وَالْمَرْءُ رَاكِبُهَا غَيْرُ سَائِرٍ عَلَيْهَا، وَلَا نَازِلٍ عَنْهَا

**٢٥٤٤-** حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ الزَّعْفَرَانِيُّ، حَدَّثَنَا عَاصِمٌ -يَعْنِي ابْنَ عَلِيٍّ- حَدَّثَنَا لَيْثٌ -وَهُوَ ابْنُ سَعْدٍ-، وَ حَدَّثَنَا الزَّعْفَرَانِيُّ أَيْضًا، حَدَّثَنَا شَبَابَةُ، أَخْبَرَنَا لَيْثٌ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنِ [ابْنِ] مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ (٢)، عَنْ أَبِيهِ، فِي خَبَرِ شَبَابَةَ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَفِي حَدِيثِهِمَا جَمِيعًا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «ارْكَبُوا هَذِهِ الدَّوَابَّ سَالِمَةً وَابْتَدِعُوهَا سَالِمَةً وَلَا تَتَّخِذُوهَا كَرَاسِيَّ»[2].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده حسن.

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی ئاژەڵ بکرێ بە کورسی، بەجۆرێ مرۆڤ سواری ببێ و لەسەری دانەبەزێ بۆ ئەوەی پشوو بدات

واتە: حەسەنی کوڕی موحەممەدی زەعفەرانی بۆی باس کردین، عاصمی کوڕی عەلی بۆی باس کردین، لەیسی کوڕی سەعد بۆی باس کردین، هەروەها زەعفەرانی بۆی باس کردین، شەبابە بۆی باس کردین، لەیس هەواڵی پێ داین، لە یەزیدی کوڕی حەبیب لە ئیبنو موعازی کوڕی ئەنەس، لە باوکیەوە، لە فەرموودەکەی شەبابەدا هاتووە: باوکی موعاز یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە لە فەرموودەکەی هەردووکیاندا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سواری ئەو وشترانە ببن بەسەلامەتی (واتە: ئەرکێك مەخەنە سەر شانیان لە توانایاندا نەبێت)، وە ئەگەر پێویستتان پێیان نەبوو لەسەریان دابەزن، پشتیان مەکەن بە کورسی و تەخت (واتە: بەسەر وشترەوە دامەنیشن و لەگەڵ یەکدیی دەمەتەقێ بکەن، وەکوو ئەوەی لەسەر کورسی دانیشتبن).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْإِحْسَانِ إِلَى الدَّوَابِّ الْمَرْكُوبَةِ فِي الْعَلَفِ وَالسَّقْيِ، وَكَرَاهِيَةِ إِجَاعَتِهَا وَإِعْطَاشِهَا وَرُكُوبِهَا وَالسَّيْرِ عَلَيْهَا جِيَاعًا عِطَاشًا

**٢٥٤٥-** عَن سَهْلِ بْنِ حَنْظَلَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِبَعِيرٍ قَدْ لَحِقَ ظَهْرُهُ بِبَطْنِهِ، فَقَالَ: «اتَّقُوا اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ الْمُعْجَمَةِ ارْكَبُوهَا صَالِحَةً وَكُلُوهَا صَالِحَةً»[1].

## باسی چاکتر وایە مامەڵەی چاك بکرێت لەگەڵ ئەو ئاژەڵانەی سواریان دەبن، ئالیکی باش و خواردنەوەیان پێ بدەن، وە دروست نییە تینوو و برسیان بکەن و بەو شێوە سواریان ببن و ڕێگای دووریان پێ ببڕن بە برسێتی و تینوێتی

واتە: سەهلی کوڕی حەنزەلە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای وشترێکدا تێپەڕی پشتی نووسا بوو بە سکیەوە، (لە برساندا) فەرمووی: لە خوا بترسن لەوەی (مافی) ئەو ئاژەڵانە نەدەن کە بەستەزمانن (ناتوانن هاواری برسێتی و قورسایی

---
(١) صحیح.

سەرشانیان بە خاوەنەکەیان بڵێن) کاتێ سواریان ببن کە بەهێز و بەتوانابن و گونجاوبن بۆ سواری، کاتێکیش گۆشتیان بخۆن قەڵەو و بن (و بۆ خواردن گونجاو بن).

## بَابُ إِبَاحَةِ الْحَمْلِ عَلَى الدَّوَابِّ الْمَرْكُوبَةِ فِي السَّيْرِ طَلَبًا لِقَضَاءِ الْحَوَائِجِ إِذَا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهَا عِنْدَ الرُّكُوبِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى

**٢٥٤٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَوْقَ ظَهْرِ كُلِّ بَعِيرٍ شَيْطَانٌ، فَإِذَا رَكِبْتُمُوهُنَّ فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلَا تَقْصُرُوا عَنْ حَاجَةٍ»[١].

## باسی ڕێگە دراوە بار لەسەر ئاژەڵ دابنرێت لە ڕێگاوباندا بۆ تەواوکردنی پێویستی، ئەگەر لە کاتی سواربوون (بسم الله)ی کرد، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و پوخت نەك شیکراوە

واتە: موحەممەدی کوڕی حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر پشتی هەموو وشترێك شەیتانێك هەیە (پێدەچێ مەبەستی پێی ئەوە بێت سیفەتێکی شەیتانی تێدایە) جا ئەگەر سواری بوون، ناوی خوا بهێنن (بسم الله) بکەن، وە وازی لێ مەهێنن کاتێ پیویستیتان پێی هەبوو (بە بیانووی ئەوەی شەیتان لەسەر پشتێتی، چونکە ئێوە (بسم الله)تان کردووە).

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ الْحَمْلَ عَلَى الدَّوَابِّ الْمَرْكُوبَةِ، وَأَنْ لَا تَقْصُرَ عَلَى طَلَبِ حَاجَةٍ، إِذِ اللَّهُ ﷻ يُرَاقِبُهُ، وَرَحْمَتُهُ تَحْمِلُ الرَّاكِبَ بِأَنَّ يَقَوِّي الْمَرْكُوبَ لِيَقْضِيَ الرَّاكِبُ حَاجَتَهُ

**٢٥٤٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ عَلَى ذُرْوَةِ كُلِّ بَعِيرٍ شَيْطَانًا فَامْتَهِنُوهُنَّ بِالرُّكُوبِ، وَإِنَّمَا يَحْمِلُ اللَّهُ»[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ عَنْ أَبِيهِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ الْحَمْلَ عَلَيْهَا فِي السَّيْرِ طَلَبًا لِقَضَاءِ الْحَاجَةِ إِذَا كَانَتِ الدَّابَّةُ الْمَرْكُوبَةُ مُحْتَمِلَةٌ لِلْحَمْلِ عَلَيْهَا؛ لِأَنَّهُ قَالَ: ارْكَبُوهَا سَالِمَةً وَابْتَدِعُوهَا سَالِمَةً، وَكَذَلِكَ فِي خَبَرِ سَهْلٍ ارْكَبُوهَا صَالِحَةً وَكُلُوهَا صَالِحَةً، فَإِذَا كَانَ الْأَغْلَبُ مِنَ الدَّوَابِّ الْمَرْكُوبَةِ أَنَّهَا إِذَا حُمِلَ عَلَيْهَا فِي الْمَسِيرِ عَطِبَتْ لَمْ يَكُنْ لِرَاكِبِهَا الْحَمْلُ عَلَيْهَا، النَّبِيُّ ﷺ قَدِ اشْتَرَطَ أَنْ تُرْكَبَ سَالِمَةً، وَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ، ارْكَبُوهَا سَالِمَةً أَيْ رُكُوبًا تَسْلَمُ مِنْهُ، وَلَا تَعْطِبُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە ڕێگەی داوە سواری ئەو ئاژەڵانە بن کە بۆ سواری دانراون، زیاتر نەبێت لە پێویست، چونکە خوا ﷻ چاودێری دەکات، وە بەڕەحمەتی خۆی هێز دەدات بە سوارەکە تا سواری ئاژەڵەکە بێت بۆ ئەوەی پێویستییەکەی تەواو بکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی لەسەر چڵەپۆپەی بەرزایی پشتی هەموو وشترێك شەیتانێك هەیە، (کاتێك سواری بوون ناوی خوا بێنن (بسم الله) بکەن وەکوو چۆن فەرمانی پێ کردوون)، پاشان بۆ خۆتان بەکاری بێنن، خوا هێز و توانای تێ دەخات بۆتان.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی موعازی کوڕی ئەنەسی جوهەنی لە باوکیەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە ڕێگەی داوە بە سواربوونی لە ڕێگا ئەگەر بەدوای پێویستییەکدا بگەڕێت، ئەگەر ئەو وشترەی سواری بووە هی سواربوون بێت، چونکە فەرموویەتی: (ارْكَبُوهَا سَالِمَةً وَابْتَدِعُوهَا سَالِمَةً)، واتە: سواری ئەو وشترانە ببن بەسەلامەتی (واتە: ئەرکێك مەخەنە سەرشانیان لە توانایاندا نەبێت)، وە ئەگەر پێویستتان پێیان نەبوو لەسەریان دابەزن. هەروەها لە فەرموودەکەی سەهلدا هاتووە: (ارْكَبُوهَا صَالِحَةً وَكُلُوهَا صَالِحَةً)، واتە: کاتێ سواریان ببن کە بەهێز و بە توانابن، کاتێکیش گۆشتیان بخۆن قەڵەو بن. ئەگەر زۆربەی ئاژەڵەکان کاتێ سواریان ببن لە ڕێگاوباندا پەکیان بکەوێت، ئەوە نابێت خاوەنەکەی سواری بێت، پێغەمبەر ﷺ مەرجی داناوە سواریان ببن بە مەرجێ سەلامەت بن، وە پێدەچێ مانای فەرموودەکەی: (ارْكَبُوهَا سَالِمَةً)، واتە: سواربوونێك پێی سەلامەت بێت و پەکی نەکەوێت. خوا زاناترە.




## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ أَنْ لَا يَقْتَصِرَ عَنْ حَاجَةٍ إِذَا رَكِبَ الدَّوَابَّ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُجَاوِزَ السَّائِرُ الْمَنَازِلَ، إِذَا كَانَتِ الْأَرْضُ مُخْصِبَةً، وَالْأَمْرِ بِإِمْكَانِ الرِّكَابِ عَنِ الرَّعْيِ فِي الْخِصْبِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ سَمَاعِ الْحَسَنِ مِنْ جَابِرٍ

٢٥٤٨- عن الحَسنِ يقول: حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ، فَأَمْكِنُوا الرِّكَابَ مِنْ أَسْنَانِهَا وَلَا تَتَجَاوَزُوا الْمَنَازِلَ، وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْجَدْبِ فَانْجُوا وَعَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ؛ فَإِنَّ الْأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ، وَإِذَا تَوَغَّلَتْكُمُ الْغِيلَانُ، فَبَادِرُوا بِالصَّلَاةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْمَعْرَسَ عَلَى جَوَادِ الطَّرِيقِ، وَالصَّلَاةَ عَلَيْهَا، فَإِنَّهَا مَأْوَى الْحَيَّاتِ وَالسِّبَاعِ وَقَضَاءِ الْحَاجَةِ عَلَيْهَا فَإِنَّهَا الْمَلَاعِنُ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بەوەی گەشتیار لە زەوی وشك و بێلەوەڕدا بارگە دانەنێت و پەلە بکات لە تێپەڕبوون بەنێویدا، وە فەرمانی کردووە بەوەی لە زەوی پڕ لە لەوەڕ و سەوزایی و ئاو بارگە دابنێت و پشوو بدات، ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە لەوەی حەسەن فەرموودەی بیستبێ لە جابرەوە

واتە: حەسەن دەڵێ: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ بۆی باس کردین وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ گەشتتان کرد بەنێو شوێنێکدا لەوەڕ و سەوزایی و ئاوی تێدا بوو، مافی وشترەکان بدەن با بلەوەڕێن، بەجوانترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، بەڵام لە مامەڵەکردنتان لەگەڵیان سنوور تێ مەپەڕێنن (بەوەی بەرژەوەندی خۆتان بەهۆیانەوە لەبیر بکەن)، وە کاتێ گەشتتان کرد بەنێو شوێنێکدا لەوەڕ و سەوزایی و ئاوی تێدا نەبوو، بەپەلە تێپەڕن بەنێویدا، هەروەها لە کۆتایی شەودا دەربچن، چونکە لە شەودا زەوی زوو دەبڕدرێ وەك لە ڕۆژ، وە کاتێ جنۆکە (لە دەشتایی لە کاتی گەشتکردن) وێنای خۆیانیان گۆڕی بە چەند شێوەیەك بۆ ئەوەی ڕێگاکەتان لێ ون بکەن (و لەناوتان بدەن)، ئەوە دەسپێشخەری بکەن بە نوێژکردن، دەخیلە دامەبەزنە سەر ڕێگا بە مەبەستی پشوودان و خەوتن، نوێژکردن تێیدا، چونکە

---

(١) إسناده ضعيف.

ئەوە جێگای مار و جڕوجانەوەر و مێرووی زیانبەخشە، هەروەها سەرئاویش لەسەر ڕێگا مەکەن چونکە نەفرینلێکراوە.

**٢٥٤٩-** عَنِ الحَسَنِ عَنِ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَتِ الْأَرْضُ مُخْصِبَةً، فَأَمْكِنُوا الرِّكَابَ، وَعَلَيْكُمْ بِالْمَنَازِلِ، وَإِذَا كَانَتْ مُجْدِبَةً فَاسْتَنْجُوا عَلَيْهَا وَعَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ؛ فَإِنَّ الْأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ، وَإِيَّاكُمْ وَقَوَارِعَ الطَّرِيقِ؛ فَإِنَّهُ مَأْوَى الْحَيَّاتِ وَالسِّبَاعِ، وَإِذَا رَأَيْتُمُ الْغِيلَانَ، فَأَذِّنُوا»[1].

واتە: حەسەن دەگێڕێتەوە لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ گەشتتان کرد بەنێو شوێنێکدا لەوەڕ و سەوزایی و ئاوی تێدا بوو، ئەوا مافی وشترەکان بدەن با بلەوەڕێن، بەجوانترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، وە بارگە دابنێن بۆ پشوودان (تا وشترەکانیش تێر بخۆن)، وە کاتێ (گەشتتان کرد) بەنێو شوێنێکدا لەوەڕ و سەوزایی و ئاوی تێدا نەبوو، بەپەلە تێپەڕن بەنێویدا، وە لە کۆتایی شەودا دەربچن بۆ گەشتکردن، چونکە لە شەودا زەوی زوو دەبڕدرێ وەك لە ڕۆژ، دەخیلە لەسەر ڕێگا بارگە مەخەن بۆ پشوودان، چونکە جێگای مار و جڕوجانەوەر و مێرووی زیانبەخشە، وە کاتێ جنۆکە (لە دەشتایی لە کاتی گەشتکردن) وێنای خۆیانیان گۆڕی بە چەند شێوەیەك بۆ ئەوەی ڕێگاکەتان لێ ون بکەن (و لەناوتان بدەن)، ئەوە بانگ بدەن.

## بَابُ صِفَةِ السَّيْرِ فِي الْخِصْبِ وَالْجَدْبِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِسُرْعَةِ السَّيْرِ فِي الْجَدْبِ كَيْ يَقْطَعَ الدَّوَابُّ الْمَرْكُوبَةِ السَّفَرَ بِنِقْيِهَا قَبْلَ تَعَجُّفِ، فَيَذْهَبُ نَقْيُ عِظَامِهَا مِنَ الْهُزَالِ وَالْعَجْفِ»

**٢٥٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأَعْطُوا الْإِبِلَ حَقَّهَا، وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ فَابْدُرُوا بِنِقْيِهَا، وَإِذَا عَرَّسْتُمْ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ، فَإِنَّهَا طَرِيقُ الدَّوَابِّ وَمَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ»[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**باسی چۆنییەتی ڕێکردن بە وشتر بەنێو شوێنێکی بێلەوەڕ و بێ ئاودا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمانی کرد بە زەوی وشك و بێلەوەڕ و سەوزایی بەپەلە ڕێ بە ئاژەڵەکان بکات بۆ ئەوەی ئاژەڵەکان مەودای ئەو گەشتە بەلەشساغییەوە ببڕن، پێش ئەوەی برسێتی لەڕ و لاوازی بکات، وە ئێسکەکەی بپووکێتەوە بەهۆی برسێتی و لەڕ و لاوازی**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گەشتتان کرد بەنێو شوێنێکدا لەوەڕ و سەوزایی و ئاوی زۆر بوو، ئەوە مافی وشترەکان بدەن، (سات سات پشوویان پێ بدەن با گژوگیا بخۆن و بلەوەڕێن)، وە ئەگەر گەشتتان کرد بەنێو شوێنێکدا سەوزایی و لەوەڕ و ئاوی تێدا نەبوو ئەوە پەلە بکەن زوو دەربچن لەو ناوچەیە، وە ئەگەر شەو دابەزین بۆ پشوودان دوور بکەونەوە لە ڕێگاوبان، چونکە ئەوە ڕێگای ئاژەڵەکان و جڕوجانەوەر و مێرووە زیانبەخشەکانە لە شەودا.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ ضَرْبِ الدَّوَابِّ عَلَى الْوَجْهِ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الضَّرْبَ عَلَى غَيْرِ الْوَجْهِ مُبَاحٌ

**٢٥٥١**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ، وَعَنِ الضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي أَخْبَارِ جَابِرٍ فِي قِصَّةِ الْبَعِيرِ الَّذِي ابْتَاعَهُ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: أَعْيَا جَمَلِي فَنَخَسَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِقَضِيبٍ أَوْ ضَرَبَهُ. دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ ضَرْبَ الدَّوَابِّ عَلَى غَيْرِ الْوَجْهِ مُبَاحٌ، خَرَّجْتُ تِلْكَ الْأَخْبَارَ فِي كِتَابِ الْبُيُوعِ.

**باسی سەرزەنشتکردن بە لێدان لە نێوچاوانی ئاژەڵان، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی لێدان لە جگە لە نێوچاو ڕێگەپێدراوە**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لە داخکردنی نێوچاوانی (مرۆڤ)، هەروەها لە لێدانی ڕوخساریش (جا مرۆڤ بێت یان هەر ئاژەڵێکی دیکە).

---

(١) صحیح.

ئەبو بەكر دەڵێ: لە فەرموودەكانی جابردا هاتووە دەربارەی چیرۆكی ئەو وشترەی كە فرۆشتی بە پێغەمبەر ﷺ وتی: وشترەكەم ماندوو بوو، پێغەمبەر ﷺ بە شوولێك ژەندی پێیەوە یان لێی دا. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لێدان لە جگە لە نێوچاوان ڕێگەپێدراوە، ئەو فەرموودانەم لە كتێبی (الْبُيُوعِ) كڕین و فرۆشتنەكاندا باس كردووە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ رُكُوبِ الْجَلَّالَةِ مِنَ الدَّوَابِّ الْمَرْكُوبَةِ

**٢٥٥٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهَى عَنِ الشُّرْبِ مِنْ فِيِّ السِّقَا، وَعَنْ رُكُوبِ الْجَلَّالَةِ، وَالْمُجَثَّمَةِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يُرِيدُ وَنَهَى عَنِ الْمُجَثَّمَةِ، وَالْمُجَثَّمَةُ هِيَ الْمَصْبُورَةُ الَّتِي تُرْبَطُ فَتُرْمَى حَتَّى تُقْتَلَ، قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي كِتَابِ الْأَطْعِمَةِ أَوْ كِتَابِ الْجِهَادِ، وَإِخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُقْتَلَ شَيْءٌ مِنَ الدَّوَابِّ صَبْرًا.

## باسی سەرزەنشتكردن لە سواربوونی ئاژەڵی پیسخۆر لەو ئاژەڵانەی بۆ سواری بەكار دێن

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كرد لە خواردنەوە لە دەمی كونە یان مەشكە یان جەوەنە، وە لە سواربوونی ئاژەڵی پیسخۆر و كوشتن بەلەسەرخۆیی.

ئەبو بەكر دەڵێ: مەبەستی لە (وَنَهَى عَنِ الْمُجَثَّمَةِ)، (الْمُجَثَّمَة): بریتییە لەو گیانلەبەرەی كە دەبەسترێتەوە تیرباران دەكرێ تا بەلەسەرخۆیی دەكوژرێ، لە كتێبی خواردن و خواردنەوەكان یان كتێبی جیهاد باسم كرد، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە لەبارەی ئەوەی كە قەدەغەی كردووە لەوەی هیچ شتێك لە ئاژەڵان بەلەسەرخۆیی بكوژرێ.

تێبینی: (الْجَلَّالَةُ): بریتییە لەو ئاژەڵەی زۆربەی ئەو ئالـفەی پێی دەدرێت پیس بێت، پێدانی خواردنی پیس بە ئاژەڵ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ صُحْبَةِ الرُّفْقَةِ الَّتِي يَكُونُ فِيهَا الْكَلْبُ أَوِ الْجَرَسُ إِذِ الْمَلَائِكَةِ لَا تَصْحَبُهَا

**٢٥٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَا تَصْحَبُ رُفْقَةً فِيهَا جَرَسٌ أَوْ فِيهَا كَلْبٌ»[١].

## باسی سەرزەنشتكردن لە هاوەڵی كاروانییەك سەگ یان زەنگڵەی تێدا بێت، چونكە فریشتەی ڕەحمەت هاوڕێیەتی ئەو كاروانییە ناكات

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەكان (ی ڕەحمەت) هاوەڵی كاروانییەك ناكەن زەنگڵەی تێدا بێت یان سەگ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَلَائِكَةَ لَا تَصْحَبُ رُفْقَةً فِيهَا جَرَسٌ إِذِ الْجَرَسُ مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ

**٢٥٥٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْجَرَسُ مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فریشتەكانی ڕەحمەت هاوەڵی كاروانییەك ناكەن زەنگڵەی تێدا بێت، چونكە زەنگڵە زوڕنای شەیتانە

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەنگ زوڕنای شەیتانە (چونكە دەنگەكەی مرۆڤ سەرقاڵ دەكات بیری یادی خوای نامێنێت).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الدُّلْجَةِ بِاللَّيْلِ إِذِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَطْوِي الْأَرْضَ بِاللَّيْلِ، فَيَكُونُ السَّيْرُ بِاللَّيْلِ أَقْطَعَ لِلسَّفَرِ

**٢٥٥٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ فَإِنَّ الْأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی چاکتر وایە مرۆڤ لە گەشتکردنیدا بە شەو ڕێ بکات، چونکە خوا بە شەو زەوی دەپێچێتەوە، بۆیە ڕێکردن لە شەودا مەوداکە زووتر دەبڕێ**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەست بگرن بە شەوڕەوی (لە گەشتەکانتاندا)، چونکە بەڕاستی زەوی بە شەو دەپێچرێتەوە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ التَّعْرِيسِ عَلَى جَوَادِّ الطَّرِيقِ

**٢٥٥٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَرَّسْتُمْ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ، فَإِنَّهَا طَرِيقُ الدَّوَابِّ وَمَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ»[١].

**باسی سەرزەنشتکردن لە دابەزینی کاروانی بۆ پشوودان لەسەر ڕێگاوبان**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شەو دابەزین بۆ پشوودان دوور بکەونەوە لە ڕێگاوبان، چونکە ئەوە ڕێگای ئاژەڵەکان و جڕوجانەوەر و مێرووە زیانبەخشەکانە لە شەودا.

**٢٥٥٧-** عَنْ سُهَيْلٍ ﷺ بِمِثْلِهِ وَقَالَ: «إِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْلِ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ؛ فَإِنَّهُ مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ»[٢].

واتە: سوهەیل ﷺ دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی دیکە، وە فەرمووی: ئەگەر شەو دابەزین بۆ پشوودان دوور بکەونەوە لە ڕێگاوبان، چونکە ئەوە جێگای جڕوجانەوەر و مێرووە زیانبەخشەکانە لە شەودا.

## بَابُ صِفَةِ النَّوْمِ فِي الْعُرْسِ

**٢٥٥٨-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا عَرَّسَ بِلَيْلٍ اضْطَجَعَ عَلَى يَمِينِهِ، وَإِذَا عَرَّسَ قُبَيلَ الصُّبْحِ نَصَبَ ذِرَاعَيْهِ نَصْبًا، وَوضَعَ رَأْسَهُ عَلَى كَفَّيْهِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی چۆنییەتی خەوتن لە دابەزینی گەشتیار بۆ پشوودان

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە شەودا دابەزیبایە بۆ پشوودان، بەلای ڕاستیدا ڕائەکشا، کاتێکیش نزیك بەرەبەیان دابەزیبایە بۆ پشوودان هەردوو باڵی دادەنا و سەری دەخستە سەر هەدوو لەپی دەستی.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ سَيْرِ أَوَّلِ اللَّيْلِ

٢٥٥٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَقِلُّوا الْخُرُوجَ إِذَا هَدَأَتِ الرِّجْلُ، إِنَّ اللَّهَ يَبُثُّ فِي لَيْلِهِ مِنْ خَلْقِهِ مَا شَاءَ»[١].

## باسی شەوڕەویکردنی سەرەتای شەو کەڕاهەتی هەیە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەرچوونتان کەم بکەنەوە کاتێ کە قاچەکان لە ڕێکردن دەکەون (واتە: کاتێ خەڵکی لە سەرەتای شەو دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، ئێوەیش پشوو بدەن و گەشتەکانتان ڕابگرن)، چونکە بەڕاستی خوا لە شەودا هەندێك لە دروستکراوەکانی بڵاوە پێ دەکات بەویستی خۆی (جا ئەگەر لەو کاتەدا دەرچوون یان ئازاریان دەدەن یان ئازارتان دەدەن، بۆیە چاکتر وایە لە سەرەتای شەو دەرنەچن، بەڵام ئەگەر پێویست بوو هەر دەربچن ئەوە ڕێگەدراوە، خوا زاناترە).

## بَابُ ذِكْرِ تَوْقِيتِ أَوَّلِ اللَّيْلِ الَّذِي كُرِهَ الِانْتِشَارُ وَالْخُرُوجُ فِيهِ

٢٥٦٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَكُفُّوا مَوَاشِيَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ مِنْ عِنْدِ غُرُوبِ الشَّمْسِ إِلَى أَنْ تَذْهَبَ». قال لَنَا يُوسُفُ: فَحْوَةُ الْعِشَاءِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذَا - عِلْمِي - تَصْحِيفٌ، إِنَّمَا هُوَ فَجْوَةُ الْعِشَاءِ اشْتَدَّ الظَّلَامُ.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

### باسی دیاریکردنی یەکەم کاتی شەو کە بڵاوبوونەوە و دەرچوون تیایدا کەراهەتی هەیە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێگری بکەن لە دەرچوونی مەڕومالات و ماڵ و منداڵەکانتان لە کاتی خۆرئاوابوون تا دەڕوات، یوسف (کە شێخی ئەبو بەکر ئیبنو خوزەیمەیە) پێیانی وت: (فَحْوَةُ الْعِشَاءِ).

ئەبو بەکر وتی: پێم وایە ئەوە (تَصْحِيفٌ)ە، بەڵکوو ئەوە (فَجْوَةُ الْعِشَاءِ) واتە: تاریکایی شەو.

### بَابُ وَصِيَّةِ الْمُسَافِرِ بِالتَّكْبِيرِ عِنْدَ صُعُودِ الشَّرَفِ وَالتَّسْبِيحِ عِنْدَ الْهُبُوطِ

**٢٥٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُرِيدُ سَفَرًا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْصِنِي قَالَ: «أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ»، فَلَمَّا مَضَى قَالَ: «اللَّهُمَّ ازْوِ لَهُ الْأَرْضَ وَهَوِّنْ عَلَيْهِ السَّفَرَ»[١].

### باسی ئامۆژگاریکردنی گەشتیار بە تەکبیر (الله أكبر) کردن لە کاتی سەرکەوتن بە بەرزاییدا، وە (سبحان الله) کردن لە کاتی دابەزین

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی سەفەرکردن بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ئامۆژگاریت دەکەم بە لەخواترسان، وە تەکبیر (الله أكبر) کردن کاتێ سەر دەکەوی بەسەر هەر بەرزاییەکدا، کاتێ کە ڕۆیشت فەرمووی: خوایە زەوی بۆ کورت بکەیتەوە و گەشتەکەی لەسەر ئاسان بکەی.

**٢٥٦٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا، وَإِذَا هَبَطْنَا سَبَّحْنَا[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێ سەر بکەوتباین بەسەر کێوێکدا، تەکبیرمان دەکرد، کاتێکیش دابەزیباین (سبحان الله)مان دەکرد.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ خَفْضِ الصَّوْتِ بِالتَّكْبِيرِ عِنْدَ صُعُودِ الشَّرَفِ فِي الْأَسْفَارِ

**٢٥٦٣-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزَاةٍ، فَلَمَّا أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَكَبَّرُوا تَكْبِيرَةً فَرَفَعُوا بِهَا أَصْوَاتَهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَصَمَّ، وَلَا غَائِبٍ وَهُوَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ رَأْسِ رَوَاحِلِكُمْ»[١].

## باسی چاکتر وایە بۆ بەندە لە گەشتەکانیدا کاتێ سەر دەکەوێ بەسەر کێوێکدا بەدەنگی نزم تەکبیر بکات

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە غەزایەکدا، کاتێ سەر کەوتینە سەر بەرزاییەکانی مەدینە، (الله أكبر)یکیان کرد دەنگیان بەرز کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی پەروەردگارتان نە کەڕ و نە پەنهانە، ئەو (بە زانستی) لە نێوانتانداية و نزیکترە لە زین و کورتانی وشترەکانتان.

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ عِنْدَ تَعْرِيسِ النَّاسِ بِاللَّيْلِ

**٢٥٦٤-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ظَبْيَانَ، رَفَعَهُ إِلَى أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ، وَثَلَاثَةٌ يُبْغِضُهُمُ اللَّهُ، أَمَّا الَّذِينَ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ، فَقَوْمٌ سَارُوا لَيْلَتَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ النَّوْمُ أَحَبَّ إِلَى أَحَدِهِمْ مِمَّا يَعْدِلُ بِهِ نَزَلُوا فَوَضَعُوا رُءُوسَهُمْ، فَقَامَ يَتَمَلَّقُنِي، وَيَتْلُو آيَاتِي». فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی شەونوێژ لە کاتی دابەزینی گەشتیار بۆ پشوودان

واتە: زەیدی کوڕی زەبیان، ڕەفعی کردووە بۆ لای ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن خوا خۆشی دەوێن، سیانی دیکەش خوا ڕقی لێیانە، جا ئەوانەی کە خوا خۆشی دەوێن: خەڵکێك شەوڕەوی بکەن هەتا وایان لێ دێت خەو لەلای هەر یەکێکیان خۆشەویستتر دەبێت لە بەرانبەر ئەوەی بیدات،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح من غير هذا الطريق.

داببەزن بۆ پشوودان و سەریان دابنێن بۆ ئەوەی بخەون، کەسێك لەنێویاندا هەستێت بپاڕێتەوە لێم و ئایەتەکانم بخوێنێتەوە. وە فەرمووده‌کەی باس کرد.

## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ رُؤْيَةِ الْقُرَى اللَّوَاتِي يُرِيدُ الْمَرْءُ دُخُولَهَا

٢٥٦٥- عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَرْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ كَعْبًا ﷺ، حَدَّثَهُ، أَنَّ صُهَيْبًا صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَرَ قَرْيَةً يُرِيدُ دُخُولَهَا إِلَّا قَالَ حِينَ يَرَاهَا: «اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ، وَرَبَّ الْأَرَضِينَ وَمَا أَقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينَ وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَيْنَ، فَإِنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ، وَخَيْرَ أَهْلِهَا وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أَهْلِهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا»[1].

## باسی پاڕانەوە لە کاتی بینینی ئەو شارەی کە دەیەوێ بچێتە نێوی

واتە: عەتائی کوڕی ئەبو مەڕوان لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، کەعب ﷺ بۆی باس کرد، صوهەیب هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کرد، پێغەمبەر ﷺ هەر گوندێکی ببینیایە و بیویستایە بچێتە نێویەوە، کاتێ کە دەیبینی دەیفەرموو: خوای پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و هەموو ئەوەی سێبەری بۆ دەکات (لە ئەستێرە و مانگ و خۆر و زەوی) وە پەروەردگاری حەوت چینەکەی زەوی و ئەوەی لەسەر پشتی خۆی هەڵگرتووە (لە دروستکراوەکان)، پەروەردگاری شەیتانەکان و ئەوانەی گومڕایان کردوون، پەروەردگاری باکان و ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن، ئێمە داوای خێر و چاکەی ئەم گوندە دەکەین لە مانەوە بەسەلامەتی تیایدا و چاکەی خەڵکەکەی (لە ئیمان و دامەزراوی و یارمەتیدانیان لەسەر خێر و کۆبوونەوەیان لەگەڵ زانا و پیاوچاکان و ناسیاوان) و پەنات پێ دەگرین لە خراپەکەی و خراپەی خەڵکەکەی و خراپەی ئەوەی تیایەتی.

---

(١) إسناده حسن بشواهده.

## بَابُ الِاسْتِعَاذَةِ عِنْدَ نُزُولِ الْمَنَازِلِ

**٢٥٦٦-** عَن خَوْلَةَ بِنْتَ حَكِيمِ السُّلَمِيَّةَ ﵂ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ نَزَلَ مَنْزِلًا»، ثُمَّ قَالَ: «أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ، حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ»[١].

## باسی پەناگرتن بە خوا لە کاتی دابەزین بۆ جێگایەك

واتە: خەولەی کچی حەکیمی سولەمیە ﵂ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دابەزیە جێگایەك (بۆ پشوودان) پاشان وتی: پەنا دەگرم بە وتە تەواوە (بێکەموکوڕی و شیفادەرە)کانی خوای گەورە لە خراپەی ئەوەی دروستی کردووە، ئەوە هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێ، هەتا ئەو جێگایە بەجێ دەهێڵێ.

**٢٥٦٧-** عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَشَجِّ بِهَذَا الْإِسْنَادِ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: یەعقوبی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەشەج دەگێڕێتەوە، بەم سەنەدە بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو.

## بَابُ تَوْدِيعِ الْمَنَازِلِ بِالصَّلَاةِ

**٢٥٦٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَنْزِلُ مَنْزِلًا إِلَّا وَدَّعَهُ بِرَكْعَتَيْنِ[٣].

## باسی بەجێهێشتنی شوێنەکان بە نوێژکردن

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دانەدەبەزیە هیچ جێگایەك ئیللا بە دوو ڕکات نوێژ بەجێی دەهێشت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف جدا.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ سَيْرِ الْوَحْدَةِ بِاللَّيْلِ

**٢٥٦٩-** عن ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَال: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مِنَ الْوَحْدَةِ مَا أَعْلَمُ لَمْ يَسِرِ الرَّاكِبُ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ أَبَدًا»[١].

### باسی قەدەغەکردن لە دەرچوون بەتەنھا لە شەودا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی بیانزانیبایە چی لە تەنھاییدا ھەیە ھەرگیز سوار لە شەودا بەتەنھا دەرنەدەچوو.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ سَيْرِ الاِثْنَيْنِ ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَا دُونَ الثَّلَاثِ مِنَ الْمُسَافِرِينَ فَهُمْ عُصَاةٌ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الْوَاحِدَ شَيْطَانٌ، وَالاِثْنَانِ شَيْطَانَانِ، وَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ مَعْنَى قَوْلِهِ: شَيْطَانٌ أَوْ عَاصِي، كَقَوْلِهِ شَيَاطِينَ أَوْ عَاصِي، كَقَوْلِهِ شَيَاطِينَ الْإِنْسِ وَالْجِنِّ، وَمَعْنَاهُ: عُصَاةُ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ.

**٢٥٧٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَاحِدُ شَيْطَانٌ وَالاِثْنَانِ شَيْطَانَانِ، وَالثَّلَاثَةُ رَكْبٌ»[٢].

### باسی قەدەغەکردن لە گەشتکردن بە دوو کەسەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی گەشتیاران ئەگەر کەمتر بن لە سێ کەس ئەوە سەرپێچیکارن، چونکە پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندووە یەك کەس شەیتانە، دوو کەس دوو شەیتانن، پێدەچی مانای فەرموودەکەی: شەیتان، یان سەرپێچیکەر، ھەر وەکوو فەرمایشتەکەی بێت: (شَيَاطِينَ الْإِنْسِ وَالْجِنِّ)، مانای ئەوەیە: سەرپێچیکەرانی جنۆکە و مرۆڤ

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەك کەس شەیتانە، دوو کەسیش شەیتانە، سێ کەسیش کاروانییە. (واتە: گەشتکردن بەتەنھا لەسەر زەویدا لە کردەوەی شەیتانە،

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

هەروەها دوو کەسیش، بەڵام گەشتکردن بە سێ کەسەوە کاروانییە، چونکە کەس ناتوانێ تەماحیان تێ بکات).

## بَابُ دُعَاءِ الْمُسَافِرِ عِنْدَ الصَّبَاحِ

**٢٥٧١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ فَبَدَا لَهُ الْفَجْرُ قَالَ: «سَمِعَ سَامِعٌ بِحَمْدِ اللَّهِ وَنِعْمَتِهِ وَحُسْنِ بَلَائِهِ عَلَيْنَا، رَبَّنَا صَاحِبْنَا، فَأَفْضِلْ عَلَيْنَا سِتْرًا بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ»، يَقُولُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ يَرْفَعُ صَوْتَهُ[١].

## باسی پاڕانەوەی گەشتیار لە کاتی بەرەبەیان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەشتی بکردایە و بگەیشتایەتە بەرەبەیان، دەیفەرموو: با ئەوەی خاوەن بیستنە (وتەکەی ئێمە) ببیسێت و (بیگەیەنێت بە جگە لە خۆی) بەوەی ئێمە ستاییشی خوامان کرد لەسەر چاکی نیعمەتەکانی لەسەرمان، پەروەردگارمان خاوەنمانە، بە فەزڵ و چاکەی بێپایانت بمانپارێزە لە ئاگر. سێ جار ئەوەی دەفەرموو: دەنگی بەرز دەکردەوە.

## بَابُ صِفَةِ الدُّعَاءِ بِاللَّيْلِ فِي الْأَسْفَارِ

**٢٥٧٢**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا غَزَا أَوْ سَافَرَ فَأَدْرَكَهُ اللَّيْلُ قَالَ: «يَا أَرْضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللَّهُ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ، وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ، وَشَرِّ مَا دَبَّ عَلَيْكِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ كُلِّ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ وَحَيَّةٍ وَعَقْرَبٍ مِنْ سَاكِنِي الْبَلَدِ، وَمِنْ شَرِّ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ»[٢].

## باسی چۆنێتی پاڕانەوە لە گەشتەکاندا بە شەو

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ غەزای بکردایە یان گەشتی بکردایە و شەوی بەسەردا بهاتایە، دەیفەرموو: ئەی زەوی

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

پەروەدگارم پەروەردگاری تۆیشە، پەنا دەگرم بە خوا لە شەڕی تۆ و شەڕی ئەوەیشی لەنێو تۆدایە، وە شەڕی ئەوەیشی لەنێو تۆدا دروست کراوە، هەروەها شەڕی ئەوەیشی بەسەر تۆدا ڕێ دەکات، پەنا دەگرم بە خوا لەشەڕی هەموو شێر و ماری مەزن و مارەکانی دیکە و دووپشکی نیشتەجێی ئەم شوێنە، وە لەشەڕی شەیتان و نەوەکانیشی.

## بَابُ تَقْلِيدِ الْبُدْنِ وَإِشْعَارِهَا عِنْدَ السُّوقِ

**٢٥٧٣**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِيَدِيَّ هَاتَيْنِ[١].

## باسی ملوانکەکردنی ملی وشتر و برینداركردنی لە بازاڕ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: بە هەردوو دەستی خۆم ملوانکەی ملی ئاژەڵە قوربانییەکانم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهۆنییەوە.

تێبینی: (الهَدْيِ): بریتییە لە هەر یەك لەو ئاژەڵانە وشتر و مانگا و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و بزنە، بە دیاری دەنێردرێ بۆ کەعبە، بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خوا، لەوێ دەکرێ بە قوربانی بۆ ئەوەی خەڵکی هەژار و نەدار سوود لە گۆشتەکەی وەربگرن.

**٢٥٧٤**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَلَّدَ هَدْيَهُ وَأَشْعَرَهُ[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ملوانکەی دەکردە ملی ئاژەڵی هەدیەی و برینەی دەکرد.

## بَابُ إِشْعَارِ الْبُدْنِ فِي شَقِّ السَّنَامِ الْأَيْمَنِ وَسَلْتِ الدَّمِ عَنْهَا، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ إِشْعَارَ الْبُدْنِ مُثْلَةٌ، فَسَمَّى سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ مُثْلَةً بِجَهْلِهِ

**٢٥٧٥**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ، وَأَمَرَ بِبُدْنِهِ أَنْ تُشْعَرَ مِنْ شِقِّهَا الْأَيْمَنِ، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ وَسَلَتَ عَنْهَا الدَّمَ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی بریندارکردنی وشتر وەکوو دیاریکردن لە لای چڵەپۆپەی ڕاستی و خوێن لێ دەرهێنانی، دژی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات بریندارکردنی وشتر شێواندنە، جا ئەو کەسە سوننەتی پێغەمبەری ﷺ ناو ناوە بە شێواندن بەهۆی نەفامییەوە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد و فەرمانیشی کرد لای ڕاستی وشترەکانی بریندار بکرێن، (وەکوو دیاریکردن بەمەبەستی ئەوەی بیکاتە هەدیە و قوربانی)، هەروەها دوو نەعلیشی کردە ملی و خوێنیشی لە لای ڕاستی دەرهێنا.

**٢٥٧٦-** عَنْ قَتَادَةَ ﷺ بِهَذَا الْإِسْنَادِ نَحْوَهُ، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَشْعَرَ الْهَدْيَ فِي شِقِّ السَّنَامِ الْأَيْمَنِ[١].

واتە: قەتادە ﷺ بەهەمان سەنەد دەگێڕێتەوە، هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو، ئەوە نەبێت ئەو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لای چڵەپۆپەی ڕاستی وشتری دیاری کرد ( وەك دیاریکردن بۆ قوربانی).

## بَابُ الْهَدْيِ إِذَا عَطِبَ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَ مَحِلَّهُ

**٢٥٧٧-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَاجِيَةُ الْخُزَاعِيُّ ﷺ، صَاحِبُ بُدْنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ أَصْنَعُ بِمَا عَطِبَ مِنْ بُدْنِي؟ فَأَمَرَنِي أَنْ أَنْحَرَ كُلَّ بَدَنَةٍ عَطِبَتْ، ثُمَّ يُلْقَى نَعْلُهَا فِي دَمِهَا ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ فَيَأْكُلُونَهَا[٢].

## باسی ئاژەڵی قوربانی کە بەدیاری دەنێردرێ بۆ کەعبە، ئەگەر لە ڕێگا پەکی کەوت و نەیتوانی بگاتە شوێنی مەبەست

واتە: هیشامی کوڕی عوڕوە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: ناجیەی خوزاعی ﷺ بۆی باس کردم، (جوندوبی کوڕی کەعب) سەرپەرشتیاری وشترەکانی پێغەمبەری

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ﷺ دەکرد، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: چی بکەم لەو وشترانەی پەکیان دەکەوێ لە ڕێگا؟ فەرمانی پێ کردم هەر وشترێك پەکی کەوت سەری ببڕم، پاشان نەعلەکەی ملی بخرێتە نێو خوێنەکەی (بۆئەوەی دەوڵەمەندەکان لێی نەخۆن)، پاشان خەڵك ئازاد بکرێ لێی بخۆن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ أَكْلِ سَائِقِ الْبُدْنِ وَأَهْلِ رُفْقَتِهِ مِنْ لَحْمِهَا إِذَا عَطِبَتْ وَنُحِرَتْ

**٢٥٧٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّ ذُؤَيْبًا أَبَا قَبِيصَةَ الْخُزَاعِيَّ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ مَعَهُ بِبُدْنِهِ، فَقَالَ: «إِنْ عَطِبَ عَلَيْكَ شَيْءٌ مِنْهَا فَانْحَرْهَا وَاغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِ جَوْفِهَا، وَلَا تَأْكُلْ مِنْهَا أَنْتَ وَلَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رِفْقَتِكَ»[1].

**باسی سەرزەنشتکردنی سەرپەرشتیاری وشتری هەدی و قوربانی ئەوانەشی هاوەڵی دەکەن، لە ڕێگا لە گۆشتەکەی بخۆن، ئەگەر پەکی کەوت و سەریان بڕی**

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، زوئەیب کە ئەبو قەبیصەی خوزاعییە بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشترێکی هەدی لەگەڵیدا نارد (بۆ کەعبە، بەمەبەستی قوربانیکردن)، فەرمووی: ئەگەر یەکێکیان پەکی کەوت و نەیتوانی ڕێ بکات سەری ببڕە، پاشان ئەو نەعلەی لە ملیدایە بیخەرە نێو خوێنەکەی (بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان لێی نەخۆن) خۆت لێی مەخۆ، هەروەها هیچ یەکێك لەوانەیش هاوەڵیت دەکەن.

## بَابُ إِيجَابِ إِبْدَالِ الْهَدْيِ الْوَاجِبِ إِذَا ضَلَّتْ - إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ - وَلَا أَخَالُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرٍ الْأَسْلَمِيِّ

**٢٥٧٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَهْدَى تَطَوُّعًا ثُمَّ ضَلَّتْ، فَإِنْ شَاءَ أَبْدَلَهَا، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ، وَإِنْ كَانَتْ فِي نَذْرٍ فَلْيُبْدِلْ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسی واجببوونی گۆڕینی هەدی واجب، ئەگەر گوم بوو، -ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت- پێموا نییە بەو شێوە بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی عەبدوڵای کوڕی عامری ئەسلەمی (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە)**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس وشترێك بەهەدی بنێرێت (بۆ کەعبە) پاشان گوم بێت، ئەگەر ویستی بیگۆڕێت، وە ئەگەر ویستی وازی لێ بێنێت، بەڵام ئەگەر نەزری کردبوو، ئەوە با بیگۆڕیت بە دانەیەکی دیکە.

٢٥٨٠- عَنْ عَطَاءٍ عَنْ أَبِي الخَلِيلِ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَاقَ هَدْيًا تَطَوُّعًا فَعَطِبَ فَلَا يَأْكُلْ مِنْهُ؛ فَإِنَّهُ إِنْ أَكَلَ مِنْهُ كَانَ عَلَيْهِ بَدَلُهُ، وَلَكِنْ لِيَنْحَرْهَا، ثُمَّ يَغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ يَضْرِبْ فِي جَنْبِهَا وَإِنْ كَانَ هَدْيًا وَاجِبًا، فَلْيَأْكُلْ إِنْ شَاءَ؛ فَإِنَّهُ لَا بُدَّ مِنْ قَضَائِهِ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْحَدِيثُ مُرْسَلٌ بَيْنَ أَبِي الْخَلِيلِ، وَأَبِي قَتَادَةَ رَجُلٌ.

واتە: عەتا دەگێڕێتەوە، لە ئەبو خەلیل، لە ئەبو قەتادەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ئاژەڵی هەدی وەکوو سوننەت لێبخوڕێ و (بیبات بۆ کەعبە)، دواتر ئاژەڵەکە (لە ڕێگا) پەکی کەوت، با لێی نەخوات، چونکە ئەگەر لێی خوارد ئەوە دەبێت لەجیاتی دانەیەکی دیکە دابنێت، بەڵکوو سەری ببڕێت، پاشان نەعلەکەی نوقم بکات لەنێو خوێنەکەیدا، پاشان بیدات لە تەنیشتەکانی، وە ئەگەر هەدیەکی واجب بوو، ئەگەر ویستی با لێی بخوات، چونکە هەر دەبێ قەزای بکاتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە (مُرْسَل)ە، لە نێوان ئەبو خەلیل و ئەبو قەتادە پیاوێك هەیە کە ناوی نەهاتووە.

## بَابُ التَّطَيُّبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ كَرِهَ ذَلِكَ، وَخَالَفَ سُنَّةَ النَّبِيِّ ﷺ

٢٥٨١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ بِيَدَيْهَا: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی خۆبۆنخۆشکردن لە کاتی ئیحرامبەستن، دژی وتەی ئەو کەسەی ئەوەی پێ باش نییە، وە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری ﷺ کردووە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: عائیشەم ﵂ بینی بە دەستی ئاماژەی دەکرد و دەیوت: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد بۆ ئیحرامبەستنی کاتێ کە ویستی ئیحرام ببەستێت و کاتێکیش کە شکاندی پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات.

**٢٥٨٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، سَمِعَ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ، وَبَسَطَتْ يَدَيْهَا: إِنِّي طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِيَدِيَّ هَاتَيْنِ لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ حِينَ أَحْرَمَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْعَرَبَ تَقُولُ إِذَا فَعَلْتَ كَذَا تُرِيدُ إِذَا أَرَدْتَ فِعْلَهُ، وَعَائِشَةُ إِنَّمَا أَرَادَتْ أَنَّهَا طَيَّبَتِ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ أَرَادَ الْإِحْرَامَ لَا بَعْدَ الْإِحْرَامِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ مَا ذَكَرْتُ، خَبَرُ مَنْصُورِ بْنِ زَاذَانَ الَّذِي ذَكَرْتُ فِي الْبَابِ الَّذِي يَلِي هَذَا مَعَ الْأَخْبَارِ الَّتِي خَرَّجْتُهَا فِي الْكِتَابِ الْكَبِيرِ.

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، گوێی لە عائیشە بوو ﵂ دەیوت، هەردوو دەستی کردەوە: بێگومان بەم دوو دەستەی خۆم پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد بۆ ئیحرامبەستنی کاتێ کە ویستی ئیحرام ببەستێت و کاتێکیش کە شکاندی پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە (حِينَ أَحْرَمَ)، واتە: کاتێ ئیحرامی بەست، لەو شێوازەیە کە دەڵێین: بێگومان عەرەب دەڵێ: (إِذَا فَعَلْتَ كَذَا)، واتە: ئەگەر ئەوەت کرد، مەبەستی: (إِذَا أَرَدْتَ فِعْلَهُ)، واتە: ئەگەر ویستت ئەو کردەوە بکەی، وە عائیشە مەبەستی ئەوە بوو: ئەو پێغەمبەری ﷺ بۆنخۆش کرد کاتێ ویستی ئیحرام ببەستێ نەك دوای ئیحرام، بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەوەی باسمان کرد، فەرموودەکەی مەنصوری کوڕی زازانە کە لە بەشەکەی دوای ئەم بەشە دێت باسم کردووە، لەگەڵ ئەو فەرموودانەی لە کتێبی (الْكِتَابِ الْكَبِيرِ) تەخریجم کردووە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّطَيُّبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ بِالْمِسْكِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمِسْكَ طَاهِرٌ غَيْرُ نَجِسٍ، لَا عَلَى مَا زَعَمَ بَعْضُ التَّابِعِينَ أَنَّهُ مَيْتَةٌ نَجِسٌ، زَعَمَ أَنَّهُ سَقَطَ مِنْ حَيٍّ وَهُوَ مَيِّتٌ نَجِسٌ»

٢٥٨٣- عَنِ الْقَاسِمِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: طَيَّبْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ وَيَوْمَ النَّحْرِ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ بِطِيبٍ فِيهِ مَسْكٌ[1].

## باسی مۆڵەتدان بە بەكارهێنانی میسك لە كاتی ئیحرام، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی میسك پاكە و پیس نییە، نەك وەكوو هەندێ لە تابعییەكان وا گومان دەبات میسك پیسە، پێی وایە لە شتێكی زیندوو كەوتووەتە خوارەوە لە كاتێكدا خۆی مردووە بۆیە پیسە

واتە: قاسم دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: پێغەمبەرم ﷺ بۆنخۆش كرد پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێت، وە ڕۆژی قوربانیش پێش ئەوەی تەوافی بەیت بكات، بە بۆنێك میسكی تێدا بوو.

٢٥٨٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ أَطْيَبَ طِيبِكُمُ الْمِسْكُ». دَلَالَةٌ وَاضِحَةٌ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ نَجِسٌ[2].

واتە: ئەبو سەعید ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خۆشترینی بۆنەكانتان بۆنی میسكە. بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر دژی وتەی ئەو كەسەی وا گومان دەبات میسك پیسە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّطَيُّبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ بِطِيبٍ يَبْقَى أَثَرُهُ عَلَى الْمُتَطَيِّبِ فِي الْإِحْرَامِ

٢٥٨٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە خۆبۆنخۆشکردن لە کاتی ئیحرام بە بۆنێك شوێنەوارەکەی بمێنێتەوە لەسەر ئەو کەسەی بۆنی خۆشی بەکار هێناوە لە ئیحرامدا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای بریقەی بۆنە خۆشەکە بکەم لە نێوەڕاستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیحرامیشدا بوو.

٢٥٨٦- عَنِ الْأَسْوَدِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: لَقَدْ رَأَيْتُ الطِّيبَ فِي مَفَارِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِنَّهُ لَيُلَبِّي[١].

واتە: ئەسوەد دەڵێ: عائیشە ﵂ دەڵێ: بەڕاستی بۆنی خۆشم بینی لە نێوەڕاستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا تەلبیەی دەکرد.

٢٥٨٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای بریقەی بۆنە خۆشەکە بکەم لە نێوەڕاستی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیحرامیشدا بوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاغْتِسَالِ بَعْدَ التَّطَيُّبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ مَعَ اسْتِحْبَابِ جِمَاعِ الْمَرْءِ امْرَأَتَهُ إِذَا أَرَادَ الْإِحْرَامَ كَيْ يَكُونَ أَقَلَّ شَهْوَةٍ لِجِمَاعِ النِّسَاءِ فِي الْإِحْرَامِ، إِذَا كَانَ حَدِيثَ عَهْدٍ بِجِمَاعِهِنَّ

٢٥٨٨- عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْمُنْتَشِرِ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ ﵄ عَنِ الطِّيبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ، فَقَالَ: لَأَنْ أَتَطَيَّبَ بِقَطِرَانٍ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَفْعَلَ ذَلِكَ قَالَ: فَذَكَرْتُهُ لِعَائِشَةَ، فَقَالَتْ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَيَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ، ثُمَّ يُصْبِحُ مُحْرِمًا يَنْضَحُ طِيبًا. سَمِعْتُ الرَّبِيعَ يَقُولُ: سُئِلَ الشَّافِعِيُّ عَنِ الذُّبَابَةِ تَقَعُ عَلَى النَّتْنِ، ثُمَّ تَطِيرُ فَتَقَعُ عَلَى ثَوْبِ الْمَرْءِ، فَقَالَ الشَّافِعِيُّ: يَجُوزُ أَنْ تَيْبَسَ أَرْجُلُهَا فِي طَيَرَانِهَا، فَإِنْ كَانَ كَذَلِكَ، وَإِلَّا فَالشَّيْءُ إِذَا ضَاقَ اتَّسَعَ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی چاکتر وایە بۆ بەندە دوای بەکارهێنانی بۆنی خۆش خۆی بشوات، لە کاتی ئیحرامبەستندا، لەگەڵ ئەوە چاکتر وایە بەندە لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت بێت کاتێ ویستی ئیحرام ببەستێت، بۆ ئەوەی کەمترین ئارەزووی هەبێت بۆ جووتبوون لەگەڵ ئافرەتان لە ئیحرامدا، ئەگەر تازە جووت بوو لەگەڵیان**

واتە: ئیبراهیمی کوڕی مونتەشیر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، ئەو پرسیاری کرد لە ئیبنو عومەر ﷺ، لە بەکارهێنانی بۆنی خۆش لە کاتی ئیحرامبەستندا، وتی: ئەگەر ڕەشم بکەن بە قیر لەوە پێم خۆشترە بۆنی خۆش بدەم لە خۆم، وتی: ئەوەم باس کرد بۆ عائیشە، وتی: خوا ڕەحم بە باوکی عەبدوڕەحمان بکات، بەڕاستی من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد دەگەڕا بەسەر خێزانەکانیدا، (جووت دەبوو) پاشان بەیانی دەکردەوە بۆنی خۆشی بڵاوەی دەکرد. گوێم لە ڕەبیع بوو دەیوت: پرسیار کرا لە شافیعی دەربارەی مێش بچێتە سەر شتێکی پیسی بۆگەن، پاشان باڵ بگرێتەوە بچێتە سەر جلی کەسێك، شافیعی وتی: دروستە قاچەکانی وشك ببنەوە لە کاتی باڵگرتنەوەی، ئەگەرنا هەر شتێ ئەگەر بەرتەسك بوو فراوان دەبێت.

**بَابُ ذِكْرِ مَوَاقِيتِ الْإِحْرَامِ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوْ بِأَحَدِهِمَا لِمَنْ مَنَازِلُهُمْ وَرَاءَ الْمَوَاقِيتِ**

**٢٥٨٩-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا[1].

**باسی دیاریکردنی شوێنی ئیحرامبەستن بۆ حەج و عومرە، یان یەك دانەیان بۆ ئەوانەی ماڵەکانیان لە پشتی ئەو شوێنانەیە کە دیاریکراون**

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ: پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکی مەدینە (ذَو الْحُلَيْفَةِ)ی دیاری کردووە و کردوویەتی بە شوێنی (ئیحرامبەستن)، بۆ خەڵکی شامیش (الْجُحْفَةَ) ی دیاری کردووە، بۆ خەڵکی نەجدیش (قَرْن)ی دیاری کردووە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِحْرَامِ أَهْلِ الْمَنَاهِلِ الَّتِي هِيَ أَقْرَبُ إِلَى الْحَرَمِ مِنْ هَذِهِ الْمَوَاقِيتِ الَّتِي وَقَّتَهَا النَّبِيُّ ﷺ لِمَنْ مَنَازِلُهُمْ وَرَائِهَا «وَالْبَيَانِ أَنَّ مَوَاقِيتَ مَنْ مَنْزِلُهُ أَقْرَبُ إِلَى الْحَرَمِ مِنْ هَذِهِ الْمَوَاقِيتِ مَنَازِلُهُمْ»

٢٥٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ، فَمَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ، فَمِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَلِكَ حَتَّى أَهْلِ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا[1].

## باسی ئیحرامبەستنی خەڵکی ئەو شوێنانەی کە ماڵەکانیان نزیکترە لە حەرەمەوە، وەك لە شوێنی میقات کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردووە بۆ ئەوانەی ماڵەکانیان لە پشتی میقاتەوەیە، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی هەر کەس ماڵی لە حەرەمەوە نزیکتر بێت لەو جێگایانە ئەوە لە ماڵی خۆی ئیحرام دەبەستێ

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی مەدینە (ذَو الْحُلَيْفَةِ)ی دیاری کرد و کردی بە شوێنی (ئیحرامبەستن)، وە بۆ خەڵکی شام لە (الْجُحْفَةِ)، بۆ خەڵکی یەمەنیش لە (يَلَمْلَمَ)، بۆ خەڵکی نەجد لە (قَرْن)، ئەم شوێنانە بۆ خەڵکی خۆیانن (کە باس کران)، وە بۆ هەموو کەسێکیدیکەشە کە بێت بەسەر ئەم شوێنانەدا جگە لەمان (جگە لە خەڵکی خۆیان)، لەو کەسانەی دەیانەوێ حەج و عومرە بکەن، وە ئەو کەسەش کە نزیکترە (لەو شوێنانەی باس کرا) ئەوە (شوێنی ئیحرامبەستنی بریتییە) لە شوێنی خۆی، وە خەڵکی مەککەش (شوێنی ئیحرامبەستنیان) لە مەککەیە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ هَذِهِ الْمَوَاقِيتِ الَّتِي ذَكَرْنَاهَا كُلُّ مِيقَاتٍ مِنْهَا لِأَهْلِهِ، وَلِمَنْ مَرَّ بِهِ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِ، إِذَا مَرَّ الْمَدِينِيُّ عَلَى طَرِيقِ الشَّامِ بِالْجُحْفَةِ، وَحَادَ عَنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ وَلَمْ يَمُرَّ بِهِ، كَانَ مِيقَاتُهُ الْجُحْفَةَ إِذَا هُوَ مَارٌّ بِهَا، وَكَذَلِكَ الْيَمَانِيُّ إِذَا أَخَذَ طَرِيقَ الْمَدِينَةِ فَمَرَّ بِذِي الْحُلَيْفَةِ كَانَ ذُو الْحُلَيْفَةِ مِيقَاتَهُ، وَإِذَا مَرَّ النَّجْدِيُّ بِيَلَمْلَمَ، كَانَ مِيقَاتُهُ يَلَمْلَمَ «وَالدَّلِيلِ أَيْضًا أَنَّ مَنْ كَانَ مَنْزِلُهُ الْحَرَمَ، كَانَ مِيقَاتُهُ مَنْزِلَهُ، وَلَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى بَعْضِ هَذِهِ الْمَوَاقِيتِ الَّتِي وَقَّتَهَا النَّبِيُّ ﷺ لِمَنْ مَنْزِلُهُ وَرَاءَهَا، وَخَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ هَذَا مُفَسِّرٌ لِخَبَرِ ابْنِ عُمَرَ، وَفِي خَبَرِ ابْنِ

---

(١) صحيح.

## عَبَّاسٍ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا وَقَّتَ تِلْكَ الْمَنَازِلَ لِلْإِحْرَامِ فِي خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ لِمَنْ مَنْزِلُهُ وَرَاءَ تِلْكَ الْمَوَاقِيتِ دُونَ مَنْ مَنْزِلُهُ أَقْرَبُ إِلَى الْحَرَمِ مِنْ تِلْكَ الْمَنَازِلِ»

**٢٥٩١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَلِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ. قَالَ: هِيَ لَهُمْ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِمَّنْ سِوَاهُمْ مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ ثُمَّ مَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ بَدَأَ حَتَّى يَبْلُغَ ذَلِكَ أَهْلَ مَكَّةَ[1].

**باسی ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەو شوێنانەی كە باسمان كرد هەر جێگایەك بۆ خەڵكی شوێنەكەی خۆیەتی، هەروەها بۆ ئەو كەسەیشە بەو شوێنەدا تێپەڕ دەبێت لە جگە لە خەڵكی ئەو شوێنە، ئەگەر كەسێكی خەڵكی مەدینە تێپەڕ بوو بە ڕێگای شامدا لە جوحفەوە، لەڕێگای (ذِي الْحُلَيْفَةِ) و كەناری گرت و بەوێدا تێپەڕ نەبوو، ئەوە شوێنی ئیحرامبەستنی جوحفەیە، ئەگەر بەنێویدا تێپەڕ بوو، بەهەمان شێوە كەسێكی یەمەنیش ئەگەر بەڕێگای مەدینەدا هات ئەوە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) شوێنی ئیحرامبەستنێتی، وە ئەگەر كەسێكی خەڵكی نەجد بە یەلەملەمدا تێپەڕ بوو ئەوە شوێنی ئیحرامبەستنەكەی یەلەملەمە، هەروەها بەڵگەشە لەسەر ئەوەی هەر كەس ماڵی لە حەرەم بوو ئەوە شوێنی ئیحرامبەستنی لە ماڵەكەی خۆیەتی، واجب نییە لەسەری بچێت بۆ یەكێك لەو شوێنانەی كە پێغەمبەر ﷺ دیاری كردووە بۆ ئەوانەی ماڵیان لە پشتیانەوەیە، وە ئەم فەرموودەی ئیبنو عەباس شیكەرەوەی فەرموودەكەی ئیبنو عومەرە، وە فەرموودەكەی ئیبنو عەباس بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەو جێگایانەی دیاری كرد تەنها بە مەبەستی ئیحرامبەستن، وە لە فەرموودەكەی ئیبنو عومەر هاتووە: بۆ ئەو كەسەی ماڵەكەی لەپشت ئەو شوێنانەیە نەك ئەو كەسەی ماڵەكەی لە حەرەمەوە نزیكترە لەو شوێنانە**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵكی مەدینە (ذَو الْحُلَيْفَةِ) ی دیاری كرد و كردی بە شوێنی (ئیحرامبەستن)، وە بۆ خەڵكی شام لە (الْجُحْفَةِ)، بۆ خەڵكی نەجد لە (قَرْن)، بۆ خەڵكی یەمەنیش لە (يَلَمْلَمَ)، فەرمووی: ئەم شوێنانە بۆ خەڵكی خۆیانن (كە باس كران)، وە بۆ هەموو كەسێكیدیكەشە كە بێت بەسەر ئەم شوێنانەدا جگە لەمان (جگە لە خەڵكی خۆیان)، لەو كەسانەی دەیانەوێ حەج

---

(١) صحيح.

و عومرە بکەن، پاشان ئەو کەسەش کە نزیکترە (لەو شوێنانەی باس کرا) ئەوە (شوێنی ئیحرامبەستنی بریتییە) لە شوێنی خۆی، وە خەڵکی مەککەش (شوێنی ئیحرامبەستنیان) لە مەککەیە.

## بَابُ ذِكْرِ مِيقَاتِ أَهْلِ الْعِرَاقِ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ مُسْنَدًا

**٢٥٩٢-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَسْأَلُ عَنِ الْمُهَلِّ قَالَ: أَحْسَبُهُ يُرِيدُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «مُهَلُّ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ذُو الْحُلَيْفَةِ، وَالطَّرِيقُ الْآخَرِ الْجُحْفَةُ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الْعِرَاقِ مِنْ ذَاتِ عِرْقٍ، وَمُهَلُّ أَهْلِ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ، وَمُهَلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ»[١].

## باسی شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی عێراق ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵا بوو ﷺ پرسیاری کرد دەربارەی ئیحرامبەستن، وتی: پێم وایە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی: شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی مەدینە (ذَو الْحُلَيْفَةِ)یە، وە ڕێگاکەیدیکەش جوحفەیە، وە شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی عێراق (ذَاتِ عِرْقٍ)، وە شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی نەجد قەرنە، وە شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی یەمەنیش لە یەلەملەمە.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الْإِحْرَامِ وَرَاءَ الْمَوَاقِيتِ الَّتِي وَقَّتَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَهْلِ الْآفَاقِ الَّذِينَ مَنَازِلُهُمْ وَرَاءَهَا، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ وَقَّتَ هَذِهِ الْمَوَاقِيتَ لِأَهْلِهَا وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهَا مِنْ غَيْرِ أَهْلِهَا وَالْمُصْطَفَى ﷺ وَجَمِيعُ مَنْ خَرَجَ مِنَ الْمَدِينَةِ وَقْتَ إِرَادَتِهِمُ الْحَجَّ خَرَجُوا فَجَلَسَ حَتَّى أَتَوْا ذَا الْحُلَيْفَةِ فَأَحْرَمُوا مِنْهُ، وَلَوْ كَانَ الْإِحْرَامُ وَرَاءَ الْمَوَاقِيتِ أَوْ مِنْ مَنَازِلِهِمْ وَرَاءَ الْمَوَاقِيتِ سُنَّةً أَوْ خَيْرًا أَوْ أَفْضَلَ لَأَشْبَهَ أَنْ يَكُونَ الْمُصْطَفَى ﷺ يُحْرِمُ مِنَ الْمَدِينَةِ وَيَأْمُرُ أَصْحَابَهُ بِالْإِحْرَامِ مِنْهَا، وَاتِّبَاعِ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ أَفْضَلَ عَمَّا سِوَاهَا

**٢٥٩٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ: «أَمَرَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَنْ يُهِلُّوا مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهْلَ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَأَهْلَ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ». قال عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: وَأُخْبِرْتُ أَنَّهُ قَالَ «وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی ئیحرامبەستن باش نییە لە دەرەوەی ئەو شوێنانەی کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردووە بۆ خەڵکی ئەو ناوچانەی کە ماڵەکانیان لە دەرەوەی ئەو شوێنانەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو شوێنانەی دیاری کردووە بۆ خەڵکی ئەو ناوچانە و ئەوانەیشی کە دێن بۆ ئەوێ و خەڵکی ئەوێ نین، پێغەمبەر ﷺ و هەموو ئەوانەی لەگەڵی بوون لە مەدینە دەرچوون بە مەبەستی حەج ئیحرامیان نەبەست تا گەیشتنە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) لەوێ ئیحرامیان بەست، ئەگەر ئیحرامبەستن لە دەرەوەی ئەو شوێنانەی دیاری کراوە، یان لە ماڵەکانیان لە پشتی ئەو شوێنانەی دیاری کراوە سوننەت یان چاك بووایە، ئەوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە ئیحرامی دەبەست و فەرمانیشی دەکرد بە هاوەڵانی ئیحرام ببەستن، وە پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ چاکترە لەوانی دیکە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە خەڵکی مەدینە لە (ذَو الْحُلَيْفَةِ) ئیحرام ببەستن، خەڵکی شامیش لە جوحفە، خەڵکی نەجدیش لە قەرن، عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێ: هەواڵم پێ دراوە، ئەو فەرموویەتی: خەڵکی یەمەنیش لە یەلەملەم ئیحرام دەبەستن.

**بَابُ أَمْرِ النُّفَسَاءِ بِالِاغْتِسَالِ وَالِاسْتِغْفَارِ إِذَا أَرَادَتِ الْإِحْرَامَ، وَإِنْ كَانَ الِاغْتِسَالُ لَا يُطَهِّرُ مَا يُطَهِّرُ غَيْرَ النُّفَسَاءِ وَغَيْرَ الْحُيَّضِ، إِذِ النُّفَسَاءُ وَالْحُيَّضُ لَا يَطْهُرْنَ بِالِاغْتِسَالِ مَا لَمْ يَطْهُرْنَ بِانْقِطَاعِ دَمِ النِّفَاسِ وَالْحَيْضِ، وَالْبَيَانُ أَنْ لَيْسَ فِي السُّنَّةِ إِلَّا اتِّبَاعُهَا، إِذْ لَوْ كَانَ مِنْ جِهَةِ الْعَقْلِ وَالرَّأْيِ لَمْ يَكُنْ لِاغْتِسَالِ النُّفَسَاءِ وَالْحُيَّضِ قَبْلَ أَنْ يَطْهُرْنَ مَعْنًى مِنْ وِجْهَةِ الْعَقْلِ وَالرَّأْيِ، وَلَكِنْ لَمَّا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ النُّفَسَاءَ وَالْحُيَّضَ بِالْغُسْلِ وَجَبَ قَبُولُ أَمْرِهِ، وَتَرْكُ الرَّأْيِ وَالْقِيَاسِ**

**٢٥٩٤-** عَنْ جَعْفَرٍ وَهُوَ ابْنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: وَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: «اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي، ثُمَّ أَهِلِّي»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي قَوْلِهِ: «وَاسْتَثْفِرِي» دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ دَمَ النِّفَاسِ كَانَ غَيْرُ مُنْقَطِعٍ.

---

(١) صحيح.

**باسی فەرمانکردن بە ئافرەتی زەیستانی خۆی بشوات و داوای لێخۆشبوون بکات، ئەگەر ویستی ئیحرام ببەستێ، ئەگەرچی خۆشۆردن ئافرەتی زەیستانی و ئافرەتی حەیزدار پاك ناکاتەوە وەکوو چۆن جگە لەو دووانە پاك دەکاتەوە، چونکە ئافرەتانی زەیستانی و حەیزدار بەخۆشۆردن پاك نابنەوە، تا پاك نەبنەوە لە خوێنی زەیستانی و حەیز، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی سوننەت هەر دەبێ شوێنی بکەویت، جا ئەگەر بەپێی عەقڵ و بۆچوون بووایە خۆشۆردنی ئافرەتانی زەیستانی و حەیزدار پێش ئەوەی پاك ببنەوە هیچ مانایەکی نەبوو، بەڵام کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەوانەی لە زەیستانی و حەیزدان خۆیان بشۆرن، واجبە وتەکەی قبوڵ بکرێت و واز لە بۆچوون و قیاس بهێنرێ**

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ، پرسیارمان لێ کرد دەربارەی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەسمائی کچی عومەیس، موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، چی بکەم؟ فەرمووی: خۆت بشۆرە و بە پارچە لۆکەیەك یان پارچە پەڕۆیەك داوێنت بگرە، پاشان ئیحرام ببەستە.

ئەبو بەکر وتی: فەرموودەکەی: (وَاسْتَثْفِرِي) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوێنی زەیسانی هێشتا کۆتایی پێ نەهاتبوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاغْتِسَالِ لِلْإِحْرَامِ

٢٥٩٥- عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَجَرَّدَ لِإِهْلَالِهِ وَاغْتَسَلَ[١].

## باسی سوننەت وایە ئیحرامپۆش لە کاتی ئیحرامبەستندا خۆی بشوات

واتە: خاریجەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە کاتی ئیحرامبەستندا جلوبەرگی لەبەر خۆی داکەند و خۆی شۆرد.

---

(١) حسن لغيره.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْإِحْرَامِ بِالْحَجِّ فِي غَيْرِ أَشْهُرِ الْحَجِّ، إِذِ اللَّهُ وَجَلَّ وَعَلَا جَعَلَ الْحَجَّ أَشْهُرًا مَعْلُومَاتٍ، فَغَيْرُ جَائِزٍ الدُّخُولُ فِي الْحَجِّ قَبْلَ وَقْتِهِ، كَمَا لَا يَجُوزُ الدُّخُولُ فِي الصَّلَوَاتِ قَبْلَ أَوْقَاتِهَا

**٢٥٩٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَا يُحْرِمُ بِالْحَجِّ إِلَّا فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ؛ فَإِنَّ مِنْ سُنَّةِ الْحَجِّ أَنْ تُحْرِمَ بِالْحَجِّ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ[١].

## باسی قەدەغەکردن لە ئیحرامبەستن بۆ حەج لە جگە لە مانگەکانی حەج، چونکە خوا ﷻ حەجی لە چەند مانگێکی دیاریکراودا داناوە، بۆیە چوونەنێوەوەی حەج دروست نییە پێش کاتی خۆی، وەکوو چۆن چوونەنێوەوەی نوێژ دروست نییە پێش هاتنی کاتەکەی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: کەس بۆی نییە ئیحرام بۆ حەج ببەستێ جگە لە مانگەکانی حەج نەبێت، چونکە لە سوننەتەکانی حەج ئەوەیە ئیحرام ببەستی بۆ حەج لە مانگەکانی حەجدا.

## بَابُ ذِكْرِ الثِّيَابِ الَّذِي زُجِرَ الْمُحْرِمُ عَنْ لُبْسِهَا فِي الْإِحْرَامِ

**٢٥٩٧-** عَنْ نافع عن عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَاذَا نَلْبَسُ مِنَ الثِّيَابِ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ فَقَالَ: «لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْقَلَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَحَدٌ لَيْسَتْ لَهُ نَعْلَانِ فلْيَلْبَسْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ وَرْسٌ وَلَا زَعْفَرَانٌ». وَقَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَقُولُ: وَلَا تَنْقَبُ الْمَرْأَةُ وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ[٢].

### باسی ئەو پۆشاکانەی کە قەدەغە کراوە ئیحرامپۆش لە کاتی ئیحرامدا لەبەری بکات

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵاوە ﷺ، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کاتێ ئیحرامان بەست چی بپۆشین لە جلوبەرگەکان؟ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکەن و نە

---

(١) صحيح موقوفا.

(٢) صحيح.

شەرواڵ لەپێ بکەن و نە ڕۆب لەبەر بکەن و نە مێزەر لەسەر بکەن و نە کڵاو لەسەر بکەن و نە خوف لەپێ بکەن، مەگەر کەسێك نەعلی دەست نەکەوێ، ئەوا با خوفەکان لەپێ بکات، بەڵام لەخوار قاپەڕەقەی قاچیەوە ببڕێت، هەروەها هیچ پۆشاکێك لەبەر مەکەن کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت. وە وتی: عەبدوڵا دەیوت: با ئافرەت پەچە نەدات و دەستکێش لەدەست نەکات. (وَرْسٌ: ڕوەکێکی زەردی بۆنخۆشە بۆیاخی پێ دەکرێ).

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ لُبْسِ الْأَقْبِيَةِ فِي الْإِحْرَامِ

**٢٥٩٨**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَلْبَسَ الْمُحْرِمَ الْقُمُصَ أَوِ الْأَقْبِيَةَ أَوِ الْخُفَّيْنِ إِلَّا أَنْ لَا يَجِدَ نَعْلَيْنِ أَوِ السَّرَاوِيلَاتِ أَوْ يَلْبَسَ شَيْئًا مَسَّهُ وَرْسٌ أَوْ زَعْفَرَانٌ[(١)].

## باسی سەرزەنشتکردن لە پۆشینی کراسی قۆڵدار لە ئیحرامدا

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لەوەی ئیحرامپۆش کراسی بێقۆڵ یان کراسی قوڵدار لەبەر بکات، یان خوفەکان لەپێ بکات، مەگەر کەسێك نەعلی دەست نەکەوێ، یان شەرواڵ لەپێ بکات، یان پۆشاکێك لەبەر بکات زەعفەران یان وەرسی پێوە بێت.

(ڕوونکردنەوە: (الْأَقْبِيَةِ) واتە: کراسی قوڵدار، (الْقَمِيصَ): ئەو پۆشاکەیە کە جەستە دادەپۆشێ لەگەڵ عەوڕەتدا، بەڵام بێقۆڵە، لە سەرەوە لەبەر دەکرێ، وە (السِّروال): بەزۆری بە پۆشاکێك دەوترێ نێوانی ناوك و هەردوو ئەژنۆ بپۆشێ، هەروەها هەردوو قاچیش، وە لە خوارەوە لەپێ دەکرێ، وە (البُرنس): بریتییە لە پۆشاکێك کڵاوی لەگەڵدا بێت).

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ انْتِقَابِ الْمَرْأَةِ وَعَنِ التَّقَفُّزِ فِي الْإِحْرَامِ

**٢٥٩٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا تَأْمُرُنَا أَنْ نَلْبَسَ مِنَ الثِّيَابِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ، فَقَالَ: «لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا

---

(١) صحيح.

الْخِفَافَ إِلَّا أَنْ يَكُونَ رَجُلًا لَيْسَتْ لَهُ نَعْلَانِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ مَا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ وَالْوَرْسُ». قَالَ: وَلَا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْحَرَامُ وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی ئافرەت لە کاتی ئیحرامدا پەچە بدات و دەستکێش لەدەست بکات

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: فەرمانمان بە چی پێ دەکەی لە پۆشینی جلوبەرگەکان لە کاتی ئیحرامدا؟ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکەن و نە مێزەر لەسەر بکەن و نە ڕۆب لەبەر بکەن و نە شەرواڵ لەپێ بکەن و نە خوفەکان لەپێ بکەن، مەگەر کەسێك نەعلی دەست نەکەوێ، ئەوا با خوفەکان لەپێ بکات، بەڵام لەخوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بیبڕێت، هەروەها هیچ پۆشاکێك لەبەر مەکەن کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت. (واتە نابێت بۆن و گوڵاوی بەر کەوتبێت). فەرمووی: با ئافرەت پەچە نەدات و دەستکێش لەدەست نەکات. (وَرْسٌ: ڕووەکێکی زەردی بۆنخۆشە بۆیاخی پێ دەکرێ).

٢٦٠٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْحَرَامُ وَلَا تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ». هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ الدِّرْهَمِيِّ[2].

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئافرەت پەچە نەدات و دەستکێش لەدەست نەکات لە کاتی ئیحرامدا.

## بَابُ الْإِحْرَامِ فِي الْأُزُرِ، وَالْأَرْدِيَةِ وَالنِّعَالِ

٢٦٠١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَجُلًا نَادَى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا يَجْتَنِبُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ، فَقَالَ: «لَا تَلْبَسُوا السَّرَاوِيلَ، وَلَا الْقُمُصَ، وَلَا الْبُرْنُسَ، وَلَا الْعِمَامَةَ، وَلَا ثَوْبَ مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ وَلَا وَرْسٌ، وَلْيُحْرِمَ أَحَدُكُمْ فِي إِزَارٍ وَرِدَاءٍ وَنَعْلَيْنِ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا إِلَى الْكَعْبَيْنِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی ئیحرامبەستن بە پۆشاکی بەشی خوارەوە و بەشی سەرەوە و دوو جووت نەعل

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پیاوێك بانگی کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیحرامپۆش خۆی لە پۆشینی چی جۆرە پۆشاکێك بەدوور بگرێ؟ فەرمووی: نە شەرواڵ لەپێ بکەن و نە کراس لەبەر بکەن و نە ڕۆب و نە مێزەریش لەسەر بکەن، وە هیچ پۆشاکێك لەبەر مەکەن کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت. (واتە نابێت بۆن و گوڵاوی بەر کەوتبێت)، با هەر یەکێکتان ئیحرام ببەستێ بە پۆشاکی بەشی خوارەوە و بەشی سەرەوە و دوو جووت نەعل، ئەگەر نەعلی دەست نەکەوت با خوفەکان لەپێ بکەن، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە ببڕێت.

## بَابُ اشْتِرَاطِ مَنْ بِهِ عِلَّةٌ عِنْدَ الْإِحْرَامِ أَنَّ مَحِلَّهُ حَيْثُ يُحْبَسُ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ كَرِهَ ذَلِكَ

**٢٦٠٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِضُبَاعَةٍ، وَهِيَ شَاكِيَةٌ، فَقَالَ: «أَتُرِيدِينَ الْحَجَّ؟» فَقَالَتْ: نَعَمْ قَالَ: «فَحُجِّي وَاشْتَرِطِي، وَقُولِي اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ تَحْبِسُنِي»[1].

## باسی مەرجدانانی ئەو کەسەی نەخۆشییەکی هەیە لە کاتی ئیحرامبەستن، لە هەر شوێنێك نەیتوانی ئیحرام دەشکێنێ، دژی وتەی ئەو کەسەی ئەوەی پێ باش نییە

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای زوباعەی (کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتەلیب)، ئەو نەخۆش بوو، پێی فەرموو: دەتەوێ حەج بکەیت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: حەج بکە و مەرج دابنێ، وە بڵێ: خوایە ئیحرامشکاندنم لەو شوێنەیە کە نەخۆش دەکەوم (کە نەتوانم حەجەکەم تەواو بکەم).

---

(١) صحيح.

## بَابُ الِاكْتِفَاءِ بِالنِّيَّةِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ بِالْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ - أَوْ هُمَا - عِنْدَ الْإِهْلَالِ عَنِ النُّطْقِ بِذَلِكَ

**٢٦٠٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَكَثَ بِالْمَدِينَةِ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أَذِنَ بِالْحَجِّ، فَقِيلَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَاجٌّ، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كُلُّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيَفْعَلُ كَمَا يَفْعَلُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَتَى مَسْجِدَ ذِي الْحُلَيْفَةِ فَصَلَّى فِيهِ، ثُمَّ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَرَكِبَ مَعَهُ بَشَرٌ كَثِيرٌ رُكْبَانٌ وَمُشَاةٌ كُلُّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى ظَهَرَ عَلَى الْبَيْدَاءِ، فَأَهَلَّ وَنَحْنُ لَا نَنْوِي إِلَّا الْحَجَّ لَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ، فَنَظَرْتُ أَمَامِي، وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَخَلْفِي مَدَّ الْبَصَرِ رُكْبَان وَمُشَاةً كُلَّهُمْ يُحِبُّ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ[١].

## باسی نییەت بەسە لە کاتی ئیحرامبەستن بۆ حەج یان عومرە -یان هەردووکیان- لە کاتی ئیحرامبەستن بەبێ ئەوەی بە زمان بیڵێ

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نۆ ساڵ لە مەدینە مایەوە حەجی نەکرد، پاشان جاڕی دا بۆ حەجکردن، وترا: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ حەج بکات، بۆیە خەڵکێکی زۆر لە مەدینەوە لەگەڵی دەرچوون، هەموویان حەزیان دەکرد پەیڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، ئەو چی دەکات ئەوانیش ئەوە بکەن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو: تا گەیشتە مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) نوێژی تێدا کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وڵاخەکەی بوو دەرچوو، خەڵکێکی زۆریش لەگەڵی دەرچوون بەسواری و بەپیادە، هەموویان حەزیان دەکرد پەیڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، تا سەرکەوتە سەر (الْبَيْدَاءِ) (کە بەرزاییەکە بە دەوروبەری خۆیدا دەڕوانێ لە پێشی (ذي الحليفة) لە ڕووی مەککەوەیە، لە (ذي الحليفة)وە نزیکە) ئیحرامی بەست ئێمە هیچ نییەتێکمان نەبوو جگە لە حەج نەبێت، عومرەمان نەدەزانی، تەماشای پێشی خۆم و لای ڕاست و لای چەپ و دواوەم کرد تا چاو بڕ بکات سوار و پیادەی لێ بوو هەموویان حەزیان دەکرد پەیڕەوی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْقِرَانِ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، وَالْإِفْرَادِ، وَالتَّمَتُّعِ، وَالْبَيَانِ أَنَّ كُلَّ هَذَا جَائِزٌ طَلْقٌ مُبَاحٌ وَالْمَرْءُ مُخَيَّرٌ بَيْنَ الْقِرَانِ وَالْإِفْرَادِ وَبَيْنَ التَّمَتُّعِ، يُهِلُّ بِمَا شَاءَ مِنْ ذَلِكَ

**٢٦٠٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مُوَافِينَ هِلَالَ ذِي الْحِجَّةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ فَلْيُهِلَّ بِحَجٍّ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ بِعُمْرَةٍ». فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ[1].

## باسی ڕێگەدان بە قیران لە نێوان حەج و عومرە، وە بە ئیفراد و بە تەمەتوعیش، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی هەموو ئەمانە ڕێگەپێدراون بەڕەهایی، مرۆڤ سەرپشکە لە نێوان قیران و ئیفراد و تەمەتوع

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین لە نزیك هاتنی مانگی (ذِي الْحِجَّةِ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس دەیەوێ ئیحڕام ببەستێ بۆ حەج با ئیحڕام ببەستێ بۆ حەج، هەر کەسیش دەیەوێ ئیحڕام ببەستێ بۆ عومرە با ئیحڕام ببەستێ بۆ عومرە، جا تیاماندا هەبوو ئیحڕامی بەست بۆ حەج هەیشبوو ئیحڕامی بەست بۆ عومرە.

تێبینی: (الْقِرَانُ): بریتییە لەوەی کە ئیحڕام ببەستێت بۆ حەج و عومرە پێکەوە، وە ئەو کەسەی کە بۆ ئیفراد بەستوویەتی چی دەکات ئەمیش بەهەمان شێوە دەکات، بەڵام ئەم کردەوەکانی هی حەج و عومرەیە پێکەوە، وە واجبە لەسەری کە خوێن بڕێژێ.

(التَّمَتُّع): واتە: کەسێك دەچێت بۆ حەج ئیحڕام دەبەستێ بۆ عومرە لە مانگەکانی حەجدا، کە گەیشتە ئەوێ ڕاستەوخۆ تەواف دەکات و سەعی نێوان صەفا و مەڕوە دەکات و قژی کورت دەکاتەوە یاخود دەیتاشێ، پاشان ئیحڕام لە خۆی دەکاتەوە و هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە هەتا کاتی حەجکردن، پاشان ئیحڕامی حەج دەبەستێ، ئەوکات عومرە جیا دەبێت لە حەج، بەڵام واجبە لەسەری کە خوێن بڕێژێ).

(الإفْراد): بریتییە لەوەی بەتەنها ئیحڕام بۆ حەج ببەستێت).

---

(١) صحیح.

٢٦٠٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْحَجِّ وَأَهَلَّ بِهِ نَاسٌ، وَأَهَلَّ نَاسٌ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، وَأَهَلَّ نَاسٌ بِالْعُمْرَةِ. لَمْ يَقُلْ عَبْدُ الْجَبَّارِ: وَأَهَلَّ بِهِ نَاسٌ، وَزَادَ قَالَتْ: فَكُنْتُ فِيمَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بۆ حەج بەست، خەڵکێکیش ئیحرامیان بۆ حەج بەست، خەڵکێکی دیکە ئیحرامیان بۆ حەج و عومرە بەست، خەڵکێکدیکەش ئیحرامیان بۆ عومرە بەست. عەبدولجەبار (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) نەیوت: خەڵکێکیش ئیحرامیان بۆ حەج بەست، ئەوەیشی زیاد کرد، عائیشە وتی: من یەکێك بووم لەوانەی ئیحرامم بۆ حەج و عومرە بەست.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّمَتُّعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَعْلَمَ أَصْحَابَهُ أَنْ لَوِ اسْتَقْبَلَ مِنْ أَمْرِهِ مَا اسْتَدْبَرَ لَمَا سَاقَ الْهَدْى وَلَحَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَلَمَّا أَمَرَ مَنْ لَمْ يَسُقِ الْهَدْى بِالْإِهْلَالِ بِعُمْرَةٍ

٢٦٠٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَرْبَعٍ مَضَيْنَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ أَوْ خَمْسٍ فَدَخَلَ عَلَيَّ وَهُوَ غَضْبَانُ، فَقُلْتُ: مَنْ أَغْضَبَكَ؟ فَقَالَ: «أَمَّا شَعَرْتِ إِنِّي أَمَرْتُ النَّاسَ بِأَمْرٍ فَإِذَا هُمْ يَتَرَدَّدُون لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا سُقْتُ الْهَدْى مَعِي حَتَّى أَشْتَرِيَهُ، ثُمَّ أَحِلُّ كَمَا حَلُّوا»[2].

## باسی چاکتر وایە ئیحرام ببەستێ بە بەجێهێنانی عومرە هەتا کاتی حەج، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی ڕاگەیاند ئەو بۆچوونەی ئێستا هەیەتی ئەوسا هەیبووایە ئاژەڵی قوربانی لەگەڵ خۆی نەدەهێنا، وە ئیحرامیشی دەشکاند، وە فەرمانی نەدەکرد بەوەی کە هەدی لەگەڵ خۆی نەهێناوە ئیحرامی عومرە ببەستێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی حەجکردنی هات بۆ لام چوار یان پێنج شەو تێ پەڕیبوو لە (ذِي الْحِجَّةِ)، لە کاتێکدا توڕە بوو، وتم: کێ توڕەی کردووی؟ فەرمووی: ئایە هەستت نەکرد من فەرمانم پێ کردن بە فەرمانێك ئەوانیش دوودڵبوون

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

تیایدا، ئەگەر ئەو بۆچوونەی ئێستا هەمە ئەوسا هەمبووایە ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، تا دەمکڕی، پاشان ئیحرامم دەشکاند وەکوو چۆن ئەوان ئیحرامیان شکان.

## بَابُ أَمْرِ الْمُهِلِّ بِالْعُمْرَةِ الَّذِي مَعَهُ الْهَدْيُ بِالْإِهْلَالِ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ لِيَصِيرَ قَارِنًا، إِذْ سَائِقُ الْهَدْيَ الْمُهِلُّ بِالْعُمْرَةِ، غَيْرُ جَائِزٍ لَهُ الْإِحْلَالُ مِنْهَا قَبْلَ مَبْلَغِ الْهَدْيِ مَحِلَّهُ

**٢٦٠٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ»[١].

## باسی فەرمانکردن بەوکەسەی ئیحرامی بەستووە بۆ عومرە کە ئاژەڵی قوربانی بە هەدی لەگەڵ خۆی هێناوە ئیحرام ببەستێت بۆ حەج لەگەڵ عومرە، بۆ ئەوەی ببێتە (قارِن) واتە: ئیحرامیۆش بۆ حەج لەگەڵ عومرە، چونکە ئەو کەسەی ئاژەڵی قوربانی بە هەدی لەگەڵ خۆی هێناوە و ئیحرامی عومرەی بەستووە دروست نییە بۆی ئیحرام بشکێنێ پێش ئەوەی ئاژەڵی قوربانی و هەدییەکان بگاتە جێگای خۆی

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین لە حەجی ماڵئاواییدا ئیحرامی عومرەمان بەست، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس (هەدی) قوربانی لەگەڵ خۆی هێناوە با ئیحرامی حەج و عومرە ببەستێت.

## بَابُ تَقْلِيدِ الْغَنَمِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ إِذَا سِيقَ الْهَدْيُ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْغَنَمَ لَا تُقَلَّدُ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ قَلَّدَ الْغَنَمَ الَّذِي أَهْدَى وَهُوَ مُقِيمٌ بِالْمَدِينَةِ حَلَالٌ، وَسُنَّةِ الْهَدْيِ فِي التَّقْلِيدِ لِمَنْ كَانَ مُقِيمًا بِبَلْدَةٍ يُرِيدُ تَوْجِيهَ الْهَدْيِ، وَمَنْ أَرَادَ الْحَجَّ أَوِ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ وَأَهْدَى أَوْ سَاقَ الْهَدْيَ مَعَهُ فِي التَّقْلِيدِ سِيَّانٌ لَا فَرْقَ بَيْنَهُمَا

**٢٦٠٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَفْتِلُ قَلَائِدَ الْغَنَمِ لِهَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَمْكُثُ حَلَالًا. هَذَا حَدِيثُ الزَّعْفَرَانِيِّ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ملوانکەکردنە ملی مەڕ لە کاتی ئیحرام، ئەگەر مەڕی هەدی برا بۆ کەعبە، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە ملوانکە ناکرێتە ملی مەڕ، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ملوانکەی کردە ملی ئەو مەڕەی کە بە هەدی ناردی، لە کاتێکدا خۆی لە مەدینە نیشتەجێ بوو ئیحرامی نەبەستبوو، وە سوننەتی هەدی لە دیاریکردندا بۆ ئەو کەسەی لە شوێنی خۆی نیشتەجێیە و هەدییەکەی ڕەوانە دەکات، هەر کەس ویستی حەج بکات یان حەج و عومرە بکات و ئاژەڵ بکاتە هەدی و بینێرێ یان هەدییەکەی لەگەڵ خۆی ببات، حوکمی ملوانکەکردنە ملی وەکوو یەک وایە هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوانیاندا**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: بەڕاستی خۆمم بینی ملوانەکەی ملی مەڕم دەهۆنییەوە بۆ دیاریکردنی قوربانییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان بەبێ ئیحرام دەمایەوە.

## بَابُ حَدِيثِ الْإِحْرَامِ خَلْفِ الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ إِذَا حَضَرَتْ

**٢٦٠٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ، وَأَمَرَ بِبُدْنِهِ أَنْ تُشْعَرَ مِنْ شِقِّهَا الْأَيْمَنِ، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ، وَسَلَتَ عَنْهَا الدَّمَ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ الْبَيْدَاءَ أَهَلَّ[1].

**باسی قسەکردنی ئیحرامپۆش دوای نوێژە فەرزەکان ئەگەر ئامادە بوو**

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد و فەرمانیشی کرد لای ڕاستی وشترەکانی بریندار بکرێن، (وەکوو دیاریکردن بەمەبەستی ئەوەی بیکاتە هەدی و قوربانی)، هەروەها دوو نەعلیشی کردە ملی و خوێنیشی لەلای ڕاستی دەرهێنا، کاتێ لەسەر وشترەکەی ڕاست بۆیەوە لە (الْبَيْدَاءَ) تەلبیەی کرد.

**بَابُ إِبَاحَةِ الْإِحْرَامِ مِنْ غَيْرِ صَلَاةٍ مُتَقَدِّمَةٍ مِنْ مَكْتُوبَةٍ أَوْ تَطَوُّعٍ «وَالدَّلِيلِ أَنَّ غَيْرَ الْمُتَطَهِّرَةِ وَالْجُنُبِ إِنْ أَحْرَمَ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوْ هُمَا كَانَ الْإِحْرَامُ جَائِزًا، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ النُّفَسَاءَ وَالْحَائِضَ بِالْإِحْرَامِ وَهُمَا غَيْرُ طَاهِرَتَيْنِ، إِذِ النُّفَسَاءُ وَالْحَائِضُ لَا تُجْزِئُهُمَا الصَّلَاةُ قَبْلَ أَنْ تَطْهُرَا وَلَا تَطْهُرَانِ بِالِاغْتِسَالِ قَبْلَ أَنْ تَطْهُرَا بِانْقِطَاعِ دَمِ الْحَيْضِ وَالنِّفَاسِ»**

---

(١) صحيح.

**٢٦١٠-** عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجًّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَجَّةَ الْوَدَاعِ، وَمَعَهُ امْرَأَتُهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ بْنِ خَثْعَمٍ، فَلَمَّا كَانُوا بِالشَّجَرَةِ وَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِالشَّجَرَةِ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَتَى أَبُو بَكْرٍ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَأْمُرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، ثُمَّ تُهِلَّ بِالْحَجِّ، وَتَصْنَعُ مَا يَصْنَعُ النَّاسُ إِلَّا أَنَّهَا لَا تَطُوفُ بِالْبَيْتِ[١].

## باسی ڕێگە دراوە ئیحرام ببەسترێ بەبێ ئەنجامدانی نوێژی فەرز یان سوننەت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو ئافرەتەی پاك نییە یان ئەو پیاوەی لەشی گرانە ئەگەر ئیحرامی بۆ حەج و عومرە بەست یان هەردووکیان ئەوە ئیحرامبەستنەکە دروستە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ئافرەتانی زەیسانی و حەیزدار ئیحرام ببەستن، لەگەڵ ئەوەیشدا هەردووکیان پاك نین، لە کاتێکدا ئافرەتی زەیسانی و حەیزدار نوێژیان دروست نییە پێش ئەوەی خۆیان پاك بکەنەوە، وە بە خۆشۆردنیش پاك نابنەوە تا پێشتر لە خوێنی حەیز و زەیسانی پاك نەبنەوە

واتە: ئەبو بەکر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو بە مەبەستی حەجکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، لە حەجیماڵئاواییدا، هاوسەرەکەیشی ئەسمائی کچی عومەیسی کوڕی خەسعەمی لەگەڵ بوو، کاتێ گەیشتنە لای درەختەکە ئەسماء لەوێ موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، ئەبو بەکریش هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ دا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد پێی بڵێ: با خۆی بشوات، پاشان ئیحرام بۆ حەج ببەستێت، ئەوەی خەڵك دەیکەن ئەویش بیکات، ئەوە نەبێت تەوافی کەعبە نەکات.

## بَابُ الْإِهْلَالِ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ

**٢٦١١-** عَنْ سَالِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: هَذِهِ الْبَيْدَاءُ الَّتِي تَكْذِبُونَ فِيهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاللَّهِ مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَّا عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ[٢].

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

## باسی ئیحرامبەستن لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ)

واتە: سالم دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو ﷺ دەیوت: ئەو (الْبَيْدَاء)ەی (كە بەرزاییەكە بە دەوروبەری خۆیدا دەڕوانێ لەپێش (ذِي الْحُلَيْفَةِ) لە ڕووی مەككەوەیە، لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ)وە نزیكە) كە ئێوە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ (ئیحرامی تێدا بەستووە) سوێند بە خوا ئیحرامی نەبەستووە لەلای دەرگای مزگەوتی (ذي الحليفة) نەبێت.

## بَابُ الْإِهْلَالِ إِذَا اسْتَوَتْ بِالرَّاكِبِ نَاقَتُهُ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُهِلَّ حَتَّى أَتَى الْبَيْدَاءَ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ فِي كُتُبِنَا، أَنَّ الْخَبَرَ الْوَاجِبِ قَبُولَهُ هُوَ خَبَرُ مَنْ يُخَبِرُ بِسَمَاعِ الشَّيْءِ وَرُؤْيَتِهِ دُونَ مَنْ يُنْكِرُ الشَّيْءَ وَيَدْفَعُهُ»

**٢٦١٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ إِهْلَالَ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ[1].

## باسی تەلبیەكردن كاتێ سوار لەسەر وشترەكەی جێگیر دەبێت لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ)، دژی وتەی ئەو كەسەی پێی وایە پێغەمبەر ﷺ تەلبیەی نەكرد تا گەیشتە (الْبَيْدَاء) ئەمەش لەو شێوازەیە كە لە چەند شوێنێكی كتێبەكانماندا باسم كردووە، ئەو هەواڵەی كە واجبە وەربگیرێ ئەو هەواڵەیە كە كەسێك هەواڵ ئەدات بەوەی شتەكەی بیستووە و بینیویەتی نەك ئەوەی نكووڵی دەكات و ڕەتی دەكاتەوە

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، تەلبیەكردنی پێغەمبەر ﷺ لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) بوو كاتێ لەسەر وشترەكەی ڕێك بۆیەوە و دامەزرا.

(ڕوونكردنەوە: تەلبیە: بریتییە لە وتنی (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) بەدەنگی بەرز).

**٢٦١٣-** عَنْ سَالِمٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ وَاسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ أَهَلَّ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.





واتە: سالم دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ قاچی دەخستە نێو ئاوزەنگی وشترەکەی ڕاست دەبۆیەوە، تەلبیەی دەکرد.

تێبینی: ئاوزەنگ: ئەو شتەیە کە پێ دەخرێتە نێوی بۆ سواربوونی وڵاخ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاسْتِقْبَالِ بِالرَّاحِلَةِ الْقِبْلَةَ إِذَا أَرَادَ الرَّاكِبُ الْإِهْلَالَ

**٢٦١٤-** عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا أَتَى ذَا الْحُلَيْفَةِ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَرُحِلَتْ، ثُمَّ صَلَّى الْغَدَاةَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَأَهَلَّ قَالَ: ثُمَّ يُلَبِّي حَتَّى إِذَا بَلَغَ الْحَرَمَ أَمْسَكَ حَتَّى إِذَا أَتَى ذَا طُوًى بَاتَ بِهِ قَالَ: فَيُصَلِّي بِهِ الْغَدَاةَ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ «. فَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَ ذَلِكَ[1].

## باسی چاکتر وایە وشتر ڕووی بکرێتە قیبلە، ئەگەر سوار ویستی تەلبیە بکات

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ کاتێ هاتە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) فەرمانی کرد کەلوپەلەکانی خرایە سەر وشترەکە، پاشان نوێژی بەیانی کرد، پاشان سوار بوو تا ڕێك بۆیەوە تەلبیەی کرد، وتی: پاشان تەلبیەی کرد تا گەیشتە حەرەم، (بەهۆی سەرقاڵبوون بە شتی دیکەوە وەکوو تەوافکردن) لە تەلبیەکردن وەستا، تا کاتێ گەیشتە (ذَي طُوًى) (کە شوێنێکی ناسراو بوو لە نزیك مەککە) لەوێ خەوت، وتی: نوێژی بەیانی لەوێ کرد، پاشان خۆی شۆرد، پێی وا بوو پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەی کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْبَيْتُوتَةِ بِذِي الْحُلَيْفَةِ وَالْغُدُوِّ مِنْهَا اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ

**٢٦١٥-** عن مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ، حَدَّثَنِي نَافِعٌ، وَسَالِمٌ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا مَرَّ بِذِي الْحُلَيْفَةِ بَاتَ بِهَا حَتَّى يُصْبِحَ. وَيُخْبِرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ[2].

## باسی چاکتر وایە شەو بکرێتەوە لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ)و سەرلەبەیانی لێی دەربچێ، وەکوو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: موسای کوڕی عوقبە دەگێڕێتەوە، نافیع و سالم بۆیان باس کردم: ئیبنو عومەر ﷺ ئەگەر بەلای (ذِي الْحُلَيْفَةِ) تێپەڕ بووایە، شەوی دەکردەوە تا نوێژی بەیانی دەکرد، وە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەی دەکرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّعَرُّسِ فِي بَطْنِ الْوَادِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ

**٢٦١٦-** عَنْ مُوسَى بن عُقْبَةَ عن سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَى وَهُوَ فِي مُعَرَّسِهِ فِي ذِي الْحُلَيْفَةِ، فَقِيلَ: إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ «، قَالَ مُوسَى: وَقَدْ أَنَاخَ بِنَا سَالِمٌ بِالْمَنَاخِ الَّذِي كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُنِيخُ بِهِ يَتَحَرَّى مُعَرَّسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ أَسْفَلُ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِبَطْنِ الْوَادِي بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطَّرِيقِ وَسَطًا مِنْ ذَلِكَ[١].

## باسی چاکتر وایە لە کۆتایی شەودا لە قوڵایی شیوەکە لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) پشوو بدرێ

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی شەو هات بۆ شوێنی پشوودانەکەی لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) پێی وترا: تۆ لە (بَطْحَاءَ) (کە شیوێك بوو لە مەککە) شیوێکی پیرۆزدایت، موسای (کوڕی عوقبە) وتی: سالم لەو شوێنەدا وشترەکەی یەخ دا کە عەبدوڵا وشترەکەی تیایدا یەخ دەدا، بەوشوێنەدا دەگەڕا کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا پشووی دا، ئەو شوێنە لەخوار ئەو مزگەوتە بوو کە لەنێو شیوەکە بوو (شیوی عەقیق)[٢] وە لە نێوان قوڵایی شیوەکە و ڕێگاکە بوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ فِي ذَلِكَ الْوَادِي

**٢٦١٧-** عن عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: حَدَّثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ رَبِّي وَهُوَ بِالْعَقِيقِ أَنْ: صَلِّ فِي هَذَا الْوَادِي الْمُبَارَكِ، وَقُلْ: عُمْرَةً فِي حَجَّةٍ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) ) شیوی عەقیق: شیوێکە دەکەوێتە خۆرئاوای مەدینە (١٠٠) سەد کیلۆمەتر لێیەوە دوورە.

(٣) صحيح.

### باسی نوێژکردن سوننەتە لە شیوی (ذِي الْحُلَيْفَةِ).

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردم فەرمووی: ئەمشەو کەسێك لەلایەن پەروەرگارمەوە هات، (واتە: جبریل) لە کاتێکدا ئەو لە شیوی عەقیق بوو، (وتی): لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بکە، وە بڵێ: ئەمە عومرەیە لەنێو حەجدا.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْإِهْلَالِ بِمَا يُحْرِمُ بِهِ الْمُهِلُّ مِنْ حَجٍّ أَوْ عَمْرَةٍ أَوْ هُمَا

**٢٦١٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَبَّيْكَ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ»[١].

### باسی سوننەت وایە تەلبیە بکرێ بەوەی تەلبیەکەر ئیحرامی پێ بەستووە لە حەج یان عومرە یان هەردووکیان

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە خزمەتدام بە (ئیحرامی) حەج و عومرە پێکەوە.

**٢٦١٩-** عن أَنَسٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا» مِرَارًا[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو چەند جارێك دەیفەرموو: لە خزمەتدام بە (ئیحرامی) عومرە و حەج پێکەوە، لە خزمەتدام بە (ئیحرامی) حەج و عومرە پێکەوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْإِحْرَامِ مِنْ غَيْرِ تَسْمِيَةِ حَجٍّ وَلَا عَمْرَةٍ، وَمِنْ غَيْرِ قَصْدِ نِيَّةٍ وَاحِدٍ بِعَيْنِهِ عِنْدَ ابْتِدَاءِ الْإِحْرَامِ

**٢٦٢٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَا نَرَى إِلَّا الْحَجَّ حَتَّى قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: «نَبْدَأُ بِالَّذِي بَدَأَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

اللَّهُ بِهِ»، فَبَدَأَ بِالصَّفَا حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ سَبْعَةٍ عَلَى الْمَرْوَةِ، فَجَاءَهُ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ بِهَدِيَّةٍ مِنَ الْيَمَنِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِمَ أَهْلَلْتَ؟». قال: قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ قَالَ: «فَإِنِّي أَهْلَلْتُ بِالْحَجِّ». فَذَكَرَ الدَّوْرَقِيُّ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: " فَقَدْ أَهَلَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَهُوَ غَيْرُ عَالِمٍ فِي وَقْتِ إِهْلَالِهِ مَا الَّذِي بِهِ أَهَلَّ النَّبِيُّ ﷺ ؛ لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ مُهِلًّا مِنْ طَرِيقِ الْمَدِينَةِ، وَكَانَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَحِمَهُ اللَّهُ مِنْ نَاحِيَةِ الْيَمَنِ، وَإِنَّمَا عَلِمَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ مَا الَّذِي بِهِ أَهَلَّ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ اجْتِمَاعِهِمَا بِمَكَّةَ، فَأَجَازَ ﷺ إِهْلَالَهُ بِمَا أَهَلَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَهُوَ غَيْرُ عَالِمٍ فِي وَقْتِ إِهْلَالِهِ أَهَلَّ النَّبِيُّ ﷺ بِالْحَجِّ أَوْ بِالْعُمْرَةِ أَوْ بِهِمَا جَمِيعًا، وَقِصَّةُ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ مِنْ هَذَا الْبَابِ لَمَّا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ مُنِيخٌ بِالْبَطْحَاءِ، فَقَالَ ﷺ: «قَدْ أَحْسَنْتَ». غَيْرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْمُتَعَقَّبِ أَمَرَ عَلِيًّا بِغَيْرِ مَا أَمَرَ بِهِ أَبَا مُوسَى أَمَرَ عَلِيًّا بِالْمُقَامِ عَلَى إِحْرَامِهِ، إِذْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلَمْ يَجِدْ لَهُ الْإِحْلَالَ إِلَى أَنْ بَلَغَ الْهَدْيَ مَحِلَّهُ، وَأَمَرَ أَبَا مُوسَى بِالْإِحْلَالِ بِعُمْرَةٍ، إِذْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، وَقَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ.

## باسی ڕێگە دراوە بە ئیحرامبەستن بەبێ ناوهێنانی حەج یان عومرە، وە بەبێ نییەتهێنانی یەکێك لەو دووانە بەدیاریکراوی لە سەرەتای ئیحرامبەستندا

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین تەنها مەبەستمان حەج بوو، تا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەککە، حەوت جار تەوافی بەیتی کرد، لەپشت مەقامی (ئیبراهیم) دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان فەرمووی: بەوە دەستی پێ دەکەین کە خوا دەستی پێ کردووە. بە سەرکەوتن بەسەر کێوی صەفا دەستی پێ کرد تا حەوتەمین جار لەسەر مەڕوە کۆتایی پێ هێنا، ئینجا عەلی لە یەمەنەوە هات بۆ لای بە دیارییەکەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بە چی ئیحرامت بەستووە؟ وتی: وتم: ئەی خوایە من ئیحرامم بەوە بەستووە کە پێغەمبەرەکەت ئیحرامی پێ بەستووە، فەرمووی: من ئیحرامم بۆ حەج بەستووە. دواتر دەورەقی فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان عەلی کوڕی ئەبو تالیب ئیحرامی بەوە بەست کە پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی پێ بەستبوو، لە کاتێکدا ئەو لە کاتی ئیحرامبەستنیدا نەیزانیبوو پێغەمبەر

---

(١) صحيح.





ﷺ ئیحرامی بۆچی بەستووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگای مەدینە ئیحرامی بەست، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش ئەو کات لە یەمەن بوو، بۆیە عەلی کوڕی ئەبو تالیب ئەو کاتە زانی کە پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بەچی بەستووە کاتێ لەمەککە گەیشتن بە یەك، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگای پێ دا وەکوو ئەو ئیحرام ببەستێ، ئەو لە کاتی ئیحرامبەستنیدا نەیزانی پێغەمبەر ﷺ ئیحرامی بۆ حەج یان بۆ عومرە یان بۆ هەردووکیان بەستووە پێکەوە، وە باسەکەی ئەبو موسای ئەشعەریش لەم بەشەیە، کاتێ گەیشتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا کە وشترەکەی یەخ دابوو لە (الْبَطْحَاءِ)، فەرمووی: بێگومان کارێکی چاکت کرد، ئەوە نەبێ پێغەمبەر ﷺ دواتر فەرمانی بە عەلی کرد بە جگە لەوەی فەرمانی بە ئەبو موسا کرد، فەرمانی بە عەلی کرد لەسەر ئیحرامەکەی بمێنێتەوە ئەگەر ئاژەڵی هەدی لەگەڵ خۆی هێناوە، ڕێگەی نەدا ئیحرام بشکێنێ تا ئاژەڵی هەدییەکەی دەگەیەنێتە جێگای خۆی، وە فەرمانی کرد بە ئەبو موسا ئیحرام بشکێنێ بە عومرە ئەگەر ئاژەڵی هەدی لەگەڵ خۆی نەهێناوە، ئەم بابەتەم لە کتێبی (الْكَبِيرِ)دا باس کردووە.

## بَابُ صِفَةِ تَلْبِيَةِ النَّبِيِّ ﷺ

**٢٦٢١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنْ تَلْبِيَةَ النَّبِيِّ ﷺ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكُ لَا شَرِيكَ لَكَ». قَالَ مُؤَمَّلٌ فِي حَدِيثِهِ: وَزَادَ ابْنُ عُمَرَ: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ[1].

## باسی چۆنێتی تەلبیەکردنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، تەلبیەکردنی پێغەمبەر ﷺ بەوشێوەیە بوو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكُ لَا شَرِيكَ لَكَ)، واتە: ئەی خوایە پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوە و تۆ تەنها و بێ شەریکیت، پەیڕەویت دەکەم بێگومان سوپاس و ستاییش و هەموو ناز و نیعمەت و موڵك و دەسەڵاتێك هەر هی تۆیە، هیچ هاوبەشت نییە)،

---

(١) صحيح.

موئەمیل لە فەرموودەکەیدا وتی: ئیبنو عومەر ئەوەی تیایدا زیاد کرد: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ)، واتە: پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، پەیڕەویت دەکەم، هەموو خێر و چاکەیەك بە دەستی تۆیە، هەموو کار و کردەوەیەك هەر بۆ تۆیە).

**٢٦٢٢**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: تَلَقَّفْتُ التَّلْبِيَةَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ مِثْلَ حَدِيثِ مُؤَمَّلٍ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەڵێ: تەلبیەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگرت، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی موئمیلی باس کرد.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الزِّيَادَةَ فِي التَّلْبِيَةِ عَلَى مَا حَفِظَ ابْنُ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ جَائِزٌ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ بَعْضَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَدْ يَحْفَظُ عَنْهُ مَا يَعْزُبُ عَنْ بَعْضِهِمْ؛ لِأَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَدْ حَفِظَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي تَلْبِيَتِهِ مَا لَمْ يَحْكِ عَنْهُ غَيْرُهُ»**

**٢٦٢٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي تَلْبِيَتِهِ: «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ»[٢].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی زیادکردن لە دەستەواژەی تەلبیەدا لەسەر ئەوەی ئیبنو عومەر لەبەری کردووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دروستە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ هەندێ شتی لێیەوە لەبەر کردووە کە لەلای هەندێکی دیکەیان نەبووە، چونکە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەندێ شتی لەبەر کردووە جگە لە ئەو کەسی دیکە باسی نەکردووە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە تەلبیەکردنیدا فەرمووی: پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، ئەی پەرستراوی حەق.

**٢٦٢٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ قَالَ: كَانَ مِنْ تَلْبِيَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەلبیەکردنیدا فەرمووی: پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، ئەی پەرستراوی حەق.

**بَابُ إِبَاحَةِ الزِّيَادَةِ فِي التَّلْبِيَةِ: ذَا الْمَعَارِجِ، وَنَحْوَهَ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ كَرِهَ هَذِهِ الزِّيَادَةَ وَذَكَرَ أَنَّهُمْ لَمْ يَقُولُوهُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَنْ تَقَدَّمَتْ صُحْبَتُهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ أَعْلَمَ، قَدْ كَانَ يَخْفَى عَلَيْهِ الشَّيْءُ مِنْ عِلْمِ الْخَاصَّةِ، فَعَلِمَهُ مَنْ هُوَ دُونَهُ فِي السِّنِّ وَالْعِلْمِ؛ لِأَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ مَعَ مَكَانِهِ مِنَ الْإِسْلَامِ وَالْعِلْمِ وَمَعَ تَقَدُّمِ صُحْبَتِهِ، خَبَّرَ أَنَّهُمْ لَمْ يَقُولُوا: ذَا الْمَعَارِجِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَجَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ دُونَهُ فِي السِّنِّ وَالْعِلْمِ وَالْمَكَانِ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُمْ كَانُوا يَزِيدُونَ: ذَا الْمَعَارِجِ وَنَحْوَهَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَسْمَعُ لَا يَقُولُ شَيْئًا، فَقَدْ خَفِيَ عَلَى سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ مَعَ مَوْضِعِهِ مِنَ الْإِسْلَامِ وَالْعِلْمِ مَا عَلِمَهُ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ»**

**٢٦٢٥-** عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ: مُرْ أَصْحَابَكَ أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ[1].

باسی زیادکردن لە دەستەواژەی تەلبیە بە وشەی: (ذَا الْمَعَارِجِ) (لَبَّيْكَ ذَا الْمَعَارِجِ) و هاوشێوەی ئەوەش، دژی وتەی ئەو کەسەی ئەو زیادانەی پێ باش نییە، وە باسی کردووە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەو زیادەیان وتووە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی کەسێك لە سەرەتاوە هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ کردبێت و شارەزاش بووبێت، دەگونجێ هەندێ شت لەپێش چاوی بشاردرێتەوە لە زانیاری تایبەت، کەسێك بیزانێت لەخواری ئەوەوە بێت لە تەمەن و زانستدا، چونکە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لەگەڵ پلەوپایەی لە ئیسلام و زانستدا، وە لەگەڵ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە، هەواڵی داوە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەیاندەوت: (ذَا الْمَعَارِجِ) و هاوشێوەی ئەویش، وە جابری کوڕی عەبدوڵا لەخواری ئەوەوەیە لە تەمەن و زانست و پلە وپایە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، ڕایگەیاندووە ئەوان (ذَا الْمَعَارِجِ) و هاوشێوەی ئەوەیان زیاد دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ گوێی لێ دەبوو هیچی نەدەفەرموو، بێگومان ئەوە لەلای سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص شاراوە بوو، لەگەڵ ئەو پلەوپایەی لە ئیسلامدا هەیبوو لە زانست و زانیاری کە جابری کوڕی عەبدوڵا نەدەگەیشت پێیدا

---

(١) صحيح.

واتە: خەلادی کوڕی سائیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جبریل (علیه السلام) هات بۆ لام، فەرمووی: فەرمان بە هاوەڵانت بکە دەنگیان بەرز بکەنەوە بە تەلبیەکردن.

**٢٦٢٦**- عَنْ جَعْفَرٍ، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ أَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ». قال: وَأَمَّا النَّاسُ يَزِيدُونَ ذَا الْمَعَارِجِ وَنَحْوِهِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَسْمَعُ لَا يَقُولُ شَيْئًا[١].

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ پرسیارمان لێ کرد دەربارەی حەجکردنی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ وتی: دەرچوو بۆ حەجکردن تا کاتێ لەسەر وشترەکەی ڕێك بۆیەوە لەسەر (الْبَيْدَاءِ) تەلبیەی یەکتاپەرستی کرد: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ)، وتی: بەڵام خەڵکی وشەی (ذَا الْمَعَارِجِ) و هاوشێوەی ئەوەیان زیاد دەکرد لەنێو تەلبیەدا، پێغەمبەریش ﷺ گوێی لێ بو و هیچی نەدەوت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالتَّلْبِيَةِ

**٢٦٢٧**- عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ: مُرْ أَصْحَابَكَ أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ[٢].

## باسی بەچاکدانانی دەنگبەرزکردنەوە لە کاتی تەلبیەکردندا

واتە: خەلادی کوڕی سائیب دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جبریل (علیه السلام) هات بۆ لام، فەرمووی: فەرمان بە هاوەڵانت بکە دەنگیان بەرز بکەنەوە بە تەلبیەکردن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الْبَيَانِ أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالْإِهْلَالِ مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ، وَ إِنَّمَا أُمِرَ الْمُهِلُّ بِرَفْعِ الصَّوْتِ بِهِ إِذْ هُوَ مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ

**٢٦٢٨-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَاءَنِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ مُرْ أَصْحَابَكَ فَلْيَرْفَعُوا صِيَاحَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ فَإِنَّهَا شِعَارُ الْحَجِّ»[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی بەرزکردنەوەی دەنگ بە تەلبیەکردن یەکێکە لە دروشمەکانی حەج، بۆیە فەرمان کراوە بە تەلبیەکەر دەنگی بەرز بکاتەوە، چونکە ئەو دەنگبەرز کردنەوەیە لە دروشمەکانی حەجە

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جبريل (عليه السلام) هات بۆ لام، فەرمووی: ئەی موحەممەد فەرمان بە هاوەڵانت بکە دەنگیان بەرز بکەنەوە بە تەلبیەکردن، چونکە ئەوە لە دروشمەکانی حەجە.

**٢٦٢٩-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ لِي: أَشْعِرْ بِالتَّلْبِيَةِ، فَإِنَّهَا شِعَارُ الْحَجِّ»[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: " هَذِهِ اللَّفْظَةُ: «فَإِنَّهَا شِعَارُ الْحَجِّ» مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ أَنَّ الْعَرَبَ قَدْ تَقُولُ: إِنَّ أَفْضَلَ الْعَمَلِ كَذَا، وَإِنَّمَا تُرِيدُ مِنْ أَفْضَلِ، وَخَيْرُ الْعَمَلِ كَذَا، وَإِنَّمَا تُرِيدُ مِنْ خَيْرِ الْعَمَلِ وَالنَّبِيُّ ﷺ، إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «فَإِنَّهَا شِعَارُ الْحَجِّ» أَيْ مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ.

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جبريل (عليه السلام) هات بۆ لام، پێمی فەرمووی: دەنگ بەرز بکەرەوە بە تەلبیەکردن، چونکە ئەوە لە دروشمەکانی حەجە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (فَإِنَّهَا شِعَارُ الْحَجِّ) لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاند بێگومان عەرەب هەندێ جار دەڵێ: (إِنَّ أَفْضَلَ الْعَمَلِ كَذَا)، واتە: بەڕاستی چاکترین کردەوە فلانە شتە، مەبەستی پێی لە چاکترین شتە، وە (خَيْرُ الْعَمَلِ كَذَا)، واتە: خێرترین

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کردەوە فڵانە شتە، مەبەستی پێی لە خێرترین کردەوەیە، وە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە بووە لە فەرموودەکەی: (فَإِنَّهَا شِعَارُ الْحَجِّ)، واتە: چونکە ئەوە لە دروشمەکانی حەجە.

**٢٦٣٠-** عَنْ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَرَنِي جِبْرِيلُ بِرَفْعِ الصَّوْتِ بِالْإِهْلَالِ فَإِنَّهُ مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ»[١].

واتە: عەبدولموتەلیب کوڕی عەبدوڵا دەڵێ: گوێم لە ئەبو هوڕەیڕە بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جبریل فەرمانی پێ کردم دەنگم بەرز بکەمەوە بە تەلبیەکردن، چونکە ئەوە لە دروشمەکانی حەجە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالْإِهْلَالِ مِنْ أَفْضَلِ الْأَعْمَالِ

**٢٦٣١-** عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الْعَجُّ وَالثَّجُّ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْعَجُّ رَفْعُ الصَّوْتِ بِالتَّلْبِيَةِ، وَالثَّجُّ نَحْرُ الْبُدْنِ، وَالدَّمُ مِنَ الْمَنْحَرِ.

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی دەنگبەرزکردنەوە بە تەلبیەکردن لە چاکترینی کردەوەکانە

واتە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چی کردەوەیەك چاکترینە؟ فەرمووی: عەج و ثەج.

ئەبو بەکر دەڵێ: عەج: دەنگبەرزکردنەوەیە بە تەلبیەکردن، وە ثەج: سەربڕینی وشترە، هەروەها هاتنەخوارەوەی خوێنە لە گەردنەوە.

---

(١) المتن صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ وَضْعِ الْإِصْبَعَيْنِ فِي الْأُذُنَيْنِ عِنْدَ رَفْعِ الصَّوْتِ وَالتَّلْبِيَةِ، إِذْ وَضْعُ الْإِصْبَعَيْنِ فِي الْأُذُنَيْنِ عِنْدَ رَفْعِ الصَّوْتِ يَكُونُ أَرْفَعَ صَوْتًا، وَأَمَدَّهُ

**٢٦٣٢-** عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ قَالَ: ثنا ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: انْطَلَقْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلَمَّا أَتَيْنَا وَادِيَ الْأَزْرَقِ قَالَ: «أَيُّ وَادٍ هَذَا؟» قُلْنَا: وَادِي الْأَزْرَقِ قَالَ: «كَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى»، فَنَعَتَ مِنْ طُولِهِ، وَشَعْرِهِ، وَلَوْنِهِ وَاضِعًا أُصْبُعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ لَهُ جَوَارٌ إِلَى اللَّهِ بِالتَّلْبِيَةِ مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي، ثُمَّ نَظَرْنَا حَتَّى أَتَيْنَا قَالَ دَاوُدُ: أَظُنُّهُ ثَنِيَّةَ مُوسَى، فَقَالَ: «أَيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟» فَقُلْنَا: ثَنِيَّةُ مُوسَى قَالَ: «كَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَى يُونُسَ عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ، خِطَامُ النَّاقَةِ خَلِيَّةٌ، عَلَيْهِ جُبَّةٌ لَهُ مِنْ صُوفٍ بِهَذِهِ الثَّنِيَّةِ مُلَبِّيًا»[1].

## باسی سوننەت وایە هەردوو پەنجە بخرێتە هەردوو گوێ لە کاتی دەنگبەرزکردنەوە بە تەلبیەکردن چونکە پەنجە خستنە نێو گوێیەکان لە کاتی دەنگبەرزکردنەوە دەنگ زیاتر بەرز دەکاتەوە

واتە: ئەبولعایە دەڵێ: ئیبنو عەباس ﵄ بۆی باس کردین وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە مەککەوە بۆ مەدینە کاتێ هاتینە (وَادِي الْأَزْرَقِ) فەرمووی: ئەوە چی شیوێکە؟ وتمان: (وَادِي الْأَزْرَقِ)ە، فەرمووی: هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای موسا (علیه السلام) بکەم، وەسفی درێژی و قژ و ڕەنگی کرد، هەردوو پەنجەی خستبووە نێو گوێی، بەتەواوی ملکەچی بۆ خوا دەردەبڕی بە تەلبیەکردن، (لبيك اللهم لبيك) بەنێو ئەم شیوەدا تێپەڕ بوو، پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتینە، داوود (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: گومانم وایە تەپۆڵکەکەی موسا بوو، فەرمووی: ئەوە چی تەپۆڵکەیەکە؟ وتمان: تەپۆڵکەکەی موسا، فەرمووی: هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای یونس (علیه السلام) بکەم لەسەر وشترێکی سوور بوو، ڕەشمەی وشترەکەی ڕیشاڵی دارخورما بوو، جوبەیەکی خوری لەسەر شان بوو، بەنێو ئەم شیوەدا تێپەڕی بەتەلبیەکردنەوە.

---

(١) صحیح.

**٢٦٣٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَمَرَرْنَا بِوَادٍ، فَقَالَ: «أَيُّ وَادٍ هَذَا؟»، فَقَالُوا: وَادِي الْأَزْرَقِ قَالَ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى»، فَذَكَرَ مِنْ لَوْنِهِ وَشَعَرِهِ شَيْئًا لَمْ يَحْفَظْهُ دَاوُدُ وَاضِعًا أُصْبُعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ لَهُ جَوَارٌ إِلَى اللَّهِ بِالتَّلْبِيَةِ مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي قَالَ: ثُمَّ سِرْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى ثَنِيَّةٍ قَالَ: «أَيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟»، فَقَالُوا: هُوَ شَيْءٌ أَوْ كَذَا، فَقَالَ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يُونُسَ عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ عَلَيْهِ جُبَّةٌ صُوفٌ، خِطَامُ نَاقَتِهِ خَلِيَّةٌ مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي مُلَبِّيًا»[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی شەوڕەویمان لە نێوان مەککە و مەدینە، تێپەڕین بەنێو شیوێکدا، فەرمووی: ئەمە چی شیوێکە، وتیان: (وَادِي الْأَزْرَقِ)ە، فەرمووی: هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای موسا (علیه السلام) بکەم، باسی لە ڕەنگی و قژی کرد، داوود (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) باش لەبەری نەکردبوو، هەردوو پەنجەی خستبووە نێو گوێی، بەتەواوی ملکەچی بۆ خوا دەردەبڕی بەتەلبیەکردن، (لبيك اللهم لبيك) بەنێو ئەم شێوە تێپەڕی، وتی: پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتینە تەپۆڵکەیەك، فەرمووی: ئەوە چی تەپۆڵکەیەکە؟ وتیان: ئەوە فڵانە تەپۆڵکەیە، فەرمووی: هەر وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای یونس (علیه السلام) بکەم لەسەر وشترێکی سوور بوو، جوبەیەکی خوری لەسەر شان بوو، ڕەشمەی وشترەکەی ڕیشاڵی دارخورما بوو، بەناو ئەم شیوەدا تێپەڕی.

## بَابُ ذِكْرِ تَلْبِيَةِ الْأَشْجَارِ وَالْأَحْجَارِ اللَّوَاتِي عَنْ يَمِينِ الْمُلَبِّي وَعَنْ شِمَالِهِ عِنْدَ تَلْبِيَةِ الْمُلَبِّي

**٢٦٣٤-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُلَبٍّ يُلَبِّي إِلَّا لَبَّى مَا عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ مِنْ شَجَرٍ وَحَجَرٍ حَتَّى تَنْقَطِعَ الْأَرْضُ هَاهُنَا وَهَاهُنَا يَعْنِي عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ»[٢].

## باسی تەلبیەکردنی درەختەکان و بەردەکان ئەوانەی لەلای ڕاست و چەپی تەلبیەکەرن، لە کاتی تەلبیەکردنی تەلبیەکەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر تەلبیەکەرێك تەلبیە بکات ئیللا ئەوەی لە لای ڕاست و چەپیەتی لە درەخت و بەرد تەلبیە دەکەن، تا زەوی کۆتایی دێت ئاوا و ئاوا، واتە: لای ڕاستی و لای چەپی.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ مَعُونَةِ الْمُحْرِمِ لِلْحَلَالِ عَلَى الِاصْطِيَادِ بِالْإِشَارَةِ وَمُنَاوَلَةِ السِّلَاحِ الَّذِي يَكُونُ عَوْنًا لِلْحَلَالِ عَلَى الِاصْطِيَادِ

**٢٦٣٥**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ أَبِي قَتَادَةَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّهُمْ كَانُوا فِي سَفَرٍ وَفِيهِمْ مَنْ قَدْ أَحْرَمَ قَالَ: فَرَكِبَ أَبُو قَتَادَةَ فَرَسَهُ، فَأَتَى حِمَارَ وَحْشٍ فَأَصَابَهُ فَأَكَلُوا مِنْ لَحْمِهِ، ثُمَّ كَأَنَّهُمْ هَابُوا ذَلِكَ فَسَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «اشْتَرَكْتُمْ أَوْ أَشَرْتُمْ؟». قَالوا: لَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَكُلُوهُ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی ئیحرامپۆش یارمەتی کەسێك بدات لە ئیحرامدا نەبێت بۆ ڕاوکردن، بەئاماژە و پێدانی چەك کە ببێتە یارمەتیدەری ئەو کەسەی ئیحرامی نەبەستووە لەسەر ڕاوکردن

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ باسی کرد: ئەوان لە گەشتێکدا بوون، خەڵکێکیان تێدا بوو ئیحرامی بەستبوو، وتی: ئەبو قەتادە سواری ئەسپەکەی بوو، کەرەکێوییەکی ڕاو کرد، دواتر لە گۆشتەکەیان خوارد، پاشان ترسان لە خواردنی گۆشتەکە، پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: بەشدار بوون لەگەڵی یان ئاماژەتان بۆ کرد؟ وتیان: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێی بخۆن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُحْرِمَ إِذَا أَشَارَ لِلْحَلَالِ الصَّيْدَ فَاصْطَادَهُ الْحَلَالُ، لَمْ يَجُزْ أَكْلُهُ لِلْمُحْرِمِ

**٢٦٣٦**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّهُ أَصَابَ حِمَارَ وَحْشٍ، وَهُوَ مَعَ قَوْمٍ، وَهُمْ مُحْرِمُونَ، فَذَكَرُوهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «أَصِدْتُمْ أَوْ أَعَنْتُمْ أَوْ أَشَرْتُمْ؟». قَالوا: لَا قَالَ: «فَكُلُوهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئیحرامپۆش ئەگەر ئاماژە بۆ ئیحرامنەپۆش بکات بۆ ڕاوکردنی نێچیرێك، ئیحرامنەپۆشەکەش ڕاوی بکات، دروست نییە ئیحرامپۆشەکە لێی بخوات

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ: ئەو کەرەکێوییەکی ڕاو کرد، لەگەڵ خەڵکێکدا بوو ئیحرامیان بەستبوو، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد (ئایا حەلاڵە بۆیان لە گۆشتەکەی بخۆن)؟ فەرمووی: ڕاوتان کرد یان یارمەتیتان دا یان ئاماژەتان بۆی کرد، وتیان: نەخێر، فەرمووی: لێی بخۆن.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ قَبُولِ الْمُحْرِمِ الصَّيْدَ إِذَا أُهْدِيَ لَهُ فِي إِحْرَامِهِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُحْرِمَ غَيْرَ جَائِزٍ لَهُ مِلْكُ الصَّيْدِ فِي إِحْرَامِهِ»

**٢٦٣٧-** عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا بِالْأَبْوَاءِ قَالَ ابْنُ مَعْمَرٍ: أَوْ بِوَدَّانَ، فَأَهْدَيْتُ لَهُ حِمَارًا وَحْشِيًّا فَرَدَّهُ إِلَيَّ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِي قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ بِرَادٍّ عَلَيْكَ، وَلَكِنَّا حُرُمٌ». وَفِي خَبَرِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قُلْتُ لِابْنِ شِهَابٍ: الْحِمَارُ عَقِيرٌ؟ قَالَ: لَا أَدْرِي[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي مَسْأَلَةِ ابْنِ جُرَيْجٍ الزُّهْرِيَّ وَإِجَابَتِهِ إِيَّاهُ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ مَنْ قَالَ فِي خَبَرِ الصَّعْبِ أَهْدَيْتُ لَهُ لَحْمَ حِمَارٍ أَوْ رِجْلَ حِمَارٍ وَاهِمٌ فِيهِ، إِذِ الزُّهْرِيُّ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ لَا يَدْرِي الْحِمَارَ كَانَ عَقِيرًا أَمْ لَا حِينَ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ ؟ وَكَيْفَ يُرْوَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُهْدِيَ لَهُ لَحْمُ حِمَارٍ أَوْ رِجْلُ حِمَارٍ، وَهُوَ لَا يَدْرِي كَانَ الْحِمَارُ الْمُهْدَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ عَقِيرًا أَمْ لَا؟ قَدْ خَرَّجْتُ أَلْفَاظَ هَذَا الْخَبَرِ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ، مَنْ قَالَ فِي الْخَبَرِ أَهْدَيْتُ لَهُ لَحْمَ حِمَارٍ أَوْ قَالَ: رِجْلَ حِمَارٍ أَوْ قَالَ: حِمَار.

## باسی کەراهەتی وەرگرتنی نێچیری ڕاوکراو ئەگەر لە ئیحرامدا بەدیاری بۆی هات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی دروست نییە بۆ ئیحرامپۆش لە کاتی ئیحرامدا نێچیرێك بکاتە موڵکی خۆی

واتە: صەعبی کوڕی جوسامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامدا تێپەڕ بوو، منیش لە (الْأَبْوَاء) بووم، ئیبنو مەعمەر (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: یان

---

(١) صحيح.

لە (وَدَّانَ) بووم، کەرێکی کێویم بەدیاری بۆی هێنا، ڕەتی کردەوە بۆم، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بێتاقەتی لە ڕوخسارمدا بەدی کرد، فەرمووی: ئەگەر لە ئیحرامدا نەبووینایە ڕەتمان نەدەکردەوە، وە لە فەرموودەکەی ئیبنو جوڕەیج (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) هاتووە، بە ئیبنو شیهابم وت: کەرەکە سەر بڕابوو؟ وتی: نازانم.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە پرسیارکردنی ئیبنو جوڕەیج لە زوهری و وەڵامدانەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەس لە فەرموودەکەی صەعب وتی: گۆشتی کەرێکم بەدیاری بۆی برد، یان قاچی کەرێك هەڵەی کردووە تیایدا، چونکە زوهری ڕایگەیاند ئەو نەیزانی ئەو کەرەی کە بەدیاری درا بە پێغەمبەر ﷺ سەر بڕابوو یان نا؟ نەك کاتێ کە بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ؟ چۆن دەگێڕدرێتەوە پێغەمبەر ﷺ گۆشتی کەرەکێوییەك یان قاچی بەدیاری بۆ هێنرا، لە کاتێکدا ئەو نازانێ ئەوەی بەدیاری نێردراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ سەربڕاوە یان نا؟ بێگومان دەستەواژەی ئەم فەرموودەم لە کتێبی (الْكَبِيرِ) تەخریج کردووە، ئەوەی لە فەرموودەکەدا وتوویەتی: گۆشتی کەرم بۆی برد، یان وتی: قاچی کەر، یان وتی: کەرێك.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي إِبَاحَةِ أَكْلِ لَحْمِ الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ قَدْ يَحْسَبُ بَعْضُ مَنْ لَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْخَبَرِ الْمُجْمَلِ وَالْمُفَسَّرِ، أَنَّ أَكْلَ لَحْمِ الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ إِذَا اصْطَادَهُ الْحَلَالُ، طَلْقٌ حَلَالٌ بِكُلِّ حَالٍ

**٢٦٣٨-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ طَلْحَةَ ﷺ وَنَحْنُ حُرُمٌ فَأُهْدِيَ لَهُ طَيْرٌ، وَطَلْحَةُ رَاقِدٌ، فَمِنَّا مَنْ أَكَلَ، وَمِنَّا مَنْ تَوَرَّعَ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ طَلْحَةُ، وَفَّقَ مَنْ أَكَلَ، وَقَالَ: أَكَلْنَاهُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ الدَّوْرَقِيِّ، وَقَالَ بُنْدَارٌ: عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْبَارُ أَبِي قَتَادَةَ وَتَصْوِيبُ النَّبِيِّ ﷺ فِعْلَ مَنْ أَكَلَ الصَّيْدَ الَّذِي اصْطَادَهُ أَبُو قَتَادَةَ، وَمَسْأَلَتُهُ إِيَّاهُمْ هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ؟ وَأَكْلُهُ مِنْ ذَلِكَ اللَّحْمِ مِنْ هَذَا الْبَابِ، وَخَبَرُ عُمَيْرِ بْنِ سَلَمَةَ الضُّمَيْرِيِّ مِنْ هَذَا الْبَابِ أَيْضًا.

---

(١) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، سەبارەت بە خواردنی گۆشتی نێچیری ڕاوکراو بۆ ئیحرامپۆش، کورت و نارِوونە (مُجْمَل) شیکراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)، هەندێ لەوانەی کە فەرموودەی ناڕوون و ڕوون لە یەکدی جیا ناکەنەوە وا دەزانن خواردنی گۆشتی نێچیری ڕاوکراو بۆ ئیحرامپۆش، ئەگەر کەسێك ڕاوی بکات ئیحرامی نەپۆشی بێت، بەرەهایی حەلاڵە لە هەموو کاتێکدا**

واتە: موعازی کوڕی عەبدوڕەحمانی تەمیمی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ تەڵحە ﷺ بووین، ئیحرامان پۆشی بوو، باڵندەیەکی بەدیاری بۆی هێنرا، تیاماندا بوو لێی خوارد، تیاشماندا بوو لێی نەخوارد، کاتێ تەڵحە لە خەو هەستا دەستخۆشی لەوە کرد کە لێی خوارد، وتی: ئێمەیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ خواردمان.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەواڵدانی ئەبو قەتادە و بە پەسەند دانانی کردەوەی ئەو کەسەی لە گۆشتی ڕاوەکەی خوارد کە ئەبو قەتادە ڕاوی کردبوو لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، وە پرسیارکردنی لێیان ئایا شتێکتان لە گۆشتەکەی لەلا ماوە لەم بەشەیە.

**بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي رَدِّهِ لَحْمَ صَيْدٍ أُهْدِيَ لَهُ فِي إِحْرَامِهِ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ، وَقَدْ يَحْسَبُ بَعْضُ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ وَلَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْمُجْمَلِ وَالْمُفَسَّرِ مِنَ الْأَخْبَارِ، أَنَّ لَحْمَ الصَّيْدِ مُحَرَّمٌ عَلَى الْمُحْرِمِ بِكُلِّ حَالٍ، وَإِنِ اصْطَادَهُ الْحَلَالُ**

**٢٦٣٩**- عَنِ طَاوُسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: اسْتَذْكِرْهُ كَيْفَ حَدَّثْتَنَا عَنْ لَحْمٍ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ ؟ فَاسْتَذْكَرْتُهُ، فَقَالَ: أُهْدِيَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ لَحْمُ صَيْدٍ وَهُوَ مُحْرِمٌ فَرَدَّهُ، وَقَالَ: «إِنَّا حُرُمٌ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: رَوَاهُ زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَحْمَ صَيْدٍ، فَقَالَ: «لَوْلَا أَنَّا حُرُمٌ قَبِلْنَاهُ» حَدَّثَنَاهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعِيدٍ الْجَوْهَرِيُّ، حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ بِشْرِ بْنِ مُسْلِمٍ، عَنْ زُهَيْرٍ.

---

(١) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَخَبَرُ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ دَالٌّ عَلَى أَنَّ مَنْ قَالَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ حِمَارُ وَحْشٍ أَرَادَ خَبَرَهُ عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ رِوَايَةَ مَنْ قَالَ أَهْدَيْتُ لَهُ حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَلَعَلَّهُ شُبِّهَ عَلَى بَعْضِ الرُّوَاةِ، فَجَعَلَ خَبَرَ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ فِي ذِكْرِ لَحْمِ الصَّيْدِ فِي قِصَّةِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ، وَخَبَرَ عَائِشَةَ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ لَحْمُ ظَبْيٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ فَلَمْ يَأْكُلْهُ كَخَبَرِ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، وَالْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ.

**باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە گۆشتی نێچیری ڕاوكراوی ڕەت كردەوە كە بەدیاری بۆی هێنرا، كورت و ناڕوونە (مُجْمَل) شیكراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)، جا هەندێ لەوانەی كە زۆر شارەزا نییە لە زانست و فەرموودەی ناڕوون و ڕوون لە یەكدی جیا ناكاتەوە لە فەرموودەكان، وا گومان دەبات گۆشتی نێچیری ڕاوكراو قەدەغەیە لەسەر ئیحرامپۆش لە هەموو حاڵەتەكان، ئەگەرچی ئیحرامنەپۆش ڕاوی كردبێت**

واتە: تاوس دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەڵێ: کاتێ زەیدی کوڕی ئەرقەم هات بۆ لای ئیبنو عەباس، (ئیبنو عەباس) پێی وت: ئەو فەرمووده بخەرەوە یادمان کە پێشتر باست کرد بۆمان دەربارەی ئەو گۆشتەی بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ؟ زەیدیش بۆی باس کرد، وتی: گۆشتی نێچری ڕاوکراو هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ئەو لە ئیحرامدا بوو، ئەویش ڕەتی کردەوە، فەرمووی: ئێمە لە ئیحرامداین.

ئەبو بەکر دەڵێ: زوهەیر گێڕاویەتەوە لە ئەبو زوبەیر، لە تاوس، لە ئیبنو عەباس، لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە وتی: گۆشتی نێچیری ڕاوکراو بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەگەر لە ئیحرامدا نەبووینایە وەرماندەگرت.

ئەبو بەکر دەڵێ: جا فەرموودەکەی تاوس لە ئیبنو عەباسەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەس وتوویەتی لە ئیبنو عەباسەوە: کەرەکێوی بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، مەبەستی فەرموودەکەی صەعبی کوڕی جەسامەیە، گێڕانەوەی ئەو کەسەی کە وتوویەتی: کەرێکی کێویم بەدیاری بۆی هێنا، پێدەچێت تێکەڵ بووبێت لەلای هەندێ لە گێڕەرەوەکان، فەرموودەکەی ئیبنو عەباس کە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە هێناویەتی لە باسکردنی گۆشتی ڕاو لە چیرۆکی صەعبی کوڕی جەسامە، وە

فەرموودەکەی عائیشە گۆشتی ئاسك بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ئیحرامدا بوو، لێی نەخوارد، وەکوو فەرموودەکەی زەیدی کوڕی ئەرقەم و بەڕائی کوڕی عازیبە.

**٢٦٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ مَكَّةَ - لَمْ يَقُلِ ابْنُ مَعْمَرٍ مَكَّةَ - فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَسْتَذْكِرُ: كَيْفَ أَخْبَرْتَنِي عَنْ لَحْمٍ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ حَرَامًا؟ قَالَ: نَعَمْ أَهْدَى لَهُ رَجُلٌ عُضْوًا مِنْ لَحْمِ صَيْدٍ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: «إِنَّا لَا نَأْكُلُهُ إِنَّا حُرُمٌ»[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: زەیدی کوڕی ئەرقەم هات بۆ مەککە -ئیبنو مەعمەر (کە یەکێکە لە گێرەرەوەی ئەم فەرموودەیە) نەیوت: مەککە- ئیبنو عەباس پێی وت: بیرم بخەرەوە ئەوە چۆن بوو هەواڵت پێ دام دەربارەی ئەو گۆشتەی بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەو لە ئیحرامدا بوو؟ وتی: بەڵێ، پیاوێك گۆشتی ئەندامی نێچیرێکی ڕاوکراوی بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بۆی گەڕاندەوە و فەرمووی: ئێمە نایخۆین چونکە لە ئیحرامداین.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلْأَخْبَارِ الَّتِي ذَكَرْنَاهَا فِي الْبَابَيْنِ الْمُتَقَدِّمَيْنِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ أَكْلَ لَحْمِ الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ إِذَا اصْطَادَهُ الْحَلَالُ، إِذَا لَمْ يَكُنِ الْحَلَالُ اصْطَادَهُ مِنْ أَجْلِ الْمُحْرِمِ، وَإِنَّهُ إِنَّمَا كَرِهَ لِلْمُحْرِمِ أَكْلَ لَحْمِ الصَّيْدِ الَّذِي اصْطَادَهُ الْحَلَالُ مِنْ أَجْلِ الْحَرَامِ»

**٢٦٤١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لَحْمُ صَيْدِ الْبَرِّ لَكُمْ حَلَالٌ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ مَا لَا تَصِيدُوهُ أَوْ يُصَدُ لَكُمْ»[2].

**باسی فەرموودەیەك ڕوونکەرەوەی ئەو فەرموودانەیە کە لە دوو بەشەکەی پێشوودا باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ڕێگەی داوە بە ئیحرامپۆش گۆشتی ڕاوکراو بخوات ئەگەر ئیحرامنەپۆش ڕاوی کردبوو، ئەگەر ئیحرامنەپۆش لەبەر ئیحرامپۆش ڕاوی نەکردبوو، بێگومان بۆیە باش نییە ئیحرامپۆش گۆشتی نێچیری ڕاوکراو بخوات کە ئیحرامنەپۆش ڕاوی کردووە ئەگەر لەبەر ئیحرامپۆش ڕاوی کردبوو**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گۆشتی نێچیری ڕاوکراوی دەشت حەڵاڵە بۆتان، لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدا بن، بەمەرجێ خۆتان ڕاوتان نەکردبێت یان بۆتان ڕاو نەکرابێت.

**٢٦٤٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فَأَحْرَمَ أَصْحَابِي، وَلَمْ أُحْرِمْ فَرَأَيْتُ حِمَارًا فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ فَاصْطَدْتُهُ فَذَكَرْتُ شَأْنَهُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَذَكَرْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَحْرَمْتُ، وَأَنِّي إِنَّمَا اصْطَدْتُهُ لَكَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَهُ، فَأَكَلُوا، وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ حِينَ أَخْبَرْتُهُ أَنِّي اصْطَدْتُهُ لَهُ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ الزِّيَادَةُ: إِنَّمَا اصْطَدْتُهُ لَكَ، وَقَوْلُهُ: وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ حِينَ أَخْبَرْتُهُ أَنِّي اصْطَدْتُهُ لَكَ، لَا أَعْلَمُ أَحَدًا ذَكَرَهُ فِي خَبَرِ أَبِي قَتَادَةَ غَيْرَ مَعْمَرٍ فِي هَذَا الْإِسْنَادِ، فَإِنْ صَحَّتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ فَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ ﷺ أَكَلَ مِنْ لَحْمِ ذَلِكَ الْحِمَارِ، قَبْلَ أَنْ يُعْلِمَهُ أَبُو قَتَادَةَ أَنَّهُ اصْطَادَهُ مِنْ أَجْلِهِ، فَلَمَّا أَعْلَمَهُ أَبُو قَتَادَةَ أَنَّهُ اصْطَادَهُ مِنْ أَجْلِهِ امْتَنَعَ مِنْ أَكْلِهِ بَعْدَ إِعْلَامِهِ إِيَّاهُ أَنَّهُ اصْطَادَهُ مِنْ أَجْلِهِ؛ لِأَنَّهُ قَدْ ثَبَتَ عَنْهُ ﷺ أَنَّهُ قَدْ أَكَلَ مِنْ لَحْمِ ذَلِكَ الْحِمَارِ.

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ حەج لە سەردەمی حودەیبیەدا هاوەڵەکانم ئیحرامیان بەستبوو، بەڵام من ئیحرامم نەبەستبوو، کەرێکی کێویم بینی پەلامارم دا و ڕاوم کرد، دواتر ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، وە ئەوەیشم باس کرد من ئیحرامم نەبەستبوو، تەنها بۆ تۆ ڕاوم کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵانی لێی بخۆن، ئەوانیش لێیان خوارد بەڵام کاتێ وتم: بۆ تۆ ڕاوم کرد، لێی نەخوارد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم زیادەیە: (إِنَّمَا اصْطَدْتُهُ لَكَ)، واتە: تەنها بۆ تۆ ڕاوم کرد، وە وتەکەی: (وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ حِينَ أَخْبَرْتُهُ أَنِّي اصْطَدْتُهُ لَكَ)، واتە: بەڵام کاتێ وتم: بۆ تۆ ڕاوم کرد، لێی نەخوارد. زانیاریم نییە کەسێك لە فەرموودەکەی ئەبو قەتادە باسی کردبێت جگە لە مەعمەر (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) لەم سەنەدەدا، ئەگەر ئەو دەستەواژەیە تەواو بێت پێدەچێت پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی ئەو کەرەی خواردبێت، پێش ئەوەی ئەبو قەتادە پێی ڕاگەیاندبێت کە ئەو لەبەر ئەو ڕاوی کردووە، جا کاتێ

---

(١) صحيح.

ئەبو قەتادە پێی ڕاگەیاند ئەو لەبەر ئەو ڕاوی کردووە، دەستی هەڵگرت لە خواردنی، دوای ئەوەی پێی ڕاگەیاند ئەو لەبەر ئەو ڕاوی کردووە، چونکە جێگیر بووە لێیەوە پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی ئەو کەرەی خوارد.

**٢٦٤٣-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُمْ مُحْرِمُونَ، وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ فَرَأَى حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَرَكِبَ فَرَسَهُ، وَسَأَلَهُمْ أَنْ يُنَاوِلُوهُ الرُّمْحَ أَوِ السَّوْطَ فَأَبَوْا أَنْ يُنَاوِلُوهُ، فَتَنَاوَلَهُ، ثُمَّ شَدَّ عَلَيْهِ، فَعَقَرَهُ، ثُمَّ جَاءَ بِهِ فَلَحِقُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ؟». قَالوا: نَعَمْ، فَأَتَوْهُ بِرِجْلِهِ، فَأَكَلَ مِنْهَا[١].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، ئەوان ئیحرامیان بەستبوو، بەڵام ئەو ئیحرامی نەبەستبوو، کەرێکی کێوی بینی، دواتر سواری ئەسپەکەی بوو، داوای کرد ڕمەکە یان قامچییەکەی بدەنێ، بەڵام ئەوان نکوولیان کرد پێی بدەن، پاشان خۆی هەڵیگرت، ئینجا هەڵی کوتایە سەری و سەری بڕی، پاشان هێنای، دواتر کە گەیشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان بۆی باس کرد، فەرمووی: ئایا هیچتان لەلایە لە گۆشتەکەی؟ وتیان: بەڵێ، ڕانەکەیان هێنا، ئەویش لێی خوارد.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ أَكْلِ الْمُحْرِمِ بَيْضَ الصَّيْدِ، إِذَا أُخِذَ الْبَيْضَةَ مِنْ أَجْلِ الْمُحْرِمِ

**٢٦٤٤-** عَنِ طَاوسٍ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: يَا زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُهْدِيَ لَهُ بَيْضَاتُ نَعَامٍ وَهُوَ حَرَامٌ فَرَدَّهُنَّ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ جَابِرٍ: لَحْمُ الصَّيْدِ حَلَالٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ مَا لَمْ تَصِيدُوهُ أَوْ يُصَدْ لَكُمْ، دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ بَيْضَ الصَّيْدِ مُبَاحٌ لِلْمُحْرِمِ إِذَا لَمْ يُؤْخَذْ مِنْ أَجْلِ الْمُحْرِمِ؛ لِأَنَّ حُكْمَ بَيْضِ الصَّيْدِ لَا يَكُونُ أَكْثَرَ مِنْ حُكْمِ لَحْمِهِ.

## باسی سەرزەنشتکردن لە خواردنی هێلکەی ڕاو لەلایەن ئیحرامپۆش، ئەگەر ئەو هێلکەی لەبەر ئیحرامپۆش هەڵگرت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: تاوس دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عەباسەوە ﷻ ئەو وتی: ئەی زەیدی کوڕی ئەرقەم ئایا زانیوتە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند هێلکەیەکی نەعامەی بەدیاری بۆ هێنرابێت، لە کاتێکدا ئەو لە ئیحرامدا بووبێت و ڕەتی کردبێتەوە؟ وتی: بەڵێ.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی جابردا هاتووە: گۆشتی نێچیری ڕاو بۆ ئێوە حەڵاڵە لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بن بەمەرجێ خۆتان ڕاوتان نەکردبێت و یان بۆتان ڕاو نەکرابێت، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هێلەکەی نێچیری ڕاو بۆ ئیحرامپۆش ڕێگەپێدراوە، ئەگەر لەبەر ئیحرامپۆش هەڵنەگیرێ، چونکە حوکمی هێلکەی نێچیری ڕاو زیاتر نییە لە حوکمی گۆشتەکەی.

**بَابُ الزَّجْرِ عَنْ قَتْلِ الضَّبُعِ فِي الْإِحْرَامِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ الْمُوَلَّى بِبَيَانِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ مِنَ الْوَحْيِ إِلَيْهِ، قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الضَّبُعَ صَيْدٌ، وَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي مُحْكَمِ تَنْزِيلِهِ قَدْ نَهَى الْمُحْرِمَ عَنْ قَتْلِ الصَّيْدِ فَقَالَ: ﴿لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴿٩٥﴾﴾ المائدة**

٢٦٤٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ قَالَ: لَقِيتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷻ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الضَّبُعِ، أَنَأْكُلُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ؟ قُلْتُ: أَصَيْدٌ هِيَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: نَعَمْ[1].

**باسی سەرزەنشتکردن لە کوشتنی کەمتیار لە ئیحرامدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خواوە ڕاسپێردراوە ئەوەی دایبەزاندوە بە وەحی شی بکاتەوە، ڕایگەیاندووە کەمتیار نێچیرە، خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا قەدەغەی کردووە لە ئیحرامپۆش نێچیر بکوژێ و فەرموویەتی: ﴿لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴿٩٥﴾﴾، واتە: ڕاو مەکەن لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان**

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو عەممار دەڵێ: گەیشتم بە جابری کوڕی عەبدوڵا ﷻ پرسیارم لێ کرد دەربارەی کەمتیار، ئایا بیخۆین؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئایا نێچیرە (واتە: گۆشتی دەخورێ)؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووتە؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ جَزَاءِ الضَّبُعِ إِذَا قَتَلَهُ الْمُحْرِمُ

٢٦٤٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الضَّبُعِ يُصِيبُهُ الْمُحْرِمُ كَبْشًا نَجْدِيًّا، وَجَعَلَهُ مِنَ الصَّيْدِ[١].

## باسی تۆڵەی کوشتنی کەمتیار ئەگەر ئیحرامپۆش ڕاوی کرد

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا هەر ئیحرامپۆشێك کەمتیارێك بکوژێ دەبێ بەرانێکی نەجدی سەر ببڕێت، وە کەمتیاری دانا بە یەکێك لەو ئاژەڵانەی کە ڕاو دەکرێن (واتە: گۆشتی حەڵاڵە).

٢٦٤٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَضَى فِي الضَّبُعِ بِكَبْشٍ[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دادگەری کرد لە کوشتنی کەمتیار بە بەرانێك.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَبْشَ الَّذِي قُضِيَ بِهِ جَزَاءً لِلضَّبُعِ هُوَ الْمُسِنُّ مِنْهُ لَا مَا دُونَ الْمُسِنِّ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: ﴿فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ ۝٩٥﴾ المائدة، أَقْرَبَ الْأَشْيَاءِ شَبَهًا بِالْبُدْنِ مِنَ النَّعَمِ، لَا مِثْلَهُ فِي الْقِيمَةِ كَمَا قَالَهُ بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ، إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ قِيمَةَ الضَّبُعِ تَخْتَلِفُ فِي الْأَزْمَانِ وَالْبُلْدَانِ، وَكَذَلِكَ قِيمَةُ الْكَبْشِ قَدْ تَزِيدُ وَتَنْقُصُ فِي بَعْضِ الْأَزْمَانِ وَالْبُلْدَانِ، وَلَوْ كَانَ الْمِثْلُ فِي الْقِيمَةِ لَمْ يَجْعَلْ ﷺ جَزَاءَ الضَّبُعِ كَبْشًا فِي كُلِّ وَقْتٍ وَزَمَانٍ وَفِي كُلِّ بَلَدٍ

٢٦٤٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الضَّبُعُ صَيْدٌ، فَإِذَا أَصَابَهُ الْمُحْرِمُ، فَفِيهِ جَزَاءُ كَبْشٍ مُسِنٍّ وَتُوكَلُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو بەرانەی کە بڕیار درا لە تۆڵەی کەمتیارێك سەر ببڕدرێت، بریتییە لە بەرانێکی پیر نەك لەخواری پیر، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لە فەرمایشتەکەیدا فەرموویەتی: ﴿فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ (٩٥)، واتە: ئەوە سزاکەی هاوشێوەی ئەو نێچیرەی کە ڕاوی کردووە لە وشتر و مانگا و مەڕ و بزن. مەبەستی ئەو شتانە بووە کە هاوشێوەی وشتر و مانگا و مەڕ و بزنن، نەك هاوشێوەیان لە نرخدا، وەکوو هەندێ لە عێراقییەکان وتوویەتی، چونکە زانراوە کە نرخی کەمتیار لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت یان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە، هەروەها بەرانیش، ئەگەر مەبەستی هاوشێوە بووایە لە نرخدا ئەوە تۆڵەی کەمتێکارێکی بە بەرانێك دانەدەنا لە هەموو سەردەم و لە هەموو وڵاتێکدا**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەمتیار نێچیرە، ئەگەر ئیحرامپۆش ڕاوی کرد و کوشتی، ئەوە تۆڵەی بەرانێکی پیرە و گۆشتەکەیش دەخورێت.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ تَزْوِيجِ الْمُحْرِمِ وَخِطْبَتِهِ وَإِنْكَاحِهِ

**٢٦٤٩-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلَا يُنْكَحُ»[1].

**باسی سەرزەنشتکردن لەوەی ئیحرامپۆش ژن بۆ خۆی مارە ببڕێ، هەروەها داوای بکات و، بۆ کەسێکدیکەش مارەی ببڕێ**

واتە: عوسانی کوڕی عەفان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیحرامپۆش نابێ بۆ خۆی ئافرەت مارە بکات، وە نابێ بۆ کەسێکی دیکە مارەی بکات.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ أَفْعَالٍ اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي إِبَاحَتِهِ لِلْمُحْرِمِ، نَصَّتْ سُنَّةُ النَّبِيِّ ﷺ أَوْ دَلَّتْ عَلَى إِبَاحَتِهَا.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي غَسْلِ الْمُحْرِمِ رَأْسَهُ.

---

(١) صحيح.

٢٦٥٠- عن إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: امْتَرَى الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ، وَابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ وَهُمَا بِالْعَرْجِ فِي غُسْلِ الْمُحْرِمِ رَأْسَهُ وَقَالَ مَرَّةً فِي غَسْلِ النَّبِيِّ ﷺ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلُونِي إِلَى أَبِي أَيُّوبَ أَسْأَلُهُ، فَأَتَيْتُهُ بِالْعَرْجِ، وَهُوَ يَغْتَسِلُ بَيْنَ قَرْنَيِ الْبِئْرِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَلَمَّا رَآنِي ضَمَّ الثَّوْبَ إِلَى صَدْرِهِ حَتَّى كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى صَدْرِهِ، فَقُلْتُ: إِنَّ ابْنَ أَخِيكَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ أَسْأَلُكَ كَيْفَ رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَأَمَرَ بِدَلْوٍ فَصَبَّ، فَأَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ، فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ بِهِمَا فِي رَأْسِهِ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ، فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ الْمِسْوَرُ: لَا أُمَارِيكَ فِي شَيْءٍ بَعْدَهَا أَبَدًا[1].

## کۆباسی کۆمەڵەکردەوەیەك زانایان جیاوازییان هەیە لە ڕێگەپێدانی، فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بەدەق هاتووە لەبارەیەوە یان بەڵگەیە لەسەر ڕێگەپێدانی

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ئیحرامپۆش سەری بشوات

واتە: ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حەنین دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: میسوەری کوڕی مەخرەمە و ئیبنو عەباس ﷺ بووبە مشتومڕیان، لە کاتێکدا هەردووکیان لە (الْعَرْج) بوون (لادێیەکە کە لە مەدینە دەردەچیت لەسەر ڕێگای مەککەیە) دەربارەی ئەوەی ئیحرامپۆش سەری بشوات، جارێکی دیکە وتی: دەربارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ سەری شۆردووە، دواتر ناردمیان بۆ لای ئەبو ئەیوب تا پرسیاری لێ بکەم، هاتم بۆ لای لە (الْعَرْج)، لەسەر بیرێك خۆی دەشۆرد، سڵاوم لێ کرد، کاتێ کە بینیمی جلەکانی لەسەر سنگی کۆ کردەوە تا وەکوو ئەوەی تەماشای سنگی بکەم، وتم: عەبدوڵای کوڕی عەباسی برازات ناردوومی پرسیارت لێ بکەم چۆن پێغەمبەری خوات ﷺ بینی سەری بشوات لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو؟ داوای سەتڵێکی کرد ئاوی کرد بەسەریدا، ئاوی پێدا هێنایە خوارەوە، هەردوو دەستی خستە نێو سەری بۆ پێش و بۆ دواوە دەیبرد، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەوشێوەی کرد، دواتر هاتم بۆ لای ئیبنو عەباس هەواڵم پێ دا، میسوەر پێی وت: ئیتر لەمەودوا لە هیچ شتێکدا مشتومڕت لەگەڵ ناکەم.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْحِجَامَةِ لِلْمُحْرِمِ مِنْ غَيْرِ قَطْعِ شَعَرٍ وَلَا حَلْقِهِ

**٢٦٥١-** عن ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ يَقُولُ: احْتَجَمَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ[(١)].

## باسی مۆڵەتدان بە کەڵەشاخ بۆ ئیحرامپۆش بەبێ بڕینی قژ و تاشینی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حیجامەی کرد لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ادِّهَانِ الْمُحْرِمِ بِدُهْنٍ غَيْرِ مُطَيِّبٍ إِنْ جَازَ الِاحْتِجَاجُ بِفَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، وَصَحَّتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ مِنْ رِوَايَتِهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ادَّهَنَ وَهُوَ مُحْرِمٌ؛ لِأَنَّ أَصْحَابَ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ قَدِ اخْتَلَفُوا عَنْهُ فِي هَذِهِ اللَّفْظَةِ، أَنَا خَائِفٌ أَنْ يَكُونَ فَرْقَدٌ السَّبَخِيُّ وَاهِمًا فِي رَفْعِهِ هَذَا الْخَبَرَ

**٢٦٥٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ادَّهَنَ بِزَيْتٍ غَيْرِ مُقَتَّتٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ[(٢)].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا خَائِفٌ أَنْ يَكُونَ فَرْقَدٌ السَّبَخِيُّ وَاهِمًا فِي رَفْعِهِ هَذَا الْخَبَرَ؛ فَإِنَّ الثَّوْرِيَّ رَوَى عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَدْهِنُ بِالزَّيْتِ حِينَ يُرِيدُ أَنْ يُحْرِمَ.

## باسی مۆڵەت دراوە بە ئیحرامپۆش ڕۆنێك بەکار بهێنێ بۆنی خۆشی تێکەڵ نەکرابێت، ئەگەر دروست بێت فەرموودەی فەرقەدی سەبخی وەربگیرێت، (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وە ئەم دەستەواژەیەش تەواو بێت لە گێڕانەوەکەی، پێغەمبەر ﷺ ڕۆنی بەکارهێنا لە کاتێکدا لە ئیحرامیشدا بوو، چونکە هاوەڵانی حەمادی کوڕی سەلەمە جیاوازییان هەبوو لە فەرقەدەوە لەم دەستەواژەیە، من دەترسم لەوەی فەرقەدی سەبخی هەڵە بووبێت لە ڕەفعکردنی ئەم فەرموودەیە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆنێکی بەکار هێنا بۆ سەر و ڕیشی بۆنی خۆشی تێکەڵ نەکرابوو، لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

ئەبو بەکر دەڵێ: من دەترسم لەوەی فەرقەدی سەبخی (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) هەڵە بوویێت لە ڕەفعکردنی ئەم فەرموودە، بێگومان سەوری دەگێڕێتەوە، لە مەنصور لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە وتی: ئیبنو عومەر کاتێ لە ئیحرامدا بوو ڕۆنی بەکار دەهێنا بۆ چەورکردنی سەر و ڕیشی.

**٢٦٥٣-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ رَافِعٍ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَاقِ أَخْبَرَنَا الثَّوْرِيُّ قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَقفهُمَا - عِلْمِي - هُوَ الصَّحِيحُ، الِادِّهَانُ بِالزَّيْتِ فِي حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، إِنَّمَا هُوَ مِنْ فِعْلِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ لَا مِنْ فِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَنْصُورُ بْنُ الْمُعْتَمِرِ أَحْفَظُ وَأَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ، وَأَتْقَنَ مِنْ عَدَدٍ مِثْلِ فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ، وَهَكَذَا رَوَاهُ حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ عَنْ حَمَّادٍ ثنا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى ثنا حَجَّاجُ بْنُ مِنْهَالٍ رَوَاهُ وَكِيعُ بْنُ الْجَرَّاحِ عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ، فَقَالَ: عِنْدَ الْإِحْرَامِ، ح ثنا سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ ثنا وَكِيعٌ، وَرَوَاهُ الْهَيْثَمُ بْنُ جَمِيلٍ عَنْ حَمَّادٍ، فَقَالَ: إِذَا أَرَادَ أَنْ يُحْرِمَ، حَدَّثَنَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى نَا الْهَيْثَمُ بْنُ جَمِيلٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَاللَّفْظَةُ الَّتِي ذَكَرَهَا وَكِيعٌ، وَالَّتِي ذَكَرَهَا الْهَيْثَمُ بْنُ جَمِيلٍ لَوْ كَانَ الدُّهْنُ مُقَتَّتًا بِأَطْيَبِ الطِّيبِ جَازَ الِادِّهَانُ بِهِ إِذَا أَرَادَ الْإِحْرَامَ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ تَطَيَّبَ حِينَ أَرَادَ الْإِحْرَامَ بِطِيبٍ فِيهِ مِسْكٌ، وَالْمِسْكُ أَطْيَبُ الطِّيبِ عَلَى مَا خَبَّرَ الْمُصْطَفَى ﷺ[١].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: هەردوو گێڕەرەوەکە بە (موقوف) هێناویانە، بەپێی زانیاری من ئەوەی تەواوە، چەورکردن بە ڕۆن لە فەرموودەکەی سەعیدی کوڕی جوبەیر، لە کردەوەی ئیبنو عومەرە ﵄، نەك لە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ، مەنصوری کوڕی موعتەمەر پارێزراوتر و زاناتر و وردبینترە بە فەرموودە لە ژمارەیەك وەك فەرقەدی سەبخی، وە بەوشێوە حەجاجی کوڕی مینهال گێڕاویەتەوە، لە حەمادەوە، موحەممەدی کوڕی یەحیا بۆی باس کردین، حەجاجی کوڕی مینهال بۆی باس کردین، وەکیعی کوڕی جەڕاح گێڕایەوە، لە حەمادی کوڕی سەلەمە، وتی: (عِنْدَ الْإِحْرَامِ)، واتە: لە کاتی ئیحرام، فەرموودەکە. سەلەمی کوڕی جونادە بۆی باس کردین، وەکیع بۆی باس کردین، وە هەیسەمی کوڕی جەمیل گێڕایەوە، لە حەمادەوە، وتی: (إِذَا أَرَادَ أَنْ يُحْرِمَ)، واتە: ئەگەر بیویستایە ئیحرام ببەستێ، موحەممەدی کوڕی یەحیا بۆی باس کردین لە هەیسەمی کوڕی جەمیلەوە.

---

(١) إسناده صحيح.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەو دەستەواژەی كە وەكیع باسی كرد، وە ئەوەیشی كە هەیسەمی كوڕی جەمیل باسی كرد ئەگەر ڕۆنەكە بۆنی خۆشی تێكەڵ كرابێت دروستە سەر و ڕیشی پێ چەور بكات ئەگەر ویستی ئیحرام ببەستێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ كاتێ ویستی ئیحرام ببەستێ بۆنی خۆشی بەكار هێنا بە بۆنێك میسكی تێدا بوو، میسكیش خۆشترین بۆنە، وەكوو چۆن پێغەمبەر ﷺ ئاوای فەرمووە.

## بَابُ إِبَاحَةِ مُدَاوَاةِ الْمُحْرِمِ عَيْنَهُ - إِذَا أَصَابَهُ رَمَدٌ - بِالصَّبِرِ

**٢٦٥٤-** عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ حَدَّثَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا اشْتَكَى عَيْنَيْهِ، وَهُوَ مُحْرِمٌ ضَمَّدَهُمَا بِالصَّبِرِ»[١].

## باسی ڕێگەدان بەوەی ئیحرامپۆش چارەسەری چاوی بكات -ئەگەر چاوی ئێشا- بە (الصَّبِرِ)

واتە: ئەبانی كوڕی عوسمان دەگێڕێتەوە، عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ باسی كرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ئیحرامپۆش ئەگەر چاوەكانی ئێشا با بە (الصَّبِرِ) تیماریان بكات. (الصَّبِرِ: شتێكی سوور بووە وەكوو كل چاویان پێ ڕشتووە بەمەبەستی چارەسەركردن، چارەسەرێكی بەناوبانگ بووە لەو سەردەمەدا)

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي السِّوَاكِ لِلْمُحْرِمِ

**٢٦٥٥-** عَنِ طاوس ومجاهد عن ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَهَلْ تَسَوَّكَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ قَالَ: نَعَمْ[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە سیواككردنی ئیحرامپۆش

واتە: تاوس و موجاهید دەگێڕنەوە، لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ كەڵەشاخی كرد لە كاتێكدا بەڕۆژوو بوو، وتی: ئایا پێغەمبەر ﷺ سیواكی كردووە لە كاتێكدا كە بەڕۆژوو بوو؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَلْبِيدِ الْمُحْرِمِ رَأْسَهُ كَيْ لَا يَتَأَذَّى بِالْقَمْلِ وَالصِّيبَانِ فِي الْإِحْرَامِ

**٢٦٥٦-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يُهِلُّ مُتَلَبِّدًا ثنا يُونُسُ أَخْبَرَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: قُلْتُ: لِمَالِكٍ يُلَبِّدُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ؟ قَالَ: بِالصَّمْغِ وَالْغَاسُولِ[1].

## باسی ڕوخسەتدان بە ئیحرامپۆش لە کاتی ئیحرامدا جۆرە مادەیەکی لینج بەکار بهێنێ بۆ قژی بۆ ئەوەی سپێ و ڕشک هەراسانی نەکەن

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی دەنگی بەرز دەکردەوە لە ئیحرامبەستندا بە (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إنَّ الحَمْدَ والنِّعْمَةَ لَكَ والمُلْكَ لا شَرِيكَ لَكَ) و جۆرە مادەیەکی لینجی ئەدا لە قژی تا وەك لەباو یەك بگرێ و هەڵنەوەشێ. یونس بۆی باس کردین، ئیبنو وەهب بۆی باس کردین و وتی: بە مالیکم وت: ئایا ئیحرامپۆش مادەی لینج ئەدا لە قژی؟ وتی: بە (الصَّمْغِ) و (الْغَاسُولِ). (الصَّمْغِ: جۆرە ماددەیەکە لە درەخت دەردەچێت و لینجە و بۆ بەیەکەوە نووساندنی شت بەکار دەهێنرێ)، وە (الْغَاسُول): جۆرە گیایەکی لینجە).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي حِجَامَةِ الْمُحْرِمِ عَلَى الرَّأْسِ وَإِنْ كَانَ الْمَحْجُومِ ذَا جُمَّةٍ أَوْ وَفْرَةٍ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصّ

**٢٦٥٧-** عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ عَلَى رَأْسِهِ. قَالَ أَبُو بَكرٍ خَبَرُ بْنِ بُحَيْنَةَ مِنْ هَذَا الْبَابِ[2].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی ئیحرامپۆش کەڵەشاخ لەسەر سەری بکات، ئەگەرچی کەڵەشاخ بۆکراو قژی لەنێو شانی یان تا نەرمایی هەردوو گوێی بوو، بە باسکردنی فەرموودەیەکی پوختکراو نەك درێژەپێدراو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: تاوس دەڵێ: ئیبنو عەباس ﵄ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی کرد لەسەر سەری، لە کاتێکدا ئەو لە ئیحرامدا بوو. ئەبو بەکر دەڵێ فەرموودەکەی ئیبنو بوحەینەیش هەر لەم بەشەیە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا احْتَجَمَ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ وَجَعٍ وَجَدَهُ بِرَأْسِهِ

**٢٦٥٨-** عن حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ ﵁ عَنِ الصَّائِمِ يَحْتَجِمُ، فَقَالَ: مَا كُنَّا نَرَى إِنَّ ذَلِكَ يُكْرَهُ إِلَّا لِجَهْدِهِ، وَلَمْ يُسْنِدْهُ، وَقَالَ: قَدِ احْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ، وَهُوَ مُحْرِمٌ وَمِنْ وَجَعٍ وَجَدَهُ فِي رَأْسِهِ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە کەڵەشاخی کرد لەسەری لەبەر ئازارێك لە سەریدا هەبوو

واتە: حومەید دەڵێ: پرسیار لە ئەنەس ﵁ کرا دەربارەی ڕۆژووەوان کەڵەشاخ بکات، وتی: ئێمە پێمان وا نەبوو ئەوە کەڕاهەتی ببێت مەگەر لەبەر ماندووبوونی خۆی، وتەکەی نەدایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، وە وتی: پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی کرد بەهۆی ئازارێك لە سەریدا بوو.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْحِجَامَةِ لِلْمُحْرِمِ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدِ احْتَجَمَ مُحْرِمًا غَيْرَ مَرَّةٍ، مَرَّةً عَلَى الرَّأْسِ، وَمَرَّةً عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ

**٢٦٥٩-** عَنْ قتادةَ عَن أَنَسٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِهِ[٢].

## باسی ڕێگەدان بە کەڵەشاخکردن بۆ ئیحرامپۆش لەسەر قاچ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ چەند جارێك بە ئیحرامەوە کەڵەشاخی کردووە، جارێك لەسەر سەری، جارێك لەسەر قاچی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی لەسەر پشتی پێی کرد بەهۆی ئەوەی ئازاری هەبوو.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوَجَعَ الَّذِي وَجَدَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي إِحْرَامِهِ فَاحْتَجَمَ بِسَبَبِهِ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ، وَجَدَهُ بِظَهْرِهِ أَوْ بِوَرِكِهِ لَا بِقَدَمِهِ

**٢٦٦٠-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ مُحْرِمٌ مِنْ وَثْءٍ كَانَ بِظَهْرِهِ أَوْ بِوَرِكِهِ لَمْ يَقُلْ لَنَا بُنْدَارٌ: أَوْ بِوَرِكِهِ، قِيلَ لَنَا إِنَّهُ كَانَ فِي كِتَابِهِ، وَلَمْ يَتَكَلَّمْ بِهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ بُحَيْنَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ وَجَعٍ وَجَدَهُ فِي رَأْسِهِ، فَدَلَّ خَبَرُ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ أَنَّهُ احْتَجَمَ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ وَإِنَّمَا كَانَتْ لِلْوَثْءِ الَّذِي كَانَ بِظَهْرِهِ أَوْ بِوَرِكِهِ؛ لِأَنَّ فِي خَبَرِ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ أَنَّ إِحْدَى الْحِجَامَتَيْنِ كَانَ مِنْ وَجَعٍ وَجَدَهُ فِي رَأْسِهِ، وَفِي خَبَرِ جَابِرٍ أَنَّ إِحْدَاهُمَا كَانَ مِنْ وَثْءٍ كَانَ بِظَهْرِهِ أَوْ بِوَرِكِهِ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو ئازارەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ئیحرامەکەیدا بینی و بەهۆیەوە کەڵەشاخی کرد لەسەر قاچی، ئەو ئازارە لە پشتی یان لە کەلەکەیدا بوو نەک لە قاچی

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، جابر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی کرد لە کاتێکدا لە ئیحرامدا بوو، بەهۆی ئازارێك لە پشتیدا بوو یان کەلەکەی. بوندار (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) پێیانی نەوت: یان لە کەلەکەی، پێیان وترا: ئەوە لە پەڕتووکەکەیدا بوو، بەڵام بەقسە نەیوت.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس و ئیبنو بوحەینەدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی کرد لەسەر سەری، بەهۆی ئازارێك لە سەریدا هەبوو، جا فەرموودەکەی حومەید لە ئەنەسەوە پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی کرد لەسەر قاچی تەنها بەهۆی ئەو ئازارەوە بوو کە لە پشتی یان کەلەکەیدا بوو، چونکە لە فەرموودەکەی حومەید لە ئەنەسەوە هاتووە: یەکێك لەو دوو کەڵەشاخە بەهۆی ئازارێکەوە بوو لە سەریدا بینی،

---

(١) صحيح.

وە لە فەرموودەکەی جابردا هاتووە: یەکێك لە دوو کەڵەشاخە بەهۆی ئازارێکەوە بوو لە پشتی یان کەلەکەی.

**٢٦٦١-** وَقَدْ رَوَى ابْنُ خُثَيْمٍ عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ مِنْ رَهْصَةٍ أَصَابَتْهُ، حَدَّثَنَاهُ الزِّيَادِيُّ ثنا الْفَضْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ عَنِ ابْنِ خُثَيْمٍ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذِهِ الرُّخْصَةُ تُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ الْوَثْءُ الَّذِي ذُكِرَ فِي خَبَرِ أَبِي الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ.

واتە: ئیبنو خوسەیم دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زوبەیر لە جابرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی کرد بەهۆی ئازارێك لەژێر قاچیدا هەبوو، زەیادی بۆی باس کردین، لە فەزلی کوڕی سولەیمانەوە بۆی باس کردین لە ئیبنو خوسەیمەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم مۆڵەتە پێدەچێ بەهۆی ئازارێکەوە بێت کە لە فەرموودەکەی ئەبو زوبەیر لە جابرەوە باس کرا.

## بَابُ إِبَاحَةِ رُكُوبِ الْمُحْرِمِ الْبُدْنَ إِذَا سَاقَهُ بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٦٦٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَتَى عَلَى رَجُلٍ يَسُوقُ بَدَنَةً فَقَالَ: «ارْكَبْهَا». قال: إِنَّهَا بَدَنَةٌ قَالَ: «ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ أَوْ وَيْحَكَ»[2].

## باسی ڕێگەپێدان بەوەی ئیحرامپۆش سواری وشتر بێت ئەگەر بەهەدی بردی بۆ بەیت، بە دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) شیکراوە و ڕوون (مُفَسَّر)

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای پیاوێك وشترێکی لێ دەخوڕی بۆ بەیت بەمەبەستی هەدیکردن، فەرمووی: سواری بە، وتی: ئەوە وشتری هەدییەیە (واتە: قوربانی)، فەرمووی: سواری بە هاوار بۆ تۆ، یان خوا لێت خۆش بێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِبَعْضِ اللَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ رُكُوبَ الْبُدْنِ إِذَا كَانَ رَاكِبُهَا لَا يَجِدُ ظَهْرًا يَرْكَبُهُ، لَا إِذَا وَجَدَ ظَهْرًا، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ إِذَا رَكِبَ الْبَدَنَةَ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنْ وَجُودِ الظَّهْرِ ثُمَّ وَجَدَ ظَهْرًا يَرْكَبُهُ، لَمْ يَجُزْ لَهُ الثُّبُوتُ عَلَى الْبَدَنَةِ، وَكَانَ عَلَيْهِ النُّزُولُ عَنْهَا»

**٢٦٦٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُسْأَلُ عَنْ رُكُوبِ الْبَدَنَةِ قَالَ «ارْكَبْهَا حَتَّى تَجِدَ ظَهْرًا»[١].

**باسی فەرمووودەیەك ڕوونكەرەوەی هەندێ لەو فەرموودە كورت و ناڕوونەیە كە باسمان كرد، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە كاتێكدا ڕێگەی دا سواری وشتری هەدی ببێت، ئەگەر سوارەكەی هیچی دەست نەكەوێت سواری بێت جگە لەو وشترە نەبێت، نەك ئەگەر وشترێكی دەست بكەوێت، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەگەر هیچی دەست نەكەوت و سواری بوو، پاشان وشترێكی دەست كەوت سواری ببێت، دروست نییە بۆی لەسەر ئەو وشترە بمێنێتەوە، پێویستە لەسەری دابەزێ**

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: گوێم لێ بوو پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی سواربوونی وشتری هەدی بۆ بەیت، فەرمووی: سواری بە تا وشترێكی دیكەت دەست دەكەوێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ رُكُوبَ الْبُدْنِ عِنْدَ الْحَاجَةِ إِلَى رُكُوبِهَا عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنْ وَجُودِ الظَّهْرِ رُكُوبًا بِالْمَعْرُوفِ، وَمِنْ غَيْرِ أَنْ يَشُقَّ الرُّكُوبُ عَلَى الْبَدَنَةِ

**٢٦٦٤-** عن أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ سُئِلَ عَنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ارْكَبْ بِالْمَعْرُوفِ إِذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا حَتَّى تَجِدَ ظَهْرًا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ڕێگەی داوە بەندە سواری وشتری هەدی ببێت، ئەگەر پێویستی پێی هەبوو سواری بێت، یان هیچ وڵاخێکی دیکەی دەست نەکەوێت سواری بێت، بەبێ ئەوەی قورسایی بخاتە سەر وشترکە**

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵا بوو ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی سواربوونی وشتری هەدیە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەشێوازێکی گونجاو سواری ببە ئەگەر پێویستت پێی بوو تا وشترێکی دیکەت دەست دەکەوێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّوَابِّ الَّتِي أُبِيحَ لِلْمُحْرِمِ قَتْلُهَا فِي الْإِحْرَامِ بِذِكْرِ لَفْظَةٍ مُجْمَلَةٍ فِي ذِكْرِ بَعْضِهِنَّ بِلَفْظٍ عَامٍّ، مُرَادُهُ خَاصٌّ عَلَى أَصْلِنَا

**٢٦٦٥-** عَنِ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَتْ حَفْصَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ، الْعَقْرَبُ وَالْحِدَأَةُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[1].

**باسی ئەو گیاندارانەی کە ڕێگە دراوە بە ئیحرامپۆش بیانکوژێت، بە باسکردنی دەستەواژەیەك هەندێکیانی بەناڕوونی (مُجْمَلَ) هێناوە، بەدەستەواژەی گشتی، مەبەستی پێی تایبەتە**

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: حەفصە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج لە گیانداران هەن هەر کەس بیانکوژێت گوناهبار نابێت، دووپشك و کۆلارە (سوورەداڵ، مشکگرەشی پێ دەوترێ) و مشك و سەگی هار.

**٢٦٦٦-** عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ لَيْسَ عَلَى الْمُحْرِمِ فِي قَتْلِهِنَّ جُنَاحٌ، الْغُرَابُ وَالْحِدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج لە گیانداران هەن ئیحرامپۆش گوناهبار نابێت بەکوشتنیان، قەلەڕەش و کۆلارە (سوورەداڵ، مشکگرەشی پێ دەوترێ) و دووپشك و مشك و سەگی هار.

**٢٦٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَمْسٌ قَتْلُهُنَّ حِلٌّ فِي الْحَرَمِ، الْحَيَّةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَأْرَةُ وَالْحِدَأَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج (گیاندار) هەن کوشتنیان حەڵاڵە لە حەرەمدا: مار و دووپشك و مشك و کۆلارە (سوورەداڵ، مشکگرەشی پێ دەوترێ) و سەگی هار.

## بَابُ إِبَاحَةِ قَتْلِ الْمُحْرِمِ الْحَيَّةَ وَإِنْ كَانَ قَاتِلُهَا فِي الْحَرَمِ لَا فِي الْحِلِّ

**٢٦٦٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَمَرَ مُحْرِمًا بِقَتْلِ حَيَّةٍ فِي الْحَرَمِ»[2].

## باسی ڕێگەدان بە ئیحرامپۆش لەنێو حەرەمدا مار بکوژێت، ئەگەرچی بکوژەکەشی لە ئیحرامدا بێت نەك ئیحرامی نەپۆشیبێت

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ئیحرامپۆش بە کوشتنی مار لەنێو حەرەمدا.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي بَعْضِ مَا أُبِيحَ قَتْلُهُ لِلْمُحْرِمِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ لِلْمُحْرِمِ قَتْلَ بَعْضِ الْغِرْبَانِ لِأَكْلِهَا، وَإِنَّهُ إِنَّمَا أَبَاحَ قَتْلَ الْأَبْقَعِ مِنْهَا دُونَ مَا سِوَاهُ مِنَ الْغِرْبَانِ

**٢٦٦٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ، الْحَيَّةُ وَالْغُرَابُ الْأَبْقَعُ وَالْفَأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ وَالْحُدَيَّأَةُ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك ڕوونکەرەوەی ئەو دەستەواژە کورت و ناڕوونەیە کە باسم کرد لە هەندێ لەو گیاندارانەی ڕێگە دراوە بە ئیحرامپۆش بیانکوژێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە ئیحرامپۆش هەندێ لە قەلەڕەشەکان بکوژێت نەك هەموویان، بێگومان ئەو ڕێگەی داوە بە کوشتنی ئەو قەلەڕەشانەی پەڵەی سپی لەسەر شانیانە یان لەسەر سنگیانە (واتە: قەلەبازەڵە) نەك قەلەڕەشەکانی دیکە**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج (گیانداری) فاسیق هەن دەکوژرێن لە غەیری حەرەم و حەرەمیشدا: مار و قەلەبازەڵە (واتە: ئەو قەلەڕەشەی پەڵەی سپی لەسەر پشتێتی یان لەسەر سنگێتی) و مشك و سەگی هار و کۆلارە.

**بَابُ ذِكْرِ طِيبِ الْمُحْرِمِ وَلُبْسِهِ فِي الْإِحْرَامِ مَا لَا يَجُوزُ لُبْسُهُ جَاهِلًا، بِأَنَّ ذَلِكَ غَيْرَ جَائِزٍ فِي الْإِحْرَامِ وَإِسْقَاطِ الْكَفَّارَةِ عَنْ فَاعِلِهِ ضِدَّ مَذْهَبِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْكَفَّارَةَ وَاجِبَةٌ عَلَيْهِ وَإِنْ كَانَ جَاهِلًا، بِأَنَّ التَّطَيُّبَ وَلُبْسَ مَا لُبِسَ مِنَ الثِّيَابِ غَيْرُ جَائِزٍ لَهُ بِذِكْرِ خَبَرٍ لَفْظَةٍ فِي الطِّيبِ، غَلِطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهَا بَعْضُ مَنْ كَرِهَ الطِّيبَ عِنْدَ الْإِحْرَامِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ الْمَرْءُ، مِمَّنْ لَمْ يُمَيِّزْ بَيْنَ الْمُقَدَّمِ وَبَيْنَ الْمُؤَخَّرِ مِنْ سُنَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ الْمُجْمَلِ مِنَ الْأَخْبَارِ وَبَيْنَ الْمُفَسَّرِ مِنْهَا**

**٢٦٧٠**- عَنِ عَطَاءٍ، حَدَّثَنِي صَفْوَانُ بْنُ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ أَنَّ يَعْلَى بْنَ أُمَيَّةَ قَالَ لِعُمَرَ ﷺ: لَيْتَ أَنِّي أَرَى النَّبِيَّ ﷺ حِينَ يَتَنَزَّلُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا كَانَ بِالْجِعْرَانَةِ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ مَعَهُ فِيهِ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِهِ قَالَ فَجَاءَهُ رَجُلٌ قَدْ تَضَمَّخَ بِطِيبٍ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ أَحْرَمَ فِي جُبَّةٍ بَعْدَمَا تَضَمَّخَ بِطِيبٍ؟ قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ سَاعَةً، ثُمَّ أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فَأَرْسَلَ عُمَرُ إِلَى يَعْلَى أَنْ تَعَالَ فَجَاءَهُ فَأَدْخَلَ رَأْسَهُ فَإِذَا مُحْمَرٌّ وَجْهُهُ كَذَلِكَ سَاعَةً، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، ثُمَّ قَالَ: أَيْنَ الَّذِي يَسْأَلُنِي عَنِ الْعُمْرَةِ آنِفًا؟ فَالْتُمِسَ الرَّجُلُ، فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: أَمَّا الطِّيبُ الَّذِي بِكَ فَاغْسِلْهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَأَمَّا الْجُبَّةُ فَانْزَعْهَا، ثُمَّ اصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ مَا تَصْنَعُ فِي حَجَّتِكَ»[1].

---

(١) صحيح.

**باسی خۆبۆنخۆشکردنی ئیحرامپۆش، وە پۆشینی جلوبەرگ لە ئیحرامدا کە دروست نییە لەبەری بکات، بەنەزانین، خاوەنەکەی کەفارەتی لەسەر پێویست نابێت، دژی مەزهەبی ئەو کەسەی پێی وایە کەفارەتی لەسەر پێویست دەبێت ئەگەرچی بەنەزانیش ئەنجامی دا، چونکە خۆبۆنخۆشکردن و لەبەرکردنی ئەوەی دروست نییە لەبەر بکرێت لە جلوبەرگەکان، دروست نییە بۆی، بە باسکردنی دەستەواژەی فەرموودەیەك لەبارەی خۆبۆنخۆشکردنەوە هاتووە، هەندێ کەس بەهەڵە لێی تێگەیشتووە بەباشی نازانێت بەندە پێش ئەوەی ئیحرام بپۆشێ بۆنی خۆش بەکار بهێنێ، لەوکەسانەیە ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ کە لە پێشەوە وتراوە و ئەوەیشی دواتر وترا لە یەکدی جیا ناکاتەوە، هەروەها فەرموودەی ڕوووننەکراوە و ڕوونکراوە لە فەرموودەکان لە یەکدی جیا ناکاتەوە**

واتە: عەتا دەگێڕێتەوە، صەفوانی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەییە بۆی باس کردم، یەعلای کوڕی ئومەییە بە عومەری ﷺ وت: خۆزگە پێغەمبەرم ﷺ دەبینی کاتێ کە وەحی بۆ دادەبەزێت، کاتێ کە لە جیعڕانە لەژێر دەوارێکدا بوو کۆمەڵێکیش لە هاوەڵانی لەگەڵی بوون، وتی: پیاوێك هات بۆ لای بۆنی خۆشی لە خۆی دابوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێت چۆنە پیاوێك بە جوبەیەکەوە ئیحرامی بەستبێت دوای ئەوەی بۆنخۆشی کردبێت؟ وتی: ئەندازەیەك تەماشای کرد، پاشان وەحی بۆ دابەزی، عومەر ناردی بەدوای یەعلادا بێت، (بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ببینێت لە کاتی دابەزینی وەحی) ئەویش هات، سەری خستە نێو دەوارەکە بینی ڕوخساری سوور هەڵگەڕابوو، پاشان ئاسایی بۆیەوە، ئینجا وتی: کوا ئەو پیاوەی کەمێ پێش ئێستا پرسیاری عومرەی لێ کردم؟ پیاوەکە دۆزرایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد فەرمووی: ئەو بۆنەی کە پێتەوەیە سێ جار بیشۆرە، جوبەکەیش دابکەنە، پاشان لە عومرەکەت ئەوە بکە کە لە حەجدا دەتکرد.

**بَابُ ذِكْرِ اللَّفْظَةِ الْمُفَسِّرَةِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي الطِّيبِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا أَمَرَ الْمُحْرِمَ فِي الْجُبَّةِ بَعْدَ النَّضْخِ بِالطِّيبِ يَغْسِلُ ذَلِكَ الطِّيبَ إِذَا كَانَ مَا تَطَيَّبَ بِهِ مِنْ طِيبِ النِّسَاءِ خَلُوقًا، لَا ذَاكَ الطِّيبِ الَّتِي هِيَ مِنْ طِيبِ الرِّجَالِ الَّتِي قَدْ تَطَيَّبَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ الْإِحْرَامِ**

**٢٦٧١-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: وَدِدْتُ أَنِّي أَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ يَتَنَزَّلُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا كُنَّا بِالْجِعْرَانَةِ أَتَاهُ رَجُلٌ عَلَيْهِ مُقَطَّعَاتٌ مُتَضَمِّخٌ بِخَلُوقٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَهْلَلْتُ بِالْعُمْرَةِ، وَعَلَيَّ هَذَا فَكَيْفَ أَصْنَعُ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ كُنْتَ تَصْنَعُ فِي حَجَّتِكَ؟» قَالَ: أَنْزِعُ هَذِهِ الثِّيَابَ وَأَغْسِلُهُ قَالَ: «فَاصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ كَمَا تَصْنَعُ فِي حَجَّتِكَ» قَالَ: وَأُنْزِلَ عَلَيْهِ فَسُجِّيَ بِثَوْبٍ فَدَعَانِي عُمَرُ: فَكَشَفَ لِي عَنِ الثَّوْبِ فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَغِطُّ مُحْمَرًّا وَجْهُهُ[1].

**باسی ئەو دەستەواژە ڕوونکەرەوەیە بۆ ئەو دەستەواژە ناڕوونەی کە باسم کرد دەربارەی بەکارهێنانی بۆنی خۆش، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانی کرد بە ئیحرامپۆشەکە کە جوبەیەکی لەبەردا بوو بۆنی خۆشی لێی دابوو، ئەو بۆنە خۆشە بشوات، ئەوە لە کاتێکدایە ئەو بۆنەخۆشەی بەکاری هێناوە لەو بۆنە بێت کە ئافرەتان بەکاری دەهێنن، وەکوو بۆنی (خَلُوق)، نەك ئەو بۆنەی پیاوان بەکاری دەهێنن کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی ئیحرامدا خۆی پێ بۆنخۆش کرد**

واتە: صەفوانی کوڕی یەعلا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: حەزم دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم کاتێ قوڕئانی بۆ دادەبەزێت، کاتێ ئێمە لە جیعڕانە بووین پیاوێك هات بۆ لای جلێکی خەتخەتی لەبەردا بوو (یان جلێکی کورت) هەڵیکێشابوو لە بۆنی (خَلُوق) (بۆنێکی ناسراوی خۆشە لە زەعفەران پێك دەهێنرێ ڕەنگی سوور و زەرد ئەڕوانێ زیاتر بۆ ژنان بەکار دێت)، وتی: من ئیحرامم بەستووە بە عومرە ئەم جلەیشم لەبەردایە چی بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووی: لە حەجدا چیت دەکرد؟ وتی: ئەم جلەم لەبەر خۆم دادەکەند و دەمشۆرد، فەرمووی: لە عومرەکەیشتدا بەوشێوە بکە کە لە حەجکردنەکەتدا دەتکرد، وتی: وە وەحی بۆ هات بە پۆشاکێك داپۆشرا عومەر بانگی کردم پۆشاکەکەی بەرز کردەوە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەیپرخاند ڕەنگی سوور هەڵگەڕابۆیەوە.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ هَذَا الْمُحْرِمَ - الَّذِي ذَكَرْنَاهُ - بِغَسْلِ الطِّيبِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ خَلُوقٌ فِيهِ زَعْفَرَانٌ وَالتَّزَعْفُرُ غَيْرُ جَائِزٍ... أَيْضًا وَإِنْ كَانَ الْمُحْرِمُ مَنْهِيًّا عَنْهُ، لَا كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُ بِغَسْلِ ذَلِكَ الطِّيبِ؛**

---

(١) صحيح.

**لِأَنَّ الْمُحْرِمَ غَيْرَ جَائِزٍ أَنْ يَكُونَ بِهِ أَثَرُ الطِّيبِ وَهُوَ مُحْرِمٌ وَإِنْ كَانَ تَطَيَّبَ بِهِ وَهُوَ حَلَالٌ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: وَعَلَيْهِ مُقَطَّعَاتٌ مُتَضَمِّخٌ بِخَلُوقٍ، وَالْخَلُوقُ لَا يَكُونُ - عِلْمِي - إِلَّا فِيهِ زَعْفَرَانٌ وَفِي خَبَرِ مَنْصُورِ بْنِ زَاذَانَ، وَعَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، وَابْنِ أَبِي لَيْلَى، وَالْحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ عَلَيْهَا رَدْغٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ، إِلَّا أَنَّهُمْ أَسْقَطُوا صَفْوَانَ بْنَ يَعْلَى مِنَ الْإِسْنَادِ.**

٢٦٧٢- عَنْ عطاء عن يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ عَلَيْهَا رَدْغٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَحْرَمْتُ فَمَا تَرَى، وَالنَّاسُ يَسْخَرُونَ مِنِّي قَالَ: فَأَطْرَقَ عَنْهُ هُنَيْهَةً قَالَ: ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ: «اخْلَعْ عَنْكَ هَذِهِ الْجُبَّةَ، وَاغْسِلْ عَنْكَ هَذَا الزَّعْفَرَانَ، وَاصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ مَا كُنْتَ تَصْنَعُ فِي حَجِّكَ»[1].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمانی کرد بەم ئیحرامپۆشەی -کە باسمان کرد- ئەو بۆنە خۆشە بشوات کە خەلوقی لەسەر بوو، چونکە زەعفەرانی تێدا بوو، بەکارهێنانی زەعفەرانیش دروست نییە، ئەگەرچی ئیحرامپۆش قەدەغەی لێ کراوە، نەك وەکوو ئەوەی هەندێ لە زانا عێراقییەکان گومانیان بردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە شۆردنی ئەو بۆنە خۆشە، چونکە دروست نییە شوێنەواری بۆنی خۆشی پێوە بێت، ئەگەرچی لە پێش ئیحرامبەستن بەکاری هێنا بوو، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی عەمری کوڕی دینار دەڵێ: (وَعَلَيْهِ مُقَطَّعَاتٌ مُتَضَمِّخٌ بِخَلُوقٍ)، واتە: جلێکی خەتخەتی لەبەردا بوو (یان جلێکی کورت) هەڵیکێشابوو لە بۆنی خەلوق. پێم وایە خەلوق ئیلا دەبێ زەعفەرانی تێکەڵ بکرێ، وە لە فەرموودەکەی مەنصوری کوڕی زازان و عەبدولمەلیکی کوڕی ئەبو سولەیمان و ئیبنو ئەبو لەیلا و حەجاجی کوڕی ئەرتات، لە عەتاوە لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە دەڵێ: (وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ عَلَيْهَا رَدْغٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ)، واتە: جوببەیەکی لەبەردا بوو کەمێك زەعفەرانی پێوە بوو. ئەوە نەبێ ئەوان صەفوانی کوڕی یەعلایان لە سەنەدەکەدا پچڕاندووە**

---

[1] صحیح.

واتە: عەتا دەگێڕێتەوە، لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ جوببەیەکی لەبەردا بوو کەمێك زەعفەرانی پێوە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئیحرامم پۆشیوە پێت چۆنە، خەڵکەکەیش گاڵتەم پێ دەکەن، وتی: کەمێك بێدەنگ بوو، وتی: پاشان بانگی کرد، فەرمووی: ئەو جوببەیە لەبەرت داکەنە و ئەو زەعفەرانەیش بە جەستەتەوەیە بشۆرە، لە عومرەکەیشتدا ئەوە بکە کە لە حەجکردنتدا دەتکرد.

**بَابُ ذِكْرِ زَجْرِ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ تَزَعْفُرِ الْمُحِلِّ وَالْمُحْرِمِ جَمِيعًا، وَالدَّلِيلِ عَلَى صِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ خَبَرَ يَعْلَى بْنَ أُمَيَّةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ الْمُحْرِمَ الَّذِي ذَكَرْنَا صِفَتَهُ بِغَسْلِ الطِّيبِ الَّذِي كَانَ مُتَضَمِّخًا بِهِ، إِذْ كَانَ طِيبُهُ خَلُوقًا فِيهِ زَعْفَرَانٌ**

**٢٦٧٣**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرِّجَالَ عَنِ التَّزَعْفُرِ[١].

**باسی سەرزەنشتکردنی پێغەمبەر ﷺ لە بەکارهێنانی زەعفەران بۆ ئیحرامنەپۆش و بۆ ئیحرامپۆش، وە بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەوەی لەیەکم دایەوە، فەرموودەکەی یەعلای کوڕی ئومەییەیە، پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمانی کرد بەو ئیحرامپۆشەی باسی سیفەتەکەیمان کرد بە شۆردنی ئەو بۆنەی کە هەڵکێشرابوو پێی، چونکە بۆنی خەلوقی بەکارهێنا بوو زەعفەرانیشی تێدا بوو**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لە پیاوان زەعفەران بەکار بهێنن.

**٢٦٧٤**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە پیاو زەعفەران بەکار بهێنێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابِ ذِكْرِ دَلِيلٍ ثَانٍ يَدُلُّ عَلَى صِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ فِي خَبَرِ يَعْلَى بِغَسْلِ الطِّيبِ الَّذِي كَانَ عَلَى الْمُحْرِمِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ الْمُحِلَّ أَيْضًا بِغَسْلِ الْخَلُوقِ الَّذِي كَانَ قَدْ تَخَلَّقَ بِهِ، فَسَوَّى فِي الْأَمْرِ بِغَسْلِ الْخَلُوقِ بَيْنَ الْمُحْرِمِ وَالْمُحِلِّ

**٢٦٧٥-** عن عَبِيدَةَ بْنِ حُمَيْدٍ، حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ الثَّقَفِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: شَحِبتُ يَوْمًا، فَقَالَ لِي صَاحِبٌ لِي: اذْهَبْ بِنَا إِلَى الْمَنْزِلِ قَالَ فَذَهَبْتُ فَاغْتَسَلْتُ، وَتَخَلَّقْتُ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَمْسَحُ وُجُوهَنَا، فَلَمَّا دَنَا مِنِّي جَعَلَ يُجَافِي يَدَهُ عَنِ الْخَلُوقِ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ لِي: «يَا يَعْلَى مَا حَمَلَكَ عَلَى الْخَلُوقِ، أَتَزَوَّجْتَ؟» قُلْتُ: لَا فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَاذْهَبْ فَاغْسِلْهُ». قال: فَمَرَرْتُ عَلَى رَكِيَّةٍ فَجَعَلْتُ أَقَعُ فِيهَا، ثُمَّ جَعَلْتُ أَتَدَلَّكُ بِالتُّرَابِ حَتَّى ذَهَبَ، ثُمَّ جِئْتُ فَلَمَّا رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَعَادَ بِخَيْرِ دِينِهِ، الْعُلَا تَابَ وَاسْتَهَلَّتِ السَّمَاءُ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَدْ أَمَرَ ﷺ يَعْلَى بْنَ مُرَّةَ بِغَسْلِ الْخَلُوقِ، وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ كَمَا أَمَرَ الْمُحْرِمَ بِغَسْلِ الْخَلُوقِ.

## باسی بەڵگەی دووەم بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوەی کە فەرمانەکەی پێغەمبەرم ﷺ لەیەك دایەوە لە فەرموودەکەی یەعلا بە شۆردنی ئەو بۆنە خۆشەی کە ئیحرامپۆشەکە بەکاری هێنابوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەهەمان شێوە فەرمانی کرد بە ئیحرامنەپۆشەکەیش ئەو خەلوقەی بەکاری هێناوە بیشوات، بەیەکسانی فەرمانی کرد بە ئیحرامپۆش و ئیحرامنەپۆش خەلوقەکە بشوات

واتە: عوبەیدەی کوڕی حومەید دەگێڕێتەوە، لە عومەری کوڕی عەبدوڵای کوڕی یەعلای کوڕی موڕەی سەقەفی، لە باپیریەوە ﷺ، دەڵێ: ڕۆژێك زۆر ماندوو بووم، هاوڕێیەکم پێمی وت: برۆ با بچین بۆ ماڵەوە، وتی: ڕۆیشتم خۆم شۆرد و سەرم تاشی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (لە کاتی نوێژدا) دەستی دەهێنا بە ڕوخسارماندا، کاتێ لێم نزیك بوویەوە، دەستی بەرز کردەوە نەیدا لە خەلوقەکە، کاتێ لێ بۆیەوە، پێمی فەرموو: ئەی یەعلا چی وای لێ کردی خەلوقت بەکار هێنا، ئایا ژنت هێناوە؟ وتم: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: برۆ بیشۆرە، وتی: دواتر ڕۆیشتم تێپەڕیم

---

(١) إسناده ضعيف.




بەلای بیرێکدا، چوومە نێویەوە خۆم شۆرد بەخۆڵ دەستم هێنا بەگیانمدا تا بۆنەکەی ڕۆیشت، پاشان (بۆ نوێژێکی دیکە) هاتمەوە، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بینیمی، فەرمووی: بەچاکترین دیندارییەوە هاتەوە و تەوبەی کرد، خوایش پێی خۆش بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی بە یەعلای کوڕی موڕە کرد بە شۆردنی خەلوقەکە، لە کاتێکدا ئەو لە ئیحڕامیشدا نەبوو، وەکوو چۆن فەرمانی کرد بە ئیحڕامپۆشەکە خەلوقەکە بشوات.

**بَابُ الْبَيَانِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُحْرِمَ فِي الْجُبَّةِ عَلَيْهِ خَرْقُ الْجُبَّةِ، وَغَيْرُ جَائِزٍ لَهُ نَزْعُهَا فَوْقَ رَأْسِهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: انْزَعْ جُبَّتَكَ ثنا مُحَمَّدُ بْنُ هِشَامٍ، ثنا هُشَيْمٌ، عَنِ الْحَجَّاجِ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَنَا هَذَا الْحَدِيثُ يَخْرِقُ عَنْهُ جُبَّتَهُ، فَلَمَّا بَلَغَنَا هَذَا الْحَدِيثُ أَخَذْنَا بِهِ قَالَ الْحَجَّاجُ، ثنا عَطَاءٌ بِهَذَا الْحَدِيثِ عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ.**

**باسی ڕوونکردنەوە دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە ئیحڕامپۆش جوببەی لەبەردا بوو پێویستە لەسەری جوبەکەی بدڕێت، وە دروستیش نییە جوببەکەی لەسەریەوە دابکەنێت. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی صەفوانی کوڕی یەعلادا هاتووە لە باوکیەوە، فەرمووی: (انْزَعْ جُبَّتَكَ)، واتە: جوببەکەت داکەنە، موحەممەدی کوڕی هیشام بۆی باس کردین لە هوشەیمەوە بۆی باس کردین، لە حەجاجەوە بۆی باس کردین، لە عەتاوە وتی: ئێمە پێش ئەوەی ئەم فەرموودەمان پێ بگات دەمانوت: جوببەکەی دەدڕێ، کاتێ ئەم فەرموودەمان پێگەیشت وەرمانگرت، حەجاج وتی: عەتا ئەم فەرموودەی بۆ باس کردین لە صەفوانی کوڕی یەعلا لە باوکیەوە**

**بَابُ الرُّخْصَةِ فِي حَلْقِ الْمُحْرِمِ رَأْسَهُ إِذَا مَرِضَ أَوْ أَذَاهُ الْقَمْلُ أَوِ الصِّيبَانُ أَوْ هُمَا، وَإِيجَابِ الْفِدْيَةِ عَلَى حَالِقِ الرَّأْسِ وَإِنْ كَانَ حَلْقُهُ مِنْ مَرَضٍ أَوْ أَذًى بِرَأْسِهِ.**

**٢٦٧٦-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَأَنَا كَثِيرُ الشَّعْرِ، فَقَالَ: كَأَنَّ هَوَامَّ رَأْسِكَ يُؤْذِيكَ؟ فَقُلْتُ: أَجَلْ قَالَ: «فَاحْلِقْهُ وَاذْبَحْ شَاةً نَسِيكَةً أَوْ صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ أَوْ تَصَدَّقْ بِثَلَاثَةِ آصُعٍ بَيْنَ سِتَّةِ مَسَاكِينٍ»[١].

---

(١) صحيح.

**باسی مۆڵەتدان بەوەی ئیحرامپۆش سەری بتاشێ ئەگەر نەخۆش کەوت، یان ئەسپێ ئازاری دا، یان ڕشك، یان هەردووکیان، وە پێویستبوونی فیدیە لەسەر ئەو کەسەی سەری ئەتاشێ ئەگەرچی بەهۆی نەخۆشی، یان بەهۆی هەر ئازارێکی دیکە تاشی**

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەردەمی حودەیبیە بەلامدا تێپەڕ بوو، من قژم زۆر بوو، فەرمووی: ئەڵێی ئەسپێی نێو سەرت ئازارت ئەدات؟ وتم: بەڵێ: فەرمووی: بیتاشە و مەڕێك بکە بە قوربانی، یان سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە یان سێ صاع ببەخشە بەسەر شەش کەسی هەژاردا.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ كَعْبًا أَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِحَلْقِ رَأْسِهِ وَيَفْتَدِي بِصِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ، قَبْلَ أَنْ يُبَيِّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ يَحْلِقُونَ بِالْحُدَيْبِيَةِ وَيَرْجِعُونَ إِلَى الْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ وُصُولٍ إِلَى مَكَّةَ**

**٢٦٧٧-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يُوقِدُ تَحْتَ بُرْمَةٍ أَوْ قَالَ: تَحْتَ قِدْرٍ، وَالْقَمْلُ تَتَسَاقَطُ عَلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُؤْذِيكَ هَذِهِ؟» فَقَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴿١٩٦﴾ ﴾البقرة، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ وَهُمْ بِالْحُدَيْبِيَةِ، وَلَمْ يُبَيِّنْ لَهُمْ أَنَّهُمْ يَحْلِقُونَ بِهَا وَهُمْ عَلَى طَمَعٍ أَنْ يَدْخُلُوا مَكَّةَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْفِدْيَةَ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَحْلِقَ وَيَصُومَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ أَوْ يُطْعِمَ فَرَقًا بَيْنَ سِتَّةِ مَسَاكِينَ أَوْ يَذْبَحَ شَاةً(١).

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە کەعب سەری بتاشێ و فیدیە بدات، بە ڕۆژووگرتن یان بەخشین یان قوربانی، پێش ئەوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە ئەوان لە حودەیبیە سەریان دەتاشن و دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە بەبێ گەیشتن بە مەککە**

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلایدا، ئەویش ئاگری خستبووە ژێر مەنجەڵە گۆشتێك، یان وتی: ژێر مەنجەڵێك، ئەسپێیش لە

---

(١) صحيح.

ڕوخساری دەکەوتە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو ئەسپێیانە ئازارت دەدەن؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴿١٩٦﴾﴾، واتە: ئەگەر سەری تاشی بریتییەك بدات کە ڕۆژووی (سێ ڕۆژە) یان خێرێك، یان قوربانییەك بکات. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد، لە کاتێکدا ئەوان لە حودەیبیە بوون، پێشتر بۆیانی ڕوون نەکردبۆیەوە ئەوان لەوێ سەریان دەتاشن، ئەوان لە تەماحی ئەوەدا بوون بچنە نێو مەککەوە، خوا ﷻ ئایەتی فیدیەی دابەزاند، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێ کرد سەری بتاشێ و سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، یان ئەندازەی (فَرَق)ێك خواردن ببەخشێت، (کە دەکاتە سێ صاع) لە نێوان شەش کەسی هەژار یان مەڕێك سەرببڕێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ﴾ البقرة: ١٩٦، اخْتِصَارَ كَلَامٍ مَعْنَاهُ: فَحَلَقْتُمْ، فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ، كَقَوْلِهِ ﷻ: ﴿ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ ﴿٦٣﴾﴾ الشعراء، أَرَادَ: فِيهِنَّ جَمِيعًا، فَضَرَبَ، فَاخْتَصَرَ الْكَلَامَ وَحَذَفَ فَضَرَبَ، وَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ انْفِجَارَ الْحَجَرِ انْبِجَاسُهُ، وَانْفِلَاقَ الْبَحْرِ إِنَّمَا كَانَ عَنْ ضَرَبَاتِ مُوسَى ﷺ، وَلَا شَكَّ وَلَا ارْتِيَابَ أَنَّ مُوسَى أَطَاعَ اللَّهَ فِيمَا أَمَرَ بِهِ مِنْ ضَرْبِ الْحَجَرِ وَالْبَحْرِ، فَكَانَ انْفِلَاقُ الْبَحْرِ وَانْفِجَارُ الْحَجَرِ وَانْبِجَاسُهُ بَعْدَ ضَرْبِهِ مُسَارَعَةً مِنْهُ إِلَى طَاعَةِ خَالِقِهِ

**٢٦٧٨-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَآهُ، وَقَمْلُهُ يَسْقُطُ عَلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ: «أَيُؤْذِيكَ هَوَامُّكَ». قال: نَعَمْ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَحْلِقَ وَهُوَ بِالْحُدَيْبِيَةِ لَمْ يُبَيِّنْ لَهُمْ أَنْ يَحِلُّوا بِهَا وَهُمْ عَلَى طَمَعٍ أَنْ يَدْخُلُوا مَكَّةَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْفِدْيَةَ فَأَمَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُطْعِمَ فَرَقًا بَيْنَ سِتَّةٍ أَوِ الْهَدْيَ شَاةً أَوْ يَصُومَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ الْأَيْمَانِ وَالْكَفَّارَاتِ مَبْلَغَ الْفَرَقِ، وَأَنَّهُ ثَلَاثَةُ آصُعٍ، وَبَيَّنْتُ أَنَّ الصَّاعَ أَرْبَعَةُ أَمْدَادٍ، وَأَنَّ الْفَرَقَ سِتَّةَ عَشَرَ رِطْلًا، وَأَنَّ الصَّاعَ ثُلُثُهُ، إِذِ الْفَرَقُ ثَلَاثَةُ آصُعٍ، وَالصَّاعُ خَمْسَةُ أَرْطَالٍ وَثُلُثٌ بِدَلَائِلِ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ، وَهَذِهِ الْآيَةُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ

---

(١) صحيح.

أَجْمَلَ فَرِيضَةً، وَبَيَّنَ مَبْلَغَهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ بِالْفِدْيَةِ فِي حَلْقِ الرَّأْسِ فِي كِتَابِهِ بِصِيَامٍ لَمْ يَذْكُرْ فِي الْكِتَابِ عَدَدَ أَيَّامِ الصِّيَامِ، وَلَا مَبْلَغَ الصَّدَقَةِ، وَلَا عَدَدَ مَنْ يُصَدَّقُ بِصَدَقَةِ الْفِدْيَةِ عَلَيْهِمْ، وَلَا وَصَفَ النُّسُكَ، فَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ الَّذِي وَلَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بَيَانَ مَا أَنْزَلَ عَلَيْهِ مِنْ وَجْهِ أَنَّ الصِّيَامَ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَالصَّدَقَةَ ثَلَاثَةُ آصُعٍ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ، وَأَنَّ النُّسُكَ شَاةٌ، وَذِكْرُ النُّسُكِ فِي هَذَا الْخَبَرِ هُوَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي يَقُولُ إِنَّ الْحُكْمَ بِالْمِثْلِ وَالشِّبْهِ وَالنَّظِيرِ وَاجِبٌ، فَسُبْعُ بَقَرَةٍ، وَسُبْعُ بَدَنَةٍ فِي فِدْيَةِ حَلْقِ الرَّأْسِ جَائِزٌ أَوْ سُبْعُ بَقَرَةٍ، وَسُبْعُ بَدَنَةٍ يَقُومُ مَقَامَ شَاةٍ فِي الْفِدْيَةِ، وَفِي الْأُضْحِيَةِ وَالْهَدْيِ، وَلَمْ يَخْتَلِفِ الْعُلَمَاءُ أَنَّ سُبْعَ بَدَنَةٍ، وَسُبْعَ بَقَرَةٍ يَقُومُ كُلُّ سُبْعٍ مِنْهَا مَقَامَ شَاةٍ فِي هَدْيِ التَّمَتُّعِ وَالْقِرَانِ وَالْأُضْحِيَةِ لَمْ يَخْتَلِفُوا فِي ذَلِكَ الْأَمْرِ، زَعَمَ أَنَّ الْقِرَانَ لَا يَكُونُ إِلَّا بِسَوْقِ بَدَنَةٍ أَوْ بَقَرَةٍ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: إِنَّ عُشْرَ بَدَنَةٍ يَقُومُ مَقَامَ شَاةٍ فِي جَمِيعِ ذَلِكَ فَمَنْ أَجَازَ عُشْرَ بَدَنَةٍ فِي ذَلِكَ كَانَ لِسُبْعِهِ أَجْوَزَ إِذِ السُّبْعُ أَكْثَرُ مِنَ الْعُشْرِ، وَقَدْ كُنْتُ أَمْلَيْتُ عَلَى بَعْضِ أَصْحَابِنَا مَسْأَلَةً فِي هَذِهِ الْآيَةِ، وَبَيَّنْتُ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ يُوجِبُ الشَّيْءَ فِي كِتَابِهِ بِمَعْنًى، وَقَدْ يَجِبُ ذَلِكَ الشَّيْءُ بِغَيْرِ ذَلِكَ الْمَعْنَى الَّذِي أَوْجَبَهُ اللَّهُ فِي الْكِتَابِ إِمَّا عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ الْمُصْطَفَى ﷺ أَوْ عَلَى لِسَانِ أُمَّتِهِ؛ لِأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّمَا أَوْجَبَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ عَلَى مَنْ أَصَابَهُ فِي رَأْسِهِ أَوْ كَانَ بِهِ مَرَضٌ فَحَلَقَ رَأْسَهُ، وَقَدْ تَجِبُ عِنْدَ جَمِيعِ الْعُلَمَاءِ هَذِهِ الْفِدْيَةُ عَلَى حَالِقِ الرَّأْسِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ، وَلَا كَانَ مَرِيضًا، وَكَانَ عَاصِيًا بِحَلْقِ رَأْسِهِ إِذَا لَمْ يَكُنْ بِرَأْسِهِ أَذًى، وَلَا كَانَ بِهِ مَرَضٌ، فَبَيَّنْتُ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ أَنَّ الْحُكْمَ بِالنَّظِيرِ وَالشَّبِيهِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ وَاجِبٌ، وَلَوْ لَمْ يَجُزِ الْحُكْمُ لِلْمَثَلِ وَالشَّبِيهِ وَالنَّظِيرِ لَمْ يَجِبْ عَلَى مَنْ جَزَّ شَعْرَ رَأْسِهِ بِمِقْرَاضٍ أَوْ فِدْيَةٍ إِذِ اسْمُ الْحِلَقِ لَا يَقَعُ عَلَى الْجَزِّ وَلَكِنْ إِذَا وَجَبَ الْحُكْمُ بِالنَّظِيرِ وَالشَّبِيهِ وَالْمَثَلِ كَانَ عَلَى جَازِّ شَعْرَ الرَّأْسِ فِي الْإِحْرَامِ مِنَ الْفِدْيَةِ مَا عَلَى الْحَالِقِ، وَهَذِهِ مَسْأَلَةٌ طَوِيلَةٌ قَدْ أَمْلَيْتُهَا فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی لە فەرمایشتی خوادا:** ﴿ وَلَا تَحْلِقُواْ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ ﴾، **واتە: سەرتان مەتاشن تا قوربانییەکە دەگاتە جێی دیاریکراوی خۆی ئینجا هەر کامێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان ئازارێك لە سەریدا بوو، ئەگەر سەری تاشی بریتییەك بدات کە ڕۆژووی (سێ ڕۆژە) یان خێرێك، یان قوربانییەك بکات. فەرمایشتەکەی کورت کردەوە ماناکەی ئەوەیە: سەرتان تاشی، ئەوە فیدیە دەدەن لە ڕۆژوو یان صەدەقە، یان قوربانی، وەکوو فەرمایشتەکەی خوا** ﷻ: ﴿ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ ﴿٦٣﴾ ﴾، **مەبەستی ئەوەیە: بە هەموو**




**گۆچانەکەت بدە لە دەریاکە، فەرمایشتەکەی کورت کردەوە و وشەی (فَضَرَبَ)ەی لابرد، ئەوەش ڕوونە تەقینی بەرد هەڵقوڵان و دەرچوونی ئاوەکەیەتی، وە لەتبوونی دەریاکەیش لە لێدانی موساوە بوو، هیچ گومان و دوودڵییەکی تێدا نییە موسا (علیه السلام) فەرمانی خوای جێبەجێ کرد لەوەی لە بەردەکە و دەریاکەی دا، جا لەتبوونی دەریاکە و تەقینەوەی بەردەکە دوای لێدانی موسا بوو، جا بۆیە لەتبوونی دەریاکە و تەقینەوەی بەردەکە دوای ئەوە بوو موسا ( علیه السلام) بە لێدانی فەرمانی خوای جێبەجێ کرد**

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بینیمی ئەسپێ لە ڕوخسارم دەکەوتە خوارەوە، وتی: ئایا ئەسپێکانت ئازارت ئەدەن؟ وتی: بەڵێ، فەرمانی پێ کرد سەری بتاشێ، لە کاتێکدا ئەو لە حودەیبیە بوو، ئەوەیان بۆ ڕوون نەبووبۆیەوە کە لەوێ ئیحرام دەشکێنن، چونکە تەماحی ئەوەیان هەبوو بچنە نێو مەککەوە، خوا ﷻ فیدیەی دابەزاند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد ئەندازەی (الْفَرَقِ) لە نێوان شەش کەس دابەش بکرێت، یان قوربانییەك سەر ببڕێت، یان سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: بێگومان لە کتێبی (الْأَيْمَانِ وَالْكَفَّارَاتِ) ئەندازەی ئەو (الْفَرَق)م باس کرد، ئەویش دەکاتە سی صاع، صاعێکیش چوار (المُدَّ)، هەروەها (الْفَرَق)ێك دەکاتە شازدە (رِطْل)، صاعێکیش دەکاتە سێیەکی، چونکە (الْفَرَق) سێ صاعە، صاعێکیش پێنج (رِطْل) و سێیەکی (رِطْل)ێکە، بە باسکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە ئەو ئایەتەیش لەو شێوازەیە کە دەڵێ بێگومان خوا ﷻ ئایەتەکەی بەکوورتکراوەیی هێناوە، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕوون کردۆتەوە، چونکە خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا فەرمانی کردووە بە ڕۆژووگرتن وەکوو فیدیە لە سەرتاشیندا، بەڵام لە کتێبەکەیدا باسی ژمارەی ڕۆژەکانی نەکردووە کە ڕۆژوویان تێدا دەگیرێ، هەروەها باسی ئەندازەی بەخشینیشی نەکردووە، وە ژمارەی ئەوانەیشی کە بەخشینەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێت، هەروەها باسی وەسفی قوربانییەکەیشی نەکردووە، جا پێغەمبەر ﷺ کە لەلایەن خواوە ڕاسپێردراوە بە ڕوونکردنەوەی ئەو پەیامەی دایبەزاندووە،





ڕوونی کردۆتەوە فیدیەی ڕۆژووگرتن بریتییە لە سێ ڕۆژ، بەهەمان شێوە بەخشینیش سێ صاعە دابەش دەکرێ بەسەر شەش کەسی هەژاردا، وە قوربانیش مەڕێکە، وە باسکردنی قوربانی لەم فەرموودەدا لەو شێوازەیە کە دەڵێ حوکم و بڕیاردان بە هاوشێوە و لێکچوواندن و هاوتاکردن واجبە، جا حەوتیەکی مانگایەك یان حەوتیەکی وشترێك لە فیدیەی سەرتاشیندا دروستە، یان حەوتیەکی مانگایەك یان حەوتیەکی وشترێك لەجیاتی مەڕێکە لە فیدیەدا، بەهەمان شێوە لە قوربانی و ئاژەڵی هەدیەشدا، زانایان هیچ جیاوازییان نییە کە حەوتیەکی وشترێك و حەوتیەکی مانگایەك بەرانبەرە بە مەڕێك لە ئاژەڵی هەدیەی تەمەتوع و قیران و قوربانیدا، پێی وایە قیران دروست نییە مەگەر بە لێخوڕینی وشترێك یان مانگایەك، هەندێ لە زانایان وتویانە: دەیەکی وشترێك بەرانبەرە بە مەڕێك لە هەموو ئەوانەدا، جا ئەوەی کە ڕێگەی داوە بە دەیەکی وشترێك لەوەدا ئەوە حەوتیەکی وشتر لەپێشترە بەوەی کە دروستە، چونکە حەوتیەك زیاترە لە دەیەك، بێگومان من لای هەندێ لە هاوەڵەکانم بابەتێکم باس کرد لەم ئایەتەدا، وە ڕوونم کردەوە خوا ﷻ هەندێ جار شتێك واجب دەکات لە کتێبەکەیدا بە مانایەك، هەر خودی ئەو شتەیش واجب دەبێت بە جگە لەو مانایەی کە خوا ﷻ واجبی کردووە لە کتێبەکەیدا، یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، یان لەسەر زمانی ئوممەتەکەی، چونکە خوا ﷻ لەم ئایەتەدا تەنها واجبی کردووە لەسەر ئەو کەسەی شتێك لە سەریدا دەبێت و ئازاری دەدات، یان نەخۆشە، ئەوە سەری دەتاشێ، هەندێ جار لەلای زانایان بەگشتی ئەم فیدیەیە واجب دەبێ لەسەر ئەو کەسەی سەری تاشیوە، ئەگەرچی هیچ ئازاردەرێك لە سەریدا نەبێ، هەروەها نەخۆشیش نەبێ، ئەو کەسە بەسەرتاشینی سەرپێچی کردووە ئەگەر شتێکی ئازاربەخش لە سەریدا نەبێ، هەروەها نەخۆشیش نەبێت، جا لەو شوێنەدا ڕوونم کردەوە حوکم و بڕیاردان بە هاوشێوە و لێکچوواندن و هاوتاکردن واجبە، ئەگەر حوکم و بڕیاردان بە هاوشێوە و لێکچوواندن و هاوتاکردن واجب نەبووایە، ئەوە هیچ فیدیەیەك واجب نەدەبوو لەسەر ئەو کەسەی قژی بە مەقەست کورت کردۆتەوە، چونکە ناوی (الْحِلَقِ) تاشین نادرێت بەسەر ناوی (الْجَزِّ) کوورتکردنەوەدا، بەڵام ئەگەر حوکم و بڕیار بە هاوشێوە و لێکچوواندن و هاوتاکردن واجب بوو ئەوە هەر کەس قژی لە ئیحرامدا

کورت بکاتەوە فیدیەی لەسەر واجب دەبێت، ئەمە بابەتێکی درێژە لەو شوێنەدا باسم کردووە.

تێبینی:

(رِطْل): پێوانەیەکە بەرانبەرە بە دوازدە ئوقیە، یان (٥٠٠) گرام، بەپێی جیاوازی وڵاتەکان جیاوازە.

(المُد): پێوانەیەکی ناسراو بووە لەو سەردەمەدا، وتراویشە لەبەر ئەوە ناونراوە بە (المُد)، چونکە مرۆڤ هەردوو دەستی دانابایە پڕی دەکرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي أَدَبِ الْمُحْرِمِ عَبْدَهُ إِذَا ضَيَّعَ مَالَ الْمَوْلَى فَاسْتَحَقَّ الْأَدَبَ عَلَى ذَلِكَ

**٢٦٧٩-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُجَّاجًا، وَإِنَّ زَمَالَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَزَمَالَةَ أَبِي بَكْرٍ وَاحِدَةٌ، فَنَزَلْنَا الْعَرْجَ، وَكَانَتْ زَمَالَتُنَا مَعَ غُلَامِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَجَلَسَتْ عَائِشَةُ إِلَى جَنْبِهِ، وَجَلَسَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ وَجَلَسْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي نَنْتَظِرُ غُلَامَهُ وَزِمَالَتَنَا مَتَى يَأْتِينَا، فَطَلَعَ الْغُلَامُ يَمْشِي مَا مَعَهُ بَعِيرُهُ قَالَ: فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: أَيْنَ بَعِيرُكَ؟ قَالَ: أَضَلَّنِي اللَّيْلَةَ قَالَ: فَقَامَ إِلَيْهِ أَبُو بَكْرٍ يَضْرِبُهُ، وَيَقُولُ: بَعِيرٌ وَاحِدٌ أَضْلَلْتَ وَأَنْتَ رَجُلٌ فَمَا يَزِيدُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَنْ يَتَبَسَّمَ، وَيَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا الْمُحْرِمِ، وَمَا يَصْنَعُ[١].

### باسی مۆڵەتدان بەوەی ئیحرامپۆش تەمێی کۆیلەکەی بکات ئەگەر ماڵ و سامانی گەورەکەی بەفیڕۆ دا، وە شیاوی ئەوە بوو لەسەر ئەو کردەوە تەمێ بکرێ

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ حەج، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر یەك وشتری بارهەڵگرمان پێبوو لەلای بەندەیەك دایاننابوو، دواتر دابەزینە (الْعَرْج) (کە دێیەکە چەند ڕۆژێك لە مەدینەوە دوورە)، وشترەکەمان لەگەڵ بەندەیەکی ئەبو بەکر بوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) إسناده ضعيف.





دانیشت، عائیشەیش لە تەنیشتی دانیشت، ئەبو بەکریش لەو تەنیشتەکەی دیکەی دانیشت، منیش لەلای باوکم دانیشتم، چاوەڕوانی بەندەکەمان دەکرد تا بزانین کەی وشتر و کەلوپەلەکانمان بۆ دێنێ، دواتر بەندەکە دەرکەوت ڕێی دەکرد وشترەکەی پێ نەبوو، وتی: ئەبو بەکر پێی وت: وشترەکەت لەکوێیە؟ وتی: ئەمشەو لە دەستم ڕای کرد و وێڵ بوو، وتی: ئەبو بەکر هەستا لێی بدات و دەیوت: یەك وشترت گووم کرد، خۆ تۆ پیاوی، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی نەفەرموو تەنها پێدەکەنی و دەیفەرموو: تەماشای ئەو ئیحرام پۆشە بکەن بزانن چی دەکات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِنْشَادِ الْمُحْرِمِ الشِّعْرَ وَالرَّجَزَ

**٢٦٨٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ مُعْتَمِرًا قَبْلَ أَنْ يَفْتَحْهَا، وَابْنُ رَوَاحَةَ يَمْشِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ: [البحر الرجز] خَلُّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهِ... الْيَوْمَ نَضْرِبُكُمْ عَلَى تَنْزِيلِهِ ضَرْبًا يُزِيلُ الْهَامَ عَنْ مَقِيلِهِ... وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهِ، فَقَالَ عُمَرُ يَا ابْنَ رَوَاحَةَ فِي حَرَمِ اللَّهِ، وَبَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَقُولُ هَذَا الشِّعْرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خَلِّ عَنْهُ يَا عُمَرُ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَكَلَامُهُ أَشَدُّ عَلَيْهِمْ مِنْ وَقْعِ النَّبْلِ»[1].

## باسی مۆڵەتدان بە وتنی شیعر و هۆنراوە لە ئیحرامدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ چووە نێو مەککە بە مەبەستی عومرەکردن پێش ئەوەی فەتحی مەککە بکات، ئیبنو ڕەواحەیش لە پێشیەوە دەڕۆیشت و دەیوت:

بێبڕوایان با ڕێگای بەردەمی چۆڵ بکەن... ئەمڕۆ لێتان دەدەین هەتا دادەبەزینە مەککە.

لێدانێك سەر لە گەردن جیا دەکاتەوە... خۆشەویست لە خۆشەویست جیا دەکاتەوە،

عومەر وتی: ئەی کوڕەکەی ڕەواحە لە حەڕەمی خوادا و لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شیعرە دەڵێی! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازی لێ بهێنە ئەی عومەر، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەو شیعرە لە تیربارانکردن کاریگەرترە لەسەر دڵیان.

---

(١) إسناده حسن، من أجل جعفر بن سليمان الضبعي، والمتن صحيح.

## الرُّخْصَةِ فِي لُبْسِ الْمُحْرِمِ السَّرَاوِيلَ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْإِزَارِ وَالْخُفَّيْنِ عِنْدَ عَدَمِ وُجُودِ النَّعْلَيْنِ، بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ فِي ذِكْرِ الْخُفَّيْنِ عِنْدَ عَدَمِ وُجُودِ النَّعْلَيْنِ

**٢٦٨١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَخْطُبُ، وَيَقُولُ: «السَّرَاوِيلُ لِمَنْ لَا يَجِدُ الْإِزَارَ وَالْخُفَّانِ لِمَنْ لَا يَجِدُ النَّعْلَيْنِ»[١].

**باسی مۆڵەتدان بە ئیحرامپۆش لە کاتی نەبوونی پۆشاکی بەشی خوارەوە شەرواڵ لەپێ بکات، هەروەها خوفیش بەکار بهێنێ ئەگەر جووتێ نەعلی دەست نەکەوت، بە دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك شیکراوە و ڕوون (مُفَسَّر)، لە باسی هەردوو خوفەکە لە کاتی نەبوونی جووتێك نەعل**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو وتاری دەدا و دەیفەرموو: شەرواڵ بۆ کەسێکە پشتەماڵی نەبێ (بەشی خوارەوەی خۆی پێ بپۆشێ)، هەروەها لەپێکردنی خوفیش بۆ کەسێکە نەعلی دەست نەکەوێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي إِبَاحَةِ لُبْسِ الْخُفَّيْنِ لِمَنْ لَا يَجِدُ النَّعْلَيْنِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ لِلْمُحْرِمِ لُبْسَ الْخُفَّيْنِ الْمَقْطُوعِ أَسْفَلَ الْكَعْبَيْنِ، لَا كُلُّ مَا وَقَعَ عَلَيْهِ اسْمُ خُفٍّ، وَإِنْ كَانَ فَوْقَ الْكَعْبَيْنِ

**٢٦٨٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ بِذَاكَ الْمَكَانِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ قَالَ: «لَا يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَ وَلَا الْعِمَامَةَ، وَلَا الْخُفَّيْنِ إِلَّا أَنْ لَا يَجِدَ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا شَيْئًا مِنَ الثِّيَابِ مَسَّهُ وَرْسٌ أَوْ زَعْفَرَانٌ وَلَا الْبُرْنُسَ»[٢].

**باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەی ئەو دەستەواژە ناڕوونەیە کە باسمان کرد، دەربارەی ڕێگەدان بە لەپێکردنی خوفەکان، بۆ ئەو کەسەی جووتێ نەعلی دەست نەکەوت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## ڕێگەی داوە بە ئیحرامپۆش خوفەکان لەپێ بکات لە خواری قاپەڕەقەیەوە ببیڕێتەوە، نەک هەموو ئەوانەی ناوی خوفیان بەسەردا سەپاوە، ئەگەرچی لە سەرووی قاپەڕەقەیشەوە بێت

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، لە کاتێکدا ئەو لەو جێگایە بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیحرامپۆش چی جلوبەرگێك لە ئیحرامدا نەپۆشێ؟ فەرمووی: نە کراس لەبەر بکات و نە شەرواڵ لەپێ بکات و نە مێزەر لەسەر بکات و نە خوفەکان لەپێ بکات، مەگەر کەسێك جووتێ نەعلی دەست نەکەوێ، ئەوا با خوفەکان لەپێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە ببیڕێت، هەروەها هیچ پۆشاکێك لەبەر نەکات کە زەعفەران و وەرسی پێوە بێت (واتە: نابێت بۆن و گوڵاوی بەر کەوتبێت) هەروەها ڕۆبیش لەبەر نەکات (کە جۆرە پۆشاکێ بووە کڵاوی لەگەڵ خۆیدا بووە).

**٢٦٨٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭫ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا لَمْ يَجِدِ الْمُحْرِمُ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﭫ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئیحرامپۆش جووتێ نەعلی دەست نەکەوت، ئەوە با خوفەکان لەپێ بکات، بەڵام لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە ببیڕێت (بۆ ئەوەی وەکوو نەعلی لێ بێت).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ لِلْمُحْرِمِ لُبْسَ الْخُفَّيْنِ اللَّذَيْنِ هُمَا أَسْفَلُ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، لَا أَنَّهُ أَبَاحَ لَهُ لُبْسَ الْخُفَّيْنِ اللَّذَيْنِ لَهَا سَاقَانِ، وَإِنْ شُقَّ أَسْفَلَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الْخُفَّيْنِ شَقًّا، وَتُرِكَ السَّاقَيْنِ فَلَمْ يُبَانَا مِمَّا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ عَلَى مَا تَوَهَّمَهُ بَعْضُ النَّاسِ

**٢٦٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﭬ أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَاذَا نَلْبَسُ مِنَ الثِّيَابِ إِذَا أَحْرَمْنَا؟ فَقَالَ: «لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ، وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا الْقَلَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ إِلَّا أَحَدٌ لَيْسَتْ لَهُ نَعْلَانِ فَلْيَلْبَسْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ[٢]».

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە ئیحرامپۆش هەردوو خوفەکە لەپێ بکات بە مەرجێ لە خواری هەردوو قاپەڕەقەیەوە بێت، بەڵام ڕێگەی پێ نەداوە هەردوو خوفەکە لەپێ بکات کە لە سەرووی قاپەڕەقەیەوە بێت، ئەگەرچی لە خوار هەردوو قاپەڕەقەوە قڵیشیان بردبێ و پێش قاپەڕەقەیان داپۆشی بێت، بەڵام لە خوار قولەپێیان دەرنەکەوتبێت و بەڕوونی دیار نەبێت، ئەوە دروست نییە، وەکوو هەندێ کەس بەهەڵەدا چوون پێیان وایە دروستە

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بپۆشین كاتێ ئیحرامان بەست؟ فەرمووی: نە كراس لەبەر بكەن و نە شەرواڵ لەپێ بكەن و نە ڕۆب لەبەر بكەن و نە مێزەر لەسەر بكەن و نە كڵاو لەسەر بكەن و نە خوف لەپێ بكەن، مەگەر كەسێك جووتێ نەعلی دەست نەكەوێ، ئەوە با خوفەكان لەپێ بكات لە خوار قاپەڕەقەی قاچیەوە بێت.

**٢٦٨٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ:«فَإِنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[١].

واتە: وە بەسەنەدێكی دیكە گێڕدراوەتەوە لە ئیبنو عومەر ﷺ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر (ئیحرامپۆش) جووتێك نەعلی دەستكەوت (لەپێی بكات)، با دوو خوف لەپێ بكات، بەڵام لە خوار قاپەڕەی قاچیەوە بێ (بۆ ئەوەی وەك نەعلی لێ بێت).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا رَخَّصَ بِالْأَمْرِ بِقَطْعِ الْخُفَّيْنِ لِلرِّجَالِ دُونَ النِّسَاءِ، إِذْ قَدْ أَبَاحَ لِلنِّسَاءِ الْخُفَّيْنِ وَإِنْ وَجَدْنَ نِعَالًا، فَرَخَّصَ لِلنِّسَاءِ فِي لُبْسِ الْخِفَافِ دُونَ الرِّجَالِ

**٢٦٨٦-** عَنْ سَالِمٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ، قَدْ كَانَ صَنَعَ ذَلِكَ يَعْنِي قَطْعَ الْخُفَّيْنِ لِلنِّسَاءِ حَتَّى حَدَّثَتْهُ صَفِيَّةُ بِنْتُ أَبِي عُبَيْدٍ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ رَخَّصَ لِلنِّسَاءِ فِي الْخُفَّيْنِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە بڕینی خوفەکان بۆ پیاوان نەك ئافرەتان، چونکە ڕێگەی دا ئافرەتان خوفەکان لەپێ بکەن ئەگەرچی نەعلیشیان هەبوو، جا مۆڵەتی دا بە ئافرەتان خوفەکان لەپێ بکەن جگە لە پیاوان

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ خوفەکانی بۆ ئافرەتان دەبڕیەوە تا صەفیەی کچی ئەبو عوبەید بۆی باس کرد لە عائیشەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بە ئافرەتان خوفەکان لەپێ بکەن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي اسْتِظْلَالِ الْمُحْرِمِ وَإِنْ كَانَ نَازِلًا غَيْرَ سَائِرٍ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ كَرِهَهُ وَنَهَى عَنْهُ

**٢٦٨٧-** عن جَعْفَر بْن مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ أَمَرَ - يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ - بِقُبَّةٍ لَهُ مِنْ شَعْرٍ فَضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةٍ فَسَارَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةٍ فَنَزَلَ بِهَا(١).

## باسی مۆڵەتدان بە دروستکردنی سێبەر بە مەبەستی پشوودان بۆ ئیحرامپۆش ئەگەرچی دابەزیبێت و لە ڕێگا نەبێت، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی باش نییە و قەدەغەی لێکردووە

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: چووین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ، -دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد- وتی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەوارەکەی خۆی کە لە موو دروست کرابوو بۆی هەڵبدرێ لە (نَمِرَةَ) (شوێنێك بوو لە عەرەفە)، جا لە (نَمِرَةَ) دەوارەکەی بۆ هەڵدرا، پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێ تا گەیشتە عەرەفە، تەماشای کرد دەوارەکەی لە (نَمِرَةَ) بۆ هەڵدرابوو، دواترە دابەزیە ئەو شوێنە بۆ پشوودان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ اسْتِظْلَالِ الْمُحْرِمِ وَإِنْ كَانَ رَاكِبًا غَيْرَ نَازِلٍ

**٢٦٨٨-** عَنْ يحيى بن الحصين الأحمسي عَن أُمِّ الْحُصَيْنِ جَدَّتِهِ ﵂ قَالَتْ: حَجَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَجَّةَ الْوَدَاعِ فَرَأَيْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، وَبِلَالًا يَقُودُ أَحَدُهُمَا بِخِطَامِ رَاحِلَتِهِ وَالْآخَرُ رَافِعًا ثَوْبَهُ يَسْتُرُهُ مِنَ الْحَرِّ حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ[1].

## باسی ڕێگەدان بە دروستکردنی سێبەر بۆ ئیحرامپۆش، ئەگەرچی ئیحرامپۆش سوار بێت و دانەبەزیبێ بەمەبەستی پشوودان

واتە: یەحیای کوڕی حوصەینی ئەحمەسی دەگێڕێتەوە، لە ئوممو حوصەین، کە داپیریەتی ﵂، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاوایدا حەجم کرد، ئوسامەی کوڕی زەید و بیلالم بینی یەکێکیان ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو، ئەویتریشیان جلەکەی بەرز کردبۆیەوە و کردبووی بە سێبەر بۆی لە تینی گەرما تا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ أَبْدَالِ الْمُحْرِمِ ثِيَابَهُ فِي الْإِحْرَامِ وَالرُّخْصَةِ فِي لُبْسِ الْمُمَشَّقِ مِنَ الثِّيَابِ وَإِنْ كَانَ الْمُمَشَّقُ مَصْبُوغًا غَيْرَ أَنَّهُ مَصْبُوغٌ بِالطِّينِ

**٢٦٨٩-** عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: كُنَّا نَلْبَسُ مِنَ الثِّيَابِ إِذَا أَهْلَلْنَا مَا لَمْ نُهِلَّ فِيهِ، وَنَلْبَسُ الْمُمَشَّقَ إِنَّمَا هُوَ طِينٌ. و عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: كُنَّا نَلْبَسُ إِذَا أَهْلَلْنَا مَا لَمْ يَمَسَّهُ طِيبٌ وَلَا زَعْفَرَانٌ، وَنَلْبَسُ الْمُمَشَّقَ إِنَّمَا هُوَ طِينٌ[2].

## باسی ڕێگەدان بەوەی ئیحرامپۆش جلەکەی لە ئیحرامدا بگۆڕێ، وە ڕێگەدان بەوەی جلوبەرگی بۆیاغکراو لەبەر بکات، ئەگەرچی بە قوڕی سوور بۆیاغ نەکرابێت

واتە: جابر ﵁ دەڵێ: ئێمە کاتێ ئیحرامان ببەستایە جلوبەرگێکمان لەبەر دەکرد کە ئیحرامان پێوە نەبەستبوو، وە جلێکمان لەبەر دەکرد بە قوڕی سوور بۆیاغکرابوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وە (بە سەنەدێکی دیکە هاتووە) جابری کوڕی عەبدوڵا دەڵێ: ئێمە کاتێ ئیحڕاممان بەستایە جلێکمان لەبەر دەکرد بۆنی خۆش و زەعفەرانی بەرنەکەوتایە، هەروەها جلێکمان لەبەر دەکرد بە قوڕی سوور بۆیاغکرابوو.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَغْطِيَةِ الْمُحْرِمَةِ وَجْهَهَا مِنَ الرِّجَالِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ، أَحْسَبُهُ غَيْرَ مُفَسَّرٍ

٢٦٩٠- عَنْ أَسْمَاءَ ﵄ قَالَتْ: كُنَّا نُغَطِّي وُجُوهَنَا مِنَ الرِّجَالِ، وَكُنَّا نَمْتَشِطُ قَبْلَ ذَلِكَ[1].

## باسی ڕێگەدان بەوەی ئافرەتی ئیحڕامپۆش ڕوخساری داپۆشێت لە پیاوان، بە باسکردنی فەرموودەیەکی ناڕوون، پێم وایە ڕوون نەکراوەتەوە

واتە: ئەسماء ﵄ دەڵێ: ئێمە ڕوخسارمان لە پیاوان دادەپۆشی (لە ئیحڕامدا)، وە ئێمە قژمان شانە دەکرد پێش ئەوەی بچینە نێو ئیحڕامەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِهَذِهِ اللَّفْظَةِ الَّتِي حَسَبْتُهَا مُجْمَلَةً، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لِلْمُحْرِمَةِ تَغْطِيَةَ وَجْهِهَا مِنْ غَيْرِ انْتِقَابٍ وَلَا إِمْسَاسِ الثَّوْبِ، إِذِ الْخِمَارُ الَّذِي تَسْتُرُ بِهِ وَجْهَهَا بَلْ تُسْدِلُ الثَّوْبَ مِنْ فَوْقِ رَأْسِهَا عَلَى وَجْهِهَا، أَوْ تَسْتُرُ وَجْهَهَا بِيَدِهَا أَوْ بِكُمِّهَا أَوْ بِبَعْضِ ثِيَابِهَا، مُجَافِيَةً يَدَهَا عَنْ وَجْهِهَا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي زَجْرِ النَّبِيِّ ﷺ الْمُحْرِمَةَ عَنِ الِانْتِقَابِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنْ لَيْسَ لِلْمُحْرِمَةِ تَغْطِيَةُ وَجْهِهَا بِإِمْسَاسِ الثَّوْبِ وَجْهَهَا

٢٦٩١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ فَإِذَا مَرَّ بِنَا الرَّكْبُ سَدَلْنَا الثَّوْبَ عَلَى وَجْهِنَا، وَفِي حَدِيثِ هُشَيْمٍ، فَإِذَا جَاوَزْنَا كَشَفْنَاهُ[2].

**باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەی ئەو دەستەواژەیە کە پێم وا بوو ناڕوونە، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئافرەتی ئیحڕامپۆش ڕوخساری دەپۆشێت بەبێ نیقابکردن، ئەو سەرپۆشە لەسەریەوە دەهێنێتە خوارەوە بۆ سەر ڕوخساری، بەدەستی ڕوخساری دادەپۆشێ، یان بە قۆڵی، یان بە**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## هەندێ لە جلەکانی، دەستی دەخاتە سەر ڕوخساری، ئەبو بەکر دەڵێ: سەرزەنشتکردنی پێغەمبەر ﷺ لە نیقابکردن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئافرەتی ئیحرامپۆش بۆی نییە ڕوخساری بە جلوبەرگ دابپۆشێت

واتە: عائیشە ڕضی الله عنها دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، ئیحرامان پۆشیبوو، کاتێ کاروانییەك بەلاماندا تێپەڕ بووایە جلەکانمان دەدا بەسەر ڕوخسارماندا، وە لە فەرموودەکەی هوشەیمدا هاتووە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە): کاتێ لێمان تێپەڕ بووایە لامان دەبرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ دُخُولِ مَكَّةَ نَهَارًا، اقْتِدَاءً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالْبَيْتُوتَةِ قُرْبَ مَكَّةَ إِذَا انْتَهَى الْمَرْءُ بِاللَّيْلِ إِلَى ذِي طُوًى لِيَكُونَ دُخُولُهُ مَكَّةَ نَهَارًا لَا لَيْلًا

**٢٦٩٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ بَاتَ بِذِي طُوًى حَتَّى أَصْبَحَ فَدَخَلَ مَكَّةَ[١].

## باسی سوننەت وایە بۆ بەندە بە ڕۆژ بچێتە نێو مەککە، وەکوو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، وە لە نزیك مەککە شەو بکاتەوە، ئەگەر بە شەو گەیشتە (ذِي طُوًى) بۆ ئەوەی بە ڕۆژ بچێتە نێو مەککە نەك شەو

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە (ذِي طُوًى) (کە شوێنێکە لە نزیك مەککە) شەوی کردەوە، تا ڕۆژ بۆیەوە، دواتر چووە نێو مەککە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ دُخُولِ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ، إِذْ فِي الِاقْتِدَاءِ الْخَيْرُ الَّذِي لَا يُعْتَاضُ مِنْهُ أَحَدٌ تَرَكَ الِاقْتِدَاءَ بِهِ

**٢٦٩٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدْخُلُ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا، وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




**سوننەت وایە بۆ بەندە لە ڕێگای سەرەوە بچێتە نێو مەککە، وەکوو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ چونکە لە شوێنکەوتنیدا خێر و پاداشتێك هەیە لە هیچ شتێکدا ئەو خێر و پاداشتە نییە**

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەچووە نێو مەککەوە لە ڕێگای سەرەوە، وە لە ڕێگای خوارەوەیش دەردەچوو.

**بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاغْتِسَالِ لِدُخُولِ مَكَّةَ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ اغْتَسَلَ عِنْدَ إِرَادَتِهِ دُخُولَ مَكَّةَ**

**٢٦٩٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَهَلَّ مَرَّةً مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ مِنْ عِنْدِ الشَّجَرَةِ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا جَاءَ ذَا طُوًى بَاتَ حَتَّى يُصَلِّيَ الصُّبْحَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ دَخَلَ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ مِنْ كُدًى، وَخَرَجَ حِينَ خَرَجَ مِنْ كُدًى مِنْ أَسْفَلِ مَكَّةَ[١].

**باسی سوننەت وایە بەندە کاتێ دەچێتە نێو مەککە خۆی بشوات، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتی ویستی بچێتە مەککە خۆی شۆرد**

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) ئیحرامی بەست لەلای درەختەکە، (ئەو درەختەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە ژێریدا پشووی ئەدا) وە پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە (ذَي طُوًى) شەو لەوێ مایەوە تا نوێژی بەیانی کرد، دواتر خۆی شۆرد، پاشان لە بەرزاییەکانی مەککەوە لە (كُدى) دەرچوو، وە کاتێکیش دەرچوو لە (كُدى)وە دەردەچوو لە خوار مەککە.

**٢٦٩٥-** عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما، كَانَ إِذَا أَتَى ذَا الْحُلَيْفَةِ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَرُحِلَتْ، ثُمَّ صَلَّى الْغَدَاةَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَأَهَلَّ، ثُمَّ يُلَبِّي حَتَّى إِذَا بَلَغَ الْحَرَمَ أَمْسَكَ حَتَّى إِذَا أَتَى ذَا طُوًى بَاتَ بِهِ قَالَ: فَيُصَلِّي بِهِ الْغَدَاةَ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَ ذَلِكَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ کاتێ هاتە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) فەرمانی کرد کەلوپەلەکانی خرایە سەر وشترەکە، پاشان نوێژی بەیانی کرد، پاشان سوار بوو تا ڕێك بۆیەوە ڕووی کردە قیبلە و تەلبیەی کرد، وتی: پاشان تەلبیەی کرد تا گەیشتە حەرەم، (بەهۆی سەرقاڵبوون بە شتی دیکەوە وەکوو تەوافکردن) لە تەلبیەکردن وەستا، تا کاتێ گەیشتە (ذَي طُوًى) (کە شوێنێکی ناسراو بوو لە نزیك مەککە) لەوێ خەوت، وتی: نوێژی بەیانی لەوێ کرد، پاشان خۆی شۆرد، پێی وا بوو پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەی کرد.

## بَابُ قَطْعِ التَّلْبِيَةِ فِي الْحَجِّ عِنْدَ دُخُولِ الْحَرَمِ إِلَى الْفَرَاغِ مِنَ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ

**٢٦٩٦-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ قَالَ: حَجَجْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ بَيْنَ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ مَرَّةً قَالَ قُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَقَدْ رَأَيْتُ مِنْكَ أَرْبَعَ خِصَالٍ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: رَأَيْتُكَ إِذَا أَهْلَلْتَ، فَدَخَلْتَ الْعَرْشَ قَطَعْتَ التَّلْبِيَةَ قَالَ: صَدَقْتَ يَا ابْنَ حُنَيْنٍ خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا دَخَلَ الْعَرْشَ قَطَعَ التَّلْبِيَةَ، فَلَا تَزَالُ تَلْبِيَتِي حَتَّى أَمُوتَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ أَرَى لِلْمُعْتَمِرِ التَّلْبِيَةَ حَتَّى يَسْتَلِمَ الْحَجَرَ أَوَّلَ مَا يَبْتَدِئُ الطَّوَافَ لِعُمْرَتِهِ لِخَبَرِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى عَنْ عَطَاءٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يُمْسِكُ عَنِ التَّلْبِيَةِ فِي الْعُمْرَةِ إِذَا اسْتَلَمَ الْحَجَرَ.

## باسی پچڕاندنی تەلبیەکردن لە حەجدا لە کاتی چوونەنێوەوەی حەرەم، تا هاتوچۆی نێوان صەفا و مەروە تەواو دەکات

واتە: عوبەیدی کوڕی حونەین دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دوازدە جار حەج و عومرەم کرد، وتی: پێم وت: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان چوار خەصڵەتم لە تۆ بینی، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد، وتی: بینیتم کاتێ ئیحرامت بەست و چوویتە نێو کەپرەکانی نزیك مەککە تەلبیەکردنت پچڕاند، وتی: ڕاستت کرد ئەی ئیبنو حونەین، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم، کاتێ چووە نێو کەپرەکە

---

(١) صحيح.

تەلبیەکردنی پچڕاند، (واتە: ئیتر تەلبیەی نەکرد) بەردەوام بەوشێوە تەلبیە دەکەم تا دەمرم.

ئەبو بەکر دەڵێ: من پێم وایە عومرەکەر تەلبیە بکات تا دەست دەدات لە بەردەکە و یەکەم جار کە دەست دەکات بە تەواف بۆ عومرەکەی، لەبەر فەرموودەکەی ئیبنو ئەبو لەیلا لە عەتا لە ئیبنو عەباسەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی بدایە لە بەردەکە لە عومرەدا ئیتر تەلبیەی نەدەکرد.

**٢٦٩٧-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَلَمَّا تَدَبَّرْتُ خَبَرَ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ كَانَ فِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ كَانَ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ عِنْدَ دُخُولِ عُرُوشِ مَكَّةَ، وَخَبَرُ عُبَيْدِ بْنِ حُنَيْنٍ أَثْبَتُ إِسْنَادًا مِنْ خَبَرِ عَطَاءٍ؛ لِأَنَّ ابْنَ أَبِي لَيْلَى لَيْسَ بِالْحَافِظِ، وَإِنْ كَانَ فَقِيهًا عَالِمًا، فَأَرَى لِلْمُحْرِمِ كَانَ بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ أَوْ بِهِمَا جَمِيعًا قَطْعَ التَّلْبِيَةِ عِنْدَ دُخُولِ عُرُوشِ مَكَّةَ، فَإِنْ كَانَ مُعْتَمِرًا لَمْ يَعُدْ إِلَى التَّلْبِيَةِ، وَإِنْ كَانَ مُفْرَدًا أَوْ قَارِنًا عَادَ إِلَى التَّلْبِيَةِ عِنْدَ فَرَاغِهِ مِنَ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ؛ لِأَنَّ فِعْلَ ابْنِ عُمَرَ كَالدَّالِ عَلَى أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ قَطَعَ التَّلْبِيَةَ فِي حَجَّتِهِ إِلَى الْفَرَاغِ مِنَ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ حَدَّثَنَاهُ الرَّبِيعُ بْنُ سُلَيْمَانَ حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ بَكْرٍ عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ قَالَ: قَالَ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَدَعُ التَّلْبِيَةَ إِذَا دَخَلَ الْحَرَمَ، وَيُرَاجِعَهَا بَعْدَ مَا يَقْضِي طَوَافَهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ[1].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: کاتێ کە سەرنجی فەرموودەکەی عوبەیدی کوڕی حونەینم دا ئەوەی تێدا بوو کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ چووە لای کەپرەکانی مەککە تەلبیەکردنی پچڕاند، وە فەرموودەکەی عوبەیدی کوڕی حونەین لە ڕووی سەنەدەوە بەهێزترە لە فەرموودەکەی عەتاء، چونکە ئیبنو ئەبو لەیلا (الْحَافِظِ) نییە (کە مەرتەبەیەکە لە زانستی فەرموودە)، ئەگەرچی فەقیهێکی زانایە، جا پێم وایە ئیحرامپۆش بۆ حەج یان عومرە یان بۆ هەردووکیان کاتێ دەگاتە لای کەپرەکانی مەککە تەلبیە بپچڕێنێ، ئەگەر ئیحرامی بۆ عومرە بەستبوو ناگەڕێتەوە بۆ تەلبیەکردن، وە ئەگەر ئیحرامی تەنها بۆ حەج بەستبوو یان بە قیران بەستبوو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ تەلبیە لە کاتی لێبوونەوەی لە هاتوچۆ لە نێوان صەفا و مەڕوە، چونکە کردەوەکەی ئیبنو عومەر وەکوو بەڵگە وایە لەسەر ئەوەی ئەو پێغەمبەری ﷺ بینیوە تەلبیەی

---

(١) إسناده ضعيف.

پچڕاندووە لە حەجەکەیدا تا تەواوکردنی هاتوچۆ لە نێوان صەفا و مەڕوە، ڕەبیعی کوڕی سولەیمان بۆی باس کردین، لە بیشری کوڕی بەکرەوە بۆی باس کردین، لە ئەوزاعییەوە وتی: عەتائی کوڕی ئەبو ڕیباح وتی: ئیبنو عومەر وازی لە تەلبیە دەهێنا کاتێ بچووایەتە نێو حەرەمەوە، وە دەستی پێ دەکردەوە دوای ئەوەی تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەی دەکرد.

**٢٦٩٨-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ إِذَا دَخَلَ الْحَرَمَ، وَيُعَاوِدُ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الطَّوَافِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَأَخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ دَالَّةٌ عَلَى أَنَّهُ لَمْ يَقْطَعِ التَّلْبِيَةَ عِنْدَ دُخُولِهِ الْحَرَمَ قَطْعًا لَمْ يُعَاوِدْ... سَأَذْكُرُ تَلْبِيَتَهُ إِلَى أَنْ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فِي مَوْضِعِهَا مِنْ هَذَا الْكِتَابِ إِنْ وَفَّقَ اللَّهُ لِذَلِكَ وَشَاءَ.

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عومەرم بینی ﷺ کاتێ چووە نێو حەرەمەوە تەلبیەی پچڕاند، کاتێکیش تەوافی بەیتی بکردایە بۆی دەگەڕایەوە، هەروەها کاتێکیش لە تەوافی صەفا و مەڕوە دەبۆیەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەو بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی چوونەنێوەوەی حەرەم بەهیچ شێوەیەك تەلبیەی نەپچڕاندووە... کەمێکی دیکە لە جێگای خۆیدا باسی تەلبیەکردنی دەکەم تا بەردبارانی جەمرەی کردووە لەم کتێبەدا ئەگەر خوا سەرکەوتووی کردین بۆ ئەو کارە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَجْدِيدِ الْوُضُوءِ عِنْدَ إِرَادَةِ الْمَرْءِ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ عِنْدَ مَقْدَمِهِ مَكَّةَ

**٢٦٩٩-** عَنْ أَبِي الْأَسْوَدِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ قَالَ لَهُ سَلْ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ عَنْ رَجُلٍ يُهِلُّ بِالْحَجِّ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: قَدْ حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنَّهُ أَوَّلُ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ أَنَّهُ تَوَضَّأَ، ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ فَذَكَرَ حَدِيثًا فِيهِ بَعْضُ الطُّوْلِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی چاکتر وایە بەندە دەستنوێژ تازە بکاتەوە کاتێ ویستی تەوافی بەیت بکات، لە کاتی گەیشتنی بە مەککە

واتە: ئەبولئەسوەد موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە خەڵکی عێراق پێی وت: پرسیار بکە لە عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەربارەی پیاوێك لە حەج تەلبیە بکات، پرسیارم لێکرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەجی کرد عائیشە هەواڵی پێدام یەکەم شت کە پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد کاتێ هاتە مەککە دەستنوێژی گرت، پاشان تەوافی بەیتی کرد، دواتر باسی فەرموودەیەکی کرد ئەندازەیەك درێژ بوو.

### بَابُ اسْتِحْبَابِ دُخُولِ الْمَسْجِدِ مِنْ بَابِ بَنِي شَيْبَةَ

**٢٧٠٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا قَدِمَ فِي عِقْدِ قُرَيْشٍ فَلَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنْ هَذَا الْبَابِ الْأَعْظَمِ، وَقَدْ جَلَسَتْ قُرَيْشٌ مِمَّا يَلِي الْحَجَرُ أَوِ الْحِجْرُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[١].

### باسی چاکتر وایە لە دەرگای نەوەکانی شەیبەوە بچێتە نێو مزگەوتی حەرام

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هاتە مەککە لە پەیمانبەستنەکەی لەگەڵ قوڕەیش، کاتێ کە هاتە نێو مەککە، لەم دەرگا گەورەوە هاتە ژوورەوە، کۆمەڵی قوڕەیشیش لە لای بەردە ڕەشەکە یان حیجری (ئیسماعیل علیه السلام)) دانیشتبوون، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد.

**بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّزَيُّنِ عِنْدَ إِرَادَةِ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ بِلُبْسِ الثِّيَابِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لُبْسَ الثِّيَابِ زِينَةٌ لِلْمَلَابِسِينَ وَلِسُتْرَةِ الْعَوْرَةِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنِ الثِّيَابُ مُزَيَّنَةً بِصِبْغٍ، وَلَا كَانَتْ ثِيَابًا فَاخِرَةً، إِذِ اللَّهُ ﷻ قَالَ فِي مُحْكَمِ تَنْزِيلِهِ: ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴿٣١﴾﴾ الأعراف، وَلَمْ يُرِدْ بِهَذَا الْأَمْرِ لُبْسَ الثِّيَابِ الْمُزَيَّنَةِ بِالصَّبْغِ وَالْمُوَشَّى، وَلَا لُبْسَ الثِّيَابِ الْفَاخِرَةِ، وَلَكِنْ أَرَادَ لُبْسَ الثِّيَابِ الَّتِي تُوَارِي الْعَوْرَةَ، كَانَتْ فَاخِرَةً أَوْ دَنِيئَةً، إِذِ الْآيَةُ إِنَّمَا نَزَلَتْ زَجْرًا عَمَّا كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَفْعَلُونَهُ مِنَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ عُرَاةً غَيْرَ سَاتِرِي عَوْرَاتِهِمْ بِالثِّيَابِ»**

---

(١) صحيح.

**٢٧٠١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ، وَتَقُولُ: الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ، فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلَا أُحِلُّهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف[1].

**باسی فەرمانکردن بە خۆڕازاندنەوە کاتێ بەندە دەیەوێ تەوافی بەیت بکات بە پۆشینی جلوبەرگ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پۆشینی جلوبەرگ خۆڕازاندنەوەیە بۆ ئەوانەی پۆشاك لەبەر دەکەن، ئەگەرچی جلوبەرگەکەش بە بۆیاخ جوان نەکرابێتەوە، یان جلوبەرگێکی گرانبەها نەبێت، چونکە خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم خۆتان بڕازێننەوە لە هەموو مزگەوتێکدا. لەم فەرمانکردنەدا مەبەستی پۆشینی جلوبەرگی جوانکراو نەبوو بە بۆیاخ، یان جلوبەرگێکی گرانبەها، بەڵکوو مەبەستی ئەو جلوبەرگەیە کە عەوڕەت و شەرمگا دادەپۆشێ، جا جلوبەرگەکە گرانبەها بێت یان هەرزان، چونکە ئایەتەکە بۆ سەرزەنشتکردنی ئەوە دابەزی کە خەڵکی سەردەمی نەفامی دەیانکرد لە تەوافکردنی بەیت بەڕووتی، نەك ئەوانەی عەوڕەتیان بە جلوبەرگ دادەپۆشی**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئافرەت (لە سەردەمی نەفامیدا) بەڕووتی تەوافی بەیتی دەکرد، وە دەیوت: ئەمڕۆ بەشێك لە عەوڕەت دەردەکەوێت، یان هەمووی دەردەکەوێت، لە هەردوو حاڵەتدا تەماشاکردن بەحەڵاڵ نازانم، دواتر ئەم دەقە دابەزیە خوارەوە: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴿٣١﴾ ﴾.

**٢٧٠٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ فِي رَهْطٍ يُؤَذِّنُونَ النَّاسَ يَوْمَ النَّحْرِ أَلَا لَا يَحُجُّ بَعْدَ الْيَوْمِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکری صدیق لەو حەجکردنەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد پێش حەجیماڵئاوایی لەگەڵ کۆمەڵێکدا ناردمی بە خەڵك ڕابگەیەنین و ئاگاداریان بکەینەوە لە ڕۆژی جەژنی قوربان، ئاگادار بن با لەدوای ئەمڕۆ هیچ هاوبەشدانەرێك حەج نەکات، هەروەها هیچ کەسێکیش بەڕووتی تەواف نەکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ كَرَاهَةِ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ رُؤْيَةِ الْبَيْتِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ، قَدْ تَوَهَّمَ بَعْضُ مَنْ لَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْخَبَرِ الْمُجْمَلِ وَالْمُفَسَّرِ أَنَّهُ خِلَافُ خَبَرِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَنَّهُ رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ رَأَى الْبَيْتَ، وَيَحْسَبُ أَنَّهُ خِلَافُ خَبَرِ مِقْسَمٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَنَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، «تُرْفَعُ الْأَيْدِي فِي سَبْعِ مَوَاطِنَ» فِي الْخَبَرِ: وَعِنْدَ اسْتِقْبَالِ الْبَيْتِ

**٢٧٠٣-** عَنِ ابنِ أبي ليلى عَن مِقْسم عن بن عباس وعَن نافع عن ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تُرْفَعُ الْأَيْدِي فِي سَبْعَةِ مَوَاطِنٍ، وَفِي الْخَبَرِ وَعِنْدَ اسْتِقْبَالِ الْبَيْتِ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ أَجْعَلْ لِهَذَا الْخَبَرِ بَابًا لِأَنَّهُمْ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي هَذَا الْإِسْنَادِ وَبَيَّنْتُهُ فِي كِتَابِ الْكَبِيرِ.

**باسی کەڕاهەتی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە کاتی بینینی کەعبەی پیرۆز، بە باسکردنی فەرموودەیەك کورت و ناڕوونە (مُجْمَل) شیکراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)، هەندێ لەوانەی کە فەرموودەی ناڕوون و ڕوونکراوە لەیەك ناکاتەوە بەهەڵەدا چووە وا دەزانێ ئەوە پێچەوانەی فەرموودەکەی عومەرە کە ئەو کاتێ بەیتی بینی هەردوو دەستی بەرز کردەوە، وە پێی وایە پێچەوانەی فەرموودەکەی میقسەمە لە ئیبنو عەباسەوە، وە نافیع لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تُرْفَعُ الْأَيْدِي فِي سَبْعِ مَوَاطِنَ)، واتە: لە حەوت جێگادا دەستەکان بەرز دەکرێنەوە، وە لە فەرموودەکەدا هاتووە: وە لە کاتی بینینی بەیت**

واتە: ئیبنو ئەبو لەیلا دەگێڕێتەوە، لە میقسەم، لە ئیبنو عەباس، وە لە نافیع، لە ئیبنو عومەرەوە رضي الله عنهما، وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە حەوت جێگادا دەستەکان بەرز دەکرێنەوە، وە لە فەرموودەکەدا هاتووە لە کاتی ڕووکردنە بەیت.

ئەبو بەکر وتی: بۆ ئەم فەرموودە بەشێکم دانەناوە چونکە ئەوان جیاوازییان هەبوو لەم سەنەدەدا، لە کتێبی (الْكَبِيرِ) ڕوونم کردۆتەوە.

**٢٧٠٤-** عَنِ الْمُهَاجِرِ الْمَكِّيِّ قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما عَنِ الرَّجُلِ يَرَى الْبَيْتَ أَيَرْفَعُ يَدَيْهِ قَالَ: مَا أَظُنُّ أَحَدًا يَفْعَلُ هَذَا إِلَّا الْيَهُودَ، وَقَدْ حَجَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَكُنْ يَفْعَلُ هَذَا[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: موهاجیری مەککی دەڵێ: پرسیار کرا لە جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەربارەی پیاوێك کە بەیت دەبینێ ئایا دەستەکانی بەرز بکاتەوە، وتی: گومان نابەم کەس ئەو کارە بکات جگە لە جوولەکە نەبێت، بێگومان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ حەجمان کرد کاری ئاوای نەدەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: لَمْ يَكُنْ يَفْعَلُ هَذَا، أَيْ: لَمْ نَكُنْ نَرْفَعُ أَيْدِينَا عِنْدَ الْخُرُوجِ مِنَ الْمَسْجِدِ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الطَّوَافِ وَالصَّلَاةِ، وَلَمْ نَكُنْ نَسْتَقْبِلُ الْبَيْتَ فَنَرْفَعَ أَيْدِيَنَا بَعْدَ ذَلِكَ، لَا أَنَّا لَمْ نَكُنْ نَرْفَعُ أَيْدِيَنَا عِنْدَ رُؤْيَةِ الْبَيْتِ أَوَّلَ مَا نَرَاهُ

**٢٧٠٥-** عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَقْضِي صَلَاتَهُ وَطَوَافَهُ ثُمَّ يَخْرُجُ مِنَ الْمَسْجِدِ فَيَسْتَقْبِلُ الْبَيْتَ، فَقَالَ: مَا كُنْتُ أَرَى يَفْعَلُ هَذَا إِلَّا الْيَهُودَ[1].

**باسی فەرموودەیەك شیكەرەوەی ئەو دەستەواژە نارِوونەیە کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی جابری کوڕی عەبدوڵا لە وتەکەیدا: (لَمْ يَكُنْ يَفْعَلُ هَذَا)، واتە: لە کاتی دەرچوونمان لە مزگەوت دوای تەواوبوونمان لە تەواف و نوێژ دەستمان بەرز نەدەکردەوە، هەروەها دوای ئەوە ڕوومان نەدەکردە بەیت و دەست بەرز بکەینەوە، نەك بەو مانایەی ئێمە کە یەکەمجار بەیتمان دەبینی دەستمان بەرز نەدەکردەوە**

واتە: موهاجیری کوڕی عیکریمە دەڵێ: پرسیارمان کرد لە جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەربارەی پیاوێك نوێژ و تەواف تەواو دەکات، پاشان لە مزگەوت دەردەچێ و ڕوو دەکاتە بەیت، وتی: کەسم نەبینیوە کردەوەی لەو جۆرە بکات جگە لە جوولەکە.

## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ

**٢٧٠٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ وَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ، وَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) هذا حديث معلول، أخطأ فيه ضحاك بن عثمان -وهو صدوق يهم- وخالف من هم أحفظ منه، وأكثر عددا.

## باسی پاڕانەوە لە کاتی چوونە نێو مزگەوت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە با سڵاو بکات لە پێغەمبەر ﷺ، وە با بڵێت: خوایە دەرگاکانی میهرەبانی خۆتم بۆ بکەرەوە، وە ئەگەر دەرچوو با سڵاو بکات لە پێغەمبەر ﷺ و بڵێت: خوایە بمپارێزی لە شەیتانی ڕەجمکراو.

## بَابُ الِاضْطِبَاعِ بِالرِّدَاءِ عِنْدَ طَوَافِ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوْ أَحَدِهِمَا

٢٧٠٧- عَنْ أَبِي الطُّفَيل عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ قَالَ: فَاضْطَبَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ وَرَمَلُوا ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ وَمَشَوْا أَرْبَعَةً»[١].

## باسی دەرکردنی پۆشاك لەژێر باڵی ڕاستی بۆ سەر شانی چەپ لە کاتی تەوافی حەج و عومرە یان یەکێکیان

واتە: ئەبو توفەیل دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ لە فەرموودەیەکی درێژدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکەکەی لەژێر باڵی ڕاستیەوە دەرکرد و دای بەسەر شانی چەپیدا، لەگەڵ هاوەڵەکانی بە هەروەلە سێ تەوافیان کرد و چوار جاریش بەڕێکردنی ئاسایی تەوافیان کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السُّنَّةَ قَدْ كَانَ يَسُنُّهَا النَّبِيُّ ﷺ لِعِلَّةٍ حَادِثَةٍ فَتَزُولُ الْعِلَّةُ وَتَبْقَى السُّنَّةُ قَائِمَةً إِلَى الْأَبَدِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا رَمَلَ فِي الِابْتِدَاءِ وَاضْطَبَعَ لِيُرِيَ الْمُشْرِكِينَ قُوَّتَهُ وَقُوَّةَ أَصْحَابِهِ فَبَقِيَ الِاضْطِبَاعُ وَالرَّمَلُ سُنَّتَيْنِ إِلَى آخِرِ الْأَبَدِ

٢٧٠٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: فِيمَ الرَّمَلَانُ الْآنَ وَالْكَشْفُ عَنِ الْمَنَاكِبِ وَقَدْ أَطَّأَ اللَّهُ الْإِسْلَامَ، وَنَفَى الْكُفْرَ وَأَهْلَهُ، وَمَعَ ذَلِكَ لَا نَتْرُكُ شَيْئًا كُنَّا نَصْنَعُهُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر هۆکارێکی دیاریکراو سوننەتێکی ئەنجام دەدا، دواتر ئەو هۆکارە نەدەما، بەڵام سوننەتەکە هەر دەمایەوە بۆ هەتا هەتایە، پێغەمبەر ﷺ بۆیە لە سەرەتا هەروولەی کرد و پۆشاکەکەی لەژێر باڵی ڕاستی دەرکرد و خستیە سەر شانی چەپی تا هاوبەشدانەران هێز و توانای خۆی و هاوەڵەکانی ببینن، جا پۆشاك خستنە سەر شانی چەپ و هەروولەکردنەکە وەکوو دوو سوننەت بۆ هەمیشەیی مانەوە**

واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب بوو ﷺ دەیوت: ئیستا هەروەلە و دەرخستی شانەکان بۆچی بێت، لە کاتێکدا خوا ئیسلامی سەرخست و بێباوەڕی و شوێنکەوتووانیشی نەهێشت، لەگەڵ ئەوەیشدا واز لە شتێك ناهێنین کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەمانکرد.

## بَابُ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ عِنْدَ ابْتِدَاءِ الطَّوَافِ

**٢٧٠٩-** عن جَعْفَرٍ، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: فَخَرَجْنَا لَا نَنْوِي إِلَّا الْحَجَّ حَتَّى أَتَيْنَا الْكَعْبَةَ، فَاسْتَلَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْحَجَرَ الْأَسْوَدَ ثُمَّ رَمَلَ ثَلَاثًا وَمَشَى أَرْبَعًا[1].

**باسی دەستدان لە بەردە ڕەشەکە لە کاتی دەستپێکردنی تەواف**

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوری عەبدوڵا ﷺ پرسیارمان لێ کرد دەربارەی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، وتی: دەرچووین مەبەستمان هیچ نەبوو جگە لە حەج هەتا هاتینە کەعبە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە، پاشان سێ جار بەهەروەلە تەوافی کرد و چوار جاریش بەڕێکردن تەوافی کرد

**٢٧١٠-** عَنْ سَالِمِ بنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ يَقْدَمُ مَكَّةَ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ الْأَسْوَدَ أَوَّلَ مَا يَطُوفُ حِينَ يَقْدَمُ يَخِبُّ ثَلَاثَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی کاتێ هاتە مەککە، یەکەم جار کە دەستی کرد بە تەواف کرد دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە، لە کۆی حەوت تەوافەکە سێ جاریان بەپەلە تەوافی کرد.

## بَابُ تَقْبِيلِ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ إِذَا تَمَّ تَقْبِيلُهُ مِنْ غَيْرِ إِيذَاءِ الْمُسْلِمِ

**٢٧١١-** عَنْ سَالِمٍ أَنَّ أَبَاهُ، حَدَّثَهُ قَالَ: قَبَّلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ الْحَجَرَ، فَقَالَ: أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّكَ حَجَرٌ وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ[١].

## باسی ماچکردنی بەردە ڕەشەکە ئەگەر گونجا ماچ بکرێت بەبێ ئەوەی ئازاری مسوڵمانێك بدرێت

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، باوکی بۆی باس کرد وتی: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد، پاشان وتی: سوێند بە خوا زانیومە تۆ (تەنها) بەردێکی، ئەگەر نەمبینیایە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچت دەکات هەرگیز ماچم نەدەکردی.

## بَابُ الْبُكَاءِ عِنْدَ تَقْبِيلِ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ، وَفِي الْقَلْبِ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَوْنٍ هَذَا، وَوَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْحَجَرِ، وَمَسْحِ الْوَجْهِ بِهِمَا، وَلَكِنْ خَبَرَ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ ثَابِتٌ

**٢٧١٢-** عَنْ محمد بْنِ عَوْنٍ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اسْتَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ وَضَعَ شَفَتَيْهِ عَلَيْهِ يَبْكِي طَوِيلًا، فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا هُوَ بِعُمَرَ يَبْكِي، فَقَالَ: «يَا عُمَرُ هَا هُنَا تُسْكَبُ الْعَبَرَاتُ»[٢].

## باسی گریان لە کاتی ماچکردنی بەردە ڕەشەکە، لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی موحەممەدی کوڕی عەون، وە دانانی هەردوو دەست لەسەر بەردەکە، هەروەها سڕینی ڕوخساریش پێیان، بەڵام فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی عەلی چەسپاوە

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف جدا.

واتە: موحەممەدی کوڕی عەون دەگێڕێتەوە، لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووبەڕووی بەردە ڕەشەکە وەستا و دەستی لێی دا، ڕوخساریشی بە هەردوو دەستی سڕی، پاشان لێوی خستە سەری ئەندازەیەکی زۆر گریا، ئاوڕم دایەوە بینیم عومەریش دەگریا، فەرمووی: ئەی عومەر ئا لێرەدا فرمێسك لەچاو دێتە خوار (بەهۆی دابەزینی ڕەحمەتی خوا بۆ ئەو شوێنە).

**٢٧١٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَدَخَلْنَا مَكَّةَ حِينَ ارْتِفَاعِ الضُّحَى، فَأَتَى يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ بَابَ الْمَسْجِدِ، فَأَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَبَدَأَ بِالْحَجَرِ فَاسْتَلَمَ، وَفَاضَتْ عَيْنَاهُ بِالْبُكَاءِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: وَرَمَلَ ثَلَاثًا وَمَشَى أَرْبَعًا، حَتَّى فَرَغَ، فَلَمَّا فَرَغَ قَبَّلَ الْحَجَرَ وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَيْهِ، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە کاتی چێشتەنگاودا چووینە نێو مەککەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای دەرگای مزگەوتەکە (کەعبەی پیرۆز)، وشترەکەی یەخ دا، سەرەتا دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە و فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد-، وتی: سێ جار بەهەروەلە تەوافی کرد چوار جاریش بەڕێکردن، تا لێ بۆیەوە، کاتێ تەواو بوو ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد و هەردوو دەستی لەسەری دانا، پاشان هەردوو دەستی بە ڕوخساریدا هێنا.

## بَابُ السُّجُودِ عَلَى الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ إِذَا وَجَدَ الطَّائِفُ السَّبِيلَ إِلَى ذَلِكَ مِنْ غَيْرِ إِيذَاءِ الْمُسْلِمِ

**٢٧١٤-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: رَأَيْتُ مُحَمَّدَ بْنَ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ قَبَّلَ الْحَجَرَ وَسَجَدَ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ خَالَكَ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ يُقَبِّلُهُ وَيَسْجُدُ عَلَيْهِ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَبَّلَ وَسَجَدَ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ هَكَذَا، فَفَعَلْتُ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

### باسی سووژدەبردن لەسەر بەردە ڕەشەکە ئەگەر تەوافکەر زانی دەتوانێ ئەو کارە بکات بەبێ ئەوەی ئازاری مسوڵمانێك بدات (مەبەست لە سووژدەبردن لێرەدا ئەوەیە: بەردە ڕەشەکە ماچ بکات و نێوچاوانی بخاتە سەری، نەك سووژدەی نوێژ)

واتە: جەعفەری کوڕی عەبدوڵا دەڵێ: موحەممەد کوڕی عەبادی کوڕی جەعفەرم بینی ماچی بەردە ڕەشەکەی کرد و نێوچاوانی خستە سەری، پاشان وتی: ئیبنو عەباسی ﵄ خاڵتم بینی ماچی دەکرد و نێوچاوانی دەخستە سەری، ئیبنو عەباسیش وتی: عومەری کوڕی خەتابم بینی ماچی کرد و نێوچاوانی خستە سەری، پاشان وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەوشێوەی کرد، بۆیە منیش کردم.

### بَابُ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ بِالْيَدِ، وَتَقْبِيلِ الْيَدِ إِذَا لَمْ يُمْكِنْ تَقْبِيلُ الْحَجَرِ وَلَا السُّجُودُ عَلَيْهِ

**٢٧١٥-** عَنْ نَافِعٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﵄ اسْتَلَمَ الْحَجَرَ بِيَدِهِ، وَقَبَّلَ يَدَهُ، وَقَالَ مَا تَرَكْتُهُ مُنْذُ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُهُ[١].

### باسی دەستدان لە بەردە ڕەشەکە و ماچکردنی دەست، ئەگەر نەگونجا ماچی بەردە ڕەشەکە بکات و سووژدەی لەسەر ببات

واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەرم ﵄ بینی دەستی دا لە بەردە ڕەشەکە و ماچی دەستیشی کرد، وتی: لەو کاتەی بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکرد وازم لێ نەهێناوە (بەردەوام کردوومە).

### بَابُ التَّكْبِيرِ عِنْدَ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ وَاسْتِقْبَالِهِ عِنْدَ افْتِتَاحِ الطَّوَافِ

**٢٧١٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ فِي حَجَّةٍ أَوْ عُمْرَةٍ أَهَلَّ، فَقَالَ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ، فَهَذِهِ تَلْبِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا انْتَهَى إِلَى الْبَيْتِ اسْتَقْبَلَهُ الْحَجَرُ، فَكَبَّرَ ثُمَّ اسْتَقْبَلَ الْحَجَرَ، ثُمَّ رَمَلَ ثَلَاثَةَ أَشْوَاطٍ، وَمَشَى أَرْبَعَةَ أَشْوَاطٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی تەکبیر (الله أکبر) کردن لە کاتی دەستلێدان لە بەردە ڕەشەکە و ڕووتێکردنی لە کاتی دەستپێکی تەواف

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە ڕێك دەبۆیەوە لەسەر وشترەکەی لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) لە حەج بووایە یان عومرە تەلبیەی دەکرد و دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ)، واتە: پەروەردگار پەیڕەویت دەکەم و گەردنی بەندایەتیت بۆ کەچ دەکەم، وەڵامی داواکەت دەدەمەوە و تۆ تەنها و بێ شەریکیت، وە بێگومان سوپاس و ستاییش و هەموو ناز و نیعمەتێك و موڵك و دەسەڵاتێك هەر بۆ تۆیە، تۆ بێهاوەڵ و بێوێنەیت، ئەوە تەلبیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تا گەیشتە لای بەیت، بەردەکە ڕووبەڕووی بوو، ئەویش تەکبیر (الله أکبر)ی کرد، پاشان ڕووی کردە بەردە ڕەشەکە، پاشان سێ جار بەهەروەلە تەوافی کرد، چوار جاریش بەڕێکردن، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد.

## بَابُ الرَّمَلِ فِي الْأَشْوَاطِ الثَّلَاثَةِ وَالْمَشْيِ فِي الْأَرْبَعَةِ

**٢٧١٧-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَمَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثًا وَمَشَى أَرْبَعًا[١].

## باسی هەروەلەکردن لە سێ جارەکە و ڕێکردن لە چوار جارەکەی دیکەدا

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار بەهەروەلە تەوافی کرد و چوار جاریش بەڕێکردن.

## بَابُ الرَّمَلِ بِالْبَيْتِ مِنَ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ إِلَى الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ

**٢٧١٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: رَمَلَ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ زَادَ عَلِيٌّ: ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی هەروەلەكردن بە دەوری بەیت لە بەردە ڕەشەكەوە بۆ بەردە ڕەشەكە**

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەردە ڕەشەكەوە هەروەلەی كرد بۆ بەردە ڕەشەكە، عەلی (كە یەكێكە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) ئەوەیشی زیاد كرد: سێ جار، چوار جاریش ڕێی كرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا رَمَلَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الِابْتِدَاءِ

**٢٧١٩-** عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ الرَّمَلُ ثَلَاثَةُ أَشْوَاطٍ بِالْبَيْتِ وَأَرْبَعَةٌ مَشْيًا إِنَّ قَوْمَكَ يَزْعُمُونَ أَنَّهَا سُنَّةٌ قَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ، فَلَمَّا سَمِعَ بِهِ أَهْلُ مَكَّةَ قَالُوا: انْظُرُوا إِلَى أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ لَا يَقْدِرُونَ أَنْ يَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ مِنَ الْهُزَالِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرُوهُمْ مَا يَكْرَهُونَ»[١].

**باسی ئەو هۆكارەی كە لەپێناویدا پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتادا هەروەلەی كرد**

واتە: ئەبو توفەیل دەڵێ: بە ئیبنو عەباسم ﷺ وت: قەومەكەت پێیان وایە سێ جار هەروەلە بە دەوری بەیتدا و چوار جاریش بەڕێكردنی ئاسایی سوننەتە، وتی: هەم ڕاستیان كرد و هەم هەڵەیان كرد، پێغەمبەر ﷺ هاتە مەككە، كاتێ خەڵكی مەككە بیستیان دێت بۆ مەككە، وتیان: تەماشای هاوەڵانی موحەممەد بكەن بەهۆی لەڕ و لاوازییەوە ناتوانن تەوافی بەیت بكەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێیان نیشان بدەن ئەوەی كە پێیان ناخۆشە.

**٢٧٢٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ قُرَيْشًا قَالَتْ: إِنَّ مُحَمَّدًا، وَأَصْحَابَهُ قَدْ وَهَنَتْهُمْ حُمَى يَثْرِبَ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَامِهِ الَّذِي قَدِمَ فِيهِ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: أَرْمِلُوا بِالْبَيْتِ ثَلَاثًا لِيَرَى الْمُشْرِكُونَ قُوَّتَكُمْ، فَلَمَّا رَمَلُوا قَالَتْ قُرَيْشٌ: مَا وَهَنَتْهُمْ[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، قوڕەیشییەكان وتیان: موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی تای یەثریب (مەدینە) لاوازی كردوون، كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ساڵەدا هات بۆ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مەککە، بە هاوەڵانی فەرموو: سێ جار بەهەروەلە بە دەوری بەیتدا (تەواف) بکەن، تا هاوبەشدانەران هێز و تواناتان ببینن، کاتێ هەروەلەیان کرد قورەیش وتی: هیچ شتێك لاوازی نەکردوون.

## بَابُ الدُّعَاءِ بَيْنَ الرُّكْنِ الْيَمَانِي وَالْحَجَرِ الْأَسْوَدِ

**٢٧٢١-** عن يَحْيَى بْنِ عُبَيْدٍ، مَوْلَى السَّائِبِ أَنَّ أَبَاهُ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ السَّائِبِ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ فِيمَا بَيْنَ رُكْنِ بَنِي جُمَحٍ وَالرُّكْنِ الْأَسْوَدِ يَقُولُ: «رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، قَالَ الدَّوْرَقِيُّ: يَقُولُ: بَيْنَ الرُّكْنِ الْيَمَانِيِّ وَالْحَجَرِ»[١].

## باسی پاڕانەوە لە نێوان ڕوکنی یەمانی و بەردە ڕەشەکە

واتە: یەحیای کوڕی عوبەید، کە مەولای سائیبە دەگێڕێتەوە، باوکی هەواڵی پێداوە، عەبدوڵای کوڕی سائیب ﷺ هەواڵی پێ دا ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نێوان ڕوکنی نەوەکانی جومەح و ڕوکنی (الْأَسْوَدِ) دەیفەرموو: خوایە هەم لە دنیا و هەم لە ڕۆژی دواییدا خێر و خۆشیمان پێ بدە، وە بمانپارێزە لە سزای ئاگر. دەوڕەقی (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: لە نێوان ڕوکنی یەمانی و بەردە ڕەشەکە.

## بَابُ التَّكْبِيرِ كُلَّمَا انْتَهَى إِلَى الْحَجَرِ

**٢٧٢٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ طَافَ بِالْبَيْتِ وَهُوَ عَلَى بَعِيرٍ كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ وَكَبَّرَ»[٢].

## باسی تەکبیر (الله أکبر) کردن هەر کاتێ گەیشتە لای بەردە ڕەشەکە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تەوافی بەیتی کرد، لە کاتێکدا بەسەر وشترێکەوە بوو، هەر کاتێ بهاتایە بۆ لای ڕوکن بە شتێك کە بە دەستیەوە بوو (وەکوو گۆچان) ئاماژەی بۆی دەکرد و تەکبیر (الله أکبر)ی دەکرد.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ وَالرُّكْنِ الْيَمَانِي فِي كُلِّ طَوَافٍ مِنَ السَّبْعِ

**٢٧٢٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ مَسَحَ أَوْ قَالَ: «اسْتَلَمَ الْحَجَرَ، وَالرُّكْنَ فِي كُلِّ طَوَافٍ»[١].

## باسی ماچکردن یان دەستپێداهێنانی بەردە ڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی لە هەر حەوت تەوافەکەدا

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ تەوافی بەیتی بکردایە دەستی دەهێنا بە بەردە ڕەشەکەدا، یان وتی: ماچی بەردەکەی دەکرد یان دەستی پێدا دەهێنا، هەروەها بە ڕوکنیش، لە هەموو تەوافێکدا.

## بَابُ الْإِشَارَةِ إِلَى الرُّكْنِ عِنْدَ الِانْتِهَاءِ وَالْبَدْءِ إِذَا لَمْ يُمْكِنِ اسْتِلَامُهُ

**٢٧٢٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَافَ بِالْبَيْتِ عَلَى بَعِيرٍ فَكُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ[٢].

## باسی ئاماژەکردن بۆ لای ڕوکن لە کاتی کۆتایی و سەرەتا، ئەگەر نەگونجا ماچی بکات یان دەستی لێ بدات

واتە: ئیبنو عەباس  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی بەیتی کرد بەسەر وشترێکەوە، هەر کاتێ بهاتایە بۆ لای ڕوکن ئاماژەی بۆی دەکرد.

## بَابُ اسْتِلَامِ الرُّكْنَيْنِ الَّذَيْنِ يَلِيَانِ الْحَجَرَ، رُكْنِ الْأَسْوَدِ وَالَّذِي يَلِيهِ وَهُمَا الرُّكْنَانِ الْيَمَانِيَانِ

**٢٧٢٥-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ  قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اسْتَلَمَ مِنْ أَرْكَانِ الْبَيْتِ إِلَّا الرُّكْنَ الْأَسْوَدَ، وَالَّذِي يَلِيهِ مِنْ نَحْوَ دَارِ الْجُمَحِيِّينَ[٣].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی دەستلێدان لە هەردوو ڕوکنەکە کە لەلای بەردە ڕەشەکەن، ڕوکنە ڕەشەکە و ئەوەشی لە نزیکێتی، ئەو دووانەش بریتین لە دوو ڕوکنە یەمانییەکە

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﵄، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی نەدەدا لە ڕوکنەکانی کەعبە، جگە لە ڕوکنی بەردە ڕەشەکە نەبێت، ئەوەشی لە تەنیشتی بوو کە لە ڕووی خانووی جومەحییەکان بوو.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي نَرَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَرَكَ اسْتِلَامَ الرُّكْنَيْنِ الَّذَيْنِ يَلِيَانِ الْحَجَرَ لَهَا

**٢٧٢٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَلَمْ تَرَيْ إِلَى قَوْمِكِ حِينَ بَنَوَا الْكَعْبَةَ؟» اخْتَصَرُوا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا تَرُدَّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: لَوْلَا حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ قَالَ: فَقَالَ: ابْنُ عُمَرَ، لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا أَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَرَكَ اسْتِلَامَ الرُّكْنَيْنِ الَّذَيْنِ يَلِيَانِ الْحَجَرَ إِلَّا أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُصَمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ[(١)].

## باسی ئەو هۆکارەی کە دەیبینین پێغەمبەر ﷺ لەپێناویدا وازی لە دەستلێدانی دوو ڕوکنەکە هێنا کە لەدوای بەردەکەوە دێن

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا نەتبینیوە قەومەکەت کە قوڕەیشە کاتێ کەعبەیان بونیاد نایەوە لەسەر بنچینەی ئیبراهیم دروستیان نەکردەوە ( ڕووبەرەکەیان کەم کردەوە)، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی بۆ نایگەڕێنێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئیبراهیم دروستی کردبوو، فەرمووی: ئەگەر قەومەکەت لە سەردەمی کوفرەوە نزیك نەبووایەن، (مەبەستی ئەوە بوو ئیسلام هێشتا جێگیر نەبووە لە دڵیاندا، دەمگەڕاندەوە جێگاکەی خۆی)، عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: ئەگەر عائیشە ئەمەی بیستبێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێموا نییە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە دەستلێدانی ئەو دوو ڕوکنە هێنابێ کە لە نزیك بەردە ڕەشەکەن، ئەوە نەبێ کەعبە لەسەر شێوەی دروستکردنی ئیبراهیم دروست نەکراوەتەوە.

---

(١) صحیح.

## بَابُ وَضْعِ الْخَدِّ عَلَى الرُّكْنِ الْيَمَانِي عِنْدَ تَقْبِيلِهِ

**٢٧٢٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَبَّلَ الرُّكْنَ الْيَمَانِيَّ وَوَضَعَ خَدَّهُ عَلَيْهِ[١].

## باسی دانانی ڕومەت لەسەر ڕوکنی یەمانی لە کاتی ماچکردنی

واتە: ئیبنو عەباس  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی ڕوکنی یەمانی کرد و ڕومەتی لەسەری دانا.

## بَابُ الدُّعَاءِ بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ أَنْ يَرْزُقَ اللَّهُ الدَّاعِيَ الْقَنَاعَةَ بِمَا رَزَقَ وَيُبَارِكَ لَهُ فِيهِ وَيَخْلُفَ عَلَى كُلِّ غَائِبَةٍ لَهُ بِخَيْرٍ

**٢٧٢٨-** عَن سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ  يَقُولُ: احْفَظُوا هَذَا الْحَدِيثَ، وَكَانَ يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ يَدْعُو بِهِ بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ: «رَبِّ قَنِّعْنِي بِمَا رَزَقْتَنِي وَبَارِكْ لِي فِيهِ، وَاخْلُفْ عَلَى كُلِّ غَائِبَةٍ لِي بِخَيْرٍ»[٢].

## باسی پاڕانەوە لە نێوان هەردوو ڕوکنەکە، بەوەی خوا ڕزق و ڕۆزی قایلبوون بەوکەسە بدات کە دەپاڕێتەوە بەوەی پێی بەخشیوە و فەڕ و بەرەکەتیشی تێ بخات بۆی، وە هەرشتێکیشی بەجێ هێشتووە جێگای بۆی پڕ بکاتەوە بە چاکتر لەوە

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئیبنو عەباس  دەیوت: ئەم فەرموودەیە لەبەر بکەن، جا ڕەفعیشی دەکرد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، لە نێوان هەردوو ڕوکنەکەدا نزای پێ دەکرد: ئەی پەروەردگارا قایلم بکە بەو ڕزق و ڕۆزییەی پێت بەخشیوم و فەڕ و بەرەکەتیشی تێ بخەی، هەر شتێکیشم بەجێ هێشتووە جێگای بە خێر بۆم پڕ بکەیتەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ فَضْلِ اسْتِلَامِ الرُّكْنَيْنِ وَذِكْرِ حَطِّ الْخَطَايَا بِمَسْحِهَا

**٢٧٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُولُ لِابْنِ عُمَرَ ﭬ: مَا لِيَ لَا أَرَاكَ تَسْتَلِمُ إِلَّا هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ الْحَجَرَ الْأَسْوَدَ وَالرُّكْنَ الْيَمَانِيَّ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنْ أَفْعَلْ فَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مَسْحَهُمَا يَحُطُّ الْخَطَايَا»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی دەستدان لە هەردوو ڕوکنەکە و سڕینەوەی گوناهەکان بە مەسحکردنیان

واتە: عەبدوڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە باوکی بوو بە ئیبنو عومەری ﭬ دەوت: ئەوە چییە نابینم دەست بدەی لە هیچ جێگایەك جگە لەو دوو ڕوکنە نەبێت، بەردە ڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی، ئیبنو عومەر وتی: ئەگەر ئەوە بکەم ئەوە بێگومان گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی مەسحکردنیان هەڵە و پەڵەکان دەسڕێتەوە.

**٢٧٣٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو.

## بَابُ صِفَةِ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ وَالْبَيَانِ أَنَّهُمَا يَاقُوتَتَانِ مِنْ يَوَاقِيتِ الْجَنَّةِ

**٢٧٣١-** عَنْ أيوب بن سويد عن يونس عن الزهري عن مُسافع الحجَبي عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﭬ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الرُّكْنُ وَالْمَقَامُ يَاقُوتَتَانِ مِنْ يَاقُوتِ الْجَنَّةِ طَمَسَ اللَّهُ نُورَهُمَا، وَلَوْلَا ذَلِكَ لَأَضَاءَتَا مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ لَمْ يُسْنِدْهُ أَحَدٌ أَعْلَمُهُ مِنْ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ غَيْرُ أَيُّوبَ بْنِ سُوَيْدٍ إِنْ كَانَ حَفِظَ عَنْهُ، وَقَدْ رَوَاهُ عَنْ مُسَافِعَ بْنِ شَيْبَةَ مَرْفُوعًا غَيْرُ الزُّهْرِيِّ رَوَاهُ رَجَاءٌ أَبُو يَحْيَى.

## باسی سیفەتی ڕوكن و مەقام وە ڕوونكردنەوەی ئەوەی هەردووكیان دوو گەوهەرن لە گەوهەرەكانی بەهەشت

واتە: ئەیوبی كوڕی سوەید دەگێڕێتەوە، لە ئەنەس، لە زوهرییەوە، لە موسافیعی حەجەبی، لە عەبدوڵای كوڕی عەمرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕوكن و مەقام دوو گەوهەرن لە گەوهەرەكانی بەهەشت، خوا ﷻ نورەكەیانی كوژاندووەتەوە، ئەگەر نەیكوژاندایەتەوە ئەوە نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان ڕووناك دەكردەوە.

ئەبو بەكر دەڵێ: من بزانم ئەم فەرموودەیە كەسێك نییە سەنەدەكەی گەیاندبێت لە فەرموودەكەی زوهری، جگە لە ئەیوبی كوڕی سوەید ئەگەر لێیەوە لەبەری كردبێت، وە جگە لە زوهری ڕەجاء كە پێی دەوترێ ئەبو یەحیا لە موسافیعی كوڕی شەیبەوە ڕیوایەتی كردووە بەمەڕفوعی.

**٢٧٣٢-** عن رجاء أبو يحيى ثنا مُسَافِعُ بْنُ شَيْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، أَنْشَدَ بِاللَّهِ ثَلَاثًا وَوَضَعَ أُصْبُعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَنَّ الْحَجَرَ وَالْمَقَامَ» بِمِثْلِهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَسْتُ أَعْرِفُ أَبَا رَجَاءٍ هَذَا بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ وَلَسْتُ أَحْتَجُ بِخَبَرِ مِثْلِهِ.

واتە: ڕەجاء ئەبو یەحیا دەگێڕێتەوە، موسافیعی كوڕی شەیبە دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵای كوڕی عەمر بوو ﷺ، سێ جار سوێندی بە خوا خوارد پەنجەكانیشی خستە نێو هەردوو گوێی، (وتی): گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی بەردە ڕەشەكە و مەقام. هەروەكو فەرموودەكەی پێشوو باسی كرد.

ئەبو بەكر دەڵێ: من ئەبو ڕەجاء ناناسم و نازانم دادپەروەرە یان لەكەدارە، وە فەرموودەی هاوشێوەی ئەو وەرناگرم و نایكەم بە حوجەجە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي مِنْ سَبَبِهَا اسْوَدَّ الْحَجَرُ، وَصِفَةِ نُزُولِهِ مِنَ الْجَنَّةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا سَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ، إِذْ كَانَ عِنْدَ نُزُولِهِ مِنَ الْجَنَّةِ أَشَدَّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ

**٢٧٣٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «نَزَلَ الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ أَشَدَّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ»(١).

## باسی هۆکاری ڕەشبوونی بەردەکە و چۆنییەتی دابەزینی لە بەهەشتەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی تەنها گوناهی نەوەکانی ئادەم ڕەشی کردووە، لە کاتێکدا کە دابەزی لە بەهەشتەوە لە بەفر سپیتر بوو

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردە ڕەشەکە کە لە بەهەشتەوە دابەزی لە بەفر سپیتر بوو، گوناهی نەوەکانی ئادەم ڕەشی کردووە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَجَرَ إِنَّمَا سَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ الْمُشْرِكِينَ دُونَ خَطَايَا الْمُسْلِمِينَ

**٢٧٣٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ يَاقُوتَةٌ بَيْضَاءُ مِنْ يَاقُوتِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّمَا سَوَّدَتْهُ خَطَايَا الْمُشْرِكِينَ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِثْلُ أُحُدٍ يَشْهَدُ لِمَنِ اسْتَلَمَهُ، وَقَبَّلَهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا»(٢).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەردە ڕەشەکە تەنها گوناهی هاوبەشدانەرانی نەوەی ئادەم ڕەشی کردووە نەك گوناهی مسوڵمانان

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردە ڕەشەکە گەوهەرێکی سپییە لە گەوهەرەکانی بەهەشت، تەنها گوناهی هاوبەشدانەران ڕەشی کردووە، لە ڕۆژی دوایی دەنێردرێت ئەوەندەی کێوی ئوحود گەورەیە، شایەتی ئەدات بۆ ئەو کەسەی دەستی لێ داوە و ماچی کردووە لە خەڵکی دنیا.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ صِفَةِ الْحَجَرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَبَعْثَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إِيَّاهُ مَعَ إِعْطَائِهِ إِيَّاهُ عَيْنَيْنِ يُبْصِرُ بِهِمَا وَلِسَانًا يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ لِمَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ، جَلَّ رَبُّنَا وَتَعَالَى وَهُوَ فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ

**٢٧٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَبْعَثَنَّ اللَّهُ هَذَا الرُّكْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ يَشْهَدُ عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ»[١].

## باسی سیفەتی بەردەکە لە ڕۆژی دواییدا، وە خوا دەینێرێ و دوو چاوی پێ ئەدات پێیان ببینێ و زمانێکیش قسەی پێ بکات، شایەتی بدات بۆ ئەو کەسەی بەحەق و ڕاستی دەستی لێ داوە، گەورەیی و بەرزی بۆ پەروەردگارمان بێگومان ئەو هەر شتێکی بوێ دەیکات

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا لە ڕۆژی دواییدا ئەم ڕوکنە (بەردە ڕەشەکە) دەنێرێ دوو چاوی هەیە پێیان دەبینێ، زمانێکیشی هەیە قسەی پێ دەکات، شایەتی ئەدات بۆ ئەو کەسەی بەحەق و ڕاستی دەستی لێ داوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِذِكْرِهِ الرُّكْنَ فِي هَذَا الْخَبَرِ نَفْسَ الْحَجَرِ الْأَسْوَدِ لَا غَيْرَ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ» أَيْ لِمَنِ اسْتَلَمَهُ، فِي خَبَرِ فُضَيْلِ بْنِ سُلَيْمَانَ «لِمَنِ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ»، وَفِي حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ أَيْضًا: لِمَنِ اسْتَلَمَهُ وَقَبَّلَهُ

**٢٧٣٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِهَذَا الْحَجَرِ لِسَانًا وَشَفَتَيْنِ يَشْهَدُ لِمَنِ اسْتَلَمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِحَقٍّ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودە کەباسی ڕوکنی کردووە، تەنها مەبەستی پێی بەردە ڕەشەکەیە نەك غەیری ئەو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی فوزەیلی کوڕی سولەیمان: (عَلَى مَنِ اسْتَلَمَهُ)، واتە: (لِمَنِ اسْتَلَمَهُ)، هەروەها لە فەرموودەکەی حەممادی کوڕی سەلەمەیش: (لِمَنِ اسْتَلَمَهُ وَقَبَّلَهُ)، واتە: بۆ ئەو کەسەی دەستی لێ دەدات و ماچی دەکات**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەم بەردە لە ڕۆژی دواییدا زمانێك و دوو لێوی پێ ئەدرێ، شایەتی ئەدات بۆ ئەو کەسەی بەحەق دەستی پێوە داوە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَجَرَ إِنَّمَا يَشْهَدُ لِمَنِ اسْتَلَمَهُ بِالنِّيَّةِ دُونَ مَنِ اسْتَلَمَهُ غَيرَ نَاوٍ بِاسْتِلَامِهِ طَاعَةَ اللَّهِ وَتَقَرُّبًا إِلَيْهِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ لِلْمَرْءِ مَا نَوَى**

**٢٧٣٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَأْتِي الرُّكْنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مِنْ أَبِي قُبَيْسٍ لَهُ لِسَانٌ وَشَفَتَانِ يَتَكَلَّمُ عَنْ مَنِ اسْتَلَمَهُ بِالنِّيَّةِ، وَهُوَ يَمِينُ اللَّهِ الَّتِي يُصَافِحُ بِهَا خَلْقَهُ»[(١)].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەردە ڕەشەکە شایەتی ئەدات بۆ ئەو کەسەی بەنییەتەوە دەستی لێ داوە، نەك ئەو کەسەی بەبێ نییەتی گوێڕایەڵی و نزیکبوونەوە دەستی لێ دابێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە کردەوەی بەندە بەپێی نییەتەکەیەتی**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕوکن (بەردە ڕەشەکە) لە ڕۆژی دواییدا دێت گەورەترە لە کێوی ئەبو قوبەیس زمانێك و دوو لێوی هەیە، قسە دەکات دەربارەی ئەو کەسەی بەنییەتەوە دەستی لێ داوە، ئەوە دەستی ڕاستی خوایە کە بەهۆیەوە تەوقە لەگەڵ دروستکراوەکانی دەکات.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ ذِكْرِ اللَّهِ فِي الطَّوَافِ إِذِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ إِنَّمَا جُعِلَ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ، لَا بِحَدِيثِ النَّاسِ وَالِاشْتِغَالِ بِمَا لَا يُجْرِي عَلَى الطَّائِفِ نَفْعًا فِي الْآخِرَةِ، وَإِنْ كَانَ التَّكَلُّمُ بِالْخَيْرِ فِي الطَّوَافِ طَلْقًا مُبَاحًا، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ الْكَلَامُ ذِكْرَ اللَّهِ

**٢٧٣٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا جُعِلَ رَمْيُ الْجِمَارِ وَالطَّوَافُ بِالْبَيْتِ؛ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ لَيْسَ لِغَيْرِهِ»[١].

## باسی یادکردنی خوا ﷻ لە تەوافدا سوننەتە، چونکە تەوافکردنی بەیت بۆ یادی خوا دانراوە، نەك بۆ گفتوگۆ و سەرقاڵبوون بەوەی هیچ سوودێك بە تەوافکەر نەگەیەنێ لە ڕۆژی دواییدا، ئەگەرچی قسەکردنی خێر و چاك لە تەوافدا ڕێگەپێدراوە، ئەگەرچی ئەو قسەکردنەش یادی خوا نەبێت

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان بەردبارانکردنی جەمرەکان و تەوافی بەیت بۆ بەجێهێنانی یادی خوایە، بۆ هیچی دیکە نییە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّكَلُّمِ بِالْخَيْرِ فِي الطَّوَافِ، وَالزَّجْرِ عَنِ الْكَلَامِ السَّيِّئِ فِيهِ

**٢٧٣٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلَاةِ إِلَّا أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فَمَنْ تَكَلَّمَ، فَلَا يَتَكَلَّمْ إِلَّا بِخَيْرٍ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ قَائِدَ الرَّجُلِ يَسِيرُ قَدْ زَنَقَهُ بِهِ أَنْ يَقُودَهُ بِيَدِهِ وَهُوَ طَائِفٌ بِالْبَيْتِ مِنْ بَابِ الْكَلَامِ الْحَسَنِ فِي الطَّوَافِ قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي بَابٍ آخَرَ.

## باسی مۆڵەتدان بە قسەکردنی چاك لە تەوافدا، وە سەرکۆنەکردن لە قسەکردنی خراپ و نابەجێ

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی تەوافکردنی بەیت وەکوو نوێژ وایە، ئەوە نەبێت قسەکردن حەڵاڵە، جا هەر کەس قسەی کرد، با قسە نەکات تەنها قسەی چاك نەبێت.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

ئەبو بەكر دەڵێ: كەسێك پیاوێك لەگەڵ خۆی دەبات قسەی لەگەڵ دەكات (بۆ نموونە: دەڵێ: ئاوا بكە و بەوشێوە بكە) لە كاتی تەوافی بەیت، لە چوارچێوەی قسەی چاك هەژمار دەكرێت، ئەم فەرموودەم لە بەشێكی دیكەدا هێناوە.

## بَابُ الطَّوَافِ مِنْ وَرَاءِ الْحِجْرِ

**٢٧٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ الْحِجْرُ مِنَ الْبَيْتِ؛ لِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَافَ بِالْبَيْتِ مِنْ وَرَائِهِ، وَقَالَ اللَّهُ: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾﴾ الحج[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ الْحَجَرُ مِنَ الْبَيْتِ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الِاسْمَ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَلِفِ وَاللَّامِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ الشَّيْءِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ أَمَرَ عَائِشَةَ أَنْ تُصَلِّيَ فِي الْحِجْرِ، وَقَالَ: «الْحِجْرُ مِنَ الْبَيْتِ» أَرَادَ بَعْضَ الْحِجْرِ لَا كُلَّهُ، وَابْنُ عَبَّاسٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ الْحِجْرُ مِنَ الْبَيْتِ جَمِيعَ الْحِجْرِ وَإِنَّمَا أَرَادَ بَعْضَهُ عَلَى مَا خَبَّرَتْ عَائِشَةُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ بَعْضَ الْحِجْرِ مِنَ الْبَيْتِ لَا جَمِيعَهُ.

### باسی تەوافكردن لە پشتی حیجر
### (ی ئیسماعیل كە دیوارێكی بازنەییە لە تەنیشتی كەعبە)

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: حیجر بەشێكە لە بەیت، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی بەیتی كرد لە پشتی حیجرەوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: با تەواف بكەن بە دەوری ئەو ماڵە ئازادكراوەدا.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە (الْحَجَرُ مِنَ الْبَيْتِ) لەو دەستەواژەیە كە لە چەند شوێنێكی كتێبەكانماندا ڕامگەیاندووە بێگومان (الِاسْمَ) ناوی ناسراو بە (الْأَلِفِ وَاللَّامِ) هەندێ جار بۆ بەشێك لەو شتە بەكار دێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە عائیشە لە حیجر نوێژ بكات، وە فەرمووی: (الْحَجَرُ مِنَ الْبَيْتِ)، مەبەستی بەشێك لە حیجر بوو نەك هەمووی، ئیبنو عەباسیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە وتەكەیدا: (الْحَجَرُ مِنَ الْبَيْتِ)، مەبەستی هەموو حیجر نەبوو، بەڵكوو مەبەستی هەندێكی بوو وەك عائیشە هەواڵی داوە، كە بەشێك لە حیجر لە بەیتە نەك هەمووی.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى صِحَّةِ مَا تَأَوَّلْتُ قَوْلَ ابْنِ عَبَّاسٍ وَالْبَيَانِ أَنَّ بَعْضَ الْحِجْرِ مِنَ الْبَيْتِ لَا جَمِيعِهِ

**٢٧٤١-** عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُبَيْدٍ: وَفَدَ الْحَارِثُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ فِي خِلَافَتِهِ، فَقَالَ عَبْدُ الْمَلَكِ: مَا أَظُنُّ أَبَا خُبَيْبٍ يَعْنِي ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ سَمِعَ مِنْ عَائِشَةَ مَا كَانَ يَزْعُمُ أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنْهَا قَالَ الْحَارِثُ: بَلَى أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْهَا، قَالَ: سَمِعْتَهَا تَقُولُ مَاذَا؟ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ قَوْمَكِ اسْتَقْصَرُوا مِنْ بُنْيَانِ الْبَيْتِ، وَإِنِّي لَوْلَا حَدَاثَةُ عَهْدِهِمْ بِالشِّرْكِ أَعَدْتُ مَا تَرَكُوا مِنْهُ فَإِنْ بَدَا لِقَوْمِكِ مِنْ بَعْدِي أَنْ يَبْنُوهُ فَهَلُمِّي، فَلِأُرِيكِ مَا تَرَكُوا مِنْهُ»، فَأَرَاهَا قَرِيبًا مِنْ سَبْعَةِ أَذْرُعٍ هَذَا حَدِيثُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدٍ، وَزَادَ عَلَيْهِ الْوَلِيدُ بْنُ عَطَاءٍ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ مَوْضُوعَيْنِ فِي الْأَرْضِ شَرْقِيًّا وَغَرْبِيًّا، وَهَلْ تَدْرِينَ لِمَ كَانَ قَوْمُكِ رَفَعُوا بَابَهَا؟» قُلْتُ: لَا قَالَ: «تَعَزُّزًا أَلَّا يَدْخُلَهَا إِلَّا مَنْ أَرَادُوا، فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا كَرِهُوا أَنْ يَدْخُلَهَا دَعُوهُ يَرْتَقِي حَتَّى إِذَا كَادَ أَنْ يَدْخُلَ دَفَعُوهُ فَسَقَطَ». قال عَبْدُ الْمَلِكِ لِلْحَارِثِ: أَأَنْتَ سَمِعْتَهَا تَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ فَنَكَتَ سَاعَةً بِعَصَاهُ، ثُمَّ قَالَ: وَدِدْتُ أَنِّي تَرَكْتُهُ، وَمَا تَحَمَّلَ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەوەی وتەکەی ئیبنو عەباسم لەیەك دایەوە، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی بەشێك لە حیجر بەشێکە لە بەیت نەك هەموو حیجر

واتە: حارسی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی عوبەید دەڵێ: حارسی کوڕی عەبدوڵا بەوەفد چوو بۆ لای عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان لە خیلافەتەکەیدا، عەبدولمەلیك وتی: پێموا نییە باوکی خوبەیب واتە: ئیبنو زوبەیر ﷺ ئەوەی لە عائیشەوە بیستبێت کە بانگەشەی بۆ دەکات، حاریس وتی: بەڵێ من لە عائیشەوە گوێم لێ بوو، وتی: گوێت لێ بوو چی دەوت؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی قەومەکەت (کە قوڕەیشە کاتێ) کەعبەیان بونیاد نایەوە لێیان کەم کردەوە (لەسەر بنچینەی ئیبڕاهیم دروستیان نەکردەوە)، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت قەومەکەت لە سەردەمی شیرك نزیکن (تازە ئیسلامیان ناسیوە)، ئەوەی وازیان لێ

---

(١) صحيح.

هێنابوو دەمگەڕاندەوە، ئەگەر قەومەکەت دوای من بۆیان گونجا دروستی بکەنەوە، وەرە با ئەوەت پێ نیشان بدەم کە وازیان لێ هێناوە، پێی نیشان دا، نزیکەی حەوت باڵ دەبوو، ئەمە فەرموودەی عەبدوڵای کوڕی عوبەیدە، بەڵام وەلیدی کوڕی عەتا زیادی کردووە تیایدا، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو دەرگام بۆی دادەنا لە زەوییەوە دەرگایەك لە خۆرهەڵات و دەرگایەکیدیکەش لە خۆرئاواوە، ئایا دەزانی قەومەکەت بۆچی دەرگاکەیان لەسەر زەوی بەرز کردەوە (بە چەند پلیکانەیەك)؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: لەبەر ئەوەی کەس نەچێتە نێویەوە بە ویستی ئەوان نەبێت، ئەگەر پێیان ناخۆش بووایە پیاوێك بچووایەتە نێویەوە وازیان لێ دەهێنا تا سەردەکەوت تا خەریك بوو بچێتە نێویەوە، پاڵیان پێوە دەناو ئەویش دەکەوتە خوارەوە، عەبدولمەلیك بە حارسي وت: ئایا تۆ بیستووتە شتی وا بڵێ؟ وتی: بەڵێ، دواتر ئەندازەیە گۆچانەکەی لەسەر زەوی دانا، پاشان وتی: خۆزگە وازم لێ بهێنایە و وەکوو خۆی بێت و نەمڕوخاندایە.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا طَافَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ وَرَاءِ الْحِجْرِ إِذِ الطَّائِفُ بِبِنَاءِ الْبَيْتِ إِذَا خَلَّفَ الْحِجْرَ وَرَاءَهُ عُدَّ طَائِفًا لِجَمِيعِ الْكَعْبَةِ إِذْ بَعْضُ الْحِجْرِ مِنَ الْكَعْبَةِ عَلَى مَا خَبَّرَ الْمُصْطَفَى ﷺ، وَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ بِالطَّوَافِ بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ لَا بِبَعْضِهِ

**٢٧٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا حَدَاثَةُ عَهْدِ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَنَقَضْتُ الْبَيْتَ، فَبَنَيْتُهُ عَلَى أَسَاسِ إِبْرَاهِيمَ؛ فَإِنَّ قُرَيْشًا اسْتَقْصَرَتْ فِي بِنَائِهِ، وَجَعَلْتُ لَهُ خَلْفًا»[(١)].

قال أَبُو بَكْرٍ: يَعْنِي بَابًا آخَرَ فِي خَلْفٍ.

**باسی هۆکاری ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە پشتی حیجرەوە تەوافی کرد، چونکە ئەو کەسەی تەوافی کەعبە دەکات، ئەگەر حیجری خستە پشتیەوە ئەوە بە تەوافکەر دەژمێرێ بە دەوری هەموو کەعبە، چونکە هەندێ لە حیجر بەشێکە لە کەعبە وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە، خوای بەرز و مەزن فەرمانی کردووە بە تەوافکردن بە دەوری کەعبەی پیرۆز نەك هەندێکی**

---

(١) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە قەومەکەت لە سەردەمی کوفر نزیکن (تازە ئیسلامیان ناسیوە)، ئەوە کەعبەم هەڵدەوەشاندەوە، دواتر لەسەر بناغەی ئیبراهیم دروستم دەکردەوە، چونکە قورەیش کاتێ دروستیان کرد بەبچووکی دروستیان کرد، دواتر دەرگایەکم لە پشتەوە بۆی دادەنا.

ئەبو بەکر وتی: واتە: دەرگایەکی دیکەم لە پشتەوە بۆی دادەنا.

## بَابُ ذِكْرِ طَوَافِ الْقَارِنِ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ عِنْدَ مَقْدِمِهِ مَكَّةَ وَالْبَيَانِ أَنَّ الْوَاجِبَ عَلَيْهِ طَوَافٌ وَاحِدٌ فِي الِابْتِدَاءِ، ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ عَلَى الْقَارِنِ فِي الِابْتِدَاءِ طَوَافَيْنِ وَسَعْيَيْنِ.

**٢٧٤٣-** عَنْ نَافِعٍ قَالَ: أَرَادَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ الْحَجَّ فَقَالَ: أَجْعَلُهَا عُمْرَةً فَإِنْ أَنَا صُدِدْتُ صَنَعْتُ كَمَا صَنَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى الْبَيْدَاءِ قَالَ: مَا أَرَى سَبِيلَهُمَا إِلَّا وَاحِدًا، وَأُشْهِدُكُمْ، إِنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ مَعَ عُمْرَتِي حَجَّةً، فَلَمَّا أَتَى قُدَيْدًا اشْتَرَى هَدْيًا وَسَاقَهُ مَعَهُ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ يَعْنِي طَافَ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ[١].

## باسی تەوافکردنی ئەو کەسەی ئیحرامی حەج و عومرە پێکەوە دەبەستێت کاتێ دەگاتە مەککە، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی لە سەرەتا تەنها یەک تەواف واجبە لەسەری، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە ئەو کەسەی ئیحرامی حەج و عومرەی پێکەوە بەستووە دوو تەواف و دوو سەعی لە نێوان صەفا و مەروە واجبە لەسەری

واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﵄ ویستی حەج بکات، وتی: دەیکەم بە عومرە، ئەگەر ڕێگریم لێ کرا پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد منیش ئەوە دەکەم، (واتە: ئیحرام دەشکێنم هەر وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ لەساڵی حودەیبیە ئیحرامی شکاند)، کاتێ سەرکەوتە سەر (الْبَيْدَاءِ) (کە بەرزاییەکە بە دەوروبەری خۆیدا دەڕوانێ لە پێشی (ذي

---

(١) صحيح.

الحليفة) لە ڕووی مەككەوەیە، لە (ذي الحليفة)وە نزیكە)، وتی: پێم وایە ڕێكارەكانی حەج و عومرە وەكوو یەكە، ئێوە دەكەم بە شایەت من لەگەڵ عومرەكەمدا حەجم پێویست كرد لەسەر خۆم، كاتێ گەیشتە (قُدَيْد) (ناوی شوێنێكە لە نزیك مەككە) وڵاخێكی لەوێ كڕی بۆ هەدیە و قوربانی، لەگەڵ خۆیدا بردی تا هاتە مەككە، تەوافی بەیتی كرد، لە پشتی مەقامی (ئیبراهیم) دوو ڕكات نوێژی كرد، وە تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەشی كرد، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەو شێوەی كرد.

**٢٧٤٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ، الَّذِينَ قَرَنُوا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ كە ئیحرامیان بە حەج و عومرە بەستبوو تەنها یەك تەوافیان كرد.

**٢٧٤٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَجْزَأَهُ لَهُمَا طَوَافٌ وَاحِدٌ، ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ، ثُمَّ يَحِلُّ مِنْهُمَا جَمِيعًا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەس ئیحرام بەنییەتی حەج و عومرە ببەستێت یەك تەوافی بەسە بۆ هەردووكیان، پاشان حەڵاڵ نابێت (لە ئیحرام دەرناچێت) تاوەكو حەجەكەی تەواو دەكات، پاشان لە هەردووكیان دەردەچێت.

**٢٧٤٦-** عَن نافعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ لَبَّى بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ فَطَافَ لَهُمَا طَوَافًا وَاحِدًا، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ[٣].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﵄، ئەو تەلبیەی حەج و عومرەی پێكەوە كرد یەك تەوافی بۆ هەردووكیان كرد و وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەوشێوەی كرد.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الطَّوَافِ وَالصَّلَاةِ بِمَكَّةَ بَعْدَ الْفَجْرِ وَبَعْدَ الْعَصْرِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى صِحَّةِ مَذْهَبِ الْمُطَّلِبِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِزَجْرِهِ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، بَعْضَ الصَّلَاةِ لَا جَمِيعَهَا

**٢٧٤٧-** عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا يَمْنَعَنَّ أَحَدٌ طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّ سَاعَةٍ كَانَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ»[١].

## باسی ڕێگەدان بە تەواف و نوێژكردن لە مەككە دوای نوێژی بەیانی و دوای عەسریش، وە بەڵگەش لەسەر ڕاستی مەزهەبی موتەلیبی (واتە: ئیمامی شافیعی) بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە سەرزەنشتكردنی لە نوێژكردن دوای بەیانی تا خۆر دەكەوێت و دوای عەسر تا خۆر ئاوا دەبێت هەندێ نوێژە نەك هەمووی

واتە: جوبەیری كوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی نەوەكانی عەبدو مەناف، با ڕێگری لە هیچ كەس نەكرێ تەوافی ئەمماڵە بكات و نوێژی تێدا بكات، لە هەر ساتێك شەو بێت یان ڕۆژ.

**٢٧٤٨-** عَنْ موجاهید عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ، وَلَا بَعْدَ الْعَصْرِ إِلَّا بِمَكَّةَ إِلَّا بِمَكَّةَ إِلَّا بِمَكَّةَ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا أَشُكُّ فِي سَمَاعِ مُجَاهِدٍ مِنْ أَبِي ذَرٍّ.

واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە، لە ئەبو زەڕەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ نییە دوای نوێژی بەیانی، هەروەها دوای عەسریش مەگەر لە مەككە، مەگەر لە مەككە، مەگەر لە مەككە.

ئەبو بەكر دەڵێ: من گومانم هەیە لە بیستنی موجاهید لە ئەبو زەڕەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**٢٧٤٩-** عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: طَافَ الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ ﷺ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سُبُوعًا، ثُمَّ صَلَّى لِكُلِّ سَبْعٍ رَكْعَتَيْنِ، وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ: «إِنْ وُلِّيتُمْ هَذَا الْبَيْتَ مِنْ بَعْدِي، فَلَا تَمْنَعُوا أَحَدًا مِنَ النَّاسِ أَنْ يَطُوفَ بِهِ أَيَّ سَاعَةٍ مَا كَانَ مِنَ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ»[١].

واتە: ئیبنو ئەبو مولەیکە دەڵێ: میسوەری کوڕی مەخڕەمە ﷺ هەژدە جار حەوت تەوافی کرد، پاشان بۆ هەر حەوت تەوافێك دوو ڕکاتی کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی نەوەکانی عەبدو مەناف، ئەگەر دوای من سەرپەرشتیاری ئەم بەیتە کەوتە ئەستۆتان، ئەوە ڕێگری لە هیچ کەسێك مەکەن تەوافی تێدا بکات لە هەر ساتێك لە شەو بێت یان ڕۆژ.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الشُّرْبِ فِي الطَّوَافِ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ، وَأَنَا خَائِفٌ أَنْ يَكُونَ عَبْدُ السَّلَامِ أَوْ مَنْ دُونَهُ وَهِمَ فِي هَذِهِ اللَّفْظَةِ أَعْنِي قَوْلَهُ: فِي الطَّوَافِ

**٢٧٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ مَاءً فِي الطَّوَافِ[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە ئاوخواردنەوە لە تەوافدا، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بوو، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم سەنەدە، وە من دەترسم عەبدوسەلام یان خواری ئەو هەڵە بێت لەم دەستەواژەیە مەبەستم ئەم وتوویەتی: (فِي الطَّوَافِ)

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە تەوافدا ئاوی خواردەوە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ قِيَادَةِ الطَّائِفِ بِزِمَامٍ أَوْ خَيْطٍ شَبِيهًا بِقِيَادَةِ الْبَهَائِمِ

**٢٧٥١-** عَنِ سُلَيْمَانَ الْأَحْوَلِ، أَنَّ طَاوُسًا، أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِرَجُلٍ يَقُودُ رَجُلًا بِخِزَامَةٍ فِي أَنْفِهِ، فَقَطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَقُودَهُ بِيَدِهِ قَالَ: وَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ﷺ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِرَجُلٍ قَدْ زَنَقَ بِسَيرٍ يَدَ رَجُلٍ أَوْ بِخَيْطٍ أَوْ بِشَيْءٍ غَيْرِ ذَلِكَ فَقَطَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ، وَقَالَ: «قُدْهُ بِيَدِكَ»[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی تەوافکەر تەوافپێکەر لغاو بکات یان پەتێك بخاتە دەستی وەکوو ئاژەڵ ڕایبکێشی بە دوای خۆیدا

واتە: سولەیمانی ئەحوەل دەگێڕێتەوە، تاوس هەواڵی پێ داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کەعبەی دەکرد تێپەڕی بەلای پیاوێکدا پەتی لە لووتی پیاوێك کردبوو تەوافی پێ دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پەتەکەی بڕی، پاشان فەرمانی پێ کرد دەستی بگرێت، وە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کەعبەی دەکرد تێپەڕی بەلای پیاوێکدا تەوقێك یان پەتێك یان شتێکی جگە لەوەی کردبووە دەستی پیاوێکی دیکەوە، پێغەمبەر ﷺ پچڕاندی و فەرمووی: دەستی بگرە و تەوافی پێ بکە.

**٢٧٥٢-** عن سُلَيْمَان الْأَحْوَل أَنَّ طَاوُسًا، أَخْبَرَهُ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ ذَلِكَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى الرُّخْصَةِ فِي الْكَلَامِ فِي الطَّوَافِ بِالْأَمْرِ وَالنَّهْيِ.

واتە: سولەیمانی ئەحوەل دەگێڕێتەوە، تاوس هەواڵی پێ داوە، ئیبنو عەباس ﷺ ئەوەی وتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدایە لەسەر مۆڵەتدان بە قسەکردن لە تەواف بە فەرمانکردن (بە چاکە) و قەدەغەکردن (لە خراپە).

## بَابُ فَضْلِ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ وَذِكْرِ كَتْبِ حَسَنَةٍ وَرَفْعِ دَرَجَةٍ وَحَطِّ خَطِيئَةٍ عَنِ الطَّائِفِ بِكُلِّ قَدَمٍ يَرْفَعُهَا أَوْ يَضَعُهَا فِي طَوَافِهِ، وَإِعْطَاءِ الطَّائِفِ بِإِحْصَاءِ أُسْبُوعٍ مِنَ الطَّوَافِ أَجْرَ مُعْتِقِ رَقَبَةٍ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ جَعَلَ مُحْصِيَ الْأُسْبُوعِ الْوَاحِدِ مِنَ الطَّوَافِ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ

**٢٧٥٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: إِنَّكَ لَتُزَاحِمُ عَلَى هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ قَالَ: إِنْ أَفْعَلْ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَسْحُهُمَا يَحُطُّ الْخَطَايَا»،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ «مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ لَمْ يَرْفَعْ قَدَمًا وَلَمْ يَضَعْ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ حَسَنَةً وَيَحُطُّ عَنْهُ خَطِيئَةً، وَكَتَبَ لَهُ دَرَجَةً»، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ أَحْصَى أُسْبُوعًا كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ قَالَ يُوسُفُ فِي حَدِيثِهِ: وَرُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ»[(١)].

**باسی فەزڵ و گەورەیی تەوافی بەیت و باسی نووسینی چاکەیەك و بەرزبوونەوەی پلەیەك و سڕینەوەی گوناهێك بۆ هەر هەنگاوێك تەوافکەر بەرزی دەکاتەوە یان دایدەنێت لە کاتی تەوافەکەیدا، هەروەها بە تەوافکردنی هەفتەیەك پاداشتی ئازادکردنی بەندەیەك بۆ تەوافکەر دەنووسرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ داینـاوە هەر کەس هەفتەیەك تەواف بکات وەکوو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێت**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، ئەو بە عەبدوڵای کوڕی عومەری ﷺ وت: تۆ زۆر تەنگ هەڵ ئەچنی بۆ دەستلێدانی ئەو دوو ڕوکنە (بەبێ ئازاردانی خەڵك)، وتی: ئەگەر ئەوە بکەم، لەبەر ئەوە دەیکەم گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دەستلێدانیان گوناهەکان دەسڕێتەوە. وە گوێم لێ بوو دەیفەرموو: هەر کەس تەوافی بەیت بکات هیچ هەنگاوێك بەرز ناکاتەوە و دایناـبێت ئیللا خوا چاکەیەکی بۆ دەنووسێ و گوناهێکی دەسڕێتەوە و پلەیەك بەرزی دەکاتەوە. وە گوێم لێ بوو دەیفەرموو: هەر کەس حەوت جار تەواف بکات وەکوو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێت. یوسف (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە) لە فەرموودەکەیدا وتی: وە پلەیەك پێی بەرز دەبێتەوە.

**بَابُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الطَّوَافِ عِنْدَ الْمَقَامِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ قَدْ يَأْمُرُ بِالْأَمْرِ أَمْرَ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ وَفَضِيلَةٍ، لَا أَنَّ كُلَّ أَمْرِهِ أَمْرُ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ بِاتِّخَاذِ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى، وَتَلَا النَّبِيُّ ﷺ هَذِهِ الْآيَةَ عِنْدَ فَرَاغِهِ مِنَ الطَّوَافِ لَمَّا عَمَدَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ، فَصَلَّى خَلْفَهُ رَكْعَتَيْنِ، وَلَيْسَ بِفَرْضٍ عَلَى الطَّائِفِ وَلَا عَلَى أَحَدٍ مِنَ الْمُصَلِّينَ الصَّلَاةُ خَلْفَ الْمَقَامِ، إِذِ الصَّلَاةُ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الطَّوَافِ جَائِزَةٌ خَلْفَ الْمَقَامِ وَفِي غَيْرِهِ مِنَ الْمَسْجِدِ مُسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةِ، وَأَحْسِبُ هَذِهِ اللَّفْظَةَ: «مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ» مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ أَنَّ الْعَرَبَ قَدْ**

---

(١) صحيح.

**تُدْخِلُ «مِنْ» فِي بَعْضِ كَلَامِهَا فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يَكُونُ مَعْنَاهَا مَعْنَى حَذْفِ مِنْ كَقَوْلِهِ تَعَالَى فِي سُورَةِ نُوحٍ: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾ الأحقاف، وَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ نُوحًا لَمْ يَدْعُ قَوْمَهُ إِلَى الْإِيمَانِ بِاللَّهِ لِيَغْفِرَ لَهُمْ بَعْضَ ذُنُوبِهِمُ الَّتِي ارْتَكَبُوهَا فِي الْكُفْرِ دُونَ أَنْ يَكْفُرَ جَمِيعَ ذُنُوبِهِمْ قَالَ اللَّهُ ﷻ لِنَبِيِّهِ عَلَيْهِ السَّلَامُ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِن يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الأنفال، فَأَعْلَمَ رَبُّنَا أَنَّ الْكَافِرَ إِذَا آمَنَ غَفَرَ ذُنُوبَهُ السَّالِفَةَ كُلَّهَا لَا بَعْضَهَا دُونَ بَعْضٍ»**

**٢٧٥٤-** عن جَعْفَر، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: «إِذَا فَرَغَ -يُرِيدُ مِنَ الطَّوَافِ- عَمَدَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ فَصَلَّى خَلْفَهُ رَكْعَتَيْنِ، وَتَلَا: ﴿ وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقرة»، قَالَ: «أَيْ يَقْرَأُ فِيهِمَا بِالتَّوْحِيدِ، وَقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ»[1].

باسی نوێژکردن دوای تەواوبوونی تەواف لەلای مەقامی ئیبراهیم، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خوا ﷻ هەندێ جار فەرمان دەکات بە فەرمانێك بۆ پەسەندبوون و ڕێنیشاندان و فەزڵ و چاکەیە، نەك هەموو فەرمانێکی بۆ فەرز و واجببوون بێت، چونکە خوا ﷻ فەرمانی کرد مەقامی ئیبراهیم بکرێتە نوێژگە، پێغەمبەریش ﷺ کاتێ تەوافی تەواو کرد ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾، ئینجا چوو بۆ لای مەقامی ئیبراهیم دوو ڕکات نوێژی لە پشتیەوە کرد، جا نوێژکردن لەپشت مەقامی ئیبراهیم فەرز نییە نە بۆ تەوافکەر و نە بۆ نوێژخوێنان، لە کاتێکدا نوێژکردن لەدوای تەوافکردن لەپشت مەقامی ئیبراهیم و لە هەر جێگایەکی دیکەی مزگەوتەکە ڕووبەڕووی کەعبە دروستە، وە پێم وایە ئەم دەستەواژەیە (مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ) لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاند هەندێ جار عەرەب (مِنْ) لە قسەکردندا بەکار دەهێنێ لە جێگایەکدا بە مانای لابردنی (مِنْ) دێت، وەکوو خوا ﷻ فەرموویەتی لە سوڕەتی نوحدا: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾، بێگومان ئەوە ڕوونە کە نوح (علیه السلام) بانگەوازی قەومەکەی نەکردووە بۆ بڕواهێنان بە خوا تا لە بەشێك لە گوناهەکانیان خۆش بێت کە ئەنجامیان داوە لە سەردەمی بێباوەڕی جگە لە هەندێکی دیکەی، خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِن يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ

(١) صحيح.

**سَلَفَ ﴿٣٨﴾ ﴾، پەروەردگارمان ڕایگەیاندووە بێباوەڕ ئەگەر بڕوای هێنا لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت، نەك هەندێکی جگە لە هەندێکی دیکەی**

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ پرسیارمان لێ کرد دەربارەی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد و وتی: کاتێ تەواو بوو -مەبەستی لە تەوافکردن- چوو بۆ لای مەقامی ئیبراهیم دوو ڕکات نوێژی لە پشتیەوە کرد، ئەم ئایەتەیشی خوێند: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾، واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم (علیه السلام) لەسەری ڕادەوەستا بکەنە جێگای نوێژ. وتی: لە دوو ڕکاتەکەدا ئەو سورەتانەی دەخوێند کە باس لە یەکتاپەرستی دەکات: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ وە ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١﴾ ﴾یش.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا صَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ حِينَ عَمَدَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ خَلْفَ الْمَقَامِ، جَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَابِ، لَا أَنَّهُ وَقَفَ بَيْنَ يَدَيِ الْمَقَامِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ وَلَا عَنْ يَسَارِهِ

**٢٧٥٥-** عَنْ جَعفر بن مُحمد عَن أبيه جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَالَ: ثُمَّ رَمَلَ ثَلَاثًا وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ أَتَى الْمَقَامَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقرة، وَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَابِ، فَلَمَّا فَرَغَ أَتَى الْبَيْتَ وَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ فَذَكَرَ بَاقِيَ الْحَدِيثِ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ دوو ڕکاتەکەی کرد کە چوو بۆ لای مەقامی ئیبراهیم، لەپشت مەقامەوە نوێژی کرد، مەقامی خستە نێوان خۆی و دەرگای بەیت، لەپێش مەقام نەوەستا، هەروەها لەلای ڕاست و لەلای چەپیشی نەوەستا

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە ﷺ، باسی فەرموودەکەی کرد بەدرێژی سەبارەت بە حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، وە وتی:

---

(١) صحيح.

پاشان سێ جار بەهەروەلە تەوافی کرد و چوار جاریش بەڕێکردن، پاشان هات بۆ مەقامی (ئیبراهیم)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ ١٢٥﴾، مەقامی خستە نێوان خۆی و نێوان دەرگای بەیت، کاتێ تەواو بوو هات بۆ لای بەیت و دەستی دا لە ڕوکن (بەردە ڕەشەکە)، دواتر باسی تەواوی فەرموودەکەی کرد.

## بَابُ الرُّجُوعِ إِلَى الْحَجَرِ وَاسْتِلَامِهِ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنْ رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ

**٢٧٥٦-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، حِينَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ عَادَ إِلَى الْحَجَرِ فَاسْتَلَمَهُ[١].

## باسی گەڕانەوە بۆ لای بەردە ڕەشەکە و دەستپێداهێنانی، دوای تەواوکردنی دوو ڕکاتەکەی تەواف

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ دوو ڕکاتەکەی کرد گەڕایەوە بۆ لای بەردە ڕەشەکە و دەستی پێدا هێنا.

## بَابُ الْخُرُوجِ إِلَى الصَّفَا بَعْدَ اسْتِلَامِ الرُّكْنِ، وَصُعُودِ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ حَتَّى يَرَى الصَّاعِدُ الْبَيْتَ عَلَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَالْبَدْءِ بِالصَّفَا قَبْلَ الْمَرْوَةِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بَدَأَ بِذِكْرِ الصَّفَا قَبْلَ ذِكْرِ الْمَرْوَةِ، وَأَمَرَ الْمُبَيِّنُ عَنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ النَّبِيُّ الْمُصْطَفَى بِالْبَدْءِ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ فِي الذِّكْرِ

**٢٧٥٧-** عَن جَعْفَر، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، ثُمَّ عَادَ إِلَى الْحَجَرِ فَاسْتَلَمَهُ، وَخَرَجَ إِلَى الصَّفَا، وَقَالَ: «أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، وَقَرَأَ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ ١٥٨﴾ البقرة، فَرَقِيَ عَلَى الصَّفَا حَتَّى إِذَا نَظَرَ إِلَى الْبَيْتِ كَبَّرَ ثَلَاثًا يَعْنِي وَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَغَلَبَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، ثُمَّ أَعَادَ هَذَا الْكَلَامَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ نَزَلَ حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي الْوَادِي سَعَى حَتَّى إِذَا صَعِدَ مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ فَرَقِيَ عَلَيْهَا حَتَّى إِذَا نَظَرَ إِلَى الْبَيْتِ قَالَ عَلَيْهِ كَمَا قَالَ عَلَى الصَّفَا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی دەرچوون بۆ صەفا دوای دەستدان لە بەردە ڕەشەکە، وە سەرکەوتن بەسەر صەفا و مەڕوە تا بەیت دەبینێ، هەروەها دەستپێکردن بە صەفا پێش مەڕوە، چونکە خوا ﷻ (لە پەرتووکەکەیدا) بە صەفا دەستی پێکرد پێش باسکردنی مەڕوە، فەرمانیشی بە پێغەمبەر ﷺ کرد بەوە دەست پێ بکات کە دەستی پێکردووە لە باسکردن**

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ هات بۆ لامان پرسیارمان لێ کرد دەربارەی چۆنییەتی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بەشێك لە فەرموودەکەی باس کرد، (وتی): دواتر گەڕایەوە بۆ لای بەردە ڕەشەکە و دەستی لێ دا، ئینجا چوو بۆ صەفا و فەرمووی: بەوە دەستی پێ دەکەم کە خوا دەستی پێ کرد، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾، واتە: بەڕاستی صەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی دینی خوای گەورەن، دواتر سەرکەوتە سەر کێوی صەفا و تەماشای بەیتی کرد و سێ جار تەکبیر (الله أكبر)ی کرد و فەرمووی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَغَلَبَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ)، واتە: هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا تاکی بێهاوەڵە، هەموو موڵك و ستاییش بۆ ئەوە و بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا بەڵێنەکەی بەڕاست بەجێ هێنا و بەندەکەی خۆی سەر خست و بەتەنها خۆی هەموو کۆمەڵ و حیزب و پارتەکانی شکاند. سێ جار ئەو وشانەی دووبارە کردەوە، پاشان دابەزیە خوارەوە، هەتا پێیەکانی لەنێو شیوەکەدا جێگیر بوو، ئینجا بەخێرایی ڕۆیشت هەتا سەرکەوت، پاشان ڕێی کرد هەتا گەیشتە مەڕوە و سەر کەوت بەسەریدا، کاتێ کە تەماشای بەیتی کرد ئەوەی لەسەری وت کە لەسەر صەفا وتی.

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ الدُّعَاءِ عَلَى الصَّفَا

**٢٧٥٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَبَاحٍ قَالَ: وَفَدَتْ وُفُودٌ إِلَى مُعَاوِيَةَ أَنَا فِيهِمْ وَأَبُو هُرَيْرَةَ، وَذَاكَ فِي رَمَضَانَ، فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلًا مِنْ فَتْحِ مَكَّةَ، وَقَالَ: فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: أَلَا أُعْلِمُكُمْ بِحَدِيثٍ مِنْ

حَدِيثِكُمْ يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، فَذَكَرَ فَتْحَ مَكَّةَ قَالَ: وَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَدَخَلَ مَكَّةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْحَجَرِ فَاسْتَلَمَهُ وَطَافَ بِالْبَيْتِ فِي يَدِهِ قَوْسٌ أَخَذَ بِسِيَةِ الْقَوْسِ فَأَتَى فِي طَوَافِهِ صَنَمًا فِي جَنْبَةِ الْبَيْتِ يَعْبُدُونَهُ، فَجَعَلَ يَطْعَنُ بِهَا فِي عَيْنَيْهِ وَيَقُولُ: ﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ﴿٨١﴾﴾ الإسراء، ثُمَّ أَتَى الصَّفَا فَعَلَاهُ حَيْثُ يَنْظُرُ إِلَى الْبَيْتِ فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يَذْكُرُ اللَّهَ بِمَا شَاءَ أَنْ يَذْكُرَهُ، وَيَدْعُوهُ، وَالْأَنْصَارُ تَحْتَهُ «، ثُمَّ ذَكَرَ بَاقِيَ الْحَدِيثِ، ثَنَاهُ الرَّبِيعُ بْنُ سُلَيْمَانَ ثنا أَسَدٌ، ثنا سُلَيْمَانُ بْنُ الْمُغِيرَةِ عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَبَاحٍ بِنَحْوِهِ، وَقَالَ: فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يَحْمَدُ اللَّهَ، وَيَدْعُوهُ بِمَا شَاءَ اللَّهُ[1].

## باسی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە کاتی پاڕانەوە لەسەر صەفا

واتە: عەبدوڵای کوڕی ریباح دەڵێ: خەڵکانێك وەکوو نوێنەر چوون بۆ لای موعاویە من و ئەبو هورەیرەیش لەگەڵیان بووین، لەمانگی ڕەمەزاندا بوو، دواتر باسی فەرموودەیەکی درێژی کرد دەربارەی ئازادکردنی مەککە، وتی: ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: ئەی کۆمەڵی ئەنصارەکان ئایا فەرموودەیەکتان پێ ڕابگەیەنم، باسی ئازادکردنی مەککەی کرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو مەککەوە، لە درێژەی قسەکانیدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای بەردە ڕەشەکە و ماچی کرد، وە تەوافی بەیتیشی کرد کەوانێك بە دەستیەوە بوو تەنیشتەکەی گرت، لە تەوافەکەیدا هات بۆ لای بتێك لە تەنیشتێکی بەیتەوە بوو دەیانپەرست، دەیدا لە چاوی بتەکە و دەیفەرموو: ﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ﴿٨١﴾﴾، واتە: ئایینی ڕاست هات و ئایینی ناحەق و بەتاڵ نەما. پاشان هات بۆ صەفا سەرکەوتە سەری و تەماشای بەیتی کرد، دواتر دەستی بەرز کردەوە ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو یادی کرد و پاڕایەوە، ئەنصارەکانیش لەخواریەوە بوون، پاشان تەواوی فەرموودەکەی باس کرد، ڕەبیعی کوڕی سولەیمان بۆی باس کردین، لە سولەیمانی کوڕی موغیرەوە بۆی باس کردین، لە سابیتی بونانییەوە، لە عەبدوڵای کوڕی ریباحەوە بەهەمان شێوە، وە وتی: دەستەکانی بەرز کردەوە و سوپاس و ستاییشی خوای کرد ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو.

---

(١) صحیح.

## بَابُ الْمَشْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ خَلَا السَّعْيَ فِي بَطْنِ الْوَادِي فَقَطْ

**٢٧٥٩-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي خَبَرِ جَابِرٍ ﷺ: حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي الْوَادِي سَعَى حَتَّى إِذَا صَعِدَ مَشَى[1].

## باسی ڕێکردن لە نێوان صەفا و مەڕوە، جگە لەنێو شیوەکە نەبێت بەهەروەلە ڕێ دەکات تا سەر دەکەوێ

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی جابردا ﷺ هاتووە: تا کاتێ بەهێواشی لێژ بۆیەوە (لەسەر چیای صەفا) بۆ نێو شیوەکە، پاشان بەخێرایی ڕێی کرد تا کاتێ سەر کەوت، ئینجا بەڕێکردن ڕۆیشت. (تا چووە سەر چیای مەڕوە).

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ فِي السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ، أَنَا خَائِفٌ أَنْ يَخْطِرَ بِبَالِ بَعْضِ مَنْ لَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْخَبَرِ الْمُجْمَلِ وَالْمُفَسَّرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَعَى بَيْنَهُمَا مِنَ الصَّفَا إِلَى الْمَرْوَةِ، وَمِنَ الْمَرْوَةِ إِلَى الصَّفَا

**٢٧٦٠-** عَنْ عَمْرٍو، وَهُوَ ابْنُ دِينَارٍ قَالَ: سَأَلْنَا ابْنَ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدِمَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ»[2].

## باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی هەروەلەکردن لە نێوان صەفا و مەڕوە بەدەستەواژەیەکی گشتی (عَام) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاص)، من دەترسم بە خەیاڵی هەندێ لەوانەدا بێت کە فەرموودەی ناڕوون و شیکەرەوە لە یەکدی جیا ناکاتەوە وا خەیاڵ بکات پێغەمبەر ﷺ هەروەلەی کردووە لە نێوانیاندا لە صەفاوە بۆ مەڕوە و لە مەڕوەیشەوە بۆ صەفا

واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: پرسیارمان لە ئیبنو عومەر ﷺ کرد (دەربارەی چۆنییەتی حەج)، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هات حەوت جار تەوافی کرد،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لەپشت مەقامیش دوو ڕکاتی کرد، وە تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەشی کرد بەخێرایی، بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێوە سەرمەشق و پێشەوایەتی چاك هەیە.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُ أَنَّ لَفْظَهَا عَامٌّ مُرَادُهَا خَاصٌّ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا سَعَى مِمَّا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ بِبَطْنِ الْمَسِيلِ دُونَ سَائِرِ مَا بَيْنَهُمَا، لَا أَنَّهُ سَعَى جَمِيعَ مَا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ.**

**٢٧٦١-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي خَبَرِ جَابِرٍ ﷺ الَّذِي ذَكَرْتُهُ قَبْلُ: حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْوَادِي سَعَى حَتَّى إِذَا صَعِدَ مَشَى[١].

**باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەی ئەو دەستەواژە ناڕوونەیە کە باسم کرد و وتم دەستەواژەکەی گشتییە (عام) و مەبەستی پێی تایبەتە (خاص)، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها لەنێو شیوەکەی نێوان صەفا و مەڕوە بەخێرایی هەروەلەی کرد نەك لە نێوانیان بەگشتی، بە هیچ شێوەیەك بەگشتی لە نێوان صەفا و مەڕوە هەروەلەی نەکرد**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی جابردا ﷺ هاتووە کە لە پێشەوە باسم کرد: تا کاتێ بەهێواشی لێژ بۆیەوە (لەسەر چیای صەفا) بۆ نێو شیوەکە، پاشان بەخێرایی ڕێی کرد تا کاتێ سەرکەوت، ئینجا بەڕێکردن ڕۆیشت (تا چووە سەر چیای مەڕوە).

**٢٧٦٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْعَى بِبَطْنِ الْمَسِيلِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو جێگایەی کە لافاوی تێدا کۆ دەبێتەوە لە نێوان صەفا و مەڕوە بەهەروەلە دەڕۆیشت.

**٢٧٦٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ فِي حَجَّةٍ أَوْ عُمْرَةٍ أَهَلَّ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: ثُمَّ أَتَى الصَّفَا فَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا فَإِذَا مَرَّ بِالْمَسْعَى سَعَى[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە ڕێك بۆیەوە لەسەر وشترەکەی لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) لە حەج بووایە یان عومرە تەلبیەی دەکرد، دواتر فەرموودەکەی باس کرد، فەرموی: پاشان هات بۆ صەفا حەوت جار هەروەلەی کرد لە نێوان صەفا و مەڕوە، کاتێ تێپەڕ بوو بەنێو شیوەکە هەروەلەی کرد.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَاجِبٌ، لَا أَنَّهُ مُبَاحٌ غَيْرُ وَاجِبٍ لِقَوْلِهِ ﷻ: ﴿فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ١٥٨﴾ البقرة، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ١٥٨﴾ البقرة، لَيْسَ فِي الْمَعْنَى كَقَوْلِهِ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ١٠١﴾ النساء**

**٢٧٦٤-** عَنْ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي تَجْرَاةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَتْ لَنَا خِلْفَةٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَالَتِ: اطَّلَعْتُ مِنْ كَوَّةٍ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَأَشْرَفْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَإِذَا هُوَ يَسْعَى، وَإِذَا هُوَ يَقُولُ لِأَصْحَابِهِ: «اسْعَوْا فَإِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ السَّعْيَ، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ مِنْ شِدَّةِ السَّعْيِ يَدُورُ الْإِزَارُ حَوْلَ بَطْنِهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ بَطْنِهِ، وَفَخِذَيْهِ»[1].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی هەروەلەکردن لە نێوان صەفا و مەڕوە واجبە، نەك ڕێگەپێدراو بێت و واجب نەبێت، لەبەر فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ١٥٨﴾، واتە: جا هەر کەس حەجی ماڵی خوای کرد یان عومرەی کرد هیچ تاوانی ناگات کە تەوافی ئەو دووانەش بکات. وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ١٥٨﴾، لە مانادا وەکوو ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻ نییە: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ١٠١﴾، واتە: ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە کە هەندێ لە نوێژەکان کورت بکەنەوە**

واتە: حەبیبەی کچی ئەبو تەجراتە ﵂ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا دەربارەی تەوافی نێوان صەفا و مەڕوە شتێکی نەزانیمان بۆ مابۆیەوە، وتی: لە کون و کەلەبەری دیوارەکەوە تەماشای نێوان صەفا و مەڕوەم کرد، من لە شوێنێکی بەرز بووم دەمڕوانییە سەر پێغەمبەر ﷺ، بینیم ئەو هەروەلەی دەکرد (لە نێوان صەفا و مەڕوە)،

---

(١) صحيح.

بە هاوەڵەکانیشی دەفەرموو: هەروەلە بکەن بێگومان خوا هەروەلەی (نێوان صەفا و مەڕوەی) لەسەرتان نووسیوە، بینیم بەهۆی خێرایی هەروەلەکردنی پۆشاکی بەشی خوارەوەی پێچابوو بە دەوروبەری سکیەوە تەنانەت سپیایی سکی و ڕانیم بینی.

**٢٧٦٥-** عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ أَنَّ امْرَأَةً ﷺ، أَخْبَرَتْهَا أَنَّهَا، سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ يَقُولُ: «كُتِبَ عَلَيْكُمُ السَّعْيُ، فَاسْعَوْا»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ الَّتِي لَمْ تُسَمَّ فِي هَذَا الْخَبَرِ حَبِيبَةُ بِنْتُ أَبِي تَجْرَاةَ.

واتە: صەفیەی کچی شەیبە دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك ﷺ هەواڵی پێ دا، ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نێوان صەفا و مەڕوە دەیفەرموو: هەروەلەتان لەسەر نووسراوە، هەروەلە بکەن.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەو ئافرەتەی لەم فەرموودە ناوی نەهێنراوە حەبیبەی کچی ئەبو تەجراتە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّمَا أَعْلَمَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ لَا جُنَاحَ عَلَيْهِمْ فِي الطَّوَافِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِأَنَّهُمْ تَحَرَّجُوا مِنَ الطَّوَافِ بَيْنَهُمَا، إِذْ كَانَ الطَّوَافُ بَيْنَهُمَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَتَمَاشَاهُ بَعْضُ أَهْلِ الشِّرْكِ وَالْأَوْثَانِ مِنَ الْعَرَبِ مَنْ كَانَ يُهِلُّ مِنْهُمْ لِبَعْضِ أَوْثَانِهِمْ، وَكَانُوا يَتَحَرَّجُونَ مِنَ الطَّوَافِ بَيْنَهُمَا فَأَعْلَمَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا نَبِيَّهُ ﷺ وَأُمَّتَهُ أَنْ لَا جُنَاحَ عَلَيْهِمْ فِي الطَّوَافِ بَيْنَهُمَا كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُهُمْ

**٢٧٦٦-** عَنْ الزهري عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: قَرَأْتُ عِنْدَ عَائِشَةَ ﷺ: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، الْآيَةَ قُلْتُ: مَا أَرَى عَلَى مَنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا قَالَتْ: بِئْسَ مَا قُلْتَ يَا ابْنَ أُخْتِي، إِنَّمَا كَانَ مَنْ أَهَلَّ لِمَنَاةَ الطَّاغِيَةِ الَّتِي بِالْمُشَلَّلِ يَطُوفُونَ مِنْ بَيْنِ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا كَانَ الْإِسْلَامُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ طَوَافَنَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْحَجَرَيْنِ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ قَالَتْ: فَنَزَلَتْ: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، الْآيَةَ قَالَتْ: فَطَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَتْ سُنَّةً، وَقَالَ غَيْرُهَا قَالَ اللَّهُ: ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا ﴿١٨٤﴾ ﴾ البقرة، فَتَطَوَّعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَطَافَ قَالَ

---

(١) صحيح.

الزُّهْرِيُّ: فَحَدَّثْتُ بِهِ أَبَا بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَعِلْمٌ، وَلَقَدْ سَمِعْتُ رِجَالًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: سَأَلَ النَّاسُ الَّذِينَ كَانُوا يَطُوفُونَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا أُمِرْنَا أَنْ نَطُوفَ بِالْبَيْتِ، وَلَمْ نُؤْمَرْ أَنْ نَطُوفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة، فَأَرَاهَا نَزَلَتْ فِي هَؤُلَاءِ وَفِي هَؤُلَاءِ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ بۆیە بە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند ئەوان گوناهیان ناگات لە تەوافکردن لە نێوان صەفا و مەڕوە، چونکە لەسەر شانیان گران بوو دەترسان گوناهبار بن تەواف لە نێوانیاندا بکەن، لە سەردەمی نەفامی هەندێ لە هاوبەشدانەرانی عەرەب ئیحرامیان دەبەست بۆ هەندێ لە بتەکان، بۆیە لەسەر شانیان گران بوو تەواف لە نێوان صەفا و مەڕوە بکەن، خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئوممەتەکەی ڕاگەیاند گوناهیان ناگات لە تەوافکردن لە نێوانیاندا، وەك چۆن هەندێکیان بەهەڵەدا چوون**

واتە: زوهری دەگێڕێتەوە لە عوروەوە دەڵێ: لەلای عائیشە ﵂ ئەم ئایەتەم خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾، واتە: بێگومان صەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی خوای گەورەن. وتم: پێموا نییە ئەو کەسەی تەوافی صەفا و مەڕوە نەکات گوناهبار بێت پێی، عائیشە وتی: خراپترین قسەت کرد ئەی کوڕی خوشکم، ئەوسا هەر کەس ئیحرامی بۆ مەناتی تاغوت ببەستایە کە لە لای (الْمُشَلَّلِ) بوو، تەوافیان دەکرد لە نێوان صەفا و مەڕوە، بەڵام کە ئیسلام هات وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تەوافکردنمان لە نێوان ئەم دوو چیایە لە کردەوەی سەردەمی نەفامییە، عائیشە وتی: دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کرد، ئەوە بوو بە سوننەت، جگە لە عائیشە دەڵێ: خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا ﴿١٨٤﴾﴾، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کرد، زوهری وتی: ئەوەم بۆ ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕەحمان باس کرد، وتی: بەڕاستی ئەوە زانستە، گوێم لە پیاوانێکی خاوەن زانست و زانیاری بوو دەیانوت: خەڵکانێك کە تەوافیان دەکرد لە نێوان صەفا و مەڕوە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە فەرمانمان پێ کراوە تەوافی بەیت بکەین، فەرمانمان پێ نەکراوە تەواف لە نێوان صەفا و مەڕوە

---

(١) صحيح.

بکەین، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾، وادەزانم دەربارەی ئەوانە و ئەوانە دابەزی.

تێبینی:

(مَنَاة): ناوی بتێکە دەکەوێتە ڕووی دەریاوە، لە نزیك قودەید، حەوت میل لە مەدینەوە دوورە.

(الْمُشَلَّلِ): کێوێکە گەشتیار بەسەریدا دەچێت بۆ قودەید لە تەنیشتی دەریایە.

**٢٧٦٧-** عَنِ ابْنِ شِهَابَ عَن عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ الْأَنْصَارَ كَانُوا قَبْلَ أَنْ يُسْلِمُوا هُمْ وَغَسَّانُ يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ فَتَحَرَّجُوا أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَكَانَ ذَلِكَ سُنَّةً فِي أَيَّامِهِمْ مَنْ أَحْرَمَ لِمَنَاةَ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَأَنَّهُمْ حِينَ أَسْلَمُوا سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ:﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾البقرة، إِلَى قَوْلِهِ:﴿ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ ﴾البقرة، قَالَ عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ: هِيَ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١].

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، لە عورِوەی کوڕی زوبەیرەوە، عائیشە ﵂ هەواڵی پێ دا ئەنصارەکان پێش ئەوەی مسوڵمان بن لەگەڵ هۆزی غەسان ئیحرامیان بۆ مەنات دەبەست لەسەر شانیان گران بوو تەوافی نێوان صەفا و مەڕوە بکەن، جا ئەوە لە سەردەمی ئەواندا ڕێبازێك بوو هەر کەس ئیحرامی بۆ مەنات ببەستایە تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەی نەدەکرد، جا کاتێ کە مسوڵمان بوون، پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، دواتر خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾، تا فەرمایشتی: ﴿ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ ﴾، عورِوە وتی: عائیشە ﵂ وتی: ئەوە سوننەتێك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ داینا.

**٢٧٦٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ كَانَتِ الْأَنْصَارُ يَكْرَهُونَ أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ حَتَّى نَزَلَتْ:﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، زَادَ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ: فَطَافُوا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەنصارەکان حەزیان نەدەکرد تەوافی نێوان صەفا و مەڕوە بکەن، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾، سەلەمی کوڕی جونادە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) دەڵێ: دواتر تەوافیان کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ عَائِشَةَ لَمْ تُرِدْ بِقَوْلِهَا: «هِيَ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» أَنَّ الطَّوَافَ بَيْنَهُمَا سُنَّةٌ يَتِمُّ الْحَجُّ بِتَرْكِهِ

**٢٧٦٩-** عَنْ عُرْوَةَ قَالَ قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﷺ: مَا أَرَى عَلَيَّ مِنْ جُنَاحٍ أَنْ لَا أَتَطَوَّفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَالَتْ: وَلِمَ؟ قُلْتُ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، فَقَالَتْ: لَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ لَكَانَ، ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴾ إِنَّمَا أَنْزَلَ اللَّهُ هَذَا فِي أُنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ كَانُوا إِذَا أَهَلُّوا أَهَلُّوا لِمَنَاةَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَا يَحِلُّ لَهُمْ أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا قَدِمُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَجِّ ذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الْآيَةَ، فَلَعَمْرِي مَا أَتَمَّ اللَّهُ حَجَّ مَنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ؛ لِأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: ﴿ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، فَهُمَا مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهَا فَلَا يَحِلُّ لَهُمْ تُرِيدُ عِنْدَ أَنْفُسِهِمْ فِي دِينِهِمْ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی عائیشە لە وتەکەیدا: (هِيَ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ)، واتە: ئەوە سوننەتێکە پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە. مەبەستی ئەوە نەبووە، تەواف لە نێوان صەفا و مەڕوە سوننەتێکە بە وازهێنان و ئەنجامنەدانی حەج دروستە

واتە: هیشامی کوڕی عوڕوە دەگێڕێتەوە، لە عوڕوەوە دەڵێ: بە عائیشەم ﷺ وت: هیچ گوناهم ناگات تەوافی نێوان صەفا و مەڕوە نەکەم، عائیشە وتی: بۆچی؟ وتم: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾ ﴾، وتی: ئەگەر بەوشێوە بێت کە تۆ دەڵێی، ئەوە ئایەتەکە ئاوا دەبوو: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ

---

(١) صحيح.





﴿أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ ، واتە: ئەگەر تەوافی نێوانیان نەکەن گوناهبار نابن. بێگومان خوا ئەمەی دابەزاند دەربارەی خەڵکانێك لە ئەنصارەکان، ئەوان لە سەردەمی نەفامیدا کاتێ ئیحرامیان ببەستایە بۆ مەنات ئیحرامیان دەبەست، لە نەفسی خۆیاندا بەحەڵاڵیان نەدەزانی تەواف لە نێوان صەفا و مەڕوە بکەن، کاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتن بۆ حەج ئەوەیان بۆی باس کرد، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند، بە گیانم خوا حەجی هیچ کەس وەرناگرێ تەوافی نێوان صەفا و مەڕوە نەکات، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾، کەواتە صەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی خوای گەورەن.

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی عائیشە (فَلَا يَحِلُّ لَهُمْ)، مەبەستی پێی: لە نەفسی خۆیاندا بەحەڵاڵیان نەدەزانی تەواف لە ئایینەکەیاندا.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السَّعْيَ الَّذِي ذَكَرْتُ أَنَّهُ وَاجِبٌ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، سَعْيًا كَانَ أَوْ مَشْيًا بِسَكِينَةٍ وَتُؤَدَةٍ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السَّعْيَ الَّذِي هُوَ سُرْعَةُ الْمَشْيِ فِي الْوَادِي بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لَيْسَ بِوَاجِبٍ وُجُوبًا يَخْرِجُ تَارِكَهُ، وَأَنَّ الْمَشْيَ بَيْنَهُمَا جَائِزٌ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ أَنَّ اسْمَ السَّعْيِ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْمَشْيِ عَلَى السَّكِينَةِ وَالتُّؤَدَةِ، وَيَقَعُ عَلَى سُرْعَةِ الْمَشْيِ، وَاسْتَدْلَلْتُ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ بِقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴿٩﴾﴾ الجمعة، فَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ الْمُوَلَّى بَيَانَ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْوَحْيِ أَنَّ هَذَا السَّعْيَ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ بِهِ فِي هَذِهِ الْآيَةِ هُوَ الْمُضِيُّ وَالْمَشْيُ إِلَى الْجُمُعَةِ عَلَى السَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ بِقَوْلِهِ: «إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ» فَلَوْ كَانَ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا أَمَرَ بِسُرْعَةِ الْمَشْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ فِي هَذِهِ الْآيَةِ لَمَا قَالَ الْمُصْطَفَى ﷺ: «إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَأْتُوهَا تَمْشُونَ، وَلَا تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ»، وَكُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ أَنْ جَائِزٌ أَنْ يَقَعَ اسْمُ الْوَاحِدِ عَلَى فِعْلَيْنِ، أَحَدُهُمَا مَنْهِيٌّ عَنْهُ وَالْآخَرُ مَأْمُورٌ بِهِ، إِذِ اسْمُ السَّعْيِ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْمَشْيِ عَلَى السَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ وَعَلَى سُرْعَةِ الْمَشْيِ الَّذِي هُوَ هَرْوَلَةٌ، فَأَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَعَلَا بِالسَّعْيِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَزَجَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ السَّعْيِ إِلَى الصَّلَاةِ، فَالسَّعْيُ الَّذِي أَمَرَ اللَّهُ فِي هَذِهِ الْآيَةِ الْمَشْيُ الَّذِي هُوَ**

**ضِدُّ الْهَرْوَلَةِ، وَالسَّعْيُ الَّذِي زَجَرَ اللَّهُ عَنْهُ عِنْدَ إِتْيَانِ الصَّلَاةِ هُوَ سُرْعَةُ الْمَشْيِ الَّذِي هُوَ شِبْهُ الْهَرْوَلَةِ أَوِ الْهَرْوَلَةُ.**

**٢٧٧٠**- عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ السُّلَمِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﵄ يَمْشِي فِي الْمَسْعَى، فَقُلْتُ لَهُ تَمْشِي فِي الْمَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَقَالَ: لَئِنْ سَعَيْتُ لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْعَى، وَلَئِنْ مَشَيْتُ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي، وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ[1].

باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو (السَّعْيَ)یەی کە باسم کرد واجبە لە نێوان صەفا و مەروە، هەروەلەیە یان ڕێکردن بەلەسەرخۆیی و نەرمونیانی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی (السَّعْيَ) بریتییە لە ڕێکردن بەپەلە لەنێو شیوەکە لە نێوان صەفا و مەروە، ئەوە واجب نییە بەجۆرێ ئەو کەسەی پێی هەڵنەسێت وا بزانێ گوناهبارە، بێگومان ڕێکردن لە نێوانیاندا دروستە، ئەمەش لەو شێوازەیە کە پێشتر ڕامگەیاند ناوی (السَّعْيَ) هەندێ جار بۆ ڕێکردنی لەسەرخۆ و هێمن بەکار دێت، هەروەها بۆ ڕێکردنی بەپەلەیش بەکار دێت، لەو جێگایەدا کە باسم کرد بەڵگەشم بۆی هێنایەوە بەوەی خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ۝٩﴾. پێغەمبەر ﷺ کە خوا ڕایسپاردووە پەیامەکەی ڕوون بکاتەوە، ڕوونی کردۆتەوە کە ئەم (السَّعْيَ)یەی خوا فەرمانی پێ کردووە لەم ئایەتەدا بریتییە لە ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی بەهێمنی و لەسەرخۆیی، وەك فەرموویەتی: (إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ)، واتە: کاتێ هاتن بۆ نوێژ پێویستە لەسەرتان بەهێمنی و لەسەرخۆیی بچن. ئەگەر خوا ﷻ لەم ئایەتەدا فەرمانی بکردایە بەهەروەلە ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی، چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَأْتُوهَا تَمْشُونَ، وَلَا تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ)، واتە: کاتێ هاتن بۆ نوێژ بەڕێکردنی ئاسایی بچن، بەپەلە مەچن بۆی. وە من لەو جێگایەدا ڕامگەیاند دروستە یەك ناو بۆ دوو کردار بەکار بهێنرێ، یەکێکیان قەدەغەی لێ کرابێت ئەویتریشیان فەرمانی پێ کرابێت، لەوانە ناوی (السَّعْيِ) هەندێ جار بۆ ڕێکردنێکی لەسەرخۆ و هێمن بەکار دێت، هەندێ جاریش بۆ هەروەلە بەکار دێت، جا خوا فەرمانی کردووە بە ڕۆیشتن بە (السَّعْيِ) بۆ نوێژی هەینی، پێغەمبەریش ﷺ سەرزەنشتی

(١) صحيح.

**کردووە لە ڕۆیشتن بە (السَّعْيِ) بۆ نوێژی هەینی، جا ئەو (السَّعْيِ)یەی کە خوا فەرمانی پێ کردووە لەم ئایەتەدا ڕێکردنێکە دژی هەروەلەیە، وە ئەو (السَّعْيِ)یەی کە خوا سەرزەنشتی کردووە لە کاتی هاتن بۆ نوێژی هەینی بریتییە لە بەپەلە ڕۆیشتن کە هاوشێوەی هەروەلەیە**

واتە: کەسیری کوڕی جومهان دەڵێ: ئیبنو عومەرم بینی ﷺ ڕێی دەکرد لە شیوی نێوان صەفا و مەڕوە، پێم وت: لە شیوی نێوان صەفا و مەڕوە ڕێ دەکەی بەئاسایی، وتی: ئەگەر هەروەلە بکەم ئەوە پێغەمبەرم ﷺ بینی هەروەلەی دەکرد، وە ئەگەر ڕێ بکەم بەئاسایی ئەوە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ڕێی دەکرد بەئاسایی، منیش ئێستا بەساڵا چووم.

**٢٧٧١-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَمْشِي بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَقُلْتُ لَهُ: فَقَالَ: إِنْ أَمْشِ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي وَإِنْ أَسْعَ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْعَى(١).

واتە: کەسیری کوڕی جومهان دەڵێ: ئیبنو عومەرم بینی ﷺ ڕێی دەکرد لە شیوی نێوان صەفا و مەڕوە، پێم وت: (لە شیوی نێوان صەفا و مەڕوە ڕێ دەکەی بەئاسایی)، وتی: ئەگەر ڕێ بکەم بە ئاسایی ئەوە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ڕێی دەکرد بەئاسایی، وە ئەگەر هەروەلە بکەم ئەوە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی هەروەلەی دەکرد.

**٢٧٧٢-** عَنِ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، نَحْوَهُ(٢).

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ، بەهەمان شێوە.

**٢٧٧٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَعَى عَامًا وَمَشَى عَامًا(٣).

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ساڵێك هەروەلەی کرد (لە نێوان صەفا و مەڕوە) ساڵێکیش ڕێی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ الْحَرَجِ عَنِ السَّاعِي بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَبْلَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ جَهْلًا بِأَنَّ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ قَبْلَ السَّعْيِ

**٢٧٧٤-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَاجًّا، وَكَانَ النَّاسُ يَأْتُونَهُ، فَمِنْ قَائِلٍ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ سَعَيْتُ قَبْلَ أَنْ أَطُوفَ أَوْ أَخَّرْتُ شَيْئًا أَوْ قَدَّمْتُ شَيْئًا، وَكَانَ يَقُولُ لَهُمْ: «لَا حَرَجَ لَا حَرَجَ» إِلَّا رَجُلٌ اقْتَرَضَ مِنْ عِرْضِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ، وَهُوَ ظَالِمٌ فَذَاكَ الَّذِي حَرِجَ وَهَلَكَ[١].

## باسی ئەو کەسەی هەروەلە و ڕێکردنی نێوان صەفا و مەڕوە دەکات پێش تەوافکردنی بەیت، نەزانێت تەواف پێش هەروەلە و ڕێکردنە، گوناهبار نابێت

واتە: ئوسامەی کوڕی شەریك ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم بە مەبەستی حەجکردن، خەڵك دەهاتن بۆ لای، تیایاندا بوو دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەلەم کرد (لە نێوان صەفا و مەڕوە) پێش ئەوەی تەوافی (کەعبە) بکەم، یان شتێکم لە ڕێوڕەسمەکانی حەج دوا خست، یان پێش خست، ئەویش پێیانی دەفەرموو: گوناه نییە، گوناه نییە، مەگەر پیاوێك لە پەنهان باسی مسوڵمانێکی کردبێت، یان بوختانی کردبێ، ئەوە ستەمکارە، بەڕاستی ئەوە گوناهی کردووە و لەنێو چووە.

## بَابُ الدُّعَاءِ عَلَى أَهْلِ الْمِلَلِ وَالْأَوْثَانِ عَلَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ بِأَنْ يُهْزَمُوا وَيُزَلْزَلُوا

**٢٧٧٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ خَرَجَ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَجَعَلْنَا نَسْتُرُهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يَرْمِيَهُ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَوْ يُصِيبَهُ بِشَيْءٍ فَسَمِعْتُهُ يَدْعُو عَلَى الْأَحْزَابِ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ اهْزِمِ الْأَحْزَابَ اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی نزا لە بتپەرستان لەسەر کێوی صەفا و مەڕوە بەوەی تێك بشکێن و لەنێو بچن

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی کرد، چوو تەوافی ماڵی خوای کرد، ئینجا دەرچوو، تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەی کرد ئێمەیش پارێزگاریمان لێ دەکرد لە خەڵکی مەککە، لەوەی کەسێك تیرێکی تێ نەهاوێژێ یان ئازارێکی بدات، جا گوێم لێ بوو نزای دەکرد لە حیزبەکان و دەیفەرموو: ئەی ئەو خوایەی کتێبت دابەزاندووە و لێپرسینەوەت بەپەلەیە حیزبەکان تێك بشکێنە، ئەی خوایە تێکیان بشکێنە و لەناویان ببە.

### بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْمَعْذُورِ فِي الرُّكُوبِ فِي الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ

**٢٧٧٦-** عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّهَا قَدِمَتْ وَهِيَ مَرِيضَةٌ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ، وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ»[١].

### باسی مۆڵەتدان بەوکەسەی عوزری هەیە بەسواری تەوافی بەیت و تەوافی نێوان صەفاو مەڕوە بکات

واتە: زەینەبی کچی ئوممو سەلەمە دەگێڕێتەوە، لە ئوممو سەلەمەوە ﷺ، ئەو گەیشتە مەککە لە کاتێکدا نەخۆش بوو، ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرمووی: لەپشت خەڵکەکەوە بەسواری تەواف بکە.

### بَابُ ذِكْرِ بَعْضِ الْعِلَلِ الَّتِي لَهَا سَعَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ قَبْلُ أَنَّ اسْتِنَانَ السُّنَّةِ قَدْ تَكُونُ فِي الِابْتِدَاءِ لِعِلَّةٍ فَتَزُولُ الْعِلَّةُ وَتَبْقَى السُّنَّةُ إِلَى آخِرِ الْأَبَدِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا سَعَى بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِيَرَى الْمُشْرِكُونَ قُوَّتَهُ، فَبَقِيَتْ هَذِهِ السُّنَّةُ إِلَى آخِرِ الْأَبَدِ

**٢٧٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ إِنَّمَا سَعَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِيَرَى الْمُشْرِكُونَ قُوَّتَهُ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی هەندێ لەو هۆکارەی کە پێغەمبەر ﷺ هەروەلەی کرد لە نێوان صەفا و مەڕوە، ئەمەش لەو شێوازەیە کە پێشتر ڕامگەیاند، بێگومان کردەوەکردن بە سوننەتێك هەندێ جار سەرەتاکەی لەبەر هۆکارێك دەبێت، دواتر هۆکارەکە هەڵدەگیرێ و سوننەتەکە بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆیە هەروەلەی کرد لە نێوان صەفا و مەڕوە تا هاوبەشدانەران هێز و توانای ببینن، دواتر ئەم سوننەتە بۆ هەمیشەیی مایەوە**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بۆیە تەوافی بەیت و تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەیان کرد بۆ ئەوەی هاوبەشدانەران هێز و توانای ببینن.

**بَابُ اسْتِحْبَابِ رُكُوبِ مَنْ بِالنَّاسِ إِلَيْهِ الْحَاجَةُ وَالْمَسْأَلَةُ عَنْ أَمْرِ دِينِهِمْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِذَا كَثُرَ الزِّحَامُ عَلَى الْعَالِمِ، وَلَمْ يُمْكِنْ سُؤَالُهُ، إِذَا كَانَ الْعَالِمُ مَاشِيًا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ**

**٢٧٧٨-** عَن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: طَافَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْبَيْتِ عَلَى رَاحِلَتِهِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِيَرَاهُ النَّاسُ فَإِنَّ النَّاسَ غَشَوْهُ زَادَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَابْنُ مَعْمَرٍ لِيَسْأَلُوهُ، وَإِنَّ النَّاسَ غَشَوهُ(١).

**باسی چاکتر وایە ئەو کەسانەی کە خەڵکی پێویستییان پێیانە بۆ پرسیارلێکردن دەربارەی کاروباری ئایینەکەیان لە نێوان صەفا و مەڕوە بەسواربوونی وڵاخ تەواف بکەن، ئەمە ئەگەر زانا بەپێی ڕێ بکات لە نێوان صەفا و مەڕوە نەگونجێ پرسیاری لێ بکرێ بەهۆی قەرەباڵغییەوە**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا بەسەر وشترەکەیەوە تەوافی بەیتی کرد، هەروەها لە نێوان صەفا و مەڕوەیش تا خەڵك ببینن، چونکە خەڵکەکە قەرەباڵغییان لە دەوری دروست کردبوو. عەبدوڕەحمان و ئیبنو مەعمەر ئەوەیان زیاد کرد: تا خەڵکەکە پرسیاری لێ بکەن، وەخەڵکەکە قەرەباڵغییان لە دەوری دروست کردبوو.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الرُّكُوبِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِذَا أُوذِيَ الطَّائِفُ بَيْنَهُمَا بِالِازْدِحَامِ عَلَيْهِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الرُّكُوبَ بَيْنَهُمَا إِبَاحَةٌ لَا أَنَّهُ سُنَّةٌ وَاجِبَةٌ، وَلَا أَنَّهُ سُنَّةُ فَضِيلَةٍ بَلْ هِيَ سُنَّةُ إِبَاحَةٍ

٢٧٧٩- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَرَأَيْتَ الرُّكُوبَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ؟ قَالَ: قَوْمُكَ يَزْعُمُونَ أَنَّهَا سُنَّةٌ قَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى مَكَّةَ فَجَعَلَ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَخَرَجَ أَهْلُ مَكَّةَ حَتَّى خَرَجَ النِّسَاءُ، وَكَانَ لَا يَضْرِبُ أَحَدًا عِنْدَهُ وَلَا يَدْعُونَهُ فَدَعَا بِرَاحِلَتِهِ، فَرَكِبَ، وَلَوْ يُتْرَكُ لَكَانَ الْمَشْيُ أَحَبَّ إِلَيْهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ صَدَقُوا وَكَذَبُوا يُرِيدُ صَدَقُوا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ رَكِبَ بَيْنَهُمَا، وَكَذَبُوا بِقَوْلِ إِنَّهُ لَيْسَ بِسُنَّةٍ وَاجِبَةٍ، وَلَا فَضِيلَةٍ وَإِنَّمَا هِيَ إِبَاحَةٌ لَا حَتْمٌ وَلَا فَضِيلَةٌ.

## باسی مۆڵەتدان بە سواربوونی وڵاخ لە نێوان صەفا و مەڕوە ئەگەر ئەو کەسە ئازار درا بەوەی قەرەباڵغی لەسەر دروست بکرێ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سواربوونی وڵاخ لە نێوانیاندا ڕێگەپێدراوە، سوننەتێکی واجب نییە، وە سوننەتێکیش نییە بۆ فەزڵ و چاکە، بەڵکوو ئەوە سوننەتێکی ڕێگەپێدراوە

واتە: ئەبو توفەیل دەڵێ: بە ئیبنو عەباسم ﵄ وت: ئایا سواربوونی وڵاخت پێ چۆنە لە نێوان صەفا و مەڕوە؟ وتی: قەومەکەت پێیان وایە ئەوە سوننەتە، وتی: ڕاستیان کرد و هەڵەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەککە تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەی کرد، خەڵکی مەککە دەرچوون تەنانەت ئافرەتەکانیشیان دەرچوون، جا پێغەمبەر ﷺ لە کەسی نەدەدا و خەڵکەکەیش وازیان لێ نەدەهێنا، بۆیە داوای وڵاخەکەی کرد و سواری بوو، ئەگەر وازیان لێ بهێنایە ئەوە ڕێکردنی پێ خۆشتر بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی ئیبنو عەباس: (صَدَقُوا وَكَذَبُوا)، مەبەستی لە (صَدَقُوا) ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا سواری وڵاخ بوو، وە لە (كَذَبُوا) سواربوونی وڵاخ سوننەتێکی واجب نییە، هەروەها فەزڵ و چاکەیش نییە بەڵکوو ڕێگەپێدراوە، نە حەتمییە و نە فەزڵ و چاکەیە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ بِالْمِحْجَنِ لِلطَّائِفِ الرَّاكِبِ

٢٧٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَافَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنِهِ[١].

## باسی زیارەتکردنی بەردە ڕەشەکە بە گۆچان بۆ ئەو کەسەی بەسواری تەواف دەکات

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەسواری وشترەکەی تەوافی ماڵی خوای کرد بە گۆچانێك زیارەتی ڕوکن (بەردە ڕەشەکەی) دەکرد.

٢٧٨١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَاحِلَتِهِ الْقَصْوَاءِ يَوْمَ الْفَتْحِ لِيَسْتَلِمَ الرُّكْنَ بِمِحْجَنِهِ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە تەوافی بەیتی کرد لەسەر وشترەکەی (کە نازناوی) ئەلقەصواء بوو، بۆ ئەوەی بە گۆچانەکەی زیارەتی ڕوکن (بەردە ڕەشەکە) بکات.

## بَابُ تَقْبِيلِ طَرَفِ الْمِحْجَنِ إِذَا اسْتَلَمَ بِهِ الرُّكْنَ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ

٢٧٨٢- عن أَبِي الطُّفَيْلِ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عَلَى نَاقَتِهِ أَوْ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَهُوَ لَيَسْتَلِمُ بِمِحْجَنِهِ، وَيُقَبِّلُ طَرَفَ الْمِحْجَنِ[٣].

## باسی ماچکردنی تەنیشتی گۆچان ئەگەر زیارەتی بەردە ڕەشەکەی پێ کرد، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم سەنەدە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو توفەیل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە بەیت تەوافی دەکرد لەسەر وشترەکەی یان وڵاخەکەی، بۆ ئەوەی بە گۆچانەکەی زیارەتی (بەردە ڕەشەکە) بکات و ماچی تەنیشتی گۆچانەکە بکات.

**٢٧٨٣-** عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَطُوفُ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِالْبَيْتِ، وَيَسْتَلِمُ الْأَرْكَانَ بِمِحْجَنِهِ قَالَ: وَأُرَاهُ يُقَبِّلُ طَرَفَ الْمِحْجَنِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا فَطَافَ عَلَى رَاحِلَتِهِ[١].

واتە: ئەبو توفەیل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە بەیت تەوافی دەکرد لەسەر وڵاخەکەی، بە گۆچانەکەی زیارەتی ڕوکنەکانی دەکرد. وتی: پێم وایە ماچی تەنیشتی گۆچانەکەی کرد، پاشان چوو بۆ چیای صەفا لەسەر وشترەکەی تەوافی کرد.

## بَابُ إِحْلَالِ الْمُعْتَمِرِ عِنْدَ الْفَرَاغِ مِنَ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ

**٢٧٨٤-** عَنْ عُرْوَةَ عَنِ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَهْلَلْنَا بِالْعُمْرَةِ فَطَافَ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا[٢].

## باسی ئیحرامشکاندنی عومرەکەر لە کاتی لێبوونەوە لە هەروولەی نێوان صەفا و مەڕوە

واتە: عوروە دەگێڕێتەوە، لە عائیشەوە ﷺ، ئەو وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین ئیحرامان بەست بە نیيەتی عومرە، ئەوانەی ئیحرامیان بە نیيەتی عومرە بەستبوو تەوافی بەیتیان کرد، هەروەها تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەیش، پاشان ئیحرامیان شکاند.

**٢٧٨٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، ثُمَّ يَطُوفُونَ، ثُمَّ يُقَصِّرُوا أَوْ يَحْلِقُوا إِلَّا مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ[٣].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، (پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە بەرەبەیانی چوارەم ڕۆژدا گەیشتن نیيەتی حەجیان هێنا بوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

نییەتەکەیان بگۆڕن بۆ عومرە، پاشان تەواف بکەن، پاشان قژیان کورت بکەنەوە یان بیتاشن مەگەر کەسێك ئاژەڵی هەدی بۆ قوربانی هێنابێت (ئەوە با ئیحرام نەشکێنێ).

## بَابُ إِبَاحَةِ وَطْءِ الْمُتَمَتِّعِ النِّسَاءَ مَا بَيْنَ الْإِحْلَالِ مِنَ الْعُمْرَةِ إِلَى الْإِحْرَامِ بِالْحَجِّ، وَإِنْ كَانَ مَا بَيْنَهُمَا قَرِيبًا

٢٧٨٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَبِيحَةَ رَابِعٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ، فَقَالَ: «أَحِلُّوا وَأَصِيبُوا النِّسَاءَ». قال عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ: وَلَمْ يَعْزِمْ عَلَيْهِمْ أَنْ يُصِيبُوا النِّسَاءَ وَلَكِنَّهُ أَحَلَّهُ لَهُمْ[١].

## باسی ڕێگەدراوە بەوکەسەی تەمەتوعی کردووە، لەگەڵ خێزانەکانی جووت بێت، لە نێوان ئیحرامشکاندن لە عومرە بۆ ئیحرامبەستنی حەج، ئەگەرچی نێوانیان نزیك بێت

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەرەبەیانی چوارەم ڕۆژ کە تێپەڕی بوو لە مانگی (ذِي الْحِجَّةِ) هات بۆ مەککە، کاتێ گەیشتین فەرمانی پێ کردین ئیحرام بشکێنین، فەرمووی: ئیحرام بشکێنن و بچنە لای هاوسەرەکانتان. عەتا وتی: جابر وتی: عەزمی نەکرد لەسەریان لەگەڵ ژنەکانیان جووت بن، بەڵام حەڵاڵی کرد بۆیان.

## بَابُ ذَبْحِ الْمُعْتَمِرِ وَنَحْرِهِ وَهَدْيِهِ حَيْثُ شَاءَ مِنْ مَكَّةَ

٢٧٨٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ طَرِيقٌ وَمَنْحَرٌ»[٢].

## باسی عومرەکەر لە هەر شوێنێکی مەککە بێت دەتوانێ ئاژەڵی قوربانی و هەدییەکەی سەر ببڕێت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وە هەموو کوچە و ڕێگایەکی مەککە ڕێگا و کوشتارگەیە (دەتوانن ئاژەڵەکانتانی تێدا سەر بڕن).

## بَابُ الْمُهِلَّةِ بِالْعُمْرَةِ تَقْدَمُ مَكَّةَ وَهِيَ حَائِضٌ

**٢٧٨٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ قَالَتْ فَقَدِمْتُ مَكَّةَ، وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلَا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ وَدَعِي الْعُمْرَةَ قَالَتْ: فَفَعَلْتُ فَلَمَّا قَضَيْنَا الْحَجَّ أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ فَاعْتَمَرْتُ قَالَ: «هَذِهِ مَكَانُ عُمْرَتِكِ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ زَمَانًا يَتَخَالَجُ فِي نَفْسِي مِنْ هَذِهِ اللَّفْظَةِ الَّتِي فِي خَبَرِ عَائِشَةَ، وَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ لَهَا انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي وَكُنْتُ أَفْرُقُ أَنْ يَكُونَ فِي أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ لَهَا بِذَلِكَ دَلَالَةٌ عَلَى صِحَّةِ مَذْهَبِ مَنْ خَالَفَنَا فِي هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ عَائِشَةَ بِرَفْضِ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ وَجَدْتُ الدَّلِيلَ عَلَى صِحَّةِ مَذْهَبِنَا، وَذَلِكَ أَنَّ عَائِشَةَ كَانَتْ تَرَى أَنَّ الْمُعْتَمِرَ إِذَا دَخَلَ الْحَرَمَ حَلَّ لَهُ جَمِيعُ مَا يَحِلُّ لِلْحَاجِّ إِذَا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَكَانَ يَحِلُّ لِعَائِشَةَ بَعْدَ دُخُولِهَا الْحَرَمَ نَقْضُ رَأْسِهَا، وَالِامْتِشَاطِ، حَدَّثَنَا بِالْخَبَرِ الَّذِي ذَكَرْتُ عَبْدُ الْجَبَّارِ ثنا سُفْيَانُ سَمِعَهُ ابْنُ جُرَيْجٍ عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَالِكٍ يُخْبِرُ عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ طَلْحَةَ أَنَّ عَائِشَةَ أَمَرَتْهَا أَنْ تَنْقُضَ شَعَرَهَا وَتَغْسِلَهُ، وَقَالَتْ: إِنَّ الْمُعْتَمِرَ إِذَا دَخَلَ الْحَرَمَ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْحَاجِّ إِذَا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ الشَّافِعِيُّ إِنَّمَا أَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَتْرُكَ الْعَمَلَ بِعُمْرَةٍ مِنَ الطَّوَافِ وَالسَّعْيِ لَا أَنْ تَرْفُضَ الْعُمْرَةَ، وَأَمَرَهَا أَنْ تُهِلَّ بِالْحَجِّ، فَتَصِيرُ قَارِنَةً، وَهَذَا عِنْدَ الشَّافِعِيِّ كَفِعْلِ ابْنِ عُمَرَ حِينَ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ: مَا أَرَى سَبِيلَهُمَا إِلَّا وَاحِدًا، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجَّةً مَعَ عُمْرَتِي، فَقَرَنَ الْحَجَّ إِلَى الْعُمْرَةِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ لِلْعُمْرَةِ وَيَسْعَى لَهَا فَصَارَ قَارِنًا، وَمَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لَهَا: «هَذِهِ مَكَانُ الْعُمْرَةِ الَّتِي لَمْ يُمْكِنْكِ الْعَمَلَ لَهَا.

قال أَبُو بَكْرٍ: قَدْ بَيَّنْتُ هَذَا الْخَبَرَ فِي الْمَسْأَلَةِ الطَّوِيلَةِ فِي تَأْلِيفِ أَخْبَارِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَاخْتِلَافِ أَلْفَاظِهِمْ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

---

(١) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە عومرە (بۆ ئەو ئافرەتەی کە ئیحرامی بەنییەتی عومرە بەستووە)، بچێتە مەککە، لە کاتێکدا لە حەیزدا بێ

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە حەجیماڵئاواییدا، ئیحرامی عومرەمان بەست، وتی: هاتمە مەککە من لە حەیزدا بووم، نە تەوافی بەیتم کردبوو نە هاتوچۆی لە نێوان صەفا و مەروە، سکاڵام برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: پەلکەی قژت هەڵبوەشێنەوە و قژت شانە بکە، (مەبەست لەمەدا خۆشۆردنە) ئیحرامی حەج ببەستە و واز لە عومرە بێنە. منیش ئەوەم کرد، کاتێ حەجمان تەواو کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ من و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری نارد بۆ تەنعیم، عومرەم کرد، فەرمووی: ئەوە شوێنی عومرەکەتە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ماوەیەك لە نەفسی خۆمدا بیرم دەکردەوە لەو دەستەواژەی کە لە فەرموودەکەی عائیشە هاتبوو، وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي)، واتە: پەلکەی قژت هەڵبوەشێنەوە و قژت شانە بکە. من وا خەیاڵم دەکرد فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بە عائیشە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی مەزهەبی ئەو کەسەی لەم بابەتەدا پێچەوانەی ئێمەی کردووە، ئەو پێی وابوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە عائیشە عومرەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، دواتر بەڵگەیەکم بەدی کرد لەسەر ڕاستی مەزهەبەکەمان، چونکە عائیشە پێی وا بوو عومرەکەر ئەگەر چووە نێو حەرەمەوە هەموو ئەوانەی بۆ حەجکەر حەڵاڵە بۆ ئەویش حەڵاڵە، ئەگەر بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، جا بۆ عائیشە حەڵاڵە دوای ئەوەی چووە نێو حەرەمەوە پەلکەی سەری بکاتەوە و قژی شانە بکات (واتە: سەری بشوات)، ئەم فەرموودەی کە باسم کرد عەبدولجەبار بۆی باس کردین، لە سوفیانەوە بۆی باس کردین، لە ئیبنو جورەیجەوە بیستوویەتی، لە یوسفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە، لە عائیشەی کچی تەڵحەوە، عائیشە فەرمانی پێکرد پەلکەی سەری بکاتەوە و بیشوات، وە عائیشە دەڵێ: عومرەکەر ئەگەر چووە نێو حەرەمەوە، ئەوە وەکوو حەجکەر وایە، ئەگەر بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: شافیعی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد واز لە تەواوکردنی عومرەکەی بهێنێ لە تەواف و هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوە نەك عومرەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، وە فەرمانی پێ کرد ئیحرامی حەج ببەستێت، ئەوکات وەکوو ئەو کەسەی لێ دێت کە ئیحرامی بۆ حەج و عومرە بەستووە، ئەمەش وەکوو کردەوەکەی ئیبنو عومەرە کاتێ ئیحرامی بۆ عومرە بەست، پاشان وتی: پێم وایە کردارەکانی حەج و عومرە هەر یەکێکە، ئێوە دەکەم بە شایەت من حەجم لەگەڵ عومرەکەم واجب کرد لەسەر خۆم، حەجی دایە پاڵ عومرە پێش ئەوەی تەوافی عومرە و هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوە بکات، ئیتر بوو بە ئیحرامبەستوو بە حەج و عومرە. وە مانای فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بە عائیشە: ئەمە شوێنی ئەو عومرەیە کە دەتوانی ئەنجامی بدەیت.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەم ڕوون کردۆتەوە لە بابەتێکی دوور و درێژدا لە (تَأْلِيفِ أَخْبَارِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَاخْتِلَافِ أَلْفَاظِهِمْ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ)، واتە: دانانی فەرموودەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و جیاوازی دەستەواژەیان لە حەجیماڵئاواییدا.

## بَابُ مَقَامِ الْقَارِنِ وَالْمُفْرِدِ بِالْحَجِّ وَالْإِحْرَامِ إِلَى يَوْمِ النَّحْرِ

**٢٧٨٩-** عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لَا يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا»[1].

## باسی پلە و پایەی ئەو کەسەی نییەتی حەج و عومرە پێکەوە دەهێنێ و ئیحرام دەبەستێ، هەروەها ئەو کەسەش بەتەنها نییەتی حەج دەهێنێ و ئیحرام دەبەستێ تا ڕۆژی جەژنی قوربان

واتە: عوروە دەگێڕێتەوە، عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس ئاژەڵی قوربانی بەهەدی لەگەڵ خۆی هێناوە با ئیحرامی حەج و عومرە پێکەوە ببەستێت، پاشان با ئیحرام نەشکێنی هەتا لە هەردووکیان دەبێتەوە.

**٢٧٩٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَجِّ عَلَى أَنْوَاعٍ ثَلَاثَةٍ فَمِنَّا مَنْ أَحْرَمَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًا، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ مُفْرِدًا، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَمَنْ كَانَ

---

(١) صحيح.

أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ، فَلَا يَحِلُّ مِنْ شَيْءٍ مِمَّا حُرِّمَ عَلَيْهِ حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَقَدْ قَضَى عُمْرَتَهُ حَتَّى يَسْتَقْبِلَ حَجًّا»[1].

**واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ حەج سێ جۆر بووین: تیاماندا بوو ئیحرامی بۆ حەج و عومرە پێکەوە بەستبوو، وە تیاماندا بوو تەنها ئیحرامی بۆ حەج بەستبوو، وە تیاماندا بوو تەنها ئیحرامی بۆ عومرە بەستبوو، جا هەر کەس ئیحرامی بۆ عومرە و حەج بەستووە، هیچ شتێکی بۆ حەڵاڵ نەبوو لەوەی کە حەرام کرابوو لەسەری تا لە ڕێوڕەسمەکانی حەج دەبێتەوە، هەر کەسیش کە تەنها ئیحرامی بۆ عومرە بەستووە، دواتر تەوافی بەیتی کرد و هەروەلەی نێوان صەفا و مەڕوەی کرد، ئەوە عومرەکەی تەواو کردووە تا کاتی حەج دێت.**

## بَابُ فَضْلِ الْحَجِّ مَاشِيًا مِنْ مَكَّةَ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ عِيسَى بْنِ سَوَادَةَ هَذَا

**٢٧٩١-** عَنْ عِيسَى بْنُ سَوَادَةَ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، عَنْ زَاذَانَ قَالَ: مَرِضَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ مَرَضًا شَدِيدًا فَدَعَى وَلَدَهُ فَجَمَعَهُمْ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ حَجَّ مِنْ مَكَّةَ مَاشِيًا حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى مَكَّةَ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِكُلِّ خَطْوَةٍ سَبْعَمِائَةِ حَسَنَةٍ، كُلُّ حَسَنَةٍ مِثْلُ حَسَنَاتِ الْحَرَمِ قِيلَ لَهُ مَا حَسَنَاتُ الْحَرَمِ قَالَ: بِكُلِّ حَسَنَةٍ مِائَةُ أَلْفِ أَلْفِ حَسَنَةٍ»[2].

## باسی فەزڵ و گەورەیی حەج بەپێ لە مەککەوە، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم عیسای کوڕی سەوادە

**واتە: عیسای کوڕی سەوادە دەگێڕێتەوە، لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید، لە زازانەوە دەڵێ: ئیبنو عەباس ﷺ نەخۆش کەوت بەسەختی، منداڵەکانی بانگ کرد و کۆی کردنەوە، وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەس لە مەککەوە بەپیادە بچێت بۆ حەج تا دەگەڕێتەوە بۆ مەککە ئەوە بۆ هەر هەنگاوێکی حەوت سەد چاکەی بۆ دەنووسرێ، هەر چاکەیەکی وەکوو چاکەکانی حەڕەمە، وترا: چاکەکانی حەڕەم چییە؟ وتی: هەر چاکەیەکی سەد هەزار هەزار چاکەیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف جدا.

## بَابُ عَدَدِ حَجِّ آدَمَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَصِفَةِ حَجِّهِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنَ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ هَذَا

**٢٧٩٢-** عَنِ الْقَاسِمُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنَا أَبُو حَازِمٍ، -وَهُوَ نَبْتَكُ مولى ابْنِ عَبَّاس- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ آدَمَ أَتَى الْبَيْتَ أَلْفَ أَتْيَةٍ لَمْ يَرْكَبْ قَطُّ فِيهِنَّ مِنَ الْهِنْدِ عَلَى رِجْلَيْهِ»[١].

## باسی ژمارەی حەجکردنی ئادەم (عليه السلام)، هەروەها چۆنییەتی حەجکردنی ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی ئەم قاسمی کوڕی عەبدوڕەحمانە

واتە: قاسمی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، ئەبو حازم بۆی باس کردین -کە نەبتەکی مەولای ئیبنو عەباسە ﵄- لە ئیبنو عەباسەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئادەم (عليه السلام) هەزار جار لە وڵاتی هیندەوە بەپیادە هات بۆ کەعبە، لە هیچ جارێکیاندا بە سواری نەهات.

## بَابُ خُطْبَةِ الْإِمَامِ يَوْمَ السَّابِعِ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ مَنَاسِكَهُمْ

**٢٧٩٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَ قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِيَوْمٍ خَطَبَ النَّاسَ وَأَخْبَرَهُمْ بِمَنَاسِكِهِمْ[٢].

## باسی وتاردانی پێشەوا لە ڕۆژی حەوتەمی (ذِي الْحِجَّة) تا خەڵکی ڕێوڕەسمەکانیان بزانن

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك پێش تەڕویە وتاری بۆ خەڵکدا و هەواڵی دروشمەکانیانی پێدان.

---

(١) إسناده ضعيف جدا.

(٢) إسناده ضعيف.

تێبینی: (التَّرْوِيَةِ): بریتییە لە ڕۆژی هەشتەم لە مانگی (ذِي الْحِجَّة) بە مێژووی کۆچی، هەروەها بریتییە لەو ڕۆژەی کە حاجییەکان دەچن بۆ مینا، بۆ مانەوە تیایدا، وەك خۆئامادەکردنێك بۆ سەرکەوتن بۆ سەر کێوی عەرەفە.

## بَابُ إِهْلَالِ الْمُتَمَتِّعِ بِالْحَجِّ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ مِنْ مَكَّةَ

**٢٧٩٤**- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يُخْبِرُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: فَأَمَرَنَا بَعْدَمَا طُفْنَا أَنْ نَحِلَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَإِذَا أَرَدْتُمْ أَنْ تَنْطَلِقُوا إِلَى مِنًى فَأَهِلُّوا». قَالَ: فَأَهْلَلْنَا مِنَ الْبَطْحَاءِ[1].

## باسی ئیحرامبەستنی ئەو کەسەی حەج بە تەمەتوع دەکات لە ڕۆژی تەرویە لە مەککە

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵا بوو ﷺ، هەواڵی دا دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ وتی: دوای ئەوەی تەوافمان کرد فەرمانی پێ کردین ئیحرام بشکێنین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستان بچن بۆ مینا ئیحرام ببەستن. وتی: لە (الْبَطْحَاءِ) ئیحرامان بەست.

تێبینی:

(الْبَطْحَاءِ): جێگایەکی نەرمی فراوانە لـم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە لە نێوان مەککە و مینادایە.

(التَّمَتُّع): واتە: کەسێك دەچێ بۆ حەج ئیحرام دەبەستێ بە عومرە لە مانگەکانی حەجدا، کە گەیشتە ئەوێ ڕاستەوخۆ تەواف دەکات و سەعی نێوان صەفا و مەڕوە دەکات و قژی کورت دەکاتەوە یاخود دەیتاشێ، پاشان ئیحرام لە خۆی دەکاتەوە و هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵە هەتا کاتی حەجکردن، پاشان ئیحرامی حەج دەبەستێ، ئەوکات عومرە جیا دەبێت لە حەج، بەڵام واجبە لەسەری کە خوێن بڕێژێ).

---

(١) صحيح.

**٢٧٩٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا طُفْنَا بِالْبَيْتِ قَالَ: اجْعَلُوهَا عُمْرَةً إِلَّا مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ قَالَ: فَجَعَلْنَاهَا عُمْرَةً، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ صَرَخْنَا بِالْحَجِّ وَانْطَلَقْنَا إِلَى مِنًى[١].

**واتە:** ئەبو سەعید ﵁ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین تا تەوافی بەیتمان کرد، فەرمووی: بیکەن بە عومرە مەگەر کەسێك ئاژەڵی قوربانی بەهەدی لەگەڵ خۆی هێنابێت، وتی: کردمان بە عومرە، جا کاتێ ڕۆژی تەرویە هات دەنگمان بەرز کردەوە بە حەج و چووین بۆ مینا.

## بَابُ وَقْتِ الْخُرُوجِ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ مِنْ مَكَّةَ إِلَى مِنًى

**٢٧٩٦-** عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﵁، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ عَقِلْتَهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيْنَ صَلَّى الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ قَالَ: بِمِنًى، قُلْتُ: فَأَيْنَ صَلَّى الْعَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بِالْأَبْطَحِ، ثُمَّ قَالَ: افْعَلْ كَمَا فَعَلَ أُمَرَاؤُكَ[٢].

## باسی کاتی دەرچوون لە ڕۆژی تەرویە (لە هەشتەم ڕۆژی (ذي الحجة)) لە مەککەوە بۆ مینا

**واتە:** عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیع دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ کرد، وتم: شتێکم بۆ بگێڕەوە لەبەرت کردبێت و تێیگەیشتبێتی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لەکوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد لە ڕۆژی تەرویە (لە هەشتەم ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ))؟ وتی: لە مینا، وتم: ئەی لەکوێ نوێژی عەسری کرد لە ڕۆژی نەفرِ (ڕۆژی دەرچوون لە مینا)؟ وتی: لە ئەبطەح، پاشان وتی: ئەوە ئەنجام بدە کە کاربەدەستەکانت ئەنجامی دەدەن (چونکە ئەوکات کاربەدەستەکان لەسەر سوننەت دەڕۆیشتن).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٧٩٧-** عَن عَبْد الْعَزِيزِ بْنُ رُفَيْعٍ قَالَ: لَقِيتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ عَلَى حِمَارٍ مُتَوَجِّهًا إِلَى مِنًى يَوْمَ التَّرْوِيَةِ فَقُلْتُ لَهُ: أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذَا الْيَوْمَ الظُّهْرَ؟ قَالَ: صَلِّ حَيْثُ يُصَلِّي أُمَرَاؤُكَ[1].

واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیع دەڵێ: گەیشتم بە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە ڕۆژی تەڕویە بەسەر گوێدرێژێکەوە بوو ڕووی کردبووە مینا، پێم وت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ڕۆژەدا نوێژی نیوەڕۆی لەکوێ کرد؟ وتی: لەو شوێنە نوێژی کرد کە کاربەدەستەکانت نوێژی لێ دەکەن.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ الصَّلَوَاتِ الَّتِي يُصَلِّي الْإِمَامُ وَالنَّاسُ بِمِنًى قَبْلَ الْغُدُوِّ إِلَى عَرَفَةَ

**٢٧٩٨-** عَنِ الْقَاسِمِ يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ يَقُولُ: مِنْ سُنَّةِ الْحَجِّ، وَقَالَ مَرَّةً: مِنْ سُنَّةِ الْإِمَامِ أَنْ يُصَلِّيَ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْغُرُوبَ وَالْعِشَاءَ وَالصُّبْحَ بِمِنًى[2].

## باسی ژمارەی ئەو نوێژانەی کە ئیمام و خەڵك لە مینا ئەنجامی ئەدەن پێش ئەوەی بەیانی بکەنەوە و بچن بۆ عەرەفە

واتە: قاسم دەڵێ: گوێم لە ئیبنو زوبەیر بوو ﷺ دەیوت: لە سوننەتی حەج، جارێکی دیکە وتی: سوننەت وایە ئیمام و پێشەوا نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشا و بەیانی لە مینا بکات.

**٢٧٩٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى خَمْسَ صَلَوَاتٍ بِمِنًى[3].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێنج نوێژی لە مینا کرد.

## بَابُ وَقْتِ الْغُدُوِّ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ

**٢٨٠٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ قَالَ: مِنْ سُنَّةِ الْحَجِّ أَنْ يُصَلِّيَ الْإِمَامُ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ الْآخِرَةَ وَالصُّبْحَ بِمِنًى، ثُمَّ يَغْدُو إِلَى عَرَفَةَ فَيَقِيلُ حَيْثُ قَضَى لَهُ حَتَّى إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

خَطَبَ النَّاسَ، ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ وَقَفَ بِعَرَفَاتٍ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ، ثُمَّ يَفِيضَ فَيُصَلِّي بِالْمُزْدَلِفَةِ أَوْ حَيْثُ قَضَى اللَّهُ، ثُمَّ يَقِفَ بِجَمْعٍ حَتَّى إِذَا أَسْفَرَ دَفَعَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، فَإِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ الْكُبْرَى حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ حُرِّمَ عَلَيْهِ إِلَّا النِّسَاءَ وَالطِّيبَ حَتَّى يَزُورَ الْبَيْتَ[١].

## باسی کاتی ڕۆیشتن لە میناوە بۆ عەرەفە

**واتە: عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێ: لە سوننەتەکانی حەج ئەوەیە پێشەوا نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشا و بەیانی لە مینا بکات، پاشان سەرلەبەیانییەکەی بچێت بۆ عەرەفە، لەوێ قەیلولە بکات ئەوەندە بۆی گونجا کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا وتارێك بۆ خەڵکەکە بدات، پاشان نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە کۆ بکاتەوە، پاشان لە عەرەفە بوەستێ تا خۆر ئاوا دەبێت، پاشان دابەزێت لە موزدەلیفە نوێژ بکات یان لە هەر شوێنێ خوا بۆی ڕێك خست، پاشان لە (جَمْع) بوەستێ (کە شوێنێکە لە موزدەلیفە خەڵك لەوێ کۆ دەبنەوە)، تا دنیا ڕۆشن دەبێتەوە پێش دەرچوونی خۆر بکەوێتە ڕێ، جا کاتێ بەردبارانی جەمرەی گەورەی کرد، هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت کە حەرام کرابوو لەسەری جگە لە خێزانەکانی و بۆنی خۆش تا زیارەتی بەیت دەکات.**

**تێبینی: (الْمُزْدَلِفَةِ): شوێنێکە لە نزیك مەککە یان مینا، پێیشی دەوترێ: (جَمْع) چونکە نوێژی ئێوارەو عیشای تێدا کۆدەکرێتەوە.**

**٢٨٠١-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ يَقُولُ: مِنْ سُنَّةٍ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَرُبَّمَا اخْتَلَفَا فِي الْحَرْفِ وَالشيء، وَقَالَ: فَقَدْ حَلَّ لَهُ مَا حُرِّمَ عَلَيْهِ إِلَّا النِّسَاءَ حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذَا هُوَ الصَّحِيحُ إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ خَلَا النِّسَاءَ؛ لِأَنَّ عَائِشَةَ خَبَّرَتْ أَنَّهَا طَيَّبَتِ النَّبِيَّ ﷺ قَبْلَ نُزُولِ الْبَيْتِ.

**واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: گوێم لە ئیبنو زوبەیر بوو ﷺ دەیوت: (مِنْ سُنَّةٍ)، واتە: سوننەت وایە، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد، (فەرموودەکە بە چەند سەنەدێك**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

هاتووە) تەنها چەند پیت و شتێکی کەمیان لە یەکدی جیاوازە، وە فەرمووی: بێگومان حەڵاڵ بوو بۆی ئەوەی لەسەری حەرام کرابوو جگە لە خێزانەکانی تا تەوافی بەیت دەکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەمە تەواوە، ئەگەر بەردبارانی جەمرەی کرد هەموو شتێك بۆی حەڵاڵە جگە لە خێزانەکانی، چونکە عائیشە هەواڵی دا ئەو پێغەمبەری ﷺ بۆنخۆش کرد پێش دابەزینی بۆ کەعبە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ السُّنَّةَ الْغُدُوُّ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ لَا قَبْلَهُ

**٢٨٠٢-** عن جَعْفَر، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى بِنَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالصُّبْحَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلًا حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ لَهُ مِنْ شَعْرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةٍ، فَسَارَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةٍ فَنَزَلَ بِهَا[1].

### باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی سوننەت وایە سەرلەبەیانی لە میناوە بچێت بۆ عەرەفە، دوای دەرچوونی خۆر نەك پێش دەرچوونی

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: چووین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنهما، بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد، وتی: کاتێ کە ڕۆژی تەڕویە هات پێغەمبەری خوا ﷺ (ڕووی کردە مینا و) سواری وڵاخەکەی بوو، (تا گەیشتە مینا) نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشا و بەیانی بۆ کردین، پاشان کەمێك مایەوە تا خۆر دەرچوو، فەرمانی کرد چادرەکەی کە لە موو دروست کرابوو لە نەمیرە بۆی هەڵبدرێ، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە عەرەفە، بینی لە نەمیرە چادرەکەی بۆ هەڵدرابوو، لەوێ دابەزی بۆ پشوودان.

---

(١) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ مُحَمَّدًا النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا اتَّبَعَ خَلِيلَ اللَّهِ فِي غُدُوِّهِ مِنْ مِنًى حِينَ طَلَعَتِ الشَّمْسُ، إِذْ قَدْ أُمِرَ بِاتِّبَاعِهِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴿٩٠﴾ ﴾الأنعام، وَابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ قَدْ سَمِعَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو.**

**٢٨٠٣-** عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ رَجُلًا مِنْ قُرَيْشٍ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄: إِنِّي مُصَفَّفٌ مِنَ الْأَهْلِ وَالْحُمُولَةِ؛ إِنَّمَا حُمُولَتُنَا هَذِهِ الْحُمُرُ الدَّبَّابَةُ، أَفَأُفِيضُ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ؟ فَقَالَ: أَمَّا إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّهُ بَاتَ بِمِنًى، حَتَّى أَصْبَحَ وَطَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ سَارَ إِلَى عَرَفَةَ حَتَّى نَزَلَ مَنْزِلَهُ مِنْهَا ثُمَّ رَاحَ فَوَقَفَ مَوْقِفَهُ مِنْهُ، حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ أَفَاضَ فَأَتَى جَمْعًا فَنَزَلَ مَنْزِلَهُ مِنْهُ، ثُمَّ بَاتَ بِهِ حَتَّى إِذَا كَانَتْ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ الْمُعَجَّلَةِ، وَقَفَ حَتَّى إِذَا كَانَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ الْمُسْفِرَةِ أَفَاضَ فَتِلْكَ مِلَّةُ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ وَقَدْ أُمِرَ نَبِيُّكُمْ ﷺ أَنْ يَتَّبِعَهُ[1].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی موحەممەد ﷺ شوێنی ئیبراهیم (علیه السلام) کەوت لەوەی کە سەرلەبەیانی دەرچوو لە میناوە کاتێ خۆر هەڵهات، چونکە فەرمانی پێ کراوە شوێنی بکەوێت، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴿٩٠﴾ ﴾، واتە: ئا ئەمانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە.**

**ئیبنو ئەبو مولەیکەیش لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە بیستوویەتی**

واتە: ئیبنو ئەبو مولەیکە دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە قوڕەیش بە عەبدوڵای کوڕی عەمری ﵄ وت: من کاروباری ئەو کەسانە ڕایی دەکەم کە لەگەڵمدان و کەلوپەلیان لای منە و بارهەڵگرەکەشمان ئەو گوێدرێژانەن کە لە ڕۆیشتن سست و لاوازن، ئایە بە شەو لە موزدەلیفە دابەزم؟ وتی: بەڵام ئیبراهیم (علیه السلام) شەو لە مینا مایەوە، تا بەیانی کردەوە و ئەبرۆی خۆر دەرکەوت چوو بۆ عەرەفە تا لەوێ دابەزیە جێگاکەی خۆی، پاشان ڕۆیشت لە شوێنەکەی خۆی وەستا، تا خۆر ئاوا بوو، دابەزی هات بۆ موزدەلیفە، دابەزیە جێگاکەی خۆی، پاشان شەو لەوێ مایەوە تا نوێژی بەیانی کە دنیا تاریك بوو وەستا، تا کاتێ لە نوێژی بەیانی دنیا ڕووناك بۆیەوە، ئینجا دابەزی، ئەوە میللەتی باوکتان ئیبراهیمە، فەرمان کراوە بە پێغەمبەرەکەتان ﷺ شوێنی بکەوێت.

---

(١) لم نقف عليه.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي سُمِّيَتْ لَهَا عَرَفَةُ عَرَفَةَ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جِبْرِيلَ قَدْ أَرَى النَّبِيَّ ﷺ مُحَمَّدًا الْمَنَاسِكَ كَمَا أَرَى إِبْرَاهِيمَ خَلِيلَ الرَّحْمَنِ

**٢٨٠٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: أَتَى جِبْرِيلُ إِبْرَاهِيمَ يُرِيهِ الْمَنَاسِكَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: ثُمَّ دَفَعَ بِهِ حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ فَقَالَ لَهُ: أَعْرِفِ الْآنَ، وَأَرَاهُ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، وَفَعَلَ ذَلِكَ بِالنَّبِيِّ ﷺ[1].

## باسی هۆکاری ناونانی عەرەفە بە عەرەفە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی جبریل ڕێوڕەسمەکانی حەجی نیشانی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دا، وەکوو چۆن نیشانی ئیبراهیمی خۆشەویستی خوای دا

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێ: جبریل هات بۆ لای ئیبراهیم دروشم و ڕێوڕەسمەکانی حەجی پێ نیشان دا، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، وە وتی: پاشان بردی تا بەردبارانی جەمرەی کرد، پێی وت: ئێستا بزانە، وە هەموو ڕێوڕەسمەکانی پێ نیشان دا، جبریل بەهەمان شێوە نیشانی پێغەمبەریشی ﷺ دا.

## بَابُ ذِكْرِ التَّخْيِيرِ بَيْنَ التَّلْبِيَةِ وَبَيْنَ التَّكْبِيرِ فِي الْغُدُوِّ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ

**٢٨٠٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنهما قَالَ: غَدَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ، مِنَّا الْمُلَبِّي، وَمِنَّا الْمُكَبِّرُ[2].

## باسی بەندە سەرپشك كراوە لە نێوان تەلبیە و تەكبیركردن كاتێ سەرلەبەیانی لە میناوە بۆ عەرەفە دەچێ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە رضي الله عنهما دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سەرلەبەیانی لە میناوە دەرچووین بۆ عەرەفە، تیاماندا بوو تەلبیەی دەکرد، تیاشماندا بوو تەکبیر (الله أکبر)ی دەکرد.

---

(١) محمد بن عبد الرحمن بن أبي ليلى ضعيف، لكن للحديث شواهد.

(٢) صحيح.

## بَابُ التَّكْبِيرِ وَالتَّهْلِيلِ وَالتَّلْبِيَةِ فِي الْغُدُوِّ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ

**٢٨٠٦-** عَنِ ابْنِ سَخْبَرَةَ قَالَ: غَدَوْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ رَجُلًا آدَمَ، لَهُ ضَفِيرَتَانِ، عَلَيْهِ مَسْحَةُ أَهْلِ الْبَادِيَةِ، وَكَانَ يُلَبِّي، فَاجْتَمَعَ عَلَيْهِ غَوْغَاءٌ مِنْ غَوْغَاءِ النَّاسِ: يَا أَعْرَابِيُّ، إِنَّ هَذَا لَيْسَ بِيَوْمِ تَلْبِيَةٍ، إِنَّمَا هُوَ تَكْبِيرٌ قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ الْتَفَتَ إِلَيَّ، وَقَالَ: أَجَهِلَ النَّاسُ أَمْ نَسُوا؟ وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا بِالْحَقِّ لَقَدْ خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ، فَمَا تَرَكَ التَّلْبِيَةَ حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ الْعَقَبَةَ، إِلَّا أَنْ يَخْلِطَهَا بِتَهْلِيلٍ أَوْ تَكْبِيرٍ[1].

### باسی تەکبیر و تەهلیل و تەلبیەکردن،
### کاتێ سەرلەبەیانی لە میناوە دەچێت بۆ عەرەفە

واتە: ئیبنو سەخبەرە دەڵێ: بەیانیم کردەوە لەگەڵ عەبدوڵا لە میناوە بۆ عەرەفە، عەبدوڵا پیاوێك بوو ڕەش دەیروانی، دوو پەلکەی هەبوو، پۆشاکێکی جوانی دەشتنشینی لەبەردا بوو، لەو کاتەدا تەلبیەی دەکرد، کۆمەڵە خەڵکێکی ناحاڵی و ئاژاوەچی لێی کۆبوونەوە، وتیان: ئەی دەشتەکی، ئەمڕۆ ڕۆژی تەلبیە نییە، بەڵکوو ڕۆژی تەکبیرکردنە، وتی: لەو کاتەدا ئاوڕی دایەوە بۆ لام و وتی: ئایا ئەوانە نازانن یان بیریان چووە؟ سوێند بەوەی موحەممەدی ﷺ بەحەق ناردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم لە میناوە بۆ عەرەفە، وازی لە تەلبیە نەهێنا تا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، ئەوە نەبێ هەندێ جار تەهلیل و تەکبیریشی لەگەڵ تێکەڵ دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ خُطْبَةِ الْإِمَامِ بِعَرَفَةَ، وَوَقْتِ الْخُطْبَةِ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ

**٢٨٠٧-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي خَبَرِ ابْنِ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما: حَتَّى إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ خَطَبَ النَّاسَ، ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی وتاری ئیمام و پێشەوا لە عەرەفە، وە کاتی وتاردان لەو ڕۆژەدا

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی ئیبنو زوبەیر ﷺ هاتووە: تا کاتێ خۆر ترازا ئینجا وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا، پاشان نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کرد.

## بَابُ صِفَةِ الْخُطْبَةِ يَوْمَ عَرَفَةَ

**٢٨٠٨-** عَنْ حِزْيَمِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي خِطْبَتِهِ يَوْمَ عَرَفَةَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «اعْلَمُوا أَنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، وَكَحُرْمَةِ شَهْرِكُمْ هَذَا، وَكَحُرْمَةِ بَلَدِكُمْ هَذَا»[١].

## باسی چۆنییەتی وتاری ڕۆژی عەرەفە

واتە: حیزیەمی کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە حەجی ماڵئاواییدا لە ڕۆژی عەرەفە وتارێکی دا دەیفەرموو: بزانن لە ڕاستیدا خوێنتان، سامانتان، ناموستان لە نێوانتاندا حەرامە، وەکوو حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا، لەم وڵاتەتاندا.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا خَطَبَ بِعَرَفَةَ رَاكِبًا لَا نَازِلًا بِالْأَرْضِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ زَيْدِ بْنِ هَارُونَ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ، سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ قَالَ: خَطَبَ النَّاسَ بِعَرَفَةَ ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ

**٢٨٠٩-** عَن جَعْفَر بْن مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ فَأَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ، فَرُحِلَتْ لَهُ فَرَكِبَ حَتَّى أَتَى بَطْنَ الْوَادِي، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: «إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَلَا وَإِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ تَحْتَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ، وَدِمَاءَ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَأَوَّلُ دَمٍ أَضَعُهُ دِمَاؤُنَا: دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ كَانَ مُسْتَرْضَعًا فِي بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ، وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِبًّا أَضَعُهُ رِبَانَا رِبَا

---

(١) صحيح من غير هذا الوجه.

الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؛ فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ اتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ، وَإِنَّ لَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَإِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ كِتَابَ اللَّهِ، وَأَنْتُمْ مَسْئُولُونَ عَنِّي مَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟» فَقَالُوا: نَشْهَدُ إِنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ رِسَالَاتِ رَبِّكَ، وَنَصَحْتَ لِأُمَّتِكَ، وَقَضَيْتَ الَّذِي عَلَيْكَ، فَقَالَ «بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ، وَيُنَكِّسُهَا إِلَى النَّاسِ اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ النِّكَاحِ أَنَّ قَوْلَهُ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، إِنَّمَا أَرَادَ وَطْءَ الْفِرَاشِ بِالْأَقْدَامِ، كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا تَجْلِسْ عَلَى تَكْرُمَتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ، وَفِرَاشُ الرَّجُلِ تَكْرِمَتُهُ وَلَمْ يَرِدْ مَا يَتَوَهَّمُهُ الْجُهَّالُ إِنَّمَا أَرَادَ وَطْءَ الْفُرُوجِ.

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە وتاری دا بەسەر وڵاخەوە نەك لەسەر زەوی، ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی زەیدی کوڕی هارون، لە یەحیای کوڕی سەعید، لە قاسمەوە هاتووە: گوێم لە ئیبنو زوبەیر بوو وتی: پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە وتاری بۆ خەڵکەکە دا، پاشان دابەزی نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردەوە

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد سەبارەت بە حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە عەرەفە، (دەوارەکەی بینی لە «نَـمِرَةَ» بۆی هەڵدرابوو، لەوێ مایەوە) هەتا خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا، فەرمانی کرد وشترەکەی (کە نازناوی) ئەلقەصواء بوو بۆی ئامادە کرا، سوار بوو کەوتە ڕێ تا گەیشتە نێو شیوەکە (شوێنێك بوو لە عەرەفات پێی دەوترا عەرنە، عەرەفاتیش نەبوو) لەوێ وتاری بۆ خەڵکەکە دا، پاشان فەرمووی: بەڕاستی خوێن و ماڵتان لەسەر یەکدی قەدەغەیە، وەکوو چۆن ئەمڕۆ قەدەغەیە، لەم مانگەتاندا و لەم شارەتاندا، ئاگادار بن هەرچی شتی نەفامی هەیە دەیخەمە ژێری ئەم پێیانەم، وە خوێنی سەردەمی نەفامی بەفیڕۆ چووە، وە یەکەم خوێنێك کە وازی لێ دەهێنم لە خوێنەکانمان خوێنی ڕەبیعەی کوڕی حاریسە (کە ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ بوو)

---

(١) صحيح.

شیرەخۆرە بوو لەلای نەوەکانی سەعد، هۆزی هوزەیل کوشتیان، وە ڕیبای سەردەمی نەفامی بەفیڕۆ چوو، یەکەم ڕیبایەك لایدەبەم ڕیبای عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە، بەڕاستی هەموو ئەوانە بەفیڕۆ چوون، لە خوا بترسن لە مامەڵەکردنتان لەگەڵ ئافرەتاندا، چونکە ئێوە بە ئەمانەتی خوا وەرتانگرتوون، وە بەکتێبی خوا ﷻ داوێنیانتان حەڵاڵ کردووە، وە مافی ئێوەیش لەسەر ئەوان ئەوەیە خەڵکێك نەهێننە ماڵەکەتان کە ئێوە پێتان ناخۆشە، ئەگەر کاری لەو جۆرەیان کرد ئازاریان بدەن بەڵام با بریندارکەر نەبێت، مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە بە چاکترین شێوە ڕزق و ڕۆزییان بدەن و پۆشاکیان بۆ بکەن، بەڕاستی لەنێو ئێوەدا شتێکم بەجێ هێشتووە ئەگەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن ئەویش کتێبی خوایە، پرسیار لە ئێوەیش دەکرێت دەربارەی من ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: شایەتی دەدەین کە بەڕاستی پەیامی پەروەردگارت گەیاندووە و ئامۆژگاری ئوممەتەکەت کردووە، ئەوەی لە ئەستۆت بووە گەیاندووتە، ئەویش پەنجەی شایەتمانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی (النِّكَاحِ)دا ڕوونم کردەوە فەرموودەکەی: با خێزانەکانتان، هیچ کەس نەهێننە سەر جێگاکەتان کە ئێوە پێتان ناخۆشە. مەبەستی چوونە سەر جێگاوبانەکانە بەپێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با لەسەر جێگاکەی دانەنیشێ مەگەر بە ئیزنی خاوەنەکەی. وە جێگای پیاو ماڵەکەیەتی کە جێگای ڕێزلێنانی میوانەکانە، مەبەستی جووتبوون نییە وەك هەندێ لە نەفامەکان تێی گەیشتوون. (بەپوختی مەبەست لە فەرموودەکە ئەوەیە با هیچ ئافرەتێك بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی میوان نەهێنێتە ماڵ).

## بَابُ قَصْرِ الْخُطْبَةِ يَوْمَ عَرَفَةَ

٢٨١٠- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، جَاءَ لِلْحَجَّاجِ بْنِ يُوسُفَ يَوْمَ عَرَفَةَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، وَأَنَا مَعَهُ، فَقَالَ: الرَّوَاحُ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، فَقَالَ: هَذِهِ السَّاعَةُ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ سَالِمٌ: فَقُلْتُ لِلْحَجَّاجِ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ أَنْ تُصِيبَ الْيَوْمَ السُّنَّةَ فَأَقْصِرِ الْخُطْبَةَ وَعَجِّلِ الصَّلَاةَ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: صَدَقَ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی کورتکردنەوەی وتار لە ڕۆژی هەینی

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ هات بۆ لای حەجاجی کوڕی یوسف لە ڕۆژی عەرەفە کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا، منیش لەگەڵی بووم، وتی: کاتی دەرچوونە بۆ عەرەفە، ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ، وتی: ئێستا؟ وتی بەڵێ، سالم وتی: ئەگەر تۆ دەتەوێ شوێنی سوننەت بکەویت وتارەکەت کورت بکەرەوە و زوو نوێژەکە بکە (واتە: نوێژی عەسر بهێنە پاڵ نیوەڕۆ و پێکەوە ئەنجامیان بدە)، عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: ڕاستی کرد.

## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِعَرَفَةَ، وَالْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لَهُمَا

**٢٨١١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِعَرَفَاتٍ بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَيْنِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَيْنِ(١).

## باسی کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە لە عەرەفە، وە بانگدان و قامەتکردنیش بۆیان

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردەوە بە بانگێك و دوو قامەت، وە لە موزدەلیفەیش نوێژی ئێوارە و عیشای کۆ کردەوە بە بانگێك و دوو قامەت.

## بَابُ تَرْكِ التَّنَفُّلِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا بِعَرَفَةَ، وَوَقْتِ الرَّوَاحِ إِلَى الْمَوْقِفِ

**٢٨١٢-** عَنْ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: فَخَطَبَ، ثُمَّ أَذَّنَ بِلَالٌ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، لَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی وازهێنان لە نوێژی سوننەت لە نێوان نیوەڕۆ و عەسر، ئەگەر پێکەوە لە عەرەفە کۆیانی کردەوە، وە کاتی دەرچوون بۆ خاکی عەرەفە

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: چووین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد، وە وتی: پێغەمبەر ﷺ وتاری دا، پاشان بیلال بانگی دا، پاشان قامەتی کرد، نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان قامەتی کرد، نوێژی عەسری کرد، لە نێوانیاندا هیچ نوێژێکی (سوننەتی) نەکرد، پاشان سواری ئەلقەصواء (نازناوی وشترەکەی پێغەمبەرە ﷺ) بوو تا گەیشتە خاکی عەرەفە (الْمَوْقِفَ) (شوێنی وەستانە لە عەرەفە).

### بَابُ التَّهْجِيرِ بِالصَّلَاةِ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَتَرْكِ تَأْخِيرِ الصَّلَاةِ بِهَا

**٢٨١٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّ سَالِمًا، أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يُصَلِّي بِأَهْلِ مَكَّةَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُومُونَ فَيُتِمُّونَ صَلَاتَهُمْ، وَإِنَّ سَالِمًا قَالَ لِلْحَجَّاجِ عَامَ نَزَلَ بِابْنِ الزُّبَيْرِ الْحَجَّاجُ، فَكَلَّمَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَنْ يُرِيَهُ كَيْفَ يَصْنَعُ فِي الْمَوْقِفِ قَالَ سَالِمٌ: فَقُلْتُ لِلْحَجَّاجِ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ فَهَجِّرْ بِالصَّلَاةِ فِي يَوْمِ عَرَفَةَ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَدَقَ، وَإِنَّهُمْ كَانُوا يَجْمَعُونَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي السُّنَّةِ يَوْمَ عَرَفَةَ فَقُلْتُ لِسَالِمٍ: أَفَعَلَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ فَقَالَ: إِنَّمَا يَتَّبِعُونَ سُنَّتَهُ(١).

### باسی ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە لە عەرەفە لە کاتی نیوەڕۆدا، وە وازهێنان لە دواخستنیان بۆ کاتی عەسر

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، سالم هەواڵی پێ دا لە باوکیەوە وتی: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دوو ڕکات نوێژی بۆ خەڵکی مەککە دەکرد، پاشان سەلامی ئەدایەوە، پاشان ئەوان هەڵدەسان نوێژەکەیان تەواو دەکرد، سالم بە حەجاجی وت: لەوساڵەی حەجکەران دابەزین بۆ لای ئیبنو زوبەیر، حەجاج قسەی لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر کرد پێی نیشان بدات لە زەوی عەرەفە چی بکات، سالم وتی: بە حەجاجم وت:

---

(١) صحيح.

ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ لە ڕۆژی عەرەفە نوێژی عەسر بهێنە پاڵ نیوەڕۆ و پێکەوە کۆیان بکەرەوە، عەبدوڵا وتی: ڕاستی کرد، ئەوان لە ڕۆژی عەرەفە نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان پێکەوە کۆ دەکردەوە، بە سالمم وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوەی دەکرد؟ وتی: بێگومان ئەوان شوێنی سوننەت دەکەوتن.

## بَابُ تَعْجِيلِ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ

**٢٨١٤-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَتَبَ عَبْدُ الْمَلَكِ بْنُ مَرْوَانَ إِلَى الْحَجَّاجِ بْنِ يُوسُفَ يَأْمُرُهُ أَنْ لَا يُخَالِفَ ابْنَ عُمَرَ ﷺ فِي أَمْرِ الْحَجِّ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ جَاءَهُ ابْنُ عُمَرَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، وَأَنَا مَعَهُ، فَصَاحَ عِنْدَ سُرَادِقِه، أَيْنَ هَذَا؟ فَخَرَجَ إِلَيْهِ الْحَجَّاجُ وَعَلَيْهِ مَلْحَفَةٌ، فَقَالَ لَهُ: مَا لَكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: الرَّوَاحَ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، فَقَالَ: نَعَمْ أُفِيضُ عَلَيَّ مَاءً، ثُمَّ أَخْرُجُ إِلَيْكَ، فَانْتَظَرَهُ حَتَّى خَرَجَ فَسَارَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَبِي، فَقُلْتُ لَهُ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ أَنْ تُصِيبَ السُّنَّةَ فَاقْصُرِ الْخُطْبَةَ، وَعَجِّلِ الْوُقُوفَ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى ابْنِ عُمَرَ كَيْمَا يَسْمَعَ ذَلِكَ مِنْهُ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ ابْنُ عُمَرَ قَالَ: صَدَقَ[1].

### باسی پەلەکردن لە وەستان لە عەرەفە

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەڵێ: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان نووسراوی کرد بۆ حەجاجی کوڕی یوسف پێی ڕاگەیاند پێچەوانەی ئیبنو عومەر ﷺ نەکات لە کارو باری حەجدا، کاتێ ڕۆژی عەرەفە هات، ئیبنو عومەر هات بۆ لای کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازابوو دوای نیوەڕۆ منیش لەگەڵی بووم، لای ڕەشماڵی حاجییەکانەوە هاواری کرد: ئەمە لە کوێیە؟ حەجاج هاتە دەرەوە بۆ لای بە جلێکی ڕەنگاوڕەنگەوە پێی وت: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان ئەوە چییە؟ وتی: کاتی دەرچوونە بۆ عەرەفە ئەگەر تۆ سوننەتت دەوێ، وتی بەڵێ، ئاوێ ئەکەم بەخۆمدا پاشان دێم بۆ لات، ئەویش چاوەڕوانی کرد تا دەرچوو، لە نێوانی من و باوکمدا ڕێی دەکرد، پێم وت: ئەگەر تۆ دەتەوێ سوننەت بپێکی وتارەکەت کورت بکەرەوە و پەلە بکە لە وەستان لە عەرەفە، تەماشای ئیبنو عومەری دەکرد بەڵکوو ئەوە لە ئەوەوە ببیستێ، کاتێ ئیبنو عومەر هەستی بەوە کرد، وتی: ڕاستی کرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ، وَالرُّخْصَةِ لِلْحَاجِّ أَنْ يَقِفُوا حَيْثُ شَاءُوا مِنْهُ، وَجَمِيعُ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ

٢٨١٥- عَنْ جَعْفَر، حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ فَقَالَ: «وَقَفْتُ هَهُنَا، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ»[١].

## باسی وەستان لە چیای عەرەفە، وە مۆڵەت دراوە بۆ حەجکەران لە هەر شوێنێ بیانەوێ بوەستن، چونکە هەموو عەرەفە شوێنی وەستانە بۆ حەج

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدولا ﵄، پرسیارمان لێ کرد دەربارەی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە وەستا، فەرمووی: ئا لێرە وەستام، (لە نزیك تاشەبەردەکانی عەرەفە) عەرەفەیش هەمووی شوێنی وەستانە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْوُقُوفِ بِعُرَنَةَ

٢٨١٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ارْفَعُوا عَنْ بَطْنِ عُرَنَةَ وَارْفَعُوا عَنْ بَطْنِ مُحَسِّرٍ»[٢].

## باسی سەرزەنشتکردن لە وەستان لەسەر عورەنە (کە شوێنێکە لە عەرەفە)

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرز ببنەوە لە شیوی عورەنە، وە بەرز ببنەوە لە شیوی موحەسیر.

تێبینی: (مُحَسِّر): شیوێکە لە نێوان موزدەلیفە و مینا.

٢٨١٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ كَانَ يُقَالُ: ارْتَفَعُوا عَنْ مُحَسِّرٍ وَارْتَفِعُوا عَنْ عُرَنَاتٍ أَمَّا قَوْلُهُ الْعُرَنَاتُ فَالْوُقُوفُ بِعُرَنَةَ أَلَّا يَقِفُوا بِعُرَنَةَ وَأَمَّا قَوْلُهُ عَنْ مُحَسِّرٍ فَالنُّزُولُ بِجَمْعٍ أَيْ لَا تَنْزِلُوا مُحَسِّرًا[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: دەوترا: بەرز ببنەوە لە موحەسیر، وە بەرز ببنەوە لە عورەنات. بەڵام وتەکەی: (الْعُرَنَاتُ) وەستان لە عورەنە، مانای ئەوەیە لە عورەنە نەوەستن، بەڵام وتەکەی: (عَنْ مُحَسِّرٍ) ئەوە با دابەزنە موزدەلیفە، واتە: دانەبەزنە موحەسیر.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْوُقُوفَ بِعَرَفَةَ مِنْ سُنَّةِ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلِ الرَّحْمَنِ وَأَنَّهُ إِرْثٌ عَنْهُ، وَرِثَهَا أُمَّةُ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ ﷺ

**٢٨١٨-** عَنْ سُفْيَان قَالَ: حَفِظْتُهُ مِنْ عَمْرٍو، عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ، قَال أَخْبَرَنَا يَزِيدُ بْنُ شَيْبَانَ ﷺ، -وَهُوَ أَخْوَالُهُ- قَالَ: أَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ الْأَنْصَارِيُّ وَنَحْنُ وُقُوفٌ بِعَرَفَةَ خَلْفَ الْمَوْقِفِ -مَوْضِعٍ يَبْعُدُهُ عَمْرٌو عَنِ الْمَوْقِفِ-، فَقَالَ: إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ إِلَيْكُمْ[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی وەستان لە عەرەفە لە سوننەت و ڕێبازی ئیبراهیمی خۆشەویستی خوایە، وەکوو میراتییەك لە ئەوەوە ماوەتەوە بۆ ئوممەتی موحەممەد ﷺ

واتە: سوفیان دەڵێ: لە عەمرەوە لەبەرم کرد، لە عەمری کوڕی عەبدوڵای کوڕی صەفوانەوە، دەڵێ: یەزیدی کوڕی شەیبان ﷺ -کە خاڵیەتی- هەواڵی پێ داین وتی: ئیبنو میربەعی ئەنصاری هات بۆ لامان ئێمە لە عەرەفە وەستابووین لە پشتی (الْمَوْقِف) (کە جێگای وەستانە لە عەرەفە) -شوێنێکە عەمر (ی کوڕی عەبدوڵا) پێی وا بوو دوورە لە (الْمَوْقِف)ەوە-، وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ لاتان.

**٢٨١٩-** عَنْ سفيان، عَنْ عَمْرٍو، -وهو بن دينار- عن عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ، عن خاله يَزِيد بْنِ شَيْبَانَ ﷺ قَالَ كُنَّا وُقُوفًا مِنْ وَرَاءِ الْمَوْقِفِ -مَوْقِفًا يَتَبَاعَدُهُ عَمْرٌو مِنَ الْإِمَامِ- فَأَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ الْأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ إِلَيْكُمْ يَقُولُ لَكُمْ: «كُونُوا عَلَى مَشَاعِرِكُمْ هَذِهِ فَإِنَّكُمْ عَلَى إِرْثٍ مِنْ إِرْثِ إِبْرَاهِيمَ»[2].

واتە: سوفیان دەگێڕێتەوە، لە عەمری کوڕی دینارەوە، لە عەمری کوڕی عەبدوڵای کوڕی صەفوانەوە، لە خاڵیەوە یەزیدی کوڕی شەیبان ﷺ دەڵێ: ئێمە لە پشتی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(الْمَوْقِفِ)وە وەستابووین، شوێنێك بوو عەمر پێی وا بوو دووره لە ئیمامەوە- ئیبنو میربەعی ئەنصاری هات بۆ لامان وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ لاتان، فەرموویەتی: لە شوێنەکانی خۆتان بمێننەوە چونکە ئێوە لە شوێنی بابیرەتان ئیبراهیم وەستاون.

## بَابُ ذِكْرِ وَقْتِ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُفِيضَ مِنْ عَرَفَةَ بَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ مِنْ لَيْلَةِ النَّحْرِ مُدْرِكٌ لِلْحَجِّ غَيْرُ فَائِتِ الْحَجِّ، ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُفِيضَ مِنْ عَرَفَةَ الْخَارِجَ مِنْ حَدِّهَا قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ لَيْلَةَ النَّحْرِ فَائِتُ الْحَجِّ، إِذَا لَمْ يَرْجِعْ فَيَدْخُلَ حَدَّ عَرَفَةَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ مِنَ النَّحْرِ.

**٢٨٢٠**- عَنِ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسِ بْنِ أَوْسِ بْنِ حَارِثَةَ بْنِ لَامٍ الطَّائِيُّ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ بِجَمْعٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَيْتُكَ مِنْ جَبَلِ طَيِّئٍ أَنْصَبْتُ رَاحِلَتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللَّهِ مَا تَرَكْتُ مِنْ حَبَلٍ إِلَّا وَقَفْتُ عَلَيْهِ فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ، فَقَالَ ﷺ: «مَنْ صَلَّى مَعَنَا هَذِهِ الصَّلَاةَ، وَوَقَفَ مَعَنَا هَذَا الْمَوْقِفَ، فَأَفَاضَ قَبْلَ ذَلِكَ مِنْ عَرَفَاتٍ لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ»[١].

## باسی کاتی وەستان لە عەرەفە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی لە عەرەفە دەگەڕێتەوە دوای ترازانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان پێش خۆرئاوابوون لە شەوی جەژنی قوربان گەیشتووە بە حەجدا و حەجی لەدەست نەچووە، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە ئەوەی لە عەرەفە گەڕایەوە لە دەرەوەی سنووری خۆی پێش خۆرئاوابوون لە شەوی جەژنی قوربان حەجی لەدەست چووە، ئەگەر نەگەڕێتەوە و نەچێتە سنووری عەرەفە پێش دەرچوونی بەرەبەیان لە ڕۆژی جەژن

واتە: عورووەی کوڕی موزەریسی کوڕی ئەوسی کوڕی حاریسی کوڕی لامی تائی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو لە موزدەلیفە بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە چیای طەیئەوە هاتووم وشترەکەم ماندوو کردووە و خۆشم ماندوو بووم، سوێند بە خوا هیچ تەپۆڵکەیەکم بەجێ نەهێشتووە حەتمەن لەسەری وەستاوم، جا ئایا حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس ئەم نوێژەی لەگەڵمان کرد (نوێژی

---

(١) صحيح.

بەیانی) و لەگەڵمان وەستا لەم جێگایە، پێش ئەوەش لە عەرەفە هاتبێتە خوارەوە بە شەو بێت یان ڕۆژ، ئەوە حەجەکەی تەواوە و ڕێوڕەسمەکانی بەجێ هێناوە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ هَذِهِ الصَّلَوَاتِ الَّتِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صَلَّى مَعَنَا هَذِهِ الصَّلَاةَ» كَانَتْ صَلَاةَ الصُّبْحِ لَا غَيْرَهَا

**٢٨٢١-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ رضي الله عنه يَقُولُ: كُنْتُ أَوَّلَ الْحَاجِّ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ بِالْمُزْدَلِفَةِ فَخَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ حِينَ بَرَقَ الْفَجْرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَتَيْتُكَ مِنْ جَبَلِ طَيِّئٍ وَقَدْ أَكْلَلْتُ رَاحِلَتِي وَأَنْصَبْتُ نَفْسِي فَمَا تَرَكْتُ مِنْ حَبَلٍ إِلَّا وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «مَنْ شَهِدَ الصَّلَاةَ مَعَنَا، ثُمَّ وَقَفَ مَعَنَا حَتَّى نُفِيضَ، وَقَدْ وَقَفَ قَبْلَ ذَلِكَ بِعَرَفَاتٍ لَيْلًا أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ قَضَى تَفَثَهُ، وَتَمَّ حَجُّهُ»[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی ئەم نوێژانەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَنْ صَلَّى مَعَنَا هَذِهِ الصَّلَاةَ)، واتە: هەر کەس ئەم نوێژە لەگەڵمان بکات، نوێژی بەیانییە نەك نوێژێکی دیکە

واتە: عوروەی کوڕی موزەریس رضي الله عنه دەڵێ: من یەکەمین حەجکەر بووم، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو لە موزدەلیفە بوو، کاتێ بەرەبەیان دەرکەوت دەچوو بۆ نوێژ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لە چیای تەیئەوە هاتووم بۆ خزمەتت وشترەکەم ماندوو کردووە و خۆشم ماندوو بووم، سوێند بە خوا هیچ چیایەکم بەجێنەهێشتووە حەتمەن لەسەری وەستاوم، جا ئایا حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس ئەم نوێژەی لەگەڵمان کرد (بەیانی)، پاشان لەگەڵمان وەستا لەم جێگایە (واتە: موزدەلیفە) تا دادەبەزینە خوارەوە، پێش ئەوە لە عەرەفە وەستابوو بە شەو بێت یان ڕۆژ، ئەوە حەجەکەی تەواوە و ڕێوڕەسمەکانی بەجێ هێناوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَاجَّ إِذَا لَمْ يُدْرِكْ عَرَفَةَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ مِنْ يَوْمِ النَّحْرِ فَهُوَ فَائِتُ الْحَجِّ غَيْرُ مُدْرِكِهِ

**٢٨٢٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمُرَ رضي الله عنه قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِعَرَفَةَ، وَأَتَاهُ أُنَاسٌ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، وَهُمْ بِعَرَفَةَ فَسَأَلُوهُ فَأَمَرَ مُنَادِيًا، فَنَادَى، الْحَجُّ عَرَفَةُ مَنْ جَاءَ لَيْلَةَ جَمْعٍ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ فَقَدْ

---

(١) صحيح.

أَدْرَكَ الْحَجَّ، أَيَّامُ مِنًى ثَلَاثَةٌ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ، فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ، وَأَرْدَفَ رَجُلًا يُنَادِي[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ الْحَجُّ عَرَفَةُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ أَنَّ الِاسْمَ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ أَجْزَاءِ الشَّيْءِ ذِي الشُّعَبِ وَالْأَجْزَاءِ، قَدْ أَوْقَعَ النَّبِيُّ ﷺ اسْمَ الْحَجِّ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ عَلَى عَرَفَةَ، أَرَادَ الْوُقُوفَ بِهَا وَلَيْسَ الْوُقُوفُ بِعَرَفَةَ جَمِيعَ الْحَجِّ إِنَّمَا هُوَ بَعْضُ أَجْزَائِهِ لَا كُلُّهُ، وَقَدْ بَيَّنْتُ مِنْ هَذَا الْجِنْسِ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ مَا فِيهِ الْغُنْيَةِ وَالْكِفَايَةِ لِمَنْ وَفَّقَهُ اللَّهُ لِلرَّشَادِ وَالصَّوَابِ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی حاجی ئەگەر نەگات بە عەرەفە پێش دەرچوونی بەرەبەیان لە ڕۆژی جەژن ئەوە حەجەکەی لەدەست چووە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەعمور ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە، خەڵکانێکیش لە نەجدەوە هاتبوون، ئەوان لە عەرەفە بوون، پرسیاریان لێ کرد دەربارەی عەرەفە، ئەویش فەرمانی کرد بە کەسێك بەنێو خەڵکدا بانگ بکات، حەج عەرەفەیە هەر کەس بە شەوی جەمع (واتە: بە شەوی موزدەلیفە) ڕابگات پێشی نوێژی بەیانی ئەوە گەیشتووە بە حەج، ڕۆژانی مینا سێ ڕۆژن ئەوەی پەلە بکات لە دوو ڕۆژدا شەیتان ڕەجم بکات ئەوە هیچ گوناهی لەسەر نییە، ئەوەیشی کە دوای بخات (و بە سێ ڕۆژ ئەنجامی دەدات) هەر گوناهی لەسەر نییە. پیاوێکیش لە پشتیەوە سوار بوو بەنێو خەڵکەکەدا بانگی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (الْحَجُّ عَرَفَةُ) لەو شێوازەیە کە لە کتێبی (الْإِيمَان) ڕامگەیاند، ناو بە ناسراوی هەندێ جار بۆ بەش و لقەکانی ئەو شتانە بەکار دێت، بێگومان پێغەمبەر ﷺ ناوی حەجی هێناوە بەناسراوی لەسەر عەرەفە، مەبەستی پێی وەستانە لە عەرەفە، وەستانیش لە عەرەفە بریتی نییە لە هەموو حەج، بەڵکوو هەندێ لە لقەکانیەتی نەك هەمووی، وە لە کتێبی (الْإِيمَان) ئەم شێوازەم ڕوون کردەوە کە بەسە بۆ ئەو کەسەی خوا سەربەرزی کردبێت بۆ زانینی ڕاستییەکان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ عَلَى الرَّوَاحِلِ

**٢٨٢٣-** عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﵁ قَالَ: كَانَتْ قُرَيْشٌ إِنَّمَا تَدْفَعُ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ، وَيَقُولُونَ: نَحْنُ الْحُمْسُ، فَلَا نَخْرُجُ مِنَ الْحَرَمِ، وَقَدْ تَرَكُوا الْمَوْقِفَ عَلَى عَرَفَةَ قَالَ: فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَقِفُ مَعَ النَّاسِ بِعَرَفَةَ عَلَى جَمَلٍ لَهُ، ثُمَّ يُصْبِحُ مَعَ قَوْمِهِ بِالْمُزْدَلِفَةِ فَيَقِفُ مَعَهُمْ يَدْفَعُ إِذَا دَفَعُوا[١].

## باسی وەستان لە عەرەفە بەسەر وڵاخەوە

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﵁ دەڵێ: قورەیش دەردەچوون بۆ موزدەلیفە و دەیانوت: ئیمە (الْحُمْسُ)ین (واتە: قورەیش، بۆیە ناونراون بە (الْحُمْسُ) چونکە بەتوندی دەستیان بە ئایینەکەیانەوە گرتبوو)، لە حەرەم دەرناچین، ئەوان وازیان لە وەستانی عەرەفە هێنابوو، (بەڵام هەموو عەرەب جگە لە ئەوان لەسەری دەوەستان)، وتی: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ لە سەردەمی نەفامی لەگەڵ خەڵکەکە لە عەرەفە دەوەستا بەسەر وشترێکەوە، پاشان بەیانی دەکردەوە لەگەڵ قەومەکەی لە موزدەلیفە لەگەڵیان دەوەستا کاتێ دەربچووایەن دەردەچوو.

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الدُّعَاءِ عِنْدَ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ، وَإِبَاحَةِ رَفْعِ إِحْدَى الْيَدَيْنِ إِذَا احْتَاجَ الرَّاكِبُ إِلَى حِفْظِ الْعِنَانِ أَوِ الْخِطَامِ بِإِحْدَى الْيَدَيْنِ

**٢٨٢٤-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَرَفَاتٍ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَمَالَتْ بِهِ نَاقَتُهُ فَسَقَطَ خِطَامُهَا، فَتَنَاوَلَ الْخِطَامَ بِإِحْدَى يَدَيْهِ، وَهُوَ رَافِعٌ يَدَهُ الْأُخْرَى[٢].

## باسی دەستبەرزکردنەوە بە مەبەستی پاڕانەوە لە کاتی وەستان لە عەرەفە، وە ڕێگەدان بە بەرزکردنەوەی یەکێك لە دەستەکان ئەگەر پێویستی کرد سوار بە دەستەکەی دیکەی ڕەشمەی وشترەکەی بگرێت

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷻ دەڵێ: من لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ بووم بەسواری وشتر لە عەرەفات، دەستەکانی بەرز کردەوە و پاڕایەوە، وشترەکەی لاری کردەوە، بە جۆرێك ڕەشمەکەی بەربۆیەوە بە دەستێکی ڕەشمەی وشترەکەی گرت دەستەکەیدیکەشی بڵند کردبۆیەوە بۆ نزا.

**٢٨٢٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷻ قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَاتٍ، وَرِدْفُهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: فَمَالَتْ بِهِ النَّاقَةُ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ مَا تُجَاوِزَانِ رَأْسَهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى جَمْعٍ وَأَفَاضَ مِنْ جَمْعٍ، وَرِدْفُهُ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ، فَقَالَ الْفَضْلُ: مَا زَالَ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ(١).

واتە: ئیبنو عەباس ﷻ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفات گەڕایەوە، ئوسامەی کوڕی زەید لە پشتیەوە بوو، وتی: وشترەکەی لاری کردەوە لە کاتێکدا هەردوو دەستی بەرز کردبۆیەوە لەسەری بەرزتر نەبوون، تا گەیشتە موزدەلیفە، ئینجا لە موزدەلیفە گەڕایەوە فەزلی کوڕی عەباس لە پشتیەوە بوو، فەزل وتی: بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا بەردبارانی جەمرەی کرد.

## بَابُ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ عِنْدَ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ

**٢٨٢٦-** عن جَعْفَر، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرٍ ﷺ فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبَلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلًا حِينَ غَابَ الْقُرْصُ(٢).

## باسی ڕووکردنە قیبلە لە کاتی وەستان لە عەرەفە

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: چووین بۆ لای جابر ﷺ وتم: هەواڵم بدەرێ دەربارەی حەجی پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد، وتی: پاشان پێغەمبەر ﷺ سەرکەوت هەتا گەیشتە شوێنی تایبەتی خۆی لە عەرەفە، جا

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

سکی وشترەکەی دابوو لە تەنیشت بەردەکان، خەڵکەکەیش لە پێشی بوون، وە ڕووی کردە قیبلە و ڕاوەستا بەردەوام وەستابوو هەتا خۆر ئاوا بوو، تۆزێك زەردایی مابوو، سوورایی خوریش دیار نەمابوو.

## بَابٌ فِي فَضْلِ يَوْمِ عَرَفَةَ وَمَا يُرْجَى فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْمَغْفِرَةِ

**٢٨٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرُ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَأَنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي الْمَلَائِكَةَ وَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلَاءِ؟»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژی عەرەفە و ئەوەشی ئومێدی پێ دەکرێ لە لێخۆشبوونی خوا لەو ڕۆژەدا

واتە: عائیشە﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ڕۆژێك نییە ئەوەندەی ڕۆژی عەرەفە خوا بەندەی تێدا ئازاد بکات لە ئاگر، بێگومان خوا نزیك دەبێتەوە، پاشان فەزڵ و ڕێزی حەجکاران دەردەخات بۆ فریشتەکان (واتە: بەسۆز و میهرەبانی خۆی لێیان نزیك دەبێتەوە)، وە دەفەرموێ: ئەوانە چییان دەوێ (کە ماڵ و سامان و وڵاتیان جێ هێشتووە جگە لە لێخۆشبوونی خوا و نزیکبوونەوە لێی).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْفِطْرِ يَوْمَ عَرَفَةَ بِعَرَفَاتٍ تَقَوِّيًا عَلَى الدُّعَاءِ

**٢٨٢٨-** عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحَارِثِ، أَنَّ، نَاسًا، تَمَارَوْا عِنْدَ أُمِّ الْفَضْلِ يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صَوْمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ هُوَ صَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلَتْ أُمُّ الْفَضْلِ بِقَدَحِ لَبَنٍ، وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ فَشَرِبَ هُوَ يَوْمَئِذٍ بِعَرَفَةَ[٢].

## باسی چاکتر وایە بۆ بەندە لە ڕۆژی عەرەفە لەسەر چیای عەرەفات بەڕۆژوو نەبێت تا توانای هەبێ لەسەر پاڕانەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عومەیر مەولای ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، لە ئوممو فەزلی کچی حاریسەوە، خەڵکێك لە ڕۆژی عەرەفە بوو بە مشتومڕیان لەلای ئوممو فەزل دەربارەی ڕۆژووگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەندێکیان وتیان: بەڕۆژووە، هەندێکی دیکەیان وتیان: بەڕۆژوو نییە، ئوممو فەزل پەرداخێك شیری بۆی نارد، لە کاتێکدا ئەو وەستابوو بەسەر وشترەکەیەوە، لە شیرەکەی خواردەوە، ئەو ڕۆژە لەسەر عەرەفە بوو.

**٢٨٢٩**- عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ[١].

واتە: مەیمونەیش ﵂ بەهەمان شێوە دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّلْبِيَةِ بِعَرَفَاتٍ وَعَلَى الْمَوْقِفِ إِحْيَاءً لِلسُّنَّةِ إِذْ بَعْضُ النَّاسِ قَدْ كَانَ تَرَكَهُ فِي بَعْضِ الْأَزْمَانِ

**٢٨٣٠**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ لِي: يَا سَعِيدُ مَا لِي لَا أَسْمَعُ النَّاسَ يُلَبُّونَ؟ فَقُلْتُ: يَخَافُونَ مِنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: فَخَرَجَ ابْنُ عَبَّاسٍ مِنْ فُسْطَاطِهِ، فَقَالَ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ تَرَكُوا السُّنَّةَ مِنْ بُغْضِ عَلِيٍّ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ بَيَانٌ أَنَّهُ كَانَ يُلَبِّي بِعَرَفَاتٍ.

## باسی سوننەت وایە بۆ بەندە لە عەرەفە و لەو شوێنەی دەوەستێ لە عەرەفە تەلبیە بکات، چونکە هەندێ لە خەڵك لە هەندێ سەردەمدا وازیان لێهێناوە

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئێمە لەگەڵ ئیبنو عەباس ﵄ بووین لە عەرەفە، پێمی وت: ئەی سەعید ئەوە چییە نابیستم خەڵکی تەلبیە بکەن؟ وتم: لە موعاویە دەترسن، وتی: ئیبنو عەباس هاتە دەرەوە لە دەوارەکەی، وتی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)، چونکە ئەوان وازیان لە سوننەت هێناوە لە ڕقی عەلی.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە ئەو بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا بەردبارانی جەمرەی دەکرد، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو لە عەرەفە تەلبیەی دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ إِبَاحَةِ الزِّيَادَةِ عَلَى التَّلْبِيَةِ فِي الْمَوْقِفِ بِعَرَفَةَ بِأَنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الْآخِرَةِ

**٢٨٣١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَفَ بِعَرَفَاتٍ، فَلَمَّا قَالَ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ». قال: «إِنَّمَا الْخَيْرُ خَيْرُ الْآخِرَةِ»[1].

## باسی ڕێگەدراوە تەلبیە زیاد بکرێت لە شوێنی وەستان لە عەرەفە، بەوەی خێر تەنها خێری ڕۆژی دواییە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە وەستا کاتێ فەرمووی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)، فەرمووی: بەڕاستی خێر خێری ڕۆژی دواییە.

## بَابُ فَضْلِ حِفْظِ الْبَصَرِ وَالسَّمْعِ وَاللِّسَانِ يَوْمَ عَرَفَةَ

**٢٨٣٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ ابْنُ رَافِعٍ: قَالَ أَخْبَرَنِي الْفَضْلُ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ أَفَاضَ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ وَأَعْرَابِيٌّ يُسَايِرُهُ وَرِدْفُهُ ابْنَةٌ لَهُ حَسْنَاءُ قَالَ الْفَضْلُ: فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهَا، فَتَنَاوَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَجْهِي يَصْرِفُنِي عَنْهَا، فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَقَالَ ابْنُ رَافِعٍ يُسَايِرُهُ أَوْ يُسَائِلُهُ[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَرَوَى سُكَيْنُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْبَصْرِيُّ، وَأَنَا بَرِيءٌ مِنْ عُهْدَتِهِ وَعُهْدَةِ أَبِيهِ قَالَ أَبِي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يُلَاحِظُ النِّسَاءَ، وَيَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ، وَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَهُ بِيَدِهِ مِنْ خَلْفِهِ، وَجَعَلَ الْفَتَى يُلَاحِظُ إِلَيْهِنَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا ابْنَ أَخِي إِنَّ هَذَا يَوْمٌ مَنْ مَلَكَ فِيهِ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ وَلِسَانَهُ غُفِرَ لَهُ».

## باسی فەزڵ و گەورەیی پاراستنی چاو و گوێ و زمان لە ڕۆژی عەرەفەدا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە فەزلی کوڕی عەباسەوە -ئیبنو ڕافیع (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) دەڵێ: فەزل هەواڵی پێ دام- وتی: من لەپشت

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

پێغەمبەرەوە ﷺ بووم کاتێ لە موزدەلیفە گەڕایەوە، دەشتەکییەکیش شانبەشانی ئەو بەسەر وڵاخێکەوە دەڕۆیشت، کچێکی جوانی لە پشتەوە بوو، فەزل وتی: من تەماشام دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخسارمی لە ڕووی کچەکە وەرگێڕا بە لایەکی دیکەدا، بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد. ئیبنو ڕافیع وتی: شانبەشانی ڕێی دەکرد یان پرسیاری لێ دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: سوکەینی کوڕی عەبدولعەزیزی بەصری گێڕاویەتەوە، -وە من بەریم لە دڵنیایی خۆی و باوکی-، وتی: گوێم لە باوکم بوو دەیوت: ئیبنو عەباس بۆی باس کردم لە فەزلی کوڕی عەباسەوە ئەو لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو لە ڕۆژی عەرەفە، فەزل سەرنجی ئافرەتانی دەدا و تەماشای دەکردن، پێغەمبەری خواش ﷺ بە دەستی ڕوخساری وەردەگێڕا بە لاکەی دیکەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی برازام ئەمە ڕۆژێکە هەر کەس گوێ و چاو و زمانی بپارێزێ خوا لێی خۆش دەبێت.

**٢٨٣٣-** سُكَيْنُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ[١].

واتە: هەروەها فەرموودەکە بە سەنەدێکدیکەش لە سوکەینی کوڕی عەبدولعەزیزەوە گێڕدراوەتەوە.

**٢٨٣٤-** عَن سُكَيْنِ القطان ثنا أبو حدثنا ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَرَفَةَ فَجَعَلَ الْفَتَى يُلَاحِظُ النِّسَاءَ بِمِثْلِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: يَصْرِفُ وَجْهَهُ، وَلَمْ يَقُلْ يَا ابْنَ أَخِي[٢].

واتە: سوکەینی قەتان دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم، ئیبنو عەباس رضي الله عنهما بۆی باس کردین، وتی: فەزلی کوڕی عەباس لە ڕۆژی عەرەفە لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ سوار بووبوو، سەرنجی ئافرەتانی دەدا، هەروەکو فەرموودەکەی پێشوو، ئەوە نەبێت وتی: ڕوخساری وەرگێڕا، نەیوت: ئەی برازام.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ وُقُوفِ الْبُدْنِ بِالْمَوْقِفِ بِعَرَفَةَ

**٢٨٣٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّتِهِ مُنَادِيًا، فَنَادَى عِنْدَ الزَّوَالِ أَنِ اغْتَسِلُوا فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ «فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى أَنْ أَهِلُّوا بِالْحَجِّ، وَأَمَرَ بِالْبُدْنِ أَنْ تُوقَفَ بِعَرَفَةَ، وَفِي الْمَنَاسِكِ كُلِّهَا»[١].

## باسی ڕێگەدان بە وەستاندنی وشتر لە عەرەفە

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجەکەیدا لە کاتی ترازانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان فەرمانی کرد بە کەسێك لەنێو خەڵکەکە بانگ بکات خۆتان بشۆرن، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، وە وتی: کاتێ ڕۆژی تەڕویە هات فەرمانی بە کەسێك کرد لەنێو خەڵکەکە بانگ بکات، ئیحرام بۆ حەج ببەستن، وە فەرمانی کرد وشتری قوربانی لە عەرەفە بوەستێنرێ، هەروەها لە هەموو ڕێوڕەسمەکانی.

## بَابُ الِاسْتِعَاذَةِ فِي الْمَوْقِفِ مِنَ الرِّيَاءِ وَالسُّمْعَةِ فِي الْحَجِّ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ

**٢٨٣٦-** عَنْ بِشْرِ بْنِ قُدَامَةَ الضِّبَابِيِّ ﷺ قَالَ: أَبْصَرَتْ عَيْنَايَ حِبِّي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاقِفًا بِعَرَفَاتٍ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ حَمْرَاءُ قَصْوَاءُ وَتَحْتَهُ قَطِيفَةٌ قَوْلَانِيَّةٌ [٢]، وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجًّا غَيْرَ رِيَاءٍ وَلَا هِيَاءٍ وَلَا سُمْعَةٍ»[٣].

## باسی پەناگرتن لە ڕیایی و ناوبانگ لەسەر عەرەفە لە کاتی حەجدا، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت

واتە: بیشری کوڕی قودامەی زیبابی ﷺ دەڵێ: بە هەردوو چاوی خۆم خۆشەویستم پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە عەرەفە وەستابوو بەسەر وشترێکی سوورەوە (کە

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) ) ڕاستی ئەو وشەیە (بَوْلَانِيَّة): دراوەتە پاڵ (بَوْلان) ناوی شوێنێکە دەشتەکییەکان کەلوپەلی حاجییەکانیان تێدا دەدزی.

(٣) إسناده ضعيف.

نازناوی) قەصواء بوو، قەیفەیەکی (قَوْلَانِیَّة)ی لەژێر بوو، دەیفەرموو: خوایە بیکە بە حەجێك هیچ ڕیایی و خۆدەرخستن و ناوبانگێکی تێدا نەبێت.

## بَابُ وَقْتِ الدَّفْعَةِ مِنْ عَرَفَةَ خِلَافَ سُنَّةِ أَهْلِ الْكُفْرِ وَالْأَوْثَانِ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ

**٢٨٣٧-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ ثُمَّ أَفَاضَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ[١].

## باسی کاتی بەڕێکەوتن لە عەرەفە بە پێچەوانەی ڕێبازی بێباوەڕان و بتپەرستانی سەردەمی نەفامی

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە وەستا، پاشان هاتە خوارەوە کاتێ خۆر ئاوا بوو، ئوسامەی کوڕی زەیدیشی لەپشت خۆی دانا لەسەر وڵاخەکە.

**٢٨٣٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ حَتَّى إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ عَلَى رُءُوسِ الْجِبَالِ كَأَنَّهَا الْعَمَائِمُ عَلَى رُءُوسِ الرِّجَالِ دَفَعُوا، فَيَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ حَتَّى إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَكَانَتْ عَلَى رُءُوسِ الْجِبَالِ كَأَنَّهَا الْعَمَائِمُ عَلَى رُءُوسِ الرِّجَالِ دَفَعُوا، فَأَخَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الدَّفْعَةَ مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ بِالْمُزْدَلِفَةِ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ، ثُمَّ دَفَعَ حِينَ أَسْفَرَ كُلُّ شَيْءٍ فِي الْوَقْتِ الْآخِرِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا أَبْرَأُ مِنْ عُهْدَةِ زَمْعَةَ بْنِ صَالِحٍ[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: خەڵکانی سەردەمی نەفامی لە عەرەفە دەوەستان تا خۆر ئەوەندە نزم دەبۆیەوە لەسەر چیاکان وەکوو مێزەری لێ دەهات لەسەر پیاوان، ئینجا بەڕێ دەکەوتن، دواتر لە موزدەلیفە دەوەستان تا خۆر دەردەچوو، دەکەوتە سەر چیاکان وەکوو مێزەری لێ دەهات لەسەر پیاوان، ئینجا بەڕێ دەکەوتن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوونی لە عەرەفە دواخست تا خۆر ئاوا بوو، پاشان نوێژی بەیانی کرد لە

---

(١) عبد الرحمن بن الحارث فيه كلام لكن قال الترمذي: ((حسن صحيح)) وكلام المصنف عقب الحديث يقتضي التقوية بالشاهد.

(٢) إسناده ضعيف.

موزدەلیفە کاتێ بەرەبەیان دەرکەوت، پاشان کاتێ کە دنیا ڕۆشن بۆیەوە لە کۆتا کاتی نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خۆر دەربچێت بەڕێ کەوت.

## بَابُ تَبَاهِي اللَّهِ أَهْلَ السَّمَاءِ بِأَهْلِ عَرَفَاتٍ

٢٨٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِنَّ اللَّهَ يُبَاهِي بِأَهْلِ عَرَفَاتٍ أَهْلَ السَّمَاءِ»، فَيَقُولُ لَهُمْ: «انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي جَاءُونِي شُعْثًا غُبْرًا»[١].

## باسی خوا ﷻ ڕێز و شکۆی خۆی بۆ ئەوانەی لەسەر عەرەفاتن نیشانی فریشتەکانی ئاسمان ئەدات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ ڕێز و شکۆی خۆی بۆ ئەوانەی لەسەر عەرەفاتن نیشانی فریشتەکانی ئاسمان دەدات و پێیان دەفەرمووێ: تەماشای ئەو بەندانەم بکەن بەقژی بژ و تۆزاوییەوە هاتوون بۆ لام.

٢٨٤٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ إِنَّ اللَّهَ يَنْزِلُ إِلَى السَّمَاءِ فَيُبَاهِي بِهِمُ الْمَلَائِكَةَ، فَيَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي أَتَوْنِي شُعْثًا غُبْرًا ضَاحِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ « فَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ: أَيْ رَبِّ فِيهِمْ فُلَانٌ يَزْهُو وَفُلَانٌ وَفُلَانٌ قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ: قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ». قال رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَمَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرُ عَتِيقًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ڕۆژی عەرەفە دێت خوا ﷻ دادەبەزێ بۆ ئاسمانەکان ڕێز و شکۆی خۆی بۆ ئەوانەی لەسەر عەرەفاتن نیشانی فریشتەکانی ئاسمان دەدات، دەفەرمووێ: تەماشای ئەو بەندانەم بکەن بەقژی بژ و تۆزاوییەوە هاتوون بۆ لام، قوربانییان لەگەڵ خۆیان هێناوە و لە هەموو ڕێگایەکی دوورەوە هاتوون، ئێوە دەکەم بە شایەت من لێیان خۆش بووم، فریشتەکان پێی دەڵێن: ئەی پەروەردگار فڵانە کەسیان تێدایە بۆ ئەوە هاتووە فەخر و شانازی بکات، فڵان و فڵانیشیان تێدایە، فەرمووی: خوا دەفەرمووێ: بەڕاستی لێیان خۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ ڕۆژێك نییە ئەوەندەی ڕۆژی عەرەفە خەڵکی لە ئاگر ڕزگاری بێت.

---

(١) صحیح.

(٢) إسناده ضعیف.




## بَابُ ذِكْرِ الدُّعَاءِ عَلَى الْمَوْقِفِ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، وَلَا أَخَالُ إِلَّا أَنَّهُ لَيْسَ فِي الْخَبَرِ حُكْمٌ، وَإِنَّمَا هُوَ دُعَاءٌ، فَخَرَّجْنَا هَذَا الْخَبَرَ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ ثَابِتًا مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ إِذْ هَذَا الدُّعَاءُ مُبَاحٌ أَنْ يَدْعُوَ بِهِ عَلَى الْمَوْقِفِ وَغَيْرِهِ

**٢٨٤١-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَشِيَّةِ عَرَفَةَ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كَالَّذِي نَقُولُ وَخَيْرًا مِمَّا نَقُولُ اللَّهُمَّ لَكَ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي وإِلَيْكَ مَآبِي، وَلَكَ رَبِّي تُرَاثِي اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَوَسْوَسَةِ الصَّدْرِ وَشَتَاتِ الْأَمْرِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا تَجِيءُ بِهِ الرِّيحُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَجِيءُ بِهِ الرِّيحُ»[1].

**باسی پاڕانەوە لە شوێنی وەستان لە شەوی عەرەفە، ئەگەر فەرموودەکە جێگر بێت، پێموا نییە لە فەرموودەکەدا حوکمێکی شەرعی هەبێت، بەڵکوو تەنها نزا و پاڕانەوەیە، ئەم فەرموودەمان تەخریج کرد ئەگەر چی جێگیریش نییە لە ڕووی گواستنەوەوە، چونکە ئەم پاڕانەوەیە ڕێگەپێدراوە مسوڵمان پێی بپاڕێتەوە لەسەر عەرەفە و غەیری عەرەفەیش**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: زۆربەی پاڕانەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای شەوی عەرەفە بریتی بوو لە: خوایە سوپاس و ستاییش بۆ تۆ وەکوو ئەوەی کە سوپاس و ستاییشت دەکەین، وە بەوەیشی ستاییشی خۆتت پێ کردووە و تەنها خۆت دەیزانی لە زانستی پەنهانی خۆت، خوایە نوێژ و سەربڕین و ژیان و مردن و گەڕانەوەم تەنها بۆ لای تۆیە، ئەی پەروەردگارم ئەوەی بە میرات جێی دەهێڵم بۆ تۆیە، خوایە من پەنات پێ دەگرم لە سزای نێوگۆڕ و وەسوەسەی دڵ و پەرتەوازەبوون و تێکەڵبوونی کاروبارەکان، خوایە داوای خێری ئەوەت لێ دەکەم با دەیهێنێ، وە پەنات پێ دەگرم لەشەڕ و خراپەی ئەوەی با دەیهێنێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي مِنْ أَجْلِهَا سُمِّيَتْ عَرَفَةُ عَرَفَةَ

**٢٨٤٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: أَتَى جِبْرِيلُ إِبْرَاهِيمَ يُرِيهِ الْمَنَاسِكَ فَصَلَّى بِهِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالصُّبْحَ بِمِنًى، ثُمَّ ذَهَبَ مَعَهُ إِلَى عَرَفَةَ، فَصَلَّى بِهِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ

---

(١) إسناده ضعيف.




بِعَرَفَةَ وَوَقَّفَهُ فِي الْمَوْقِفِ حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ ثُمَّ دَفَعَ بِهِ فَصَلَّى بِهِ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالصُّبْحَ بِمُزْدَلِفَةِ، ثُمَّ أَبَاتَ لَيْلَتَهُ، ثُمَّ دَفَعَ بِهِ حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ، فَقَالَ لَهُ أَعْرِفِ الآنَ، فَأَرَاهُ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، فَعَلَ ذَلِكَ بِالنَّبِيِّ ﷺ[١].

## باسی هۆکاری ناونانی عەرەفە بە عەرەفە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: جبریل هات بۆ لای ئیبراهیم بۆ ئەوەی ڕێوڕەسمەکانی حەجی پێ نیشان بدات، نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشا و بەیانی لە مینا پێ کرد، پاشان لەگەڵی ڕۆیشت بۆ عەرەفە، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری لە عەرەفە پێ کرد و لە شوێنی تایبەت وەستاندی تا خۆر ئاوا بوو، پاشان لەگەڵ خۆی بردی نوێژی ئێوارە و عیشا و بەیانی لە موزدەلیفە کرد، پاشان شەوەکەی مایەوە، پاشان لەگەڵ خۆی بردی تا بەردبارانی جەمرەی پێی کرد، پێی فەرموو: ئێستا بزانە، هەموو دروشمەکانی پێ نیشان دا. وە بەهەمان شێوە ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد.

## بَابُ صِفَةِ السَّيْرِ فِي الدَّفْعَةِ مِنْ عَرَفَةَ، وَالْأَمْرِ بِالسَّكِينَةِ فِي السَّيْرِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٢٨٤٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ الْفَضْلِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «عَشِيَّةَ عَرَفَةَ، وَغَدَاةَ جَمْعٍ حِينَ دَفَعُوا النَّاسُ عَلَيْكُمُ السَّكِينَةَ « وَهُوَ كَافٌّ نَاقَتَهُ»[٢].

## باسی چۆنییەتی ڕێکردن لە کاتی دەرچوون لە عەرەفە، وە فەرمانکردن بە لەسەرخۆیی و هێمنی لە ڕێکردندا، بە دەستەواژەیەکی گشتی (عَام) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاص)

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە فەزلەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی عەرەفە و سەرلەبەیانی موزدەلیفە کاتێ خەڵکەکە بەڕێکەوتن، فەرمووی: پێویستە لەسەرخۆ و هێمن بن، وە خۆی ڕەشمەی وشترەکەی گرتبوو نەیدەهێشت خێرا ڕێ بکات.

---

(١) محمد بن عبد الرحمن بن أبي ليلى ضعيف، لكن للحديث شواهد.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ إِيجَافَ الْخَيْلِ وَالْإِبِلِ وَالْإِيضَاعَ فِي السَّيْرِ فِي الدَّفْعَةِ مِنْ عَرَفَةَ لَيْسَ الْبِرَّ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْبِرَّ السَّكِينَةُ فِي السَّيْرِ بِمِثْلِ اللَّفْظَةِ الَّتِي ذَكَرْتُ أَنَّهَا لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٢٨٤٤-** عَنْ أُسَامَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرْدَفَهُ حِينَ أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ، فَأَفَاضَ بِالسَّكِينَةِ وَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِإِيجَافِ الْخَيْلِ وَالْإِبِلِ». قال: فَمَا رَأَيْتُ نَاقَتَهُ رَافِعَةً يَدَهَا حَتَّى أَتَى جَمْعًا ثُمَّ أَرْدَفَ الْفَضْلَ فَأَمَرَ النَّاسَ بِالسَّكِينَةِ، وَأَفَاضَ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ، وَقَالَ: «لَيْسَ الْبِرُّ بِإِيجَافِ الْخَيْلِ وَالْإِبِلِ»، فَمَا رَأَيْتُ نَاقَتَهُ رَافِعَةً يَدَهَا حَتَّى أَتَى مِنًى»[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پەلەپێکردنی ئەسپ و وشترەکان لە بەڕێکەوتن لە عەرەفەوە بۆ موزدەلیفە لە کردەوە چاکەکان نییە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی چاکە بریتییە لە لەسەرخۆیی لە ڕێکردندا، وەکوو ئەو دەستەواژەی کە باسم کرد ئەوە دەستەواژەیەکی گشتییە مەبەست پێی تایبەتە

واتە: ئوسامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەپشت خۆی داینا لەسەر وڵاخەکەی کاتێ لە عەرەفە گەڕایەوە، بەلەسەرخۆیی و هێمنی گەڕایەوە، فەرمووی: ئەی خەڵکینە پێویستە لەسەرخۆ و هێمن بن، چونکە بەڕاستی چاکە لە پەلەپێکردنی ئەسپ و وشترەکاندا نییە، وشترەکەیم نەبینی دەستەکانی بەرز بکاتەوە تا گەیشتە موزدەلیفە، پاشان فەزلی لە پشتی خۆی دانا لەسەر وشترەکەی، فەرمانی کرد بە خەڵککە لەسەرخۆ و هێمن ڕێ بکەن، دواتر خۆی بەلەسەرخۆیی دابەزی و فەرمووی: چاکە لە پەلەپێکردنی ئەسپ و وشترەکاندا نییە، وشترەکەیم نەبینی دەستەکانی بەرز بکاتەوە تا گەیشتە مینا.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ اللَّفْظَةَ الَّتِي ذَكَرَهَا فِي السَّكِينَةِ فِي السَّيْرِ فِي الدَّفْعَةِ مِنْ عَرَفَةَ لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ، وَالْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يَسِيرُ سَيْرَ السَّكِينَةِ فِي الْوَقْتِ الَّذِي لَمْ يَجِدْ فَجْوَةً إِذْ قَدْ نَصَّ عِنْدَ وُجُودِ الْفَجْوَةِ فِي السَّيْرِ عِنْدَ الدَّفْعَةِ مِنْ عَرَفَةَ، وَفِي هَذَا الْخَبَرِ مَا بَانَ أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ أَرَادَ

---

(١) صحيح.

## بِقَوْلِهِ: فَمَا رَأَيْتُ نَاقَتَهُ رَافِعَةً يَدَهَا حَتَّى أَتَيْنَا جَمْعًا أَيْ فِي الزِّحَامِ دُونَ الْوَقْتِ الَّذِي وَجَدَ فِيهِ فَجْوَةً، إِذْ أُسَامَةُ هُوَ الْمُخْبِرُ أَنَّهُ نَصَّ لَمَّا وَجَدَ الْفَجْوَةَ

٢٨٤٥- عَنْ عُرْوَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أُسَامَةَ ﷺ، وَهُوَ إِلَى جَنْبِي، وَكَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ يُسْأَلُ كَيْفَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسِيرُ حِينَ دَفَعَ مِنْ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ[١].

**باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو دەستەواژەی کە باسم کرد دەربارەی ڕێکردن بەهێمنی و لەسەرخۆیی لە عەرەفە، دەستەواژەیەکی گشتییە (عَام) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاص)، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا بە لەسەرخۆیی دەڕۆیشت ئەگەر بۆشاییەکی نەبینایە، لە کاتی بینینی بۆشاییەك لە بەڕێکەوتنی لە عەرەفە گورج دەبۆیەوە، وە لەم فەرموودەدا ئەوە ڕوون بووەتەوە ئوسامەی کوڕی زەید مەبەستی لە وتەکەی: وشترەکەیم نەبینی دەستەکانی بەرز بکاتەوە تا گەیشتینە موزدەلیفە، واتە: لە کاتی قەرەباڵغیدا بوو نەك لەو کاتەی بۆشایی بەدی دەکرد، چونکە ئوسامە خۆی هەواڵی داوە پێغەمبەر ﷺ کاتێ بۆشاییەکی بەدی بکردایە گورج دەبۆیەوە**

واتە: عوروە دەڵێ: گوێم لێ بوو پرسیار کرا لە ئوسامە ﷺ، منیش لە تەنیشتی دانیشتبووم، جا ئەو لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ بوو لەسەر وشترەکە لە عەرەفە، پرسیاری لێ دەکرا: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەڕۆیشت کاتێ کە لە عەرەفە چووە خوارەوە؟ وتی: بەشێوەیەکی ئاسایی دەڕۆیشت بەڵام کاتێ کەلێنێکی بۆ هەڵکەوتبایە گورج دەردەچوو.

## بَابُ ذِكْرِ الدُّعَاءِ وَالذِّكْرِ وَالتَّهْلِيلِ فِي السَّيْرِ مِنْ عَرَفَةَ إِلَى مُزْدَلِفَةَ

٢٨٤٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ فِي حَجَّةٍ أَوْ عُمْرَةٍ أَهَلَّ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: وَوَقَفَ يَعْنِي بِعَرَفَةَ حَتَّى إِذَا وَجَبَتِ الشَّمْسُ أَقْبَلَ يَذْكُرُ اللَّهَ وَيُعَظِّمُهُ وَيُهَلِّلُهُ وَيُمَجِّدُهُ حَتَّى يَنْتَهِيَ إِلَى الْمُزْدَلِفَةِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی پاڕانەوە و یادی خوا و تەهلیلکردن لە کاتی ڕۆیشتن لە عەرەفەوە بۆ موزدەلیفە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە ڕێك بۆیەوە لەسەر وشترەکەی لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) لە حەج بووایە یان عومرە تەلبیەی دەکرد، دواتر فەرموودەکەی باس کرد. وە لە عەرەفە وەستا تا کاتێ خۆر ئاوا بوو، ئینجا بەڕێ کەوت یادی خوای دەکرد و بەگەورەی ڕادەگرت و تەهلیل و پیاهەڵدانی دەکرد تا گەیشتە موزدەلیفە.

## بَابُ إِبَاحَةِ النُّزُولِ بَيْنَ عَرَفَاتٍ وَجَمْعٍ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو لِلْمَرْءِ

**٢٨٤٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ دَفَعَ مِنْ عَرَفَةَ أَرْدَفَهُ تِلْكَ الْعَشِيَّةَ، فَلَمَّا أَتَى الشِّعْبَ نَزَلَ فَبَالَ - وَلَمْ يَقُلْ: إِهْرَاقَ الْمَاءِ - فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ مِنْ إِدَاوَةٍ فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا خَفِيفًا، فَقُلْنَا: الصَّلَاةَ فَقَالَ: «الصَّلَاةُ أَمَامَكَ» فَلَمَّا أَتَيْنَا الْمُزْدَلِفَةَ صَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ حَلُّوا رِحَالَهُمْ وَأَعَنْتُهُ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ[1].

## باسی ڕێگەدراوە بە بەندە لە نێوان عەرەفە و موزدەلیفە دابەزێت بۆ کارێکی پێویست کە بێتە پێشی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە عەرەفەوە بەڕێ کەوت لەپشت خۆی داینا لەسەر وڵاخەکە، کاتێ هاتە شیوەکە دابەزی و میزی کرد، (بەڕاشکاوی وتی میزی کرد) -نەیوت ئاوی ڕژاند- دواتر لەنێو قاپێکدا ئاوم کرد بە دەستیدا، دەستنوێژێکی سووکی گرت، پێیان وت: کاتی نوێژە. فەرمووی: نوێژ لە پێشتەوەیە (واتە: جارێ دەڕۆین)، کاتێ هاتینە موزدەلیفە نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان کەلوپەلەکانیان داگرت، منیش یارمەتیم دا، پاشان نوێژی عیشای کرد.

تێبینی: (إِدَاوَة): قاپێکی بچووکە لە چەرم دروستکراوە بۆ ئاوتێکردن بەکاردێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمُزْدَلِفَةِ

**٢٨٤٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُزْدَلِفَةِ جَمِيعًا(١).

## باسی کۆکردنەوەی نوێژی ئێوارە و عیشا لە موزدەلیفە

واتە: ئیبنو عومەر  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە لە موزدەلیفە کرد.

تێبینی: (الْمُزْدَلِفَةِ): شوێنێکە لە نزیك مەککە یان مینا، پێشی دەوترێ: (جَمْع)، چونکە نوێژی ئێوارەو عیشای تێدا کۆدەکرێتەوە.

## بَابُ تَرْكِ التَّطَوُّعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا بِالْمُزْدَلِفَةِ مَعَ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِالْمُزْدَلِفَةِ صَلَاةَ الْمُسَافِرِ لَا صَلَاةَ الْمُقِيمِ

**٢٨٤٩-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَاهُ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ لَيْسَ بَيْنَهُمَا سَجْدَةٌ صَلَّى الْمَغْرِبَ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي بِجَمْعٍ كَذَلِكَ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ(٢).

## باسی وازهێنان لە نوێژی زیادە لە نێوان هەردوو نوێژەکە ئەگەر هەردووکیان پێکەوە کۆ کرایەوە لە موزدەلیفە لەگەڵ ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە موزدەلیفە نوێژی گەشتیاری کرد نەك نوێژی نیشتەجێ

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر ، هەواڵی پێ دا، باوکی وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ئێوارە و عیشای لە موزدەلیفە کۆ کردەوە، لە نێوانیاندا هیچ نوێژێکی سوننەتی نەکرد، سێ ڕکات نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی عیشای کرد، جا عەبدوڵا بەو شێوە لە جەمع نوێژی دەکرد تا کۆچی دوایی کرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الْأَذَانِ لِلْمَغْرِبِ وَالْإِقَامَةِ لِلْعِشَاءِ مِنْ غَيْرِ أَذَانٍ، إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا بِالْمُزْدَلِفَةِ خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الصَّلَاتَيْنِ إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا فِي وَقْتِ الْآخِرَةِ مِنْهُمَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا بِإِقَامَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ أَذَانٍ

**٢٨٥٠-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَفَضْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَاتٍ، فَلَمَّا بَلَغَ الشِّعْبَ الَّذِي يَنْزِلُ عِنْدَهُ الْأُمَرَاءُ بَالَ، وَتَوَضَّأَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الصَّلَاةَ قَالَ: «الصَّلَاةُ أَمَامَكَ» فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى الْجَمْعِ أَذَّنَ وَأَقَامَ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ آخِرُ النَّاسِ حَتَّى أَقَامَ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ[1].

## باسی بانگدان بۆ نوێژی ئێواره و قامەتیش بۆ نوێژی عیشا بەبێ بانگ، ئەگەر له موزدەلیفه کۆ کرانەوە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایه ئەو دوو نوێژە ئەگەر کۆ کرانەوە لە کاتی نوێژەکەی دواتریان (واتە: نوێژی ئێواره خرایه پاڵ عیشا)، کۆ دەکرێنەوە بە دوو قامەت بەبێ بانگدان

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ له عەرەفاتەوە بەڕێ کەوتم، کاتێ گەیشتە ئەو شیوەی کە کاربەدەستدان لێی دادەبەزن بۆ پشوودان میزی کرد و دەستنوێژی گرت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی نوێژە، فەرمووی: نوێژ لە پێشتەوەیە، کاتێ گەیشتە جەمع، فەرمانی کرد بانگ درا و قامەت کرا، پاشان نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان ئەوانەی دوا کەتبوون هێشتا نوێژی ئێوارەیان تەواو نەکردبوو، قامەت کرا بۆ نوێژی عیشا، ئینجا نوێژی عیشای کرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْفَصْلِ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا بِفِعْلٍ لَيْسَ مِنْ عَمَلِ الصَّلَاةِ. فِي خَبَرِ ابْنِ عُيَيْنَةَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ: ثُمَّ حَلُّوا رِحَالَهُمْ وَأَعَنْتُهُ عَلَيْهِ

**٢٨٥١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ، فَلَمَّا بَلَغَ الشِّعْبَ نَزَلَ فَبَالَ - وَلَمْ يَقُلْ: إِهْرَاقَ الْمَاءِ - قَالَ أُسَامَةُ: فَصَبَبْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْإِدَاوَةِ فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا خَفِيفًا، قُلْتُ: الصَّلَاةَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «الصَّلَاةُ أَمَامَكَ ثُمَّ أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ وَضَعَ رَحْلَهُ، ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ئەگەر نوێژی ئێوارە و عیشا کۆ کرانەوە، ڕێگەدراوە ئەندازەیەك ماوە بخرێتە نێوانیان بە کردەوەیەك لە کردەوەی نوێژ نەبێت. لە فەرموودەکەی ئیبنو عویەینە هاتووە لە ئیبراهیمی کوڕی عوقبەوە: پاشان بارگەکانیان دانا، منیش یارمەتی پێغەمبەرم ﷺ دا**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە عەڕەفەوە بەڕێ کەوت ئوسامەی لەپشت خۆیەوە دانا لەسەر وڵاخەکە، کاتێ گەیشتە شیوەکە دابەزی و میزی کرد، (بەڕاشکاوی وتی میزی کرد) -نەیوت ئاوی ڕژاند- ئوسامە وتی: دواتر لەنێو قاپێکدا ئاوم کرد بە دەستیدا، دەستنوێژێکی سووکی گرت، وتم: کاتی نوێژە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: نوێژ لە پێشتەوەیە، پاشان هاتە موزدەلیفە، نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان کەلوپەلەکانیان داگرت، پاشان نوێژی عیشای کرد.

**بَابُ إِبَاحَةِ الْأَكْلِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ إِذَا جُمِعَ بَيْنَهُمَا بِالْمُزْدَلِفَةِ إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَا أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ أَبِي إِسْحَاقَ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ**

**٢٨٥٢-** عَنْ أَبِي إِسْحَاق عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَفَاضَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ مِنْ عَرَفَاتٍ عَلَى هِينَتِهِ لَا يَضْرِبُ بَعِيرَهُ حَتَّى أَتَى جَمْعًا فَنَزَلَ فَأَذَّنَ فَأَقَامَ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ ثُمَّ تَعَشَّى، ثُمَّ قَامَ فَأَذَّنَ، وَأَقَامَ وَصَلَّى الْعِشَاءَ، ثُمَّ بَاتَ بِجَمْعٍ حَتَّى إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ قَامَ فَأَذَّنَ، وَأَقَامَ، ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَاتَيْنِ الصَّلَاتَيْنِ يُؤَخَّرَانِ عَنْ وَقْتِهِمَا وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يُصَلِّيهِما فِي هَذَا الْيَوْمِ إِلَّا فِي هَذَا الْمَكَانِ، ثُمَّ وَقَفَ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ يَرْفَعِ ابْنُ مَسْعُودٍ قِصَّةَ عَشَاءَهُ بَيْنَهُمَا، وَإِنَّمَا هَذَا مِنْ فِعْلِهِ لَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

**باسی ڕێگەدان بە خواردن و خواردنەوە لە نێوان هەردوو نوێژەکە، ئەگەر لە موزدەلیفە کۆ کرانەوە، ئەگەر فەرموودەکە جێگیر بێت، چونکە بەڕاستی من زانیاریم نییە ئەبو ئیسحاق ئەم فەرموودەی لە عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزیدەوە بیستبێ**

---

(١) صحيح صحه الإمام البخاري.

واتە: ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزیدەوە دەڵێ: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ لە عەڕەفات بەڕێ کەوت بەلەسەرخۆیی نەیدا لە وشترەکەی تا خێرا بڕوات، تا گەیشتە (جَمْع) (واتە: موزدەلیفە)، لەوێ دابەزی، بانگی دا و قامەتی کرد، پاشان نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان نانی خوارد، پاشان هەستا بانگی دا، دواتر قامەتی کرد و نوێژی عیشای کرد، پاشان شەو لە جەمع مایەوە تا کاتێ بەرەبەیان دەرکەوت، لە خەو هەستا، بانگی دا، ئینجا قامەتی کرد، پاشان نوێژی بەیانی کرد، پاشان وتی: بەڕاستی ئەم دوو نوێژە لە کاتی خۆیان دوا دەخرێن، پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ڕۆژەدا ئەو دوو نوێژەی نەدەکرد مەگەر لەم شوێنەدا، پاشان وەستا.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئیبنو مەسعود باسی نانخواردنی شەو لە نێوان ئەو دوو نوێژەی بەرز نەکردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ. بەڵکوو ئەوە لە کردەوەی خۆی بوو نەك لە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ.

**٢٨٥٣-** عَنْ جَعْفَر، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ فَجَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ[١].

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: چووین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ پێم وت: هەواڵم بدەرێ دەربارەی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ وتی: هات بۆ موزدەلیفە نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە کۆ کردەوە، بە یەك بانگ و دوو قامەت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکشا تا بەرەبەیان بۆیەوە.

## بَابُ التَّغْلِيسِ بِصَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ النَّحْرِ بِالْمُزْدَلِفَةِ

**٢٨٥٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى صَلَاةً إِلَّا لِوَقْتِهَا إِلَّا هَاتَيْنِ الصَّلَاتَيْنِ رَأَيْتُهُ يُصَلِّي الْعِشَاءَ وَالْمَغْرِبَ جَمِيعًا لِمُزْدَلِفَةِ وَصَلَّى الْفَجْرَ قَبْلَ وَقْتِهَا بِغَلَسٍ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لە تاریکیدا لە ڕۆژی جەژنی قوربان لە موزدەلیفە**

واتە: عەبدورەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: عەبدوڵا ﷺ وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە نوێژێك بکات ئیللا لە کاتی خۆیدا دەیکرد، جگە لەم دوو نوێژە بینیم نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە لە موزدەلیفە ئەنجام دا، نوێژی بەیانیشی کرد پێش کاتی خۆی لە تاریکیدا.

## بَابُ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لِصَلَاةِ الْفَجْرِ بِالْمُزْدَلِفَةِ

**٢٨٥٥-** عَنْ جَعْفَر بْنِ محمد عَنْ أَبيهِ، عَنْ جَابِرٍ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثُ وَقَالَ: فَصَلَّى الْفَجْرَ حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ يَعْنِي بِالْمُزْدَلِفَةِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ لَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ لَنَا الْحَسَنُ بْنُ بِشْرٍ عَنْ حَاتِمٍ فِي هَذَا الْخَبَرِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ فِي خَبَرِ جَابِرٍ دَلَالَةٌ وَاضِحَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الْفَجْرَ بِالْمُزْدَلِفَةِ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا بَعْدَمَا بَانَ لَهُ الصُّبْحُ لَا قَبْلَ أَنْ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ وَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ أَرَادَ بِقَوْلِهِ وَصَلَّى الْفَجْرَ قَبْلَ وَقْتِهَا بِغَلَسٍ أَيْ قَبْلَ وَقْتِهَا الَّذِي كَانَ يُصَلِّيهَا بِغَيْرِ الْمُزْدَلِفَةِ أَيْ أَنَّهُ غَلَّسَ بِالْفَجْرِ أَشَدَّ تَغْلِيسًا مِمَّا كَانَ يُغَلِّسُ بِهَا فِي غَيْرِ ذَلِكَ الْمَوْضِعِ، وَخَبَرُ ابْنِ عُمَرَ الَّذِي يَلِي هَذَا الْبَابَ دَالٌّ عَلَى مِثْلِ مَا دَلَّ عَلَيْهِ خَبَرُ جَابِرٍ؛ لِأَنَّ فِي خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ يَبِيتُ بِالْمُزْدَلِفَةِ حَتَّى يُصْبِحَ ثُمَّ يُصَلِّيَ الصُّبْحَ.

**باسی بانگدان و قامەتکردن بۆ نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە**

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە جابرەوە ﷺ، دواتر فەرموودەکەی باس کرد، وتی: نوێژی بەیانی کرد کاتێ بەرەبەیانی بۆ ڕوون بۆیەوە، واتە: لە موزدەلیفە.

ئەبو بەکر دەڵێ: موحەممەدی کوڕی یەحیا پێی وتین، حەسەنی کوڕی بیشر پێی وتین، لە حاتەمەوە دەربارەی ئەم فەرموودە لەم شوێنەدا بە بانگ و قامەتێك، فەرموودەکەی جابر بەڵگەی ڕوونی تێدایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی

---

(١) صحيح.

كرد لە موزدەلیفە لە یەكەم كاتیدا دوای ئەوەی بەرەبەیانی بۆ ڕوون بۆیەوە، نەك پێش ئەوەی بەرەبەیانی بۆ ڕوون ببێتەوە، لەمەدا ئەوە دەردەكەوێت ئیبنو مەسعود لە وتەكەیدا: نوێژی بەیانی كرد پێش كاتی خۆی لە تاریكیدا، مەبەستی پێی ئەو كاتەیە لە جگە لە موزدەلیفە ئەنجامی دەدا، واتە: لەگەڵ دەركەوتنی بەرەبەیان بەتاریكی ئەو نوێژی كرد لە هیچ كاتێكی دیكەدا لە غەیری ئەو شوێنە لەو كاتەدا نوێژی بەیانی نەدەكرد، وە فەرموودەكەی ئیبنو عومەر كە بەدوای ئەم بەشەدا دێت پشت ڕاستكردنەوەی فەرموودەكەی جابرە، چونكە لە فەرموودەكەی ئیبنو عومەردا هاتووە، لە موزدەلیفە دەمایەوە تا ڕۆژی دەكردەوە پاشان نوێژی بەیانی دەكرد.

## بَابُ الْوُقُوفِ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَالدُّعَاءِ وَالذِّكْرِ وَالتَّهْلِيلِ وَالتَّمْجِيدِ وَالتَّعْظِيمِ لِلَّهِ فِي ذَلِكَ الْمَوْقِفِ

**٢٨٥٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ أَهَلَّ وَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: يَبِيتُ يَعْنِي بِالْمُزْدَلِفَةِ حَتَّى يُصْبِحَ، ثُمَّ يُصَلِّيَ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ يَقِفَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ، وَيَقِفُ النَّاسُ مَعَهُ يُدْعَوْنَ اللَّهَ وَيَذْكُرُونَهُ وَيُهَلِّلُونَهُ وَيُمَجِّدُونَهُ وَيُعَظِّمُونَهُ حَتَّى يَدْفَعَ إِلَى مِنًى[١].

## باسی وەستان لەلای (الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ)دا (كێوێكە لە موزدەلیفە)، وە پاڕانەوە و زیكر و تەهلیل و ستایشكردن و بەگەورەدانانی خوا لەو جێگایەدا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ كە ڕێك بۆیەوە لەسەر وشترەكەی لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) تەلبیەی كرد، وە فەرموودەكەی باس كرد، وتی: لە موزدەلیفە دەمایەوە تا بەرەبەیان، پاشان نوێژی بەیانی دەكرد، ئینجا لە لای مەشعەرولحرام دەوەستا، خەڵكەكەیش لەگەڵی دەوەستان و لە خوا دەپاڕانەوە و زیكر و تەهلیل و ستاییشی خوایان دەكرد و بەگەورە ڕایان دەگرت تا بەڕێ دەكەوت بۆ مینا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُقُوفِ حَيْثُ شَاءَ الْحَاجُّ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ إِذْ جَمِيعُ الْمُزْدَلِفَةِ مَوْقِفٌ

**٢٨٥٧-** عَنْ جَعْفَر، حَدَّثَنَا أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: وَقَفَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَقَالَ: «وَقَفْتُ هَا هُنَا وَالْمُزْدَلِفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ»[١].

## باسی ڕێگە دراوە بەوکەسەی حەج دەکات لە هەر شوێنێك ویستی لە موزدەلیفە بووەستێ، چونکە هەموو موزدەلیفە شوێنی وەستانە

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردین وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ، پرسیارمان لێ کرد دەربارەی حەجکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ لە موزدەلیفە وەستا، فەرمووی: ئا لێرە وەستام، موزدەلیفەیش هەمووی شوێنی وەستانە.

**٢٨٥٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِجَمْعٍ، وَقَالَ: «جَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەمع وەستا، وە فەرمووی: جەمع هەمووی شوێنی وەستانە.

## بَابُ الدَّفْعِ مِنَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَمُخَالَفَةِ أَهْلِ الشِّرْكِ وَالْأَوْثَانِ فِي دَفْعِهِمْ مِنْهُ

**٢٨٥٩-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: كَانَ الْمُشْرِكُونَ لَا يُفِيضُونَ مِنْ جَمْعٍ حَتَّى تَشْرُقَ الشَّمْسُ عَلَى ثَبِيرٍ، فَخَالَفَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ[٣].

## باسی بەڕێکەوتن لە مەشعەری حەرامەوە، وە پێچەوانەکردنی هاوبەشدانەران و بتپەرستان لە کاتی بەڕێ کەوتن

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: هاوبەشدانەران لە جەمع (واتە: موزدەلیفە) بەڕێ نەدەکەوتن تا خۆر لەسەر (ثَبِیر) (کە چیایەکی ناسراوە لە نزیك مەککە) دەردەکەوت، پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەوانی کرد پێش خۆردەرچوون بەڕێ کەوت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ صِفَةِ السَّيْرِ فِي الْإِفَاضَةِ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

٢٨٦٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ الْفَضْلِ قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ، وَمِنْ جَمْعٍ عَلَيْهِ السَّكِينَةُ حَتَّى أَتَى مِنًى[1].

## باسی چۆنێتی ڕێکردن لە کاتی بەڕێکەوتن لە جەمعەوە بۆ مینا بەدەستەواژەیەکی گشتی مەبەست پێی تایبەتە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، فەزل وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفەوە بەڕێ کەوت، هەروەها لە جەمعەوە بەلەسەرخۆیی و هێمنی تا هاتە مینا.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا سَارَ فِي الْإِفَاضَةِ وَمِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى عَلَى السَّكِينَةِ خَلَا بَطْنِ وَادِي مُحَسِّرٍ؛ فَإِنَّهُ أَوْضَعَ فِيهِ، وَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الْفَضْلَ إِنَّمَا أَرَادَ: وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ حَتَّى أَتَى مِنًى، خَلَا إِيضَاعِهِ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ عَلَى مَا تَرْجَمْتُ الْبَابَ أَنَّهُ لَفْظٌ عَامٌّ أَرَادَ بِهِ الْخَاصَّ

٢٨٦١- فِي خَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى انْتَهَى إِلَى وَادِي مُحَسِّرٍ فَفَزِعَ نَاقَتَهُ فَخَبَّتْ حَتَّى جَاوَزَ الْوَادِيَ[2].

واتە: لە فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ تا گەیشتە دۆڵی موحەسیر بە قامچییەکەی دای لە وشترەکەی تا لە دۆڵەکە دەرچوو.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە جەمعەوە بۆ مینا بەلەسەرخۆیی و هێمنی دەڕۆیشت جگە لە دۆڵی موحەسیر، چونکە لەو دۆڵەدا بەخێرایی دەڕۆیشت، لەمەشدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی فەزل لە وتەکەیدا وتی: بەلەسەرخۆیی و هێمنی دەڕۆیشت تا هاتە مینا، مەبەستی جگە لە دۆڵی موحەسیر بوو، چونکە کە گەیشتە ئەو دۆڵە پەلەی لە وشترەکەی کرد و بەخێرایی ڕۆیشت، وەك چۆن لەم بەشەدا باسم کرد، ئەوە دەستەواژەیەکی گشتییە (عَام) مەبەستی پێی تایبەتە (الْخَاص)

---

(١) صحيح.

(٢) ذكره المصنف معلقا، وقد وصله البيهقي ١٢٥/٥ - ١٢٦ بسند فيه علي بن زيد بن جدعان وهو ضعيف.

**٢٨٦٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کە گەیشتە دۆڵی (مُحَسِّر) بەپەلە بەنێو دۆڵەکەدا دەڕۆیشت. (مُحَسِّر: شیوێکە لە نێوان موزدەلیفە و مینا).

## بَابُ بَدْءِ الْإِيضَاعِ كَانَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ

**٢٨٦٣-** عَنْ عَطَاءٍ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ بَدْءُ الْإِيضَاعِ مِنْ قِبَلِ أَهْلِ الْبَادِيَةِ كَانَ يَقِفُونَ حَافَتَيِ النَّاسِ قَدْ عَلَّقُوا الْقِعَابَ وَالْعِصِيَّ وَالْجِعَابَ، فَإِذَا أَفَاضُوا تَقَعْقَعُوا فَأَنْفَرَتْ بِالنَّاسِ فَلَقَدْ رُئِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَإِنَّ ظَفْرَيْ نَاقَتِهِ لَتَمَسُّ الْأَرْضَ حَادِكَهَا، وَهُوَ يَقُولُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ»[٢].

### باسی سەرەتای جوڵاندنی وڵاخ بە مەبەستی خێرا ڕۆیشتن لە دۆڵی موحەسیر

واتە: عەتا دەڵێ: بێگومان سەرەتا خێرا ڕۆیشتن لە لایەن هەوارنشینەکانەوە دەستی پێ کرد، ئەوان لەولا و لای خەڵکەکە دەوەستان، کەلوپەل و تیر و چەکیان هەڵدەواسییە وڵاخەکانیان، جا کاتێ بەڕێ دەکەوتن بەخێرایی، دەنگی ئەو کەلوپەلەیان دەهات کە هەڵیانواسیبوو، خەڵکیان خێراتر دەکرد، جا بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بینرا هێندە هێواش دەڕۆیشت خەریك بوو گوێچکەی وشترەکەی بە زەوی دەکەوت، لەو کاتەدا دەیفەرموو: هێواش بن ئەی خەڵکینە، هێواش بن ئەی خەڵکینە.

## بَابُ ذِكْرِ الطَّرِيقِ الَّذِي يَسْلُكُ فِيهِ مِنَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ إِلَى الْجَمْرَةِ

**٢٨٦٤-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تُخْرِجُكَ إِلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

(٣) صحيح.

## باسی ئەو ڕێگایەی دەگیرێتە بەر لە مەشعەری حەرامەوە بۆ جەمرە

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە (پێغەمبەری خوا ﷺ لە موزدەلیفە دەرچوو پێش ئەوەی خۆر بکەوێ، فەزڵی کوڕی عەباسی لەپشت خۆی دانابوو هەتا گەیشتە دۆڵی موحەسیر وشترەکەی گورجتر کردەوە)[١]، پاشان ڕێگای نێوەندی گرتەبەر کە دەتبات بۆ سەر جەمرەی گەورە تا گەیشتە ئەو جەمرەی کە لای درەختەکەیە.

## بَابُ فَضْلِ الْعَمَلِ فِي عَشْرِ ذِي الْحِجَّةِ

**٢٨٦٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ يَعْنِي أَيَّامَ الْعَشْرِ». قَالوا: وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ: «وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، ثُمَّ لَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ» هَذَا حَدِيثُ أَبِي مُعَاوِيَةَ[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی دە شەوەکەی (ذِي الْحِجَّةِ)

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ڕۆژێك لای خوا کردەوەی چاك تیایدا خۆشەویستتر نییە ئەوەندەی دە ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ)، وتیان: تەنانەت جیهادیش لەپێناوی خوادا، فەرمووی: تەنانەت جیهادیش لەپێناوی خوادا، مەگەر کەسێك بەنەفس و ماڵی دەرچووبێت هیچ شتێکی لەگەڵ خۆی نەهێنابێتەوە لەوانە (واتە: سەروماڵی لەپێناو خوادا دانابێت).

## بَابُ فَضْلِ يَوْمِ النَّحْرِ

**٢٨٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُرْطٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَعْظَمُ الْأَيَّامِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمُ النَّحْرِ، ثُمَّ يَوْمُ الْقَرِّ»[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَوْمَ الْقَرِّ يَعْنِي يَوْمَ الثَّانِي مِنْ يَوْمِ النَّحْرِ.

---

(١) ئەوەی نێوان دوو کەوانە لە بێژەی دیکەدا هاتوە، بۆ مانا بەخشینی تەواو هێنام.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی فەزڵ و گەورەیی ڕۆژی جەژنی قوربان

واتە: عەبدوڵای کوڕی قورت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەترینی ڕۆژەکان لەلای خوا ڕۆژی جەژنی قوربانە، پاشان ڕۆژی دووەم لە جەژنی قوربان.

ئەبو بەکر دەڵێ: (يَوْمَ الْقَرِّ)، واتە: دووەم ڕۆژی جەژنی قوربانە.

## بَابُ الْتِقَاطِ الْحَصَى لِرَمْيِ الْجِمَارِ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ، وَالْبَيَانِ أَنَّ كَسْرَ الْحِجَارَةِ لِحَصَى الْجِمَارِ بِدْعَةٌ، لِمَا فِيهِ مِنْ إِيذَاءِ النَّاسِ وَإِتْعَابِ أَبْدَانِ مَنْ يَتَكَلَّفُ كَسْرَ الْحِجَارَةِ تَوَهُّمًا أَنَّهُ سُنَّةٌ

**٢٨٦٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «غَدَاةَ الْعَقَبَةِ: هَاتِ الْقُطْ حَصَيَاتٍ هِيَ حَصَى الْخَذْفِ فَلَمَّا وُضِعْنَ فِي يَدِهِ قَالَ بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالْغُلُوِّ فِي الدِّينِ»[١].

## باسی کۆکردنەوەی بەرد بۆ بەردبارانکردنی جەمرەکان لە موزدەلیفە، وە ڕوونکردنەوەش لەبارەی ئەوەی شکاندنی بەرد بۆ بەردبارانکردنی جەمرە بیدعەیە، لەوەی تیایدایە لە ئازاردانی خەڵك و ماندووبوونی جەستە لە شکاندنی بەرد بە خەیاڵی ئەوەی ئەو کردەوە سوننەتە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرلەبەیانی عەقەبە (بەسەر وشترەکەیەوە بوو) پێمی فەرموو: هەندێ بەردم بدەرێ، ئەویش بەردی (الْخَذْفِ) بوو ( کە بەردی بچووك بوون بەقەد دەنکە نۆکێك) کاتێ خستمە نێو دەستی، فەرمووی: بەڵێ، وەکوو ئەوانە بێت، وەکوو ئەوانە بێت، دەخیلە زیادەڕەوی نەکەن لە ئاییندا، چونکە بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە لەنێو چوون بەهۆی زیادەڕەوییان بوو لە ئاییندا.

**٢٨٦٨-** عَنْ عَوْفٍ قَالَ: لَا أَدْرِي الْفَضْلَ أَوْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «غَدَاةَ الْعَقَبَةِ الْقُطْ لِي حَصَيَاتٍ، بِمِثْلِهِ سَوَاءً»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەوف دەڵێ: نازانم فەزل بوو یان ئیبنو عەباس ﵄ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرلەبەیانی عەقەبە فەرمووی: هەندێ بەردم بدەرێ، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَقْدِيمِ النِّسَاءِ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى بِاللَّيْلِ

٢٨٦٩- عَنِ القَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَتْ سَوْدَةُ امْرَأَةً ضَخْمَةً ثَبْطَةً فَاسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُفِيضَ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ، فَأَذِنَ لَهَا قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَيْتَنِي كُنْتُ اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا اسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ، فَكَانَتْ عَائِشَةُ لَا تُفِيضُ إِلَّا مَعَ الْإِمَامِ[1].

## باسی مۆڵەتدان بۆ بە پێشخستنی ئافرەتان لە موزدەلیفەوە بۆ مینا

واتە: قاسم دەگێڕێتەوە، لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: سەودە ئافرەتێکی قەڵەو و قورس بوو، داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە شەو لە موزدەلیفەوە بەڕێ بکەوێت بۆ مینا، ئەویش مۆڵەتی پێ دا، عائیشە وتی: خۆزگە منیش مۆڵەتم لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرتایە وەکوو چۆن سەودە مۆڵەتی وەرگرت، جا عائیشە (لەدوای مردنی پێغەمبەر ﷺ) لەگەڵ ئیمام و پێشەوادا نەبووایە بەڕێ نەدەکەوت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَقْدِيمِ الضُّعَفَاءِ مِنَ الرِّجَالِ وَالْوِلْدَانِ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى بِاللَّيْلِ

٢٨٧٠- عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: أَنَا مِمَّنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ[2].

## باسی مۆڵەتدان لەوەی هەرچی لاواز هەیە لە پیاوان و منداڵان لە پێشەوە بە شەو ڕەوانە بکرێن لە موزدەلیفەوە بۆ مینا

واتە: عەتا دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەباس بوو ﵄ دەیوت: من لەوانە بووم کە پێغەمبەر ﷺ لە شەوی موزدەلیفە لەگەڵ کەسوکارە لاوازەکانیدا لە پێشەوە ناردمانی بۆ مینا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٨٧١-** عَنِ سالم عن ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ كَانَ يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ فَيَقِفُونَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِلَيْلٍ، فَيَذْكُرُونَ اللَّهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَدْفَعُونَ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَأْتِي مِنًى لِصَلَاةِ الصُّبْحِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَأْتِي بَعْدَ ذَلِكَ، وَأُولَئِكَ ضَعَفَةُ أَهْلِهِ، وَيَقُولُ أَذِنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ذَلِكَ[١].

**واتە:** سالم دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﵄، ئەو کەسوکارە لاواز و پەککەوتووەکانی خۆی لە پێشەوە ڕەوانە دەکرد لەلای مەشعەرولحەرام بە شەو دەوەستان، ئەوەندەی لە توانایاندا بووایە یادی خوایان دەکرد، پاشان بەڕێ دەکەوتن، هەندێکیان دەچوون بۆ مینا بۆ نوێژی بەیانی، هەندێکی دیکەیان دوای نوێژی بەیانی دەچوون بۆ مینا، ئەوانە لاوازەکانی کەسوکارەکەی بوون، وە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی ئەوەی داوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَقْدِيمِ الثِّقَلِ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى بِاللَّيْلِ

**٢٨٧٢-** عَنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنُ أَبِي يَزِيدَ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: كُنْتُ فِيمَنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الثَّقَلِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْبَارُ ابْنِ عَبَّاسٍ كُنْتُ فِيمَنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةَ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى بِاللَّيْلِ دَالَّةٌ عَلَى أَنَّ الْمَأْمُورَ بِالْتِقَاطِ الْحَصَى غَدَاةَ الْمُزْدَلِفَةِ هُوَ الْفَضْلُ ابْنُ عَبَّاسٍ لَا عَبْدُ اللَّهِ، وَأَخْبَارُ الْفَضْلِ أَنَّهُ كَانَ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى بِاللَّيْلِ دَالَّةٌ عَلَى أَنَّ خَبَرَ مُشَاسٍ عَنْ عَطَاءٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ الْفَضْلِ كُنْتُ فِيمَنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ وَهْمٌ؛ لِأَنَّ الْمُقَدَّمَ مَعَ الضَّعَفَةِ مِنْ جَمْعٍ إِلَى مِنًى هُوَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ لَا الْفَضْلُ.

## باسی ڕێگەدان بەوەی کەسانی بەتەمەن و قەڵەوو قورس لە پێشەوە بە شەو بەڕێ بکەون لە موزدەلیفەوە بۆ مینا

**واتە:** عوبەیدوڵای کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە ئیبنو عەباس بوو ﵄ دەیوت: من لەوکەسانە بووم کە پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوە ناردنی بەهۆی ئەوەی لاواز و قورس و گران بوون.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەواڵی ئیبنو عەباس من یەکێك بووم لەوانەی پێغەمبەر ﷺ لە شەوی موزدەلیفە لە جەمعەوە ناردنی بۆ مینا. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی سەرلەبەیانی لە موزدەلیفە وردەبەردی کۆ کردەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەزلی کوڕی عەباس بوو نەك عەبدوڵا، هەروەها هەواڵی فەزل ئەو لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ بوو کاتێ شەو لە جەمعەوە ڕۆیشت بۆ مینا. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی موشاس، لە عەتاء، لە ئیبنو عەباس، لە فەزلەوە: من لەوانە بووم کە پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوە (لەگەڵ کەسوکارە لاوازەکانی) ناردمی بە شەو، هەڵەیە، چونکە ئەو کەسەی نێردرا لەگەڵ لاوازەکان لە جەمعەوە بۆ مینا، عەبدوڵای کوڕی عەباس بوو نەك فەزل.

## بَابُ قَدْرِ الْحَصَى الَّذِي يُرْمَى بِهِ الْجِمَارُ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الرَّمْيَ بِالْحَصَى الْكِبَارِ مِنَ الْغُلُوِّ فِي الدِّينِ، وَتَخْوِيفِ الْهَلَاكِ بِالْغُلُوِّ فِي الدِّينِ فِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ: بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ

**٢٨٧٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ الْفَضْلِ قَالَ: أَفَاضَ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا هَبَطَ بَطْنَ مُحَسِّرٍ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِحَصَى الْخَذْفِ، وَيُشِيرُ بِيَدِهِ خَذْفَ الرَّجُلِ»[١].

**باسی قەبارەی ئەو بەردەی بەردبارانی جەمرەی پێ دەکرێت، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی بەردبارانکردن بە بەردی گەورە ڕۆچوونە لە ئاییندا، مەترسی ئەوە دەکرێت خاوەنەکەی تووشی لەناوچوون بێت بەهۆی ڕۆچوونەوە لە ئاییندا، لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس هاتووە: وەکوو ئەوانە بێت، دەخیلە زیادەڕەوی نەکەن لە ئاییندا (تەماشای فەرموودەی ژمارە (٢٨٦٧) بکە بەدرێژی هێناویەتی)**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە فەزلەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەڕێ کەوت، کاتێ دابەزیە دۆڵی موحەسیر فەرمووی: ئەی خەڵکینە پێویستە بەردی بچووك (بە ئەندازەی دەنکە نۆکێك) بەکار بهێنن، وە بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ ئەو بەردەی کە دەخرێتە نێوان پەنجە و دەوەشێنرێ.

---

(١) صحیح.

**٢٨٧٤-** عَنْ حَرْمَلَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: حَجَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا وَقَفْنَا بِعَرَفَاتٍ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاضِعًا إِحْدَى أُصْبُعَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى، فَقُلْتُ لِعَمِّي: يَا عَمِّ مَا يَقُولُ؟ قَالَ: يَقُولُ: «ارْمُوا الْجِمَارَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَاذِفِ»[١].

**واتە:** حەرمەلەی کوڕی عەمری ئەسلەمی ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ حەجم کرد، کاتێ لە عەرەفات وەستاین، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پەنجەیەکی لەسەر پەنجەکەی دیکەی دانابوو، بە مامم وت: ئەی مامە چی دەڵێ؟ وتی: دەفەرموێ: بەردبارانی جەمرەکان بکەن بە ئەندازەی ئەو بەردەی دەخرێتە نێوان دوو پەنجە و دەوەشێنرێ.

**٢٨٧٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ[٢].

**واتە:** جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردبارانی جەمرەی کرد بە بەردێك کە بە ئەندازەی ئەو بەردەی دەخرێتە نێوان دوو پەنجە و دەوەشێنرێ (ئەوەندەی دەنکە نۆکێك بوو).

**٢٨٧٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَرْمِي يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى[٣].

**واتە:** جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژن لە کاتی چێشتەنگاو بەردبارانی کرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ رَمْيِ الْجِمَارِ يَوْمَ النَّحْرِ رَاكِبًا

**٢٨٧٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَقَالَ لَنَا: «خُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ»[٤].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

## باسی ڕێگەدراوە لە ڕۆژی جەژن بەسواریی وڵاخ بەردبارانی جەمرەکان بکرێت

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی جەژن بەسەر وشترەکەیەوە بەردبارانی جەمرەی دەکرد، وە دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە دروشمەکانتان وەربگرن، چونکە من نازانم پێ دەچێ دوای ئەمساڵ حەج نەکەم.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ ضَرْبِ النَّاسِ وَطَرْدِهِمْ عِنْدَ رَمْيِ الْجِمَارِ

**٢٨٧٨-** عَنْ قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ وَهُوَ ابْنُ عَمَّارٍ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ عَلَى نَاقَتِهِ صَهْبَاءَ لَا ضَرْبَ وَلَا طَرْدَ وَلَا إِلَيْكَ إِلَيْكَ(١).

## باسی سەرزەنشتکردن لە لێدانی خەڵك و دوورخستنەوەیان لە کاتی بەردبارانی جەمرەکان

واتە: قودامەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەممار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی جەژنی قوربان بەردبارانی جەمرەی دەکرد بەسەر وشترەکەیەوە بوو (نازناوی) (صَهْبَاءَ) بوو (واتە: سپی تێکەڵ بە سوور بوو)، لەوێ لێدان و ڕێگری و پاڵپێوەنان و وتەی لاچۆ لاچۆ نەبوو (واتە زۆر بەلەسەرخۆیی ڕێوڕەسمەکەی بەڕێوە دەبرد).

## بَابُ ذِكْرِ الْمَوْقِفِ الَّذِي يَرْمِي مِنْهُ الْجِمَارَ

**٢٨٧٩-** عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ يَقُولُ: لَا تَقُولُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ قُولُوا: السُّورَةُ الَّتِي تُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِإِبْرَاهِيمَ فَقَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ حِينَ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَاسْتَبْطَنَ الْوَادِيَ، ثُمَّ اسْتَعْرَضَهَا -يَعْنِي الْجَمْرَةَ- فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ وَكَبَّرَ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، فَقُلْتُ: إِنَّ نَاسًا يَصْعَدُونَ الْجَبَلَ، فَقَالَ هَا هُنَا وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ رَأَيْتُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ رَمَى(٢).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی ئەو جێگایەی کە بەردبارانی جەمرەی لێوە دەکرێ

واتە: ئەعمەش دەڵێ: گوێم لە حەجاج بوو دەیوت: مەڵێن سورەتی بەقەرە، بەڵکوو بڵێن: ئەو سورەتەی باسی بەقەرەی تێدا کراوە، ئەوەم باس کرد بۆ ئیبڕاهیم، وتی: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید بۆی باس کردم کە ئەو لەگەڵ عەبدوڵادا بوو ﷺ، کاتێ بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، لەنێو شیوەکەوە بەردبارانی کرد، بە حەوت بەرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیر (الله أكبر)ێکی کرد، وتم: خەڵکانێك هەن سەر دەکەون بەسەر کێوەکەدا و بەردباران دەکەن، وتی: ئا لەم شوێنەوەیە سوێند بەو خوایەی هیچ کەسێك شیاوی پەرستش نییە جگە لە ئەو نەبێت، بینیم ئەو کەسەی کە سورەتی بەقەرەی بەسەردا دابەزی لێرەوە بەردبارانی کرد.

## بَابُ اسْتِقْبَالِ الْجَمْرَةِ عِنْدَ رَمْيِهَا وَالْوُقُوفِ عَنْ يَسَارِ الْقِبْلَةِ

**٢٨٨٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّهُ حَجَّ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَّهُ رَمَى الْجَمْرَةَ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَجَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ وَمِنًى عَنْ يَمِينِهِ، وَقَالَ: هَذَا مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ[١].

### باسی ڕووکردنە جەمرە لە کاتی بەردبارانکردنی، وە وەستان لە لای چەپی قیبلە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: ئەو حەجی لەگەڵ عەبدوڵا ﷺ کرد، عەبدوڵا بەردبارانی جەمرەی کرد بە حەوت بەرد، بەیتی خستە لای چەپی و مینایشی خستە لای ڕاستی، وە وتی: ئەم شوێنە جێگای بەردبارانکردنی ئەو کەسەیە کە سورەتی بەقەرەی بەسەردا دابەزی.

## بَابُ التَّكْبِيرِ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ يَرْمِيهَا لِلْجِمَارِ

**٢٨٨١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ أَخِيهِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی تەکبیر (الله أكبر) کردن لەگەڵ هەموو بەردێکدا کە دەیهاوێژێ بۆ جەمرەکان**

واتە: ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە، لە براکەیەوە فەزلی کوڕی عەباس ﵄ دەڵێ: من لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ بووم بەسەر وشترەکەیەوە، بەردەوام تەلبیەی دەکرد تا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، بە حەوت بەردی بچووك بەردبارانی کرد لەگەڵ هەر بەردێك تەکبیرێکی دەکرد.

## بَابُ الذِّكْرِ عِنْدَ رَمْيِ الْجِمَارِ

**٢٨٨٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَرَمْيُ الْجِمَارِ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ»(١).

**باسی زیکر و یادکردن لە کاتی بەردبارانکردنی جەمرەکان**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەوافکردنی دەوری بەیت و نێوان صەفا و مەڕوە و بەردبارانکردنی جەمرەکان، تەنها بۆ بەجێهێنانی زیکر و یادی خوا دانراون.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلنِّسَاءِ وَالضُّعَفَاءِ الَّذِينَ رُخِّصَ لَهُمْ فِي الْإِفَاضَةِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ فِي رَمْيِ الْجِمَارِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

**٢٨٨٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﵄، كَانَ يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، فَمِنْهُمْ مِمَّنْ يَقْدَمُ مِنًى لِصَلَاةِ الْفَجْرِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِذَا قَدِمُوا رَمَوَا الْجَمْرَةَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: أَرْخَصَ فِي أُولَئِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ خَرَّجْتُ طُرُقَ أَخْبَارِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي كِتَابِي الْكَبِيرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أُبَيْنِيَّ لَا تَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلَسْتُ أَحْفَظُ فِي تِلْكَ الْأَخْبَارِ إِسْنَادًا ثَابِتًا مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ، فَإِنْ ثَبَتَ

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

إِسْنَادٌ وَاحِدٌ مِنْهَا، فَمَعْنَاهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ زَجَرَ الْمَذْكُورَ مِمَّنْ قَدَّمَهُمْ تِلْكَ اللَّيْلَةَ عَنْ رَمْيِ الْجِمَارِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، لَا السَّامِعَ الْمَذْكُورَ؛ لِأَنَّ خَبَرَ ابْنِ عُمَرَ يَدُلُّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَذِنَ لِضَعْفَةِ النِّسَاءِ فِي رَمْيِ الْجِمَارِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، فَلَا يَكُونُ خَبَرُ ابْنِ عُمَرَ خِلَافَ خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ إِنْ ثَبَتَ خَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ عَلَى أَنَّ رَمْيَ الْجِمَارِ لِضَعْفَةِ النِّسَاءِ بِاللَّيْلِ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ أَيْضًا عِنْدِي جَائِزٌ لِلْخَبَرِ الَّذِي أَذْكُرُهُ فِي الْبَابِ الَّذِي يَلِي هَذَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ».

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتان و ئەو لاوازانەی کە مۆڵەتیان پێ دراوە لە جەمعەوە بە شەو دەربچن بۆ بەردبارانکردنی جەمرەکان پێش هەڵهاتنی خۆر

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، سالمی کوڕی عەبدوڵا هەواڵی پێ دا، عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ، لە پێشدا ئەوانەی دەنارد کە لاواز و بێتوانا بوون لە کەسوکارەکەی، هەندێکیان بۆ نوێژی بەیانی دەگەیشتنە مینا، هەندێکیشیان دوای نوێژی بەیانی دەگەیشتن، جا کاتێ بگەیشتایەن بەردبارانی جەمرەیان دەکرد، جا عەبدوڵا دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بەوانە داوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی (الْكَبِير) ڕێگاکانی فەرموودەکەی ئیبنو عەباسم هێناوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ئەی منداڵە بچووکەکانم بەردبارانی جەمرە مەکەن تا خۆر هەڵدێت. لەو فەرموودانەدا سەنەدێکم لەبەر نییە لە ڕووی گواستنەوەوە جێگیر بێت، ئەگەر یەك سەنەدیان جێگیر بوو، ئەوە مانای ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لەوەی باس کرا، ئەوانەی ئەو شەوە پێشی خستن بچن بەردبارانی جەمرە بکەن پێش هەڵهاتنی خۆر، چونکە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە ئافرەتە لاوازەکان بەردبارانی جەمرەکان بکەن پێش هەڵهاتنی خۆر، نابێت فەرموودەکەی ئیبنو عومەر پێچەوانەی فەرموودەکەی ئیبنو عەباس بێت، ئەگەر فەرموودەکەی ئیبنو عەباس جێگیر بێت لە ڕووی گواستنەوەوە لەسەر ئەوەی بەردبارانی جەمرەکان بۆ ئافرەتە لاوازەکان بێت لە شەودا پێش دەرچوونی بەرەبەیان لای من دروستە لەبەر ئەو فەرموودەی لە بەشەکەی دوای ئەم بەشە باسی دەکەم ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلنِّسَاءِ اللَّوَاتِي رُخِّصَ لَهُنَّ فِي الْإِفَاضَةِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ فِي رَمْيِ الْجِمَارِ قَبْلَ الْفَجْرِ

**٢٨٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ أَنَّ أَسْمَاءَ ﵂، نَزَلَتْ لَيْلَةَ جَمْعٍ دَارَ الْمُزْدَلِفَةِ، فَقَامَتْ تُصَلِّي، فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ قُمِ انْظُرْ هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: لَا، فَصَلَّتْ، ثُمَّ قَالَتْ: يَا بُنَيَّ انْظُرْ هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ قَالَتِ: ارْتَحِلْ فَارْتَحَلْنَا فَرَمَيْنَا الْجَمْرَةَ، ثُمَّ صَلَّتِ الْغَدَاةَ فِي مَنْزِلِهَا قَالَ: فَقُلْتُ لَهَا يَا هَنْتَاهُ لَقَدْ رَمَيْنَا الْجَمْرَةَ بِلَيْلٍ قَالَتْ: كُنَّا نَصْنَعُ هَذَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، هَذَا حَدِيثُ بُنْدَارٍ قَالَ ابْنُ مَعْمَرٍ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ: أَيْ بُنَيَّ هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ قَالَتْ: فَارْتَحِلُوا، قَالَ: ثُمَّ مَضَيْنَا بِهَا حَتَّى رَمَتِ الْجَمْرَةَ، ثُمَّ رَجَعَتْ فَصَلَّتِ الصُّبْحَ فِي مَنْزِلِهَا، فَقُلْتُ لَهَا يَا هَنْتَاهُ لَقَدْ غَلَّسْنَا؟ قَالَتْ: كَلَّا يَا بُنَيَّ إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَذِنَ لِلظُّعُنِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَذِنَ فِي الرَّمْيِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ لِلنِّسَاءِ دُونَ الذُّكُورِ، وَعَبْدُ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ هَذَا قَدْ رَوَى عَنْهُ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ أَيْضًا قَدِ ارْتَفَعَ عَنْهُ اسْمُ الْجَهَالَةِ.

## باسی مۆڵەتدان بەو ئافرەتانەی کە مۆڵەتیان پێ دراوە لە موزدەلیفە بە شەو بچن بەردبارانی جەمرە بکەن، پێش بەرەبەیانیش بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان

واتە: عەبدوڵا مەولای[٢] ئەسماء دەگێڕێتەوە، ئەسماء ﵂ لە شەوی جەمع دابەزیە موزدەلیفە، هەستا نوێژ بکات، وتی: ئەی کوڕە بچکۆلەکەم هەستە تەماشا بکە بزانە مانگ ئاوا بووە؟ وتم: نەخێر، نوێژی کرد، پاشان وتی: ئەی کوڕە بچکۆلەکەم هەستە تەماشا بکە بزانە مانگ ئاوا بووە؟ وتم: بەڵێ، وتی: بەڕێ بکەوە، دواتر کەوتینە ڕێ، ئینجا بەردبارانی جەمرەمان کرد، پاشان نوێژی بەیانی کرد لە شوێنەکەی خۆی لە موزدەلیفە، وتی: پێم وت: ئەی کابرا ئێمە بە شەو بەردبارانی جەمرەمان کرد، وتی: ئێمە کاتێ لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین ئەوەمان کرد، ئەمە فەرموودەی بوندارە

---

(١) صحيح.

(٢) مةولا واتة: كؤيلةي ئازادكراو.

(کە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە) ئیبنو مەعمەر (کە یەکێکی دیکە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە) وتی: عەبدوڵای مەولای ئەسماء هەواڵی پێ دام لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە وتی: ئەی کوڕە بچکۆلەکەم هەستە تەماشا بکە بزانە مانگ ئاوا بووە؟ وتم: بەڵێ، وتی: بکەونە ڕێ، وتی: پاشان ڕۆیشتین تا بەردبارانی جەمرەمان کرد، پاشان گەڕایەوە لە جێگاکەی خۆی نوێژی بەیانی کرد، پێم وت: ئەی کابرا بەتاریکی بەردبارانی جەمرەمان کرد؟ وتی: نەخێر ئەی کوڕە بچکۆلەکەم پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە ئافرەتان.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بە ئافرەتان پێش دەرچوونی خۆر بەردبارانی جەمرە بکەن، نەك پیاوان، وە ئەم عەبدوڵای مەولای ئەسمائە عەتائی کوڕی ئەبو ریباحیش فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە، بەڕاستی ناوی نەناسراوی (الْجَهَالَةِ) لەسەر هەڵگیراوە. (واتە: بەهۆی ئەوەی عەتائیش فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە لە نەناسراوییەوە بووە بە ناسراو).

## بَابُ قَطْعِ التَّلْبِيَةِ إِذَا رَمَى الْحَاجُّ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ

**٢٨٨٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْعَبَّاسِ رضي الله عنهما، أَنَّ الْفَضْلَ، أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَرَّجْتُ طُرُقَ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ فِي كِتَابِي الْكَبِيرِ، وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ دَالَّةٌ عَلَى أَنَّهُ لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي رَمْيَ الْجَمْرَةِ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ إِذْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ «حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ، وَحَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ» ظَاهِرُهَا حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ بِتَمَامِهَا إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ مِنْ جِنْسِ الْعَرَبِيَّةِ إِذَا رَمَى الرَّامِي حَصَاةً وَاحِدَةً أَنْ يُقَالَ: رَمَى الْجَمْرَةَ، وَإِنَّمَا يُقَالُ رَمَى الْجَمْرَةَ إِذَا رَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ.

---

(١) صحيح.

## باسی کۆتاییهێنان بە تەلبیەکردن کاتێ حەجکەر لە ڕۆژی جەژن بەردبارانی جەمرە دەکات

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، فەزل هەواڵی پێ دا پێغەمبەر ﷺ بەردەوام تەلبیەی دەکرد هەتا بەردبارانی جەمرەی کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی (الْكَبِير) هەموو ڕێگاکانی فەرموودەکانی پێغەمبەرم ﷺ هێناوەتەوە، ئەو دەستەواژەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام تەلبیەی دەکرد هەتا بەردبارانکردنی جەمرە بە حەوت بەرد، چونکە ئەو دەستەواژەیە: (حَتَّى رَمَى الْجَمْرَةَ)، وە دەستەواژەی: (حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ)، ڕواڵەتەکەی ئەوە دەگەیەنێ هەتا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد بەتەواوی، چونکە دروست نییە لە شێوازی عەرەبی ئەگەر بەردبارانکەر بەردێك بهاوێژێ، بوترێ: (رَمَى الْجَمْرَةَ)، بەڵکوو لە کاتێکدا دەوترێ: (رَمَى الْجَمْرَةَ)، ئەگەر حەوت بەردەکە هەموویان بهاوێژێ.

**٢٨٨٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رَمَقْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ بِأَوَّلِ حَصَاةٍ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَعَلَّهُ يَخْطِرُ بِبَالِ بَعْضِ الْعُلَمَاءِ أَنَّ فِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ عِنْدَ أَوَّلِ حَصَاةٍ يَرْمِيهَا مِنْ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ، وَهَذَا عِنْدِي مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كِتَابِنَا أَنَّ الْأَمْرَ قَدْ يَكُونُ إِلَى وَقْتٍ مُؤَقَّتٍ فِي الْخَبَرِ، وَالزَّجْرُ يَكُونُ إِلَى وَقْتٍ مُؤَقَّتٍ فِي الْخَبَرِ، وَلَا يَكُونُ فِي ذِكْرِ الْوَقْتِ مَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بَعْدَ ذَلِكَ الْوَقْتِ سَاقِطٌ، وَلَا أَنَّ الزَّجْرَ بَعْدَ ذَلِكَ الْوَقْتِ سَاقِطٌ، كَزَجْرِهِ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَلَمْ يَكُنْ فِي قَوْلِهِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَتْ، فَالصَّلَاةُ جَائِزَةٌ عِنْدَ طُلُوعِهَا إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ زَجَرَ أَنْ يُتَحَرَّى بِالصَّلَاةِ طُلُوعُ الشَّمْسِ وَغُرُوبُهَا، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ فَزَجَرَ عَنِ الصَّلَاةِ عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَقَالَ: «وَإِذَا ارْتَفَعَتْ فَارَقَهَا»، فَدَلَّهُمْ بِهَذِهِ الْمُخَاطَبَةِ أَنَّ الصَّلَاةَ عِنْدَ طُلُوعِهَا غَيْرُ جَائِزَةٍ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَقَدْ أَمْلَيْتُ مِنْ هَذَا الْجِنْسِ مَسَائِلَ كَثِيرَةً فِي الْكُتُبِ الْمُصَنَّفَةِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ هَذَا التَّأْوِيلِ الْحَدِيثُ الْمُصَرَّحُ الَّذِي حَدَّثْنَاهُ.

---

(١) صحيح.

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: بەوردی تەماشای پێغەمبەرم ﷺ کرد، بەردەوام تەلبیەی دەکرد هەتا یەکەم بەردی هاویشت لە بەردبارانکردنی جەمرە.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێ دەچێت بە خەیاڵی هەندێ لە زانایاندا بێت لەم فەرموودەیەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە یەکەم کاتی بەردهاویشتنی جەمرەی عەقەبە تەلبیەی دەپچڕاند، ئەمەش لەلای من لەو شێوازەیە کە لە چەند شوێنێکی کتێبەکەماندا ڕامگەیاندووە، هەندێ جار فەرمانکردن بە ئەنجامدانی کردەوەیەك لە فەرموودەکەدا تا کاتێکی دیاریکراوە، هەروەها سەرزەنشتکردنیش لە ئەنجامدانی کردەوەیەك لە فەرموودەکەدا تا کاتێکی دیاریکراوە، وە لە باسکردنی کاتەکە هیچ بەڵگەیەك نییە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی فەرمانەکە دوای ئەو کاتە هەڵبوەشێتەوە، هەروەها سەرزەنشتکردنەکەیش لەدوای ئەوکاتە هەڵبوەشێتەوە، وەك سەرزەنشتکردنی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژکردن دوای نوێژ تا خۆر هەڵدێت، لە فەرموودەکەیدا هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر ئەوەی کاتێ خۆر هەڵهات ئەوە نوێژ دروستە لە کاتی هەڵهاتنی، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە کاتی هەڵهاتنی خۆر و ئاوابوونی نوێژ بکرێ، وە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە خۆر لە نێوان هەردوو شاخی شەیتاندا هەڵدێت، بۆیە سەرزەنشتی کردووە لە نوێژکردن لە کاتی دەرچوونی خۆر، وە فەرموویەتی: کاتی خۆر بەرز بۆیەوە شەیتان لێی جیا دەبێتەوە. بەم دواندنە ئەوەی بۆ ئاشکرا کردوون نوێژکردن لە کاتی هەڵهاتنی خۆر دروست نییە تا خۆر بەرز دەبێتەوە، بێگومان لە کتێبەکان بابەتی زۆرم لەسەر ئەم شێوازە باس کردووە، وە بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەم لەیەکدانەوەیە ئەو فەرموودەیە کە بەڕاشکاوی باسمان کرد.

**٢٨٨٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ أَخِيهِ الْفَضْلِ قَالَ: أَفَضْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي عَرَفَاتٍ، فَلَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ قَطَعَ التَّلْبِيَةَ مَعَ آخِرِ حَصَاةٍ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ أَنَّهُ قَطَعَ التَّلْبِيَةَ مَعَ آخِرِ حَصَاةٍ لَا مَعَ أَوَّلِهَا، فَإِنْ لَمْ يَفْهَمْ بَعْضُ طَلَبَةِ الْعِلْمِ هَذَا الْجِنْسَ الَّذِي ذَكَرْنَا فِي الْوَقْتِ، فَأَكْثَرُ مَا فِي هَذَيْنِ الْخَبَرين مِنْ أَسَاسٍ[٢] لَوْ

---

(١) صحيح.

(٢) - وشەی (مِنْ أَسَاسٍ) ئاڵۆزە وەك لە تەحقیقەکاندا هاتووە. وە لە لەبەرگراوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە هاتووە:

قَالَ: لَمْ يُلَبِّ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ أَوَّلِ حَصَاةٍ رَمَاهَا، وَقَالَ الْفَضْلُ: لَبَّى بَعْدَ ذَلِكَ حَتَّى رَمَى الْحَصَاةَ السَّابِعَةَ، فَكُلُّ مَنْ يَفْهَمُ الْعِلْمَ، وَيُحْسِنُ الْفِقْهَ، وَلَا يُكَابِرُ عَقْلَهُ، وَلَا يُعَانِدُ عَلِمَ أَنَّ الْخَبَرَ هُوَ مَنْ يُخْبِرُ بِكَوْنِ الشَّيْءِ أَوْ بِسَمَاعِهِ لَا مِمَّنْ يَدْفَعُ الشَّيْءَ، وَيُنْكِرُهُ، وَقَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ فِي مَوَاضِعَ مِنْ كُتُبِنَا.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە فەزلی برایەوە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات بەڕێ کەوتم، بەردەوام تەلبیەی دەکرد هەتا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیرێکی دەکرد، پاشان لەگەڵ حەوتەمین بەرددا تەلبیەی پچڕاند.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکات پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆتا بەرددا تەلبیەی پچڕاند نەك یەکەم بەرد، ئەگەر هەندێ لە خوێندکاری زانستی شەرعی تێ نەگات لەو شێوازەی کە دەربارەی کات باسمان کرد، جا زۆربەی ئەم دوو فەرموودەیە بنچینەیەکی هەیە[1]، ئەگەر بڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوای یەکەمین بەرد تەلبیەی نەکرد، وە فەزل وتی: دوای یەکەمین بەرد تەلبیەی کرد تا حەوتەمین بەردی هاویشت، ئەوە هەر کەس لە زانست تێ بگات و شارەزای فیقە بێت و فیز و لووتبەرزی بەسەر عەقڵیەوە نەکات و کەللەڕەقی نەنوێنێ، دەزانێ فەرموودە ئەوەیە کە کەسێك هەواڵ بدات بە شتێك یان بەوەی گوێی لێی بووە وەکوو فەرموودەکەی فەزل، نەك ئەو کەسەی ڕەتی دەکاتەوە و نکوولی لێ دەکات وەکوو فەرموودەکەی ئیبنو مەسعود، ئەم بابەتەم لە چەند شوێنێکی کتێبەکانماندا باس کردووە.

## بَابُ تَرْكِ الْوُقُوفِ عِنْدَ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ بَعْدَ رَمْيِهَا يَوْمَ النَّحْرِ

٢٨٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ فِي حَجَّةٍ أَوْ عُمْرَةٍ أَهَلَّ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَيَأْتِي جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، وَلَا يَقِفُ ثُمَّ يَنْصَرِفُ[2].

---

(فَأَكْثَرُ مَا فِي هَذَيْنِ الْخَبَرَيْنِ أمراس). تەماشای تحیقیقي د. ماهر یاسین الفحل بکە، بەهەمان ژمارە فەرموودە.

(١) ئەو برگە هەندێ ئالۆزی تێدایە ناتوانرێ وەرگێڕانی بۆ بکرێ وەك پێویست، خوا زاناترینە.

(٢) صحيح.

## باسی وازهێنان لە وەستان لەلای جەمرەی عەقەبە دوای بەردبارانکردنی لە ڕۆژی جەژنی قوربان

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە ڕێك بۆیەوە لەسەر وشترەکەی لەلای مزگەوتی (ذِي الْحُلَيْفَةِ) لە حەج بووایە یان عومرە تەلبیەی دەکرد، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد، وە وتی: دەهات بۆ لای جەمرەی عەقەبە بە حەوت بەرد دەیهاویشت لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیری دەکرد، نەدەوەستا و پاشان دەڕۆیشت.

## بَابُ الرُّجُوعِ مِنَ الْجَمْرَةِ إِلَى مِنًى بَعْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ لِلنَّحْرِ وَالذَّبْحِ

٢٨٨٩- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: ثُمَّ أَتَى النَّبِيُّ ﷺ الْجَمْرَةَ فَرَمَاهَا، ثُمَّ أَتَى الْمَنْحَرَ، فَقَالَ: «هَذَا الْمَنْحَرُ وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ»[١].

## باسی گەڕانەوە لە جەمرەوە بۆ مینا دوای بەردبارانی جەمرە بە مەبەستی قوربانی و سەربڕینی ئاژەڵ

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای جەمرە بەردبارانی کرد، پاشان هاتەوە بۆ شوێنی سەربڕینی قوربانی، فەرمووی: ئەمە شوێنی قوربانییە و مینایش هەمووی شوێنی سەربڕینی قوربانییە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي النَّحْرِ وَالذَّبْحِ أَيْنَ شَاءَ الْمَرْءُ مِنْ مِنًى

٢٨٩٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى قَالَ: وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ[٢].

---

(١) عبد الرحمن بن الحارث فيه كلام لكن قال الترمذي: ((حسن صحيح)) وكلام المصنف عقب الحديث يقتضي التقوية بالشاهد.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەدان بە بەندە لە هەر شوێنێکی مینا ویستی لەسەر بوو قوربانییەکانی سەربڕێت

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا قوربانی کرد، فەرمووی: هەموو (خاکی) مینا کوشتارگەیە (بۆ هەدی و قوربانییەکان).

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ اخْتِصَارِ الْمَنَازِلِ بِمِنًى إِنْ ثَبَتَ الْخَبَرُ، فَإِنِّي لَسْتُ أَعْرِفُ مُسَيْكَةَ بِعَدَالَةٍ وَلَا جَرْحٍ، وَلَسْتُ أَحْفَظُ لَهَا رَاوِيًا إِلَّا ابْنَتَهَا

**٢٨٩١-** عَنْ يُوسُفَ بن مَاهِك عَن أُمِّهِ مُسَيْكَةَ عَن عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ تَعْنِي رَجُلًا يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَلَا نَبْنِي بِمِنًى بِنَاءً فَيُظِلُّكَ قَالَ: «لَا مِنًى مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ»[١].

## باسی قەدەغەکردن لە دروستکردنی خانوو لە مینا، ئەگەر فەرموودەکە تەواو بێت، چونکە من نازانم موسەیکە دادپەروەرە یان لەکەدارە، وە هیچ گێڕەرەوەیەکم لەبەر نییە لێیەوە فەرموودەکەی لێیەوە گێڕابێتەوە جگە لە کچەکەی

واتە: یوسفی کوڕی ماهیك دەگێڕێتەوە، لە موسەیکەی دایکیەوە، لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ خانوویەکت لە مینا بۆ دروست نەکەین تا ببێتە سێبەر بۆت؟ فەرمووی: نەخێر، مینا شوێنی یەخکردنی سواری ئەو کەسەیە کە زووتر دەگات.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ ذَبْحِ الْإِنْسَانِ وَنَحْرِ نَسِيكِهِ بِيَدِهِ، مَعَ إِبَاحَةِ دَفْعِ نَسِيكِهِ إِلَى غَيْرِهِ لِيَذْبَحَهَا أَوْ يَنْحَرَهَا

**٢٨٩٢-** عَنْ جَعْفَر، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَنَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِيَدِهِ ثَلَاثَةً وَسِتِّينَ يَعْنِي بَدَنَةً، فَأَعْطَى عَلِيًّا، فَنَحَرَ مَا غَبَرَ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.




**باسی چاکتر وایە مرۆڤ بە دەستی خۆی قوربانییەکەی سەر ببڕێت، لەگەڵ ئەوەی ڕێگەدراوە قوربانییەکەی بداتە دەستی کەسێکی دیکە بۆی سەرببڕێ**

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردم وتی: هاتین بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی شەست و سێ وشتری قەڵەوی سەر بڕی، ئەوەی مایەوە دای بە عەلی سەری ببڕی.

## بَابُ نَحْرِ الْبُدْنِ قِيَامًا مَعْقُولَةً ضِدَّ قَوْلِ مَذْهَبِ مَنْ كَرِهَ ذَلِكَ وَجَهِلَ السُّنَّةَ وَسَمَّى السُّنَّةَ بِدْعَةً بِجَهْلِهِ بِالسُّنَّةِ

**٢٨٩٣-** عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَتَى عَلَى رَجُلٍ قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ بِمِنًى لِيَنْحَرَهَا، فَقَالَ: ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً، سُنَّةُ مُحَمَّدٍ ﷺ[١].

**باسی سەربڕینی وشتر بەپێوە و بەقاچ بەستراوەیی، دژی وتەی مەزهەبی ئەو کەسەی پێی باش نییە، وە لە سوننەت تێ نەگەیشتووە و سوننەتی ناو ناوە بە بیدعە بەهۆی ئەوەی لەو سوننەتە نازانێ و بێئاگایە**

واتە: زیادی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئیبنو عومەرم بینی ﷺ هات بۆ لای پیاوێك لە مینا وشترەکەی یەخ دابوو بۆ ئەوەی سەری ببڕێت، وتی: هەڵیسێنە سەرپێ و قاچی ببەستەوە، چونکە ئەوە سوننەتی موحەممەدە ﷺ.

**٢٨٩٤-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: وَنَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ سَبْعَ بَدَنَاتٍ قِيَامًا[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَنَسٍ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا فِي ذِكْرِ الْعَدَدِ الَّذِي لَا يَكُونُ نَفْيًا عَمَّا زَادَ عَلَى ذَلِكَ الْعَدَدِ، وَلَيْسَ فِي قَوْلِ أَنَسٍ: نَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ سَبْعَ بَدَنَاتٍ أَنَّهُ لَمْ يَنْحَرْ بِيَدِهِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِ بَدَنَاتٍ؛ لِأَنَّ جَابِرًا قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ قَدْ نَحَرَ بِيَدِهِ ثَلَاثَةً وَسِتِّينَ مِنْ بُدْنِهِ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی حەوت وشتری سەر بڕی بەپێوە بوون.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەنەس لەو شێوازەیە کە لە چەند شوێنێکی کتێبەکانماندا ڕامگەیاندووە دەربارەی باسی ئەو ژمارەی کە نابێتە هۆی ڕەتکردنەوەی زیاتر لەو ژمارەیە، جا لە فەرموودەکەی ئەنەس: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی حەوت وشتری سەر بڕی. ئەوە ڕەت ناکاتەوە کە بە دەستی زیاتر لەو ژمارەی سەر نەبڕیوە، چونکە جابر ڕایگەیاندووە پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی شەست و سێ وشتری سەر بڕی.

## بَابُ التَّسْمِيَةِ وَالتَّكْبِيرِ عِنْدَ الذَّبْحِ وَالنَّحْرِ

**٢٨٩٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ وَيُسَمِّي وَيُكَبِّرُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يُذْبَحُ بِيَدِهِ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهَا[١].

## باسی ناوهێنانی خوا (بسم الله) و تەکبیر (الله أکبر) کردن لە کاتی سەربڕین و قوربانیکردن

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی بۆری (یان بەرانی پەری) شاخداری سەر بڕی، ناوی خوای هێنا و تەکبیر (الله أکبر)ی کرد، بینیم بە دەستی خۆی سەری دەبڕی و قاچیشی خستبووە سەر لاملیان.

تێبینی:

(الأملح) بەو بەرانە دەوترێ ڕەنگی ڕەش و سپی تێکەڵە، بەڵام ڕەنگی سپی زیاترە.

**٢٨٩٦-** عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ فَقُلْتُ لَهُ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُضَحِّي بِمِثْلِهِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: قەتادە دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷛ بوو دەیوت: منیش پێم وت: تۆ بیستووتە لێیەوە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی دەکرد، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشووی باس کرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْهَدْيِ مِنَ الذُّكْرَانِ وَالْإِنَاثِ جَمِيعًا.

**٢٨٩٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِجَمَلِ أَبِي جَهْلٍ فِي هَدْيِهِ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ وَفِي رَأْسِهِ بُرَّةٌ مِنْ فِضَّةٍ كَانَ أَبُو جَهْلٍ أَسْلَمَهُ يَوْمَ بَدْرٍ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ جَمَلُ أَبِي جَهْلٍ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ الْبُيُوعِ فِي أَبْوَابِ الْأَفْرَاسِ أَنَّ الْمَالَ قَدْ يُضَافُ إِلَى الْمَالِكِ الَّذِي قَدْ مَلَكَهُ فِي بَعْضِ الْأَوْقَاتِ بَعْدَ زَوَالِ مِلْكِهِ عَنْهُ كَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ اَجْعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ ﴿٦٢﴾ ﴾يوسف، فَأَضَافَ الْبِضَاعَةَ إِلَيْهِمْ بَعْدَ اشْتِرَائِهِمْ بِهَا طَعَامًا، وَإِنَّمَا كُنْتُ احْتَجَجْتُ بِهَا؛ لِأَنَّ بَعْضَ مُخَالِفِينَا زَعَمَ أَنَّ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا أَفْلَسَ الرَّجُلُ فَوَجَدَ الرَّجُلُ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ سَائِرِ الْغُرَمَاءِ» فَزَعَمَ أَنَّ هَذَا الْمَالَ هُوَ مَالُ الْوَدِيعَةِ، وَالْغَصْبِ وَمَا لَمْ يَزَلْ مِلْكُ صَاحِبِهِ عَنْهُ، وَقَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ بَيَانًا شَافِيًا فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ.

### باسی ڕێگەدراوە وڵاخی نێر و مێ بکرێ بە هەدیە بەمەبەستی قوربانی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە لەنێو ئەو وشترانەی کە بەهەدی ناردبووی (بۆ کەعبە بەمەبەستی قوربانیکردن) وشترەکەی ئەبو جەهلیشی تێدا بوو، پارچە زیوێك بەسەریەوە بوو، ئەبو جەهل لە ڕۆژی بەدر کوژرا و وشترەکەی بوو بە دەستکەوت.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (جَمَلُ أَبِي جَهْلٍ)، لەو شێوازەیە کە لە کتێبی (الْبُيُوع) لە بەشی ئەسپەکان باسم کردووە، هەندێ جار ماڵ و سامان دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کە ماوەیەك لە ماوەکان موڵکی ئەو بووە دوای ئەوەیش کە لە موڵکی ئەو دەردەچێت، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ اَجْعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمْ فِي رِحَالِهِمْ ﴿٦٢﴾ ﴾، واتە: کەلوپەلەکانیان بۆ

---

(١) حسن.

بخەنەوە نێو بارەکانیان. شمەکەکانی داوەتە پاڵیان دوای ئەوەی خۆراکیان پێ کڕی، بۆیە بە بەڵگە هێنامەوە، چونکە هەندێ لەوانەی پێچەوانەی مەزهەبی ئێمەن پێیان وایە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (إِذَا أَفْلَسَ الرَّجُلُ فَوَجَدَ الرَّجُلُ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ سَائِرِ الْغُرَمَاءِ)، واتە: ئەگەر پیاو مایەپووچ بوو، پیاوێکی دیکە ماڵەکەی لەلای بینییەوە ئەوە ئەو لەپێشترە بە هەڵگرتنەوەی لە هەموو ئەوانی دیکە. پێی وایە ئەو ماڵ و سامانە ماڵی خوازراو و داگیرکراوە، وە ئەو ماڵەی کە هێشتا هەر موڵکی خاوەنەکەیەتی، لەو شوێنەدا بەتێروتەسەلی باسم کردووە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ إِهْدَاءِ مَا قَدْ غَنِمَ مِنْ أَمْوَالِ أَهْلِ الشِّرْكِ وَالْأَوْثَانِ أَهْلَ الْحَرْبِ مِنْهُ مُغَايَظَةً لَهُمْ

**٢٨٩٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي هَدَايَاهُ جَمَلًا لِأَبِي جَهْلٍ فِي رَأْسِهِ بُرَةٌ مِنْ فِضَّةٍ لِيَغِيظَ الْمُشْرِكِينَ بِذَلِكَ[١].

## باسی چاکتر وایە ئەوەی بەغەنیمەت و دەستکەوت گیراوە لە ماڵ و سامانی هاوبەشدانەران و بتپەرستانی جەنگاوەر بکرێت بەهەدی بۆ قوربانیکردن لەبەر ئەوەی پێی خەفەتبار بن

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە لەنێو ئەو وشترانەی کە بەهەدی ناردبووی (بۆ کەعبە بەمەبەستی قوربانیکردن) وشترەکەی ئەبو جەهلیشی تێدا بوو، پارچە زیوێك بەسەریەوە بوو، بۆ ئەوەی هاوبەشدانەران بەوە خەمبار و خەفەتبار بن.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَوْجِيهِ الذَّبِيحَةِ لِلْقِبْلَةِ، وَالدُّعَاءِ عِنْدَ الذَّبْحِ

**٢٨٩٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَبَحَ يَوْمَ الْعِيدِ كَبْشَيْنِ، ثُمَّ قَالَ حِينَ وَجَّهَهُمَا: «إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلَاتِي

---

(١) حسن.

وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُمَّ مِنْكَ وَلَكَ مِنْ مُحَمَّدٍ وَأُمَّتِهِ»(١).

## باسی چاكتر وایە ئاژەڵی قوربانی لە كاتی سەربڕیندا ڕووی بكرێتە قیبلە، وە لە كاتی سەربڕینیدا بپاڕێتەوە

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن دوو بەرانی سەر بڕی، پاشان كاتێ سەری بڕین ڕووی كردنە قیبلە و فەرمووی: بەڕاستی من ڕووم كردە ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە بەنییەت و مەبەستێكی پاك لامدا و بەلای ئایینی حەقدا و لە هاوبەشدانەران نیم، بەڕاستی نوێژ و سەربڕین و ژیان و مردنم تەنها بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانە هیچ هاوبەشێكی نییە، بەوە فەرمانم پێ كراوە من لە یەكەمینی مسوڵمانانم، خوایە ئەو ئاژەڵە لە تۆوەیە (تۆ پێت بەخشیوم) وە بۆ تۆشە (بۆ تۆ دەیكەم بە قوربانی) لەبری موحەممەد و ئوممەتەكەی.

## بَابُ إِبَاحَةِ اشْتِرَاكِ النَّفَرِ فِي الْبَدَنَةِ وَالْبَقَرَةِ الْوَاحِدَةِ، وَإِنْ كَانَ مَنْ يَشْتَرِكُ فِي الْبَقَرَةِ الْوَاحِدَةِ أَوِ الْبَدَنَةِ الْوَاحِدَةِ مِنْ قَبَائِلَ شَتَّى لَيْسُوا مِنْ أَهْلِ بَيْتٍ وَاحِدٍ، مَعَ الدَّلِيلِ أَنَّ سُبْعَ بَدَنَةٍ وَسُبْعَ بَقَرَةٍ تَقُومُ مَقَامَ شَاةٍ فِي الْهَدْيِ

**٢٩٠٠-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا ﷺ يَقُولُ: اشْتَرَكْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ كُلُّ سَبْعَةٍ فِي بَدَنَةٍ، زَادَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي حَدِيثِهِ: وَنَحَرْنَا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ بَدَنَةً وَقَالَا جَمِيعًا: فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ أَرَأَيْتَ الْبَقَرَةَ اشْتَرَكَ فِيهَا مَنْ يَشْتَرِكُ فِي الْجَزُورِ؟ فَقَالَ: مَا هِيَ إِلَّا مِنَ الْبُدْنِ وَخَصَّ جَابِرٌ الْحُدَيْبِيَةَ، وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَنَحَرْنَا يَوْمَئِذٍ كُلَّ بَدَنَةٍ عَنْ سَبْعَةٍ وَقَالَ ابْنُ مَعْمَرٍ: قَالَ: اشْتَرَكْنَا كُلُّ سَبْعَةٍ فِي بَدَنَةٍ وَنَحَرْنَا سَبْعِينَ بَدَنَةً يَوْمَئِذٍ وَالْبَاقِي لَفْظًا وَاحِدًا(٢).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەدراوە چەند کەسێك بەشدار بن لە یەك وشتر و مانگایەکدا (بۆ قوربانیکردن)، ئەگەرچی ئەوانەی بەشدار دەبن لە مانگایەك یان وشترێك لە چەند هۆز و تیرەیەکی جیاواز بن، لەیەك خانەوادە نەبن، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی حەوتیەکی وشتر و حەوتیەکی مانگا لە جێگای کاوڕێکی هەدی دەشێ بۆ قوربانی

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە جابر بوو ﷺ دەیوت: لە حەج و عومرەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشدار بووین هەر حەوت کەس لە وشترێکدا، عەبدوڕەحمان (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) لە فەرموودەکەیدا ئەوەشی زیاد کرد: لەو ڕۆژەدا حەفتا وشترمان سەر بڕی، هەردوو گێڕەرەوەی فەرموودەکە وتیان: پیاوێك پێی وت: ئایا پێت چۆنە پیاو لە مانگایەکدا بەشدار بێت وەك ئەوەی لە وشترێك بەشدار بووە؟ فەرمووی: بێگومان مانگاش وەکوو وشترە. جابر ئەوەی تایبەت کرد بە حودەیبیە. عەبدوڕەحمان وتی: ئەو ڕۆژە هەر وشترێکمان سەر بڕی بۆ حەوت کەس، ئیبنو مەعمەریش (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: ئەو ڕۆژە هەر حەوت کەس لە وشترێکدا بەشداربوون، وە حەفتا وشترمان سەربڕی، وە ئەوەی ماوە لە فەرموودەکە یەك دەستەواژەیە.

**٢٩٠١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ[1].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە قوربانیمان کرد وشترێك لە بری حەوت کەس بوو، مانگایەکیش لە بری حەوت کەس.

## بَابُ إِبَاحَةِ اشْتِرَاكِ سَبْعَةٍ مِنَ الْمُتَمَتِّعِينَ فِي الْبَدَنَةِ الْوَاحِدَةِ وَالْبَقَرَةِ الْوَاحِدَةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ سُبْعَ بَدَنَةٍ وَسُبْعَ بَقَرَةٍ مِمَّا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، إِذِ اللَّهُ ﷻ أَوْجَبَ عَلَى الْمُتَمَتِّعِ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ إِذَا وَجَدَهُ

---

(١) صحيح.

٢٩٠٢- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ كُنَّا نَتَمَتَّعُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَذْبَحُ الْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ نَشْتَرِكُ فِيهَا[١].

**باسی ڕێگەدراوە بەوانەی تەمەتوعیان کردووە (واتە: عومرەی لە مانگەکانی حەجدا کردووە لەوێ مایەوە و ئیحرامی شکاند دوای ئەوەی ئیحرامی بۆ عومرە بەست) حەوت کەس بەشداربن لە یەك وشتر یان مانگایەك، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە حەوتیەکی وشترێك و حەوتیەکی مانگایەك لەوەی بۆی ئاسانە لە هەدی بۆ قوربانی، چونکە خوا ﷻ واجبی کردووە لەسەر ئەو کەسەی تەمەتوعی کردووە ئەوەی ئاسانە بۆی لە ئاژەڵی هەدیە(بیکات بە قوربانی) ئەگەر دەستی کەوت**

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ تەمەتوعمان دەکرد، مانگایەکمان سەردەبڕی لە بری حەوت کەس بەشدار دەبووین تیایدا.

## بَابُ اشْتِرَاكِ النِّسَاءِ الْمُتَمَتِّعَاتِ فِي الْبَقَرَةِ الْوَاحِدَةِ

٢٩٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَمَّنِ اعْتَمَرَ مِنْ نِسَائِهِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً بَيْنَهُنَّ[٢].

## باسی بەشداریپێکردنی ئافرەتانی تەمەتوعکار لە یەك مانگادا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبری ئەو هاوسەرانەی عومرەیان کردبوو لە حەجیماڵئاوایدا مانگایەکی سەربڕی.

## بَابُ إِجَازَةِ الذَّبْحِ وَالنَّحْرِ عَنِ الْمُتَمَتِّعَةِ بِغَيْرِ أَمْرِهَا وَعِلْمِهَا

٢٩٠٤- عَن عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: فَلَمَّا كُنَّا مِنًى أُتِيتُ بِلَحْمِ بَقَرَةٍ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا قَالُوا: هَذَا لَحْمُ بَقَرٍ ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی ڕێگەدراوە لەبری ئەو ئافرەتانەی تەمەتوعیان کردووە مانگا یان وشترێك سەر ببڕدرێ بەبێ ئەوەی ئاگادار بن و زانیارییان هەبێت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ لە مینا بووین، گۆشتی مانگام بۆ هێنرا، وتم: ئەوە چییە؟ وتیان: ئەوە گۆشتی مانگایە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبری خێزانەکانی مانگای کرد بە قوربانی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الضَّحِيَّةِ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْهَدْيِ الْوَاجِبِ إِذْ نِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ فِي حِجَّتِهِ كُنَّ مُتَمَتِّعَاتٍ خَلَا عَائِشَةَ الَّتِي صَارَتْ قَارِنَةً لِإِدْخَالِهَا الْحَجَّ عَلَى الْعُمْرَةِ لَمَّا لَمْ يُمْكِنْهَا الطَّوَافُ وَالسَّعْيُ لِعِلَّةِ الْحَيْضَةِ الَّتِي حَاضَتْ قَبْلَ أَنْ تَطُوفَ وَتَسْعَى لِعُمْرَتِهَا

**٢٩٠٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَضْحَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ بِالْبَقَرَةِ هَذَا لَفْظُ عَبْدِ الْجَبَّارِ وَعَلِيٍّ، فَأَمَّا أَبُو مُوسَى فَإِنَّهُ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا، وَحَاضَتْ بِسَرِفَ قَبْلَ أَنْ تَدْخُلَ مَكَّةَ، فَقَالَ لَهَا: «أَقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ». قَالَتْ: فَلَمَّا كُنَّا بِمِنًى أُتِيتُ بِلَحْمِ بَقَرٍ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا قَالُوا: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَزْوَاجِهِ بِالْبَقَرِ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار ناوی قوربانی بۆ ئاژەڵی هەدیەی واجب بەکار دەهێنرێ، چونکە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە حەجەکەیدا هەموویان تەمەتوعیان کردبوو جگە لە عائیشە نەبێت، کە ئەو قیرانی کرد، چونکە حەجی پێش خست بەسەر عومرەکەیدا، نەیتوانی تەواف و هاتوچۆی نێوان صەفا و مەروە بکات لەبەر ئەوەی کەوتە حەیزەوە پێش ئەوەی تەواف و هاتوچۆی عومرەکەی بکات

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبری خێزانەکانی مانگایەکی کرد بە قوربانی، -ئەمە دەستەواژەی عەبدولجەبار و عەلییە (کە لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە فەرموودەکەیان هێناوە)، بەڵام ئەبو موسا (کە ئەویش لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە فەرموودەکەی هێناوە) وتی: پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرموو، کاتێ لە

---

(١) صحيح.

(سَرِفَ) (کە جێگایەکە شەش میل لە مەککەوە دوورە) کەوتە حەیزەوە، پێش ئەوەی بچێتە نێو مەککە، پێی فەرموو: ئەوەی حاجی دەیکات تۆش بیکە بەڵام تەوافیماڵی خوا مەکە. وتی: کاتێ کە لە مینا بووین، گۆشتی مانگام بۆ هێنرا، وتم: ئەوە چییە؟ وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگایەکی لەبری خێزانەکانی کرد بە قوربانی.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا حَظْرَ فِي إِخْبَارِ جَابِرٍ: «نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ» أَنْ لَا تُجْزِئُ الْبَدَنَةُ عَنْ أَكْثَرِ مِنْ سَبْعَةٍ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي كُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْعَرَبَ قَدْ تَذْكُرُ عَدَدَ الشَّيْءِ لَا تُرِيدُ نَفْيًا لِمَا زَادَ عَنْ ذَلِكَ الْعَدَدِ**

**٢٩٠٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ اسْحَاقَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ بنِ الزُّبَيْرِ عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، وَمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ ﷺ، أَنَّهُمَا حَدَّثَاهُ قَالَا: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ يُرِيدُ زِيَارَةَ الْبَيْتِ لَا يُرِيدُ قِتَالًا، وَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ سَبْعِينَ بَدَنَةً، وَكَانَ النَّاسُ سَبْعَمِائَةِ رَجُلٍ، فَكَانَتْ كُلُّ بَدَنَةٍ عَنْ عَشَرَةِ نَفَرٍ، قَالَ مُحَمَّدٌ: فَحَدَّثَنِي الْأَعْمَشُ عَنْ أَبِي سُفْيَانَ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: كُنَّا أَصْحَابُ الْحُدَيْبِيَةِ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی لە فەرموودەکەی جابردا هاتووە: (نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ)، واتە: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ وشترمان سەر بڕی لەبری حەوت کەس. هیچ قەدەغەکردنێك نییە لە وتەکەیدا ئەوەی دروست نەبێت وشتر لە جیاتی زیاتر لە حەوت کەس سەر ببڕدرێت، ئەمەش لەو شێوازەیە کە لە چەندین شوێنی کتێبەکانماندا باسمان کردووە هەندێ جار عەرەب باسی شتێك دەکات مەبەستی پێی ڕەتکردنەوەی زیاتر لەو ژمارە نییە**

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەگێڕێتەوە، لە موحەممەدی کوڕی موسلیمی زوهرییەوە، لە عوروەی کوڕی زوبەیر، لە میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەڕوانی کوڕی حەکەمەوە ﷺ، هەردووکیان باسیان کرد وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە دەرچوو بەمەبەستی زیارەتکردنی کەعبە، مەبەستی جەنگ نەبوو، وە لەگەڵ

---

(١) صحيح.

**خۆیدا حەفتا وشتری هەدی بە قوربانی برد، ئەو کات خەڵکەکە حەوت سەد کەس دەبوون، جا هەر وشترێك بۆ دە کەس بوو. موحەممەد وتی: ئەعمەش بۆی باس کردم لە ئەبو سوفیان لە جابری کوڕی عەبدوڵای ئەنصارییەوە وتی: ئێمەی هاوەڵانی حودەیبیە هەزار و چوار سەد کەس دەبووین.**

**٢٩٠٧-** عَن عُرْوَةَ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، وَمَرْوَانَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي بِضْعَ عَشْرَةَ مِائَةً مِنْ أَصْحَابِهِ، فَلَمَّا كَانَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ قَلَّدَ الْهَدْيَ وَأَشْعَرَهُ، فَأَحْرَمَ مِنْهَا فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ ابْنِ إِسْحَاقَ سَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ سَبْعِينَ بَدَنَةٍ، كَانَ النَّاسُ سَبْعَمِائَةِ رَجُلٍ يُرِيدُ سَبْعَمِائَةِ رَجُلِ الَّذِينَ نَحَرَ عَنْهُمُ السَّبْعِينَ الْبَدَنَةَ لَا أَنَّ جَمِيعَ أَصْحَابِهِ الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ بِالْحُدَيْبِيَةِ كَانُوا سَبْعَمِائَةِ رَجُلٍ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ اسْمَ النَّاسِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ النَّاسِ، كَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ ﴿١٧٣﴾﴾ آل عمران، فَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ كُلَّ النَّاسِ لَمْ يَقُولُوا وَلَا كُلَّ النَّاسِ قَدْ جَمَعُوا لَهُمْ، وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾﴾ البقرة، فَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ جَمِيعَ النَّاسِ لَمْ يُفِيضُوا مِنْ عَرَفَاتٍ، وَإِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ أَفَاضَ النَّاسُ بَعْضَ النَّاسِ لَا جَمِيعَهُمْ، وَهَذَا بَابٌ طَوِيلٌ لَيْسَ هَذَا مَوْضِعَهُ، وَخَبَرُ ابْنِ عُيَيْنَةَ يُصَرِّحُ بِصِحَّةِ هَذَا التَّأْوِيلِ أَلَا تَسْمَعُهُ قَالَ فِي الْخَبَرِ، وَكَانُوا بِضْعَ عَشْرَةَ مِائَةً، فَأَعْلَمَ أَنَّ جَمِيعَ أَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ أَلْفٍ وَثَلَاثِ مِائَةٍ إِذِ الْبِضْعُ مَا بَيْنَ الثَّلَاثِ إِلَى الْعَشْرِ، وَهَذَا الْخَبَرُ فِي ذِكْرِ عَدَدِهِمْ شَبِيهٌ بِخَبَرِ أَبِي سُفْيَانَ عَنْ جَابِرٍ أَنَّهُمْ كَانُوا بِالْحُدَيْبِيَةِ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، فَهَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ أَيْضًا أَنَّهُمْ كَانُوا أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةٍ، فَدَلَّتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ فِي خَبَرِ ابْنِ إِسْحَاقَ، وَكَانَ النَّاسُ سَبْعَمِائَةِ رَجُلٍ، وَكَانُوا بَعْضَ النَّاسِ الَّذِينَ كَانُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْحُدَيْبِيَةِ لَا جَمِيعَهُمْ، فَعَلَى هَذَا التَّأْوِيلِ وَهَذِهِ الْأَدِلَّةِ قَدْ نَحَرَ مِنْ بَعْضِهِمْ عَنْ كُلِّ عَشَرَةٍ مِنْهُمْ بَدَنَةً، نَحَرَ عَنْ بَعْضِهِمْ عَنْ كُلِّ سَبْعَةٍ مِنْهُمْ بَدَنَةً أَوْ بَقَرَةً، فَقَوْلُ جَابِرٍ اشْتَرَكْنَا فِي الْجَزُورِ سَبْعَةً، وَفِي الْبَقَرَةِ سَبْعَةٌ، يُرِيدُ بَعْضَ أَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ، وَخَبَرُ الْمِسْوَرِ وَمَرْوَانَ اشْتَرَكَ عَشَرَةٌ فِي بَدَنَةٍ أَيْ سَبْعُمِائَةٍ مِنْهُمْ وَهُمْ نِصْفُ أَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ لَا كُلُّهُمْ.

**واتە: عوروە دەگێڕێتەوە، لە میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەڕوانەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەردەمی حودەیبیە لەگەڵ زیاتر لە هەزار کەسێك لە هاوەڵانی دەرچوو،**

---

(١) صحيح.

کاتێ گەیشتن بە (ذِي الْحُلَيْفَة) ملوانکەی لە ملی ئاژەڵە هەدییەکان کرد بۆ قوربانی، برینەی کردن و ئیحرامیشی بەست بۆ عومرە، دواتر فەرمموودەکەی باس کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرمموودەکەی ئیبنو ئیسحاقدا هاتووە حەفتا سەر وشتری بە قوربانی بەهەدی لەگەڵ خۆی هێنا، ئەوکات خەڵکەکە حەوت سەد پیاو بوون، مەبەستی ئەوە بووە حەفتا سەری لە بری حەوت سەد کەس سەر بڕی، نەك هەموو ئەو هاوەڵانەی لەگەڵی بوون حەوت سەد پیاو بوون، ئەمەش لەو شێوازەیە کە دەڵێین: هەندێ جار ناوی (النَّاسِ) خەڵك بۆ بەشێك لە خەڵك (النَّاسِ) بەکاردێت، وەکوو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ ﴿١٧٣﴾﴾، مرۆڤ بەو زانست و زانیارییەی کە هەیەتی دەزانێ هەموو خەڵك ئەوەیان نەوت، وە هەموو خەڵکیش کۆ نەبوونەوە، بەهەمان شێوە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾﴾، مرۆڤ بەو زانست و زانیارییەی کە هەیەتی دەزانێ هەموو خەڵك لە عەرەفەوە بەڕێ نەکەوتن، بەڵکوو مەبەستی لە فەرمایشتەکەی: (أَفَاضَ النَّاسُ)، هەندێ لە خەڵك بوو نەك هەموویان، ئەمەش بابەتێکی دووردرێژە ئێرە شوێنی ئەوە نییە درێژەی پێ بدرێ، وە فەرمموودەکەی ئیبنو عویەینە بەڕاشکاوی باس لە ڕاستی ئەم لەیەکدانەوەیە دەکات، ئایا نەتبیستووە لە فەرمموودەکەدا وتی: پتر لە هەزار کەسێك دەبوون، جا ڕایگەیاندووە هەموو ئەوانەی لە حودەیبیە بوون زیاتر بوون لە هەزار و سێ سەد کەس، چونکە وشەی (الْبِضْعُ) لە نێوانی سێ بۆ دە کەسە، وە ئەم فەرمموودەیەش لە باسی ژمارەیاندا لە فەرمموودەکەی ئەبو سوفیان دەچێت لە جابرەوە وتی: ئەوان لە حودەیبیە هەزار و چوار سەد کەس بوون، هەروەها ئەم فەرمموودەیە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکات ئەوان هەزار و چوار سەد کەس بوون، جا ئەم دەستەواژەیە بەڵگەیە لەسەر وتەکەی لە فەرمموودەکەی ئیبنو ئیسحاقدا: خەڵکەکە حەوت سەد پیاو دەبوون، مەبەستی هەندێ لەوانە بوو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە حودەیبیە بوو نەك هەموویان، جا لەسەر ئەم لێکدانەوەیە و ئەم بەڵگانە لەبری هەر دە کەسێك وشترێکی قەڵەوی سەر بڕی، وە لەبری هەندێکی دیکەیان بۆ هەر حەوت کەسێك وشترێك یان مانگایەکی سەر بڕی، جا وتەکەی جابر: هەر حەوت کەس لە وشترێکدا بەژدار بووین، وە حەوت کەس لە مانگایەکدا بەژدار بووین، مەبەستی لە هەندێ لەو خەڵکە بوو لە حودەیبیە، وە فەرمموودەکەی میسوەر و

مەڕوان: وشترێك بۆ دە کەس، واتە حەوت سەد کەس لەوان، جا ئەو ڕێژەیە نیوەی خەڵکەکە بوون لە حودەیبیە نەك هەموویان.

**٢٩٠٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَحَضَرَ النَّحْرُ فَاشْتَرَكْنَا فِي الْبَقَرَةِ سَبْعَةٌ، وَفِي الْبَعِيرِ عَشَرَةٌ[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بووین، وشتری قوربانی ئامادەبوو، لە مانگایەکدا حەوت کەس بەژدار بووین، لە وشترێکیشدا دە کەس.

**٢٩٠٩-** وَخَبَرُ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﵁ فِي قَسْمِ الْغَنَائِمِ، فَعَدَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَشَرَةً مِنَ الْغَنَمِ بِجَزُورٍ كَالدَّلِيلِ عَلَى صِحَّةِ هَذِهِ الْمَسْأَلَةِ[2].

واتە: وە فەرموودەکەی ڕافیعی کوڕی خەدیج ﵁ لە دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ دە مەڕی بەرانبەر کرد بە وشترێك، وەك بەڵگەیەکە لەسەر ڕاستی ئەم بابەتە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْمُغَالَاةِ بِثَمَنِ الْهَدْيِ وَكَرَائِمِهِ إِنْ كَانَ شَهْمُ بْنُ الْجَارُودِ مِمَّنْ يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِخَبَرِهِ وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي قَالَ الْمُطَّلِبِيّ

**٢٩١٠-** فِي عَقِبِ خَبَرِ أَبِي ذَرٍّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ لَمَّا سُئِلَ أَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ قَالَ: «أَغْلَاهَا ثَمَنًا وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا»، فَقَالَ فِي عَقِبِ هَذَا الْخَبَرِ، وَالْفِعْلُ مُضْطَرٌّ إِلَى أَنْ يَعْلَمَ أَنَّ كُلَّ مَا عَظُمَتْ رَزِيَّتُهُ عِنْدَ الْمَرْءِ كَانَ أَعْظَمَ لِثَوَابِ اللَّهِ إِذَا أَخْرَجَهُ لِلَّهِ[3].

## باسی چاکتر وایە بەندە بەنرخترین و گرانبەهاترین ئاژەڵ بکاتە هەدی و قوربانی، ئەگەر شەهمی کوڕی جارود لەوانە بێت کە دروستە فەرموودەکەی وەربگیرێ و بکرێ بە بەڵگە، ئەمەش لەو شێوازەیە کە موتەلیبی (واتە: ئیمام شافیعی) فتوای پێداوە

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: لە کۆتایی فەرموودەکەی ئەبو زەڕدا ﷺ هاتووە، کاتێ پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ کام لە ئازادکردنی بەندەکان چاکترینە؟ فەرمووی: ئەوەیان کە نرخی گرانترە و چاکترینە لەلای خاوەنەکەی. جا لە کۆتایی ئەم فەرموودەدا وتی: پێویستە بزانێ هەر شتێك لای خاوەنەکەی بەنرختر بێت ئەوە پاداشتەکەی لای خوا زیاترە، ئەگەر لەبەر خوا بەخشی.

**٢٩١١-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَهْدَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ نَجِيبًا لَهُ أَعْطَى بِهَا ثَلَاثَمِائَةِ دِينَارٍ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَهْدَيْتُ نَجِيبَةً، وَإِنِّي أُعْطِيتُ بِهَا ثَلَاثَمِائَةِ دِينَارٍ أَفَأَبِيعُهَا وَأَشْتَرِي بِثَمَنِهَا بُدْنًا، فَأَنْحَرُهَا قَالَ: «لَا انْحَرْهَا إِيَّاهَا»[١].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وشترێکی بەهێزی هەبوو سوك و سوڵ بوو بۆ ڕێگاوبان، بە سێ سەد دینار کڕیبووی، کردی بە هەدیە (بۆ بەیت بەمەبەستی قوربانی)، جا هاتە خزمەت پێغەمبەرو ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من وشترێکی بەهێزم هەیە سوك و سوڵە بۆ ڕێگاوبان، کردوومە بە هەدیە، وە سێ سەد دینارم پێی داوە، ئایا بیفرۆشم و بە نرخەکەی وشترێکی قەڵە و بکڕم و بیکەم بە قوربانی، فەرمووی: نەخێر (مەیفرۆشە)، وشترەکە سەر ببڕە.

## بَابُ ذِكْرِ الْعُيُوبِ الَّتِي تَكُونُ فِي الْأَنْعَامِ فَلَا تُجْزِئُ هَدْيًا وَلَا ضَحَايَا إِذَا كَانَ بِهَا بَعْضُ تِلْكَ الْعُيُوبِ

**٢٩١٢-** عَن عُبَيْدِ بْنِ فَيْرُوزَ قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ ﷺ حَدِّثْنِي مَا كَرِهَ أَوْ نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْأَضَاحِيِّ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَكَذَا بِيَدِهِ، وَيَدِي أَقْصَرُ مِنْ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «أَرْبَعٌ لَا تُجْزِئُ فِي الْأَضَاحِي: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنِ عَوَرُهَا وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلَعُهَا، وَالْكَسِيرُ الَّتِي لَا تَنْقَى»، قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ نَقْصٌ فِي الْأُذُنِ وَالْقَرْنِ قَالَ: «فَمَا كَرِهْتَ فَدَعْهُ، وَلَا تُحَرِّمْهُ عَلَى غَيْرِكَ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی ئەو کەموکوڕییانەی لە ئاژەڵاندایە، کە نە بۆ هەدی دەشێن و نە بۆ قوربانی، ئەگەر هەندێ لەو کەموکوڕییانەیان تێدابێ

واتە: عوبەیدی کوڕی فەیروز دەڵێ: بە بەڕائم ﷺ وت: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی باش نەبووە یان قەدەغەی لێ کردووە لە قوربانییەکان بۆم باس بکە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەم شێوە بە دەستی ئاماژەی کرد، وە دەستم بچووکترە لە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ: چوار ئاژەڵ دروست نین بۆ قوربانیکردن: کوێرێك، کوێرییەکەی دیار بێت، نەخۆشێك، نەخۆشییەکەی دیار بێت، شەلێك بەئاشکرا بشەلێت، وە قاچی شکابێت نەتوانێ ڕێ بکات، وتی: من حەز ناکەم کەموکوڕی لە گوێ و شاخیدا هەبێت، وتی: چیت پێ ناخۆشە وازی لێ بێنە و مەیکە قوربانی، بەڵام لەسەر خەڵکی قەدەغەی مەکە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ ذَبْحِ الْعَضْبَاءِ فِي الْهَدْيِ وَالْأَضَاحِي زَجْرَ اخْتِيَارٍ، أَنَّ صَحِيحَ الْقَرْنِ وَالْأُذُنِ أَفْضَلُ مِنَ الْعَضْبَاءِ، لَا أَنَّ الْعَضْبَاءَ غَيْرُ مُجْزِيَةٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمَّا أَعْلَمَ أَنَّ أَرْبَعًا لَا تُجْزِئُ، دَلَّهُمْ بِهَذَا الْقَوْلِ أَنَّ مَا سِوَى ذَلِكَ الْأَرْبَعِ جَائِزٌ

**٢٩١٣**- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ نَهَى أَنْ يُضَحِّيَ بِأَعْضَبِ الْقَرْنِ وَالْأُذُنِ قَالَ قَتَادَةُ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ فَقَالَ: الْعَضْبُ النِّصْفُ فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لە سەربڕینی ئاژەڵی هەدی و قوربانی گوێبڕاو و شاخشکاو، سەرزەنشت کردنێکە بۆ سەرپشکبوون، بێگومان شاخی تەواو و گوێی تەواو چاکترە لە گوێبڕاو و شاخشکاو، نەك بەو مانایەی ئاژەڵی گوێبڕاو و شاخشکاو نادروست بێت بۆ قوربانی، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ڕایگەیاند چوار ئاژەڵ دروست نییە بۆ قوربانی، بەو وتەیە ڕێنمایی کردن کە جگە لەو چوارە دروستە بۆ قوربانی

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد حەیوانی شاخشکاو و گوێبڕاو بکرێ بە قوربانی، قەتادە وتی: ئەوەم بۆ سەعیدی کوڕی موسەیب باس کرد وتی: (الْعَضْبُ) نیو بەرەو سەرەوەیە.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ ذَبْحِ ذَاتِ النَّقْصِ فِي الْعُيُونِ وَالآذَانِ فِي الْهَدْيِ وَالضَّحَايَا نَهْيُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ؛ إِذْ صَحِيحُ الْعَيْنَيْنِ وَالأُذُنَيْنِ أَفْضَلُ لَا أَنَّ النَّقْصَ إِذَا لَمْ يَكُنْ عَوَرًا بَيِّنًا غَيْرُ مُجْزِئٍ، وَلَا أَنَّ نَاقِصَ الأُذُنَيْنِ غَيْرُ مُجْزِئٍ

**٢٩١٤-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يَقُولُ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ(١).

## باسی نەهیکردن لە سەربڕینی ئەو ئاژەڵانەی کە کەموکوڕی لە چاو و گوێیاندا هەیە بەمەبەستی هەدی و قوربانی نەهیکردنێکە بۆ پەسەندی و ڕێنیشاندان، لە کاتێکدا چاوساغ و گوێساغ چاکترە، ئەمە بەومانایە نایەت ئەگەر کەموکوڕی لە بینینیدا هەبوو دروست نییە، هەروەها کەموکوڕی لە گوێیەکانیدا بوو دروست نییە

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین سەرنجی سەلامەتی چاو و گوێچکەی ئاژەڵی قوربانی بدەین (تا دڵنیا بین کەموکوڕی تێدا نییە).

**٢٩١٥-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ حُجَيَّةَ بْنِ عَدِيٍّ أَنَّ رَجُلًا، سَأَلَ عَلِيًّا ﷺ عَنِ الْبَقَرَةِ، فَقَالَ: عَنْ سَبْعَةٍ فَقَالَ: الْقَرْنُ، فَقَالَ: لَا يَضُرُّكَ قَالَ: الْعَرَجُ؟ قَالَ: إِذَا بَلَغَتِ الْمَنْسِكَ قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَمَرَنَا أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ(٢).

واتە: سەلەمەی کوڕی کوهەیل دەگێڕێتەوە، لە حوجەییەی کوڕی عەدیەوە، پیاوێك پرسیاری لە عەلی ﷺ کرد دەربارەی مانگا (لە بری چەند کەسە)؟ وتی: لە بری حەوت کەسە، وتی: ئەگەر قۆچی شکابێت؟ وتی: زیانی بۆت نییە، وتی: ئەگەر شەل بێت؟ وتی: ئەگەر بگات بە شوێنی سەربڕین (دەشێ و سەری ببڕە)، دواتر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین سەرنجی سەلامەتی چاو و گوێچکەی ئاژەڵی قوربانی بدەین (تا دڵنیا بین کەموکوڕی تێدا نییە).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده حسن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي ذَبْحِ الْجَذَعَةِ مِنَ الضَّأْنِ فِي الْهَدْيِ وَالضَّحَايَا بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٩١٦-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ضَحَايَا بَيْنَ أَصْحَابِهِ قَالَ عُقْبَةُ: فَصَارَتْ لِي جَذَعَةٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَارَتْ لِي جَذَعَةٌ قَالَ: «ضَحِّ بِها»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَرَّجْتُ تَمَامَ أَبْوَابِ الضَّحَايَا فِي كِتَابِ الضَّحَايَا، وَإِنَّمَا خَرَّجْتُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ الَّتِي فِيهَا ذِكْرُ الضَّحَايَا فِي هَذَا الْكِتَابِ؛ لِأَنَّ الْعُلَمَاءَ لَمْ يَخْتَلِفُوا أَنَّ كُلَّ مَا جَازَ فِي الضَّحِيَّةِ فَهُوَ جَائِزٌ فِي الْهَدْيِ.

## باسی مۆڵەتدان بە سەربڕینی کاوڕی مێی یەکساڵ بۆ هەدی و قوربانی بە دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوونە (مُجْمَل) شیکراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی لە نێوان هاوەڵەکانیدا دابەش کرد، عوقبە وتی: من کاوڕێکی مێی یەکساڵەم بەرکەوت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من کاوڕێکی مێی یەکساڵەم بەرکەوتووە، فەرمووی: بیکە بە قوربانی.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی قوربانییەکان باسی تەواوی بەشەکانی قوربانیم کردووە، بۆیە لەم کتێبەدا ئەو فەرموودانەم هێناوە کە باسی قوربانی تێدایە، چونکە زانایان هیچ جیاوازییان نییە دەربارەی ئەوەی هەرچی دروست بێت بۆ قوربانیکردن بەهەمان شێوە دروستە بۆ هەدی.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي اقْتِطَاعِ لُحُومِ الْهَدْيِ بِإِذْنِ صَاحِبِهَا

**٢٩١٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُرْطٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْظَمُ الْأَيَّامِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمُ النَّحْرِ، ثُمَّ يَوْمُ الْقَرِّ»، وَقُدِّمَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بَدَنَاتٌ خَمْسٌ أَوْ سِتٌّ فَطَفِقْنَ يَزْدَلِفْنَ أَيَّتُهُنَّ يَبْدَأُ بِهَا، فَلَمَّا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا قَالَ: كَلِمَةً خَفِيفَةً لَمْ أَفْهَمْهَا، فَسَأَلْتُ بَعْضَ مَنْ يَلِيهِ، فَقَالَ: «مَنْ شَاءَ اقْتَطَعَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان لە بردنی پشکی گۆشتی ئاژەڵی هەدی بە مۆڵەتی خاوەنەکەی

واتە: عەبدوڵای کوڕی قورەت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەترین ڕۆژەکان لەلای خوا یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە، پاشان دووەم ڕۆژ. وە پێنج یان شەش وشتر هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ جا ئەو ئافرەتانە نزیك دەبوونەوە بە مەبەستی ئەوەی سەرەتا هی ئەوەیان سەر ببڕێت، جا کاتێ کە سەر بڕاو لایەکی کەوتە سەر زەوی و ڕووحی تیا نەما، وشەیەکی سوکی فەرموو لێی تێ نەگەیشتم، پرسیارم لە هەندێ لەوانە کرد کە لە نزیکی بوو، وتی: فەرمووی: هەر کەس پێی خۆشە پشکێك بۆ خۆی ببات.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْجَذَعَةَ إِنَّمَا تُجْزِئُ عِنْدَ الْإِعْسَارِ مِنَ الْمُسِنِّ

**٢٩١٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَا تَذْبَحُوا إِلَّا مُسِنَّةً إِلَّا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی کاوڕی مێی یەکساڵە، لە کاتێدا دروستە بۆ هەدی و قوربانی خاوەنەکەی نەتوانێ بەتەمەنتر دەست بخات

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەیوان بەتەمەن نەبێت سەری مەبڕن، مەگەر دەستخستی گران و قورس بوو بۆتان ئەوە کاوڕێکی مێی یەکساڵە سەر ببڕن.

## بَابُ الصَّدَقَةِ بِلُحُومِ الْهَدْيِ، وَجُلُودِهَا، وَجِلَالِ الْبُدْنِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٩١٩-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِجُلُودِهَا وَجِلَالِهَا، وَأُرَاهُ قَالَ: وَلُحُومِهَا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەخشینی گۆشت و پێستەی ئاژەڵی هەدی، وە جل و کورتانی وشتریش، بە باسکردنی فەرموودەیەك کورت و ناڕوونە (مُجْمَل) شیکراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم سەرپەرشتی قوربانییەکانی بکەم، هەروەها فەرمانی پێ کردم هەموو وشترەکانی دابەش بکەم (بەسەر هەژاراندا)، پێستەکەیان و جل و کورتانەکەیان، وە پێم وایە وتی: گۆشتەکەیشیان.

**بَابُ قَسْمِ لُحُومِ الْهَدْيِ وَجُلُودِهِ وَجِلَالِهِ فِي الْمَسَاكِينِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ خَبَرَ ابْنِ عُيَيْنَةَ مُجْمَلٌ غَيْرُ مُفَسَّرٍ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِقَسْمِ لُحُومِ بُدْنِهِ وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا عَلَى الْمَسَاكِينِ دُونَ الْأَغْنِيَاءِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الْكُلِّ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْبَعْضِ**

**٢٩٢٠-** عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي الْحَسَنُ بْنُ مُسْلِمٍ، أَنَّ مُجَاهِدًا أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أخبره: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَقْسِمَ بُدْنَهُ كُلَّهَا لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلَالَهَا لِلْمَسَاكِينِ، وَلَا يُعْطِي فِي جِزَارَتِهَا مِنْهَا شَيْئًا، قُلْتُ لِلْحَسَنِ: هَلْ سَمَّى فِيمَنْ يُقْسَمُ ذَلِكَ؟ قَالَ: لَا[(١)].

**باسی دابەشکردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کراون بە هەدی هەروەها پێستە و جل و کورتانەکانیان بەسەر هەژاراندا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی ئیبنو عویەینە کورت و ناڕوونە (مُجْمَل) شیکراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دابەشکردنی گۆشت و پێستە و جل و کورتانی وشترەکانی بەسەر هەژاراندا نەك دەوڵەمەندان، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار ناوی گشت (الْكُلِّ) لەبری ناوی هەندێك (الْبَعْضِ) بەکاردێ**

واتە: ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە، لە حەسەنی کوڕی موسلیم، کە موجاهید هەواڵی پێداوە، عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا هەواڵی پێ دا، عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ هەواڵی پێ دا: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد سەرپەرشتی قوربانییەکانی بکات، هەروەها فەرمانی پێ کرد هەموو وشترەکانی دابەش بکات بەسەر هەژاراندا،

---

(١) صحيح.

گۆشتەکەیان و پێستەکەیان و جل و کورتانەکەیان، وە هیچی لێ نەدات بەو کەسەی سەری دەبڕێ (وەکوو کرێی سەربڕین و پاککردن)، بە حەسەنم وت: ئایا ناوی ئەو کەسانەی هێنا کە دابەش دەکرێ بە سەریاندا؟ وتی: نەخێر.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اسْمَ الْكُلِّ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْبَعْضِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: أَمَرَنِي أَنْ أَقْسِمَ بُدْنَهُ كُلَّهَا، أَيْ خَلَا مَا أَمَرَ مِنْ كُلِّ بُدْنِهِ بِبَضْعَةٍ فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ فَحَسَيَا مِنَ الْمَرَقِ وَأَكَلَا مِنَ اللَّحْمِ

**٢٩٢١-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ جَابِرِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ كُلِّ بُدْنِهِ بِبَضْعَةٍ، الْحَدِيثَ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار ناوی گشت (الْكُلّ) لەبری ناوی هەندێك (الْبَعْض) بەكار دێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی عەلی كوڕی ئەبو تالیب مەبەستی لە وتەكەی كاتێ كە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردم هەموو وشترەكان دابەش بكەم. واتە: جگە لەو پشكەی كە فەرمانی پێ كردبوو جیای بكاتەوە و بكرێتە نێو مەنجەڵەوە، دواتر لە شۆربا و گۆشتەكەیان خوارد

واتە: ئەبو بەکر وتی: فەرموودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد لە هەر وشترێك پشکێك جیا بکرێتەوە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ إِعْطَاءِ الْجَازِرِ أَجْرَهُ مِنَ الْهَدْيِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٢٩٢٢-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ وَأَمَرَنِي أَنْ لَا أُعْطِيَ الْجَازِرَ مِنْهَا شَيْئًا[٢].

## باسی قەدەغەكردن لەوەی گۆشتی ئاژەڵی هەدی وەكوو كرێ بدرێ بە قەساب، بە باسكردنی فەرموودەیەك كورت و ناڕوونە (مُجْمَل) شیكراوە و ڕوون نییە (مُفَسَّر)

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم سەرپەرشتی وشترەکانی بکەم، وە فەرمانی پێ کردم هیچی لێ نەدەم بە قەساب.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا زَجَرَ عَنْ إِعْطَاءِ الْجَازِرِ مِنْ لُحُومِ هَدْيِهِ عَلَى جِزَارَتِهَا شَيْئًا لَا أَنْ يَتَصَدَّقَ مِنْ لُحُومِهَا عَلَى الْجَازِرِ، لَوْ كَانَ الْجَازِرُ مِسْكِينًا

**٢٩٢٣-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَقُومَ عَلَى الْبُدْنِ وَأَمَرَهُ أَنْ لَا يُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْ جِزَارَتِهَا شَيْئًا وَفِي حَدِيثِ وَكِيعٍ عَلَى جِزَارَتِهَا شَيْئًا[١].

## باسی فەرموودەیەك شیكەرەوەی ئەو دەستەواژە نارِوونەیە كە باسم كرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كرد لەوەی گۆشتی ئاژەڵی هەدی بدرێ بە قەسابەكە لەبری سەربڕینەكەی، نەك بەو مانایەی گۆشت نەدرێ بەو قەسابە، ئەگەر قەسابەكە هەژار بوو

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كرد سەرپەرشتی وشترەكانی بكات، وە فەرمانی پێ كرد هیچ پشكێك نەدات بەو قەسابەی سەری دەبڕێ و پاكی دەكات، لەبری كرێی قەسابییەكەی.

## بَابُ الْأَكْلِ مِنْ لَحْمِ الْهَدْيِ إِذَا كَانَ تَطَوُّعًا

**٢٩٢٤-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ كُلِّ جَزُورٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ فَطُبِخَتْ، وَأَكَلُوا مِنَ اللَّحْمِ وَحَسَوْا مِنَ الْمَرَقِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَأَلَ سَائِلٌ عَنِ الْأَكْلِ مِنَ الْهَدْيِ الْوَاجِبِ أَيَأْكُلُ صَاحِبُهَا مِنْهَا فَقُلْتُ: إِذَا نَحَرَ الْقَارِنُ وَالْمُتَمَتِّعُ بَدَنَةً أَوْ بَقَرَةً أَوْ شِرْكًا فِي بَدَنَةٍ أَوْ بَقَرَةٍ أَكْثَرُ مِنْ سُبْعِهَا، فَلَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِمَّا زَادَ عَلَى سُبْعِ الْبَدَنَةِ أَوِ الْبَقَرَةِ؛ لِأَنَّ الْوَاجِبَ عَلَيْهِ فِي هَدْيِ الْقِرَانِ وَالْمُتَمَتِّعِ سُبْعُ إِحْدَاهُمَا إِلَّا عِنْدَ مَنْ يُجِيزُ الْبَدَنَةَ عَنْ عَشَرَةٍ عَلَى مَا بَيَّنْتُ فِي خَبَرِ الْمِسْوَرِ وَمَرْوَانَ وَخَبَرِ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَوْ شَاةً تَامَّةً فَمَا زَادَ عَلَى سُبْعِ بَدَنَةٍ أَوْ بَقَرَةٍ فَهُوَ مُتَطَوِّعٌ بِهِ، وَلَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِمَّا هُوَ مُتَطَوِّعٌ بِهِ مِنَ الزِّيَادَةِ كَمَا يُضَحِّي مُتَطَوِّعًا بِالْأُضْحِيَةِ، فَلَهُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ ضَحِيَّتِهِ، وَعَلَى هَذَا الْمَعْنَى عِلْمِي أَكْلُ النَّبِيِّ ﷺ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مِنْ لُحُومِ بُدْنِهِ؛ لِأَنَّهُ نَحَرَ مِائَةَ بَدَنَةٍ، وَإِنَّمَا كَانَ الْوَاجِبُ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ قَارِنًا سُبْعَ بَدَنَةٍ إِلَّا عِنْدَ مَنْ يُجِيزُ الْبَدَنَةَ عَنْ عَشَرَةٍ لَا أَكْثَرَ، وَهُوَ مُتَطَوِّعٌ بِالزِّيَادَةِ فَجَعَلَ مِنْ كُلِّ بَعِيرٍ بَضْعَةٍ فِي قِدْرٍ فَحَسَا مِنَ الْمَرَقِ، وَأَكَلَ مِنَ اللَّحْمِ، وَإِنْ ذَبَحَ لِتَمَتُّعِهِ أَوْ لِقِرَانِهِ لَمْ يَكُنْ عِنْدِي أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا، وَالْعِلْمُ عِنْدِي كَالْمُحِيطِ أَنَّ كُلَّ مَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ شَيْءٌ لِسَبَبٍ مِنَ الْأَسْبَابِ لَمْ يَجُزْ لَهُ أَنْ يَنْتَفِعَ بِمَا وَجَبَ عَلَيْهِ فِي مَالِهِ وَلَا مَعْنَى لِقَوْلِ قَائِلٍ: إِنْ قَالَ: يَجِبُ عَلَيْهِ هَدْيٌ، وَلَهُ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ بَعْضَهُ؛ لِأَنَّ الْمَرْءَ إِنَّمَا لَهُ أَنْ يَأْكُلَ مَالَ نَفْسِهِ أَوْ مَالَ غَيْرِهِ بِإِذْنِ مَالِكِهِ، فَإِنْ كَانَ الْهَدْيُ وَاجِبًا عَلَيْهِ، فَمُحَالٌ أَنْ يُقَالَ وَاجِبٌ عَلَيْهِ، وَهُوَ مَالٌ لَهُ يَأْكُلُهُ، وَقَوْلُ هَذِهِ الْمَقَالَةِ يُوجِبُ أَنَّ الْمَرْءَ إِذَا وَجَبَتْ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ فِي مَاشِيَتِهِ أَنَّ لَهُ أَنْ يَذْبَحَهَا، فَيَأْكُلَهَا، وَإِنْ وَجَبَتْ عَلَيْهِ عُشْرُ حَبٍّ فَلَهُ أَنْ يَطْحَنَهُ، وَيَأْكُلَهُ، وَإِنْ وَجَبَ عَلَيْهِ عُشْرُ ثِمَارٍ فَلَهُ أَنْ يَأْكُلَهُ، وَهَذَا لَا يَقُولُهُ مَنْ يُحْسِنُ الْفِقْهَ.

## باسی خواردن لە گۆشتی ئاژەڵی هەدی ئەگەر واجبی نەکردبوو لەسەر خۆی

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد لەهەر وشترێك پشکێك جیا بکرێتەوە، دواتر خرایە نێو مەنجەڵەوە و کوڵێنرا، ئینجا لە گۆشت و شلەکەیان خوارد.

ئەبو بەکر دەڵێ: کەسێك پرسیاری کرد دەربارەی خواردنی گۆشتی ئاژەڵی هەدی کە خاوەنەکەی واجبی کردووە لەسەر خۆی، ئایا خاوەنەکەی دەتوانێ لێی بخوات؟ وتم: ئەگەر ئەو کەسەی قیرانی کرد (واتە: ئیحرامی بە حەج و عومرە پێکەوە بەستبوو) وە ئەو کەسەی تەمەتوعی کرد ( واتە: چوو بۆ حەج ئیحرامی بۆ عومرە بەست لە مانگەکانی حەجدا). وشترێك یان مانگایەکی سەر بڕی، یان هەردووکیان پێکەوە بەشدار بوون لە وشترێك یان مانگایەك گۆشتەکەی زیاتر بوو لە حەوتیەك، ئەوە دەتوانێ لە زیادەی ئەو حەوتیەکە بخوات، چونکە ئەوەی واجبە لەسەری لە ئاژەڵی هەدیی قیران و تەمەتوع حەوتیەکە، جگە لەلای ئەو کەسەی ڕێگەی داوە وشترێك بۆ دە کەس بێت، وەك چۆن لە فەرموودەکەی میسوەر و مەڕواندا ڕوونم کردەوە، وە فەرموودەکەی عیکریمە لە ئیبنو عەباسەوە: یان مەڕێکی تەواو هەرچی زیاتر بوو لە حەوتیەکی وشتر یان مانگا ئەوە زیادەیە، بۆی هەیە لەو زیادەیە بخوات، وەك چۆن کەسێك وەکوو سوننەت قوربانییەك دەکات، بۆی هەیە لە قوربانییەکەی بخوات، جا بەپێی ئەم مانایە پێم وایە پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی وشتری قوربانی خۆی خواردووە، چونکە سەد وشتری کرد بە قوربانی، بێگومان حەوتیەکی وشترێك واجبە لەسەری

ئەگەر قیرانی کردبوو، مەگەر لەلای ئەو کەسەی پێی وایە وشترێك بۆ دە کەسە نەك زیاتر، ( واتە: دەیەکی لەسەر واجب دەبێت بەپێی ئەم بۆچوونە) جا ئەو ئازادە لەوەی ئەو گۆشتە زیادە بخوات، دەتوانێ لە هەر وشترێك پشكێك دابنێت لەنێو مەنجەڵێکدا بیکوڵێنێ و لە گۆشت و شلەکەی بخوات. وە ئەگەر لەبەر تەمەتوع یان قیرانەکەی ئاژەڵی سەر بڕی ئەوە من پێم وا نییە لە گۆشتەکەی بخوات، پێم وایە هەر کەس شتێك واجب بوو لەسەری لە ماڵ و سامانەکەی، لەبەر هەر هۆکارێك بێت ئەوە بۆی نییە سوود لەو ماڵە وەربگرێ بۆ خۆی کە واجب بووە لەسەری، وە هیچ مانایەك نییە بۆ وتەی ئەو کەسەی کە دەڵێ: ئاژەڵی هەدی لەسەر واجب دەبێت و بۆی هەیە بەشێك لە گۆشتەکەی بخوات، چونکە مرۆڤ بۆی هەیە ماڵی خۆی بخوات، یان ماڵی کەسێکی دیکە بخوات بە پرسی خاوەنەکەی، جا ئەگەر ئاژەڵی هەدی واجب بوو لەسەری، ئەوە مەحاڵە بوترێ واجبە لەسەری و ماڵی خۆیەتی و بۆی هەیە لێی بخوات، وە قسەی خاوەن ئەم وتەیە ئەوە واجب دەکات بەندە ئەگەر بەخشینێکی لەسەر واجب بوو لە مەڕوماڵاتەکەیدا بۆی هەیە سەری ببڕێت و لێی بخوات، وە ئەگەر دەیەکی لەسەر واجب بوو لە دانەوێڵەکەیدا بۆی هەیە بیهاڕێت و لێی بخوات، وە ئەگەر دەیەکی بەروبوومیشی لەسەر واجب بوو بۆی هەیە لێی بخوات، بەڕاستی کەسێك ئەم قسەیە ناکات شارەزای فیقە بێت.

## بَابُ الْهَدْيِ يَضِلُّ فَيُنْحَرُ مَكَانَهُ آخَرُ، ثُمَّ يُوجَدُ الْأَوَّلُ

**٢٩٢٥-** عَنْ هِشام عَن أبيهِ عَن عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا سَاقَتْ بَدَنَتَيْنِ، فَأَضَلَّتْهُمَا فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا ابْنُ الزُّبَيْرِ بَدَنَتَيْنِ فَنَحَرَتْهُمَا، ثُمَّ وَجَدَتِ الْبَدَنَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ، فَنَحَرَتْهُمَا أَيْضًا، ثُمَّ قَالَتْ هَكَذَا السُّنَّةُ فِي الْبُدْنِ[١].

## باسی ئاژەڵی هەدی ئەگەر ونبوو دانەیەکی دیکە لە جێگای سەر بڕا، پاشان ئاژەڵەکەی یەکەم کە ونببوو دۆزرایەوە

واتە: هیشام دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە لە عائیشەوە ﵂، ئەو دوو وشتری نارد (بە هەدی بۆ بەیت بەمەبەستی قوربانیکردن)، هەردوو وشترەکەی لێ ونبوو، ئیبنو زوبەیر دوو

---

(١) صحیح.

وشتری بۆی نارد هەردووکیانی سەر بڕی، پاشان دوو وشترەکەی یەکەمی بینییەوە، هەردووکیانی سەر بڕی، پاشان وتی: سوننەت لە وشتردا بەوشێوەیەیە.

## بَابُ صِيَامِ الْمُتَمَتِّعِ إِذَا لَمْ يَجِدِ الْهَدْيَ

**٢٩٢٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَثُرَتِ الْمَقَالَةُ مِنَ النَّاسِ، فَخَرَجْنَا حُجَّاجًا حَتَّى بَيْنَنَا وَبَيْنَ أَنْ نَحِلَّ إِلَّا لَيَالِي قلائل: أُمِرْنَا بِالْإِحْلَالِ فَيَرُوحُ أَحَدُنَا إِلَى عَرَفَةَ وَفَرْجُهُ يَقْطُرُ مَنِيًّا، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ خَطِيبًا، فَقَالَ: «أَبِاللَّهِ تُعْلِمُونِي أَيُّهَا النَّاسُ فَأَنَا وَاللَّهِ أَعْلَمُ بِاللَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، وَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا سُقْتُ هَدْيًا، وَلَحَلَلْتُ كَمَا أَحَلُّوا، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَمَنْ وَجَدَ هَدْيًا فَلْيَنْحَرْ فَكُنَّا نَنْحَرُ الْجَزُورَ عَنْ سَبْعَةٍ»[1].

### باسی ڕۆژووگرتنی ئەو کەسەی تەمەتوعی کردووە
### ئەگەر ئاژەڵی هەدی لەلا نەبوو

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: قسەوباس زۆر کرا لەلایەن خەڵکەکەوە، بە نییەتی حەج دەرچووین تا نێوانی ئێمە و نێوانی ئەوەی ئیحرام بشکێنین چەند شەوێکی کەمی مابوو: فەرمانمان پێ کرا بە ئیحرامشکاندن، جا یەکێك لە ئێمە دەچوو بۆ عەرەفە ئەندامی نێرینەی مەنی لێ دەهاتە خوارەوە، (بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە گەشتدا بوون و جووتنەبوون لەگەڵ خێزانەکانیان) ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا وتارێکی دا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە سوێندتان دەدەم بە خوا پێم نالێن، سوێند بە خوا من لە هەمووتان زاناترم بە خوا و لە هەمووشتان زیاتر لێی دەترسم، ئەو بۆچوونەی ئێستا هەمە ئەوسا هەمبووایە ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا و دەمکرد بە عومرە و ئیحرامم دەشکاند وەکوو چۆن ئێوە ئیحرامتان شکاند، هەر کەس ئاژەڵی هەدی لەگەڵ خۆی نەهێناوە با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و کاتێکیش گەڕایەوە حەوت ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، هەر کەسیش ئاژەڵی هەدی هێناوە با سەری ببڕێت، جا ئێمە وشترێکمان لە بری حەوت کەس سەر دەبڕی.

---

(١) صحيح.

**٢٩٢٧-** وَقَالَ عَطَاءٌ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَسَمَ يَوْمَئِذٍ فِي أَصْحَابِهِ غَنَمًا فَأَصَابَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ تَيْسًا فَذَبَحَهُ عَنْ نَفْسِهِ، فَلَمَّا وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ أَمَرَ رَبِيعَةَ بْنَ أُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، فَقَامَ تَحْتَ ثَدْيِ نَاقَتِهِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: اصْرُخْ أَيُّهَا النَّاسُ هَلْ تَدْرُونَ أَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟ قَالُوا: الشَّهْرُ الْحَرَامُ قَالَ فَهَلْ تَدْرُونَ أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟ قَالُوا: الْبَلَدُ الْحَرَامُ قَالَ: فَهَلْ تَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟ قَالُوا: الْحَجُّ الْأَكْبَرِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ كَحُرْمَةِ شَهْرِكُمْ هَذَا وَكَحُرْمَةِ بَلَدِكُمْ هَذَا وَكَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا»، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَجَّهُ، وَقَالَ حِينَ وَقَفَ بِعَرَفَةَ: هَذَا الْمَوْقِفُ كُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَقَالَ حِينَ وَقَفَ عَلَى قُزَحٍ: «هَذَا الْمَوْقِفُ، وَكُلُّ مُزْدَلِفَةَ مَوْقِفٌ»[١].

واتە: عەتاء وتی: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە لە نێوان هاوەڵەکانیدا مەڕوماڵاتی دابەش کرد، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص خرتێکی بەرکەوت لەبری خۆی کردی بە قوربانی، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە ڕاوەستا، ڕەبیعەی کوڕی ئومەیەی کوڕی خەلەف لەژێر سنگی وشترەکەیدا وەستا بوو، پێی فەرموو: بەنێو خەڵکەکەدا هاوار بکە و بڵێ: ئەی خەڵکینە ئایا دەزانن ئەم مانگە چ مانگێکە؟ وتیان: مانگی حەڕامە، فەرمووی: ئایا دەزانن ئەم شارە چ شارێکە؟ وتیان: شاری حەڕامە، فەرمووی: ئایا دەزانن ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە؟ وتیان: ڕۆژی حەجی گەورەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە ڕاستیدا خوا خوێن و سامانتانی لە نێوان یەکدیدا حەرام کردووە، وەکوو چۆن لەم مانگەتاندا حەرامی کردووە، وە وەك چۆن لەم وڵاتەتاندا حەرامی کردووە، وە وەك چۆن لەم ڕۆژەتاندا حەرامی کردووە. دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ حەجەکەی تەواو کرد، کاتێ لە عەرەفە وەستا فەرمووی: ئەمە شوێنی وەستانە، وە هەموو عەرەفە شوێنی وەستانە، وە کاتێ لەسەر قوزەح وەستا فەرمووی: ئەمە جێگای وەستانە، هەموو موزدەلیفە شوێنی وەستانە.

## بَابُ حَلْقِ الرَّأْسِ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ النَّحْرِ أَوِ الذَّبْحِ، وَاسْتِحْبَابِ التَّيَامُنِ فِي الْحَلْقِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ شَعْرَ بَنِي آدَمَ لَيْسَ بِنَجَسٍ بَعْدَ الْحَلْقِ أَوِ التَّقْصِيرِ

---

(١) معلق.

**٢٩٢٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَمَّا رَمَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْجَمْرَةَ وَنَحَرَ هَدْيَهُ نَاوَلَ الْحَلَّاقَ شِقَّهُ الْأَيْمَنَ فَحَلَقَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ أَبَا طَلْحَةَ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الشِّقَّ الْأَيْسَرِ فَحَلَقَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ أَبَا طَلْحَةَ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَقْسِمَ بَيْنَ النَّاسِ[١].

## باسی سەرتاشین دوای تەواوبوونی قوربانی، وە چاکتر وایە سەرتاشین لە لای ڕاستەوە دەست پێ بکات، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی قژی نەوەکانی ئادەم دوای تاشین یان کورتکردنەوە پیس نییە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەردبارانی جەمرەی کرد و قوربانییەکەی سەر بڕی، لای ڕاستی دایە دەستی سەرتاشەکە، سەری تاشی، پاشان قژەکەی دایە دەستی ئەبو تەڵحەی ئەنصاری، پاشان لای چەپی دایە دەستی سەرتاشەکە و فەرمووی: بیتاشە، ئەویش تاشی، پاشان قژەکەی دایە دەستی ئەبو تەڵحەوە، وە فەرمانی پێ کرد دابەشی بکات لەنێو خەڵکەکەدا.

## بَابُ فَضْلِ الْحَلْقِ فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ وَاخْتِيَارِ الْحَلْقِ عَلَى التَّقْصِيرِ وَإِنْ كَانَ التَّقْصِيرُ جَائِزًا

**٢٩٢٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ». قَالوا: وَالْمُقَصِّرِينَ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ». قَالوا: وَالْمُقَصِّرِينَ قَالَهَا ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: «وَالْمُقَصِّرِينَ»[٢].

## باسی فەزڵ و چاکی سەرتاشین لە حەج و عومرە، وە پێشخستنی سەرتاشین لەسەر کورتکردنەوە، ئەگەرچی کورتکردنەوەش دروستە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە لەوانە خۆش ببە کە سەریان تاشیوە، وتیان: ئەی ئەوانەی کە کورتیان کردۆتەوە؟ فەرمووی: ئەی خوایە لەوانە خۆش ببە کە سەریان تاشیوە، وتیان: ئەی ئەوانەی کە کورتیان کردۆتەوە؟ پاشان دوای سێ جار فەرمووی: ئەوانەش کە کورتیان کردۆتەوە.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

## بَابُ تَسْمِيَةِ مَنْ حَلَقَ النَّبِيَّ ﷺ فِي حَجَّتِهِ

**٢٩٣٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَلَقَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَزَعَمُوا أَنَّ الَّذِي حَلَقَ النَّبِيَّ ﷺ مَعْمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نَضْلَةَ بْنِ عَوْفِ بْنِ عُبَيْدِ بْنِ عُوَيجِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ كَعْبٍ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَلَقَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْعَرَبَ تُضِيفُ الْفِعْلَ إِلَى الْآمِرِ كَمَا تُضِيفُهُ إِلَى الْفَاعِلِ إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، لَمْ يَتَوَلَّ حَلْقَ رَأْسِهِ نَفْسِهِ بِيَدِهِ بَلْ أَمَرَ غَيْرَهُ، فَحَلَقَ رَأْسَهُ، فَأُضِيفَ الْفِعْلُ إِلَيْهِ إِذْ هُوَ الْآمِرُ بِهِ.

### باسی ناوی ئەو کەسەی سەری پێغەمبەری ﷺ تاشی لە حەجەکەیدا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا سەری تاشی، وە پێیان وا بوو ئەو کەسەی سەری پێغەمبەری ﷺ تاشی مەعمەری کوڕی عەبدوڵای کوڕی نەزلەی کوڕی عەوفی کوڕی عوبەیدی کوڕی عەدی کوڕی کەعب بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەری تاشی، لەو شێوازەیە کە دەڵێین: عەرەب فیعل ئەداتە پاڵ فەرمانکەر وەکوو چۆن دەیداتە پاڵ بکەر، چونکە ئەوە شتێکی زانراوە پێغەمبەر ﷺ خۆی بە دەستی خۆی سەری خۆی نەتاشی، بەڵکوو فەرمانی بە کەسێکی دیکە کرد سەری بتاشێ، ئەویش سەری تاشی، بۆیە فیعلەکەی داوەتە پاڵی چونکە ئەو فەرمانی پێ کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَقْلِيمِ الْأَظْفَارِ مَعَ حَلْقِ الرَّأْسِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَظَافِرَ إِذَا قُصَّتْ لَمْ يَكُنْ حُكْمُهَا حُكْمَ الْمَيْتَةِ، وَلَا كَانَتْ نَجِسًا كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ مَا قُطِعَ مِنَ الْحَيِّ فَهُوَ مَيِّتٌ، وَخَبَرُ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ إِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ»، عِنْدَ ذِكْرِ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ فِي قَطْعِهِمْ إِلْيَاتِ الْغَنَمِ وَجَبِّهِمْ أَسْنِمَةَ الْإِبِلِ، فَكَانَ قَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ جَوَابًا عَنْ هَذَيْنِ الْفِعْلَيْنِ وَمَا يُشْبِهُهُمَا وَهُوَ فِي مَعَانِيهِمَا، وَاللَّهُ أَعْلَمُ

---

(١) صحيح.




**٢٩٣١-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَخْبَرَ، أَنَّ أَبَاهُ شَهِدَ النَّبِيَّ ﷺ عِنْدَ الْمَنْحَرِ هُوَ وَرَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَحَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ فِي ثَوْبِهِ فَأَعْطَاهُ، فَقَسَمَ مِنْهُ عَلَى رِجَالٍ، وَقَلَّمَ أَظْفَارَهُ، فَأَعْطَاهُ صَاحِبَهُ قَالَ: فَإِنَّهُ عِنْدَنَا مَخْضُوبٌ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ أَوْ بِالْكَتَمِ وَالْحِنَّاءِ[1].

**باسی چاکتر وایە لەگەڵ قژ تاشیندا نینۆکەکانیش بکرێن، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی نینۆکەکان ئەگەر بڕان حوکمیان حوکمی مردارەوەبوو نییە، هەروەها پیسیش نین وەك چۆن یەکێك لە زانایان بەهەڵەدا چووە وایزانیوە هەر شتێ لە زیندوو ببڕدرێ ئەوە مردارەوەبووە، وە فەرموودەکەی ئەبو واقیدی لەیسی لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: (مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ)، واتە: هەر شتێ لە ئاژەڵی زیندوو ببڕدرێ، ئەوە ئەو شتە مردارەوەبووە. (واتە: پیسە) پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ئەوەی فەرموو خەڵکی سەردەمی نەفامی دووگی مەڕ و کۆپارەی وشتریان دەبڕی بە زیندوویی و دەیانخوارد، جا فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ وەڵام بوو بۆ ئەو دوو ڕەفتارە و ئەوەیشی هاوشێوەی ئەوانە. خوا زاناترە**

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ هەواڵی داوە، باوکی لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاریدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوون لە شوێنی سەربڕینی قوربانییەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ قژی خۆی تاشی و خستیە نێو جلەکانی، دواتر قژەکەی پێ دا، ئینجا بەسەر پیاوەکاندا دابەشی کرد، هەروەها نینۆکەکانیشی بڕی، دواتر دای بە هاوڕێیەکەی، وتی: قژی لەلامان بوو، بۆیاغ کرابوو بە خەنە و ئوزمە یان ئوزمە و خەنە.

**٢٩٣٢-** حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ، حَدَّثَهُ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ قَالَ الدَّارِمِيُّ: فَذَكَرَ الْقِصَّةَ[2].

وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ يَقُلْ أَحَدٌ أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ غَيْرُ عَبْدِ الصَّمَدِ.

واتە: ئەبو سەلەمە بۆی باس کردین، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی زەید بۆی باس کرد، باوکی بۆی باس کرد، دارەمی وتی: دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: هیچ کەس نەیوتوە باوکی بۆی باس کردووە، جگە لە عەبدوصەمەد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ التَّطَيُّبِ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الْحَلْقِ وَقَبْلَ زِيَارَةِ الْبَيْتِ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ التَّطَيُّبَ مَحْظُورٌ حَتَّى يَزُورَ الْبَيْتَ

**٢٩٣٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، سَمِعَ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: وَبَسَطَتْ يَدَهَا أَنَا طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِيَدِيَّ هَاتَيْنِ لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[١].

## باسی ڕێگە دراوە بە بەکارهێنانی بۆنی خۆش لەدوای سەرتاشین و پێش زیارەتی بەیت، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە بەکارهێنانی بۆنی خۆش قەدەغەکراوە تا زیارەتی بەیت دەکات

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، گوێی لە عائیشە بوو ﵂ دەیوت: -دەستی کردەوە- من پێغەمبەری خوام ﷺ بەم دوو دەستەم بۆنخۆش کرد بۆ ئیحرام بەستنی، کاتێ ئیحرامی بەست، وە بۆ شکاندنیشی دوای ئەوەی شەیتانی بەردباران کرد، پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا ﷻ بکات.

**٢٩٣٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى قَبْلَ أَنْ يَزُورَ الْبَيْتَ[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد لە مینا پێش ئەوەی زیارەتی بەیت بکات.

## بَابُ إِبَاحَةِ التَّطَيُّبِ يَوْمَ النَّحْرِ قَبْلَ الزِّيَارَةِ بِالطِّيبِ الَّذِي فِيهِ مِسْكٌ

**٢٩٣٥-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ مَنْصُورِ بْنِ زَاذَانَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي أَوَّلِ الْكِتَابِ بَابِ الطِّيبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی ڕێگەدان بە بەکارهێنانی بۆنی خۆش لە ڕۆژی جەژنی قوربان بەو بۆنەی میسکی تێدایە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی مەنصوری کوڕی زازان لە عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسمەوە، لە سەرەتای ئەم کتێبەکەدا باسم کرد لە بەشی بۆنخۆشکردن لە کاتی ئیحرامدا.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْحَائِضِ أَنْ تَنْسُكَ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا فِي حَيْضِهَا خَلَا الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ وَالصَّلَاةِ

**٢٩٣٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: فَحِضْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ: «مَالَكِ أَنَفِسْتِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: «إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاقْضِي مَا يَقْضِي الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ»[1].

## باسی مۆڵەت دراوە بەو ئافرەتەی دەکەوێتە حەیزەوە، هەموو ڕێوڕەسمەکانی حەج ئەنجام بدات لە کاتی حەیزیدا، جگە لە تەوافی بەیت و نوێژ نەبێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، وتی: کەوتمە حەیزەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام دەگریام. فەرمووی: چیتە کەوتوویتە حەیزەوە؟ وتم: بەڵێ. فەرمووی: ئەمە کارێکە خوا نووسیویەتی لەسەر کچەکانی ئادەم، ئەوەی حاجی دەیکات تۆش بیکە، بەڵام تەوافی ماڵی خوا مەکە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِاصْطِيَادِ وَجَمِيعِ مَا حُرِّمَ عَلَى الْمُحْرِمِ بَعْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ يَوْمَ النَّحْرِ قَبْلَ زِيَارَةِ الْبَيْتِ إِنْ ثَبَتَتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ فِي خَبَرِ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَإِنْ لَمْ تَثْبُتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَخَبَرُ عَائِشَةَ فِي تَطْيِيبِهَا النَّبِيَّ ﷺ دَالٌّ عَلَى أَنَّ الِاصْطِيَادَ جَائِزٌ إِذَا جَازَ التَّطَيُّبُ، وَخَبَرُ أُمِّ سَلَمَةَ يُصَرِّحُ أَنَّ الِاصْطِيَادَ بَعْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ مُبَاحٌ، وَهُوَ قَوْلُهُ ﷺ: «إِنَّ هَذَا يَوْمٌ رُخِّصَ لَكُمْ إِذَا أَنْتُمْ رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ أَنْ تَحِلُّوا مِنْ كُلِّ مَا حُرِمْتُمْ مِنْهُ إِلَّا مِنَ النِّسَاءِ»، خَرَّجْتُ هَذَا الْبَابَ فِي مَوْضِعِهِ بَعْدَ خَبَرِ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ فِي هَذَا أَيْضاً

---

(١) صحيح.

**٢٩٣٧-** عَنْ الْحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَمَيْتُمْ وَحَلَقْتُمْ فَقَدْ حَلَّ لَكُمُ الطِّيبُ وَالثِّيَابُ إِلَّا النِّكَاحَ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ إِلَّا النِّكَاحَ يُرِيدُ النِّكَاحَ الَّذِي هُوَ الْوَطْءُ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ أَنَّ اسْمَ النِّكَاحِ عِنْدَ الْعَرَبِ يَقَعُ عَلَى الْعَقْدِ وَعَلَى الْوَطْءِ جَمِيعًا.

**باسی مۆڵەتدان بە ڕاوکردن و هەموو ئەوانەی قەدەغە کراوە لەسەر ئیحرامپۆش، دوای بەردبارانکردنی جەمرە لە ڕۆژی جەژنی قوربان، ئەگەر ئەم دەستەواژەیە چەسپاو بێت کە لە فەرموودەکەی عەمرەدا هاتووە، لە عائیشە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە ئەگەر ئەم دەستەواژەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ چەسپاو نەبێت، ئەوە فەرموودەکەی عائیشە لەوەی پێغەمبەری ﷺ بۆنخۆش کرد، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر بۆنخۆشکردن دروست بێت، ئەوە ڕاوکردنیش دروستە، وە فەرموودەکەی ئوممو سەلەمە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکات ڕاوکردن دوای بەردبارانکردنی جەمرەکان ڕێگەپێدراوە، ئەویش ئەوەیە کە فەرموویەتی: (إِنَّ هَذَا يَوْمٌ رُخِّصَ لَكُمْ إِذَا أَنْتُمْ رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ أَنْ تَحِلُّوا مِنْ كُلِّ مَا حُرِمْتُمْ مِنْهُ إِلَّا مِنَ النِّسَاءِ)، واتە: بەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژێکە مۆڵەتتان پێ دراوە ئەگەر ئێوە بەردبارانی جەمرەتان کرد، ئیحرام بشکێنن لە هەموو ئەو شتانەی لەسەرتان قەدەغە کرابوو جگە لە ئافرەتان. ئەم باسەم لە شوێنی خۆیدا باسم کردووە لەدوای فەرموودەکەی عوکاشەی کوڕی میحصەن**

واتە: حەجاجی کوڕی ئەرتەئە دەگێڕێتەوە، لە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدەوە، لە عومرەوە، لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بەردبارانی جەمرەتان کرد و سەرتان تاشی ئەوە حەڵاڵە بۆتان بۆنی خۆش و جلوبەرگ بەکار بهێنن جگە لە نیکاح نەبێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی: جگە لە نیکاح. مەبەستی پێی جووتبوونە، وەك لە کتێبی (مَعَانِي الْقُرْآنِ) ڕامگەیاند ناوی نیکاح لای عەرەب هەم بۆ گرێبەست و هەم بۆ جووتبوون بەکار دێت.

---

(١) إسناده ضعيف.

**٢٩٣٨**- عَنْ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ سَالِمًا يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: أَنَا طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَسُنَّةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحَقُّ أَنْ تُتَّبَعَ(١).

**واتە: عەمر دەڵێ: گوێم لە سالم بوو دەیوت: عائیشە ﵂ وتی: من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد، وە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەپێشترە.**

**٢٩٣٩**- عَنِ ابْنِ عَمَرَ ﵄، عَنْ عُمَرَ قَالَ إِذَا رَمَى الرَّجُلُ الْجَمْرَةَ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَذَبَحَ وَحَلَقَ فَقَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا النِّسَاءَ وَالطِّيبَ. قَالَ سَالِمٌ: وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: قَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا النِّسَاءَ وَقَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي إِخْبَارِ عَائِشَةَ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّهُ إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ وَذَبَحَ وَحَلَقَ كَانَ حَلَالًا قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ خَلَا مَا زُجِرَ عَنْهُ مِنْ وَطْءِ النِّسَاءِ الَّذِي، لَمْ يَخْتَلِفِ الْعُلَمَاءُ فِيهِ أَنَّهُ مَمْنُوعٌ مِنْ وَطْءِ النِّسَاءِ حَتَّى يَطُوفَ طَوَافَ الزِّيَارَةِ.

**واتە: ئیبنو عومەر ﵄، دەگێڕێتەوە عومەر گوتوویەتی: ئەگەر پیاو بەردبارانی جەمرەی کرد بە حەوت بەرد و قوربانی سەر بڕی و سەری تاشی ئەوە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لە ئافرەتان و بۆنی خۆش نەبێ، سالم دەڵێ: عائیشە دەیوت: هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت جگە لە ئافرەتان، وە وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: هەواڵدانی عائیشە: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش کرد بۆ شکاندنی ئیحرام پێش ئەوەی تەواف بکات. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەندە ئەگەر بەردبارانی جەمرەی کرد و قوربانی سەر بڕی و سەری تاشی ئەوە حەڵاڵ دەبێت (هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت کە لە کاتی ئیحرام لەسەری حەرام بووە) جگە لەوەی قەدەغەی لێ کراوە لە جووتبوون لەگەڵ خێزانی کە زانایان هیچ جیاوازییەکیان تیایدا نییە لە ڕێگریکردنی تا تەوافی زیارەت دەکات.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ التَّطَيُّبَ بَعْدَ رَمْيِ الْجِمَارِ وَالنَّحْرِ وَالذَّبْحِ وَالْحِلَاقِ إِنَّمَا هُوَ مُبَاحٌ عِنْدَ بَعْضِ الْعُلَمَاءِ قَبْلَ زِيَارَةِ الْبَيْتِ لِمَنْ قَدْ طَافَ بِالْبَيْتِ قَبْلَ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ دُونَ مَنْ لَمْ يَطُفْ بِالْبَيْتِ قَبْلَ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ

**٢٩٤٠-** عَنْ أُمِّ الزُّبَيْرِ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أُخْتِهَا أَنَّ عَبَّادَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَلَهَا جَارِيَةٌ تُمَشِّطُهَا يَوْمَ النَّحْرِ كَانَتْ حَاضَتْ يَوْمَ قَدِمُوا مَكَّةَ، وَلَمْ تَطُفْ بِالْبَيْتِ قَبْلَ عَرَفَةَ، وَقَدْ كَانَتْ أَهَلَّتْ بِالْحَجِّ، وَدَفَعَتْ مِنْ عَرَفَاتٍ وَرَمَتِ الْجَمْرَةَ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا عَبَّادٌ، وَهِيَ تُمَشِّطُهَا وَتَمَسُّ الطِّيبَ، فَقَالَ عَبَّادٌ: أَتَمَسُّ الطِّيبَ، وَلَمْ تَطُفْ بِالْبَيْتِ قَالَتْ عَائِشَةُ: قَدْ رَمَتِ الْجَمْرَةَ وَقَصَّرَتْ قَالَ: وَإِنْ، فَإِنَّهُ لَا يَحِلُّ لَهَا فَأَنْكَرَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ فَأَرْسَلَتْ إِلَى عُرْوَةَ فَسَأَلَتْهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّهُ لَا يَحِلُّ الطِّيبُ لِأَحَدٍ لَمْ يَطُفْ قَبْلَ عَرَفَاتٍ، وَإِنْ قَصَّرَ وَرَمَى[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ إِنَّمَا يَتَأَوَّلُ بِهَذَا الْفُتْيَا أَنَّ الطِّيبَ إِنَّمَا يَحِلُّ قَبْلَ زِيَارَةِ الْبَيْتِ لِمَنْ قَدْ طَافَ بِالْبَيْتِ قَبْلَ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ، وَلَوْ ثَبَتَ خَبَرُ عَمْرَةَ عَنْ عَائِشَةَ مَرْفُوعًا: «إِذَا رَمَيْتُمْ وَحَلَقْتُمْ فَقَدْ حَلَّ لَكُمُ الطِّيبُ وَالثِّيَابُ إِلَّا النِّكَاحَ»، لَكَانَتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ تُبِيحُ الطِّيبَ وَالثِّيَابَ لِجَمِيعِ الْحُجَّاجِ بَعْدَ الرَّمْيِ وَالْحَلْقِ لِمَنْ قَدْ طَافَ مِنْهُمْ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَمَنْ لَمْ يَطُفْ إِلَّا أَنَّ رِوَايَةَ الْحَجَّاجِ بْنِ أَرْطَأَةَ عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَلَسْتُ أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ الْحَجَّاجِ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ إِلَّا أَنَّ فِي خَبَرِ أُمِّ سَلَمَةَ، وَعُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ إِنَّ هَذَا يَوْمٌ رُخِّصَ لَكُمْ إِذَا أَنْتُمْ رَمَيْتُمُ الْجِمَارَ أَنْ تَحِلُّوا مِنْ كُلِّ مَا حُرِمْتُمْ إِلَّا النِّسَاءَ، فَإِذَا أَمْسَيْتُمْ قَبْلَ أَنْ تَطُوفُوا بِالْبَيْتِ صِرْتُمْ كَهَيْئَتِكُمْ قَبْلَ أَنْ تَرْمُوا الْجَمْرَةَ وَهَذَا لَفْظُ خَبَرِ أُمِّ سَلَمَةَ، وَخَبَرُ عُكَّاشَةَ مِثْلُهُ فِي الْمَعْنَى فَإِذَا حُكِمَ لِهَذَا الْخَبَرِ عَلَى ظَاهِرِهِ دَلَّ عَلَى خِلَافِ قَوْلِ عُرْوَةَ الَّذِي ذَكَرْتُهُ.

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەکارهێنانی بۆنی خۆش لەدوای بەردبارانی جەمرەکان و قوربانی و سەرتاشین تەنها لای هەندێ لە زانایان ڕێگەپێدراوە، پێش زیارەتی بەیت، بۆ ئەو کەسەی تەوافی بەیتی کردووە پێش وەستان لە عەرەفە، نەك ئەو کەسەی تەوافی بەیتی نەکردووە پێش وەستان لە عەرەفە

واتە: ئوممو زوبەیری کچی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە، لە عائیشەی کچی عەبدوڕەحمانی خوشکیەوە، کە عەبادی کوڕی عەبدوڵا هات بۆ لای

---

(١) لم نقف عليه.

عائیشەی کچی عەبدوڕەحمان، کچێکی هەبوو سەری شانە دەکرد لە ڕۆژی جەژندا، کاتێ هاتنە مەککە ئەو کچە کەوتە حەیزەوە و تەوافی بەیتی نەکرد پێش عەرەفە، ئیحرامی حەجی بەستبوو وە لە عەرەفاتیش بەڕێ کەوتبوو، هەروەها بەردبارانی جەمرەیشی کردبوو، عەباد هاتە ژوورەوە بۆ لای عائیشە قژی بۆی شانە دەکرد و بۆنی خۆشی بەکاردەهێنا، عەباد وتی: ئایا بۆنی خۆشی بۆ بەکار دێنی لە کاتێکدا تەوافی بەیتی نەکردووە، عائیشە وتی: بێگومان بەردبارانی جەمرەی کردووە و قژیشی کورت کردۆتەوە، وتی: جا با ئەوەیش بکات، بێگومان بەکارهێنانی ئەوانە حەڵاڵ نییە بۆی، عائیشەیش ئینکاری قسەکەی کرد، دواتر کەسێکی نارد بۆ لای عوروە لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد، ئەویش وتی: بۆنی خۆش بۆ هیچ کەس حەڵاڵ نییە پێش عەرەفات تەوافی نەکردبێ، ئەگەرچی قژی کورت کردبێتەوە و بەردبارانیشی کردبێ.

ئەبو بەکر دەڵێ: جا عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: بۆنی خۆش لە کاتێکدا حەڵاڵە بەکاربهێنرێت پێش زیارەتکردنی بەیت بۆ ئەو کەسەی پێش وەستان لە عەرەفە تەوافی بەیتی کردبێ، وە ئەگەر فەرموودەکەی عەمرە لە عائیشەوە جێگیر بێت کە بەمەرفوعی هاتووە: کاتێ بەردبارانی جەمرەتان کرد و سەرتان تاشی ئەوە حەڵاڵە بۆتان بۆنی خۆش و جلوبەرگ بەکار بهێنن جگە لە جووتبوون. ئەوە ئەم دەستەواژەیە ڕێگە دەدات بە بەکارهێنانی بۆنی خۆش و پۆشینی جلوبەرگ بۆ هەموو حاجییەکان، دوای بەردبارانکردن و سەرتاشین بۆ ئەو کەسەی کە تەوافی کردووە لە ڕۆژی عەرەفە، وە ئەو کەسەیشی تەوافی نەکردووە، ئەوە نەبێ گێڕانەوەی حەجاجی کوڕی ئەرتات لە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدەوە، من هیچ زانیارییەکم نییە حەجاج ئەم فەرموودەی لە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدەوە بیستبێ، جگە لەوەی کە لە فەرموودەکەی ئوممو سەلەمە و عوکاشەی کوڕی میحصەندا هاتووە، (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی): بەڕاستی ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە مۆڵەت دراوە بە ئێوە کاتێ بەردبارانی جەمرەکانتان کرد ئیحرام بشکێنن لە هەموو ئەو شتانەی ئیحرامتان بۆی پۆشیوە جگە لە ئافرەتان، جا ئەگەر ئێوارەتان کردەوە پێش ئەوەی تەوافی بەیت بکەن ئەوە وەکوو ئەو کاتەتان لێ دێت پێش ئەوەی بەردبارانی جەمرە بکەن، ئەمە دەستەواژەی فەرموودەکەی ئوممو سەلەمەیە، وە فەرموودەکەی عوکاشەیش لە ڕووی ماناوە وەکوو ئەو فەرموودە وایە،

جا ئەگەر حوکم درا بە ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیە ئەوە بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەی وتەکەی عوڕوە کە باسم کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ طَوَافِ الزِّيَارَةِ يَوْمَ النَّحْرِ اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ وَمُبَادَرَةً بِقَضَاءِ الْوَاجِبِ عَنِ الطَّوَافِ الَّذِي بِهِ يَتِمُّ حَجُّ الْحَاجِّ خَوْفَ أَنْ يَعْرِضَ لِلْمَرْءِ مَا لَا يُمْكِنُهُ طَوَافُ الزِّيَارَةِ مَعَهُ، وَإِنْ كَانَ تَأْخِيرُ الْإِفَاضَةِ عَنْ يَوْمِ النَّحْرِ جَائِزًا

**٢٩٤١-** عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى قَالَ نَافِعٌ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُفِيضُ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي الظُّهْرَ يَعْنِي بِمِنًى وَيَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَهُ[١].

## باسی چاکتر وایە لە ڕۆژی جەژنی قوربان تەوافی زیارەت بکات، وەکوو شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ، وە پەلە بکات لە بەجێهێنانی ئەو واجبەی کە حەجی حاجی بەوە تەواو دەبێت، نەوەك شتێك بێتە پێشی بەهۆیەوە نەتوانێ تەوافی زیارەت بکات، ئەگەرچی دواخستنی تەوافی زیارەت لە ڕۆژی جەژن دروستە

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن لە مینا گەڕایەوە تەوافی کرد (طواف الإفَاضَة)، پاشان گەڕایەوە نوێژی نیوەڕۆی لە مینا کرد. نافیع وتی: ئیبنو عومەریش لە ڕۆژی جەژنی قوربان بەڕێ دەکەوت، پاشان دەگەڕایەوە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، واتە: لە مینا، وە باسی ئەوەی دەکرد پێغەمبەریش ﷺ بەوشێوەی کردووە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوَطْءَ يَحِلُّ بَعْدَ رَكْعَتَيْ طَوَافِ الزِّيَارَةِ، وَإِنْ كَانَ الطَّائِفُ بِمَكَّةَ قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى مِنًى

**٢٩٤٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَزُورُ الْبَيْتَ فَيَطُوفُ بِهِ أُسْبُوعًا، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَتَحِلُّ لَهُ النِّسَاءُ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی جووتبوون دوای دوو ڕکاتەکەی تەوافی زیارەت حەڵاڵ دەبێت، ئەگەرچی تەوافکەر لە مەککەش بوو پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ مینا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زیارەتی بەیتی دەکرد و حەوت جار تەوافی دەکرد، (ئەوە تەوافی واجبە، حەج بەوە تەواو دەبێت)، وە دوو ڕکات نوێژی دەکرد و خێزانەکانیشی بۆ حەڵاڵ دەبوو.

## بَابُ تَرْكِ الرَّمَلِ فِي طَوَافِ الزِّيَارَةِ لِلْقَارِنِ، وَحُكْمُ الْمُفْرِدِ فِي هَذَا كَحُكْمِ الْقَارِنِ

**٢٩٤٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَرْمُلْ فِي السَّبْعِ الَّذِي أَفَاضَ فِيهِ، وَقَالَ عَطَاءٌ: لَا رَمَلَ فِيهِ[١].

## باسی هەروەلەنەکردن لە تەوافی زیارەت بۆ ئەو کەسەی قیرانی کردووە، وە حوکمی ئەو کەسەش کە تەنها ئیحرامی بۆ حەج بەستووە لەمەدا وەکوو حوکمی ئەو کەسەیە کە قیرانی کردووە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەوت تەوافەکەی زیارەت یان (طواف الإفَاضَة) هەروەلەی نەکرد، عەتائیش وتی: هەروەلەی تێدا نییە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الشُّرْبِ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنْ طَوَافِ الزِّيَارَةِ

**٢٩٤٤-** عَنْ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: ثُمَّ أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْبَيْتِ يَعْنِي يَوْمَ النَّحْرِ، فَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَهُمْ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ، فَقَالَ: «انْزَعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَلَوْلَا أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا فَشَرِبَ مِنْهُ[٢]

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی چاكتر وایە بۆ بەندە لەدوای تەواوبوونی تەوافی زیارەت لە ئاوی زەمزەم بخواتەوە

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە دەڵێ: چووین بۆ لای جابری كوڕی عەبدوڵا ﷺ، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەكەی كرد، وە وتی: پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ (لە میناوە) بەڕێ كەوت بۆ بەیت، واتە: لە ڕۆژی جەژن، (دوای ئەوەی زیارەتی تەواو كرد) هات بۆ لای نەوەكانی عەبدولموتەلیب ئاویان لە زەمزەم هەڵدەكێشا بۆ خەڵكەكە، فەرمووی: ئەی نەوەكانی عەبدولموتەلیب ئاو هەڵبكێشن، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خەڵكێكی زۆر لەسەرتان كۆ دەبێتەوە (بەهۆی پەیڕەویی منەوە) منیش لەگەڵتان ئاوم هەڵدەكێشا، دۆڵكەیەك ئاویان پێ دا، ئەویش لێی خواردەوە.

**٢٩٤٥**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ دَلْوًا مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ قَائِمًا[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَرَادَ شَرِبَ مِنْ دَلْوٍ لَا أَنَّهُ شَرِبَ الدَّلْوَ كُلَّهُ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي قَدْ أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ اسْمَ الشَّيْءِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ أَجْزَائِهِ كَقَوْلِهِ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴿١١٠﴾﴾ الإسراء، فَأَوْقَعَ اسْمَ الصَّلَاةِ عَلَى الْقِرَاءَةِ خَاصَّةً، وَكَقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ اللَّهُ: «قَسَمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ» ثُمَّ ذَكَرَ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ خَاصَّةً، فَأَوْقَعَ اسْمَ الصَّلَاةِ عَلَى قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي الصَّلَاةِ خَاصَّةً.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەپێوە لە دۆڵكەیەك ئاوی زەمزەمی خواردەوە.

ئەبو بەكر دەڵێ: مەبەستی ئەوەیە لە دۆڵكەكەی خواردەوە، نەك هەموو ئاوی دۆڵكەكەی خواردبێتەوە، ئەمەش لەو شێوازەیە كە لە چەند شوێنێكی كتێبەكانماندا باسم كردووە هەندێ جار ناوی شتێك بۆ بەشێك لە بەشەكانی ئەو شتە بەكار دێت، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴿١١٠﴾﴾، واتە: دەنگت بەرز مەكەرەوە لە نوێژەكانتدا. ناوی نوێژی كورت كردۆتەوە تەنها لەسەر قورئانخوێندن، وە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ فەرموویەتی: نوێژم كرد بە دوو بەشەوە لە

---

(١) صحيح.

نێوان خۆم و بەندەکەمدا. پاشان بەتایبەت باسی سوڕەتی فاتیحەی کرد، ناوی نوێژی کورت کردەوە لەسەر خوێندنی سوڕەتی فاتیحە لە نوێژدا.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاسْتِقَاءِ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ عَمَلٌ صَالِحٌ، وَأَعْلَمَ أَنْ لَوْلَا أَنْ يَغْلِبَ الْمُسْتَقِي مِنْهَا عَلَى الِاسْتِقَاءِ لَنَزَعَ مَعَهُمْ

**٢٩٤٦**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَ إِلَى السِّقَايَةِ فَاسْتَسْقَى، فَقَالَ الْعَبَّاسُ: يَا فَضْلُ اذْهَبْ إِلَى أُمِّكَ، فَإِيتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِشَرَابٍ مِنْ عِنْدِهَا، فَقَالَ: «اسْقِنِي»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ أَيْدِيَهُمْ فِيهِ، فَقَالَ «اسْقِنِي»، فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ أَتَى زَمْزَمَ، وَهُمْ يَسْقُونَ وَيَعْمَلُونَ فِيهَا، فَقَالَ: «اعْمَلُوا فَإِنَّكُمْ عَلَى عَمَلٍ صَالِحٍ»، ثُمَّ قَالَ: «لَوْلَا أَنْ تُغْلَبُوا لَنَزَعْتُ حَتَّى أَضَعَ الْحَبْلَ عَلَى هَذِهِ يَعْنِي عَاتِقَهُ. وَأَشَارَ إِلَى عَاتِقِهِ»[1].

## باسی ئاوگێڕانی زەمزەم لە کردەوە چاکەکانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە ئەو کارە لە کردەوە چاکەکانە، هەروەها ڕایگەیاندووە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت خەڵکێکی زۆر لەسەر ئاوگێڕ کۆ دەبێتەوە بۆ ئاودان ئەوە لەگەڵیان ئاوی هەڵدەکێشا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ شوێنی ئاوخواردنەوەی حاجییەکان و داوای ئاوی کرد، عەباس وتی: ئەی فەزل بڕۆ بۆ لای دایکت خواردنەوەیەك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئاوم بدەرێ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان دەستی تێ دەخەن، فەرمووی: ئاوم بدەرێ، دواتر لێی خواردەوە، پاشان هات بۆ لای ئاوی زەمزەم، ئەوان ئاویان دەگێڕا و لێیان دەردەهێنا، فەرمووی: ئاو بگێڕن بەڕاستی ئێوە لەسەر کارێکی چاکن، پاشان فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خەڵکێکی زۆر لەسەرتان کۆ دەبێتەوە دادەبەزیم گوریسێکم دەخستە ئێرەم، ئاماژەی بۆ شانی کرد، ئەوکات ئاوم لەگەڵ هەڵدەهێنجان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الشُّرْبِ مِنْ نَبِيذِ السِّقَايَةِ إِذَا لَمْ يَكُنِ النَّبِيذُ مُسْكِرًا

**٢٩٤٧-** عَنْ بَكْرٍ، جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى السِّقَايَةِ فَشَرِبَ نَبِيذًا، فَقَالَ: مَا بَالُ أَهْلِ هَذَا الْبَيْتِ يَسْقُونَ النَّبِيذَ وَبَنُو عَمِّهِمْ يَسْقُونَ اللَّبَنَ وَالْعَسَلَ أَمِنْ بُخْلٍ أَمْ مِنْ حَاجَةٍ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄ وَذَاكَ بَعْدَ مَا ذَهَبَ بَصَرُهُ: عَلَيَّ بِالرَّجُلِ، فَأُتِيَ بِهِ، فَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَتْ بِنَا حَاجَةٌ وَلَا بُخْلٌ، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَهُوَ عَلَى بَعِيرِهِ وَخَلْفَهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ فَاسْتَسْقَى فَسَقَيْنَاهُ نَبِيذًا فَشَرِبَ، ثُمَّ نَاوَلَ فَضْلَهُ أُسَامَةَ فَقَالَ: «قَدْ أَحْسَنْتُمْ وَأَجْمَلْتُمْ وَكَذَلِكَ فَافْعَلُوا» فَنَحْنُ لَا نُرِيدُ أَنْ نُغَيِّرَ ذَلِكَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذَا الْخَبَرُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ فِي كُتُبِنَا إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبِيحُ الشَّيْءَ بِذِكْرٍ مُجْمَلٍ وَيُبَيِّنُ فِي آيَةٍ أُخْرَى عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ أَنَّ مَا أَبَاحَهُ بِذِكْرٍ مُجْمَلٍ أَرَادَ بِهِ بَعْضَ ذَلِكَ الشَّيْءِ الَّذِي ذَكَرَهُ مُجْمَلًا لَا جَمِيعَهُ، وَكَذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ يُبِيحُ الشَّيْءَ بِذِكْرٍ مُجْمَلٍ، وَيُبَيِّنُهُ فِي وَقْتٍ تَالٍ أَنَّ مَا أَجْمَلَ ذِكْرَهُ أَرَادَ بِهِ بَعْضَ ذَلِكَ الشَّيْءِ لَا جَمِيعَهُ كَقَوْلِهِ: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ ﴿١٨٧﴾﴾ البقرة، فَأَجْمَلَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ ذِكْرَ الْمَأْكُولِ وَالْمَشْرُوبِ وَبَيَّنَ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ أَنَّهُ إِنَّمَا أَبَاحَ بَعْضَ الْمَأْكُولِ، وَبَعْضَ الْمَشْرُوبِ لَا جَمِيعَهُ، وَهَذَا بَابٌ طَوِيلٌ قَدْ بَيَّنْتُهُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا، فَالنَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ الشُّرْبَ مِنْ نَبِيذِ السِّقَايَةِ إِذَا لَمْ يَكُنْ مُسْكِرًا؛ لِأَنَّهُ أَعْلَمَ أَنَّ الْمُسْكِرَ حَرَامٌ.

## باسی ڕێگەدراوە بە خواردنەوەی گیراوەی ترێ یان خورما لەو گیراوانەی کە خزمەتکارانی ماڵی خوا دەیگێڕن بەسەر زیارەتکاراندا بە مەرجێ گیراوەکە سەرخۆشکەر نەبێت

واتە: بەکر دەگێڕێتەوە، پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ شوێنی خواردنەوەی حاجییەکان گیراوەی (ئاوی ترێی) خواردەوە، (واتە: شەربەتی ترێ)، وتی: ئەوە چییە ئەم خانەوادەیە شەربەتی ترێ دەبەخشنەوە (مەبەستی خانەوادەی عەباس بوو) ئامۆزاکانیشیان شیر و هەنگوین دەبەخشنەوە، ئایا ئەوە لە ڕەزیلییە یان نەبوونەییە، ئیبنو عەباس دوای ئەوەی چاوی لەدەست دابوو، وتی: ئەو پیاوەم بۆ بێنن، پیاوەکەیان بۆی هینا، وتی: ئێمە نە لەبەر هەژاری ئەوەمان کرد و نە لەبەر ڕەزیلیش،

---

(١) صحيح.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر وشترەکەیەوە هاتە نێو مزگەوتەوە، ئوسامەی کوڕی زەیدیش لە پشتیەوە بوو، داوای خواردنەوەی کرد، ئێمەیش گیراوەمان پێی دا (واتە: خۆشاو و شەربەتی ترێ)، پاشان زیادەکەی دایەوە دەستی ئوسامە و فەرمووی: بەڕاستی کارێکی چاك و جوانتان کرد، بەردەوام بن لەسەر ئەو کارە. جا ئێمە نامانەوێ ئەوە بگۆڕین.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەو شێوازەیە کە لە کتێبەکانماندا وتوومانە: خوا ﷻ ڕێگە بە شتێك ئەدات بەباسکردنێکی ناڕوون، وە ڕوونی دەکاتەوە لە ئایەتێکی دیکەدا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوەی کە ڕێگەی پێ داوە بەباسکردنێکی ناڕوون، مەبەستی پێی هەندێ لەو شتەیە کە بەناڕوونی باسی کردووە نەك هەمووی، بەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ ڕێگە بە شتێك ئەدات بەباسکردنێکی ناڕوون، بەڵام ئەو شتەی کە بەناڕوونی باسی کردووە لە کاتێکی دیکەدا ڕوون دەکاتەوە، مەبەستی پێی هەندێ لەو شتەیە نەك هەمووی، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ ﴿١٨٧﴾﴾. لەم ئایەتەدا باسی خواردن و خواردنەوەی بەناڕوونی هێناوە، وە لە غەیری ئەم شوێنەدا ڕوونی کردۆتەوە مەبەستی پێی هەندێ لە خواردن و هەندێ لە خواردنەوەکانە نەك هەموویان، ئەمەش بابەتێکی دوورودرێژە لە چەند شوێنێکی کتێبەکانماندا ڕوونم کردۆتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ڕێگەی داوە بە خواردنەوەی خۆشاو و گیراوە ئەگەر سەرخۆشکەر نەبێت، چونکە ڕایگەیاندووە سەرخۆشکەر حەرامە.

## بَابُ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ مَعَ طَوَافِ الزِّيَارَةِ لِلْمُتَمَتِّعِ

٢٩٤٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ قَالَتْ: فَطَافَ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافًا آخَرَ بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى لِحَجِّهِمْ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوە لەگەڵ تەوافی زیارەت بۆ ئەو کەسەی تەمەتوعی کردووە[1]

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا دەرچووین، وتی: ئەوانەی ئیحرامی عومرەیان بەستبوو تەوافی بەیتیان کرد، هەروەها هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوەیش، پاشان ئیحرامیان شکاند، پاشان دوای ئەوەی لە مینا گەڕانەوە تەوافێکی دیکەیان کرد بۆ حەجەکەیان.

**بَابُ تَرْكِ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ مَعَ طَوَافِ الزِّيَارَةِ لِلْمُفْرِدِ وَالْقَارِنِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ يُونُسَ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ، عَنْ مَالِكٍ فِي الْبَابِ قَبْلَ هَذَا، وَقَالَ فِيهِ: وَأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَإِنَّهُمْ طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا.**

**باسی هاتوچۆنەکردن لە نێوان صەفا و مەڕوە لەگەڵ تەوافی زیارەت بۆ ئەو کەسەی بەتەنها ئیحرامی بۆ حەج بەستووە و ئەوەیشی قیرانی کردووە (واتە: ئیحرامی بۆ حەج و عومرە پێکەوە بەستووە)، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی یونسی کوڕی عەبدولئەعلا، لە ئیبنو وەهب، لە مالیك لەو باسەی پێش ئەم باسەدا هاتووە، (واتە: فەرموودەی ژمارە ٨٤٩٢) وە عائیشە لە وتەکەیدا ئەوەیشی وت: بەڵام ئەوانەی حەج و عومرەیان پێکەوە کۆ کردەوە ئەوە یەك تەوافیان کرد**

## بَابُ ذِكْرِ مَنْ قَدَّمَ نُسُكًا قَبْلَ نُسُكٍ جَاهِلًا بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصٍّ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا فِدْيَةَ لَهُ

**٢٩٤٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ، فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ قَالَ: «اذْبَحْ، وَلَا حَرَجَ». قَالَ: وَذَبَحتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ قَالَ: «ارْمِ وَلَا حَرَجَ»[2].

---

(١ ) واتە: ئیحرامی بۆ عومرە بەستووە، لەدوای تەواوبوونی عومرە ئیحرام بۆ حەجیش ببەستێ.

(٢) صحیح.

باسی ئەو کەسەی بەنەزانین قوربانی پێش دەخات، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورتکراوە نەك تێروتەسەل، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هیچ فیدیەیەکی لەسەر نییە

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربان، وتی: سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، فەرمووی: قوربانی بکە، هیچ گوناهی تێدا نییە، وە وتی: قوربانیم کرد پێش ئەوەی بەردبارانی جەمرە بکەم، فەرمووی: بەردباران بکە و هیچ گوناهی تێدا نییە.

**٢٩٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسْأَلُ يَوْمَ النَّحْرِ بِمِنًى فَيَقُولُ: «لَا حَرَجَ لَا حَرَجَ» فَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ، فَقَالَ: «لَا حَرَجَ»، وَقَالَ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ قَالَ: «لَا حَرَجَ»[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربان لە مینا پرسیاری لێ دەکرا، دەیفەرموو: کێشە نییە کێشە نییە، پیاوێك پرسیاری لێ کرد فەرمووی: سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، فەرمووی: هیچ کێشەیەکی تێدا نییە، وە وتی: دوای ئێوارە بەردبارانی جەمرەم کرد، فەرمووی: هیچ کێشەیەکی تێدا نییە.

## بَابُ خُطْبَةِ الْإِمَامِ بِمِنًى يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الظُّهْرِ

**٢٩٥١-** عَن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ يَخْطُبُ يَوْمَ النَّحْرِ فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كُنْتُ أَحْسِبُ أَنَّ كَذَا وَكَذَا قَبْلَ كَذَا وَكَذَا، ثُمَّ آخَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كُنْتُ أَحْسِبُ أَنَّ كَذَا قَبْلَ كَذَا لِهَؤُلَاءِ الثَّلَاثِ فَقَالَ: «افْعَلْ وَلَا حَرَجَ»[٢].

باسی وتاری ئیمام و پێشەوا لە مینا لە ڕۆژی جەژنی قوربان دوای نیوەڕۆ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا لە ڕۆژی جەژنی قوربان، پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمزانی کە فڵانە شت و فڵانە شت پێش فڵانە شت و فڵانە شت بێت، (واتە: نەمزانی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کە تەواف پێش سەربڕین بێت، یان سەربڕین پێش سەرتاشین بێت)، پاشان یەکێکی دیکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمزانی کە فڵانە شت پێش فڵانە شت بێت، بەو سێ شتەی (تەواف و سەرتاشین و قوربانیکردن) فەرموو: ئەنجامی بدە و هیچ گوناهی تێدا نییە. (واتە: پێش و پاش خستنیان ئاساییە).

**٢٩٥٢-** عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ، الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[١].

واتە: ئەبو بەکرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن وتارێکی دا، فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، (بەڵام لێرەدا تەنها ئەو بەشەی هێناوە کە دەبێتە بەڵگە بۆ سەرباسەکەی).

## بَابُ خُطْبَةِ الْإِمَامِ عَلَى الرَّاحِلَةِ

**٢٩٥٣-** عَنِ الْهِرْمَاسِ بْنِ زِيَادٍ الْبَاهِلِيِّ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى يَخْطُبُ النَّاسَ وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ الْعَضْبَاءِ وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي[٢].

### باسی وتاردانی ئیمام و پێشەوا بەسەر وڵاخەوە

واتە: هیرماسی کوڕی زیادی باهیلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە مینا بەسەر وشترەکەیەوە بوو (کە نازناوی) (الْعَضْبَاء) بوو، وتاری بۆ خەڵکەکە دەدا، منیش لەپشت باوکمەوە بەسەر وەڵاخەکەوە بووم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْجِمَاعِ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الزِّيَارَةِ

**٢٩٥٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ أَرَادَ مِنْ صَفِيَّةَ مَا يُرِيدُ الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِهِ، فَقِيلَ: إِنَّهَا حَائِضٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ»، فَقَالُوا: إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ فَنَفَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

(٣) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە جووتبوون لە ڕۆژی جەژن دوای زیارەتی بەیت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی زیارەتی کرد، پاشان ویستی بچێتە لای صەفیەی خێزانی، وترا: ئەو لە حەیزدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ بڵێی نەمانهێڵێتەوە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تەوافی ماڵی خوای کردووە، (دوای تەواف کەوتە حەیزەوە)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵی مەککەی بەجێ هێشت.

## بَابُ ذِكْرِ النَّاسِي بَعْضَ نُسُكِهِ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ يَذْكُرُهُ

**٢٩٥٥-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَهُوَ يَخْطُبُ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: إِنَّهُ نَسِيَ أَنْ يَرْمِيَ قَالَ: «ارْمِ وَلَا حَرَجَ»، ثُمَّ أَتَاهُ آخَرُ، فَقَالَ: إِنَّهُ نَسِيَ أَنْ يَطُوفَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «طُفْ وَلَا حَرَجَ»، ثُمَّ أَتَاهُ آخَرُ فَقَالَ نَسِيتُ أَنْ أَذْبَحَ قَالَ: «اذْبَحْ وَلَا حَرَجَ»، فَمَا سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ يَوْمَئِذٍ إِلَّا قَالَ: «لَا حَرَجَ، وَقَالَ لَقَدْ أَذْهَبَ اللَّهُ الْحَرَجَ إِلَّا امْرَءًا اقْتَرَضَ مِنْ مُسْلِمٍ فَذَاكَ حَرَجٌ»[١].

## باسی ئەو کەسەی لە ڕۆژی جەژنی قوربان هەندێك لە ڕێوڕەسمەکانی بیر چووە، پاشان بیری کەوتووەتەوە

واتە: ئوسامەی کوڕی شەریك ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئامادەی حەجی ماڵئاوایی بووم، لە کاتێکدا ئەو وتاری دەدا پیاوێك هات بۆ لای، وتی: ئەو بیری چووە بەردبارانی جەمرە بکات، فەرمووی: بەردباران بکە و هیچ گوناهی تێدا نییە، پاشان پیاوێکی دیکە هات بۆ لای وتی: ئەو بیری چووە تەواف بکات، فەرمووی: تەواف بکە و هیچ گوناهی تێدا نییە، پاشان پیاوێکی دیکە هات بۆ لای وتی: بیرم چوو قوربانی سەر ببڕم، فەرمووی: قوربانی سەر ببڕە و هیچ گوناهی تێدا نییە، ئەو ڕۆژە پرسیاری لەبارەی هیچ شتێکەوە لێ نەکرا ئیللا فەرمووی: گوناهی تێدا نییە، وە فەرمووی: بێگومان خوا گوناهی هەڵگرت مەگەر پیاوێك دەستدرێژی کردبێتە سەر ناموسی مسوڵمانێك ئەوە گوناهە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْبَيْتُوتَةِ بِمِنًى لَيَالِيَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

**٢٩٥٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ رَجَعَ فَمَكَثَ بِمِنًى لَيَالِيَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ يَرْمِي الْجَمْرَةَ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ كُلَّ جَمْرَةٍ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، وَيَقِفُ عِنْدَ الْأُولَى وَعِنْدَ الثَّانِيَةِ، فَيُطِيلُ الْقِيَامَ، وَيَتَضَرَّعُ، ثُمَّ يَرْمِي الثَّالِثَةَ وَلَا يَقِفُ عِنْدَهَا[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ: حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ، ظَاهِرُهَا خِلَافُ خَبَرِ ابْنِ عُمَرَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ قَبْلُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى، وَأَحْسَبُ أَنَّ مَعْنَى هَذِهِ اللَّفْظَةِ لَا تُضَادُّ خَبَرَ ابْنِ عُمَرَ لَعَلَّ عَائِشَةَ أَرَادَتْ أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ بَعْدَ رُجُوعِهِ إِلَى مِنًى، فَإِذَا حُمِلَ خَبَرُ عَائِشَةَ عَلَى هَذَا الْمَعْنَى لَمْ يَكُنْ مُخَالِفًا لِخَبَرِ ابْنِ عُمَرَ، وَخَبَرُ ابْنِ عُمَرَ أَثْبَتُ إِسْنَادًا مِنْ هَذَا الْخَبَرِ، وَخَبَرُ عَائِشَةَ مَا تَأَوَّلْتُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ الْكَلَامَ مُقَدَّمٌ وَمُؤَخَّرٌ كَقَوْلِهِ:﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ ﴾ الكهف، وَمِثْلُ هَذَا فِي الْقُرْآنِ كَثِيرٌ، قَدْ بَيَّنْتُ بَعْضَهُ فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ، وَسَأُبَيِّنُ بَاقِيَهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، وَهَذَا كَقَوْلِهِ:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ ﴿١١﴾ ﴾ الأعراف، فَمَعْنَى قَوْلِ عَائِشَةَ عَلَى هَذَا التَّأْوِيلِ أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ ثُمَّ رَجَعَ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ فَقَدَّمَ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ قَبْلَ قَوْلِهِ ثُمَّ رَجَعَ كَمَا قَدَّمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ:﴿ خَلَقْنَٰكُمْ ﴿١١﴾ ﴾ الأعراف، قَبْلَ قَوْلِهِ:﴿ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ﴿١١﴾ ﴾ الأعراف، وَالْمَعْنَى صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ خَلَقْنَاكُمْ.

### باسی شەومانەوە لە مینا لە شەوەکانی (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ)دا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی زیارەتی کرد لە کۆتا ڕۆژیدا، (واتە: یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان) کاتێ نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان گەڕایەوە، دواتر لە مینا مایەوە لە شەوەکانی (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ)دا، لەوێ بەردبارانی جەمرەی دەکرد کاتێ کە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا، هەر جەمرەیەك بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیرێکی دەکرد، وە لە کاتی جەمرەی یەکەم و دووەمدا ئەندازەیەکی زۆر دەوەستا، زیکر و یادی خوای زۆر تێدا دەکرد و دەپاڕایەوە، پاشان لە جەمرەی سێیەم جار بەردبارانی کرد و لەلای نەوەستا.

---

(١) إسناده حسن.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ)، ڕواڵەتەكەی پێچەوانەی فەرموودەكەی ئیبنو عومەرە كە لە پێشەوە باسمان كرد، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژن تەوافی خواحافیزی كرد، پاشان گەڕایەوە نوێژی نیوەڕۆی لە مینا كرد. پێم وایە مانای ئەو دەستەواژەیە دژیەكی فەرموودەكەی ئیبنو عومەر نییە، پێ دەچێ عائیشە مەبەستی ئەوە بووبێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە كۆتا ڕۆژیدا تەوافی كرد، كاتێ نوێژی نیوەڕۆی كرد دوای گەڕانەوەی بۆ مینا، جا ئەگەر فەرموودەكەی عائیشە حەمل بكرێتە سەر ئەم مانایە ئەوە پێچەوانەی فەرموودەكەی ئیبنو عومەر نابێتەوە، وە فەرموودەكەی ئیبنو عومەر لە ڕووی سەنەدەوە لە فەرموودەكەی عائیشە جێگیرترە، وە فەرموودەكەی عائیشە بەو شێوەی لەیەكم دایەوە لەو شێوازەیە كە دەڵێین: بەڕاستی ئاخاوتن پێش و پاش دەخرێ (مُقَدَّمٌ وَمُؤَخَّرٌ)، وەك چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾﴾. وە هاوشێوەی ئەمە لە قورئاندا زۆرە، لە كتێبی (مَعَانِي الْقُرْآن)دا هەندێكیم ڕوون كردۆتەوە، وە بە ویستی خوا ئەوەی ماوە ئێستا ڕوونی دەكەمەوە، وە ئەویش وەكوو فەرمایشتی خوا وایە كە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ ﴿١١﴾﴾، جا مانای وتەكەی عائیشە بەپێی ئەم لێكدانەوەیە بەم شێوە دەبێت: (أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ ثُمَّ رَجَعَ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی خواحافیزی كرد لە كۆتا ڕۆژەكانیدا، پاشان گەڕایەوە كاتێ نوێژی نیوەڕۆی كرد، جا (حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ)ەی پێش خستووە بەسەر فەرموودەكەی (ثُمَّ رَجَعَ)، وەك چۆن خوا ﷻ: ﴿خَلَقْنَـٰكُمْ ﴿١١﴾﴾ ی پێش فەرمایشتەكەی خستووەتە: ﴿ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ﴿١١﴾﴾ وە مانای ئەمە بەم شێوەیەیە: (صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ خَلَقْنَاكُمْ).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْبَيْتُوتَةِ لِآلِ الْعَبَّاسِ بِمَكَّةَ أَيَّامَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِمْ لِيَقُومُوا بِإِسْقَاءِ النَّاسِ مِنْهَا

٢٩٥٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَذِنَ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، اسْتَأْذَنَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ فَأَذِنَ لَهُ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە خانەوادەی عەباس لە مانەوەیان لە مەککە لە ڕۆژەکانی مینا، بۆ ئەوەی ئاو بدەن بە حاجییان

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، داوای کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە بمێنێتەوە لە شەوانی مینا لەبەر ئەوەی ئاو بە حاجییان بدات، مۆڵەتی پێی دا.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الطِّيبِ وَاللِّبَاسِ إِذَا أَمْسَى الْحَاجُّ يَوْمَ النَّحْرِ قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ وَكُلِّ مَا زُجِرَ الْحَاجُّ عَنْهُ قَبْلَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ يَوْمَ النَّحْرِ

**٢٩٥٨-** عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، وَعَنْ أُمِّهِ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، يُحَدِّثَانِهِ ذَلِكَ جَمِيعًا عَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِي الَّتِي يَصِيرُ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهَا مَسَاءَ يَوْمِ النَّحْرِ، فَصَارَ إِلَيَّ قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيَّ وَهْبٌ وَمَعَهُ رِجَالٌ مِنْ آلِ أَبِي أُمَيَّةَ مُتَقَمِّصِينَ، فَقَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِوَهْبٍ: «هَلْ أَفَضْتَ بَعْدُ يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ؟». قَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «فَانْزِعِ الْقَمِيصَ» فَنَزَعَهُ مِنْ رَأْسِهِ قَالَ: وَنَزَعَ صَاحِبُهُ قَمِيصَهُ مِنْ رَأْسِهِ قَالُوا: وَلِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «هَذَا يَوْمٌ رُخِّصَ لَكُمْ إِذَا أَنْتُمْ رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ أَنْ تَحِلُّوا مِنْ كُلِّ مَا حُرِمْتُمْ مِنْهُ إِلَّا مِنَ النِّسَاءِ، فَإِذَا أَمْسَيْتُمْ قَبْلَ أَنْ تَطُوفُوا بِهَذَا الْبَيْتِ صِرْتُمْ حُرُمًا كَهَيْئَتِكُمْ قَبْلَ أَنْ تَرْمُوا الْجَمْرَةَ»[1].

## باسی قەدەغەکردن لە بەکارهێنانی بۆنی خۆش و لەبەرکردنی پۆشاك، ئەگەر حاجی ئێوارەی بەسەردا هات پێش ئەوەی تەوافی زیارەت بکات، هەروەها هەموو ئەوانەی قەدەغە کراوە لە حاجی پێش بەردبارانکردنی جەمرە لە ڕۆژی جەژنی قوربان

واتە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی زەمعە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، وە لە دایکیەوە (واتە: دایکی عوبەیدە) زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە، لە ئوممو سەلەمەوە ﷺ، هەردووکیان دەگێڕنەوە، ئوممو سەلەمە دەڵێ: کاتێ ئەو شەوەی نۆرەی من بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بێت بۆ لام وا ڕێك کەوت ئێوارەی جەژنی قوربان بوو (کە دەکاتە

---

(١) إسناده حسن.

شەوی یازدەی (ذي الحجة)) لەو شەوەدا هات بۆ لام، ئوممو سەلەمە وتی: وەهبیش لەگەڵ پیاوانێك لە بنەماڵی ئومەییە هاتن بۆ لام كراسیان لەبەر كرابوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە وەهبی فەرموو: ئایا تەوافی زیارەتت كردووە ئەی باوكی عەبدوڵا؟ وتی: نە سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: كراسەكە لەبەرت داكەنە، ئەویش كراسەكەی لە سەریەوە داكەند، هاوڕێكەشی كراسەكەی لە سەریەوە داكەند، وتیان: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڕاستی ئەم ڕۆژە (ڕۆژی جەژن) ڕۆژێكە مۆڵەت دراوە بە ئێوە كاتێ بەردبارانی جەمرەكانتان كرد ئیحرام بشكێنن لە هەموو ئەو شتانەی ئیحرامتان بۆی پۆشیوە جگە لە چوونتان بۆ لای ئافرەتان، جا ئەگەر ئێوارەتان كردەوە پێش ئەوەی تەوافی بەیت بكەن (لە ڕۆژی جەژن) ئەوە وەكوو ئەو كاتەتان لێ دێت كە لە ئیحرامدا بوون پێش ئەوەی بەردبارانی جەمرە بكەن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْفِطْرِ وَيَوْمِ النَّحْرِ

**٢٩٥٩-** عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ هَذَيْنِ الْيَوْمَيْنِ، وَأَمَّا يَوْمُ الْفِطْرِ فَفِطْرُكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَأَمَّا يَوْمُ الْأَضْحَى، فَتَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ[١].

**باسی قەدەغەكردن لە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان**

واتە: ئەبو عوبەید دەڵێ: لەگەڵ عومەری كوڕی خەتاب ﷺ ئامادەی جەژن بووم، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە لە ڕۆژووگرتنی ئەم دوو ڕۆژە، جا ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بەهۆی بەڕۆژووبوونتانەوەیە (لەو مانگەدا)، وە ڕۆژی جەژنی قوربانیش، تیایدا لە قوربانییەكانتان دەخۆن.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ صِيَامِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ بِدِلَالَةٍ لَا بِتَصْرِيحٍ

**٢٩٦٠-** عَنْ بِشْرِ بْنِ سُحَيْمٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يُنَادِيَ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ، لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ، وَإِنَّهَا أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان بەمانا نەک بەڕوونی و ڕاشکاوی

واتە: بیشری کوڕی سوحەیم ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد لە ڕۆژەکانی جەژنی قوربان بانگەواز بکات بەنێو خەڵکدا، هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە نەفسێکی بڕوادار نەبێت، وە ئەو ڕۆژانەیش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ صَوْمِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ بِتَصْرِيحٍ لَا بِكِنَايَةٍ وَلَا بِدِلَالَةٍ مِنْ غَيْرِ تَصْرِيحٍ

**٢٩٦١-** عَنْ أَبِي مُرَّةَ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ عَلَى أَبِيهِ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، فَإِذَا هُوَ يَتَغَذَّى فَدَعَانَا إِلَى الطَّعَامِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ هَذِهِ الْأَيَّامَ الَّتِي نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَوْمِهِنَّ وَأَمَرَ بِفِطْرِهِنَّ، فَأَمَرَهُمْ فَأَفْطَرُوا أَحَدُهُمَا يَزِيدُ عَلَى الْآخَرِ[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان بەڕوون و ئاشکرا نەک بەپێچوپەنا، یان بە بەڵگەیەکی ناڕوون

واتە: ئەبو موڕەی مەولای عەقیلی کوڕی ئەبو تالیب دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ چووین بۆ لای باوکی لە سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان، بینیمان ئەو نانی دەخوارد، فەرمووی لێ کردین نان بخۆین، عەبدوڵای کوڕی عەمر وتی: من بەڕۆژووم، عەمر پێی وت: ئەی نەتزانیوە ئەم ڕۆژانە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە ڕۆژوویان تێدا بگیرێ و فەرمانی کردووە نانیان تێدا بخورێ، دواتر فەرمانی پێ کردن ئەوانیش ڕۆژووەکەیان شکاند و نانیان خوارد یەکێکیان لەوی دیکە زیاتری دەخوارد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ سُنَّةِ الصَّلَاةِ بِمِنًى لِلْحَاجِّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِ مَكَّةَ وَغَيْرِ مَنْ قَدْ أَقَامَ بِمَكَّةَ إِقَامَةً يَجِبُ عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ بِذِكْرِ خَبَرٍ غَلَطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهِ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِمَّنْ زَعَمَ أَنَّ سُنَّةَ الصَّلَاةِ بِمِنًى لِأَهْلِ الْآفَاقِ وَأَهْلِ مَكَّةَ جَمِيعًا رَكْعَتَيْنِ كَصَلَاةِ الْمُسَافِرِ سَوَاءً

**٢٩٦٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: صَلَّى عُثْمَانُ بِمِنًى أَرْبَعًا، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ وَمَعَ عُمَرَ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ تَفَرَّقَتْ بِكُمُ الطُّرُقَ، فَوَدِدْتُ أَنَّ لِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَيْنِ مُتَقَبَّلَتَيْنِ هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ سَلْمِ بْنِ جُنَادَةَ[١].

## باسی سوننەتی نوێژ لە مینا بۆ ئەو حاجییانەی خەڵکی مەککە نین، هەروەها ئەوانەش لە مەککە نیشتەجێ بوون بەجۆرێ پێویستە لەسەریان نوێژ بەتەواوی بکەن (بەبێ کورتکردنەوە)، بە باسکردنی فەرموودەیەك هەندێ لە زانایان بەهەڵە بەڵگەیان لێ وەرگرتووە لەوانەی کە پێیان وایە سوننەتی نوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ لە مینا بۆ خەڵکی دەرەوەی مەککە و خەڵکی مەککە دوو ڕکاتە وەکوو نوێژی گەشتیار وایە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێ: عوسمان چوار ڕکات نوێژی کرد لە مینا، عەبدوڵا ﷺ وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژم کرد، لەگەڵ ئەبو بەکریش دوو ڕکات، لەگەڵ عومەریش دوو ڕکات دواتر ڕێچکەکان جیاوازییان خستە نێوانتان، خۆزگە پشکی من لە چوار ڕکات دوو ڕکاتی قەبوڵکرا و بووایە.

**٢٩٦٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ وَعُثْمَانُ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر دوو ڕکات نوێژیان کرد لە مینا، هەروەها عوسمانیش لە سەرەتای دەسەڵاتەکەیدا دوو ڕکاتی کرد، (دواتر بەتەواوی کردی بە چوار ڕکات).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا صَلَّى بِهَا رَكْعَتَيْنِ؛ لِأَنَّهُ كَانَ مُسَافِرًا غَيْرَ مُقِيمٍ، إِذْ هُوَ ﷺ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، وَإِنَّمَا قَدِمَ مَكَّةَ حَاجًّا لَمْ يُقِمْ بِهَا إِقَامَةً يَجِبُ عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَزَلْ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعَ.**

**٢٩٦٤-** وَخَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، فَصَرَّحَ أَنَّ فَرْضَ الصَّلَاةِ بِمِنًى عَلَى الْمُقِيمِ أَرْبَعٌ، كَهُوَ عَلَى غَيْرِ مَنْ هُوَ مِمَّا سِوَاهُ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە دوو ڕکاتی لە مینا کرد، چونکە گەشتیار بوو نەك نیشتەجێ، هەروەها ئەو ﷺ خەڵکی مەدینە بوو، تەنها بەنییەتی حەج هات بۆ مەککە، ئەوەندە نەمایەوە تیایدا وەکوو کەسێکی نیشتەجێ نوێژی لەسەر واجب بێت، ئەبو بەکر دەڵێ: فەموودەکەی یەحیای کوڕی ئیسحاق لە ئەنەسەوە: (أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَزَلْ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعَ)، واتە: پێغەمبەر ﷺ بەردەوام دوو ڕکات نوێژی دەکرد (لە مەککە) تا گەڕایەوە**

واتە: وە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس رضي الله عنهما هاتووە: خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ نوێژی فەرز کرد لە شوێنی نیشتەجێبوون چوار ڕکات، لە گەشتیش دوو ڕکات. بەڕاشکاوی ڕایگەیاند نوێژی فەرز لە مینا لەسەر نیشتەجێ چوار ڕکاتە، لەسەر گەشتیاریش دوو ڕکاتە.

**٢٩٦٥-** وَخَبَرُ عَائِشَةَ رضي الله عنها فُرِضَتِ الصَّلَاةُ أَوَّلَ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ زِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضَرِ، مُصَرِّحٌ أَنَّ الْحَاضِرَ بِمِنًى عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ لَيْسَ لَهُ قَصْرُ الصَّلَاةِ إِذَا كَانَ حَاضِرًا لَا مُسَافِرًا[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَقَدْ كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ الصَّلَاةِ مَعْنَى خَبَرِ يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ عَنْ أَنَسٍ، وَفِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَعَائِشَةَ دَلَالَةٌ بَيِّنَةٌ عَلَى أَنَّ الْوَاجِبَ عَلَى أَهْلِ مَكَّةَ وَمَنْ أَقَامَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَهْلِهَا أَنَّهُ يَجِبُ عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ بِمِنًى إِذْ هُوَ مُقِيمٌ لَا مُسَافِرٌ؛ لِأَنَّ فَرْضَ الْمُقِيمِ أَرْبَعٌ، فَلَا يَجُوزُ لِغَيْرِ الْمُسَافِرِ وَلِغَيْرِ الْخَائِفِ فِي الْقِتَالِ قَصْرُ الصَّلَاةِ، وَأَهْلِ مَكَّةَ، وَمَنْ قَدْ أَقَامَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَهْلِهَا إِقَامَةً

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

يَجِبُ عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ إِذَا خَرَجُوا إِلَى مِنًى نَاوِينَ الرُّجُوعَ إِلَى مَكَّةَ غَيْرَ مُسَافِرِينَ فَغَيْرُ جَائِزٍ لَهُمْ قَصْرُ الصَّلَاةِ بِمِنًى.

**واتە: وە فەرموودەکەی عائیشە ﵂ یەکەم جار کە نوێژ فەرز کرا دوو ڕکات بوو، پاشان لە شوێنی نیشتەجێبوون زیاد کرا (بوو بە چوار ڕکات)، بەڕاشکاوی ڕوونی کردۆتەوە ئەو کەسەی لە مینا نیشتەجێیە پێویستە لەسەری نوێژەکەی بەتەواوی بکات، بۆی نییە کورتی بکاتەوە ئەگەر نیشتەجێ بوو نەك گەشتیار.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی نوێژ مانای فەرموودەکەی یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاقم لە ئەنەسەوە ڕوون کردەوە، وە لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس و عائیشە بەڵگەی ڕوونی تێدایە ئەوەی واجبە لەسەر خەڵکی مەککە و ئەوەیشی تیایدا نیشتەجێیە لە غەیری خەڵکەکەی ئەوە واجبە لەسەری نوێژەکەی بەتەواوی لە مینا ئەنجام بدات، چونکە ئەو نیشتەجێیە نەك گەشتیار، لەبەر ئەوەی نوێژی فەرز لەسەر نیشتەجێ چوار ڕکاتە، جا کورتکردنەوەی نوێژ دروست نییە بۆ جگە لە گەشتیار و جگە لەو کەسەی لە کاتی جەنگ و جیهاد مەترسی لەسەرە، وە خەڵکی مەککە و ئەوانەیشی تیایدا نیشتەجێن لە غەیری خەڵکی مەککە پێویستە لەسەریان نوێژەکەیان بەتەواوی بکەن، وە ئەگەر دەرچوون بۆ مینا بەنییەتی گەڕانەوە بۆ مەککە بەبێ گەشتکردن ئەوە دروست نییە بۆیان نوێژەکەیان کورت بکەنەوە لە مینا.**

## بَابُ فَضْلِ يَوْمِ الْقَرِّ وَهُوَ أَوَّلُ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

**٢٩٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُرْطٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْظَمُ الْأَيَّامِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمُ النَّحْرِ، ثُمَّ يَوْمُ الْقَرِّ»[1].

## باسی فەزڵ و گەورەیی دووەم ڕۆژی جەژنی قوربان کە دەکاتە یەکەم ڕۆژ لە ڕۆژەکانی تەشریق

واتە: عەبدوڵای کوڕی قوڕت ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەترینی ڕۆژەکان لەلای خوا ڕۆژی جەژنی قوربانە، پاشان دووەم ڕۆژ لە جەژنی قوربان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ بَدْءِ رَمْيِ النَّبِيِّ ﷺ الْجِمَارَ، وَالْعِلَّةِ الَّتِي رَمَاهَا بَدْءًا قَبْلَ عَوْدٍ

**٢٩٦٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَاءَ جِبْرِيلُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَهَبَ بِهِ لِيُرِيَهُ الْمَنَاسِكَ، فَانْفَرَجَ لَهُ ثَبِيرٌ فَدَخَلَ مِنًى فَأَرَاهُ الْجِمَارَ، ثُمَّ أَرَاهُ عَرَفَاتٍ، فَنَبَغَ الشَّيْطَانُ لِلنَبِيِّ ﷺ عِنْدَ الْجَمْرَةِ فَرَمَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ حَتَّى سَاخَ، ثُمَّ نَبَغ لَهُ فِي الْجَمْرَةِ الثَّانِيَةِ فَرَمَاهُ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ حَتَّى سَاخَ، ثُمَّ نَبَغ لَهُ فِي جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ، فَرَمَاهُ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ حَتَّى سَاخَ فَذَهَبَ[١].

## باسی دەستپێکردنی پێغەمبەر ﷺ بە بەردبارانکردنی جەمرەکان، وە هۆکاری بەردبارانکردنی لە سەرەتاوە پێش کۆتایی

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: جبریل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوەی ڕێوڕەسمەکانی حەجی پێ نیشان بدات، کێوی ثەبیری بۆ تەخت بوو، دواتر چووە مینا جەمرەکانی پێی نیشان دا، پاشان عەرەفاتی پێی نیشان دا، شەیتان لەلای جەمرە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت، ئەویش بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد، تا ڕۆچوو بەنێو زەویدا، پاشان لە جەمرەی دووەم بۆی دەرکەوت، ئەویش بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد، تا ڕۆچوو بەنێو زەویدا، پاشان لە جەمرەی سێیەم دەرکەوت، ئەویش بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد، تا ڕۆچوو بەنێو زەویدا و دواتر ڕۆیشت.

## بَابُ وَقْتِ رَمْيِ الْجِمَارِ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ

**٢٩٦٨-** عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَرْمِي يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدَ ذَلِكَ فَبَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ[٢].

---

(١) في إسناده مقال، فإن عطاء بن السائب كان قد اختلط والراوي عنه أبو حمزة السكري محمد بن ميمون لم يذكر فيمن سمع منه قبل الاختلاط، ويغلب على الظن أنه سمعه منه بعد الاختلاط، لأن روايته عنه خارج الكتب الستة وبه أعله الهيثمي.

(٢) صحيح.

## باسی کاتی بەردبارانکردنی جەمرەکان لە ڕۆژەکانی تەشریق

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئەبو زوبەیر هەواڵی پێ دام، کە ئەو گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵا بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەر ﷺ لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان لە کاتی چێشتەنگاو بەردبارانی جەمرەی دەکرد، بەڵام دوای ئەو ڕۆژە (لە ڕۆژەکانی تەشریقدا واتە: ڕۆژی دووەم و سێیەم و چوارەم) کاتێ بەردبارانی جەمرەی دەکرد خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازابوو.

**٢٩٦٩-** عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ لَا أَرْمِي حَتَّى تُرْفَعَ الشَّمْسُ أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْمِي يَوْمَ النَّحْرِ قَبْلَ الزَّوَالِ، فَأَمَّا بَعْدَ ذَلِكَ فَعِنْدَ الزَّوَالِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ إِنْ كَانَ ابْنُ خُوَارٍ حَفِظَ عَطَاءً مِنْ هَذَا الْإِسْنَادِ[1].

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: بەردبارانی جەمرە ناکەم تا خۆر بەرز دەبێتەوە، جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان پێش ترازانی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان (لە کاتی چێشتەنگاو) بەردبارانی جەمرەی دەکرد، بەڵام دوای ئەو ڕۆژە (لە ڕۆژەکانی تەشریقدا واتە: ڕۆژی دووەم و سێیەم و چوارەم) کاتێ بەردبارانی جەمرەی دەکرد خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازابوو.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ رَمْيَ الْجِمَارِ إِنَّمَا أَرَادَ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ لَا لِلرَّمْيِ فَقَطْ

**٢٩٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِنَّمَا جُعِلَ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَرَمْيُ الْجِمَارِ لِإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ»[2].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی بەردبارانکردنی جەمرەکان تەنها بۆ بەجێهێنانی زیکری خوا دانراون نەك تەنها بۆ بەردهاویشتن

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەوافکردنی دەوری بەیت و نێوان صەفا و مەڕوە و بەردبارانکردنی جەمرەکان، تەنها بۆ بەجێهێنانی زیکر و یادی خوا دانراون.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ التَّكْبِيرِ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ يَرْمِي بِهَا رَامِي الْجِمَارِ وَالْوُقُوفِ عِنْدَ الْجَمْرَةِ الْأُولَى وَالثَّانِيَةِ مَعَ تَطْوِيلِ الْقِيَامِ وَالتَّضَرُّعِ، وَتَرْكِ الْوُقُوفِ عِنْدَ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ بَعْدَ رَمْيِهَا أَيَّامَ مِنًى

**٢٩٧١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ حِينَ صَلَّى صَلَاةَ الظُّهْرِ، ثُمَّ رَجَعَ فَمَكَثَ بِمِنًى لَيَالِيَ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ يَرْمِي الْجَمْرَةَ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، كُلُّ جَمْرَةٍ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ وَيَقِفُ عِنْدَ الْأُولَى وَعِنْدَ الثَّانِيَةِ فَيُطِيلُ الْقِيَامَ وَيَتَضَرَّعُ ثُمَّ يَرْمِي الثَّالِثَةَ وَلَا يَقِفُ عِنْدَهَا[1].

## باسی تەکبیر (الله أکبر) کردن لەگەڵ هاویشتنی هەر بەردێك کە بۆ بەردبارانی جەمرەی یەکەم و دووەم دەهاوێژرێ، لەگەڵ ئەوەدا ئەندازەیەکی زۆر دەوەستێ بۆ پاڕانەوە، بەڵام دوای بەردبارانکردنی جەمرەی عەقەبە بەهیچ شێوەیەك ناوەستێ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی زیارەتی کرد لە کۆتا ڕۆژیدا، (واتە: یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان) کاتێ نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان گەڕایەوە، دواتر لە مینا مایەوە لە شەوەکانی (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ)دا، لەوێ بەردبارانی جەمرەی دەکرد کاتێ کە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا، هەر جەمرەیەك بە حەوت بەرد بەردبارانی کرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیرێکی دەکرد، وە لە کاتی جەمرەی یەکەم و دووەمدا ئەندازەیەکی زۆر دەوەستا، زیکر و یادی خوای زۆر تێدا دەکرد و دەپاڕایەوە، پاشان لە جەمرەی سێیەم بەردبارانی کرد و لەلای نەوەستا.

## بَابُ الْوُقُوفِ عِنْدَ الْجَمْرَةِ الْأُولَى وَالثَّانِيَةِ بَعْدَ رَمْيِهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوُقُوفَ بَعْدَ رَمْيِ الْأُولَى مِنْهَا أَمَامَهَا لَا خَلْفَهَا، وَلَا عَنْ يَمِينِهَا، وَلَا عَنْ شِمَالِهَا، وَالْوُقُوفِ عِنْدَ الثَّانِيَةِ ذَاتَ الْيَسَارِ مِمَّا يَلِي الْوَادِيَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ فِي الْوَقْفَيْنِ جَمِيعًا، وَرَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الْوَقْفَيْنِ جَمِيعًا

**٢٩٧٢-** عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا رَمَى الْجَمْرَةَ الَّتِي تَلِي مَسْجِدَ مِنًى يَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ فَيُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ تَقَدَّمَ أَمَامَهَا، فَوَقَفَ مُسْتَقْبِلُ الْبَيْتَ رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو وَكَانَ

---

(١) إسناده حسن.

يُطِيلُ الْوُقُوفَ، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْحَدِرُ ذَاتَ الْيَسَارِ مِمَّا يَلِي الْوَادِيَ فَيَقِفُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو، ثُمَّ يَأْتِي الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الْعَقَبَةِ فَيَرْمِيهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، وَلَا يَقِفُ عِنْدَهَا قَالَ الزُّهْرِيُّ: سَمِعْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يُحَدِّثُ بِمِثْلِ هَذَا عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ[1].

## باسی وەستان لەلای جەمرەی یەکەم و دووەم دوای بەردبارانکردنی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی دوای بەردبارانکردنی یەکەم لەپێشی دەوەستێ نەک لەپشت، یان لەلای ڕاستی، یان لای چەپی، هەروەها لە جەمرەی دووەم لەلای چەپی دەوەستێ لە نزیک دۆڵەکە، لە هەردوو وەستانەکەدا ڕووبەڕووی قیبلە دەوەستێ و دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ پاڕانەوە

واتە: زوهری دەگێڕێتەوە، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بەردبارانی جەمرەی بکردایە کە لەلای مزگەوتی مینا بوو بەردبارانی دەکرد بە حەوت بەرد، هەر بەردێکی بوەشاندایە تەکبیرێکی دەکرد، پاشان دەچووە پێشەوە دەوەستا، ڕووبەڕووی قیبلە و دەستەکانی بەرز کردبۆیەوە و دەپاڕایەوە ئەندازەیەکی زۆر دەوەستا، پاشان دەهات بۆ جەمرەی دووەم بە حەوت بەرد بەردبارانی دەکرد، هەر بەردێکی بوەشاندایە تەکبیرێکی دەکرد، پاشان بە لای چەپدا بۆ لای دۆڵەکە لای دەدا، دواتر دەوەستا ڕووبەڕووی بەیت، دەستەکانی بەرز کردبۆیەوە و دەپاڕایەوە، پاشان دەهات بۆ ئەو جەمرەی کە لای عەقەبەیە، حەوت جار بەردبارانی دەکرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا تەکبیرێکی دەکرد، پاشان دەڕۆیشت و لەلای نەدەوەستا، زوهری دەڵێ: گوێم لە سالمی کوڕی عەبدوڵا بوو، هاوشێوەی ئەمەی لە باوکیەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ باس کرد، وە ئیبنو عومەریش ئەنجامی دەدا.

## بَابُ خُطْبَةِ الْإِمَامِ أَوْسَطَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

**٢٩٧٣-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حِصْنٍ، حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي سَرَّاءُ بِنْتُ نَبْهَانَ وَكَانَتْ رَبَّةَ بَيْتٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَالَتْ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الرُّءُوسِ فَقَالَ: «أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟» قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: «أَلَيْسَ الْمَشْعَرُ الْحَرَامِ؟» قُلْنَا: بَلَى قَالَ: «فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟» قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ:

---

(١) صحيح.

«أَلَيْسَ أَوْسَطُ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ؟» قُلْنَا: بَلَى قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، فَلْيُبَلِّغْ أَدْنَاكُمْ أَقْصَاكُمْ، اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟»[1].

## باسی وتاردانی پێشەوا لە دووەم ڕۆژی ڕۆژەکانی تەشریقدا

واتە: ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حیصن دەگێڕێتەوە، داپیرەم بۆی باس کردم سەڕائی کچی نەبهان، جا ئەو لە سەردەمی نەفامیدا کەیبانووی ماڵ بوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی (الرُّؤُوسِ) وتاری بۆ داین، فەرمووی: ئەمە چ شارێکە؟ وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئایا (الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ) نییە (کێوێکە لە موزدەلیفە)؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئایا دووەم ڕۆژی ڕۆژەکانی تەشریق نییە؟ وتمان: بەڵێ، فەرمووی: لە ڕاستیدا خوێنتان، ناموستان، سامانتان لەسەر یەکدی حەرامە، وەکوو حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا، لەم شارەتاندا، با ئەوەی لێرەیە و ئامادەیە هەواڵ بدات بەوەی لێرە نییە، خودایە ئایا پەیام و بەرنامەی تۆم ڕاگەیاند، خودایە ئایا پەیام و بەرنامەی تۆم ڕاگەیاند، خودایە ئایا پەیام و بەرنامەی تۆم ڕاگەیاند؟

## بَابُ ذِكْرِ تَعْلِيمِ الْإِمَامِ فِي خُطْبَتِهِ يَوْمَ النَّفْرِ الْأَوَّلِ كَيْفَ يَنْفِرُونَ، وَكَيْفَ يَرْمُونَ، وَتَعْلِيمِهِمْ بَاقِي مَنَاسِكِهِمْ

**٢٩٧٤**- عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ رَجَعَ مِنْ عُمْرَةِ الْجِعْرَانَةِ بَعَثَ أَبَا بَكْرٍ عَلَى الْحَجِّ، فَأَقْبَلْنَا مَعَهُ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْعَرْجِ ثَوَّبَ بِالصُّبْحِ، فَلَمَّا اسْتَوَى لِيُكَبِّرَ سَمِعَ الرَّغْوَةَ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَوَقَفَ عَنِ التَّكْبِيرِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّفْرِ الْأَوَّلِ قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَخَطَبَ النَّاسَ فَحَدَّثَهُمْ كَيْفَ يَنْفِرُونَ، وَكَيْفَ يَرْمُونَ فَعَلَّمَهُمْ مَنَاسِكَهُمْ، فَلَمَّا فَرَغَ قَامَ عَلِيٌّ فَقَرَأَ بَرَاءَةَ عَلَى النَّاسِ حَتَّى خَتَمَهَا[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

### باسی پێشەوا لە وتارەکەیدا خەڵك فێر دەکات دەربارەی ڕۆژی (النَّفْر)ی یەکەم (کە ڕۆژی سێیەمی ڕۆژەکانی تەشریقە)، وە چۆنییەتی چوون بۆ موزدەلیفە و چۆنییەتی ڕەجمکردن و دروشمەکانیان فێر دەکات

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ گەڕایەوە لە عومرەی جیعڕانە ئەبو بەکری نارد بۆ حەج، ئێمەش لەگەڵی ڕۆیشتین، تا گەیشتە (الْعَرْجِ) قامەتی نوێژی بەیانی کرد، کاتێ ڕاست بۆیەوە بۆ ئەوەی تەکبیر (الله أكبر)ی نوێژ دابەستێت، گوێبیستی دەنگێك بوو لە پشتیەوە، وەستا لەسەر تەکبیرەکەی، دواتر بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد، وتی: کاتێ کە ڕۆژی (النَّفْر)ی یەکەم هات ( کە ڕۆژی سێیەمی ڕۆژەکانی تەشریقە) ئەبو بەکر ﷺ هەستا وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و پێی ڕاگەیاندن چۆن (النَّفْر) دەکەن، واتە: وە چۆن شەیتان ڕەجم دەکەن، فێری ڕێوڕەسمەکانیانی کردن، کاتێ تەواو بوو، عەلی هەستا سورەتی (بَرَاءَة)ەی خوێند بەسەر خەڵکەکەدا تا تەواوی کرد.

### بَابُ الرُّخْصَةِ لِلرِّعَاءِ فِي رَمْيِ الْجِمَارِ بِاللَّيْلِ

**٢٩٧٥-** عَنْ أَبِي بَدَّاحٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ لِلرِّعَاءِ أَنْ يَرْمُوا بِاللَّيْلِ وَأَنْ يَجْمَعُوا الرَّمْيَ[١].

### باسی مۆڵەت دراوە بە شوانەکان بە شەو بەردبارانی جەمرەکان بکەن

واتە: ئەبو بەداح دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە شوانەکان، بە شەو بەردبارانی جەمرەکان بکەن، وە بەردبارانکردنەکان کۆ بکەنەوە. (بەردبارانکردنی دوو ڕۆژ بە شەوێك بکەن).

### بَابُ الرُّخْصَةِ لِلرُّعَاةِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا وَيَدَعُوا يَوْمًا

**٢٩٧٦-** عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لِلرُّعَاةِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا وَيَدَعُوا يَوْمًا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەت دراوە بە شوانەکان ڕۆژێك بەردبارانی جەمرەکان بکەن و ڕۆژەکەیدیکەش بەردباران نەکەن

واتە: ئەبو بەداحی کوڕی عەدی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە شوانەکان ڕۆژێك بەردباران بکەن و ڕۆژێکیش بەردباران نەکەن. (خەریکی شوانی ئاژەڵەکانیان بن).

**٢٩٧٧-** عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، بِمِثْلِ هَذَا الْحَدِيثِ[١].

واتە: ئەبو بەداح دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، بەهەمان شێوەی ئەو فەرموودە.

**٢٩٧٨-** عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَدِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ لِلرُّعَاةِ أَنْ يَرْمُوا الْجِمَارَ يَوْمًا وَيَرْعَوْا يَوْمًا[٢].

واتە: ئەبو بەداحی کوڕی عەدی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە شوانەکان ڕۆژێك بەردبارانی جەمرەکان بکەن و ڕۆژێکیش شوانی بکەن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا رَخَّصَ لِلرِّعَاءِ فِي تَرْكِ رَمْيِ الْجِمَارِ يَوْمًا وَيَرْعَوا يَوْمًا فِي يَوْمَيْنِ مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، الْيَوْمِ الْأَوَّلِ يَرْعَوا فِيهِ، وَيَرْمُوا يَوْمَ الثَّانِي، ثُمَّ يَرْمُوا يَوْمَ النَّفْرِ، لَا أَنَّهُ رَخَّصَ لَهُمْ فِي تَرْكِ رَمْيِ الْجِمَارِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَلَا يَوْمَ النَّفْرِ الْآخَرِ، وَإِنَّهُمْ إِنَّمَا يَجْمَعُونَ بَيْنَ رَمْيِ أَوَّلِ يَوْمٍ مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ وَالْيَوْمِ الثَّانِي فَيَرْمُونَهَا فِي أَحَدِ الْيَوْمَيْنِ، إِمَّا يَوْمُ الْأَوَّلِ وَإِمَّا يَوْمُ الثَّانِي مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

**٢٩٧٩-** عَنِ ابْنِ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ، أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ لِرُعَاةِ الْإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ يَرْمُونَ الْغَدَ أَوْ مِنْ بَعْدِ الْغَدِ لِيَوْمَيْنِ، ثُمَّ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّفَرَةِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە شوانەكان لەوەی یەكەم ڕۆژ لە ڕۆژەكانی تەشریق بەردبارانی جەمرە نەكەن، بەڵكوو لە دووەم ڕۆژدا بەردبارانی یەكەم و دووەم ڕۆژ بكەن (واتە: بەردبارانی گەورە و نێوەند)، ڕۆژی یەكەمی ڕۆژەكانی تەشریق شوانی بكەن (هەروەها ئاژەڵەكانیان بفرۆشن بەوانەی دەیكڕن و دەیكەن بە قوربانی)، لە ڕۆژی دووەمیشدا بەردبارانی جەمرە بكەن، پاشان ڕۆژی سێیەمی كە كۆتا ڕۆژە بەردبارانی كۆتایی بكەن، نەك بەو مانایەی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێ دابێتن لە ڕۆژی جەژن و كۆتا ڕۆژی تەشریق بەردبارانی جەمرەكان نەكەن، بەڵكوو ئەوان بەردبارانی جەمرەی یەكەم ڕۆژ لە ڕۆژەكانی تەشریق و دووەم ڕۆژ پێكەوە كۆ دەكەنەوە لە یەكێك لەو دوو ڕۆژە، پاشان لە كۆتا ڕۆژیشدا لە ڕۆژەكانی تەشریق بەردباران بكەن**

واتە: عاصمی كوڕی عەدی دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە شوانی وشترەكان لە شەوی جەژنی قورباندا نەمێننەوە (لە مینا)، لە ڕۆژی یەكەمی جەژن بەردبارانی جەمرەی عەقەبە بكەن، پاشان بەردبارانكردنی هەردوو ڕۆژەكەی دوای ڕۆژی (جەژنی) قوربان كۆ بكەنەوە لە یەكێك لەو دوو ڕۆژە، پاشان لە ڕۆژی سێیەمی ڕۆژەكانی تەشریق (كە ڕۆژی سیازدەی (ذِي الْحِجَّةِ) دەكات) بەردباران بكەن.

## بَابُ وَقْتِ النَّفْرِ مِنْ مِنًى آخِرَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

**٢٩٨٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَرَقَدَ رَقْدَةً بِالْمُحَصَّبِ ثُمَّ رَكِبَ إِلَى الْبَيْتِ، فَطَافَ بِهِ[١].

## باسی كاتی گەڕانەوە لە میناوە بۆ بەیت لە كۆتا ڕۆژەكانی تەشریق

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشای كرد، وە لە (الْمُحَصَّب) (كە شوێنێكە لە نێوان مەككە و مینا،

---

(١) صحیح.

لە میناوە نزیکترە) سەرخەوی شکاند، پاشان سوار بوو ڕۆیشت بۆ بەیت (لەوێ تەوافی خواحافیزی (الوداع) کرد).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ النُّزُولِ بِالْمُحَصَّبِ اسْتِنَانًا بِالنَّبِيِّ ﷺ

**٢٩٨١-** عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ بِمِنًى: «نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا الْخَيْفَ بَنِي كِنَانَةَ». قَالَ لَنَا بُنْدَارٌ حِينَ تَقَاسَمُوا: وَإِنَّمَا هُوَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ، وَذَلِكَ أَنَّ قُرَيْشًا وَكِنَانَةَ تَحَالَفُوا عَلَى بَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطَّلِبِ أَنْ لَا يُنَاكِحُوهُمْ، وَلَا يُبَايِعُوهُمْ حَتَّى يُسَلِّمُوا إِلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَعْنِي بِذَلِكَ الْمُحَصَّبَ[1].

## باسی چاکتر وایە بۆ بەندە دابەزێتە (الْمُحَصَّب) وەکو شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئێمە لە مینا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ پێمانی فەرموو: سبەینی سەرلەبەیانی ئێمە دادەبەزینە (الْخَيْفَ) شیوی نەوەکانی کینانە، (مەبەستی پێی (الْمُحَصَّب) بوو)، بوندار (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) پێمانی وت: کاتێ سوێندیان خوارد لەسەر کوفر، قورەیش و کینانە سوێندیان خوارد لەسەر ئەوەی بەهیچ جۆرێ ژن و ژنخوازی و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ نەوەکانی هاشم و نەوەکانی موتەلیب نەکەن تا لەو شوێنە کە (الْمُحَصَّب)ە پێغەمبەری خوایان ﷺ ڕادەست دەکەن.

**٢٩٨٢-** ثَنَا يُونُسُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى وَبَحْرُ بْنُ نَصْرٍ، قَالَا: ثَنَا بِشْرُ بْنُ بُكَيْرٍ، ثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ؛ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: بِمِثْلِهِ. ثَنَا الرَّبِيعُ، ثَنَا بِشْرُ بْنُ بَكْرٍ، أَخْبَرَنِي الْأَوْزَاعِيُّ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ: بِمِثْلِهِ، غَيْرَ أَنَّهُمْ قَالُوا: أَنْ لَا تُنَاكِحُوهُمْ، وَلَا يَكُونَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُمْ شَيْءٌ حَتَّى يُسْلِمُوا إِلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ الرَّبِيعُ وَيُونُسُ: حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ. وَقَالَ بَحْرٌ: حِينَ أَقْسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ[2].

واتە: یونسی کوڕی عەبدو لئەعلا و موحەممەدی کوڕی نەصر وتیان: بیشری کوڕی بوکەیر بۆی باس کردین، ئەوزاعی بۆی باس کردین، ئیبنو شیهاب بۆی باس کردم، لە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەبو سەلەمەوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشووی فەرموو، ڕەبیع بۆی باس کردین، بیشری کوڕی بیکر بۆی باس کردین، ئەوزاعی بۆی باس کردم، لە ئیبنو شیهابەوە بەهەمان شێوە، ئەوە نەبێت ئەوان وتیان: ژن و ژنخوازییان لەگەڵ مەکەن، وە لە نێوان ئەوان و ئەواندا هیچ شتێك نەبێت تا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕادەست دەکەن، ڕەبیع و یونس وتیان: کاتێ سوێندیان خوارد لەسەر بێباوەڕی، بەحریش وتی: کاتێ سوێندیان خوارد لەسەر بێباوەڕی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ كَانَ أَعْلَمَهُمْ وَهُوَ بِمِنًى أَنْ يَنْزِلَ بِالْأَبْطَحِ

**٢٩٨٣-** وَأَنَّ أَبَا رَافِعٍ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: أَنَا ضَرَبْتُ قُبَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يَأْمُرْنِي، فَجَاءَ فَنَزَلَ أَيْ وَلَمْ يَأْمُرْنِي بِضَرْبِ الْقُبَّةِ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ، لَا أَنَّهُ أَرَادَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَزَلَ الْأَبْطَحَ لِعِلَّةِ ضَرْبِ الْقُبَّةِ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە مینا بوو بە هەمووانی ڕاگەیاند کە دادەبەزێتە ئەبتەح

واتە: ئەبو ڕافیع مەبەستی لە وتەکەی: من دەوارەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ هەڵدا فەرمانیشی پێ نەکردبووم، دواتر هات و دابەزی، واتە: فەرمانی پێ نەکردم لەو شوێنە دەوار هەڵبدەم، مەبەستی ئەوە نەبوو پێغەمبەر ﷺ لەبەر هەڵدانی دەوارەکە دابەزیە ئەبتەح بۆ پشوودان

**٢٩٨٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ «حِينَ أَرَادَ أَنْ يَنْفِرَ مِنْ مِنًى نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ يَعْنِي بِذَلِكَ الْمُحَصَّبَ»، ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ بِمِثْلِ حَدِيثِ يُونُسَ سَوَاءً[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ویستی لە مینا بگەڕێتەوە فەرمووی: بەویستی خوا سبەینی سەرلەبەیانی ئێمە دادەبەزینە (الْخَيْفَ) شیوی نەوەکانی کینانە، کاتێ سوێندیان خوارد لەسەر کوفر، واتە: لە (الْمُحَصَّب) پاشان فەرموودەکەی باس کرد بەهەمان شێوەی سەنەدەکەی یونس.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٩٨٥-** عَنْ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيْنَ تَنْزِلُ غَدًا؟ وَذَلِكَ فِي حَجَّتِهِ قَالَ: «وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مَنْزِلًا؟»، ثُمَّ قَالَ: «نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ قَاسَمَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْكُفْرِ وَذَلِكَ أَنَّ بَنِي كِنَانَةَ حَالَفَتْ قُرَيْشًا عَلَى بَنِي هَاشِمٍ أَنْ لَا يُنَاكِحُوهُمْ، وَلَا يُبَايِعُوهُمْ، وَلَا يُؤْوُوهُمْ». قَالَ مَعْمَرٌ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَالْخَيْفُ الْوَادِيرِ[1].

واتە: مەعمەر دەگێڕێتەوە لە زوهری، لە عەلی کوڕی حوسەین، لە عەمری کوڕی عوسمان، لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سبەینێ سەرلەبەیانی لەکوێ دادەبەزی بۆ پشوودان؟ کاتێ کە لە حەجەکەدا بووی، فەرمووی: ئایا عەقیل شوێنێکی بۆمان هێشتووەتەوە (پشووی تێدا بدەین)؟ پاشان فەرمووی: ئێمە سبەینێ سەرلەبەیانی دادەبەزینە (خَيْف) شیوی نەوەکانی کینانە، لەو شوێنەی کە قوڕەیش سوێندیان لەسەر بێباوەڕی خوارد، جا نەوەکانی کینانە و قوڕەیش هاوپەیمانییان کرد و ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی ژن و ژنخوازی و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ نەوەکانی هاشم نەکەن، هەروەها پەنایان نەدەن، مەعمەر وتی: زوهری وتی: (الْخَيْفُ): شیوە یان دۆڵ.

**٢٩٨٦-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ قَالَ: ضَرَبْتُ قُبَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْأَبْطَحِ، وَلَمْ يَأْمُرْنِي أَنْ أَنْزِلَ الْأَبْطَحَ، فَجَاءَ فَنَزَلَ[2].

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: دەوارەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ لە ئەبتەح هەڵدا، فەرمانی پێ نەکردم دابەزمە ئەبتەح، دواتر هات و دابەزی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَزَلَ بِالْأَبْطَحِ لِيَكُونَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ، وَإِنْ كَانَ قَدْ أَعْلَمَهُمْ وَهُوَ بِمِنًى أَنَّهُ نَازِلٌ بِهِ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ نُزُولَهُ لَيْسَ مِنْ سُنَنِ الْحَجِّ الَّذِي يَكُونُ تَارِكُهُ عَاصِيًا، أَوْ يُوجِبُ تَرْكُ نُزُولِهِ هَدْيًا

**٢٩٨٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: إِنَّمَا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُحَصَّبَ لِيَكُونَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ فَمَنْ شَاءَ نَزَلَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە دابەزیە ئەبتەح تا بۆ دەرچوونی ئاسانتر بێت، ئەگەرچی لە مینا پێیانی ڕاگەیاندبوو ئەو دادەبەزێتە ئەو شوێنە، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی دابەزینی پێغەمبەر ﷺ لەو سوننەتانەی حەج نییە کە ئەنجامنەدەرەکەی بە سەرپێچیکار لەقەڵەم بدرێت، یان ئەنجامنەدانی فیدیەیەك واجب بکات**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوە دابەزیە (الْمُحَصَّب) بەمەبەستی پشوودان، تا بۆ دەرچوونی ئاسانتر بێت، هەر کەس ویستی با دابەزێتە ئەو جێگایە، هەر کەسیش نەیویست با دانەبەزێت.

**٢٩٨٨**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: نُزُولُ الْمُحَصَّبِ لَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ، إِنَّمَا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيَكُونَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهَا لَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ لَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ الَّتِي يَجِبُ عَلَى النَّاسِ الِائْتِمَامُ بِفِعْلِهِ ﷺ إِذْ كُلُّ مَا فَعَلَهُ ﷺ، وَإِنْ كَانَ مِنْ فِعْلِ الْمُبَاحِ فَقَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ السُّنَّةِ أَيْ أَنَّ لِلنَّاسِ الِاسْتِنَانَ بِهِ إِذْ هُوَ مُبَاحٌ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِمْ أَنْ يَفْعَلُوا ذَلِكَ الْفِعْلَ.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: دابەزین بۆ (الْمُحَصَّب) بەمەبەستی پشوودان سوننەت نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە دابەزیە ئەو شوێنە تا بۆ دەرچوونی ئاسانتر بێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی عائیشە: (لَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ)، واتە: سوننەت نییە، لەو سوننەتانە نییە پێویستە لەسەر خەڵك پەیوەست بێ بە کردەوەکەی پێغەمبەر ﷺ، چونکە هەر کردەوەیەك ﷺ ئەنجامی دابێت ئەگەرچی کردەوەکە ڕێگەپێدراویش بێت ئەوە بە سوننەت باس دەکرێ، واتە: خەڵکی دەتوانن پەیڕەوی بکەن چونکە ئەو کردەوەیە ڕێگەپێدراوە، ئەگەرچی پێویست نەبێ لەسەریان بەو کردەوەیە هەستن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاسْمَ قَدْ يُنْفَى عَنِ الشَّيْءِ إِذَا لَمْ يَكُنْ وَاجِبًا، وَإِنْ كَانَ الْفِعْلُ مُبَاحًا

٢٩٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، لَيْسَ الْمُحَصَّبُ بِشَيْءٍ، إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ لَيْسَ الْمُحَصَّبُ بِشَيْءٍ أَرَادَ لَيْسَ بِشَيْءٍ يَجِبُ عَلَى النَّاسِ نُزُولُهُ، فَنَفَى اسْمَ الشَّيْءِ عَنْهُ عَلَى الْمَعْنَى الَّذِي تَرْجَمْتُ الْبَابَ إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ نُزُولَ الْمُحَصَّبِ فِعْلٌ، وَاسْمُ الشَّيْءِ وَاقِعٌ عَلَى الْفِعْلِ، وَإِنْ كَانَ الْفِعْلُ مُبَاحًا وَلَا وَاجِبًا.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار ناوی شتێك نەفی دەكرێ، ئەگەر ئەو شتە واجب نەبێت، ئەگەرچی موباحیش بێت

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، موحەصەب شتێك نییە، بەڵكوو جێگایەكە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دابەزی بەمەبەستی پشوودان.

ئەبو بەكر دەڵێ: وتەكەی ئیبنو عەباس: موحەصەب شتێك نییە، مەبەستی ئەوەیە دابەزین بۆ ئەو شوێنە شتێك نییە لەسەر خەڵك واجب بێت، جا ناوی شتی لە دابەزین بۆ ئەو جێگایە نەفی كردووە لەسەر ئەو مانایەی لە سەرباسەكە هێناومە، چونكە ئەوە شتێكی ڕوونە دابەزین بۆ موحەصەب كردەوەیەكە، ناوی شتیش بۆ كردەوە بەكار دێت، ئەگەرچی كردەوەكە ڕێگەپێدراو بێت و واجب نەبێت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ النُّزُولِ بِالْمُحَصَّبِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ وَاجِبًا إِذِ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ الْمَهْدِيُّونَ الَّذِينَ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْعَضِّ بِالنَّوَاجِذِ عَلَى سُنَّتِهِ وَسُنَّتِهِمْ قَدِ اقْتَدَوْا بِالنَّبِيِّ ﷺ بِالنُّزُولِ بِهِ

٢٩٩٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ يَنْزِلُونَ الْأَبْطَحَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چاکتر وایە بۆ بەندە دابەزێتە موحەصەب بۆ پشوودان، ئەگەرچی واجبیش نەبێت، چونکە جێنشینە ژیر و بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە (ئوممەتەکەی) پابەند بن بە سوننەتی خۆی و سوننەتەکانیان، ئەوان پەیڕەویی پێغەمبەریان ﷺ کردووە بە دابەزین بۆ ئەو شوێنە بەمەبەستی پشوودان**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان دادەبەزینە ئەبطەح.

**٢٩٩١**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ مِثْلَهُ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ بِالْمُحَصَّبِ إِذَا نَزَلَهُ الْمَرْءُ

**٢٩٩٢**- قال أبو بكر: خبر الثوري عن عبد العزيز بن رفيع عَن أَنَسٍ ﵁ مِنْ هَذَا الْبَابِ، قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ[٢].

## باسی چاکتر وایە بۆ بەندە لە موحەصەب نوێژ بکات، ئەگەر دابەزیە ئەوێ بۆ پشوودان،

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی سەوری لە عەبدولعەزیزی کوڕی ڕەفیع، لە ئەنەسەوە ﵁، لەم بەشەیە، پێشتر باسم کرد.

**٢٩٩٣**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ الْبَطْحَاءَ عَشِيَّةَ النَّفَرِ، وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ كَانَا يَفْعَلَانِهِ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ حَتَّى هَلَكَ فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای شەوی گەڕانەوەی لە بەردبارانکردنی جەمرەکان بەمەبەستی پشوودان دابەزیە (الْبَطْحَاءِ) (کە جێگایەکی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) لم نقف عليه.

نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە کە لە نێوان مەککە و مینادایە)، ئەبو بەکر و عومەریش ئەوەیان دەکرد، ئیبنو عومەریش ئەوەی دەکرد تا کۆچی دوایی کرد، نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشای لەوێ کرد.

**٢٩٩٤-** عَنِ ابْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِالْأَبْطَحِ صَلَاةَ الْعَصْرِ رَكْعَتَيْنِ[1].

واتە: ئیبنو ئەبو جوحەیفە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ئەبتەح دوو ڕکات نوێژی عەسری کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَصَرَ الصَّلَاةَ بِالْأَبْطَحِ بَعْدَمَا نَفَرَ مِنْ مِنًى، ضِدُّ قَوْلِ مَنْ يَحْكِي لَنَا عَنْهُ مِنْ أَهْلِ عَصْرِنَا أَنَّ الْحَاجَّ إِذَا قَفَلَ رَاجِعًا إِلَى بَلَدِهِ عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ

**٢٩٩٥-** عَن عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِالْأَبْطَحِ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ لَهُ حَمْرَاءَ قَالَ: فَخَرَجَ بِلَالٌ بِفَضْلِ وَضُوئِهِ فَبَيْنَ نَاضِحٍ وَنَائِلٍ، فَأَذَّنَ بِلَالٌ فَكُنْتُ أَتَتَبَّعُ فَاهُ هَكَذَا وَهَكَذَا يَعْنِي يَمِينًا وَشِمَالًا قَالَ: ثُمَّ رُكِزَتْ لَهُ عَنَزَةٌ فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ لَهُ حَمْرَاءُ أَوْ حُلَّةٌ لَهُ حَمْرَاءُ، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَرِيقِ سَاقَيْهِ فَصَلَّى إِلَى الْعَنَزَةِ الظُّهْرَ أَوِ الْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ تَمُرُّ الْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ وَالْكَلْبُ وَرَاءَهَا لَا يَمْنَعُ ثُمَّ لَمْ يَزَلْ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حَتَّى أَتَى الْمَدِينَةَ[2].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەبتەح نوێژی کورت کردەوە دوای ئەوەی لە مینا گەڕایەوە، دژی وتەی ئەو کەسەی بۆمان باس دەکات لە خەڵکی ئەم سەردەمە: حاجی کاتێ گەڕایەوە بۆ شارەکەی پێویستە لەسەری نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام بدات

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ئەبتەح، لەنێو دەوارێکی سووردا بوو لە چەرم دروستکرابوو، وتی: بیلال هاتە دەرەوە زیادەی ئاوی دەستنوێژەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، تیایاندا بوو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

غەیری خۆی ئاوی دەپڕژاند پیایدا، تیاشیاندا بوو شتێکی لێی دەست کەوتبوو، بیلال بانگی دا منیش تەماشای دەمیم دەکرد، دەمی بەملا و بەولادا دەهێنا و دەبرد، واتە: بەلای ڕاست و چەپدا، وتی: پاشان خەنجەرێکی بۆ چەقێنرا (بۆ سوترە) پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە جوبەیەکی سوور یاخود پۆشاکێکی سووری لەبەردا بوو، وەکوو ئەوەی ئێستا تەماشای سپیایی قاچی بکەم، دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری کرد لەلای خەنجەرەکە، ئافرەت و گوێدرێژ و سەگ بەودیوی سوترەکەدا تێ دەپەڕین و ڕێگری لێ نەدەکردن، پاشان بەردەوام دوو ڕکات نوێژی دەکرد هەتا هاتە مەدینە.

(ڕوونکردنەوە: (الْعَنَزَة): خەنجەرە، یاخود گۆچانێکە بچووکترە لە ڕم، پێم وایە لێرەدا مەبەستی پێی خەنجەرە، خوا زاناترە، هەروەها پێ دەچێ مەبەستی لە (وَرَاءهَا) بەردەمی بێت نەك دواوەی، خوا زاناترە).

**٢٩٩٦-** عَنْ يَحيى بن أبي إسحاق عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، وَكَانَ يُصَلِّي بِنَا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: قُلْتُ لَهُ: هَلْ أَقَمْتَم بِمَكَّةَ شَيْئًا؟ قَالَ: أَقَمْنَا بِهَا عَشْرًا[١].

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە مەدینەوە بۆ مەککە، دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی بۆ دەکردین (واتە: نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و عیشای کورت دەکردەوە بۆ دوو ڕکات) تا هاتینەوە بۆ مەدینە، وتی: وتم: ئایا لە مەککە مانەوە؟ وتی: دە ڕۆژ تیایدا ماینەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْإِدْلَاجِ بِالِارْتِحَالِ مِنَ الْحَصْبَةِ، اقْتِدَاءً بِفِعْلِ الْمُصْطَفَى ﷺ

**٢٩٩٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُدَّلِجًا مِنَ الْأَبْطَحِ وَهُوَ يَصْعَدُ وَأَنَا أَنْزِلُ، أَوْ يَنْزِلُ وَأَنَا أَصْعَدُ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی چاکتر وایە لە کۆتایی شەو لە حەصبەوە بەڕێ بکەوێت، وەکوو شوێنکەوتنی کردەوەی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: (کاتێ لەگەڵ عەبدوڕەحمانی برام لە عومرەکەم گەڕامەوە) گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەو لە ئەبتەحەوە (کە شوێنی پشوودانی بوو) بەڕێ کەوت، ئەو سەر دەکەوت منیش دادەبەزیم، یان ئەو دادەبەزی منیش سەر دەکەوتم.

**٢٩٩٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ وَقَالَ فِي الْخَبَرِ فَأَذِنَ بِالرَّحِيلِ فِي أَصْحَابِهِ يَعْنِي مِنَ الْمُحَصَّبِ فَارْتَحَلَ النَّاسُ فَمَرَّ بِالْبَيْتِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ فَطَافَ بِهِ ثُمَّ خَرَجَ فَرَكِبَ ثُمَّ انْصَرَفَ مُتَوَجِّهًا إِلَى الْمَدِينَةِ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، وە لە فەرموودەکەدا وتی: مۆڵەتی دا هاوەڵەکانی لە موحەصەب دەربچن، خەڵکەکەیش دەرچوون، دواتر بەلای بەیتدا تێپەڕ بوو پێش نوێژی بەیانی، ئینجا تەوافی کرد، پاشان بەڕێ کەوت بۆ مەدینە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِطَوَافِ الْوَدَاعِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٢٩٩٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أُمِرَ النَّاسَ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ[2].

## باسی فەرمانکردن بە تەوافی ماڵئاوایی، بەدەستەواژەیەکی گشتی (عام) مەبەستی پێی تایبەتە (خاص)

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ فەرمان کرا بە خەڵکەکە (واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە خەڵکەکە) دوایەمین مەنزڵیان ماڵی خوا بێت (واتە: تەوافی ماڵئاوایی بێت، بەڵام ئەم تەوافی ماڵئاواییە لەسەر ئافرەتانی بێنوێژ لابراوە، خوا زاناترە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٣٠٠٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ كُلَّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْفِرْ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ»[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە دەڕۆیشتنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با هیچ کەس نەگەڕێتەوە تا دوایەمین مەنزڵی ماڵی خوا بێت (واتە: تاوەکو تەوافی ماڵئاوایی دەکات).

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّفْظَةَ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرَ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ، خَلَا الْحَائِضَ، بِذِكْرِ لَفْظَةٍ عَامٌّ مُرَادُهَا خَاصٌّ فِي ذِكْرِ الْحَيْضِ

**٣٠٠١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: مَنْ حَجَّ فَلْيَكُنْ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ إِلَّا الْحُيَّضَ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ لَهُنَّ[2].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو دەستەواژەی کە لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباسدا هاتووە دەستەواژەیەکی گشتییە (عَام) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاص)، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرَ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ، خَلَا الْحَائِضَ)، واتە: با هیچ کەس نەگەڕێتەوە تا دوایەمین مەنزڵی (تەوافی) ماڵی خوا بێت. جگە لە ئافرەتی حەیزدارە، بەباسکردنی دەستەواژەیەکی گشتی (عَام) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاص)، لە باسی حەیزدا**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: هەر کەس حەجی کرد با دوایەمین مەنزڵی (تەوافی ماڵئاوایی) ماڵی خوا بێت، جگە لەو ئافرەتانەی لە حەیزدان، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا پێیان کە تەوافەکە نەکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا رَخَّصَ لِلْحَيْضِ فِي النَّفْرِ بِلَا وَدَاعٍ إِذَا كُنَّ قَدْ أَفَضْنَ قَبْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ حِضْنَ

**٣٠٠٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، إِنَّ صَفِيَّةَ حَاضَتْ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟» فَقُلْتُ: إِنَّهَا حَاضَتْ بَعْدَمَا أَفَاضَتْ قَالَ: «فَلَا إِذًا فَلْتَنْفِرْ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها مۆڵەتی بەو ئافرەتانە دا کە لە حەیزدان، مەککە بەجێ بهێڵن بەبێ تەوافیماڵئاوایی، بەمەرجێ ئەوان پێش ئەوە تەوافی ماڵئاواییان کردبێت، دوای ئەوە کەوتبێتنە حەیزەوە

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، (لە حەجدا) صەفیە کەوتە حەیزەوە، ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرا، فەرمووی: تۆ بڵێی نەمانهێڵێتەوە؟ وتم: ئەو دوای ئەوەی تەوافی ماڵئاوایی کرد، دوای ئەوە کەوتە حەیزەوە، فەرمووی: کەواتە نامانهێڵێتەوە با دەربچێت (واتە: لە میناوە بگەڕێتەوە بۆ مەدینە).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ دُخُولِ الْكَعْبَةِ وَالذِّكْرِ وَالدُّعَاءِ فِيهَا

**٣٠٠٣-** عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: إِنَّمَا أُمِرْتُمْ بِالطَّوَافِ، وَلَمْ تُؤْمَرُوا بِدُخُولِهِ قَالَ: لَمْ يَكُنْ يَنْهَى عَنْ دُخُولِهِ، وَلَكِنْ سَمِعْتُهُ، يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا دَخَلَ الْبَيْتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا قُلْتُ: نَوَاحِيهَا أَزْوَايَاهَا؟ قَالَ: بَلْ فِي كُلِّ قِبْلَةٍ مِنَ الْبَيْتِ[٢].

## باسی سوننەتە بەندە بچێتە نێو کەعبە زیکر و یادی خوای تێدا بکات و بپاڕێتەوە

واتە: ئیبنو جوڕەیج دەڵێ: بە عەتائم وت: گوێم لە ئیبنو عەباس بوو ﵄ دەیوت: فەرمانتان پێ کراوە تەنها تەوافی کەعبە بکەن، فەرمانتان پێ نەکراوە بچنە نێویەوە، وتی: قەدەغەی نەدەکرد لە چوونە نێوەوەی، بەڵام گوێم لێ بوو دەیوت:

---

(١) صحيح.




ئوسامەی کوڕی زەید هەواڵی پێ دام پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ چووە نێو کەعبەوە لە هەموو (نَوَاحِي) تەنیشتەکانی پاڕایەوە، وتم: ئایا (نَوَاحِيهَا) تەنیشتەکانی (زَوَايَاهَا) گۆشەکانیەتی؟ وتی: بەڵکوو لە هەموو جێگایەکی قیبلە لە کەعبە.

## بَابُ وَضْعِ الْوَجْهِ وَالْجَبِينِ عَلَى مَا اسْتُقْبِلَ مِنَ الْكَعْبَةِ عِنْدَ دُخُولِهَا وَالذِّكْرِ وَالِاسْتِغْفَارِ

**٣٠٠٤-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄، أَنَّهُ دَخَلَ هُوَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَيْتَ فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَجَافَ الْبَابَ، وَالْبَيْتُ إِذْ ذَاكَ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ، فَمَضَى حَتَّى أَتَى الْأُسْطُوَانَتَيْنِ اللَّتَيْنِ تَلِيَانِ الْبَابَ بَابَ الْكَعْبَةِ، وَجَلَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَسَأَلَهُ وَاسْتَغْفَرَ، ثُمَّ قَامَ حَتَّى أَتَى مَا اسْتَقْبَلَ مِنْ دُبُرِ الْكَعْبَةِ، فَوَضَعَ وَجْهَهُ وَجَسَدَهُ عَلَى الْكَعْبَةِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَاسْتَغْفَرَ اللَّهَ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى كُلِّ رُكْنٍ مِنْ أَرْكَانِ الْكَعْبَةِ فَاسْتَقْبَلَهُ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّهْلِيلِ وَالتَّسْبِيحِ فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِالْمَسْأَلَةِ وَالِاسْتِغْفَارِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ مُسْتَقْبِلًا وَجْهَ الْكَعْبَةِ خَارِجًا مِنَ الْبَيْتِ، وَقَالَ: «هَذِهِ الْقِبْلَةُ هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[1].

## باسی دانانی ڕوخسار و نێوچاوان لەسەر ئەو شوێنەی ڕووی لە کەعبەیە لە کاتی چوونەنێوەوەی، هەروەها زیکر و پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوونیش

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﵄ دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو کەعبەوە، فەرمانی کرد بە بیلال دەرگاکەی داخست، ئەوکاتە کەعبە لەسەر شەش پایە وەستابوو، ڕۆیشت تا گەیشتە نێوان ئەو پایەی کە نزیك دەرگای کەعبە بوو، دانیشت ستایشی خوای کرد و لێی پاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی کرد، پاشان هەستا و هاتە ئەو شوێنەی کە ڕوو دەکاتە پشتی کەعبە، ڕوخسار و جەستەی لەسەر دانا و سوپاس و ستاییشی خوای کرد و داوای لێخۆشبوونی لێ کرد، پاشان ڕۆیشت بۆ لای هەر ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی کەعبە ڕووی تێ کرد تەکبیر و تەهلیل و تەسبیح و ستاییشی خوا، وە پاڕایەوە و داوای لێخۆشبوونی لێ کرد، پاشان چووە دەرەوەی کەعبە، ڕووبەڕووی کەعبە دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان لێبۆیەوە و فەرمووی: ئەمە قیبلەیە، ئەمە قیبلەیە.

---

(١) صحيح.

**٣٠٠٥-** عَن عيسى بن يونس، وإسحاق بن يوسف، وهُشَيم، وابن فُضَيل كلهم عن عَبْدُ الْمَلِكِ، فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَرُبَّمَا اخْتَلَفُوا فِي الْحَرْفِ وَالشَّيْءِ[1].

**واتە:** عیسای کوڕی یونس و ئیسحاقی کوڕی یوسف و هوشەیم و ئیبنو فوزەیل هەموویان لە عەبدولمەلیکەوە گێڕاویانەتەوە، فەرموودەکەیان بەدرێژی باس کردووە، تەنها جیاوازی لە پیت و شتی ئاساییدا هەیە.

## بَابُ التَّكْبِيرِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّهْلِيلِ وَالْمَسْأَلَةِ وَالِاسْتِغْفَارِ عِنْدَ كُلِّ رُكْنٍ مِنْ أَرْكَانِ الْكَعْبَةِ

**٣٠٠٦-** عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى أَرْكَانِ الْبَيْتِ يَسْتَقْبِلُ كُلَّ رُكْنٍ مِنْهَا بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّهْلِيلِ وَالتَّحْمِيدِ، وَسَأَلَ اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَهُ، وَذَكَرَ بَاقِيَ الْحَدِيثِ[2].

## باسی تەکبیر (الله أکبر) و تەحمید (الحمد لله) و تەهلیل (لا إله إلا الله) و پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون لەلای هەر ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی کەعبە

**واتە:** عەتاء دەڵێ: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ بۆی باس کردم، ئەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو کەعبەوە، دواتر فەرموودەکەی باس کرد، وە وتی: پاشان چوو بۆ لای ڕوکنەکانی بەیت ڕووی کردە هەر ڕوکنێك لە ڕوکنەکان بە تەکبیر و تەهلیل و تەحمید، وە لە خوا پاڕایەوە و داوای لێخۆشبونی لێ کرد، دواتر تەواوی فەرموودەکەی باس کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ السُّجُودِ بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ عِنْدَ دُخُولِ الْكَعْبَةِ، وَالْجُلُوسِ بَعْدَ السَّجْدَةِ وَالدُّعَاءِ

**٣٠٠٧-** عَنْ مُجَاهِدٍ، وَعَطَاءٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: وَلَقَدْ حَدَّثَنِي أَخِي، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ دَخَلَهَا خَرَّ بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ سَاجِدًا، ثُمَّ قَعَدَ فَدَعَا وَلَمْ يُصَلِّ[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده حسن.

**باسی چاکتر وایە بۆ بەندە کاتێ دەچێتە نێو کەعبە لە نێوان دوو کۆڵەکەکەدا سووژدە ببات، وە لەدوای سووژدەبردنی دابنیشێت و بپاڕێتەوە**

واتە: موجاهید و عەتاء دەگێڕنەوە، ئیبنو عەباس ﷺ دەیوت: بەڕاستی (فەزلی) برام بۆی باس کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ چووە نێو کەعبە لە نێوان دوو کۆڵەکەکەدا سووژدەی برد، پاشان دانیشت و پاڕایەوە، بەڵام نوێژی نەکرد.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ صَلَّى فِي الْبَيْتِ وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْخَبَرَ الَّذِي يَجِبُ قَبُولُهُ هُوَ خَبَرُ مَنْ يُخْبِرُ بِرُؤْيَةِ الشَّيْءِ وَسَمَاعِهِ وَكَوْنِهِ، لَا مَنْ يَنْفِي الشَّيْءَ وَيَدْفَعُهُ، وَالْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: وَلَمْ يُصَلِّ نَافٍ لِصَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا، لَا مُثْبِتٌ خَبَرًا، وَمَنْ أَخْبَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِيهَا مُثْبِتٌ فِعْلًا، مُخْبِرٌ بِرُؤْيَةِ فِعْلٍ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، فَالْوَاجِبُ مِنْ طَرِيقِ الْعِلْمِ وَالْوَقْفِ قَبُولُ خَبَرِ مَنْ أَعْلَمَ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِيهَا، دُونَ مَنْ نَفَى أَنْ يَكُونَ النَّبِيُّ ﷺ صَلَّى فِيهَا، وَهَذِهِ مَسْأَلَةٌ طَوِيلَةٌ قَدْ بَيَّنْتُهَا فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ لَمْ يَخْتَلِفُوا فِي جُمْلَةِ هَذَا الْقَوْلِ**

**٣٠٠٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ حَدَّثَ عَنْ بِلَالٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي جَوْفِ الْكَعْبَةِ[1].

**باسی ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەنێو کەعبە نوێژی کرد، ئەمەش لەو شێوازەیە کە لە چەند شوێنێکی کتێبەکانماندا باسم کردووە، ئەو فەرموودەی کە پێویستە وەربگیرێ بریتییە لە فەرموودەی ئەو کەسەی هەواڵ دەدات بە بینینی ئەو شتە و بیستنی و بوونی، نەك ئەو کەسەی کە شتەکە ڕەت دەکاتەوە و وەریناگرێ، جا فەزلی کوڕی عەباس لە وتەکەیدا کە وتی: (وَلَمْ يُصَلِّ)، واتە: نوێژی نەکرد لەنێو کەعبە. ڕەتی کردۆتەوە پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا کردبێت، هەواڵەکەی جێگیر نەکردووە، جا هەر کەس هەواڵی دا بەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی لە کەعبە کردووە ئەوە چەسپاندوویەتی کە پێغەمبەر ﷺ بەکردەوە نوێژی تێدا کردووە، جا ئەوەی کە واجبە لە ڕووی زانست و مرۆڤ لەسەری بوەستێ، وەرگرتنی فەرموودەی ئەو کەسەیە**

---

(١) صحيح.

**کە ڕایگەیاندووە ئەو پێغەمبەری ﷺ بینیوە نوێژی تێدا کردووە، نەك ئەو کەسەی کە ڕەتی کردۆتەوە پێغەمبەر ﷺ نوێژی تێدا کردبێت، ئەمەش بابەتێکی دوور و درێژە لە چەندین شوێنی کتێبەکانماندا ڕوونمان کردۆتەوە، کە زانایان لە کۆی ئەم قسەیە هیچ جیاوازییەکیان نییە**

واتە: عەمری کوڕی دینار دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ لە بیلالەوە گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ لەنێو کەعبە نوێژی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْمَكَانِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الْكَعْبَةِ

**٣٠٠٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقْبَلَ يَوْمَ الْفَتْحِ عَلَى بَعِيرٍ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ رَدِيفُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَهُ بِلَالٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ، فَلَمَّا جَاءَ الْبَيْتَ أَرْسَلَ ابْنُ طَلْحَةَ بِمِفْتَاحِ الْبَيْتِ، فَفَتَحَهُ فَدَخَلَ الرَّسُولُ ﷺ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ وَبِلَالٌ فَمَكَثُوا فِيهِ طَوِيلًا وَأَغْلَقُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ، ثُمَّ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَابْتَدَرُوا الْبَيْتَ، فَسَبَقَهُمُ ابْنُ عُمَرَ، وَآخَرُ مَعَهُ، فَسَأَلَ ابْنُ عُمَرَ بِلَالًا أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ فَأَرَاهُ أَيْنَ صَلَّى، وَلَمْ يَسْأَلْهُ كَمْ صَلَّى[1].

## باسی ئەو جێگایەی کە پێغەمبەر ﷺ لەنێو کەعبەدا نوێژی تێدا کرد

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە بەسەر وشترێکەوە هات، ئوسامەی کوڕی زەیدیش لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو، هەروەها بیلال و عوسمانی کوڕی تەڵحەی لەگەڵ بوو، کاتێ هات بۆ لای بەیت کوڕەکەی تەڵحەی نارد بۆ کلیلی کەعبە، دواتر کردیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئوسامەی کوڕی زەید و عوسمانی کوڕی تەڵحە و بیلال چوونە ژوورەوە، ماوەیەکی زۆر تیایدا مانەوە و دەرگاکەیان بەسەر خۆیاندا داخست، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، هاوەڵانیش بەپەلە چوون بۆ لای بەیت، ئیبنو عومەر و کەسێکی دیکە لەگەڵی پێشیان کەوتن، جا ئیبنو عومەر پرسیاری لە بیلال کرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە چی شوێنێکدا نوێژی تێدا کرد؟ پێی نیشان دا لە چی شوێنێکدا نوێژی کرد، بەڵام پرسیاری نەکرد چەند نوێژی تێدا کرد.

---

(١) صحيح.

**٣٠١٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ، وَهُوَ عَلَى نَاقَةٍ لِأُسَامَةَ حَتَّى أَنَاخَ بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ دَعَا عُثْمَانَ بْنَ طَلْحَةَ بِالْمِفْتَاحِ، فَذَهَبَ إِلَى أُمِّهِ، فَأَبَتْ أَنْ تُعْطِيَهُ، فَقَالَ: لَتُعْطِينِيهِ أَوْ لَيُخْرِجَنَّ السَّيْفَ مِنْ صُلْبِي، فَدَفَعَتْ إِلَيْهِ فَفَتَحَ الْبَابَ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ، وَدَخَلَ مَعَهُ عُثْمَانُ وَبِلَالٌ وَأُسَامَةُ، فَأَجَافُوا الْبَابَ مَلِيًّا قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَكُنْتُ رَجُلًا شَابًّا قَوِيًّا فَبَدَرَ النَّاسُ فَبَدَرْتُهُمْ، فَوَجَدْتُ بِلَالًا قَائِمًا عَلَى الْبَابِ قَالَ: يَا بِلَالُ أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ الْمُقَدَّمَيْنِ، وَنَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى[١].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﭭ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە چووە نێو مەککە، ئەو لەسەر وشترەکەی ئوسامە بوو، دواتر وشترەکەی لە تەنیشتی کەعبە یەخ دا، پاشان داوای کرد عوسمانی کوڕی تەڵحە کلیلەکەی بۆ بهێنێ، ئەویش چوو بۆ لای دایکی، دایکی ڕازی نەبوو کلیلەکەی بداتێ، ئەویش وتی: کلیلەکەم دەدەیتێ یان بەزەبری شمشێر دەریبهێنم، دواتر کلیلەکەی پێ دا ئەویش دەرگاکەی پێ کردەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە، عوسمان و بیلال و ئوسامە لەگەڵی چوون، ئەندازەیەکی زۆر دەرگاکەیان داخست، ئیبنو عومەر وتی: ئەو کات من پیاوێکی گەنجی بەهێز بووم خەڵکەکە بەپەلە ڕۆیشتن بۆ لای دەرگای کەعبە، منیش پێشیان کەوتم، بینیم بیلال لەبەر دەرگاکە وەستاوە، وتی: ئەی بیلال پێغەمبەری خوا ﷺ لە چی شوێنێکدا نوێژی کرد؟ وتی: لە نێوان ئەو دوو کۆڵەکەی پێشەوە، بیرم چوو پرسیاری لێ بکەم چەند نوێژی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْقَدْرِ الَّذِي جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ مَقَامِهِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ بَيْنَ الْكَعْبَةِ وَبَيْنَ الْجِدَارِ

**٣٠١١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: سَأَلْتُ بِلَالًا أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ فَقَالَ: فِي مَقْدَمِ الْبَيْتِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْحَائِطِ ثَلَاثَةُ أَذْرُعٍ أَوْ قَدْرُ ثَلَاثَةِ أَذْرُعٍ شَكَّ أَبُو عَامِرٍ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی ئەو ئەندازەی کە پێغەمبەر ﷺ داینا لە نێوان ئەو جێگایەی نوێژی تێدا کرد لە نێوان کەعبە و نێوان دیوارەکە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە بیلال کرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە چی شوێنێکدا نوێژی کرد؟ وتی: لە سەرەتای چوونەژوورەوەی بەیت، نێوانی ئەو و دیوارەکە سێ باڵ یان ئەندازەی سێ باڵ دەبوو. ئەبو عامر (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) گومانی هەبوو کام یەکێك لەو دووانەیە.

### بَابُ الْخُشُوعِ فِي الْكَعْبَةِ إِذَا دَخَلَهَا الْمَرْءُ، وَالنَّظَرِ إِلَى مَوْضِعِ سُجُودِهِ إِلَى الْخُرُوجِ مِنْهَا

**٣٠١٢-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، كَانَتْ تَقُولُ: عَجَبًا لِلْمَرْءِ الْمُسْلِمِ إِذَا دَخَلَ الْكَعْبَةَ كَيْفَ يَرْفَعُ بَصَرَهُ قِبَلَ السَّقْفِ، يَدَعُ ذَلِكَ إِجْلَالًا لِلَّهِ وَإِعْظَامًا، دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْكَعْبَةَ مَا خَلَفَ بَصَرُهُ مَوْضِعَ سُجُودِهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْهَا[1].

### باسی خشوع و گەردنکەچی لەنێو کەعبە کاتێ بەندە چووە ژوورەوە، وە تەماشاکردنی شوێنی سووژدەکەی تا لێی دەردەچێت

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە، عائیشە ﷺ دەیوت: سەرم سووڕ دەمێنی لە مسوڵمانێك کاتێ دەچێتە نێو کەعبە سەری بەرز دەکاتەوە بۆ سووانەی کەعبە، دەبێ لەبەر گەورەیی مەزنی خوا ﷻ ئەوە نەکات، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو کەعبە سەری لە شوێنی سووژدەکەی بەرز نەکردەوە تا لە کەعبە دەرچوو.

### بَابُ اسْتِحْبَابِ دُخُولِ الْكَعْبَةِ إِذْ دُخُولُهَا دُخُولًا فِي حَسَنَةٍ، وَخُرُوجًا مِنْ سَيِّئَةٍ مَغْفُورًا لِلدَّاخِلِ

**٣٠١٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ دَخَلَ الْبَيْتَ دَخَلَ فِي حَسَنَةٍ وَخَرَجَ مِنْ سَيِّئَةٍ مَغْفُورًا لَهُ»[2].

---

(١) إسناده ضعيف جدا.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسی سوننەت وایە بۆ بەندە بچێتە نێو کەعبەوە، چونکە چوونەنێوی چوونە نێوی چاکەیە، دەرچوونیشی دەرچوونە لە گوناهەکانی و لێی دەبووردێ**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بچێتە نێو بەیتەوە دەچێتە نێو چاکەوە، هەر کەسیش لێی دەربچێ لەگوناهەکانی دەردەچێ و لێی دەبووردرێ.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ دُخُولَ الْكَعْبَةِ لَيْسَ بِوَاجِبٍ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ بَعْدَ دُخُولِهِ إِيَّاهَا أَنَّهُ وَدَّ أَنْ لَمْ يَكُنْ دَخَلَهَا مَخَافَةَ إِتْعَابِ أُمَّتِهِ بَعْدَهُ، وَهَذَا كَتَرْكِهِ ﷺ بَعْضَ التَّطَوُّعِ وَالَّذِي كَانَ يُحِبُّ أَنْ يَفْعَلَهُ لِإِرَادَةِ التَّخْفِيفِ عَلَى أُمَّتِهِ ﷺ**

**٣٠١٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِي وَهُوَ قَرِيرُ الْعَيْنِ، طَيِّبُ النَّفْسِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ وَهُوَ حَزِينٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خَرَجْتَ مِنْ عِنْدِي، وَأَنْتَ كَذَا وَكَذَا قَالَ: «إِنِّي دَخَلْتُ الْكَعْبَةَ، وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ فَعَلْتُ إِنِّي أَخَافُ أَنْ أَكُونَ قَدْ أَتْعَبْتُ أُمَّتِي مِنْ بَعْدِي»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی چوونە نێو کەعبە واجب نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دوای چوونەنێوەوەی ڕایگەیاند ئەو خۆزگەی خواست نەچووبایەتە نێویەوە لەبەر مەترسی ئەوەی دوای خۆی ئوممەتەکەی ماندوو نەکات، ئەمەش وەکوو نەکردنی هەندێ سوننەت وایە، حەزی دەکرد کردەوەیەك ئەنجام بدات، ببێتە کارئاسانی بۆ ئوممەتەکەی**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای من دەرچوو زۆر دڵخۆش و بەکەیف بوو، پاشان گەڕایەوە بۆ لام بێتاقەت و خەمبار بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەلام دەرچووی ئاوا و ئاوا بووی، فەرمووی: من چوومە نێو کەعبە، خۆزگە ئەوەم نەکردایە، من لەوە دەترسم دوای خۆم ئوممەتەکەم ماندوو بکەم.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ عِنْدَ بَابِ الْكَعْبَةِ بَعْدَ الْخُرُوجِ مِنْهَا

**٣٠١٥-** عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: إِنَّمَا أُمِرْتُمْ بِالطَّوَافِ، فَلَمْ تُؤْمَرُوا بِدُخُولِهِ قَالَ: لَمْ يَكُنْ يَنْهَى عَنْ دُخُولِهِ، وَلَكِنْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا دَخَلَ الْبَيْتَ، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ فِي قِبَلِ الْبَيْتِ رَكْعَتَيْنِ، وَقَالَ: «هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[1].

### باسی سوننەت وایە دوای دەرچوون لەنێو کەعبە لەلای دەرگاکەی نوێژ بکرێ

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: بە عەتائم وت: گوێم لە ئیبنو عەباس ﵄ بوو دەیوت: فەرمانتان پێ کراوە تەنها تەوافی کەعبە بکەن، فەرمانتان پێ نەکراوە بچنە نێویەوە، وتی: قەدەغەی نەکرد لە چوونەنێوەوەی، بەڵام گوێم لێ بوو دەیوت: ئوسامەی کوڕی زەید هەواڵی پێ دام کە پێغەمبەر ﷺ چووە نێو کەعبەوە، کاتێکیش دەرچوو لە ڕووی کەعبە دوو ڕکات نوێژی کرد و فەرمووی: ئەمە قیبلەیە.

## بَابُ ذِكْرِ الْمَوْضِعِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ خُرُوجِهِ مِنَ الْكَعْبَةِ

**٣٠١٦-** عَنِ مجاهد يحدث، عن ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ الْبَيْتَ، فَجِئْتُ فَإِذَا قَدْ خَرَجَ، وَإِذَا بِلَالٌ قَائِمٌ عِنْدَ بَابِ الْكَعْبَةِ قَالَ: قُلْتُ يَا بِلَالُ أَيْنَ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ ؟ فَقَالَ: هَا هُنَا قَالَ: ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ الْحِجْرِ وَالْبَابِ قَالَ: فَكَانَ مُجَاهِدٌ يَصِفُهَا بَيْنَ الْأُسْطُوَانَتَيْنِ اللَّتَيْنِ مِنْ قِبَلِ بَابِ بَنِي مَخْزُومٍ[2].

### باسی ئەو جێگاکەی کە پێغەمبەر ﷺ دوای دەرچوونی لە کەعبە دوو ڕکات نوێژی تێدا کرد

واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە نێو بەیتەوە، کە هاتم ئەو دەرچووبوو، بیلالیش لەلای دەرگای کەعبە وەستابوو، وتی: وتم: ئەی بیلال پێغەمبەر ﷺ لە چی شوێنێك نوێژی کرد؟ وتی: ئا لەوێ، وتی: پاشان دەرچوو لە نێوان حیجری (ئیسماعیل) و دەرگای کەعبە دوو ڕکات نوێژی کرد، جا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

موجاهید باسی چۆنێتی نوێژەکەی کرد لەنێو کەعبە، لە نێوان ئەو دوو کۆڵەکە بوو کە ڕووبەڕووی دەرگای ماڵی نەوەکانی مەخزوم بوو.

## بَابُ الْتِزَامِ الْبَيْتِ عِنْدَ الْخُرُوجِ مِنَ الْكَعْبَةِ إِنْ كَانَ يَزِيدُ بْنُ أَبِي زِيَادٍ مِنَ الشَّرْطِ الَّذِي اشْتَرَطْنَا فِي أَوَّلِ الْكِتَابِ

**٣٠١٧-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَوْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ، فَدَخَلَ الْبَيْتَ، فَلَبِسْتُ ثِيَابِي، وَانْطَلَقْتُ، وَقَدْ خَرَجَ مِنَ الْبَيْتِ هُوَ وَأَصْحَابُهُ مُسْتَلِمِينَ مَا بَيْنَ الْحِجْرِ إِلَى الْحَجَرِ وَاضِعِي خُدُودَهُمْ عَلَى الْبَيْتِ، وَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ أَقْرَبُهُم مِن الْبَابِ، فَدَخَلْتُ بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَقُلْتُ: كَيْفَ صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالُوا: صَلَّى رَكْعَتَيْنِ عِنْدَ السَّارِيَةِ الَّتِي قُبَالَةَ الْبَيْتِ[١].

## باسی خۆنووساندن بە کەعبەوە لە کاتی دەرچوون لە کەعبە، ئەگەر یەزیدی کوڕی زیاد (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودە) لەو مەرجانە بێت کە لە سەرەتای کتێبەکەماندا دامانناوە

واتە: صەفوانی کوڕی عەبدوڕەحمان یان عەبدوڕەحمانی کوڕی صەفوان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە مەککە، دواتر چووە نێو کەعبە، منیش جلەکانم لەبەر کرد و ڕۆیشتم، پێغەمبەر ﷺ خۆی و هاوەڵانی لە کەعبە دەرچووبوون لە نێوانی حیجر و بەردە ڕەشەکە بوون دەستیان دەدا لە بەردە ڕەشەکە، ڕوخساریان نوساندبوو بە کەعبەوە، وە پێغەمبەر ﷺ لە هەموویان نزیکتر بوو لە دەرگاکەوە، منیش چوومە نێوان دوو کەسەوە وتم: پێغەمبەر ﷺ چی کرد؟ وتیان: لای ئەو کۆڵەکەی ڕووبەڕووی کەعبەیە دوو ڕکات نوێژی کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ فِي الْحِجْرِ إِذَا لَمْ يُمْكِنْ دُخُولُ الْكَعْبَةِ إِذْ بَعْضُ الْحِجْرِ مِنَ الْبَيْتِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ لَفْظُهُ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ، أَنَا خَائِفٌ أَنْ يَسْمَعَ بِهَذَا الْخَبَرِ الَّذِي ذَكَرْتُ أَنَّ لَفْظَهُ لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ بَعْضُ النَّاسِ فَيَتَوَهَّمُ أَنَّ جَمِيعَ الْحِجْرِ مِنَ الْكَعْبَةِ لَا بَعْضَهُ

---

(١) إسناده ضعيف.

**٣٠١٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَدْخُلَ الْبَيْتَ فَأُصَلِّيَ فِيهِ فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِي فَأَدْخَلَنِي الْحِجْرَ، فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ إِنَّ قَوْمَكِ لَمَّا بَنُو الْكَعْبَةَ اسْتَقْصَرُوا فَأَخْرَجُوا الْحِجْرَ مِنَ الْبَيْتِ، فَإِذَا أَرَدْتَ أَنْ تُصَلِّي فِي الْبَيْتِ فَصَلِّي فِي الْحِجْرِ، فَإِنَّمَا هُوَ قِطْعَةٌ مِنَ الْبَيْتِ»[١].

**باسی چاکتر وایە نوێژ لە حیجردا بکات ئەگەر نەیتوانی بچێتە نێو کەعبە، چونکە هەندێ لە حیجر بەشێکە لە کەعبە، بەباسکردنی فەرموودەیەك دەستەواژەکەی گشتییە (عَامٌّ) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاصٌّ)، من دەترسم کەسێك ئەم فەرموودە ببیستێ کە باسم کرد، دەستەواژەکەی گشتییە (عَامٌّ) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاصٌّ)، وا خەیاڵ بکات هەموو حیجر بەشێکە لە کەعبە نەك هەندێکی**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: من حەزم دەکرد بچمە نێو کەعبەوە و نوێژی تێدا بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستمی گرت و لەنێو حیجر (ی ئیسماعیل) دایئنام، فەرمووی: ئەی عائیشە بەڕاستی قەومەکەت (کە قورەیشە) کاتێ کەعبەیان بونیاد نایەوە لەسەر بنچینەی خۆی دروستیان نەکردەوە و ڕووبەرەکەیان کەم کردەوە، حیجریان لە کەعبە دەرکرد، جا ئەگەر ویستت لە کەعبە نوێژ بکەی ئەوە لە حیجر نوێژ بکە، چونکە پارچەیەکە لە کەعبە.

**٣٠١٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْلَا حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَأَدْخَلْتُ الْحِجْرَ فِي الْبَيْتِ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَرَّجْتُ مَا يُشْبِهُ هَذِهِ اللَّفْظَةَ الَّتِي هِيَ مِنْ لَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ فِي الْكِتَابِ الْكَبِيرِ.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قەومەکەت نۆدەمەی مسوڵمان بوونیان نەبووایە (مەبەستی ئەوە بوو ئیسلام هێشتا جێگیر نەبووە لە دڵیاندا) ئەوە حیجرم دەخستە نێو کەعبەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە کتێبی (الْكَبِير) هاوشێوەی ئەم دەستەواژەیەم هێناوە کە دەستەواژەکەی گشتییە (عَامٌّ) مەبەستی پێی تایبەتە (خَاصٌّ).

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ بَعْضَ الْحِجْرِ مِنَ الْبَيْتِ، لَا جَمِيعَهُ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: وَأَخْرَجُوا الْحِجْرَ مِنَ الْبَيْتِ، بَعْضَهُ لَا جَمِيعَهُ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الِاسْمَ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَلِفِ وَاللَّامِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِ الشَّيْءِ

**٣٠٢٠-** عَنْ وَهَب بْنِ جَرِيرٍ حَدَّثَنَا أَبِي، قَالَ سَمِعْتُ يَزِيد بْن رُومَانَ يُحَدِّثُ عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَتْ لِي عَائِشَةُ ﵂: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ لَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ لَهَدَمْتُ الْبَيْتَ حَتَّى أُدْخِلَ فِيهِ مَا أَخْرَجُوا مِنْهُ فِي الْحِجْرِ، فَإِنَّهُمْ عَجَزُوا عَنْ نَفَقَتِهِ، وَجَعَلْتُ لَهُ بَابَيْنِ بَابًا شَرْقِيًّا وَبَابًا غَرْبِيًّا، وَأَلْصَقْتُهُ بِالْأَرْضِ، وَوَضَعْتُهُ عَلَى أَسَاسِ إِبْرَاهِيمَ». قَالَ: فَكَانَ ذَاكَ الَّذِي دَعَا ابْنُ الزُّبَيْرِ إِلَى هَدْمِهِ وَبِنَائِهِ قَالَ: فَشَهِدْتُهُ حِينَ هَدَمَهُ وَبَنَاهُ، فَاسْتَخْرَجَ أَسَاسَ الْبَيْتِ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ مَتَلَائِكَةً قَالَ أَبِي: فَقُلْتُ لَيَزِيدَ بْنِ رُومَانَ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ أَطُوفُ مَعَهُ أَرِنِي مَا أَخْرَجُوا مِنَ الحِجْرِ مِنْهُ قَالَ: أُرِيكَهُ الْآنَ، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَيْهِ قَالَ: هَذَا الْمَوْضِعُ قَالَ أَبِي: فَحَزَرْتُهُ نَحْوًا مِنْ سِتَّةِ أَذْرُعٍ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ لە حیجر بەشێکە لە بەیت، نەك هەمووی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (وَأَخْرَجُوا الْحِجْرَ مِنَ الْبَيْتِ)، واتە: حیجریان دەرکرد لە کەعبە. مەبەستی هەندێکی بوو نەك هەمووی، ئەمەش لەو شێوازەیە کە لە چەندین شوێنی کتێبەکانماندا ڕامگەیاندووە بەکارهێنانی ناوی ناسراو بە (الْأَلِفِ وَاللَّامِ) هەندێ جار بۆ هەندێك لەو شتە بەکار دێت کە باسکراوە

واتە: وەهبی کوڕی جەریر دەگێڕێتەوە، باوکم بۆی باس کردین، وتی: گوێم لێ بوو یەزیدی کوڕی ڕومان باسی دەکرد، لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە وتی: عائیشە ﵂ پێمی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەی عائیشە ئەگەر قەومەکەت نۆدەمەی مسوڵمانبوونیان نەبووایە بەیتم دەڕوخاند، ئەوەی لێیان پچڕاندووە دەمخستەوە نێوی، چونکە ئەوان خەرجییان نەبوو فراوانی بکەن، هەروەها دوو دەرگام بۆی دادەنا دەرگایەك لە خۆرهەڵاتەوە و دەرگایەکیش لە خۆرئاواوە، وە دەملکاند بە زەوییەوە،

---

(١) صحيح.

لەسەر بنچینەکەی ئیبراهیم دروستم دەکردەوە. وتی: ئەمە وای کرد لە ئیبنو زوبەیر بیڕوخێنێ و دروستی بکاتەوە، (یەزید) وتی: بینیم ئیبنو زوبەیر کاتێ ڕوخاندی و دروستی کردەوە گەیاندنی بە بنەڕەتی ئیبراهیم، خۆم بنەڕەتەکەی ئیبراهیمم بینی بەردێك بوو وەکوو سمی وشتر وا بوو تێکەڵی یەکدی بوو. باوکم وتی: ئەو ڕۆژەی تەوافم لەگەڵ یەزیدی کوڕی ڕومان دەکرد پێم وت: ئەو بەشەی لە حیجر دەریانکردبوو لە کەعبە پێم نیشان بدە؟ وتی: ئێستا پێت نیشان دەدەم، کاتێ گەیشتە لای وتی: ئەم شوێنەیە، باوکم وتی: پێوانەم کرد نزیکەی شەش باڵ دەبوو.

**٣٠٢١-** عَنْ يَزِيد بن رُومَانَ، عَن عروةَ، عَن عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، فَقَالَ: قَالَ يَزِيدُ: قَدْ شَهِدْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ حِينَ هَدْمَهُ[١].

واتە: یەزیدی کوڕی ڕومان دەگێڕێتەوە، لە عوڕوەوە، لە عائیشەوە ﵂، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد، یەزید وتی: ئامادە بووم لە لای ئیبنو زوبەیر کاتێ کەعبەی ڕوخاند.

**٣٠٢٢-** عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كَانَتِ الْكَعْبَةُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَبْنِيَّةً بِالرَّضْمِ لَيْسَ فِيهِ مَدَرٌ، وَكَانَتْ قَدْرُ مَا يَقْتَحِمُهَا الْعَنَاقُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي قِصَّةِ بِنَاءِ الْكَعْبَةِ، وَقَالَ: فَلَمَّا كَانَ جَيْشُ الْحُصَيْنِ بْنِ نُمَيْرٍ فَذَكَرَ حَرِيقَهَا فِي زَمَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ ﵄ إِنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَوْلَا حَدَاثَةُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَهَدَمْتُ الْكَعْبَةَ فَإِنَّهُمْ تَرَكُوا مِنْهَا سَبْعَةَ أَذْرُعٍ فِي الْحِجْرِ ضَاقَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ وَالْخَشَبُ»[٢].

واتە: ئەبو توفەیل دەڵێ: کەعبە لە سەردەمی نەفامی بە بەرد دروست کرابوو، هیچ قوڕێکی تێدا نەبوو، ئەندازەی ئەوە بەرز بوو گیسکێکی مێی یەکساڵە سەر بکەوتایەتە سەری، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد لە باسی دروستکردنی کەعبە، وتی: کاتێ سوپاکەی حوصەینی کوڕی نومەیر (بەسەرپەرشتی حەجاجی کوڕی یوسف)، دواتر باسی سوتاندنی کەعبەی کرد لەلایەن ئەو سوپایەوە لە سەردەمی ئیبنو زوبەیر، ئیبنو زوبەیر ﵄ وتی: عائیشە هەواڵی پێ دام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قەومەكەت لە سەردەمی بێباوەڕی نزیك نەبوونایە (یان نۆدەمەی مسوڵمانبوونیان نەبووایە) بەیتم دەڕوخاند، (لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی ئیبڕاهیم دروستم دەكردەوە)، چونكە ئەوان حەوت قۆڵیان لە حیجر كەم كردەوە بەهۆی ئەوەی خەرجی و دار و تەختەیان لەلا نەبوو.

**٣٠٢٣-** عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، وَفَدَ الْحَارِثُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَلَى عَبْدِ الْمَلَكِ بْنِ مَرْوَانَ فِي خِلَافَتِهِ، فَقَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ مَا أَظُنُّ أَبَا خُبَيْبٍ يَعْنِي ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ سَمِعَ مِنْ عَائِشَةَ مَا كَانَ يَذْكُرُ أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنْهَا، قَالَ الْحَارِثُ: بَلَى أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْهَا، قَالَ: سَمِعْتَهَا تَقُولُ مَاذَا؟ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ قَوْمَكِ اسْتَقْصَرُوا مِنْ بُنْيَانِ الْبَيْتِ وَإِنِّي لَوْلَا حَدَاثَةُ عَهْدِهِمْ بِالشِّرْكِ أَعَدْتُ مَا تَرَكُوا مِنْهُ، فَإِنْ بَدَا لِقَوْمِكِ مِنْ بَعْدِي أَنْ يَبْنُوهُ فَهَلُمِّي فَلَأُرِيكِ مَا تَرَكُوا مِنْهُ»، فَأَرَاهَا قَرِيبًا مِنْ سَبْعَةِ أَذْرُعٍ، هَذَا حَدِيثُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدٍ وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[1].

واتە: حارسی كوڕی عەبدوڵای كوڕی ئەبو ڕەبیعە دەڵێ: عەبدوڵای كوڕی عوبەید دەڵێ: حارسی كوڕی عەبدوڵا بەوەفد چوو بۆ لای عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان لە خیلافەتەكەیدا، عەبدولمەلیك وتی: پێم وا نییە باوكی خوبەیب واتە: ئیبنو زوبەیر ﷺ ئەوەی لە عائیشەوە بیستبێت كە بانگەشەی بۆ دەكات، حاریس وتی: بەڵێ من لە عائیشەوە گوێم لێ بوو، وتی: گوێت لێ بوو چی دەوت؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی قەومەكەت (كە قوڕەیشە كاتێ) كەعبەیان بونیاد نایەوە لێیان كەم كردەوە، (لەسەر بنچینەی ئیبڕاهیم دروستیان نەكردەوە)، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت قەومەكەت لە سەردەمی شیركەوە نزیكن (تازە ئیسلامیان ناسیوە)، ئەوەی وازیان لێ هێنابوو دەمگەڕاندەوە، ئەگەر قەومەكەت دوای من بۆیان گونجا دروستی بكەنەوە، بێ با پیشانت بدەم ئەوەی كە وازیان لێ هێناوە، پێی نیشان دا، نزیكەی حەوت باڵ دەبوو. ئەمە فەرموودەی عەبدوڵای كوڕی عوبەیدە، دواتر فەرموودەكەی بەتەواوی باس كرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْعُمْرَةِ فِي ذِي الْحِجَّةِ بَعْدَ مُضِيِّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ

**٣٠٢٤-** عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﵄، أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَلَقَ رَأْسَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، قَالَ: وَكَانَ النَّاسُ يَحْلِقُونَ فِي الْحَجِّ، ثُمَّ يَعْتَمِرُونَ عِنْدَ النَّفَرِ، فَيَقُولُ: «مَا يَحْلِقُ هَذَا»، فَنَقُولُ لِأَحَدِهِمْ أَمِرَّ الْمُوسَى عَلَى رَأْسِكَ[1].

### باسی ڕێگەدان بە عومرە لە مانگی (ذِو الْحِجَّة) لەدوای تێپەڕبوونی ڕۆژەکانی تەشریق

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﵄ هەواڵی پێ داوە، پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا سەری تاشی، وتی: خەڵکەکەیش لە حەجدا سەریان دەتاشی، پاشان لە سێیەم ڕۆژی تەشریق عومرەیان دەکرد، دەیفەرموو: ئەوە بۆ سەری نەتاشیوە؟ ئێمەیش بە کەسێکیانمان دەوت: بە موس سەرت بتاشە.

## بَابُ الْعُمْرَةِ فِي ذِي الْحِجَّةِ مِنَ التَّنْعِيمِ لِمَنْ قَدْ حَجَّ ذَلِكَ الْعَامَ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْعُمْرَةَ غَيْرُ جَائِزَةٍ إِلَّا مِنَ الْمَوَاقِيتِ الَّتِي وَقَّتَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ ذَكَرَ الْمَوَاقِيتَ، فَقَالَ: يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، الْأَخْبَارَ بِتَمَامِهَا

**٣٠٢٥-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْمَرَ عَائِشَةَ مِنَ التَّنْعِيمِ فِي ذِي الْحِجَّةِ[2].

### باسی عومرەکردن لەدوای (ذِي الْحِجَّة) لە تەنعیم بۆ ئەو کەسەی ئەو ساڵە حەجی کردووە، دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە عومرە دروست نییە جگە لەو شوێنانەی کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردووە بۆ ئیحرامبەستن، وەك فەرموویەتی: (يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ)، واتە: خەڵکی مەدینە لە (ذِي الْحِجَّة) ئیحرام دەبەستن فەرموودەکە بەتەواوی لە شوێنی خۆیدا باس کراوە

واتە: جابر ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی بە عائیشە کرد لە تەنعیم (شوێنێکە لە مەککە لە دەرەوەی حەرەم) لە مانگی (ذِي الْحِجَّة).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٣٠٢٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْمَرَ عَائِشَةَ مِنَ التَّنْعِيمِ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی بە عائیشە کرد لە تەنعیم لە شەوی حەصبە (دەکەوێتە دوای ڕۆژەکانی تەشریق، بۆیە ئەو ناوەی لێ نراوە، چونکە لە مینا دەگەڕانەوە و دادەبەزینە موحەصەب و شەو لەوێ دەمانەوە).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْعُمْرَةَ مِنَ الْمِيقَاتِ أَفْضَلُ مِنْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ إِذْ هِيَ أَكْثَرُ نَصَبًا وَأَفْضَلُ نَفَقَةً، وَمَا كَانَ أَكْثَرَ نَصَبًا وَأَفْضَلَ نَفَقَةً فَالْأَجْرُ عَلَى قَدْرِ النَّصَبِ وَالنَّفَقَةِ

**٣٠٢٧-** عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَصْدُرُ النَّاسُ بِنُسُكَيْنِ وَأَصْدُرُ بِنُسُكٍ وَاحِدٍ؟ قَالَ: «انْتَظِرِي فَإِذَا طَهُرْتِ، فَاخْرُجِي إِلَى التَّنْعِيمِ، فَأَهِلِّي مِنْهُ، ثُمَّ الْقِنَا بِجَبَلِ كَذَا وَكَذَا». قَالَ: أَظُنُّهُ قَالَ: كُدًى، وَلَكِنَّهَا عَلَى قَدْرِ نَصَبِكِ أَوْ قَدْرِ نَفَقَتِكِ[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی عومرەکردن لە میقات چاکترە لە تەنعیم، چونکە عومرە لە میقات ماندووبوونی زیاترە و بەخشینیشی چاکترە، ئەوەشی ماندوبوونی زیاتر بێت و بەخشینیشی چاکتر بێت، ئەوە بێگومان پاداشت بە ئەندازەی ماندووبوون و بەخشینە

واتە: دایکی ئیماندااران دەڵێ: عائیشە ﵂ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان بە حەج و عومرە، منیش تەنها بە حەج بگەڕێمەوە، فەرمووی: چاوەڕوان بە ئەگەر پاك بوویتەوە، بچۆ بۆ تەنعیم، لەوێ ئیحرام ببەستە، پاشان لە کێوی فلان و فلان بگە پێمان، -وتی: پێم وایە فەرمووی: کێوی کودا- بەڵام پاداشتی عومرەکەت بە ئەندازەی ماندووبوونتە، یان ئەندازەی بەخشینەکانت.

## بَابُ إِسْقَاطِ الْهَدْيِ عَنِ الْمُعْتَمِرِ بَعْدَ مُضِيِّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ وَإِنْ كَانَ قَدْ حَجَّ مِنْ عَامِهِ ذَلِكَ

**٣٠٢٨-** عَن عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُوَافِينَ لِهِلَالِ ذِي الْحِجَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِحَجَّةٍ فَلْيُهِلَّ، فَلَوْلَا أَنِّي أَهْدَيْتُ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لَأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ وَمِنْهُمْ مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ»، فَحِضْتُ قَبْلَ أَنْ أَدْخُلَ مَكَّةَ، فَأَدْرَكَنِي يَوْمُ عَرَفَةَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «دَعِي عُمْرَتَكِ، وَانْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ، فَلَمَّا كَانَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ أَرْسَلَ مَعِي عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَرْدَفَهَا فَأَهَلَّتْ بِعُمْرَةٍ مَكَانَ عُمْرَتِهَا، فَقَضَى اللَّهُ حَجَّتَهَا وَعُمْرَتَهَا، وَلَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ هَدْيٌ، وَلَا صِيَامٌ وَلَا صَدَقَةٌ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي الْمَسْأَلَةِ الَّتِي كُنْتُ أَمْلَيْتُهَا فِي التَّأْلِيفِ بَيْنَ الْأَخْبَارِ الَّتِي رُوِيَتْ فِي حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ عَائِشَةَ إِنَّمَا تَرَكَتِ الْعَمَلَ لِعُمْرَتِهَا الَّتِي لَمْ يُمْكِنْهَا الطَّوَافُ لَهَا بِالْبَيْتِ لِعِلَّةِ الْحَيْضَةِ الَّتِي حَاضَتْهَا لَا أَنَّهَا رَفَضَتْ تِلْكَ الْعُمْرَةَ، وَبَيَّنْتُ فِي ذَلِكَ الْمَوْضِعِ أَنَّ فِي قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ لَهَا « طَوَافُكِ يَكْفِيكِ بِحَجَّتِكِ وَعُمْرَتِكِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّهَا لَمْ تَرْفُضْ عُمْرَتَهَا، وَإِنَّمَا تَرَكَتِ الْعَمَلَ لَهَا إِذْ كَانَتْ حَائِضًا، وَلَمْ يُمْكِنْهَا الطَّوَافَ لَهَا، وَبَيَّنْتُ أَنَّ قَوْلَهُ، وَلَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ فِي ذَلِكَ هَدْيٌ، وَلَا صَدَقَةٌ، وَلَا صِيَامٌ أَنَّهَا أَرَادَتْ لَمْ يَكُنْ فِي عُمْرَتِي الَّتِي اعْتَمَرْتُهَا بَعْدَ الْحَجِّ هَدْيٌ، وَلَا صَدَقَةٌ، وَلَا صِيَامٌ، وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ هَذَا التَّأْوِيلِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ نَحَرَ عَنْ نِسَائِهِ الْبَقَرَ قَبْلَ أَنْ تَعْتَمِرَ عَائِشَةُ هَذِهِ الْعُمْرَةَ مِنَ التَّنْعِيمِ، أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَهَا: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ أُدْخِلَ عَلَيْنَا بِلَحْمِ بَقَرٍ، فَقُلْنَا مَا هَذَا، فَقِيلَ نَحَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ الْبَقَرَ، فَقَدْ خَبَّرَتْ عَائِشَةُ أَنَّهُ قَدْ كَانَ فِي حَجِّهَا هَدْيٌ قَبْلَ أَنْ تَعْتَمِرَ مِنَ التَّنْعِيمِ، وَفِي خَبَرِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ فِي آخِرِ الْخَبَرِ قَالَ: تَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ: «اخْرُجِي مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَهِلِّي بِعُمْرَتِكِ»، فَفَعَلْتُ، ثُمَّ لَمْ أَهْدِ شَيْئًا.

## باسی هەڵگرتنی ئاژەڵی هەدی لەسەر عومرەکار، دوای تێپەڕبوونی ڕۆژەکانی تەشریق، ئەگەرچی لەو ساڵەیشدا حەجی کردبوو

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە سەرەتای مانگی (ذِي الْحِجَّةِ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس دەیەوێ ئیحرام ببەستێ بەنییەتی عومرە با ئیحرام ببەستێ، هەر کەسیش دەیەوێ ئیحرام ببەستێ بە نییەتی حەج با ئیحرام ببەستێ، من ئەگەر قوربانیم نەهێنابایە ئیحرامی عومرەم دەبەست، هەندێ لە هاوەڵانی ئیحرامیان بۆ عومرە بەست، هەندێکیشیان ئیحرامیان بۆ حەج بەست، کەوتمە حەیزەوە پێش ئەوەی بچمە نێو مەککە، ڕۆژی عەرەفەم بەسەردا هات

---

(١) صحیح.

لە حەیزدا بووم، سكاڵای ئەوەم برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: واز لە عومرەكەت بێنە و سەرت بكەرەوە و قژت شانە بكە و ئیحرامی حەج ببەستە. كاتێ كە شەوی حەصبە هات پێغەمبەر ﷺ عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكری لەگەڵمدا نارد بۆ تەنعیم، خستیە پشتی خۆی لەسەر وڵاخەكە، دواتر ئیحرامی عومرەی بەست لە جێگای عومرەكەی دیكەی، خوا ﷻ حەج و عومرەكەی لێ وەرگرت، لە هیچ شتێك لەوانەدا ڕۆژووگرتن و قوربانی و خێر و بەخشین نەبوو.

ئەبو بەكر دەڵێ: بێگومان من ڕوونم كردەوە لە بابەتی پێكهێنان لە نێوان ئەو فەرموودانەی كە دەربارەی حەجكردنی پێغەمبەر ﷺ هاتبوو، عائیشە بۆیە وازی لە كردەوەی عومرەكەی هێنا و نەیتوانی تەوافەكەی بە دەوری بەیتدا بكات، بەهۆی ئەو حەیزەی تێی كەوتبوو، نەك بەمانای ئەوەی عائیشە ئەو عومرەی ڕەت كردبێتەوە، وە لەو شوێنەدا ڕوونم كردەوە لە پێغەمبەر ﷺ كە پێی فەرموو: (طَوَافُكِ يَكْفِيكِ بِحَجَّتِكِ وَعُمْرَتِكِ)، واتە: تەوافەكەت بەسە بۆ حەج و عومرەكەت. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو عومرەكەی ڕەت نەكردەوە، بەڵكوو بەهۆی حەیزەكەیەوە وازی لە كارەكانی عومرەكەی هێنا و نەیتوانی تەوافی بۆ بكات، وە وتەكەیم ڕوون كردەوە: لە هیچ شتێك لەوانەدا ئاژەڵی هەدی و خێر و بەخشین و ڕۆژوو نەبوو. ئەو مەبەستی ئەوە بوو لە عومرەكەمدا كە لەدوای حەج ئەنجامم دا ئاژەڵی هەدی و خێر و صەدەقە و ڕۆژووی تێدا نەبوو، وە بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەم لەیەكدانەوەیە ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ مانگایەكی لە بری خێزانەكانی سەر بڕی پێش ئەوەی عائیشە ئەم عومرەیە بكات لە تەنعیم، ئایا وتەكەیت نەبیستووە: (عائیشە دەڵێ): كاتێ كە ڕۆژی جەژن هات گۆشتمان بۆ هێنرا، وتمان: ئەو گۆشتە چییە؟ وترا: پێغەمبەر ﷺ مانگایەكی لەبری خێزانەكانی سەر بڕی، بێگومان عائیشە هەواڵی داوە لە حەجەكەیدا ئاژەڵی هەدی هەبوو پێش ئەوەی عومرە بكات لە تەنعیم، وە لە فەرموودەكەی موحەممەدی كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی نەوفەل، لە هیشامی كوڕی عوروە، لە باوكیەوە، لە عائیشەوە لە كۆتایی فەرموودەكەدا وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اخْرُجِي مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَهِلِّي بِعُمْرَتِكِ)، واتە: لەگەڵ عەبدوڕەحماندا بچۆ بۆ تەنعیم ئیحرامی عومرەكەت ببەستە. منیش بەو شێوەیەم كرد، پاشان هیچ ئاژەڵێكی هەدیم نەكرد بە قوربانی.

**٣٠٢٩-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يُحَدِّثُ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا حَدَّثَتْهُمْ عَنْ عُمْرَتِهِمْ بَعْدَ الْحَجِّ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: حِضْتُ فَاعْتَمَرْتُ بَعْدَ الْحَجِّ، ثُمَّ لَمْ أَصُمْ، وَلَمْ أُهْدِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ يُبَيِّنُ أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنَّهَا لَمْ تَصُمْ، وَلَمْ تَهْدِ بَعْدَ تِلْكَ الْعُمْرَةِ الَّتِي اعْتَمَرَتْ مِنَ التَّنْعِيمِ لَا قَبْلَهَا.

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، لە عورڕوە، لە عائیشەوە ﵂ ئەو دەربارەی عومرەکەی کە لەدوای حەج کردی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردن و وتی: کەوتمە حەیزەوە لەدوای حەج، دواتر عومرەم کرد، پاشان نە ڕۆژووم گرت و نە ئاژەڵم کرد بە هەدی بۆ قوربانی.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا عائیشە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە لەدوای ئەو عومرەیەی کە لە تەنعیم کردی و لەپێشی نە ڕۆژووی گرت و نە ئاژەڵی هەدی کرد بە قوربانی.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْحَجِّ عَمَّنْ لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ عَنْ نَفْسِهِ مِنَ الْكِبَرِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ وَلَّى نَبِيَّهُ ﷺ بَيَانَ مَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ مِنَ الْوَحْيِ خَاصًّا وَعَامًّا، فَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم، جَمِيعَ الْأَعْمَالِ، وَأَنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَرَادَ بَعْضَ السَّعْيِ لَا جَمِيعَهُ، إِذْ لَوْ كَانَ اللَّهُ أَرَادَ جَمِيعَ السَّعْيِ لَمْ يَكُنِ الْحَجُّ إِلَّا لِمَنْ حَجَّ بِنَفْسِهِ، لَمْ يَسْقُطْ فَرْضُ الْحَجِّ عَنِ الْمَرْءِ إِذَا حُجَّ عَنْهُ، وَلَمْ يُكْتَبْ لِلْمَحْجُوجِ عَنْهُ سَعْيُ غَيْرِهِ إِذْ لَمْ يَسْعَ هُوَ بِنَفْسِهِ سَعْيَ الْعَمَلِ

**٣٠٣٠-** عَنِ الْفَضْلِ ﵁ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمٍ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ عَلَيْهِ فَرِيضَةُ اللَّهِ فِي الْحَجِّ، وَهُوَ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَوِيَ عَلَى ظَهْرِ بَعِيرِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَحُجِّي عَنْهُ»[٢].

**باسی ڕێگەدان بە حەجکردن لە جیاتی ئەو کەسەی توانای ئەوەی نییە حەج بۆ خۆی بکات بەهۆی پیرییەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاسپاردووە ئەوەی دایبەزاندووە لە وەحی و نیگاکەی**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ڕوونی بکاتەوە، تایبەت بێت یان گشتی، جا پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، خوا لە فەرمایشتەکەیدا: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، مەبەستی هەموو کردەوەکان نییە، بێگومان خوا ﷻ مەبەستی لە هەندێ کردەوە و کۆششە نەك هەمووی، چونکە ئەگەر خوا مەبەستی هەموو کردەوەکان بووایە ئەوە حەج دروست نەدەبوو تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت لە بری خۆی حەجی کردووە، ئەگەر کەسێك حەجی بۆ بکرایە فەڕزەکەی لەسەر هەڵنەدەگیرا، هەروەها ئەو کەسەی حەجی بۆ کراوە کۆششی غەیری خۆی بۆ نەدەنووسرا، ئەگەر بە نەفسی خۆی ئەو کۆششەی نەکردایە

واتە: فەزل ﷺ دەگێڕێتەوە ئافرەتێك لە هۆزی خەثعەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم پیاوێکی بەساڵاچووە حەجی لەسەر فەڕزە، ئەو ناتوانێ خۆی بەسەر پشتی وڵاخەکەیەوە بگرێ ( ئایا من لە جیاتی حەج بکەم)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە جیاتی حەج بکە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّيْخَ الْكَبِيرَ إِذَا اسْتَفَادَ مَالًا بَعْدَ كِبَرِ السِّنِّ وَهُوَ غَنِيٌّ، أَوِ اسْتَفَادَ مَالًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ كَانَ فَرْضُ الْحَجِّ وَاجِبًا عَلَيْهِ وَإِنْ كَانَ غَيْرَ مُسْتَطِيعٍ أَنْ يَحُجَّ بِنَفْسِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاسْتِطَاعَةَ كَمَا قَالَهُ مُطَّلِبِيُّنَا رَحِمَهُ اللَّهُ اسْتِطَاعَتَانِ إِحْدَاهُمَا بِبَدَنِهِ مَعَ مِلْكِ مَالِهِ، يُمْكِنُهُ الْحَجُّ عَنْ نَفْسِهِ وَمَالِهِ، وَالثَّانِيَةُ بِمِلْكِ مَالِهِ، يَحُجُّ عَنْ نَفْسِهِ غَيْرُهُ، كَمَا تَقُولُ الْعَرَبُ: أَنَا مُسْتَطِيعٌ أَنْ أَبْنِيَ دَارِي وَأَخِيطَ ثَوْبِي، يُرِيدُ بِالْأُجْرَةِ أَوْ لِمَنْ يُطِيعُنِي وَإِنْ كَانَ غَيْرَ مُسْتَطِيعٍ لِبِنَاءِ الدَّارِ وَخِيَاطَةِ الثَّوْبِ بِنَفْسِهِ

**٣٠٣١-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمٍ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ بِيَدِهِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ[1].

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پیاوی پیر و بەساڵاچوو ئەگەر دوای پیربوونی ماڵ و سامانی هەبوو ئەوە حەج فەرز دەبێت لەسەری، ئەگەرچی توانایشی نەبێت بە نەفسی خۆی حەج بکات، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی توانا دوو جۆرە وەکوو موتەلیبی ڕەحمەتی خوای لێ بێت (کە ئیمام شافیعییە) وتوویەتی: یەکەمیان: بە جەستەیەتی لەگەڵ ئەوەی ماڵ و سامانی هەبێت بتوانێت بەنەفس و ماڵی حەج بکات، دووەم: تەنها بە ماڵ و سامانی هەبێت، کەسێکی دیکە جگە لەخۆی حەجی بۆ بکات، وەکوو عەرەب دەڵێ: من دەتوانم خانووەکەم دروست بکەمەوە و جلەکەم بدوورم، مەبەستی پێی بە کرێکار دەتوانم، یان ئەو کەسەی بەگوێم دەکات، ئەگەرچی نەشتوانێ بەدەستی خۆی خانووەکە بونیاد بنێت و جلەکەیشی بدوورێ**

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ هەواڵی پێ دا وتی: فەزلی کوڕی عەباس لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو بەسەر وڵاخەکە، ئافرەتێك لە هۆزی خەثعەم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ دەکرد، لەو کاتەدا فەزل تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ڕووی فەزلی وەرچەرخاند بەلایەکی دیکەدا، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم پیاوێکی بەساڵاچووە حەجی لەسەر فەڕزە، ناتوانێ خۆی بەسەر پشتی وڵاخەکەوە بگرێ، ئایا لە جیاتی حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش لە حەجیماڵئاواییدا بوو.

**٣٠٣٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ خَثْعَمٍ سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَدَاةَ النَّحْرِ، وَالْفَضْلُ رِدْفُهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْتَمْسِكَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، هَلْ تَرَى أَنْ أَحُجَّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك لە هۆزی خەثعەم سەرلەبەیانی جەژن پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەزلیش لە پشتیەوە بوو بەسەر وڵاخەکە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان خوا حەجی فەڕز کردووە لەسەر بەندەکانی، باوکیشم پیاوێکی بەساڵاچووە خۆی بەسەر پشتی وڵاخەکەوە ناگرێ، ئایا پێت وایە لە جیاتی حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ حَجِّ الْمَرْأَةِ عَنِ الرَّجُلِ

**٣٠٣٣-** عَنِ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمٍ تَسْتَفْتِيهِ قَالَ: فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ قَالَ: فَجَعَلَ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ بِيَدِهِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ» وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ[1].

### باسی حەجکردنی ئافرەت لە جیاتی پیاو

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عەباس ﵄ هەواڵی پێ دا وتی: فەزلی کوڕی عەباس لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو بەسەر وڵاخەکە، ئافرەتێك لە هۆزی خەثعەم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ دەکرد، وتی: لەو کاتەدا فەزل تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی دەکرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ڕووی فەزلی وەرچەرخاند بەلایەکی دیکەدا، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەرز بووە، زۆر پیرە و خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا من لە جیاتی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ. ئەوەش لە حەجیماڵئاواییدا بوو.

## بَابُ الْحَجِّ عَنِ الْمَيِّتِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ عَلَى أَصْلِنَا

**٣٠٣٤-** عَن مُوسَى بْنُ سَلَمَةَ الْهُذَلِيُّ قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَسِنَانُ بْنُ سَلَمَةَ، مُعْتَمِرَيْنِ، فَلَمَّا نَزَلْنَا الْبَطْحَاءَ قُلْتُ: انْطَلِقْ إِلَى ابْنِ الْعَبَّاسِ ﵄ نَتَحَدَّثْ إِلَيْهِ قَالَ: قُلْتُ: يَعْنِي لِابْنِ عَبَّاسٍ إِنَّ وَالِدَةً لِي بِالْمِصْرِ، وَإِنِّي أَغْزُو فِي هَذِهِ الْمَغَازِي أَفَيُجْزِئُ عَنْهَا أَنْ أُعْتِقَ، وَلَيْسَتْ مَعِي؟ قَالَ: أَفَلَا أُنَبِّئُكَ بِأَعْجَبَ مِنْ ذَلِكَ أَمَرَتْ امْرَأَةَ سِنَانِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْجُهَنِيِّ أَنْ تَسْأَلَ لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَّ أُمَّهَا مَاتَتْ، وَمَا تَحُجُّ أَمَا تُجْزِئُ عَنْ أُمِّهَا أَنْ تَحُجَّ عَنْهَا قَالَ: «نَعَمْ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّهَا دَيْنٌ قَضَتْهُ عَنْهَا أَلَمْ يَكُنْ يُجْزِئُ عَنْهَا فَلْتَحُجَّ عَنْ أُمِّهَا»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی حەجکردن لە جیاتی مردوو، بەباسکردنی فەرموودەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك شیکراوە و ڕوون (مُفَسَّر)، بەپێی بنچینەکانی ئێمە (بۆ لێکدانەوەی فەرموودە)

واتە: موسای کوڕی سەلەمەی هوزەلی دەڵێ: من و سینانی کوڕی سەلەمە دەرچووین بەنییەتی عومرەکردن، کاتێ گەیشتینە (الْبَطْحَاءِ) (جێگایەکی نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە کە لە نێوان مەککە و مینادایە)، وتم: بچۆ با بڕۆین بۆ لای ئیبنو عەباس ﵄ قسەوباسی لەگەڵ بکەین، (کاتێ کە گەیشتە لای) وتی: بە ئیبنو عەباسم وت: دایکم لە میصرە، منیش لەم جەنگانەدا غەزا دەکەم (هەندێ جار کۆیلەم دەست دەکەوێ) ئایا دەتوانم لە جیاتی ئەو بەندە ئازاد بکەم لە کاتێکدا دایکم لەلام نییە؟ وتی: ئایا شتێکت بۆ باس نەکەم لەوە سەرسووڕهێنەرتر بێت، بە خێزانی سینانی کوڕی عەبدوڵای جوهەنیم وت: پرسیارم بۆ بکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ، دایکی مردووە و حەجی نەکردووە ئایا دروستە لە جیاتی دایکی حەج بکات، فەرمووی: بەڵێ، ئایا ئەگەر دایکی قەرزێکی لەسەر بووایە قەرزەکەی بۆی نەدەدایەوە، قەرزدانەوەکەش بەبری ئەو نەدەکەوت؟ با لە جیاتی دایکی حەج بکات.

**٣٠٣٥**- عَنْ مُوسَى بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ قَالَ: فُلَانٌ الْجُهَنِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي مَاتَ، وَهُوَ شَيْخٌ كَبِيرٌ لَمْ يَحُجَّ أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ قَالَ: «حُجَّ عَنْ أَبِيكَ»[1].

واتە: موسای کوڕی سەلەمە دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەباس بوو ﵄ دەیوت: فڵانە کەسی جوهەنی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی باوکم کۆچی دوایی کرد، پیاوێکی پیر و بەساڵاچوو بوو، حەجیشی نەکردبوو، یان نەیدەتوانی حەج بکات، فەرمووی: لە جیاتی باوکت حەج بکە.

---

(١) صحيح.

**بَابُ الْحَجِّ عَمَّنْ يَجِبُ عَلَيْهِ الْحَجُّ بِالْإِسْلَامِ، أَوْ مِلْكِ الْمَالِ، أَوْ هُمَا وَهُوَ غَيْرُ مُسْتَطِيعٍ لِلْحَجِّ بِبَدَنِهِ مِنَ الْكِبَرِ، وَالْفَرْقُ بَيْنَ الْعَاجِزِ عَنِ الْحَجِّ بِبَدَنِهِ لِكِبَرِ السِّنِّ وَبَيْنَ الْعَاجِزِ عَنِ الْحَجِّ لِمَرَضٍ قَدْ يُرْجَى لَهُ الْبُرْءُ إِذِ الْعَاجِزُ لِكِبَرِ السِّنِّ لَا يَحْدُثُ لَهُ شَبَابٌ وَقُوَّةٌ بَعْدُ، وَالْمَرِيضُ قَدْ يَصِحُّ مِنْ مَرَضِهِ بِإِذْنِ اللَّهِ**

**٣٠٣٦-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمٍ تَسْتَفْتِيهِ فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ[1].

**باسی حەج واجب دەبێت لەسەر ئەکەسەی مسوڵمانە و ماڵ و سامانی هەیە، بەڵام بەهۆی پیری و بەساڵاچوونەوە ناتوانێ حەج بکات، وە جیاوازی لە نێوان ئەو کەسەی بەهۆی پیربوونەوە ناتوانێ بە جەستەی حەج بکات، وە لە نێوان ئەو کەسەی بەهۆی نەخۆشییەوە ناتوانێت حەج بکات، ئەوەیە: ئەو کەسەی کە پیر بووە و پەکی کەوتووە ئومێدی ئەوەی لێ ناکری دوای ئەوە گەنج ببێتەوە و بەهێز بێت، بەڵام ئەو کەسەی نەخۆشە دەنگونجێ بە ویستی خوا لە نەخۆشییەکەی چاك ببێتەوە**

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، ئیبنو عەباس ﵄ وتی: فەزلی کوڕی عەباس لەپشت پێغەمبەر ﷺ بوو بەسەر وڵاخەکە، ئافرەتێك لە هۆزی خەثعەم هات بۆ لای پرسیاری لێ دەکرد، لەو کاتەدا فەزل تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئافرەتەکەش تەماشای ئەوی دەکرد، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی فەزلی وەرچەرخاند بەلایەکی دیکەدا، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەج فەڕزی خوایە لەسەر بەندەکانی، لەسەر باوکیشم فەڕز بووە، زۆر پیرە و خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا من لە جیاتی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ. ئەوەش لە حەجی ماڵئاواییدا بوو.

---

(١) صحيح.

## بَابُ حَجِّ الرَّجُلِ عَنِ الْمَرْأَةِ الَّتِي لَا تَسْتَطِيعُ الْحَجَّ مِنَ الْكِبَرِ بِمِثْلِ اللَّفْظَةِ الَّتِي ذَكَرْتُ أَنَّهَا مُجْمَلَةٌ غَيْرُ مُفَسَّرَةٍ

**٣٠٣٧-** عَنِ الْحَسَنِ ﷺ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ أَدْرَكَ الْإِسْلَامَ، وَلَمْ يَحُجَّ وَلَا يَسْتَمْسِكُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، وَإِنْ شَدَدْتُهُ بِالْحَبْلِ عَلَى الرَّاحِلَةِ خَشِيتُ أَنْ أَقْتُلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «احْجُجْ عَنْ أَبِيكَ»[١].

## باسی حەجکردنی پیاو لەجیاتی ئافرەت کە نەتوانێت حەج بکات بەهۆی پیربوونیەوە، بەهەمان ئەو دەستەواژەی کە باسم کرد، فەرموودەیەکی کورت و ناڕوونە (مُجْمَلَةٌ) نەك شیکراوە و ڕوون (مُفَسَّرَة)

واتە: حەسەن ﷺ دەڵێ: هەواڵم پێ گەیشتوە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: بەڕاستی باوکم پیاوێکی بەساڵاچووە و مسوڵمان بووە، حەجیشی نەکردووە، لەسەر وشتر خۆی ڕاناگرێ، ئەگەر لەسەر وشترەکەم بە پەت ببیەستمەوە دەترسم بیکوژم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە جیاتی باوکت حەج بکە.

**٣٠٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِ ذَلِكَ إِلَّا أَنَّهُ قَالَ السَّائِلُ سَأَلَ عَنْ أُمِّهِ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەهەمان شێوە ئەوە نەبێت پرسیاکەرەکە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی حەج بۆ دایکی.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ أَنْ يَحُجَّ عَنِ الْمَيِّتِ مَنْ لَمْ يَحُجَّ عَنْ نَفْسِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَخْبَارَ الَّتِي ذَكَرْتُ فِي أَنَّهَا مُجْمَلَةٌ غَيْرُ مُفَسَّرَةٍ عَلَى مَا ذَكَرْتُ، إِذْ لَيْسَ فِي تِلْكَ الْأَخْبَارِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَأَلَ مَنْ أَمَرَهُ أَنْ يَحُجَّ عَنْ غَيْرِهَا هَلْ حَجَّ عَنْ نَفْسِهِ أَمْ لَا؟ هَذَا الْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ مَنْ قَدْ حَجَّ عَنْ نَفْسِهِ أَنْ يَحُجَّ عَنْ غَيْرِهِ، لَا مَنْ لَمْ يَحُجَّ عَنْ نَفْسِهِ

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

**٣٠٣٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَمِعَ رَجُلًا يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ، فَقَالَ: «مَنْ شُبْرُمَةُ؟»، فَقَالَ: أَخِي أَوْ قَرِيبٌ لِي قَالَ: «هَلْ حَجَجْتَ؟» قَالَ: لَا قَالَ: «فَاجْعَلْ هَذِهِ عَنْكَ، ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ بَانَ أَنَّ الْمُلَبِّيَ عَنْ غَيْرِهِ إِذَا لَمْ يَكُنْ قَدْ حَجَّ عَنْ نَفْسِهِ عَلَيْهِ أَنْ يَجْعَلَ تِلْكَ الْحَجَّةَ عَنْ نَفْسِهِ.

## باسی نەهیكردن لەوەی كەسێك حەج بۆ مردوو بكات لە كاتێكدا حەجی بۆ خۆی نەكردبوو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو فەرموودانەی كە باسم كردن كورت و نارِوونن (مُجْمَلَةٌ) نەك شیكراوە و ڕوون (مُفَسَّرَة)، چونكە لەو فەرموودانەدا ئەوە نەهاتووە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری كردبێت دەربارەی حاڵی ئەو كەسەی حەج بۆ كەسێكی دیكە دەكات، ئایا پێشتر حەجی بۆ خۆی كردووە یان نا؟ ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بەو كەسەی كە حەجی خۆی كردووە، حەجیش بۆ غەیری خۆی بكات، نەك ئەو كەسەی كە حەجی بۆ خۆی نەكردووە

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو (لە كاتی حەجدا) دەیوت: پەیڕەوی و ملكەچیت دەكەم لەجیاتی شوبرومە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شوبرومە كێیە؟ وتی: برایەكمە، یا كەسێكی نزیكمە، فەرمووی: ئایا حەجت بۆ خۆت كردووە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ئەم حەجە بۆ خۆت بكە پاشان لەجیاتی شوبرومە حەج بكە.

ئەبو بەكر دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا ڕوون بووەتەوە ئەو كەسەی لە جیاتی غەیری خۆی تەلبیەی حەج دەكات ئەگەر پێشتر حەجی بۆ خۆی نەكردبوو، ئەوە پێویستە ئەو حەجە بۆ خۆی بكات.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْعُمْرَةِ عَنِ الَّذِي لَا يَسْتَطِيعُ الْعُمْرَةَ مِنَ الْكِبَرِ

**٣٠٤٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ أَوْسٍ يُحَدِّثُ عَنِ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ وَلَا الظَّعْنَ قَالَ: «حُجَّ عَنْ أَبِيكَ وَاعْتَمِرْ»[١].

## باسی عومرەکردن لەجیاتی ئەو کەسەی بە هۆی پیربوون و بەساڵاچوونەوە ناتوانێت عومرە بکات

واتە: عەمری کوڕی ئەوس دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ڕەزینەوە ﷺ ئەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم پیاوێکی گەورە و بەساڵاچووە، ناتوانێ حەج یان عومرە بکات، هەروەها ناتوانێ سواری وڵاخیش بێت، فەرمووی: لەجیاتی باوکت حەج بکە، وە عومرەش بکە.

## بَابُ النَّذْرِ بِالْحَجِّ ثُمَّ يَحْدُثُ الْمَوْتُ قَبْلَ وَفَائِهِ، وَالْأَمْرِ بِقَضَائِهِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ لِتَشْبِيهِ النَّبِيِّ ﷺ نَذْرَ الْحَجِّ بِالدَّيْنِ

**٣٠٤١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ امْرَأَةً نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَمَاتَتْ، فَأَتَى أَخُوهَا النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى أُخْتِكَ دَيْنٌ، أَكُنْتَ قَاضِيَهُ؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: «فَاقْضُوا اللَّهَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ»[٢].

**باسی نەزرکردن بەوەی حەج بکات پاشان پێش حەجکردنی بمرێت، وە فەرمانکردن بە دانەوەی حەجەکە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خەرجی حەجەکە لە هەموو ماڵەکەی دەردەکرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەزرکردنی حەجی شوبهاندووە بە قەرز**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك نەزری کردبوو حەج بکات، دواتر مرد (پێش ئەوەی حەج بکات)، براکەی هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد (کە ئایا دەتوانێ لە جیاتی ئەو حەج بکات)؟ فەرمووی: هەواڵم بدەرێ ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەر بووایە دەتدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: کەواتە قەرزی خوا بدەنەوە، خوا شایستەترە قەرزەکانی بدرێنەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَجَّ الْوَاجِبَ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ لَا مِنَ الثُّلُثِ

**٣٠٤٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ امرأةً مِن خَثعَم سألتْ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ الحديث، مِثْلَهُ، وَزَادَ: فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَهَلْ يَنْفَعُهُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: «نَعَمْ، كَمَا لَوْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَقَضَيْتِيهِ، نَفَعَهُ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی حەجی فەرز لە هەموو ماڵ و سامانی مردووەکەیە نەك سێیەکی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك لە هۆزی خەثعەم پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، دواتر فەرموودەکەی باس کرد، هەروەکو فەرموودەکەی پێشوو، ئەوەیشی زیاد کرد، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەو (حەجە) سوودی پێ دەگەیەنێ، فەرمووی: بەڵێ، وەکوو چۆن قەرزدار بێت قەرزەکەی بدەیتەوە، سوودی پێ دەگەیەنێ.

## بَابُ النَّذْرِ بِالْحَجِّ مَاشِيًا فَيَعْجِزُ النَّاذِرُ عَنِ الْمَشْيِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى

**٣٠٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَدْرَكَ شَيْخًا كَبِيرًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ يَتَوَكَّأُ عَلَيْهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا شَأْنُ هَذَا الشَّيْخِ؟» فَقَالَ ابْنَاهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَانَ عَلَيْهِ نَذْرٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْكَبْ أَيُّهَا الشَّيْخُ؛ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكَ وَعَنْ نَذْرِكَ»[2].

## باسی نەزرکردن بۆ حەج بەپیادە، دواتر نەزرکەر لە ڕێکردن بەپیادە پەکی بکەوێت، بەباسکردنی فەرموودەیەکی کورتکراوە نەك تێروتەسەل

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی پیری بەساڵاچووی بینی خۆی دابوو بەسەر شانی هەردوو کوڕەکەیدا، فەرمووی: ئەو پیاوە چییەتی؟ کوڕەکانی وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا نەزری کردووە (بەپیادە حەج بکات)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سواربە ئەی پیاوی پیر، چونکە خوا ﷻ بێنیازە لە تۆ و لە نەزرەکەیشت.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

**٣٠٤٤-** عَنْ أَنَسٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى شَيْخًا كَبِيرًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا هَذَا؟». قَالوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى الْبَيْتِ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ». قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ[1].

**واتە:** ئەنەس  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێکی پیری بەساڵاچووی بینی خۆی دابوو بەسەر شانی هەردوو کوڕەکەیدا، فەرمووی: ئەوە چییە؟ وتیان: نەزری کردووە بەپیادە حەج بکات، فەرمووی: خوا ﷻ بێنیازە لەوەی ئەم بەندەیە سزای نەفسی خۆی بدات. وتی: فەرمانی پێ کرد سواری وڵاخ بێت.

## بَابُ هَدْيِ النَّاذِرِ بِالْحَجِّ مَاشِيًا فَيَعْجِزُ عَنِ الْمَشْيِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى الْخَبَرَيْنِ اللَّذَيْنِ ذَكَرْتُهُمَا فِي الْبَابِ قَبْلُ، مُخْتَصَرَيْنِ عَلَى مَا ذَكَرْتُ

**٣٠٤٥-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ أُخْتِهِ نَذَرَتْ أَنْ تَمْشِيَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْ نَذْرِ أُخْتِكَ، لِتَرْكَبْ، وَلْتَهْدِ بَدَنَةً»[2].

## باسی ئەو کەسەی نەزری کردووە بەپیادە بچێت بۆ حەج، بەڵام توانای ڕێکردنی نەبێت، ئەوە دەبێ شتێك بکات بە هەدی و قوربانی لە مەککە سەر ببڕێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو دوو فەرموودەی باسمان کرد لە بەشەکەی پێشوو کورتکراوەن

**واتە:** عوقبەی کوڕی عامر  دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی خوشکەکەی نەزری کردبوو بەپیادە بچێت بۆ کەعبە، فەرمووی: بەڕاستی خوا ﷻ بێنیازە لە نەزرکردنی خوشکەکەت (لە خۆئەزیەتدانەکەی)، با سواری وڵاخ بێت و وشترێك بکات بە هەدی (واتە: ئاژەڵێك لە مەککە سەر ببڕێت).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## بَابُ الْيَمِينِ بِالْمَشْيِ إِلَى الْكَعْبَةِ فَيَعْجِزُ الْحَالِفُ عَنِ الْمَشْيِ

**٣٠٤٦-** عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ فِي الرَّجُلِ يَحْلِفُ بِالْمَشْيِ، فَيَعْجِزُ فَيَرْكَبُ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ يَحُجُّ مِنْ قَابِلٍ فَيَرْكَبُ مَا شَاءَ، وَيَمْشِي مَا شَاءَ، وَيَرْكَبُ. قَالَ شَرِيكٌ وَثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ مَوْلَى أَبِي طَلْحَةَ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «تَرْكَبُ، وَتُكَفِّرُ يَمِينَهَا»[١].

## باسی حوکمی ئەو کەسەی سوێند دەخوات بەپیادە بچێت بۆ کەعبە، دواتر ناتوانێت بەپیادە بچێت

واتە: شەریك دەگێڕێتەوە، لە ئەبو ئیسحاقەوە (پرسیاری لێ کرا) دەربارەی پیاوێك سوێند بخوات بەپیادە بچێت بۆ کەعبە، دواتر پەکی بکەویت نەتوانێت، ئینجا سواری وڵاخ ببێت؟ وتی: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: لەساڵی داهاتوو حەج بکات و بەویستی خۆی سواری وڵاخ ببێت و بەویستی خۆی ڕێ بکات و سواری وڵاخ ببێت. شەریك وتی: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی مەولای ئەبو تەڵحە بۆی باس کردین، لە کوڕەیب لە ئیبنو عەباسەوە ڕەفعی کردووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو فەرموویەتی: با سواری وڵاخ ببێت و کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

**٣٠٤٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَجُلًا، جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ أُخْتِي جَعَلَتْ عَلَيْهَا الْمَشْيَ إِلَى الْبَيْتِ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَصْنَعُ بِشَقَاءِ أُخْتِكَ شَيْئًا، قُلْ لَهَا فَلْتَحُجَّ رَاكِبَةً، وَلْتُكَفِّرْ يَمِينَهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وتی: خوشکەکەم پێویستی کردووە لەسەر خۆی بەپیادە بچێت بۆ کەعبە، فەرمووی: خوا ﷻ نایەوێت خوشکەکەت خۆی ماندوو بکات و خۆی بپروکێنێ، پێی بڵێ با بەسواری حەج بکات و کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ إِسْقَاطِ فَرْضِ الْحَجِّ عَنِ الصَّبِيِّ قَبْلَ الْبُلُوغِ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ

**٣٠٤٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: مَرَّ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ بِمَجْنُونَةِ بَنِي فُلَانٍ قَدْ زَنَتْ، أَمَرَ عُمَرُ بِرَجْمِهَا فَرَدَّهَا عَلِيٌّ، وَقَالَ لِعُمَرَ: يَا أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ أَتَرْجِمُ هَذِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: أَمَا تَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ عَنِ الْمَجْنُونِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ وَعَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ»: قَالَ: صَدَقْتَ فَخَلَّى عَنْهَا[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِيهِ دَلِيلٌ عِنْدِي عَلَى أَنَّ الْمَجْنُونَ إِذَا حُجَّ بِهِ فِي حَالِ جُنُونِهِ ثُمَّ أَفَاقَ لَمْ يُجْزِهُ كَالصَّبِيِّ.

## باسی ئەگەر منداڵ پێش باڵغبوون حەجی پێ بکرێ فەرزی حەجی لەسەر هەڵناگیرێ، هەروەها شێتیش تا چاك دەبێتەوە

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو تالیب تێ پەڕی بەلای ئافرەتێکی شێت لە نەوەکانی فڵان زینای کردبوو، عومەر فەرمانی کرد بە بەردبارانکردنی، عەلی ڕەتی کردەوە و بە عومەری وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا ئەمە ڕەجم دەکەی؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەی نازانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: لەسەر شێتێك عەقڵی لەدەست دابێت، وە لەسەر خەوتوو هەتا هەڵدەستێ، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵغ دەبێت. وتی: ڕاستت کرد، پاشان وازی لێی هێنا.

ئەبو بەکر دەڵێ: بەڵگەی تێدایە لەلای من ئەگەر شێت حەجی پێ کرا لە کاتێ شێتبوونیدا، پاشان چاك بۆیەوە، ئەوە فەرزی حەجەکەی لەسەر هەڵناگیرێ، هەر وەکوو حەجپێکردنی منداڵ وایە.

## بَابُ ذِكْرِ حَجِّ الصِّبْيَانِ قَبْلَ الْبُلُوغِ عَلَى غَيْرِ الْوُجُوبِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ»، أَرَادَ الْقَلَمَ مِمَّا يَكُونُ إِثْمًا وَوِزْرًا عَلَى الْبَالِغِ إِذَا ارْتَكَبَهُ، لَا أَنَّ الْقَلَمَ مَرْفُوعٌ عَنْ كِتَابَةِ الْحَسَنَاتِ لِلصَّبِيِّ إِذَا عَمِلَهَا

---

(١) صحيح.

**٣٠٤٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَدَرَ مِنْ مَكَّةَ، فَلَمَّا كَانَ بِالرَّوْحَاءِ اسْتَقْبَلَهُ رَكْبٌ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: مَنِ الْقَوْمُ؟ قَالَ: الْمُسْلِمُونَ، فَمَنْ أَنْتُمْ؟ فَقَالَ: «رَسُولُ اللَّهِ»، فَفَزِعَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُمْ فَرَفَعَتْ صَبِيًّا لَهَا مِنْ مَحَفٍّ، فَأَخَذَتْ بِعَضُدِهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ لِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: «وَلَكِ أَجْرُهُ»[1].

**باسی حەجپێکردنی منداڵان پێش باڵغبون بەبێ ئەوەی واجب بێت لەسەریان، وە بەڵگەش لەسەر فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ)، واتە: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس. مەبەستی قەڵەم لەسەر ئەو شتە هەڵگیراوە کە گوناهە و منداڵ ئەنجامی ئەدات، نەك قەڵەم هەڵگیرابێت لە نووسینی کردەوە چاکەکانی منداڵ ئەگەر ئەنجامی دا**

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ (لە یەکێك لە گەشتەکانیدا) لە مەککە دەرچوو کاتێك گەیشتە ڕەوحاء کاروانییەك ڕووبەڕووی هات، سڵاوی لێ کردن و فەرمووی: ئەم قەومە کێن؟ وتیان: مسوڵمانانین، ئەی ئێوە کێن؟ فەرمووی: پێغەمبەری خوایە، ئافرەتێك لەنێویاندا منداڵێکی بەرز کردەوە لەنێو بوخچەیەکدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەمە حەجی لەسەرە؟ فەرمووی: تۆش پاداشتت بۆ هەیە.

## بَابُ الصَّبِيِّ يَحُجُّ قَبْلَ الْبُلُوغِ ثُمَّ يَبْلُغُ

**٣٠٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا حَجَّ الصَّبِيُّ فَهِيَ لَهُ حَجَّةٌ حَتَّى يَعْقِلَ، فَإِذَا عَقَلَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى، وَإِذَا حَجَّ الْأَعْرَابِيُّ فَهِيَ لَهُ حَجَّةٌ، فَإِذَا هَاجَرَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى»[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ، وَإِذَا حَجَّ الْأَعْرَابِيُّ مِنَ الْجِنْسِ الَّتِي كُنْتُ أَقُولُ إِنَّهُ فِي بَعْضِ الْأَوْقَاتِ دُونَ جَمِيعِ الْأَوْقَاتِ، وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ إِنْ صَحَّتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَإِنَّمَا كَانَ هَذَا الْحُكْمُ قَبْلَ فَتْحِ النَّبِيِّ ﷺ مَكَّةَ، فَلَمَّا فَتَحَهَا، وَخَبَّرَ ﷺ أَنَّهُ لَا هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ اسْتَوَى الْأَعْرَابِيُّ وَالْمُهَاجِرُ فِي الْحَجِّ، فَجَازَ عَنِ الْأَعْرَابِيِّ إِذَا حَجَّ كَمَا يَجُوزُ عَنِ الْمُهَاجِرِ لِسُقُوطِ الْهِجْرَةِ، وَبُطْلَانِهَا بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی منداڵ حەج بکات پێش باڵغبوون، پاشان باڵغ بێت

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر منداڵێ حەجی کرد ئەوە دەبێتە حەج بۆی تا عاقڵ دەبێت، کاتێکیش عاقڵ بوو ئەوە حەجێکی دیکەی لەسەر پێویست دەبێت، وە ئەگەر دەشتەکییەك حەجی کرد ئەوە بۆی دەبێت بە حەجێك، کاتێکیش هیجرەتی کرد حەجێکی دیکەی لەسەر پێویست دەبێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: ئەگەر دەشتەکی حەجی کرد. لەو شێوازەیە کە من دەڵێم: ئەوە بۆ هەندێ کاتە نەك هەموو کاتەکان، ئەم فەرموودەیە ئەگەر فەرموودەیەکی تەواو (صەحیح) بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەوە ئەم حوکمە بۆ پێش ئازادکردنی مەککە بووە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، کاتێ مەککەی ئازاد کرد، وە هەواڵی دا: دوای ئازادکردنی مەککە هیجرەت نەما، ئەوە حوکمی دەشتەکی و موهاجیر بۆ حەج وەکوو یەکی لێ هات، جا ئەگەر دەشتەکی حەجی کرد وەکوو حەجکردنی کەسێکی موهاجیر وایە، بەهۆی ئەوەی دوای ئازادکردنی مەککە هیجرەت نەما و پووچ بۆیەوە.

## بَابُ حَجِّ الْأَكْرِيَاءِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَكْرَ الْمَرْءِ نَفْسَهُ فِي الْعَمَلِ طَلْقٌ مُبَاحٌ، إِذْ هُوَ مِنِ ابْتِغَاءِ فَضْلِ اللَّهِ لِأَخْذِهِ الْأُجْرَةَ عَلَى ذَلِكَ

**٣٠٥١-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ التَّيْمِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ ﷺ: إِنَّا قَوْمٌ نُكْرِي فِي هَذِهِ الْوَجْهِ، وَإِنَّ قَوْمِي يَزْعُمُونَ أَنَّهُ لَا حَجَّ لَنَا، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَلَسْتُمْ تَطُوفُونَ بِالْبَيْتِ؟ أَلَسْتُمْ تَسْعَوْنَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ؟ أَلَسْتُمْ أَلَسْتُمْ، إِنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلَهُ مِثْلَ مَا سَأَلْتَنِي فَلَمْ يَدْرِ مَا يَرُدُّ عَلَيْهِ حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴿١٩٨﴾ ﴾ البقرة، فَدَعَاهُ فَتَلَاهَا عَلَيْهِ، وَقَالَ: «أَنْتُمْ حُجَّاجٌ»[1].

---

(١) صحيح.

## باسی حەجکردنی ئەو کەسانەی کە بەکرێ ئیش دەکەن، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئیشکردن بەکرێ لە ساڵی حەجدا و حەجکردن لەگەڵ ئیشەکەیدا ڕێگەپێدراوە، چونکە ئەوە جۆرێکە لە گەڕان بە دوای فەزلی خوا ﷻ

واتە: ئەبو ئومامەی تەمیمی دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم ﷺ وت: ئێمە کۆمەڵێکین بەکرێ ئیش دەکەین (واتە: لە ساڵی حەجدا) هۆزەکەم پێی وایە ئێمە حەجمان بۆ نییە (چونکە پێیان وا بوو هەر کەس بۆ ئیشوکاری خۆی و بازرگانی بچێت حەجی بۆ حیساب نییە)، ئیبنو عومەر وتی: ئایا تەوافی کەعبە ناکەن؟ ئایا هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوە ناکەن؟ ئایا ئەوە و ئەوە ناکەن، پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد وەکوو چۆن تۆ پرسیارت لێم کرد، نەیزانی چۆن وڵامی بداتەوە تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡۚ ﴿١٩٨﴾ ﴾، واتە: هیچ تاوانتان لەسەر نییە کە ئەگەر لەگەڵ حەجکردنەکەیشدا کەسێك شت بکڕێت و بازرگانی بکات و بەدوای ڕزق و ڕۆزی و فەزڵی خوادا بگەڕێت. پاشان بانگی کرد و ئایەتەکەی بەسەریدا خوێندەوە و فەرمووی: ئێوە لەوانەن کە حەج دەکەن.

**٣٠٥٢-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ التَّمِيمِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ[١].

واتە: ئەبو ئومامەی تەمیمی دەڵێ: بە ئیبنو عومەرم ﷺ وت، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشووی باس کرد.

## بَابُ حَجِّ الْأُجَرَاءِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَجِيرَ إِذَا أَجَّرَ نَفْسَهُ بِكَذَا، وَحَجَّ عَنْ نَفْسِهِ كَانَتْ لَهُ الْأُجْرَةُ عَلَى مُسْتَأْجِرِهِ، وَأَدَاءُ الْفَرْضِ عَنْ نَفْسِهِ جَائِزٌ

**٣٠٥٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَجَّرْتُ نَفْسِي مِنْ قَوْمٍ فَتَرَكْتُ لَهُمْ بَعْضَ أُجْرَتِي أَوْ أَجْرِي لَوْ يُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ الْمَنَاسِكِ، فَهَلْ يُجْزِئُ ذَلِكَ عَنِّي؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَعَمْ هَذَا مِنَ الَّذِينَ قَالَ اللَّهُ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾ ﴾ البقرة[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی حەجکردنی ئەو کەسانەی بەکرێ کار دەکەن، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کرێکار ئەگەر کرێکاری بە بڕێکی دیاری کراو کرد، وە حەجیشی بۆ خۆی کرد ئەوە پێویستە لەسەر خاوەن کار کرێیەکەی پێ بدات،وە ئەنجامدانی فەریزەی حەجی بۆ دروستە**

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای ئیبنو عەباس ﷺ وتی: من بەکرێ ئیشم بۆ قەومێك کرد، وازم لە هەندێ لە کرێیەکەم هێنا لەبەر ئەوەی ڕێگەم بدەن حەج بکەم و دروشمەکان ئەنجام بدەم، ئایا ئەوە دروستە بۆم؟ ئیبنو عەباس وتی: بەڵێ ئەوە لەو کەسانەیە کە خوا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾﴾، واتە: ئەوانە بەشی خۆیان هەیە لەوەی کە بەدەستیان خستووە، وە خوای گەورە حیساب و لێپرسینەوەی زۆر خێرایە.

**بَابُ إِبَاحَةِ التِّجَارَةِ فِي الْحَجِّ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاشْتِغَالَ بِمَا أَبَاحَ اللَّهُ مِنْ طَلَبِ الْمَالِ مِنْ حِلِّهِ أَيَّامَ الْمَوْسِمِ فِي غَيْرِ الْأَوْقَاتِ الَّذِي يَشْتَغِلُ الْمَرْءُ عَنْ أَدَاءِ الْمَنَاسِكِ لَا يَنْقُصُ أَجْرَ الْحَاجِّ، وَلَا يُبْطِلُ الْحَجَّ، وَلَا يُوجِبُ عَلَيْهِ هَدْيًا وَلَا صَوْمًا وَلَا صَدَقَةً**

**٣٠٥٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّاسَ كَانُوا فِي أَوَّلِ الْحَجِّ يَبْتَاعُونَ بِمِنًى وَعَرَفَةَ وَسُوقِ ذِي الْمَجَازِ وَمَوَاسِمِ الْحَجِّ، فَخَافُوا الْبَيْعَ، وَهُمْ حُرُمٌ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ ﴿١٩٨﴾﴾البقرة، فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ، فَحَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ أَنَّهُ كَانَ يَقْرَأُهَا فِي الْمُصْحَفِ[١].

**باسی ڕێگەدراوە بەوەی بازرگانی لە حەجدا بکرێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سەرقاڵبوون بەوەی خوا ڕێگەی پێ داوە لە ماوەی ئیحرامنەبەستنی ڕۆژەکانی حەج جگە لەو ڕۆژانەی مرۆڤ سەرقاڵە بە جێبەجێکردنی ڕێوڕەسمەکانی حەج، هیچ لە پاداشی حاجی کەم ناکاتەوە، حەجەکەیش بەتاڵ ناکاتەوە، هەروەها ئاژەڵی هەدی و ڕۆژوو و خێر و بەخشینی لەسەر واجب ناکات بەهۆی بازرگانییەکەیەوە**

---

(١) صحيح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکانێك هەبوون لە یەکەم حەجدا کڕین و فرۆشتنیان دەکرد لە مینا و عەرەفە و بازاڕی (الْمَجَاز) و (کە بازاڕێك بوو لە عەرەفە) کاتی حەج، لە کاتێدا لە ئیحرامدا بوون، جا ترسان کڕین و فرۆشتن بکەن لە کاتێکدا لە ئیحرامدان، دواتر خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴿١٩٨﴾ ﴾، عوبەیدی کوڕی عومەیر بۆی باس کردم ئەو (فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ )ی لەنێو موصحەفدا دەخوێندەوە.

٣٠٥٥- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ، يَقْرَأُهَا: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ ﴾[1].

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی ئەبو یەزید دەڵێ: گوێم لە ئیبنو زوبەیر بوو ﷺ ئەم ئایەتەی بەو شێوەیە دەخوێندەوە: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ فِي مَوَاسِمِ الْحَجِّ ﴾.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ حِجَجِ النَّبِيِّ ﷺ وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ مَا تَوَهَّمَهُ الْعَامَّةُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَحُجَّ إِلَّا حَجَّةً وَاحِدَةً وَالنَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا حَجَّ حَجَّةً وَاحِدَةً بَعْدَ هِجْرَتِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَأَمَّا مَا قَبْلَ الْهِجْرَةِ فَقَدْ حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ غَيْرَ تِلْكَ الْحَجَّةِ الَّتِي حَجَّهَا مِنَ الْمَدِينَةِ

٣٠٥٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَجَّ ثَلَاثَ حِجَجٍ حَجَّتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُهَاجِرَ، وَحَجَّةً بَعْدَمَا هَاجَرَ مَعَهَا عُمْرَةٌ[2].

## باسی ژمارەی حەجەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵگەش لەسەر دژی ئەوانەی گومانیان وایە پێغەمبەر ﷺ تەنها یەك حەجی کرد، وە پێغەمبەر ﷺ تەنها یەك حەجی کرد دوای کۆچکردنی بۆ مەدینە، بەڵام پێش هیجرەت پێغەمبەر ﷺ جگە لەو حەجەی لە مەدینە کردی حەجیدیکەشی کردووە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ حەجی کرد دوو حەجی پێش هیجرەتکردنی بوو، وە حەجێکیش دوای هیجرەتکردنی بوو لەگەڵیدا عومرەیشی کرد.

---

(١) أخرجه الطبري في تفسيره ٢/٢٨٤.

(٢) هذا حديث غير صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى صِحَّةِ هَذَا الْمَتْنِ وَالْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ حَجَّ قَبْلَ هِجْرَتِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ لَا كَمَا مَنْ طَعَنَ فِي هَذَا الْخَبَرِ، وَادَّعَى أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ لَمْ يَرْوِهِ غَيْرُ زَيْدِ بْنِ الْحُبَابِ

**٣٠٥٧-** عَنْ نَافِع بن جُبَيْرٍ،عن أَبِيهِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ، وَإِنَّهُ لَوَاقِفٌ عَلَى بَعِيرٍ لَهُ بِعَرَفَاتٍ مَعَ النَّاسِ يَدْفَعُ مَعَهُمْ مِنْهَا، مَا ذَاكَ إِلَّا تَوْفِيقًا مِنَ اللَّهِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ يُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ أَرَادَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ:﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ البقرة، أَوْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ جَمِيعُ الْقُرْآنِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ ذَلِكَ.

## باسی بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەو دەقە، وە ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێش هیجرەتکردن بۆ مەدینە حەجی کرد، نەك وەکوو ئەو کەسەی تانە لەو فەرموودە ئەدا، (فەرموودەی ژمارە ٣٠٥٦ ) وە بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو فەرموودەیە کەس نەیگێڕاوەتەوە جگە لە زەیدی کوڕی حوباب (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە)

واتە: نافیعی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پێش ئەوەی دابەزێتە سەری، ئەو لە عەرەفات لەسەر وشترەکەی وەستابوو لەگەڵ خەڵکەکە، لەگەڵیاندا لە عەرەفە بەڕێ دەکەوت، ئەوە تەنها بەیارمەتی خوا بوو، (واتە: بەوەحی نەبوو).

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی: (قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ)، واتە: پێش ئەوەی دابەزێتە سەری، پێ دەچێ مەبەستی پێی: پێش ئەوەی ئەم ئایەتە دابەزێتە سەری: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾، یان پێش ئەوەی قورئان بەگشتی دابەزێتە سەری، وە بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەمە. (تەماشای فەرموودەکەی دواتر بکە).

---

(١) إسناده حسن.

**٣٠٥٨-** أن سلم بن جنادة حدثنا قال حدثنا أبو معاوية عن هشام عن أبيه عن عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيْشٌ، وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، فَلَمَّا جَاءَ الْإِسْلَامُ أَمَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ ﷺ أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ فَيَقِفَ، ثُمَّ يُفِيضُ مِنْهَا قَالَتْ: فَذَلِكَ قَوْلُهُ:﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ البقرة، فَهَذَا الْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّمَا أَمَرَ نَبِيَّهُ ﷺ بِالْوُقُوفِ بِعَرَفَاتٍ، وَمُخَالَفَةِ قُرَيْشٍ فِي وُقُوفِهِمْ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَتَرْكِهِمُ الْخُرُوجَ مِنَ الْحَرَمِ لِتَسْمِيَتِهِمْ أَنْفُسَهُمُ الْحُمْسَ لِهَذِهِ الْآيَةِ:﴿ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ البقرة، أَيْ غَيْرُ قُرَيْشٍ الَّذِينَ كَانُوا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ: إِنَّ اسْمَ النَّاسِ قَدْ يَقَعُ عَلَى بَعْضِهِمْ إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ جَمِيعَ النَّاسِ لَمْ يَقِفُوا بِعَرَفَاتٍ، وَإِنَّمَا وَقَفَ بِعَرَفَاتٍ بَعْضُهُمْ لَا جَمِيعُهُمْ، وَفِي قَوْلِ جُبَيْرٍ مَا كَانَ إِلَّا تَوْفِيقًا مِنَ اللَّهِ لَهُ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُنْ أَمَرَهُ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ بِوَحْيٍ مُنَزَّلٍ عَلَيْهِ بِالْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ إِذْ لَوْ كَانَ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ كَانَ اللَّهُ قَدْ أَمَرَهُ بِالْوَقْفِ بِعَرَفَةَ عِنْدَ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ لَأَشْبَهَ أَنْ يَقُولَ فَعَلِمْتُ أَنَّ اللَّهَ أَمَرَهُ بِذَلِكَ، وَإِنَّمَا قُلْتُ إِنَّهُ جَائِزٌ أَنْ يَكُونَ جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ أَرَادَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ أَيْ جَمِيعُ الْقُرْآنِ؛ لِأَنَّ جَمِيعَ الْقُرْآنِ لَمْ يَنْزِلْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِمَكَّةَ قَبْلَ هِجْرَتِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَإِنَّمَا نَزَلَ عَلَيْهِ بَعْضُ الْقُرْآنِ بِمَكَّةَ قَبْلَ الْهِجْرَةِ بِالْمَدِينَةِ بَعْدَ الْهِجْرَةِ، وَاسْتَدْلَلْتُ بِأَنَّهُ أَرَادَ بِقَوْلِهِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ، جَمِيعَ الْقُرْآنِ لَا أَنَّهُ أَرَادَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ شَيْءٌ مِنَ الْقُرْآنِ[1].

واتە: سەلەمی کوڕی جونادە بۆی باس کردین وتی: ئەبو موعاویە بۆی باس کردین، لە هیشام، لە باوکیەوە، لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: قوڕەیش و ئەوانەی لەسەر ئایینەکەی ئەوان بوون لە موزدەلیفە دەوەستان، جا پێیان دەوت: (الْحُمْسُ) (واتە: قوڕەیش، بۆیە ناو نراون بە (الْحُمْسُ) چونکە بەتوندی دەستیان بە ئایینەکەیانەوە گرتبوو)، بەڵام هەموو عەرەبەکانی دیکە لەسەر عەرەفە دەوەستان، کاتێ کە ئیسلام هات خوا ﷻ فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بچێت بۆ عەرەفات و لەوێ بوەستێ، پاشان لێی دابەزێتە خوارەوە، وتی: ئەویش فەرمایشتی خوایە کە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ بۆیە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد بەوەستان لەسەر عەرەفات و پێچەوانەکردنی قوڕەیش لە وەستانیان لەسەر موزدەلیفە و دەرنەچوونیان لە حەرەم بەهۆی ئەوەی

---

(١) صحيح.

ناوی خۆیان نابوو (الْحُمْسُ)، لەبەر ئەم ئایەتە: ﴿أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ۝١٩٩﴾، واتە: جگە لەو قورەیشییانەی کە لە موزدەلیفە دەوەستان، ئەم دەستەواژەیە لەو شێوازەیە کە دەڵێین: هەندێ جار ناوی (النَّاسِ) بۆ بەشێك لە خەڵك بەکاردێت، بێگومان ئەوە شتێکی زانراوە کە هەموو خەڵك لە عەرەفات نەوەستان، بەڵکوو بەشێکیان وەستان نەك هەموویان، وە لە وتەکەی جوبەیردا: (مَا كَانَ إِلَّا تَوْفِيقًا مِنَ اللَّهِ)، واتە: ئەو وەستانە لە عەرەفە تەنها بەیارمەتی خوا بوو. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لەو کاتەدا بە وەحی فەرمانی پێ نەکرد لە عەرەفە بوەستێ، ئەگەر لەو کاتەدا خوا ﷻ فەرمانی پێ بکردایە لە عەرەفە بوەستایە ئەوە لەپێشتر بوو جوبەیری کوڕی موتعیم بیوتایە: زانیم خوای گەورە فەرمانی پێ کرد بە دابەزین لەسەر عەرەفە. وە کاتێ کە وتم: دروستە جوبەیری کوڕی موتعیم لە وتەکەیدا: (قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ)، مەبەستی دابەزینی هەموو قورئان بێت، چونکە هەموو قورئان لە مەککە بۆ پێغەمبەر ﷺ دانەبەزی پێش هیجرەتکردنی بۆ مەدینە، بەڵکوو بەشێك لە قورئانی لە مەککە بۆ دابەزی پێش هیجرەتکردن بۆ مەدینە و بەشەکەیدیکەشی دوای هیجرەت بۆ دابەزی، وە بەڵگەم هێنایەوە لەسەر ئەوەی مەبەستی لە وتەکەی: (قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ)، هەموو قورئانە، نەك ئەو مەبەستی ئەوە بووبێ پێش ئەوەی شتێك لە قورئانی بۆ دابەزیبێت.

**٣٠٥٩-** عَنْ بن جريج قالَ: أخبرني أبي، عن جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: أَضْلَلْتُ جَمَلًا لِي يَوْمَ عَرَفَةَ، فَانْطَلَقْتُ إِلَى عَرَفَةَ أَتَتَبَّعُهُ، فَإِذَا أَنَا بِمُحَمَّدٍ وَاقِفًا فِي النَّاسِ بِعَرَفَةَ عَلَى بَعِيرِهِ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ، وَذَلِكَ بَعْدَمَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِنْ كَانَ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ جُرَيْجٍ قَدْ أَدْرَكَ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ فَهَذَا الْخَبَرُ يُبَيِّنُ أَنَّ تَأْوِيلَ خَبَرِ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنْ أَبِيهِ أَيْ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَيْهِ جَمِيعُ الْقُرْآنِ.

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێ: باوکم هەواڵی پێ دام، جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی عەرەفە وشترێکم لێ ونبوو، چووم بۆ عەرەفە بەدوایدا دەگەڕام، لە شەوی عەرەفە موحەممەدم ﷺ بینی لە عەرەفە لەنێو خەڵکەکەدا بوو بەسەر وشترێکەوە وەستابوو، ئەویش دوای ئەوە بوو کە قورئانی بۆ دابەزێنرا.

---

(١) إسناده ضعيف.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر عەبدولعەزیزی کوڕی جوڕەیج گەیشتبێت بە جوبەیری کوڕی موتعیم ئەوە ئەم فەرموودەیە لەیەکدانەوەکەی فەرموودەکەی نافیعی کوڕی جوبەیر ڕوون دەکاتەوە، لە باوکیەوە، (فەرموودەی ژمارە ٣٠٥٧ ) واتە: پێش ئەوەی هەموو قورئانی بۆ دابەزێت.

**٣٠٦٠-** عَنْ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: ذَهَبْتُ أَطْلُبُ بَعِيرًا لِي بِعَرَفَةَ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَاقِفًا بِعَرَفَةَ مَعَ النَّاسِ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ إِنَّ هَذَا لَمِنَ الْحُمْسِ فَمَا شَأْنُهُ هَاهُنَا، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقِفُ بِعَرَفَةَ سِنِيهِ الَّتِي كَانَ بِهَا[١].

واتە: عەمر دەڵێ: گوێم لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم بوو لە باوکیەوە ﷺ وتی: ڕۆیشتم بەدوای وشترێکمدا دەگەڕام لە عەرەفە، پێغەمبەرم ﷺ بینی لەنێو خەڵکەکە وەستابوو، وتم: سوێند بە خوا ئەم پیاوە لە قوڕەیشە چی دەکات لێرە، وە پێغەمبەر ﷺ ئەو ساڵانەی لە مەککە بوو لە عەرەفە دەوەستا. (ڕوونکردنەوە: جوبەیری کوڕی موتعیم ئەو کاتە بێباوەڕ بوو، ئەو لە ئازادکردنی مەککە مسوڵمان بوو، بۆیە سەری سووڕمابوو لە وەستانی پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە، چونکە قوڕەیش دەیانوت: ئێمە دڵسۆزترینی بەندەکانی خواین لە حەرەم دەرناچین).

**٣٠٦١-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، وَقَالَ، فَمَا لَهُ خَرَجَ مِنَ الْحَرَمِ، وَكَانَتْ قُرَيْشٌ لَا تُجَاوِزُ الْحَرَمَ، تَقُولُ: نَحْنُ أَهْلُ اللَّهِ لَا نَخْرُجُ مِنَ الْحَرَمِ، وَلَمْ يَقُلْ كَانَ يَقِفُ بِعَرَفَةَ سِنِيهِ الَّتِي كَانَ بِهَا[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی جوبەیر دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە وتی: چی وای لێ کرد لە حەرەم دەربچێت، چونکە قوڕەیش لە حەرەمی مەککە دەرنەدەچوون، دەیانوت: ئێمە دڵسۆزترینی بەندەکانی خواین لە حەرەم دەرناچین، بەڵام نەیوت ئەو ساڵانەی لە مەککە بوو لە عەرەفە دەوەستا.

**٣٠٦٢-** عَنْ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَهُوَ وَاقِفٌ بِعَرَفَاتٍ مَعَ الْمُشْرِكِينَ، ثُمَّ رَأَيْتُهُ فِي الْإِسْلَامِ وَاقِفًا مَوْقِفَهُ ذَلِكَ فَعَرَفْتُ أَنَّ اللَّهَ وَفَّقَهُ لِذَلِكَ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

واتە: ڕەبیعە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، لە پیاوێکی قوڕەیشییەوە ﷺ وتی: لە سەردەمی نەفامیدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، لە عەرەفات وەستابوو لەگەڵ هاوبەشدانەراندا، پاشان کاتێ کە مسوڵمان بووم بینیم لە هەمان شوێن وەستابوو، ئەوکات زانیم خوا تەوفیقی داوە بۆ ئەو کارە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي دُخُولِ مَكَّةَ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ عِنْدَ الْعِلْمِ بِحَدَثٍ

**٣٠٦٣-** عَنْ ابنِ شِهَابٍ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ، وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْنُ أَخْطَلَ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْتُلُوهُ». قَالَ: ابْنُ شِهَابٍ، وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَئِذٍ مُحْرِمًا[١].

## باسی مۆڵەت دراوە بە چوونەنێوەوەی مەککە بەبێ ئیحرام، کاتێ بزانێ شتێك ڕوو دەدات

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککە چووە نێو مەککەوە کڵاوێکی سەربازی لەسەر بوو، کاتێ کڵاوەکەی لادا پیاوێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئیبنو ئەختەلە خۆی بە پەردەی کەعبەوە هەڵواسیوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیکوژن (کوشتیان، چونکە لە ئیسلام هەڵگەڕابۆیەوە و خزمەتکارە مسوڵمانەکەی خۆی کوشتبوو و جوێنی زۆر قێزەونی دەدا بە پێغەمبەر ﷺ)، ئیبنو شیهاب وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە لە ئیحرامدا نەبوو.

**٣٠٦٤-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ الْفَضْلِ بْنِ الْحَسَنِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَبَعَثَ مَعِي رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ: «ائْتِيَا أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ، فَاقْتُلَاهُ»، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. وَقَالَ: فَلَمَّا دَخَلْنَا مَكَّةَ قَالَ لِي صَاحِبِي هَلْ لَكَ أَنْ نَبْدَأَ فَنَطُوفَ بِالْبَيْتِ أُسْبُوعًا، وَنُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ؟ فَقُلْتُ: أَنَا أَعْلَمُ بِأَهْلِ مَكَّةَ أَنَّهُمْ إِذَا أَظْلَمُوا رَشُّوا أَفْنِيَتَهُمْ، ثُمَّ جَلَسُوا بِهَا، وَأَنَا أَعْرِفُ فِيهَا مِنَ الْفَرَسِ الْأَبْلَقِ فَلَمْ يَزَلْ بِي حَتَّى أَتَيْنَا الْبَيْتَ فَطُفْنَا بِهِ أُسْبُوعًا وَصَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ خَرَجْنَا[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: جەعفەری کوڕی فەزلی کوڕی حەسەنی کوڕی عەمری کوڕی ئوممەیەی زەمری دەگێڕێتەوە، لە باوکی لە باپیریەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی پیاوێکی ئەنصاریشی لەگەڵم نارد، فەرمووی: بچن بۆ لای ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و بیکوژن، دواتر درێژەی دا بە باسەکەی، وە وتی: کاتێ چووینە مەککە، هاوڕێیەکەم پێمی وت: با سەرەتا حەوت جار تەوافی بەیت بکەین و دوو ڕکات نوێژیش بکەین؟ وتم: من خەڵکی مەککە دەناسم، کاتێ ئێوارە دادێ بەهۆی گەرماوە شوێنی دانیشتنەکەیان لەلای کەعبە ئاوڕشێن دەکەن، پاشان دادەنیشن، وە من دەزانم ئەسپی ئەبلەقی تێدایە (جۆرە ئەسپێکی سوور و سپییە)، بەردەوام وازی نەهێنا تا حەوت جار تەوافمان کرد و دوو ڕکات نوێژمان کرد ئینجا دەرچووین.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ الْعُمْرَةِ وَشَرَائِعِهَا وَسُنَنِهَا وَفَضَائِلِهَا

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ الْعُمْرَةَ فَرْضٌ وَأَنَّهَا مِنَ الْإِسْلَامِ كَالْحَجِّ سَوَاءً إِلَّا أَنَّهَا تَطَوُّعٌ غَيْرُ فَرِيضَةٍ عَلَى مَا قَالَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ

**٣٠٦٥-** عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمُرَ، فَذَكَرَ حَدِيثَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي سُؤَالِ جِبْرِيلَ إِيَّاهُ عَنِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: «الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَأَنْ تُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَحُجَّ وَتَعْتَمِرَ، وَتَغْتَسِلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَأَنْ تُتِمَّ الْوُضُوءَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ»، قَالَ: فَإِذَا فَعَلْتُ ذَلِكَ فَأَنَا مُسْلِمٌ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: صَدَقْتَ[١].

---

(١) صحيح.

## کۆباسی عومرە، وە ڕێوڕەسم و سوننەت و فەزڵ و پاداشتەکانی

### باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی عومرە فەرزە، وە لە ئیسلامەوەیە وەکوو حەج وایە و یەکسانە لەگەڵی، ئەوە نەبێ سوننەتە و فەرز نییە وەك بەشێك لە زانایان وتوویانە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە میانەی پرسیاری جبریل لێی دەربارەی ئیسلام، فەرمووی: ئیسلام بریتییە لەوەی شایەتی بدەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، وە نوێژەکانت بەجێ بهێنی و زەکاتی ماڵەکەت دەربکەیت و حەج و عومرەیش بکەیت، وە لە لەشگرانی خۆت بشۆریت، هەروەها بەچاکی دەستنوێژ بگریت، مانگی ڕەمەزانیش بەڕۆژوو بیت، وتی: ئەگەر ئەوەم کرد ئەوە مسوڵمانم، فەرمووی: بەڵێ، وتی: ڕاستت فەرموو.

**٣٠٦٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ وَعُمْرَةٌ وَاجِبَتَانِ لَا بُدَّ مِنْهُمَا فَمَنْ زَادَ بَعْدَ ذَلِكَ خَيْرٌ وَتَطَوُّعٌ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: هیچ کەس نییە ئیللا حەج و عومرەی لەسەر واجبە، هەر دەبێ ئەنجامیان بدات، هەر کەس دوای ئەوە زیاتری کرد ئەوە خێر و سوننەتە.

**٣٠٦٧-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ أَحَدٌ إِلَّا وَعَلَيْهِ عُمْرَةٌ وَاجِبَةٌ[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: هیچ یەکێك لە دروستکراوەکان نییە ئیللا عومرەیەك لەسەری واجبە.

**٣٠٦٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْعُمْرَةِ أَوَاجِبَةٌ هِيَ؟ قَالَ: «لَا إِنْ تَعْتَمِرَ فَهُوَ أَفْضَلُ». ثَنَاهُ بِشْرُ بْنُ مُعَاذٍ ثنا عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ ثنا الْحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، فَلَوْ كَانَ جَابِرٌ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ فِي الْعُمْرَةِ إِنَّهَا لَيْسَتْ بِوَاجِبَةٍ لَمَا خَالَفَ قَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ وَفِي خَبَرِ مَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنِ الضَّبِّيِّ بْنِ مَعْبَدٍ فِي قِصَّةِ عُمَرَ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْعُمْرَةَ وَاجِبَةٌ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی عومرە ئایا واجبە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام ئەگەر عومرە بکەیت چاکترە. بیشری کوڕی موعاز بۆی باس کردین، لە عەمری کوڕی عەلییەوە بۆی باس کردین، لە حەجاجی کوڕی ئەرتاتەوە بۆی باس کردین، ئەگەر جابر گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی عومرە واجب نییە، ئیتر چۆن پێچەوانەی وتەی پێغەمبەری ﷺ کردووە، وە لە فەرموودەکەی مەنصوردا هاتووە، لە ئەبو وائیلی زەبی کوڕی مەعبەد لە چیرۆکەکەی عومەر، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عومرە لای عومەری کوڕی خەتاب واجب بووە.

**٣٠٦٩-** عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ الضَّبِّيُّ بْنُ مَعْبَدٍ: كُنْتُ رَجُلًا أَعْرَابِيًّا نَصْرَانِيًّا، فَأَسْلَمْتُ، فَكُنْتُ حَرِيصًا عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَتَيْنِ عَلَيَّ، فَأَتَيْتُ رَجُلًا مِنْ عَشِيرَتِي يُقَالُ لَهُ: هُدَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ فَقُلْتُ: يَا هَنَاهُ إِنِّي حَرِيصٌ عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَتَيْنِ عَلَيَّ فَكَيْفَ لِي أَنْ أَجْمَعَهُمَا؟ فَقَالَ: اجْمَعْهَا، ثُمَّ اذْبَحْ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْى قَالَ: فَأَهْلَلْتُ بِهِمَا مَعًا، فَلَمَّا أَتَيْتُ الْعُذَيْبَ لَقِيَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَزِيدُ بْنُ صُوحَانَ، وَأَنَا أُهِلُّ بِهِمَا مَعًا فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: مَا هَذَا بِأَفْقَهَ مِنْ بَعِيرِهِ، فَكَأَنَّمَا أُلْقِىَ عَلَيَّ جَبَلٌ حَتَّى أَتَيْتُ عُمَرَ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنِّي كُنْتُ رَجُلًا أَعْرَابِيًّا نَصْرَانِيًّا وَإِنِّي أَسْلَمْتُ، وَأَنَا حَرِيصٌ عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَتَيْنِ عَلَيَّ فَأَتَيْتُ رَجُلًا مِنْ عَشِيرَتِي يُقَالُ لَهُ: هُدَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَقُلْتُ: يَا هَنْتَاهُ إِنِّي حَرِيصٌ عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَتَيْنِ عَلَيَّ، فَكَيْفَ لِي أَنْ أَجْمَعَهُمَا، فَقَالَ: اجْمَعْهُمَا، ثُمَّ اذْبَحْ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَإِنِّي أَهْلَلْتُ بِهِمَا جَمِيعًا، فَلَمَّا أَتَيْتُ الْعُذَيْبَ لَقِيَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَزِيدُ بْنُ صُوحَانَ، وَأَنَا أُهِلُّ بِهِمَا مَعًا فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلْآخَرِ: مَا هَذَا بِأَفْقَهَ مِنْ بَعِيرِهِ، قَالَ: فَقَالَ لِي عُمَرُ: هُدِيتَ لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي تَرْكِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ النَّكِيرَ عَلَى الضَّبِّيِّ بْنِ مَعْبَدٍ قَوْلَهُ: وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَتَيْنِ عَلَيَّ أَبْيَنُ الدَّلَالَةِ عَلَى أَنَّ الْعُمْرَةَ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ كَانَتْ وَاجِبَةً كَالْحَجِّ إِذْ لَوْ كَانَتِ الْعُمْرَةُ عِنْدَهُ تَطَوُّعًا لَا وَاجِبَةً، لَأَشْبَهَ أَنْ يُنْكِرَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، وَلَقَالَ لَهُ: لَمْ نَجِدْ ذَلِكَ مَكْتُوبَتَيْنِ عَلَيْكَ بَلْ إِنَّمَا وَجَدْتُ الْحَجَّ مَكْتُوبًا عَلَيْكَ دُونَ الْعُمْرَةِ، وَفِي تَرْكِهِ الْإِنْكَارَ عَلَيْهِ مَا أَفْتَاهُ هُدَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، دَلَالَةٌ بَيِّنَةٌ بِأَنَّ الْقِرَانَ عِنْدَهُ جَائِزٌ مِنْ غَيْرِ سَوْقِ بَدَنَةٍ، وَلَا بَقَرَةٍ مِنَ الْمِيقَاتِ الَّذِي يُحْرِمُ مِنْهُ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، وَفِيهِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، جَائِزٌ عَنِ الْقَارِنِ كَهُوَ

---

(١) صحيح.

عَنِ الْمُتَمَتِّعِ لَا كَمَا قَالَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ: إِنَّ الْقِرَانَ لَا يَكُونُ إِلَّا بِسَوْقِ بَدَنَةٍ أَوْ بَقَرَةٍ يَسُوقُهُ مِنْ حَيْثُ يُحْرِمُ.

واتە: ئەبو وائیل دەڵێ: زەبی کوڕی مەعبەد وتی: من پیاوێکی دەشتەکی گاور بووم، دواتر مسوڵمان بووم، سووربووم لەسەر ئەوەی جیهاد بکەم، بینیم حەج و عومرەیش لەسەرم نووسراون، هاتم بۆ لای پیاوێك لە هۆزەکەم پێی دەوترا: هودەیمی کوڕی عەبدوڵا، وتم: ئەی کابرا من سوورم لەسەر جیهادکردن، بەڵام بینیم حەج و عومرەیش لەسەرم نووسراون، چۆن هەردووکیان پێکەوە کۆ بکەمەوە؟ وتی: هەردووکیان پێکەوە کۆ بکەرەوە، پاشان ئەوەندەی لە تواناتدایە ئاژەڵێك بکە بە هەدی بۆ قوربانی، وتی: دواتر ئیحرامی حەج و عومرەم بەست پێکەوە، بەڵام کاتێ هاتمە (الْعُذَيْبَ) ( ناوی ئاوێکە موڵکی نەوەکانی تەمیم بوو چەند قۆناغێك دوور بوو لە کوفە) سولەیمانی کوڕی ڕەبیعە و زەیدی کوڕی صوحانم پێ گەیشت، لە کاتێکدا من تەلبیەم دەکرد بە حەج و عومرە، یەکێکیان بە ئەوی دیکەی وت: ئەم پیاوە ئەوەندەی وشترەکەی عاقڵ نییە، ئەوەندە بەلامەوە گران بوو وەکوو ئەوەی کێوێك بخرێتە شانم، ڕۆیشتم تا گەیشتمە عومەر، پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران من پیاوێکی گاور بووم، دواتر مسوڵمان بووم، سووربووم لەسەر ئەوەی جیهاد بکەم، بینیم حەج و عومرەیش لەسەرم نووسراون، هاتم بۆ لای پیاوێك لە هۆزەکەم پێی دەوترا: هودەیمی کوڕی عەبدوڵا، وتم: ئەی کابرا من سوورم لەسەر جیهادکردن، بەڵام بینیم حەج و عومرەیش لەسەرم نووسراون، چۆن هەردووکیان پێکەوە کۆ بکەمەوە؟ وتی: هەردووکیان پێکەوە کۆ بکەرەوە، پاشان ئەوەندەی لە تواناتدایە ئاژەڵێك بکە بە هەدی بۆ قوربانی، دواتر ئیحرامی حەج و عومرەم بەست پێکەوە، بەڵام کاتێ هاتمە (الْعُذَيْبَ) (ناوی ئاوێکە موڵکی نەوەکانی تەمیم بوو چەند قۆناغێك دوور بوو لە کوفە) سولەیمانی کوڕی ڕەبیعە و زەیدی کوڕی صوحانم پێ گەیشت، لە کاتێکدا من تەلبیەم دەکرد بە حەج و عومرە پێکەوە، یەکێکیان بە ئەوی دیکەی وت: ئەم پیاوە ئەوەندەی وشترەکەی عاقڵ نییە، وتی: عومەر پێمی وت: سوننەتی پێغەمبەرەکەتت ﷺ پێ نیشان دراوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە نکووڵینەکردنی عومەری کوڕی خەتاب لە قسەکەی مەعبەد کە

وتی: من بینیم حەج و عومرە لەسەرم نووسراون، بەڵگەیەكی ڕوون و حاشا هەڵنەگرە كە عومرە لەلای عومەری كوڕی خەتاب واجب بووە وەكوو حەج، ئەگەر عومرە لەلای ئەو سوننەت بووایە و واجب نەبووایە، پێ دەچوو نكووڵی قسەكەی مەعبەدی بكردایە و پێی بوتایە: پێیان وا نییە حەج و عومرە لەسەرت نووسرابێت بەڵكوو تەنها حەج لەسەرت نووسراوە جگە لە عومرە، وە لە نكووڵینەكردنی لە فتواكەی هودەیمی كوڕی عەبدوڵا، بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر ئەوەی ئیحرامبەستنی حەج و عومرە پێكەوە لەلای دروست بووە، بەبێ ئەوەی وشتر یان مانگا و ڕەشەوڵاخ لەگەڵ خۆی بیات بۆ میقات كە ئیحرامی حەج و عومرەی تێدا دەبەستێ، هەروەها بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی ئەوەندەی لە توانایدایە ئاژەڵی هەدی بكات بە قوربانی، دروستە بۆ ئەو كەسەی ئیحرامی حەج و عومرەی پێكەوە بەستووە هەر وەكوو چۆن دروستە بۆ ئەو كەسەی تەمەتوعی كردووە، (واتە: چووە بۆ حەج ئیحرامی بۆ عومرە بەستووە لە مانگەكانی حەجدا)، نەك وەكوو ئەوەی هەندێ لە زانایان وتوویەتی: ئیحرامبەستن بۆ حەج و عومرە پێكەوە نابێت مەگەر لەو شوێنەی كە ئیحرامی بەستووە وشتر یان مانگا لەگەڵ خۆی بیات.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ عُمَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

**٣٠٧٠-** عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما جَالِسٌ إِلَى حُجْرَةِ عَائِشَةَ قَالَ: وَإِذَا النَّاسُ فِي الْمَسْجِدِ يُصَلُّونَ صَلَاةَ الضُّحَى، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ صَلَاتِهِمْ، فَقَالَ: بِدْعَةٌ، ثُمَّ قَالَ: كَمِ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: أَرْبَعٌ[1].

### - باسی ژمارەی عومرەكانی پێغەمبەر ﷺ

واتە: موجاهید دەڵێ: من و عوروەی كوڕی زوبەیر چووینە نێو مزگەوتەوە، عەبدوڵای كوڕی عومەر رضي الله عنهما لەلای ژوورەكەی عائیشە دانیشتبوو، وتی: خەڵكانێكیش لەنێو مزگەوت نوێژی چێشتەنگاویان دەكرد بەكۆمەڵ، جا پرسیارمان كرد دەربارەی نوێژەكەیان، وتی: ئەوە بیدعەیە، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جار عومرەی كردووە؟ وتی: چوار جار. ( پێ دەچێ مەبەست لە وتەكەی عەبدوڵای كوڕی عومەر:

---

(١) صحيح.

ئەوە بیدعەیە، ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو بێ بەكۆمەڵ لەنێو مزگەوت، نەك خودی نوێژی چێشتەنگاو، لەوانەشە لە لای ئەو بیدعە بووبێت).

**٣٠٧١-** عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: كَمِ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ؟ قَالَ: أَرْبَعَ عُمَرٍ، وَحَجَّ حَجَّةً وَاحِدَةً، وَعُمْرَتُهُ مَعَ حَجَّتِهِ[١].

**واتە:** قەتادە دەڵێ: بە ئەنەسی كوڕی مالیكم ﷺ وت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند عومرەی كرد؟ وتی: چوار عومرە، هەروەها یەك حەجی كرد، عومرەكەیشی لەگەڵ حەجەكەیدا بوو.

## بَابُ فَضْلِ الْعُمْرَةِ وَتَكْفِيرِ الذُّنُوبِ الَّتِي يَرْتَكِبُهَا الْمُعْتَمِرُ بَيْنَ الْعُمْرَتَيْنِ

**٣٠٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ»[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی عومرە و سڕینەوەی ئەو گوناهانەی كە عومرەكار لە نێوان هەردوو عومرەكەدا كردوویەتی

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومرە بۆ عومرە دەبێتە كەفارەتی گوناهەكان لە نێوانیاندا، وە حەجی وەرگیراویش هیچ پاداشتێكی نییە جگە لە بەهەشت.

**٣٠٧٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ تُكَفِّرُ مَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ»[٣].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومرە بۆ عومرە دەبێتە كەفارەتی گوناهەكان لە نێوانیاندا، وە حەجی وەرگیراویش هیچ پاداشتێكی نییە جگە لە بەهەشت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جِهَادَ النِّسَاءِ الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ، وَفِي الْخَبَرِ - عِلْمِي - دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْعُمْرَةَ وَاجِبَةٌ كَالْحَجِّ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ أَعْلَمَ أَنَّ عَلَيْهِنَّ الْعُمْرَةَ كَمَا أَنَّ عَلَيْهِنَّ الْحَجَّ

**٣٠٧٤-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ عَلَى النِّسَاءِ جِهَادٌ؟ قَالَ: «عَلَيْهِن جِهَادٌ لَا قِتَالَ فِيهِ، الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي قَوْلِهِ ﷺ «عَلَيْهِنَّ جِهَادٌ لَا قِتَالَ فِيهِ» وَإِعْلَامُهُ أَنَّ الْجِهَادَ الَّذِي عَلَيْهِنَّ الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ بَيَانُ أَنَّ الْعُمْرَةَ وَاجِبَةٌ كَالْحَجِّ إِذْ ظَاهِرُ قَوْلِهِ عَلَيْهِنَّ أَنَّهُ وَاجِبٌ إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُقَالَ عَلَى الْمَرْءِ مَا هُوَ تَطَوُّعٌ غَيْرُ وَاجِبٍ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی جیهاد و تێکۆشانی ئافرەتان بریتییە لە حەج و عومرە، وە لە فەرموودەکەدا -بەپێی زانستی من- بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی عومرە وەکوو حەج واجبە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە ئافرەتان عومرەیان لەسەرە وەکوو چۆن حەجیان لەسەرە

واتە: عائیشە دایکی ئیمانداران ﵂ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئافرەتان جیهادیان لەسەرە؟ فەرمووی: جیهادێکیان لەسەرە جەنگ و کوشتاری تێدا نییە، ئەویش حەج و عومرەیە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا ﷺ: (عَلَيْهِنَّ جِهَادٌ لَا قِتَالَ فِيهِ)، وە ڕاگەیاندنی کە ئەو جیهادەی لەسەریانە بریتییە لە حەج و عومرە، خۆی لە خۆیدا ڕوونکردنەوەیە کە عومرە وەکوو حەج واجبە، چونکە ڕواڵەتی فەرموودەکەی: (عَلَيْهِنَّ) بە مانای واجب دێت، چونکە دروست نییە بوترێ: (عَلَى الْمَرْءِ)، واتە: لەسەر بەندەیە، کە سوننەت بێت و واجب نەبێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْعُمْرَةِ عَلَى الدَّوَابِّ الْمُحْبَسَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

**٣٠٧٥-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: أَرْسَلَ مَرْوَانُ إِلَى أُمِّ مَعْقِلٍ ﵂ مَنْ يَسْأَلُهَا عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَحَدَّثَتْ أَنَّ زَوْجَهَا جَعَلَ بَكْرًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَأَنَّهَا أَرَادَتِ الْعُمْرَةَ، فَسَأَلَتْ زَوْجَهَا الْبَكْرَ، فَأَبَى عَلَيْهَا، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعْطِيَهَا، وَقَالَ: «إِنَّ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مِنْ سُبُلِ اللَّهِ، وَأَنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً أَوْ تُجْزِئُ حَجَّةً»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ عِنْدِي دَالٌّ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ مَنْ حَبَسَ شَيْئًا فِي سَبِيلٍ مِنْ سُبُلِ الْخَيْرِ، فَلَمْ يُخْرِجْهُ مِنْ يَدِهِ أَنَّ الْحَبْسَ غَيْرُ جَائِزٍ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَجَازَ لِأَبِي مَعْقِلٍ تَسْبِيلَ الْبَكْرِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُخْرِجَهُ مِنْ يَدِهِ، وَهَذَا الْخَبَرُ يَدُلُّ عَلَى صِحَّةِ قَوْلِ الْمُطَّلِبِيِّ: إِنَّ الْحَبْسَ يَتِمُّ بِالْكَلَامِ، وَإِنْ لَمْ يُخْرِجْهُ الْمُحْبِسُ مِنْ يَدِهِ.

## باسی مۆڵەتدان بە عومرەکردن لەسەر ئەو ئاژەڵانەی لە پێناوی خوادا بۆ جەنگ و جیهاد وەقفکراون

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریس دەڵێ: مەڕوان کەسێکی نارد بۆ لای ئوممو مەعقیل ﵂ پرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەم فەرموودەیە، ئەویش بۆی باس کرد کە مێردەکەی وشترێکی کردبوو بە وەقف لە ڕێگای خوادا، وە ئەویش ویستی بچێت بۆ عومرە، داوای کرد لە مێردەکەی وشترەکەی پێ بدا، بەڵام مێردەکەی ڕازی نەبوو، دواتر هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بە مێردەکەی وشترەکەی پێ بدات بۆ ئەوەی عومرەی پێ بکات، فەرمووی: بەڕاستی حەج و عومرە لە ڕێگای خوادان، عومرەیەك لە مانگی ڕەمەزاندا وەکوو حەجێك وایە، یان بەرانبەرە بە حەجێك.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لە لای من دژی وتەی ئەو کەسەیە کە پێی وایە هەر کەس شتێکی وەقف کرد لە ڕێگایەك لە ڕێگاکانی خێر و چاکە، شتەکەی لەژێر دەسەڵاتی خۆی دەرنەکرد، ئەوە ئەو وەقفکردنە دروست نییە، وە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە باوکی مەعقیل وشترەکەی لە ڕێی خوادا وەقف بکات و لەژێر دەستی خۆیشیدا

---

(١) صحيح.

بێت، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی وتەی موتەلیبی (ئیمامی شافیعی): وەقف تەنها بە قسەکردن دەبێت، ئەگەرچی وەقفکەر لەژێر دەستی خۆی دەری نەکردبێ.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْحَاجِّ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ وَالْإِحْرَامِ بِهِمَا مِنْ أَيِّ الْحِلِّ شَاءَ

٣٠٧٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: «مَا شَأْنُكِ؟». قَالَتْ: لَا أُصَلِّي قَالَ: «فَلَا يَضُرُّكِ إِنَّمَا أَنْتِ مِنْ بَنَاتِ آدَمَ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْكِ مَا كَتَبَ عَلَيْهِنَّ»، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: حَتَّى نَزَلَ الْمُحَصَّبَ، وَنَزَلْنَا مَعَهُ فَدَعَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ «اخْرُجْ بِأُخْتِكَ، فَلْتُهِلَّهُ بِعُمْرَةٍ»[1].

## باسی مۆڵەتدان بە حاجی دوای ئەوەی لە حەج و عومرە و ئیحرامبەستنیان بۆیەوە لە هەر شوێنێ ویستی پشوو بدات

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لام دەگریام، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ وتی: نوێژم لەسەر نییە، فەرمووی: هیچ زیانێکت پێ ناگات بێگومان تۆش یەکێکی لە کچانی ئادەم، ئەوەی خوا لەسەر ئەوان نووسیویەتی لەسەر تۆش نووسیویەتی، دواتر فەرموودەکەی باس کرد، وتی: تا دابەزیە موحەصەب، ئێمەیش لەگەڵی دابەزین، دواتر عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری بانگ کرد پێی فەرموو: خوشکەکەت لەگەڵ خۆت ببە و عومرەی پێ بکە.

## بَابُ فَضْلِ الْعُمْرَةِ فِي رَمَضَانَ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهَا تَعْدِلُ بِحَجَّةٍ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّيْءَ قَدْ يُشَبَّهُ بِالشَّيْءِ وَيُجْعَلُ عِدْلَهُ إِذَا أَشْبَهَهُ فِي بَعْضِ الْمَعَانِي، لَا فِي جَمِيعِهِ، إِذِ الْعُمْرَةُ لَوْ عَدَلَتْ حَجَّةً فِي جَمِيعِ أَحْكَامِهَا لَقَضَيَ الْعُمْرَةُ مِنَ الْحَجِّ، وَلَكَانَ الْمُعْتَمِرُ فِي رَمَضَانَ إِذَا كَانَ عَلَيْهِ حَجَّةُ الْإِسْلَامِ تُسْقِطُ عُمْرَتُهُ فِي رَمَضَانَ حَجَّةَ الْإِسْلَامِ عَنْهُ، فَكَانَ النَّاذِرُ حَجًّا لَوِ اعْتَمَرَ فِي رَمَضَانَ كَانَتْ عُمْرَتُهُ فِي رَمَضَانَ قَضَاءً لِمَا أَوْجَبَ عَلَى نَفْسِهِ مِنْ نَذْرِ الْحَجِّ

٣٠٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْحَجَّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ لِزَوْجِهَا حُجَّنِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: مَا عِنْدِي مَا أُحِجُّكِ عَلَيْهِ قَالَتْ: فَحُجَّنِي عَلَى نَاضِحِكَ قَالَ: ذَاكَ يَعْتَقِبُهُ أَنَا

---

(١) صحيح.

وَوَلَدُكِ قَالَتْ: حُجَّنِي عَلَى جَمَلِكَ فُلَانٍ قَالَ: ذَلِكَ حَبِيسُ سَبِيلِ اللَّهِ قَالَتْ: فَبِعْ تَمْرَتَكَ قَالَ: ذَاكَ قُوتِي وَقُوتُكِ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَكَّةَ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِ زَوْجَهَا فَقَالَتْ أَقْرِئْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنِّي السَّلَامَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ وَسَلْهُ مَا تَعْدِلُ حَجَّةً مَعَكَ، فَأَتَى زَوْجُهَا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي تُقْرِئُكَ السَّلَامَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ، وَإِنَّهَا كَانَتْ سَأَلَتْنِي أَنْ أَحُجَّ بِهَا مَعَكَ، فَقُلْتُ لَهَا: لَيْسَ عِنْدِي مَا أُحِجُّكِ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: حُجَّنِي عَلَى جَمَلِكَ فُلَانٍ، فَقُلْتُ لَهَا: ذَلِكَ حَبِيسٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ: أَمَا إِنَّكَ لَوْ كُنْتَ حَجَجْتَهَا، فَكَانَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَالَتْ: حُجَّنِي عَلَى نَاضِحِكَ فَقُلْتُ: ذَاكَ يَعْتَقِبُهُ أَنَا وَوَلَدُكِ قَالَتْ: فَبِعْ تَمْرَتَكَ، فَقُلْتُ: ذَاكَ قُوتِي وَقُوتُكِ قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَعَجُّبًا مِنْ حِرْصِهَا عَلَى الْحَجِّ، وَإِنَّهَا أَمَرَتْنِي أَنْ أَسْأَلَكَ مَا يَعْدِلُ حَجَّةً مَعَكَ؟ قَالَ: «أَقْرِئْهَا مِنِّي السَّلَامَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ وَأَخْبِرْهَا أَنَّهَا تَعْدِلُ حَجَّةً مَعِي عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ»[1].

**باسی فەزڵ و گەورەیی عومرە لە ڕەمەزاندا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی عومرە لەو مانگەدا بەرانبەرە بە حەجێك، لەگەڵ بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار شتێك دەچوێنرێ بە شتێك و دەكرێت بە بەرانبەری ئەگەر لە هەندێ مانادا لەو بچێت نەك لە هەموویدا، چونكە ئەگەر عومرە لە هەموو ماناكانیدا لە حەج بچێت ئەوە دەچێتە جێگای حەج، وە عومرەكەر ئەگەر حەجی لەسەر واجب بوو لە ڕەمزاندا عومرەی كرد حەجەكەی لەسەر هەڵدەگیرێ، هەروەها ئەگەر كەسێك نەزری كردبوو حەج بكات ئەگەر لە ڕەمەزان عومرەی كرد ئەوە نەزرەكەی لەسەر هەڵدەگیرێ**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی حەج بكات، ئافرەتێك بە مێردەكەی وت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ حەجم پێ بكە، وتی: هیچ وڵاخێكم نییە بەو وڵاخە حەجت پێ بكەم، وتی: ئەی بە وشترە (نَاضِح)ەكەت (ئەو وشترەیە ئاوی پێ دەگوازنەوە بۆ كشتوكاڵ و كاروباری ڕۆژانە) حەجم پێ بكە، وتی: ئەوە من و كوڕەكەت بەكاری دێنین، وتی: ئەی بە (جَمَل)ەكەت (واتە: وشترەی گەورە) حەجم پێ بكە، وتی: ئەو وشترەم لە ڕێی خوادا وەقف كردووە، وتی: خورماكانت بفرۆشە، وتی: ئەوە بژێوی من و تۆیە، كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەككەوە گەڕایەوە، مێردەكەی نارد بۆ لای وتی: سڵاوی من بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنە و پرسیاری لێ بكە، چی شتێك بەرانبەرە بە حەجكردن لەگەڵتدا، دواتر مێردەكەی هات بۆ خزمەت پێغەمبەر

---

(١) صحیح.

ﷺ وتی: خێزانم سڵاوت لێ دەکات، ئەو داوای لە من کرد لەگەڵ خۆم بیبەم حەجت لەگەڵ بکات، وتم: هیچ وڵاخێکم نییە پێی حەجت پێ بکەم، وتی: ئەی بە (جَمَل) ەکەت ( واتە: وشترەی گەورە) حەجم پێ بکە، پێم وت: ئەو وشترەم لە ڕێی خوادا وەقف کردووە، فەرمووی: ئەگەر حەجت پێ بکردایە ئەوەش ڕێگای خوایە. خێزانم وتی: ئەی بە وشترە (نَاضِح)ەکەت (ئەو وشترەیە ئاوی پێ دەگوازنەوە بۆ کشتوکاڵ و کاروباری ڕۆژانە) حەجم پێ بکە، وتم: ئەوە من و کوڕەکەت بەکاری دێنین، وتی: خورماکانت بفرۆشە، وتم: ئەوە بژێوی من و تۆیە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی وەك سەرسووڕمانی بە سووربوونی ئەو ئافرەتە لەسەر حەجکردن، جا خێزانم ڕایسپاردووم: پرسیارت لێ بکەم چی شتێك بەرانبەرە بە حەجکردن لەگەڵتدا؟ وتی: سڵاوی منی پێ بگەیەنە هەواڵی بدەرێ، عومرەکردنێك لە مانگی ڕەمەزان بەرانبەرە بە حەجکردنێك لەگەڵ مندا.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْعُمْرَةِ مِنَ الْجِعْرَانَةِ

٣٠٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فِي قَوْلِهِ: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ۝١﴾ التوبة، قَالَ: لَمَّا قَفَلَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ حُنَيْنٍ اعْتَمَرَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ ثُمَّ أَمَّرَ أَبَا بَكْرٍ عَلَى تِلْكَ الْحَجَّةِ[1].

## باسی ڕێگەدان بە عومرە لە جیعڕانە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەبارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ۝١﴾، دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە حونەین گەڕایەوە، لە جیعڕانە عومرەی کرد (کە جێگایەکە لە نێوان تائیف و مەککە، لە مەککەوە نزیکترە) پاشان فەرمانی کرد ئەبو بەکر سەرپەرشتی ئەو حەجە بکات.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْعُمْرَةِ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ لِمَنْ لَا يَحُجُّ عَامَهُ ذَلِكَ، وَالرُّخْصَةِ لَهُ فِي الرُّجُوعِ إِلَى وَطَنِهِ بَعْدَ قَضَاءِ الْعُمْرَةِ قَبْلَ أَنْ يَحُجَّ

**٣٠٧٩**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ النَّاسَ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَقَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْجِعَ بِعُمْرَةٍ قَبْلَ الْحَجِّ فَلْيَفْعَلْ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ بِصِحَّةِ قَوْلِ الْمُطَّلِبِيِّ أَنَّ فَرْضَ الْحَجِّ مَمْدُودٌ مِنْ حِينِ يَجِبُ عَلَى الْمَرءِ إلى أن تَحْدُثَ بِهِ الْمَنِيَّةُ، إِذْ لَوْ كَانَ فَرْضُ الْحَجِّ عَلَى مَا تَوَهَّمَهُ بَعْضُ مَنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ، وَزَعَمَ أَنَّ مَنْ أَخَّر أداءَ الْحَجِّ عَنْ أَوَّلِ سَنَةٍ يَجِبُ عَلَيْهِ الْحَجُّ كَانَ فِيهَا عَاصِيًا لِلَّهِ لَمَا أَبَاحَ الْمُصْطَفَى ﷺ لِمَنْ كَانَ مَعَهُ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ أَنْ يَرْجِعَ بِعُمْرَةٍ قَبْلَ أَنْ يَحُجَّ، وَبَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْحَجِّ أَيَّامٌ قَلَائِلُ؛ لِأَنَّ الْمُصْطَفَى ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ لِأَرْبَعٍ مَضَيْنَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، وَبَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَرَفَةَ خَمْسَةُ أَيَّامٍ، فَأَبَاحَ لِمَنْ أَحَبَّ الرُّجُوعَ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الْعُمْرَةِ أَنْ يَرْجِعَ قَبْلَ أَنْ يَحُجَّ.

## باسی ڕێگەدان بە عومرە لە مانگەکانی حەجدا بۆ ئەو کەسەی لەو ساڵەیدا حەج نەکات، وە ڕێگەدان پێی بە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی دوای ئەنجامدانی عومرە پێش ئەوەی حەج بکات

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حەجی ماڵئاواییدا فەرمانی بە خەڵکەکە کرد و فەرمووی: هەر کەس پێی خۆشە بە عومرەیەکەوە بگەڕێتەوە پێش حەج با بگەڕێتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاوی باس لە ڕاستی وتەکەی موتەلیبی دەکات: بێگومان ماوەی حەجی فەڕز درێژکراوەتەوە لەو کاتەی لەسەر بەندە پێویست دەبێت تا مردن، چونکە ئەگەر حەجی فەڕز بەپێی تێگەیشتنی هەندێ لەوانە بووایە کە لە زانست تێ نەگەیشتووە و پێی وایە هەر کەس حەج دوا بخات لە یەکەم ساڵ کە لەسەری پێویست بووە سەرپێچی خوای کردووە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ چۆن ڕێگەی دەدا بەوانەی کە لە حەجی ماڵئاوایی لەگەڵی بوون بە عومرەیەکەوە بگەڕێنەوە پێش

---

(١) إسناده حسن.

ئەوەی حەج بکەن، وە نێوانی ئەوان و حەج چەند ڕۆژێکی کەمی مابوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاوایی چووە نێو مەککەوە چوار ڕۆژ تێپەڕیبوو لە مانگی (ذِي الْحِجَّةِ)، نێوان ئەوان و عەرەفە پێنج ڕۆژ بوو، جا پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دا بەوەی هەر کەس پێی خۆشە دوای عومرەکەی بگەڕێتەوە پێش ئەوەی حەج بکات.

**بَابُ إِبَاحَةِ الْعُمْرَةِ قَبْلَ الْحَجِّ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْفِعْلَيْنِ مِنْ جِنْسٍ، إِذْ أَمَرَ اللَّهُ ﷻ بِهِمَا فَبَدَأَ بِذِكْرِ أَحَدِهِمَا فِي الْأَمْرِ قَبْلَ الْآخَرِ، أَنْ جَائِزٌ أَنْ يَبْدَأَ الْمَأْمُورُ بِالْفِعْلَيْنِ بِأَحَدِهِمَا فِي..**

**باسی ڕێگەدان بە عومرە پێش حەج، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو دوو کردارە لە ڕەگەزێکن، چونکە خوا ﷻ فەرمانی کردووە بە هەردووکیان، سەرەتا فەرمانی بە یەکێکیان کردووە پێش ئەوی دیکە، بەوەی دروستە فەرمانپێکراوە بە دوو کردار سەرەتا دانەیەکیان ئەنجام بدات لە...**

**سوپاس بۆ خوای بەرز و بێهاوتا دروود و سەلام بۆ سەر گیانی پێغەمبەری سەروەر ﷺ صەحیحی پێشەوا ئیبنو خوزەیمە تەواو بوو لە بەرواری ١٨/ ٨/ ٢٠٢٠. ڕۆژی سێشەممە کاتژمێر ١٠:٢١ خولەکی سەرلەبەیانی.**

# ناوەڕۆک

